

# ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە

## لە 0001/1/1 تا 1900/12/31

عەلی کەندی

بەرگی یەکەم - چاپی دووەم
بژارکراو و پترکراو
باشووری کوردستان - هەولێر
2709 - 2009

گەنجینەیەکی پڕ لە مێژووی ڕووداوی کۆمەڵگاکانی جیهان لەهەموو بوارەکان لەماوەی بیست سەدە دا

# ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە

## لە ١/١/٠٠٠١ تا ٣١/١٢/١٩٠٠

عەلی کەندی

بەرگی یەکەم – چاپی دووەم
بژارکراو و پترکراو
باشووری کوردستان – هەولێر
٢٠٠٩ – ٢٧٠٩




**وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان**

**بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە**

ناوی کتێب: ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە

نووسینی: عەلی کەندی

دیزاینی بەرگ: دانەری مێژوونامەکە – عەلی کەندی

کۆمپیوتەر: نووسینگەی هیوا بۆ کۆمپیوتەر

بەرگ: بەرگی یەکەم ٢٠٠٩

چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٩

چاپخانە: چاپخانەی ڕۆشنبیری و لاوان - هەولێر

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

نرخ: بۆ هەرچوار بەرگ (٢٠٠٠٠) دینارە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ ژمارەی سپاردنی(٢٢٥٥) ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە.


-------------------------


بۆ هەر ڕەخنەیەك یان پێشنیارێك یان هەر زانیارییەك لە هەڵەو بەسەرچوون ئاگادارمان بکەنەوە بە ژمارەی مۆبایـــــل/ ٤٥٤٨٠٩٨ ، یـــــان ژمـــــارەی ئاریــــــافۆنی / ٠٦٦٢٥٣٣٥٢٢- یــــــان ئیمێڵی:Alikendi@yahoo.com

# دەسپێك بۆ چاپی دووەم

لەگەڵ پەرەسەندن وپێشکەووتن و گەشەکردن و بووژانەوەی بەردەوام بە پێی تێپەر بوونی قۆناخـە یـەك لـە دوای یەکـەکانی مرۆڤایـەتی لـە هـەموو بوارەکـانی رامیـاری و نەتەوەیی و نیشتمانی و ئاینی و جووگرافی و زمـان و مێژوو وکەلتوورو داب و نەریت و شـووێنەوارو شارسـتانیەت ، و بازرگـانی و پیـشەسازی وکـشتووکاڵ و .........هـی دیکە .

ئەمـەش پێداویـستی ژیـان بـە زانیـاری تـەواو لـەم بوارانـەدا هەیـە ، لـە پێنـاو هەلـسەنگاندن و شـێکردنەوەی رووداو بەسـەرهاتەکان لـە هـەموو بـوارە جیاجیاکـان و گوونجانـدنی لەگـەڵ ئێـستا دا ، ئـەویش لـە پێنـاو هێنانـە کایـەوەی بـارێکی لـە بارەو گوونجاوتر بۆ خزمـەتکردنی مرۆڤایـەتی ، بە دابین کـردن و سـەقامگیرکردن و مسۆگەر کردنـی داد پـەروەری کۆمەلایـەتی و دانـان بـە مـافی مـرۆڤ و چارەسـەر کردنـی کێشە تەشەنە دارەکانی لەو بوارانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن . بە تایبـەتی لـە بوارەکـانی نەتەوەیی ونیشتمانی و زمان و مێژوو و مێژووی جووگرافی و کـەلتوور داب ونـەریت و شووێنەوارو شارستانیەت وئاین وچارەسەر کردنـی لە رێگـەی دەست لـەناو دەستدا و رازی بـوون بـە بەرامبەرەکـە ، کـە سەرچـاوەی چارەسـەری هـەموو کێـشەکانە ، بـە دوورکەوتنـەوە لـە هەرەشـە لێك کـردن و پـەلاماردانی یـەکتری و بـە پێچەوانەشەوە لـە رێگەی گفتووگۆو دایلۆگ ودانی مافە زەوت کراوەکان لەلایەن دەسەلاتداران .

جا من نامـەوێ بە درێـژی بچمە نـاو باسـەکەم ، بەلکووپێـشەکیەکەی چاپی یەکـەم وبەرگی یەکەمی مێژوونامەکە ، ئاماژەم بە هەموو لایەنەکان کردووە بە شێوەیەکی لە بار لە بوارەکانی پەرەسەندن و پێشکەووتن ، بە پێی تێپەربوونی قۆناخەکان .

وادیـارە مێژوونامەکـە جێگـای خـۆی کردۆتـەوە لـە دەرونـی خووێنـدواران وسەرکەوتنی بە پلەی ٨٥ ٪ ی بە دەست هێناوە . لە سەر باری کوردو کوردستان لەو هـەموو بوارانـەدا . بەڵگـەش بـۆ ئەمـە بـەرگی یەکـەمی مێژوونامەکـە بـە تـیراژی ٤٥٠٠ دانـەی لەلایـەن وەزارەتـی پـەروەردەی حکوومـەتی هـەرێم لـە باشـووری کوردسـتان کڕاوەتەوە و بۆتە سەرچاوەیەکی سوود لێوەرگرتن وەك سەرچاوەیەك . کە بووە هۆی ئەوەی کە داواکاری زۆری لە سەر بێت .

جـا منـیش بـەو پـەری دڵخۆشـیەوە مێژوونامەكـەم ، لـە چـوار بەرگـدا دەخەمـە بەردەستتان بە شێووەیەكی تێرو تەسەل لە هەموو بوارەجیاجیاكان . بە ناوێكی دیكە كە — ئینسكلۆپیدیای مێژوونامە — یە ئەمـەش لـە سەر داوای مامۆستایانی شارەزا بە هۆی لە خۆگرتنی هـەموو بوارێك بەتایبـەتی لـە سەر كوردو خاكی كوردسـتان ، وەك بوارەكـانی رامیاری و نەتـەوەیی و نیشتمانی و ئاین و جووگرافی و زمان و كـەلتوورو مێژوو شووێنەوارو ئابووری و بازرگانی وكۆمەلایەتی و رۆشەنبیری و زانست و ئەدەب و گـەردوون و یاسـاو شـەڕو ئاشـتی و بـە بەڵگـە نامـەكان . ئـافرەت و رووداوەكـانی تیرۆرستەكان و فرۆكەو پزیشك و .... ئەوەی بتـەویٚ لـە بەر دەستت دایـە لـە نـاوەرۆكی مێژوونامەكەدا .

كە بەرگی یەكەم لـە ١/١/ ٠٠٠١ دەسـت پێـدەكات تا ٣١ / ١٢/ ١٩٠٠ ، هـەروا بـەرگی دووەم لـە ١٩٠١/١/١ دەسـت پێـدەكات تـا ١٩٥٠/١٢/٣١ ، بـەرگی سـێیەم لـە ١٩٥١/١/١ دەسـت پێـدەكات تـا ٢٠٠٠/١٢/٣١ ، هـەروا بـەرگی چـوارەم لـە ٢٠٠١/١/١ دەسـت پێدەكات تا ٢٠٠٧/١٠/٣١ .

لـە هـەمان كـات بـە پێـی پێویـست وێنەكانیـشی لەگـەڵ دانـراوە لەگـەڵ نەخـشە جیاجیاكان بە پێی رووداوو بەسەرهات و ئەنجام دانی بەرۆژو مانگ و ساڵ . بەڵام بۆ ئەوەی وێنەو نەخشەكان دووبارە نەبنەوە دەتوانرێت لە جێگەی دیكە سەیری بكەیت لە ناوە رۆكی ئینسكلۆپیدیای مێژوونامەكەدا . لە بەر ئەوەی دانەنراوە ، یا وێنەكە دەست نەكـەوتووە یـا وێنەكـە زۆر كـۆن بـووە ، لـە هـەمان كـات نـەم ویـستووە وێنـەكان دووبارە ببنەوە . وەك بەڵگەیەكی راست و دروست و رێك و پێك .

لـە هـەمان كات داوای لێبـووردن لـە خوێنـەرانی هـەڵگری ئـەم كتێبـە دەكـەم لـە هـەر كەموو كوریەك ، لە بەر ئەوەی مرۆ ڤ گەر هەڵە نەكات پێش ناكەویت .

لـە كۆتـایی هیـوادارم خزمـەتێكی بچووكی كتێبخانـەی كـوردی و خووێنـەری كـوردم كردبێت لە كوردستان و وولاتانی دراوسێی كوردستان و هەرێم و ناوچەو جیهان .

**عـــەلی كــەندی**

دانەری ئینسكلۆپیدیای مێژوونامە

٢٠٠٩ / ١ / ٣١

# بەرەو چەندین ئینسکلۆپیدیا کە هەموو لایەنەکانی ژیان بگرێتەوە

## پارێزەر/ تارق جامباز

ئـەم خەمخۆریـە تاقـە کەسـییە کـە لایـەن مامۆسـتا عـەلی کەنـدی ئەنجامـدراوە شـایانی سوپاس و پێزانینـە ، چونکە پشوویەکی فراوان و ماوەیەکی زۆرو ئارامیەکی ئەیووبیانەی گەرەکە ، لە بەر ئەوەی ئەم ئینسکلۆپیدیایە چەندین ئینسکلۆپیدیا لە خۆدەگرێ .

لـە وولاتاندا بۆ هـەر بوارێك لـەم بوارانەدا دەزگایەك بە کۆمـەڵێ پسپۆڕو شـارەزاو لێزان بەماوەیـەکی دیـاریکراو بەمـەرجێ هـەموو کاتێکیـان بـۆ جۆرێـك لـەجۆرەکانی ئینـسکلۆپیدیا تـەرخان دەکـەن وەك ( ئینـسکلۆپیدیای زمـان ، فۆلکلـۆر ، سیاسـەتمەداران ، شـاعیران ، ڕۆژنامەنووسان ، ...هتد ) ئەم ئینسکلۆپیدیانە لە کتێبخانەکانە و لەسەر تۆڕی ماڵپەڕەکان هەن و هەروەختێ یەکێك ویستی لە چ بوارێك پێویستی پێی هـەبێ ئەوا بە ئاسانی دەتوانێ سوودی لێ وەربگرێ .

بـەڵام بەداخـەوە لایـەنی پەیوەندار لـە کوردسـتان چ حکوومـەت و دەزگاکـانی تایبـەتمەند نەمزانیووە پلانێکیان بۆ ئەم بوارانە هـەبێ کە بەشێوەیەکی بابـەتی و زانستی زانیارییـەکان لەلایەن خەمخۆرانەوە بەووردی و قووڵی بنووسرێنەوەو پێداچوونەوەیان بۆ بکرێ .

ئینجا چاپ و بڵاوبکرێنـەوەو جارێ خـەرمان بەرەکـەتی زمانی کوردی بەهـەموو شـێووە زارەکـانی کۆنەکراونەتـەوەو تـاکو لەبەردەسـت دابـێ ، ئـەوجا دەزانین چ زمـانێکی زەنگـین و ڕەنگینمان هەیە .

لە بەر ئەوەی زمان ناسنامەو گیانی نەتەوەیە هەر نەتەوەیەك بێ ، بۆیە هەرچەندی بایـەخ و گرنگی و بەها بـەزمانی کوردی و زمـانی نەتـەوەکانی دیکە کە لـە کوردسـتان دەژیـن بدرێ هێشتا کەمـە ، چـونکە هێنـدەی تـر هـزرو ڕۆناکبیری و ووشـیاری نەتەوایـەتی پێگەیـشتن و پێشکەوتنی بەخۆیەوە دەبینێ و گەر خاك نیشتمان و وولات بێ ، ئەوا زمان گیانەکەیـەتی و هەڵگری ناسنامەی تایبەمەندیەتی لەنێوو زمانانی جیهاندا هەیە .

ئەندامی پەرلەمانی کوردســـــتان

باشووری کوردســــــــتان – هەولێر

٢٠٠٩/٨/١٠

# کارێـــکی کەلتـــووری مـــەزن

٠٠٠ ئەم کارەی پیشەسازییەی ووشە :

(( ئینــــــــسکلۆپیدیایە – مێژوونامە ))

قەلایـەکی کلتـووری مێـژووی مەزنــە ، وەکـو قەلاکــەی شــاری مێــژوو – هــەولێر – ، هــەردەم زیندووە .

بـــەلێ ، کارگـــە ووشـــە سازیەکەی مامۆستا عەلی کەندی ، مــەزنترین ســەرمایەی کــوردو کوردســـتان و مرۆڤایەتیـــە . لـــە لایەنی دارشتن و زمانەوانییەوە ، خۆزگە باشتر بوایە .



الزمان
AZZAMAN.COM

کارێکی کەلتووری مەزن

... ئەم کارەی پیشەسازییەی ووشە :

(( ئینسکلۆپیدیایە - مێژوونامە - ))

قەلایەکی کلتووری مێژووی مەزنە ، وەکو قەلاکەی شاری مێژوو - هەولێر - ، هەردەم زیندووە .

بەلێ . کارگەی پیشەسازییەکەی مامۆستا عەلی کەندی ، مەزنترین سەرمایەی کوردو کوردستانە و مرۆڤایەتییە . لە لایەنی دارشتن و زمانەوانییەوە ، خۆزگە باشتر بوایە ..

مومتاز حەیدەری

٢٠٠٩/٧/٧

مومتاز حەیدەری

باشووری کوردستان – هەولێر

٢٠٠٩/٧/٧

# پـــــــێشەکی

لە یەکێك لە ژمارەکانی گۆڤاری مێرگ چەند تێبینیەکم لە سەر چاپی یەکەمی کتێبی – مێژوونامە – ی نووسەر – عەلی کەندی – نووسیبوو ، دیارە ئەمەش لە بایەخی بەرهەمەکەی کەم ناکاتەوە ، چونکە ئەگەر بزانم کتێبێك لاوازە و کەم بایەخە کاتی خۆم و خوێنەرانی پێ ناکوژم و هەر لە سەری نانووسم ، بەڵام دیارە کتێبەکەی نووسەر عەلی کەندی لەم جۆرە نییە<

پاش ماوەیەك عەلی کەندی بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوە کردم و باسی لەوە کرد کە مێژوونامەکەی کردووە بە چوار بەرگ و دەیەوێت بۆی بەسەردا بچمەوە و پێشەکی بۆ بنووسم .

منیش خۆشحاڵی خۆم پێشانداو کاتێکمان بۆ یەکتر بینین دانا ، ئەوە بوو ئێوارەیەك سەردانی بارەگای کۆمەڵەی رۆشنبیری مێژوویی کوردستانی کردو دڵخۆش بووم بەوەی کە هاورێیەکی نوێم بۆ پەیدابوو ، بەڵام بینیم کە چوار بەرگەکە زۆر گەورەن و ژمارەی لاپەرەکانی زۆرە ، بۆیە داوای کاتێکی باشم کرد بۆ ئەوەی بتوانم پێداچوونەوەی بۆ بکەم <

بەڵام دیارە ئەویش بە پەلە بوو بۆیە بریارمدا لە کاتێکی کەمتردا ئەرکەکەم ئەنجام بدەم ، بەڵام بە هۆی سەرقاڵیم و کەمی کات و گەورەیی بابەتەکە لە چوار بەرگدا نەمتوانی بە تەواوی بەسەر بابەتەکەدا بچمەوە ، بۆیە لەوانەیە ئەم بەرهەمە وەکو بەرهەمێکی تر لە هەڵەی چاپ و هەندێ جاریش هەڵەی زانیاریش بەدەرنەبێت ، بەڵام لە هەمان کات کارێکی مەزنە بە ماندووبوونێکی زۆر ئەنجام دراوە .

نووسەرێکی دڵسۆزی وەك عەلی کەندی پێی هەڵساوە ، کە پێویستە هان بدرێت و پشتگیری لێ بکرێ تاکو بەرهەمی زیاتر پێشکەشی کتێبخانەی کوردی بکات ، بە تایبەتی کە هێشتا کتێبخانەی کوردی لە زۆر بواردا هەژارەو، ئێستاش نەوەی نوێ لە کوردستانی ئێراقدا پتر هەر زمانی کوردی دەزانن ، بۆیە چاپکردنی کتێبی کوردیش لە هەموو بوارەکاندا بەشداریکردنە لە بەرەو

پێشبردنی ڕەوتی ڕۆشنبیری كوردی ، بۆیە داوا لە خوێنەران و ڕەخنەگرانی كورد دەكەم كە بە بایەخەوە سەیری ئەم بەرهەمە بكەن و بیخوێننەوە و لە سەری بنووسن و لایەنە چاك و خراپەكانی بە دیار بخەن ، تاوەكو گەر هەر كەم و كوریەكیشی هەبێت لە چاپەكانی تردا ڕاست بكرێتەوە .

نووسەر كارێكی زۆر باشیش دەكات كە نووسینی خۆی پێش چاپ كردن بە خەڵكانی تر پێشان دەدات ، چونكە مرۆڤ ناتوانێت هەموو هەڵەكانی خۆی ببینێ ، لە كۆتایشدا هیوادارم كە عەلی كەندی ئەم توانا باشەی هەیەتی لە بواری كۆكردنەوەو ساغ كردنەوەی بەڵگەنامەی تایبەت بە مێژووی كورد و لێكۆڵینەوەی مێژوویدا بەكاربهێنێت .

بەمەش بابەتەكانی نووسینی لە باشەوە بەرەو باشتر دەچێت و هەر نووسەرێكیش لە پرۆسەی نووسیندا بریتیە لە چەند قۆناخێك .

د- محەمەد عەبدوڵڵا كاكە سوور

جێگری سەرۆكی كۆمەڵەی ڕۆشنبیری مێژوویی

كوردستان وسەرنووسەری گۆڤارمێژوو

سەرۆكی بەشی مێژوویی ئێواران / كۆلێجی ئاداب لە

زانكۆی سەلاحەدین

٢٥ /٧/ ٢٠٠٩

# پێشەکی

**دوکتۆر مارف خەزنەدار**

فەرهەنگی زمان و ئەدەب و زانستی و هونەر بەهەموو بابەتەکانیەوە، هەروەها ئەنسیکلۆپیدیاو رێبەری هەموو شتێك و بیبلیۆگرافیای تایبەتی و گشتی لەگەڵ گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵ نرخیان گرانترو پێویستیان زیاتر دەبێ. ئەگەر لەڕۆژگاری ئەمڕۆی تەکنۆلۆجیاو ئەنتەرنێت و مۆبایل بیری کەسانێك بۆ ئەوە بچێ سەرچاوەکانی فەرهەنگی زمان و ئەنسیکلۆپیدیاو بیبلیۆگرافیا ئەو نرخەیان نامێنێ، یا کەس پێویستی پێ یان نابێ بەهەڵە چووە، چونکە هێشتا ئەم ئامارە تازە داهاتوانە بەسەرهات و کردەوەو پاشماوەی مەدەنیەتی چەندان هەزار ساڵەی ژیانی ئادەمزادیان تۆمار نەکردووە لەمرۆڤی نیاندرتالەوە تا ئادەمزادی سەردەم.

ئەمە ماوەییەکی زۆری دەوێ، جگە لەوەی ئەم ئامارانەش لەبەردەستی هەموو کەسێك نین، تەنیا خوێندەوار کەڵکیان لێ وەردەگرێ. ئەدی نەخوێندەوار لەسەر رووی زەوی ژمارەیان چەندە! نەك تەنیا ئەمە، بەڵکو بەتایبەتی لەهەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستان ژمارەی نەخوێندەوار چەندە!

لەبەر ئەوەی ئەو سەرچاوانەی باسم لێوەکردن لەناو کۆمەڵی ئێمەی کوردەواری بایەخیان پێ نەدراوە، لەم لایەنەوە نامەخانەی کوردی هەژارە، لێرەدا پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێتەوە یەکێ لە مەرجە هەرە گرنگەکان ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێك خۆیان بە نەتەوە (الأمة Nation) بزانن پێویستە تۆماری زمان و ئەدەب و مێژوو و جوگرافیاو کولتووری نەتەوەیی یان هەبێ،

ئەوەی ئەم هەموو مەرجە کولتووریانە دەپارێزێ و ڕێکی دەخا ئەو کارەیە کە بەشێکە کەوتۆتە ئەستۆی عەلی کەندی.

تاقیکردنەوە لەناو کوردەواری ئێمەدا لەم بابەتەوە کەمە، ئەوەی کراوە لەو پلەیەدا نییە باوەڕی تەواوی پێ بکرێ، چونکە دوو هۆی سەرەکی دوژمنی ئەم جۆرە کارە زانستییانەن، یەکەمیان ئیدۆلۆجییەت و دووەمیان سۆزی نەتەوەیی (قەومی)، ئەم دیاردانە هەوێنی کاری داهێنانی ئەدەبی و هونەرین، بەڵام پێویستە زۆر دووربن لە کاری لێکۆڵینەوەی زانستی، بەتایبەتی فەرهەنگ و ئەنسیکلۆپیدیا. لەناو میللەتانی کەم پێشکەوتوودا شوێنەواری ئەم دوو ڕەوشتە سایکۆلۆجی و کۆمەڵایەتیە تا پلەیێك دەمێنێ.

عەلی کەندی خۆی لەم کارە قورس و پڕ هەوەس و بە کەڵکە داوە، بۆ ئەوەی ئەم لایەنەی نامەخانەی کوردی هەندێ دەوڵەمەند بکا. بەناوی ڕێز لێنانەوە پێی خۆش بوو دوو قسەی بۆ بکەم، منیش بەناوی ڕێز لێنانەوە پێویستە داواکاریەکەی بهێنمە دی.

ئەم کارەی دانەر بەبێ سەرچاوە نەگەیشتۆتە ئەنجام. ئەم سەرچاوانەش دەکرێن بە دوو بەشەوە، سەرچاوەی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی. ئەوانەی ڕۆژئاوا مەرجی ڕاستی و بابەتیان تێدا هەیە، بەڵام سەرچاوە ڕۆژهەڵاتیەکان، بەتایبەتی کوردییەکان هەندێ جار جێی متمانە نین، چونکە ئیدیۆلۆجییەت و سۆزی نەتەوەیی تیایاندا کاری خۆیان کردووە، لەو کاتەی ئەو جۆرە فیکرو سۆزە پێویستە لەکاری لەم بابەتەوە دوور بکەونەوە، هەر چۆنێ بێ ئەگەر شێوازی ئیدیۆلۆجی و عاتیفی لەهەندێ جێگە لەم کارە گرنگەدا بەرچاو بکەوێ دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە ڕۆژهەڵاتیەکان بەتایبەتی کوردییەکان، هەروەها ئەم دیاردەیە هەندێ جار لەسەرچاوە ئەورووپاییەکانیش دەکەونەبەرچاو، بەوەی ئەو کتێبانەی لەزمانانی ئەورووپاییەوە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی لەهەندێ شوێن ئەمانەتی زانستیان تێدا وون بووە یا بەشێوەیێك دەسکاری کراون.

هەر چۆنێ بێ ڕۆشنبیری کورد عەلی کەندی کارێکی گەورەی کردووە، ئەمە تەنیا لە کتێبی "مێژوونامە"دا ناکەوێتە ڕوو، بەڵکو لەپێش ئەوە هەندێ کاری دیکەی لەم بابەتەوە بەرهەمی ئەو کۆششە بووەو بڵاوکراوەتەوە. هەروەها لەکارەکەی دا بەردەوامە بۆ بەرهەمهێنانی فەرهەنگ و ئەنسیکلۆپیدیای بەکەڵکی دیکە.

لەم مەیدانە گرنگەی کولتووری هەموو نەتەوەیێك عەلی کەندیش دەبێتە سەربازی نەناسراوی ئەو جۆرە کارە زانستیانە. ئەمانە نەك تەنیا لای ئێمە، بەڵکو لەهەموو گێتی دا سوود بەخوێندەوارو ڕۆشنبیران دەگەیەنن، کەچی نووسینەکانیان دەبن بەسەرچاوەی بنچینەیی بۆ هەموو جۆرە بەرهەمێك، بەلام ناویان ناچێتە ناو بیبلیۆگرافیای ئەو کتێبانەی خاوەنیان سوود لەکارە فەرهەنگیەکانیان وەردەگرن.

دەسخۆشی لەبەڕێز عەلی کەندی دەکەم، هیوام وایە لەسەر کارەکەی بەردەوام بێ، هەمیشە ئەوەی کردوویەتی بەکەمی بزانێ بۆ ئەوەی زیادی بکا.

هەولێر : مەڵبەندی ڕووناکی

٤ ی مایسی ٢٠٠٧

# دەســــپێك بۆ چاپی یەکەم

خووێنەری بەڕێز :-

ئەوەی دەیخەمە بەر دەستتان کارێکی مێژوویی گرنگە لە مێژووی ڕووداوەکانی کوردو کوردستان‌و وولاّتانی جیهان لە ١/١/٠٠٠١ زاینی تاکوو ١/٦/٢٠٠٦ بەپێی قۆناخە تێپەر بووەکانی پەرەسەندن‌و پێشکەووتن‌و گەشەکردن لە هەموو بوارە جیاجیاکانی نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌و رامیاری‌و ئابووری‌و بازرگانی سەربازی‌و زمان‌و مێژوو کەلتوورو داب‌و نەریت‌و شووێنەوارو شارستانیەت.

لەسەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بەرەو دامەزراندنی کەسایەتی تاك‌و خێزان‌و بنەماڵەو کۆمەڵگاو نیشتمان‌و نەتەووەو زمان‌و مێژوو و داب‌و نەریت‌و کەلتوورو شووێنەوارو بەرەو شارستانیەت، بەپێی قۆناخە یەك لە دوای یەکەکان ، کە هەر هەمووی لە ئەنجامی کێشەو ململانێی بەردەوام بووە چ لە ململانێی مرۆڤ لەگەڵ سرووشت‌و سەلماندنی بوونی خۆیی‌و چ لە ململانێی ناو خوودی مرۆڤایەتیدا .

لەپێناو پێك هێنانی یەکەم:- نیشتمان و، دووەم :- نەتەووەو دووایی بە چەسپاندنی سنوورو دەسەلاّت‌و دەووڵەت‌و بەرەو دام‌و دەزگاکان .

کە کوردیش نەتەوەیەك بووە لەپێشەوەی بەر لە نەتەوەکانی دیکەی سەر زەوی لەناو ئەو کێشەوململانێیەدا خوولایتەوە ، کورد بەر لە ٢٨٤٥ ساڵ خاوەنی ٢٧ وویلایەتی خۆیی بووەو ٢٧ سەرۆك‌و شانشین دەسەلاّتداریەتی نیشتمان‌و گەلەکەیان کردووەو بەردەوام بوونە لە پاراستنی دەسەلاّتەکەیان، کە پایتەختەکەیان هەمەدانی رۆژهەلاّتی کورستان بووە .

خاکی کوردستان‌و گەلەکەی سەرچاووەی یەکەمی بە دەست هێنانی باری پیشەسازی‌و کشتووکاڵ‌و بناسازی‌و بازرگانی بوونەو سەرچاووەی پەرەسەندن‌و پێشکەووتن‌و گەشەکردنی گەلاّنی دیکە بوونە . بە تایبەتی سۆمەری‌و بابلی‌و هەروا،... هەتا لە بوواری نووسین بەهەموو بووارەکانی کە بەر لەو مێژووەی سەرەوە لەسەر خاکی کوردستان گەلەکەی نووسین‌و خووێندنی بەدەست هێناوە .

لە بەرئەوەی مێژوو و جووگرافیا جەستەیەکی زیندووی هاوبەشن لە دوو ڕێگای هاوسەنگ بە سەلماندنی بوونی یەکیان بۆ ئەویدیکە بە پێچەوانەش ڕاستە.

جا هەر کارێکی سەربازی یاخوود نەتەوەیی . یاخوود جووگرافی و ئابووری ، کە ڕۆڵی بنەڕەتی خۆی هەبووەو هەیە لە کاردانەوەی لـــــــــــە سەر لایەنەکەی دیکـە بـە هـۆی دابـەش بـوونی کۆمـەڵگای مرۆڤایـەتی بـەدوو بەشـی دژ بەیـەکتر لەسەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤ و کۆتایی نایەت تا کووتایی مرۆڤ ئەویش بە نەمانی ژیان لەسەر زەویدا .

زانستەکانی مێـژوو سرووشـت و کۆمەڵایـەتی ئـەوەیان سـەلماندووە کـە مێـژوو گەنجینەیەکـەو بـاش و خـراپ دەچـێتە نـاو لاپـەڕەکانی... مێـژووی پەرەسـەندنی قۆناخـە یـەك لـە دووای یەکـەکانی مرۆڤایـەتی لـە کـرداره نالـەبارو لـەبارەکان ... لـە نێـووان چەووسـانەووەو چەووسـێنەرەوە ... لـە داگیرکـردن و لـە ڕزگـار کـردن... لـە سەرکەووتن و لە ژێرکەووتن و بەزاندن... لەئاوەدان کردنـەووەو لـە وێرانکـردن ... لە دەووڵەمەند بوون و لە بەهەژار کردن... لە بوون و لـە مـردن... لـە سـەرهەڵدان و لـە تووانەوە ... لـە قەدەخـەکردن و لـە مـاوەدان ... لـە دادپـەروەری و لـە سـتەمدیدەیی ... لەدزین و تالآنکردن و لە یارمەتیدان و پێدان و دابین کردن... لە ڕاست گۆیی و لە ناراستی و فرت و فێل ... لەخۆشی و لە کارەسات ... لەداگیرکردن و لە ئازادکردندا.

ئەمانە هەرهەمووی بەکاری مێژوویی دەچێتە ژوورەکانی تۆمارکردن هـەر یەکـەو لـە لاپـەڕەکانی خـۆی بـەجیاو ، هـەر یـەکێش لەووانـە بەیەکـەوە بەسـتراووەنەتەووەو هێـزیش نیـە بتووانـێ یـەك دێـر لـە دێـرە تۆمارکراوەکـانی مێـژووی تۆمـار کـراو بشێووێنێ، چونکە بـە ملیۆنـەها لاپـەڕە خـۆی تۆمـار کـردووەو بـێ ئـەوەی کرداری کارەکە هەستی پێ بکات لە بەرامبەریدا.

بـەڵام لـە دوای خۆتۆمـار کردنـەکانی وردە وردە خـۆی دەردەخـات و ڕاسـت و چەووتەکان و باش و خراپەکان بە ڕووی کرداری کارەکە دا دەداتـەوە بـەپێی قۆناخـە یەك لەدوای یەکەکاندا .

خووێنەری بەڕێز :—

چ سرووشـــت و چ مـــرۆڤ ، دوو جەمـــسەری بەیەکـــەوە بەســـتراون لەخـــەبات و هاوبەشی بەیەکەوە ژیان و یەکیان بەبێ ئەویدیکەیان بەمردوو دەمێنێتەوە، لەهەمان

کـات دژ بـه یـەکترن لـەپێناو خزمـەتکردنی یـەکتری لـه نـاو هـەر یـەکیان ، بـه مانایـەکی دیکـه، کۆمـەڵگای مرۆڤایـەتی خۆی لـه خۆیـدا کێشەو ململانێیـه لـه دوو جەمسـەردا ، هـەروا لـەناو سرووشتیـشدا... بـەپێی یاسـاکانی کۆمـەڵو سرووشـت وەك یاسـاکانی (وحـدة وصـراع الاضـداد- نفـي نفـي- كميـة و نوعيـة- الـشكل والمحتوى- الصدفة والضرورة).

جا لـه بەرئـەوه بـەپێی پەرەسـەندنی تەمـەن ، پـەیتا پـەیتا ساتەکانو کاتـەکانو رۆژەکانو چاخەکان ، سەرکردەکان دێنو دەڕۆنو رادەبوورن.

چـونکه هـەر کارێـك گـەر سـەرەتای هـەبێت کۆتـایی هەیـەو بەپێـچەوانەش زۆر راسته ... لەبەر بوونی کێشەو ململانێو تـەنگ و چەلەمەی نێـوان ئایینو زانست لەناوچەو هەرێمو جیهان ، لە پێنـاو سـەرکەوتنی یـەکیان بەرامبـەر ئەوویدیکـەیانو لەناووبردنی یەکیان بەرامبەر ئەوویدیکەیان بەردەوامه.

ئـەوەی مـن بـیری لێدەکەمـەوەو کردوومەتـەوه . هـیچ شـتێك کۆتـایی نیـەو مالانهایەیـەو هـەردەم لـه گۆڕیندایـه بـۆ گـۆڕانێکی دیکـه ، گـەر وونـیش بێـت لـه قۆناخێـك بـۆ قۆنـاخێکی دیکـه... واتـه مێـژوو خـوول دەخوواتـەوەو ژیـانیش بەردەوامەو بەردەوام دەبێ .

گـەر قـەدەری لێـك ترازانـی گـۆی زەوی لەگـەڵ کۆمەڵـەی رۆژەکـانی دیکـەو بـه بوونی بەزریانێکی خوڵاویو بەرەو ئەستێرەیەکی دیکەی بەهێزتر، ئـەوکات ژیان لـه سەر ئەو زەویه کۆتایی دێت لە سەر ئەم هەسارەیەدا .

دڵنیاشـم لـەوەوەی کـه ژیـان لـه سـەر ئەسـتێرەی دیکـه لـه گـەردوون دا هەیـه وەك ئێستای ئێمەو هەمان باروو دۆخ دەگرێته خۆ، بەلام له شێووەو شێووازێکی دیکـه ، بـه هـەمان یاسـاکانی کـه لـه سـەرەوه باسـم کـردووه . کـه ئـەو پێنج یاسایه بەنده بـه پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیو سرووشت .

سـەرجەم رۆژەکـانی هەفتـەو مـانگو سـاڵ پـڕن لـه رووداو کارەسـاتی پـڕ لـه خۆشـیو ناخۆشـی و فرمێـسك رشـتنو پێکـەنین لـه هـەموو بـووارو لایەنـه جـۆراو جۆرەکانی ژیان چ بە نەخشێنراو چ بەخۆڕسکیەوه.

خووێنەری بەڕێز:-

بەر پابوونی رووداوەکان چ ناخۆشو جەرگبڕن یاخوود رووداوی

مووژدەبــەخش و دلخۆشــکەر بــن ... لاپــەرەکانی مێــژوو بەدەســت پــاکی و بەئەمانەتەوە لە لاپەرەکانی رۆژنامەی ژیانی خۆی تۆماریان دەکات ، گەر تۆو هـەر کەسێکی دیکەو لایـەنێك و هێزێك و بنەماڵەیەك بـەرگری لـە خـۆی بکـات... چونکە مێـژوو لـە گـەڵ پەرەسـەندنی ژیـان بەردەووامــە، مـرۆڤ مێـژوو دورسـت دەکـات بەپێچەوانەش راسترە ، بێ ئەوەی هەستی پێ بکات و مردنی بۆ نیە ، تەنیا مرۆڤ و ئاژەڵ و گیـان لەبـەروو داروودرەخـت و شاخ و داخ نـەبێت . کـە بوون و مردنـی تیا بەردەوامە هەر یەکەو بەپێی بارودۆخی تەمەن.

کاروانی پەرەسەندن و پێشکەووتنی مرۆڤایـەتی لـە قۆناخـە جیاجیاکانـدا ،. کـە نەتـەوە سـەرهەڵدەدەن و دەتووێنـەوە ، چیاو شاخ و دۆڵ تـەخت دەبن و چیاو دۆڵ و شـاخی دیکـە سـەرهەڵدەدەن ، دەریـا لەجێگـەی خـۆی وون دەبـێ و لەجێگـەی دیکـە سەر هەڵدەدەن ،.

هەروا بەرامبەر بە سرووشت و گـەردوون و مـرۆڤ و کـەش و هـەواو ئەستێرەکان ، کە هەر هەمووی بە یاساکانی سەرەوە بەستراوەتەوە ،. لەهەمان کات مێژووش لەناو ئـەو یاسـایانە لـەکارەکانی خـۆی بـەردەوام دەبـێ ، لـە بـە ئـەنجام گەیانـدنی کـاری فەرمانبەریەتی خۆی لەکات وساتەکان و کاری ئەمرۆی ناخاتە رۆژی دوواتر لەهەموو بوواره جیاجیاکاندا.

جا بە هەر حاڵ ئەمرۆ بەچاوی خۆمان دەبینین ، کەباروودۆخی ناوچەو هەرێمە جیاجیاکـان و وولاّتـانی جیهـان بەقۆناخێکدا تێپـدەرێت کـە لـەژێر دەسـتی سـەرەك کۆمــارو شانــشین و ئــەمیرو ســەرەك پــارت و گــرووپ و رێکخــراوی نەتــەوەیی و نیشتمانی و ئیسلامی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و بنەماڵە بەبوونی داد پـەرووەری و نـەبوونی دەکەوونـە بـەر دەسـتی سـزای گـەل بـەپێی تۆمارکراوەکـانی مێـژوو بـۆ دادگایکردنیان لەدزینی سامانە هەمەجۆرەکانی گەل ونیشتمان .

لە هـەموو بوواره جیاجیاکان و هەنگاوونان بـەرەو چەسپاندنی دادپـەرووەری بەرێنماییــەکانی مێــژوو، بــەراماڵینی بــیروو بۆچــوونی چــەووتی خۆپەرســتی و خۆویستی و فەسادو دزی وگەندەڵی، بەهێنانەکایەوەی دادپـەرووەری لـەکارو ژیان و لەئەرك و مافدا...!!

بۆ مێژوو دەڵێم تورك و فارس و عەرەب ، لە هەمووکات و ساتێکدا دووژمنی یەکتر

بوونـه بـەپێیّ ڕووداوەكـانی مێـژوو . لـە هـەموو بووارەجیاجیاكـان،.. تـەنیا لەسـەر چاسەرەنەكردن و پێشێل كردنی مافی كورد، هاووخـەبات و هاووبەش و هاووخـەمی یەكتر بوونە ، . بەتایبەتی لە دوای دروست كردنی سنووری جووگرافی وولاتـەكانیان لەسەر خاكی گەلانی هەرێمەكە بەتایبەتی لە سەرخاكی كوردستان... !

سەركردایەتی كوردیش بگرە لە سەرەتای بوونی دەسەلاتیان لەسـەر تیرەو هۆزو ئیمارت و بنەماڵەو پارت و ڕێكخراو لە هـەموو بـووارە جیاجیاكان دژی یـەكتر بوونـەو مێژوو بوونی گەل و نیشتمانیان پڕكردۆتەوە لە شەڕی خۆكووژی و كێشەو ململانـێ ، لە ئاسانكاری كردن بۆ دووژمنانی گەل و نیشتمان .

تەنیا لە سەر دەسەلات و سامان كۆك بوونە ، كە ئەمـەش دوو هۆكـاری سـەرەكی بنەڕەتی بوونە لـە نەگەیشتنی كورد بـە وولاتێكـی سنووورداری قەووارە سـەربەخۆ . وەك وولاتانی دیكەی جیهان، كە كورد لـە كیـشووەری ئاسیا لەنەتـەوە یەكەمـەكانی ئــەو كیــشووەرە بوونــەو دوا نەتــەوەش بوونــە لــە بەدەســتهێنانی وولاتێكــی سەربەخۆدا..!!..!!..

جـا هیـوادارم لـەناوەڕۆكی پێـشەكیەكەم گەیـشتبن ، كـە ئـەوەی لەتووانامـدا هەبووەو دەستم كەوتووە لە مێژووی ڕووداوەكانی كوردو كوردستان و داگیركـەرانی كوردسـتان و نـاووخۆی كوردسـتان و گـەلانی جیهـانم كۆكردۆتـەوە بـەڕۆژو مـانگ و ساڵ لەو كتێبە تۆمارم كردووە بەدڵنیاییەوە .

دڵنیاشـم لـەووەی كـە مێـژووەكان لـە ٩٩٪ ڕاسـتن بـەپێی مێـژووی سەرچـاوە كوردیــەكان و عەرەبیەكان وبــە تایبــەتی بیانیــەكان ، وەك لــە كۆتــایی كتێبەكــە سەرچاوەكان هەمووی تۆمار كراوە ... لە هەمان كات بەشێووەیەكی ڕێك و دورست لە زجیرەیەكی یەك لـە دووای یـەك و سـاڵ بەسـاڵ بەپێی دەسـت كـەووتن و بـرووا پـی بوون تۆماركراون..

خووێنەری بەڕێز:-

لـە كۆتاییـدا هیـوادارم خزمـەتێكی بـچووكی مێـژووی گـەل و نیـشتمانەكەم و سـەرجەم مێـژووی گـەلانی دیكـەی جیهـان و مرۆڤایـەتیم كردبـێ ، بـە دەووڵەمەنـد كردنـی كتێبخانــەی كـوردی، هیـوادارم كـە ئـەم كتێبـە ببێتـە هۆكـارێكی زیـاتر دەووڵەمەند كردن و پەرەپێدان بە پەرتووكخانەی كوردی و بیانی . بەتایبەتی وولاتانی دراووسێیی داگیركەری كوردو خاكی كوردستان .

ئـەویش بـە تێگەیـشتنیان لـە راسـتیەکان و هەڵـەی رابردوویـان و گەرانـەوە بـە گرتنەبەری بنەماکانی ژیانی بەیەکەوەی سەردەمیانە لـە هـەموو بوارە جیاجیاکانی خۆیی و بوونی دراووسێیەتی برایانە...

هیـوادارم کـە یارمـەتی دەرم بـن لـە هـەر رەخنەیـەك یـاخوود کەمووکوورییـەك کـە لەناوەرۆکی کتێبەکەم بەدی دەکرێ .

تـا بـە هاووکـاری و یارمــەتی ئێــووەی بــەرێز راســتبکرێتەوە ، بــۆ زیــاتر پـووختکردنی ، کـە مایـەی خۆشـحاڵی و دەستخۆشـییە... ئـەویش بـە پەیووەنـدی کردن بەژمارە مۆبایلی/ ٤٥٤٨٠٩٨ یاخوود ئاریافۆنی ژمارە /٦٦٠٢٥٣٣٥٢٢ .

لەگەڵ رێزم بۆ هەڵگری ئەم مێژوونامەیە

عــەلی کــەندی

باشــووری کوردستـان – هــەولێر

١ /٣/٢٠٠٣

خوێنەری بەرێز :- نەخشەی بلاد مابين النهرين - نەخشەیەکی نوێیەو لە دوای ساڵی ١٩٣٢ بۆتە نەخشەی فەرمی دەوڵەتی ئێراق ... کە ناوی ئێراق بەر لە دامەزراندنی نەبووە ، ئەم نەخشەیەش بۆ ئەوەی دامناوە کە تەنیا بۆ زانیاریە لە بارەی ئەو شووێنەوارانەی لە ناو ئەو سنوورە دەست نیشان کراون ، لە بەر ئەوەی هەردوو نەخشەکەی ئەو دوو نەخشەیە و دوای ئەو نەخشەیە دانراون ، ئەو نەخشەیە رەتدەکەنەوە بە پێی مێژووی جووگرافی مێژووی بوونی هەڵکەوتە جووگرافیەکە , کە ئەو کاتە پێی گووتراوە میزۆبۆتامیا .
تایە




ئەم نەخشەیە تەواوی وولاتی نێوان دوو زێیٚ دیار دەکات  بە پێی تێپەر بـــوونی قۆناخە یەك لە دوای یەکەکان بە پێچەوانەی ئەوانەی کە دەنووسن یاخوود بڕوایان وایە  کە ناوی ئێراق یا سووریا یا چەندین جێگەی دیکە بەر لەو مێژووە دادەنێن ، لە بەر  ئەوەی ئەو وولاتانە دوای جەنگی یەکەمی جیهان دامەزراون ، کە نە عەرەب ونە تورك لەو ناوچەیە نەبووەو نەشیان دیووە .

تەنیا لە سەرەتای سەر هەڵدانی وئیسلام و سەرەتای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، کە کورد و هەڵگری بڕوای ئاشووروو ئارامـــی لێ نیشتە جێ بوونە ...

بەڵام کـورد بـەر لـە ٦٠٠ سـاڵ دانیـشتووی وولاتـی نـــێوان دوو زێـیٚ بوونـەو ئیمپراتۆریـەتی میدیاش پایتەختەکەی شاری نەمرود بووە لە ڕۆژهەڵاتی شاری مسلا – مووسڵ – لە وولاتی نێوان دوو زێدا .

**٢٠٠١**



٢٠٠٠/١/١/١ ئـەم ڕۆژە کـە بـە ڕۆژی لـە دایـك بـوونی حـەزرەتی عیـسا درووڎی خوای لە سەر بێ ، سـەرەرای بـیروو بۆچـوونی جیـاواز لـە سـەر ڕۆژی لـە دایـك بـوونی حـەزرەتی عیـسا . بـە هـۆی دواکـەوتوویی کۆمـەڵگاکان و نـەبوونی خووێنـدەوارو ڕۆژنامـەو گۆڤـاری بەرچـاو لـەدیاری کردنـی ڕۆژی ڕووداوەکان، بەشێوەیەکی زانستی و ئەکادیمیانەو نەبوونی ڕۆژنامە بۆ تۆمارکردنی ڕووداوەکان .

کەچی دووانزە قوتابیەکەی حەزرەتی عیسا لەوانە (مەتی و لۆقا) لەدایك بوونی مەسیح لەکاتی دەسەڵاتی شانشین- هیردۆرس- دادەنێن ، کە شانشینی وولاتی جوولەکەکان بوو، ئەویش بەر لە ساڵی سێیەمی زاینی . بـەڵام لـە گـەڵ ئەوەشـدا نیـشانەکانی بـوونی مەسـیح پـشتبەستە بەنامەکانی ، کە ئاراستەی قەدیس پترس کراوە کە مێژووی ساڵی ٦٤ زاینـی لەسـەر بووە بەتایبـەتی پەیووەندیـەکانی نێووان زاناکـانی ئـاینی مەسـیح و یاوەرەکـانی عـەزرەتی مەسـیح ، پـۆلس و پـترۆس و هـەروا یـەعقوب و یۆحنا بـەپێی باری لە دایك بـوونی حەزرەتی عیساو بوونی بەپێغەمبەر لەناو ئاڵۆزترین و نالـەبارترین بارودۆخی ئـەوکات بەتایبـەتی لەنێووان دەسەڵات و کاربەدەستان و زانایانی ئاینی جوولەکەدا .

ئـەویش بـە سـەرهەلدای دووژمنکـاریکردنی مەسـیح و ئـاینی مەسـیح و خۆخزاندنـە نـاو ئـەو ئاینـە نووێیـە ، لـەپێناو شـێوادن و نووسـینەوەی مێژووی هەلە لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ئاینی مەسیح، دوای ئـەوەش سـەرهەڵدانی بیرووبۆچـوونی جیـاواز لـە نێـووان کەنیسەی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئاواو بوونی دوو مەزهەبی لێك جیـاواز ئـەویش مەزهـەبی کاسۆلیك و

پرۆتستانت له جیهان .
رۆژی له دایك بوونی حەزرەتی عیسا بەشێوەیەکی مێژوویی دیار نیه، بەڵام بیری جیاواز هەیه لەو بارەیەوه کەچی (کلمنت ئەسکەندەر) لەساڵی ١٠٠ زاینـی کـه زۆر لـەزاناکان و پرۆفیـسۆرەکان کـه هەنـدێکیان رۆژی لـەدایك بـوونی بـه رۆژی ٣/١١/١٧ی پـێش زایـن دادەنـێن، بـەڵام مەسیحیەکانی رۆژهەڵات بەپێچەوانەوه لەدایك بوونی حەزرەتی مەسیح به رۆژی ١/١/٦ زاینی دادەنێن ... دوای تێپەڕبوونی زیاتر له ١٠٠ ساڵ له بوونی ئاینی مەسیح لەساڵی ٣٥٤ زاینی هەندێ کەنیسەی رۆژئاوا بەتایبـەتی کەنیـسەی رۆمـا ئاهـەنگیان گێـڕا بەبۆنـەی لـەدایك بـوونی حەزرەتی مەسیح له ١/١١/٢٥ی پێش زاینی، بەڵام ئەو مێژووه هەڵەیه که رۆژی کوودەتای زستانیه ، که رۆژی زستان لەو رۆژه بەرەو درێژ بوون دەچێت .

بەڵام بەر لەوه ئاهەنگیان دەگێڕا بەبۆنەی جەژنی (متراس) که لەدایك بوونی رۆژەکه کۆتایه نایەت... بەڵام کەنیسەکانی رۆژهـەڵات دەستگیر بـوون بـەرۆژی ١/٦ تاگەیـشته ئـەو کاتـەی کـه کەنیـسەکانی رۆژهـەڵات رۆژهـەڵاتیش جـەژنی لـه دایـك بـوونی حـەزرەتی عیـسا بکەنـه رۆژی ١/١٢/٢٥ پێش زاین تاکوو رۆژی ١/١/١ زاینی که به گەورەترین جەژنی ئـاینی مەسـیح و جیهـان دادەنرێـت و بـەردەوام بـووه تـاکوو ئـەمرۆو بـەردەوامیش دەبێـت... شـایانی باسـه ئـەمرۆ ئـاینی مەسـیح لـه گەشـەکردن و پەرەسـەندنه ، که ژمـارەی زیـاتره لـه ٢/٥ ملیـارو نیـوو لـه جیهان و کەسانی هەڵگری ئاینەکانی دیکەی جیهان روو له ئاینی مەسیح دەکـەن و رێنمـایی و بیرەکـانی پەسەندەکــــــەن – قـصة الحـضارات– بەرگی شەشەم–(١٢/١١).

١ / ٢/ ٢٠٠١ مەبەستم لـه دانانی ئـەم مێژووه رەتکردنـەوەی چـەند ئامـاژه پێکردنێکـی نووسەری مێژووی مووسڵ – القس سلیمان سائغ الموصلي – بووه ، که دانراوەکـەی بـه نـاوی مێژووی مووسـڵ بووه و لـه سـاڵی ١٩٢٣ بـه چاپ گەیەنراوه له چاپخانەی سەلەفی له میسر ... ! ئەویش:–
جێگەی روونکردنەوەیه که بەرگی یەکەمی له لاپەرەی ٣٩ له خاڵی دووەم

باسـی کـردووە ، کـە شـاری مووسلّ هـیچ کەسـێك داینەمەزراندووە تـەنیا عەرەب نەبێت .

بـەڵام شـاری مووسـڵ بـە پێـی نووسـراوە مێژووییـەکان بـە تایبـەتی نووسەری یۆنانی بەناوبانگی جیهان – کزینفۆن – کە لـەو کاتـەی خـۆی و نزیکەی ١٠,٠٠٠ هەزار چەکدار لە دەڤەرەکانی بەغدای ئێستا بەرەو باکوور دەهات و کە گەیشتە رۆژهەڵاتی زێـی دیجلە هیچ دانیشتووانێك لەو ناوچەیە نەبوو ، واتە مووسڵی دوای فتووحاتی ئیسلامی تەنیاماڵە کوردەکان نەبن کە لە ناو کووخ دەژیان کە زینفۆن دەڵێ :–

کە بەو ناوچەیە تێپەریم تـەنیا ئـەوەم دی کـە بـە دەیـا کـووخ هـەبوون و دانیشتووانەکەی بـە زمـانی کـوردی ئاخاوتنیان دەکـرد و زێـی دیجلـەیان کردبووە سەنگەری بەرگری کردن لە خۆ ، ئەویش لـە ترسـی دووژمنانیان کـە ئەمـەش لـە سـاڵی ٤٢٠ ی بـەر لـە زایین بـووە ... دوای ئـەوە بـە هـۆی هەڵکەوتـەی شـاری مووسـڵ وردە وردە دانیـشتووانی دەڤـەرەکانی دیکـە روویان لەو ناوچەیە کردووە ، بە تایبەتی ئارامیەکان و فارسەکان لەدوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریـەتی میـدیا و شـاری مووسـڵ ، کـە ئێـستا پێـی دەڵـێن مووسـڵ ، نـاوی مووسـڵ نـەبووە بـەڵکوو نـاوی نواردشـێر بـووە ، لەگەڵ چەندین ناوی دیکە وەك مـسبلا ، کە لەلایـەن دانیشتووانەکەی کـە چەندین ناوی دیکەی هەبووە بەپێی تێپەڕبوونی قۆناخەکان .

دوای ئـەوە بـەر لـە فتووحـاتی ئیـسلامی دانیـشتووانی مووسـڵی ئێـستا کـورد و ئـارامی و ئاشـووریەکانی تێـدا نیـشتەجێ بوونـە نـەك عـەرەب ، یاخوود عەرەب شاری مووسڵی ئێستای دایمەزراندبێ یاخوود ئاوەدانی کردۆبێتەوە ... لە بەر ئەوەی نە عەرەب و نـە تـورك لـە پارێزگـای ئێـستای مووسڵ نەبوونە تاکوو دەرکەووتنی ئیسلام و فتووحاتی ئیسلامی ، کـە لـە سـاڵی ٦٤٠ ی زایـینی مووسـڵ لەلایـەن عـەرەب داگیرکـراوە لـە ڕێگـەی فتووحاتی ئیسلامی .

کـە کوردیش لـە رۆژهـەڵاتی زێـی دیجلـە نیشتەجێ بوونـەو بـەر لـە هـەموو نەتەوەیـەك و ئاینێـك ، کـە هـەڵگری بـڕوای ئـاینی زەردەشـتی بوونـەو ئـەم ناوچەیەش لە ژێر دەسەڵاتی میدیا بووە ، کە پایتەختی دەسـەڵاتی میدیا

لە شاری نەمرودی ڕۆژهەڵاتی ئێستای مووسڵ و ئەوکاتی دەسەڵاتی میدیا بووە ... کە عەرەب ئەو کاتە لە دوورگەی بیابانی عەرەب و یەمەنی ئێستا زیاتر تێپەڕ نەبوون و ناوزەندنەبوون لەناوچە جیاجیاکانی دیکە ، تەنیا بازرگانەکان نەبن ، کە بەو ناوچانە تێپەڕدەبوون و ببووە ئامرازێکی پەیوەندی و ناسین لەگەڵ نەتەوەو دانیشتووانەکانی دیکە .

بەڵام لە دوای فتووحاتی ئیسلامی گەیشتنە هەموو جێگایەك لە ڕێگەی بە ئیسلام کردن و داگیرکردن و سووتاندن ، کە عەرەب داگیرکەرەو ئەوەی ئێستا لێی نیشتەجێ بووە خاکی عەرەب نیە لە ئێراقی دوای دامەزراندنی لە ساڵی ١٩٢٠ و نە سووریا و نە میسر و نە فەلەستین و چەندین وڵاتی دیکە ، بەڵکوو لە ڕێگەی فتووحاتی ئیسلامی داگیرکراوە و بە خاوەنداریەتی خۆی و ئوومەی عەرەب و ئوومەی ئیسلامی دادەنێ ، کە ئەویش بە زەبری شمشێر بووە لە ڕێگەی کووشتن و تۆقاندنی و




سووتاندن و تاڵانکردن و ئەنفالکردن...؟ .

ئەم وێنەیە وێنەی پردی کۆنی مووسڵە لە سەر زێی دیجلە کە کورد لە ڕۆژهەڵاتی ئەم زێیەی نیشتەجێ بووە بەر لە هەموو نەتەوەیەك لە کاتی دروستکردنی ئەم پردە دانیشتووانەکەی تەنیا کورد بووەو عەرەب بوونی نەبووە ...؟...!.

نەك لە ڕێگەی لێبووردن و ئاشتی و تێگەیاندن ، کە ئەمەش مێژووی ڕووداوەکان ئەو ڕاستیانە دەسەلمێنن لە هەموو بوارە جیاجیاکان ، لە

ناوچەو کێشووەرەکەدا .

تێبینی :-

ئەمە تەنیا بۆ ڕوونکردنەوە بوو ، هیوادارم کورد بە مێژووی ڕووداوەکاندا بچێتەوەو فێری ببێ ، کە گەل و نیشتیمانەکەی چۆن کەوتۆتە بەر شمشێری ژەهراوی و پێی لەت لەت کراوەو داگیرکراوە ، لە سەرەتای بوونی ئیسلام تاکوو ئەمڕۆ لە هەرێم و ناوچە و جیهان ، بەتایبەتی بەرامبەر بە گەل و خاکی کوردستان لە کێشووەرەکەدا .

٢٠٠١/٣/٢١ مەبەست لەو مێژووە ئەوە نیە کە لەم ڕۆژەدا جەژنی نەورۆز دەستی پێکردبێ یاخوود مێژووی کوردی بێت ... بەلکوو مێژووی کورد لە ٧٠٨/٣/٢١ بەر لە زایین . دەست پێدەکات ، کە دەکاتە بەرامبەر ١/٣/٢١ بەر لە زایین . بەلآم مەبەست لێرەدا جەژنی نەورۆز وچۆنیەتی سەرهەلدانیەتی بەپێی نووسراو وتووێژینەوەکانی تووێژینەرە بیانەیەکانی ئەو کاتە و بە پێی سەرچاوەکان ، کە نووسراون و بەر لەهەمووشیان کتابی پیرۆزی – ئاڤێستا – بەهەموو بەشەکان لەگەڵ دیاریکردنی ڕێنماییەکانی ئاینی زەردەشت و سەرهەلدانیدا .

هەروا – قصة الحضارات – کە دانەرەکەی ویل دیورانتە – هەروا – هکژا تکلم زرداشت –کە نووسەرەکەی – نیشتەیە – کە فەیلەسوفێکی ناوداری جیهانیە ... هەروا لە – قصە الدیانات – کە دانەرەکەی – سلیمان مەزهەرە – هەروا – زرداشت والدیانات الزرداشتیە – کە دانەرەکەی – فارس عوسمان .

ئەمەو چەندین دانراوی دیکە لەلایەن نووسەرو پرۆفیسۆرو تووێژینەری ناوداری جیهانی و کەسایەتی دیکەی ئاینەکانی دیکەی وەك بووزی و جوولەکەو مەسیحی و ئیسلام لە جیهان .




هـەروا زۆر لـە نووسـەرانی ئـەو سـەردەمە بەتایبـەتی لـە عـەرەب و کـوردو فـارس و تـورك و نەتـەوەکانی دیکـەی ناوچـەو هەرێمـە نزیکـەکان لـە کیشوەری ئاسـیا کـە جـەژنی نـەورۆزو بـوونی نـەورۆز هـی کـورد نیـە و بـەڵکوو هـی چەندین نەتـەوەی دیکەیـە ... بەتایبـەتی لەلایـەن نووسـەرو کەسایەتی ئایینی ئیسلام کە بە جەژنیشی دانانێت و مەراسیمی جەژنی نـەورۆزیش بـەلا شـەرعی دادەنێـت لـە جیهانـدا ... کـە تـەنیا جەژنـەکانی ئاینی ئیسلام بەجەژن دانانێن وەك جەژنی – قوربـان و رەمـەزان و جـەژنی لەدایك بوونی پێغەمبەری ئیسلام – محەمەد – درودی خوای لەسەربێت .

لەلایــەکی دیکــە جــەژنی نــەورۆز وەك – چــیرۆکێك یــاخوود وەك پەخشانەیەك ناوزەند دەکەن ، کە گوایە پاشایەك هەبووە بە نـاوی زوحـاك ، کـە دوو مـار یـاخوود ئـەژدیهای لـە سـەر شـان بـووە و هـەموو رۆژێـك خـووێنی مرۆڤێکـی بـۆ کراوەتـەو بۆتـە خـواردنی رۆژانـەی ، تـاکوو ئـەو رۆژەی کە پیاوێك بە ناوی کاوەی ئاسنگەر بۆتـە هۆکـاری کووشـتنی ئـەو پاشایەو مارەکانی یاخوود ئەژدیهاکانی سەر شانی ، و دانیشتووانی لـەم کارەسات و مەینەتە رزگارکردووە .

پێنووسی زۆر لە نووسەرە هەمە لایەنەکانی ئیـسلام ... کـە زەردەشـت و ئاینی زەرادەشتی بەئاگر پەرست دادەنێن و دژ بەخواو رێنماکانی خوا بۆ

مرۆڤایەتی دادەنێن .
من نامەویٚ باسەکە بە درێژی بخەمە ناو کتێبی مێژوونامەکە... لە بەر ئەوەی گەر لە سەر زەردەشت و ئاینی زەردەشتی و چۆنیەتی ئەو ئاینە بنووسین ، بیٚ گومان کتێبێکی ٥٠٠ لاپەرەی پێویستە لەبەر راستی و دروستی سەرهەڵدانی ئەو ئاینەو خوودی زەردەشت خۆی لە سەر خاکی کوردستان و کێشوەرەکەدا .
گەر بە ووردی بچیتە بنچ و بناوانی ئەم ئاینەو چۆنیەتی کەووتنە سەر رووی زەوی لە سەردەمێکی کە سەرهەڵدانی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەت لەباو بووە ، نەك وەك ئێستا لە وولاتی بچووك و گەوورەو بەتوانا و بیٚ توانا ... گەر نووسەر یاخوود تووێژێنەر بیروو بۆچوونی خۆی لەگەڵ بیروو بۆچوونی نووسەرو تووێژێنەرو پرۆفیسۆرو فەیلە سوفەکانی بەر لە خۆی شیٚ نەکاتەوە ئەوە پێی ناگوتریٚ نووسەر.
لە بەر ئەوەی زۆر لە نووسران هەن کە خاوەنی بەدەیان دنراون ... بەلام تەنیا ووتەی دانەرەکانی بەرلە خۆیان گوواستۆتەوە ناو دانراوەکانی خۆیان بۆ ئەو سەردەمەی کە خۆی تیای دەژی و بە ئاگادارکردنەوەی خووێنەرو نووسەرانی دیکەدا .
ئەمەش لە بازنەیەکی تەسك دەخوولێتەوە ... کەچی نووسەردەبیٚ بیروو بۆچوون و هەڵوویستی خۆی هەبیٚ لە نووسین ، یاخوود لەو بوارەی کە خۆی بۆماندوو دەکات . جا لە بواری نەتەوەیی بیٚ ، یاخوود لەبواری نیشتمانی بیٚ ، یاخوود لە بوارەکانی زمان و مێژوو و کەلتوورو داب ونەریت و شارستانیەت شووێنەوار بێت.
جا مەبەستی من ئەوە نیە کە بە شێووەیەکی نادروست بۆ ئەو کارانە بچم بەڵکوو هەڵوویستی من ئەوەیە ، کە نووسەر دەبیٚ پێنووسەکەی بەراستی بنووسیت ، گەر نووسەرێکی راستگۆ و خاوەن ویژدانێکی مرۆڤانە بێت نەك نووسەری ئیمپراتۆرێك ، یاخوود نووسەری پاشایەك ، یاخوود بنەماڵەیەك یاخوود پارتێك و گرووپێك بێت...؟.
هەتا لە بوارەکانی دیکەی نەتەوییی و نیشتمانی و زمان و مێژوو و کەلتوورو داب و نەریت و شارستانیەت .

گــەر نووســـەرەکە ڕووســی بێــت نــابێ تــەنیا نووســـەری ڕووســەکان و نیشتمانی نەتەوەکەی بێت ، لە پێناو بەهێزکردنی ئامانجەکانی خۆی ، بــەڵکوو دەبــێ ئــەو نووســـەرە دادپــەروەری بخاتــە ســـەر لاپـــەرەی نووسینەکانی نەك پێنووسەکەی گوولە بێت و دەستی چەکەکە بێت و بەسنگی بەرامبەری وەبنێ...!.

بە پێـی ئـەو ئـەو زانیاریانـەی کـە لـە مـاوەی نووسـینکانم فێـری بوومـە لەهــەموو سەرچــاوەکانی بیـانی و عــەرەبی و کـوردی ، گەیـشتمە ئــەو بروایەی کە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنی جەژنی نەورۆز ڕۆژی لەدایك بوونی _زرئوشترای کوری بورشاسپا _ یە و کە دایکی ناوی – دگدوڤا – یە .



هەروا لە هۆزی – هژستیان – ە ، کە لە پارێزگای ئورمێ لە ڕۆژهـەلاتی کوردســـتان لــەدایك بــووە ...بــەلام نازنــاوی – زەردشـــت – نازنـــاوی ئایینەکەیــەو کتابــە پیرۆزەکەشــی بــەناوی – ئاڤێستایە – . وەك کتابــە پیروزەکانی دیکە – زەبوور – تەورات – ئینجیل – قورئان...کە یـەکیان بووە ... زەردەشت ئەو کاتەی کە لە دایك دەبێ ، جیا لـە هـەموو منداڵی سـەر گـۆی زەوی بە پێـی مێـژوو، پێکە نیووە ...نـەك وەکوو منداڵـەکانی دیکە گریابێت .

.هـەروا جیـا لـە هـەموو پێغەمبـەرەکانی دیکـە ، زەردەشـت خووێنـدەوار بووەو ماوەی حەوت ساڵ لەلایەن مامۆستاکەی – برزین کردی – فیری

خووندن کراوە لە هەموو بوارەکانی پزیشك و کشتووکاڵ و کۆمەڵایەتی و پیـشەسازی...کەچـی نەموسـاو نەعیـساو نـە محەمـەدی پێغەمبـەری ئیـسلام درودی خوایـان لــە سـەر بێـت خووێنـدەواریان نەبووە...!.



واتـە ئـەو ئـاگرەی کـە باڵی بـە سـەر گوندەکـە کێشاو رووناکی کەوتـە ناوچـەکەو ئاگـادار بوونـەوە بـە لـە دایـك بوونی ئـەو منداڵـەی کە لەلایەن دانیشتووانی ناوچەکە چاوەروان دەکرا .

واتـە ئـەم بڵێسە ئـاگرە مانـای مـوژدەی خۆشـی و سـەرکەووتن و نـوێ بوونەوەو تەواوکەری ئەویدیکەیە ، بە پێی پەرەسـەندن و پێشکەووتن و گەبشەکردنی قۆناخە یەك لەدوای یەکەکان.

بۆ سـەلماندنی ئەو راستیەش ... زەردەشـت لـە سـەدەی حـەوتی بەر لـە زایـن لـەدایك بـووە ، واتـە لـە سـاڵی ٧٠٠ ی بەر لە زایین و لـە رێکـەوتی ٣/٢١ ... بـەلام زۆر لـە سەرچـاوەکان لـە دایـك بـوونی زەردەشـت بـە ٦٢٨/٥/٣٠ دادەنـێن ... کەچـی لـەدایك بـوونی لـە رۆژی ٩/ئـازەر – لـە مـانگی – مردازمـا بـووە – کـە لـە ئاڤێـستادا هـاتووە بـە پێـی رۆژمێـری زەردەشت لەو کاتدا .

ئەو شەوەی کە زەردەشت لە دایك بووە ، بڵێسەی ئاگر باڵی بە سەر ئـەو گونـدەدا کێشاوە کـە زردەشـت لێـی لـەدایك بـووەو هـەموو دانیـشتووانی گوندەکە هەڵاتوون و گوندەکەیان جێ هێشتووە .

بــەلام دوای بــە سەرچــوونی شــەوو هــاتنی رۆژ دانیــشتووانەکە

ئاگادارکراوەتەوە ، کە ئەو منداڵەی چاوەروانی دەکرا لە دایك بووە ، لە هەمان کات رزگاربوون بووە لە قۆناخێك بۆ قۆناخێکی دیکە ... زەردەشت یەکەم نووێنەر ، یاخوود پێغەمبەر بووە . کە بروای بە تەنیایی یەك خوا هەبووە بەر لە موسا و عیسا و محەمەد – د.خ – ... گەر چیرۆکی لە دایك بوونی موساو عیساو محەمەد راست بێ .

ئەوا چیرۆکی لەدایك بوونی زەردەشت زۆر زۆر راسترە ...؟. لە بەر ئەوەی رێنمایەکانی ئایینی زەردەشت راستی ئەوە دەسەلمێنن ... بەجێ بەجێکردنی مەراسیمی ئاینی زەردەشتی لە کێشووەرەکەو جیهاندا .

ئەمە لەلایەك لەلایەکی دیکەوە ... ئەو نەتەوەو هەڵگری بروا جیاجیاکانی ئەو کات و تاکوو ئێستاش ، جەژنی نەورۆز لەو کات و تاکوو ئێستاش جەژنی نەورۆز بەجەژنی خۆیان دەزانن و جگە لەکوردو فارس و نەتەوەکانی دیکەی وولاتەکانی وەك ، ئەفگانستان و پاکستان و جۆرجیا و تورکمانستان و هندستان و وولاتانی بەلکان و هەتا وولاتانی عەرەبی ئێستا ئاهەنگ بۆ ئەو جەژنە مەزنە دەگێرن .

گەرباس لەجەژنەکانی ئاینی ئیسلام بکەین ... کە جەژنی قوربان جەژنی نەك بە تەنیا ئاینی ئیسلامە ، بەلکوو جەژنی هەموو ئاینەکانە لەبەر ئەوەی ئەو جەژنە لە لایەن ئیبراهیم خەلیل کراوەتە جەژن ... نەك لەلایەن ئاینی ئیسلام ... جەژنەکانی دیکەشی ... !.

جا من زۆر بە کورتی باسی جەژنی نەورۆز و سەرهەڵدانیم کردووە ... بۆ زانیاری زیاتر بگەرێنەوە سەر کتێبەکانی ... قصة الحضارات ٢/١ ... قصة الديانات ... زرادشت و الديانة الزرادشتية ... هكذا تكلم زرادشت ... کە بە رونتر بۆتان روون دەبێتەوە

**٠٠٦٨**

٦/٢٩/ ٠٠٦٨ لە دوای گەران بە بڵاوو کردنەوەی ئاینی مەسیح و بەربەرەکانی کردنیان لە لایەن ئاینی جوولەکە ، لە پێناو رازی کردنی جوولەکەکان ئیمپراتۆر – هیرۆن ، کە قدیس پترۆس و قەدیس پۆلس – ی دستگیرکردوو هەردووکیانی سەربری .

٠٠٧٠

٠٠٧٠/١/١ لێك جیابوونەوەی هەردووئایینی لێك جیاواز ، ئاینی مەسیحی لە ئایینی جوولەکە بەشێوەیەکی فەرمی و بەرچاوو ، کە هەریەك بە پێی کتابە پیرۆزەکانی خۆیان ئایینەکانیان دەبرد بەرێوە سەرەرای دژایەتی و دووژمنکاری کردنی یەکتری. کە بەر لەو مێژووش لە نێووانیاندا هەر هەبووە لە گەڵ گەلانی دیکە لە ناوچەو هەرێمەکان و جیهان .

٠٠٧١

٠٠٧١/١/١ نووسینەوەی کتابی ئینجیلی مەرقەس ، کە ئەم کەسایەتیە یەکێك بووە لە دەستە راستەکانی حەزرەتی عیساو قوتابیەکان ، بە گەیاندنی پەیامی ئایینی مەسیحی لەو کات بە گەلانی هەرێمە جیاجیاکانی قوودس و دەوورووبەری و بەرەو وڵاتانی دیکە لە جیهان.

٠٠٩٠

٠٠٩٠/١/١ کارەکانی حەزرەتی عیسا بە شێووەیەکی رێك وپێك لەم رۆژەدا نووسراوەتەوە بەپێی بنەماکان لە هەموو بوارە جیاجیاکانی پەیوەندی و ژیانی گەلانی سەر زەوی.

٠١٠٠

٠١٠٠/١/١ نووسینەوەی ئینجیلی یۆحنا ، کە ئەم کە سایەتیە یەکێك بووە لە دەستە راستەکانی حەزرەتی عیساو قوتابیەکانی بەگەیاندنی پەیامی ئایینی مەسیحی بە گەلانی هەرێمەکان و قوودس و دەوورووبەرو بەرەو جیهان... لە هەمان کات بینین و بیروو بۆچوونەکانی یۆحەنا نووسراوەتەوە بەپێی رێنمایی و ئامۆژگارییەکانی حەزرەتی عیسا.

٠١٢١

٠١٢١/٤/٢٦ لە دایك بوونی ئیمپراتۆری رۆمانی و فەیلەسوف – مارکس ئۆرلیۆس – لە بنماڵەیەکی دیارو بە ناوبانگ...لە دوای مردنی ئیمپراتۆر

ئەنتۆپینۆس لە ساڵی ١٦١ ، ماركس بووە ئیمپراتۆر لە سەر رۆمانیا ، كە ئیمپراتۆرێكی لێهاتوو لە سەرخۆ بووەو هەردەم هیواكانی ئاسوودەیی و بەیەكەوە ژیانی بە ئاشتیانە بووە لەو كاتەدا . ئەم ئیمپراتۆرە لە دەسەڵات بەردەوام بوو تاكوو لە ١٨٠/٣/١٧ كۆچی دوایی كرد .

هەروا لە ماوەی دەسەڵاتی لە ناو گێژاوی شەڕو سەركەووتن و هەڵاتن هاتووە بەهۆی فراوانكردنی دەسەڵات و داگیركردن ، لە نێوان ئیمپراتۆرەكانی ئەو سەردەمەدا ، بەتایبەتی لەدوای پەیدابوونی ئاینی مەسیح و هەنگاونان بەرەو ئەورووپا.

## ٠٢١٦



٠٢١٦/٤/١٤ رۆژی لە دایك بوونی رابەرو دامەزرێنەری ئاینی مانی – مانی كوڕی فاتك– لە گوندی – مەردینۆ – لە سەر كەناری چەپی رووباری دیجلە لە باكووری كوردستان ، كە دایكی ناوی (مریەم) بووەو لەنژاد كوردەو باوكی لە ناوچەی پارێزگای ورمێ لە رۆژهەڵاتی كوردستان بەرەوشاۆچكەی بەدرە هاتووە بە هۆی ئازاردان ، كە هەڵگری ئاینی زەردەشتی بوونە .

... شایانی باسە عەرەبە شۆڤێنیەكان ناوزەندیان كردووە بە مانی بابلی... یاخوود مەدائن واتە –سەلمان بەگ– كە قەزایەكە لە رۆژهەڵاتی شاری بەغدا بە دووری ١٥ كیلۆمەتر ، كە ئەمەش راستی تیا نیە بەهیچ جۆرێك ، چونكە ئەو كاتە عەرەب نە لە ناوچەی مەدائن بوونە گەر

هەشبووبن مەر لەووەرێن و حووشترەوان بوونە نەك بەشێووەی نیشتەجێ بوون ؛.

ئەویش بـەهۆی فتووحـاتی ئیسلامی بـووەو لـە هـەمان کـات عـەرەب لـە ناوچەی دەووروبەری بەدرەو جەسانیش نەبوونە، هەتا لـە پایزگاکانی ئێستای دیالەو کووت و عیمارەش ، چونکە ئەو پاریزگایانە لەسەرەتای سـەدەی هـەژدەم بـەرەو بـوون بـە شـار دورسـتکراون . بـە یارمـەتی بەرپرسانی عەرەبەکانی ریزی دەسەلات و سووپای عوسمانی .

شـایانی باسـە هەنـدێ سەرچـاوە لـە دایـك بـوونی مـانی بـە ۲٤۲/۳/۱۹دادەنێن، بەلام لەچەندین سەرچاوە بە۱٤/٤/ی دادەنێن ، بەلای منیش ۲۱٦/٤/۱٤ راستە بەپێی چەندین سەرچاوە.

## ۰۳۱۳

۰۳۱۳/٤/۱ دەرچـوونی مەرسـوومی هیلانـۆ بەپێـدانی ئـازادی بـیرووڕای ئـایینی مەسیحی لەگەڵ شانشین قستەنیتنی رۆما لە لایەن دەسەلاتی کەنیسەی بالای مەسیحەکان

## ۰۳۲۰



۰۳۲۰/۹/۱٤ قەدیس هیلانـە کـە دایکـــــــــــی- قـستەنتین- بـووەو ئافرەتێکی نـاودارو لێووەشـاوە بـووە ، بـــەهۆی بـــەهێزی بـــیری ئـــایینی مەسـیح، داوای لـە کوڕەکەی کرد . کە ئاینی مەسیح بلاووکەنـەوە لەگـەڵ دۆزینـەوەی خاچـی پـیرۆزی مەسـیح ، دوایی سێ خاچیان دۆزیەوە کە ئەو سێ خاچەیان لە دوای یەکتر ریز کـردوو هەریـەك لـە خاچـەکانیان دەخـستە سـەر جەسـتەی ئـافرتێکی

نـەخۆش ، كـە خاچـی سـێیەم بـووە هۆكـاری چـاكردنەوەی ئافرەتـە نەخۆشـەكە ، كە ئەو خاچە جێگەی بزمارو خوێنی جەستەی عیسای پێـووە دیـار بـوو ، كـە لـەو رۆژە خاچـی راسـتەقینەی دەسـتی حـەزرەتی مەسیح دۆزرایەوە.

**٠٣٣٠**

٠٣٣٠/٥/١١ تـەوواو بـوونی دورسـتكردنی شـاری قووسـتەنتینیە -ئەسـتەمبوڵی- توركیـای ئێـستا لەلایـەن ئیمپراتۆریـەتی بیزەنتیـەكان بـە نـاوی رۆمـانی نـوێ ، كـە ئـەو كـات ٠٠٠ر٦٠هـەزار پـاوەنی زێـری لێ خـەرج كرابـوو، كـە ماوەی شەش سـاڵ بەردەوام بوونی لەكار كردن تاكووئەو شـارە تـەواو بـوو ، بەكردنـەوەی كـە ئـەویش بـە دورسـت كردنـی ١٤ گـەرەك ، كـە دووانیـان لـە دەرەوەی پەرژینەكـە بوونـە ، ئاهـەنگ گێـران بـەم بۆنـە ٤٠ رۆژی خایاندلە شارەكەدا .

**٠٣٤١**

٠٣٤١/٤/١٧ كۆبوونەوەی شاری نیقیا لە پێناو یەكگرتنەوەی بڕوابە یـەكتر بـــوون ، بـەڵام تیرۆركردنـی سـەرۆكی كەنـسەی ئاشـووری بـەتریك مـارشموون ، بەگوللـەی شـای فـارس . كـە گـرنگترین بڕیارەكـانی كۆبوونـەوەی نیقیـا یاسای بڕوابوون بوون ، كە كەنیسەی ئاشووری رەزامەنـدەی لەسـەركرد . بێ ئەوەی بەشداری لە كۆبوونەوەكە بكات بەهۆی بارو دۆخەكە.

**٠٢٤٢**

٠٢٤٢/٣/٢١ لــە رێــورەسمی تــاجگوزاری شــاپووری كــوری ئەدەشــێردا - مــانی - ووتـارێكی خووێندۆتـەوە و شـاپوری یەكـەمی ئیمپراتـۆری ساسـانی بـۆ هەڵگری بڕوای ئاینەكەی بانگ هێشت كردووە .

ئەمەش لە دوای گەرانەوەی بوو كە لە گەشتەكەی بۆ هندستان لـە سـاڵی ٢٤١ بووە ... هەڵبژاردنی ناوی - مانی - یانی - نەمر - كە لە خێزانێكی فەرمانرەوا بووە . لە دوای چەندین ساڵ لە خەباتی رامیاری و سەربازی و ژیانی دوونیایی دیاردەیەكی ئاسایی بووە ، كە ناوی كورەكەی بە ناوی

مانی بێت لە ناو بنەماڵەکەیدا .

هەوڵەکانی مانی لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی و بانگ هێشت کردنی خەڵك بووە کە لە ساڵی ٢٤١ دەستی پێکردووە ، ئەویش لە سەردەمی دەسەڵاتداریەتی ئەردەشێر ، کە ئەو کات بارو دۆخەکەی لە بار بووە لە پێناو گەیشتنی بە ئاواتەکانی . هەرچەند زۆر بە کزی و لاوازی هەنگاوی ناوە لەسەرەتادا لە ناوچەکە بەتایبەتی لە کوردستان .



لەبەر ئەوە مانی لە گەشتەکەیدا بۆ گوند نشینە کوردیەکان لە بەهاری ٢٤٢ سەردانی شاری هەولێری کردووەو ماوەی سێ رۆژ لێی ماوەتەوەو دوای ئەوە سەردانی – روها – ونەسیبینی – ی کردووە .

دوای ئەوە لە ساڵی ٢٥٢ لە لایەن شاپوورەوە لە – مانی – دراو ئاینەکەی قەدەخەکرا ... ناوچە کورد نشینەکان بە تایبەتی لاپالی چیاکانی کوردستان بوونە یەکەمین وێستەگەی داڵدەدانی– مانی – و دەربازکردنی لەدەست بەرپرسانی ساسانی ، چونکە ئەو پاش ئەو رووداوە بەر لەوەی بگاتە ناوچەکانی خۆرهەلاتی ئیمپراتۆریەتی ساسانیەکان بەرەو کێشوەرو وولاتی هندستان هەلات.

شایانی باسکردنە کە – مانی – چەندین کتێب و نامیلکەی بەرهەم هێناوە کە ئەمەش لە پێناو دلخۆشکەری خەڵك بووە بۆ پەیامەکەی .

دیارە مانی ئەو راستیەی دەزانی کە بەر لەو ئاینەکانی –جوولەکە – تەورات – و – زەردەشتی و ئاڤێستا – و –بوزی – دامابادا – و –

مەسیحی و ئینجیل – یان هەبوونە ... ئەو بە ووردی ئاشنای ناوەرۆکی ئەوانە و بنەماکانی بووە ... بۆیە تەوراتی بەستەمکاری پەروەردگار زانی – بەلام ئاڤێستاو ئینجیلی پەسندکردووە و دامایادایشی قبوولکردووە و بەو هۆیە فێری تیۆری دۆنادۆن بووە ... لەگەڵ چەندین بیروو بۆچوونی دیکە .

لە ٢٤٤/١/١٤ هەڵگیرسانی شەڕە بەناوبانگەکەی هورمزدەگانی لە هەرێمی خۆزستانی وولاتی فارس ، کە ئەو کات روویدا لە نێوان هەردوو سەرکردەی بەناوبانگ – ئەردەشێری – و – ئەردەوانی ئەشکانی – کە لە ئەنجامی کۆتایی شەڕەکەدا ئەردەوانی دەبەزێ و زنجیرەی ئەشکانیەکان بە تەواوی لە ناودەچێت لە هەرێمەکەدا .

## ٠٢٦٩



٤/ ٢/ ٠٢٦٩ ئەم رۆژە رۆژی دەست پێکردنی ڤالانتاینەو خۆشەویستی و راستگۆیی دووپاتدەکرێتەوە... گوولی سوور بۆتە هێمایەك بۆ ئاشقان . چونکە رەنگی سوور گەر کاڵیش بێتەوە رەنگەکەی وون ناکات. جێگەی ئاماژەپێکردنە کە مالمێکی قەیسەری رۆم هەبوو ، دەیگوت نابێ سەرباز هاوسەرگیری بکات ... هەروا قەشەیەکیش هەبووە ناوی – ڤالانتایین – بوو کە بەدزیەوە کچ و کوری لەیەك مارەدەکرد ... دوای ئەوەی کەزانیان ، قەشەیان خستە زیندانەوە و بریاری لە سێدارەدانیان بەسەردا سەپاند .

کەچی قەشەکە خۆی لەبەندیخانەدا ئاشق بوو بە کچە پاسەوانەکەی ... لەو ڕۆژەی کە بردیان بۆ لە سێدارەدانی نامەیەکی بەدەستەوە بوو ، کە یەك دێـری لـێ نووسـرابوو ئـەم دێـرەش نووسـرابوو – خۆشـم دەوێیـت – سـەرەنجام لـەرۆژی ٢/١٤ لەسـێدارەدراو ئـەم رۆژە بـووە رۆژی ئاشـقان لەجیهانـدا . ئـیتر هـەر وولات و هـەر نەتەوەیـەك لـەم جیهانـە بەشـێوەو شـێوازی تایبـەتی و گـشتی خـۆی کـوران و کـچانیان ئـەم یـادە لەیـەکتر پیرۆزدەکەن .

گەلی کوردیش ئەم یادە بەسێوو ، یاخوود بە مێخەك لەیەکتر پیرۆزدەکەن ... بەڵام بەداخەوە کۆمەڵگای کوردەواری نەگەیشتۆتە ئاستێك کە بنەماو ڕێنماییـەکانی خۆشەویـستی بەئـەنجام بگەیـەنێ ، جـا چ لـەنێوان دوو خۆشەویـستی هـەردوو ڕەگـەزبێت ، یـاخوود لـە نێـوان هـەردوو هاوسەرەکەبێت ، یاخوود لە نێوان بنەماڵەو هاوڕێیەتی و دراوسێیەتی بێت ... کە لە ئەنجامیشدا دەبێ بگاتە ئەو ئاستەی کە کۆمەڵگای کورد لەو پەری خێرو خۆشی و پەیوەندیـەکی هاوسـەردەمیانە بێـت شان بەشانی کۆمەڵگاکانی دیکەی جیهاندا .

هەروا لە لایەکی دیکەدا ، لە کۆتایی سەدەی سێیەمی زاینیدا قەشەیەکی دڵ کراوە بـەناوی ڤانتـالاین لەیـەکێ لەهەرێمـەکانی ئیتالیـا ژیـانی بەسـەر دەبردوو داوای لە دانیشتووانەکە دەکرد بۆ نوێژکردن و ڕاستگۆیی و پەنا بردن بۆ خۆشەویستی , هانی گەنجەکانی لە کورو کچ دەدا بۆ هاوسەرێتی , ئـەویش تـورەیی کلودیۆسـی ئیمپراتیـۆر وای مەزنـدە دەکـرد کـە ژن و مێردەکان توانای ئەوەیان نیە ببن بەسەربازێکی بەهێز .

بە بۆچوونی ئەو هاوسەربوون گەنجانی خەمسارد دەکردو وایان لێدێت کە هەمیشە لەتەك ژن و منداڵەکانیان دابن . کە ئەمەش لەسەر قارەمانیەتی بوو , وەك کەسێکی ستەم کار کە هەمیشە بڕوای بە خوێن ڕشتن هەبوو ... ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـە بڕیـاری قەدەغـەکردنی هاوسـەرگیری لـە هەرێمەکاندا و لەژێر باڵی تاریکیدا.

ڤالانتـاین ئـەو قەشـە دڵ نورانیـە بـوو کـە لـەنێوو ئەوشـکەوتدا ڕێـورەسمی هاوسـەرگیری کـچان و کـورانی سـازدەکرد . ئەمـەش لـە ناوەنـدەکانی کێـشە

دیارو نادیارەکانی ژێردەسەڵاتی ئیمپراتۆر بەردەوام بوون ، تاکوو بووە هێمای خۆشەویستی و دەربرینی بیروو بۆچوونی راگۆڕینەوە بە دەیان رێگەی گوجاو لە پێناو خۆشەویستی و پێکە وەنانی هاوسەرێتی و خێزان .

### ٠٢٧٧

٠٢٧٧/١/٣١ بە فەرمانی شاهانەو پشتگیری و هاندانی موگەکان و لە سەر بنەمای ئاینی زەردەشتی ، لە سەر رێنمایی کرتیرمانی زیندانی کرا ... لە ماوەی زیندانیەکەی بەهۆی ئازاردان و ئەشکەنجەدان گیانی لە دەست داو کۆتایی بەژیانی مانی هێندرا .

ئەو بریارەی بە سەر – مانی – دا ، درا لای – مەردیسنا – بە تاوانی – یاخی بوو لادەر لە ئایین – ناسرابوو – کە سزاکەی بریاردان بوو بە مەرگ . ئەو سزا سەختەش بەسەر رابەری مانیزم مەترسی گەورەی زەردەشتیەکان بوو لەسەرکەووتنی ئەو ئاینە ... هەر بۆیە دوای کووشتنی مانی و مردنەکەشی زۆر کاریگەر بوو ... کە کاتێک بەفەرمانی ئەو دەسەڵاتدارە پارچە پارچە کرا و پێستەکەشیان سووتاند تا بەتەواوی لە مردنەکەی دڵنیا بن .

دوای ئەوە جەستەکەیان و خۆڵەمێشەکەیان کۆکردەوەو لە شاری – تەیسەفۆن – بەخاکیان سپارد .

بەم جۆرە کۆتایی بەژیانی هات ، کە لە ماوەی ٦١ ساڵدا کە ٣٦ ساڵ بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکرد ، لەو کاتەی لە ململانێی سەردەمی ئایین و بیروباوەری لەو پەری دژواریدا بوو لە جیهاندا .

سەرچاوە:– خسرو مزدك .ل/٥١ – زرين كۆب – تأريخ مردم ئيران./٤٧٣ .

### ٠٣٥٤

٠٣٥٤/١١/١٣ لە دایك بوونی لاهوتی و فەیلەسوف مەسیحی ناوداری جیهان – ئاریلیس ئۆگستین – لە بازاری بوکان لە رۆژهەلاتی جەزائر ... شایانی باسە ئەم فەیلەسوفە بە باوکی کەنیسەی کاسۆلیك ناسراوە .

بە هۆی بەرگری کردن لەبیری ئاینی و داهاتووی لە پەرەسەندن و پێشکەوتنی ... باوکی ناوی – وسنی – بووەو دایکی ناوی – مونکا – لەئایین مەسیحی بوونە .

لەو کاتەش باشووری ئەفریکیا وویلایەتێك بوو لە رۆمانیا ... ئۆگستین یەکەم بەرهەمی لە ساڵی ٣٩٦ بڵاوکردەوە بە ناوی – فی مختلف المسائل – هەروا کتابە بەناوبانگەکەی بەناوی – الأعترافات – لە ساڵی ٤٠١ بڵاوکردەوە . لەگەڵ شەش کتابی دیکە لەچەندین بوارداو بەردەوام بووە لە کارەکانی بە گەران لەووڵاتانی جیهان ، تاکوو لە ٤٣٠/٨/١٤ لە شاری بونەی رۆژئاوای توونس کۆچی دوایی کردووە لە ووڵاتەکەدا .

## ٠٤١٠

٠٤١٠/٩/١ شاری باتنە کە دەکەوێتە نزیك کە ناری زێی فوورات لە باکووری کوردستان ، کە بازاڕێکی گەورەی تیابوو . لە هەموو کەلوپەلێکی ئەو کاتی بازرگانیدا ، کە بازرگانەکانی چین و هیند روویان تێ دەکرد... هەموو ساڵێك لەم رۆژەدا شارەکە کراوە بووە بۆ کارەکانی بازرگانی لەگەڵ دەولەتی فارسی بە پێی بریاری ئیمپراتۆرەکانی –هۆنۆریۆس و تیۆدۆرسی– بچووك ، کە شاری نەسیبین لە رۆژهەلات لە سەر کەناری زێی دیجلەو کالینرك بووە، لەرۆژئاواو لە سەر کەناری زێی فوورات و ئرتکزانا لە هەرێمی ئەرمینیە بووە لەرووی لای باکوور.

هەروا شارەکانی نسیبین و سنجار لە باشووری کوردستان لەو رۆژە چۆڵ کرابوون ، لە دانیشتووان بەهۆی رەزامەندی شای فارس بۆ رۆمانەکان بەپێی رێکەووتننامەی ئاشتی مۆرکراو لە ساڵی ٣٦٣ لە نێووانیاندا .

## ٠٤٢٠

٠٤٢٠/١/١٧ بە ناوبانگترین پاشای ساسانیەکان – یەزدگرد – کۆچی دوایی دەکات ، کە بەرامبەر بە کوردو خاکی کوردستان لە ئازاردان و وێرانکردن بێ وێنە بووە... ساسانیەکان واتە ئیمپراتۆریەتی فارس ، کە ناوبراوە لەلایەن دانیشتووانی ووڵاتی فارس بە پاشایەکی تاوانبار ناوزەندکرا بوو بەلام لەلایەنی هەڵگری ئایینی مەسیحی بە پیاو چاك ناوزەندکرابوو ...ئەمەش لە پێناو بەهێزکردنی دەسەلاتی لە ناوچە و هەرێمەکەدا .




بوونی عەرەب لەو ناوچانەی کە لەو نەخشەیە دیاری کراوە بەر لە ئیسلام . واتە بوونی عەرەب و تورك لە وولاتی نێوان دووزێیّ و لە ئێستای ئێراق و سووریا و کەنداو بوونیان نەبووە ....!

**٠٤٣١**

٠٤٣١/٦/٢٢ هەڵوویستی ئاشووریەکان بەرامبەر بە ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی وابوو ، کە دەسـەڵاتی بێزەنتیـەکان سەرچاوەی چەووسـاندنـەوەی هـەموو گـەلانی ژێـر دەسـتـەکانیان بـوون ، لـە بووارەکـانـی ئـابووری و نەتـەوەیی و کۆمەڵایـەتی . بـەڵکوو لـە رووی ئـاینی بـوو بـە هـۆی بێـزاری کەنیـسەی ئەرسۆزکسیەی بێزەنتیـەکان ، کـە کەسـایەتی نـاوداری ئـەوکات (ئەسـتـوورەدان پێنـەر) ی یەکـەمی ئـەو چەووسـاندنەوەیە بـوو . لـە نـاو دانیـشتووانی ناوچـەی مەرعەش و کە راهیبەی دێری ناووخۆیی بوو لە باکووری کوردستان.

دوای ئـەوە بـووە بـەتریرك لـە شـاری قووسـتـەنتینیەو بیروو بۆچـوونی دوولایەنـەی گرتبـووە بـەر لـە بڵاووکردنـەوەی رێنماییـەکانی ئـاییـنی کـە دەیگـووت، حـەزرەتی مەسـیح خوایـەو ، مرۆڤیـشە لەهـەمان کـات نـەك هەرخوایـە ، کـە مەزهـەبی ئـاینی مەسـیحی ئـەوکات وابـوو ... هـەروا دەیگووت مریەمەی عەزرا دایکی خوا نیە بەڵکوو دایکی مەسیحە.

لـە سـەر ئـەو بریـارو رێنمـایی و بـیروو بۆچـوونانە – نەسـتـووره– سـزادرا

لەلایەن لایەنگرەکانی بەتایبەتی لە وولاتی میدیای ئەو کاتو شامی ئێستای سووریاو وولاتی نێووان دوو زێێ ، ئەستووره لە پلەو پایەکەی هێنرا خووارەوە و لێی وەرگیراوە، دوای ئەوە دوور خراوە بۆ هەرێمی لیبیای ئێستاو دوای بەرەو ولاتی میسر ، دووای ئەوە ئیمپراتۆری بێزەنتی-میوودوسی- دووەم بریاریدا بە سووتاندنی هەموو نووسراو و دانراوەکانی (ئەستوورەی) دا. بەلام هەندێ دەست نووسی مایەوە لە کۆگای ئەدیرەی ئاشووریەکان.

## ٤٤٦ـ

٤٤٦/٧/١٥ـ دادووەری رامیاری دەسەلاتی فارس لە شاری کەرکوك – یەزدجەرد- لە دوای گەڕانەوەی ، کە گەیشتە شاری کەرکوك دەنگی دا بە گرتنی مەسیحیەکان ، کە لەو کاتە دانیشتووانی کەرکوك زیاتر لە ٢٠ هەزار خێزان دەبوو، لەو هێرشەیدا ئەوەی دەستگیری کردوو ئەوەی بەکۆمەڵ کووشتی و ئەوەی دیکە دەربەدەر بوون.

٤٤٦/٩/٢٥ـ فەرمانرەوای فارس – یەزدجەرد – شاپوور فەرمانیدا بەکۆمەل کووشتنی ئەو کوردە مەسیحیانەی ، کە لە شاری کەرکوك دەستگیر کرابوون.

## ٤٥٧ـ

٤٥٧/٤/١ـ کەنیسەی مەسیحی بەتەنگووچەڵەمەیەکی بەجیاوازو دژووارو ئالەباردا تێدەپەری بە کەرتبوونی کەنیسەی ئاینی مەسیحی کە – تستۆربۆی- لە کەنیسەی مەسیحی جیابۆوە ، ئەویش بە پێك هێنانی کۆمەڵە کەسایەتیەکی ئایینی مەسیحی بەناوی – کۆمەڵەی ئەستووریە –.

## ٥٣٧ـ

٥٣٧/١٢/٢٦ـ کردنەوەی کەنیسەی – ئایاسۆفیا- لە رۆمای پایتەختی ئیتالیای ئێستا ، لەلایەن ئیمپراتۆرو بەتریك میتاس . کە لە پێشەووەی ئاهەنگێران بوون ، کە کەنیسەکە لە سەر شێووەی خاچی یۆنانی دورست کرابوو بە درێژایی ٢٥٠ پێ و پانی ٢٢٥ پێ ، کە قووبەی ناوەندی لە سەر چوار گۆشەی

١٠٠×١٠٠ پێ بوو، لەسەر شێوەی دووباڵی لێك جیا دورست کرابوو ، کە بەرزایی ١٠٨ پێ بوو وقەوارەکەی ١٠٠ پێ بوو .
شایانی باسە ٣٢٠,٠٠٠ هەزار رەتل زێرو ٠٠٠ر٠٠٠ر١٣٤ملیۆن دۆلاری ئەمریکی لێ خەرج کرا ، کە لەو کاتدا بە گەورەترین کەنیسە لەجیهان دادەنرا ، کە بە دەیا رەنگی جیاوازو نەقش و نیگاری تاقانەی بێ وێنە ی تیا بەکار هێنرابوو لە مێژووی کەنیسەکاندا لە جیهان.

## ٠٥٧١

٠٥٧١/٤/٢٠ لە دایك بوونی –محەمەدی کوڕی عەبدوللا کوڕی عەبدولمتەلیب– لە شاری مە ککەی وولاتی سعوودیە لە بارودۆخێکی نا لەباری دواکەوتوو لە پەیووەندیەکانی کۆمەلایەتی و هەژاری چەووسانەوە لە دوورگەی بیابانی عەرەبی ، کە بەهیچ جۆرێك پێداوویستیەکانی ژیانی تیا بەچاو نەبوو تەنیا خەریك بوون بە مەر لەوەڕێن و حوشترەوان لەلایەك و بازرگانی لەلایەکی دیکەدا .
هەروا لە تەمەنی ٤٠ساڵیدا بوو بە پێغەمبەر– د , خ – ، واتە لە ٦١١/٨/٢ بەپێشبینی کردنی رێنماییەکانی پێغەمبەرایەتی لە بارێکی دوا پلەی دواکەوتوو لە پەیوەندیەکانی کۆمەلایەتی بەتایبەتی لە نیوان ئافرەت و پیاو دەوڵەمەندو هەژار ، کە ئەو کات (عبید) هەبوو، واتە مرۆڤ وەك ئاژەڵ دکراو دەفرۆشراو بازرگانی پێووە دەکرا هەتا چ بەئازاد کردن یاخوود کووشتن و چەندین لایەنی دیکەدا ... پێغەمبەر – د, خ – لەناو ئەو کۆمەڵگایە بەپێی تەمەنی گەشەکردن تووانی خۆی بگوونجێنێ لە ناو ئەو پەیووەندیە کۆمەلایەتیەو ببێتە تاقیکردنەوەیەکی زانستیانەو رۆشنبیر بوون و دۆزینەوەی رێگە چارەی رزگار کردنی ئەو کۆمەلگایە لە قۆناخی کۆیلایەتی بۆ قۆناخی دەرەبەگی و بەرەو باش بردنی باری ناوچەکە . لە هەموو بوارە جیاجیاکان ، بەتایبەتی لە دوای بوونی بە پێغەمبەر ، واتە نووێنەری خوای میهرەبان لەسەر زەوی ... یاخوود نێردراوی خوای گەوورەو میهرەبان.

٠٦٠٣

٥/ ١ / ٠٦٠٣ دەست پێکردنی شەڕی ٢٤ ساڵە لە نێوان هێزەکانی سووپای فارس لە وولاتی فارسی لە گەڵ هێزەکانی سووپای ڕۆم . کە ئەو شەڕە درێژترین و خوێناوترین شەڕ بوو لەوکاتەی جیهاندا .... ئەمەش لەکاتی دەسەڵاتی پاشایەتی خەسرۆ پەروێز شەڕەکە هەڵگیرسا .
هۆکارەکانی ئەو شەڕە بە کووشتنی ئیمپراتۆری ڕۆم - مۆریس - هاتە کایەوە، کە دۆستی خەسرۆ بوو . کووشتنی مۆریس لەلایەن فۆرکاس ئەنجامدرا .
جێگەی ئاماژە پێکردنە کە خەسرۆ پەروێز سەرکردەیەکی بەناو کورد بوو ... کە هەموو هەوڵ و تواناکانی بۆ فارس و بە بەهێزکردنی فارس بوو نەك کورد لەسەر خاکی کوردستان .

٠٦١٠

١٥/١٠/٠٦١٠ لە دوای لە سێدارەدانی ئیمپراتۆری بێزەنتی - قووقاس- بە هۆی هەلوویستو کردەوەو تاوانەکانی لە ماوەی دەسەلاتی، دوای ئەو- هرقل- دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی گرتە دەست تاکوو مردنی لە ساڵی ٦٤١ی زاینی .
شایانی باسە هرقل سەرکردەیەکی ئازاو چاوونەترس و زیرەك و لێهاتوو بوو لە هەموو بووارەکاندا .

٠٦١١

٢/٨/٠٦١١ محەمەدی کوڕی عەبدوللای کوڕی عبدولمتەلیب بوو بە پێغەمبەر ، لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا ، ئەویش بە پێشبینی کردنی ڕووداوەکان لە هەموو بوارە جیاجیاکان . لە دوورگەی بیابانی عەرەبی لە شاری مەککەی سعوودیە ، کە وەك شۆرشێك بوو ، لە پێناو ڕزگارکردنی عەرەب لەو کاتەدا لە دوورگەی بیابانی عەرەبی لە ڕژێمی کۆیلایەتی بەرەو کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی .

ئـەویش بـە بـەرپاکردنی چـەندین لایـەنی دیکـە لـە ئـازادی لـە نێـوان کۆمەڵگاو پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان بە ڕێنماییەکانی ئاینی ئیسلامی نـوێ لـــە گۆڕەپـــانی ناوچـــەو هەرێمەکـــە بـــەرەو چارەســـەر کردنـــی کێـــشە تەشەنەدارەکان.

## ٠٦٢٢

٠٦٢٢/٧/١٦ ســەرەتای دەســت پێکردنــی مێــژووی کۆچــی بــوو ، کــە بەرامبــەر ١/١/١ مێـژووی کۆچـی دەکـات ، کـە ئـەو ڕۆژ ژمێـرە بـەپێی ڕۆژ ژمێـری مـانگ دەستی پێکـردووە، ئەویش بەکۆچی پێغەمبـەر – د ، خ – دروودی خـوای لەسەربێ بۆ دەرەوەی شاری مەککە لەگەڵ ئەبووبەکری سەدیق ، بەهۆی ترس و پالەپەستۆی دووژمنەکانی ئاینی ئیسلامی نـوێ ، کە دەکاتـە ڕژی ٩/٢٠ی هەمان ساڵ.

## ٠٦٢٣

٠٦٢٣/٩/١٢ پەرلـــەمانی شـــاری مەککـــە – دار النـــدوە – کۆبوونـــەوەکیان گرێـــدا بـــە ئامـادەبوونی نوێنـەری هـەموو هۆزەکـانی قـوورەیش ، لـە پێنـاو دارشـتنی پیلانێکی گوونجاو بۆ لە ناوبردنی هەڵگری ئایینی نـوێیی ئیسلام . لە بەر ئەوە پێغەمبەر – د.خ – لەگـەڵ هـاورێ دلسۆزەکەی ئەبووبەکر سەدیق شاری مەککەیان بەجێهێشت.

٠٦٢٣/٩/٢٤ لـە دوای هەرەشـە کردنێکـی زۆر لەلایـەن قوورەیـشیەکان بـۆ سـەر محەمـەد– د.خ – هـەتا بەکووشـتنی و دوای سـێ ڕۆژ گـەران لـە دوای محەمـەد لەلایـەن قوورەیـــشیەکان، بـــەلام منداڵـــەکانی ئەبووبـــەکر ئاگاداریـــان کـــردن بـــە خۆشـــاردنەوەیان، بـــەلام دوای ئـەوە بـــەرەو شـــاری مەککـــە گەرانـــەوەو لایەنگرانی محەمەد ، کە زیاتر لـە ٢٠٠ کـەس دەبوون بـەناوی چوونە حـەج پێشوازیان لە محـەمـەدو ئەبووبەکری سـەدیق کـرد ... شـایانی باسـە دوای ١٧ساڵ عوومـەری کـوڕی خـەتاب ئـەو ڕۆژەی کـردە ، یەکـەم ڕۆژی مێـژووی عەرەب . کە دەکاتە ڕۆژی ٦٢٢/٧/١٦ ساڵی زاینی.

کێشووەرەکەدا .
هەروا باسی ئاینی زەردەشتیەکان و ئاینی ساسانیەکان دەکات ئەویش:-
ئاینی ساسانیەکان ئاینی زەردەشتی بوو ، کە بووە ئاینی فەرمی تەختی پاشایەتی و ئەو ناوەش سەبارەت بە پێغەمبەر زەردەشتی میدیای لێنرا ... کە لە سەردەمی پاشای میدیای – کەشتاسبی هەراسب – لە ساڵی ٦٢٨ ی بەر لە زایین لە دایك بووە .
زەردەشت ڕێنمایی ئاینەکەی بڵاوکردەوەو لە سەر پێستی گامێش کە ژمارەیان/ ١٢ دوانزە هەزار پارچە نووسیووەو کتێبەکەی ناونا – ئاڤێستا – و بە زمانی کوردی و بە خەتێکی نزیك لەوەی هیندیەکانی ئێستا بە کاری دێنن نووسیووە ، ساسانیەکان ئاینەکەی خۆیان لە دەرەوەی وڵاتەکەیان بڵاونەکردەوە لەبەر ئەوەی نەیاندەویست بێگانە بێنە سەر ئاینەکەیان و پێیان وابوو – مەجووسیەت تایبەتە – بە خۆیان ، بنەماکانی ئاینەکە ئەمانەن:-
ڕاوو بۆچوونی خێرخوازانەو ووتەی باش و کاری بەجێ و باوەڕی بە کتاب پەرستی و ڕۆژی دوایی هەبوو ... کۆمەگە لەسەردەمی ساسانی لە چەند چینێك پێك دەهات کە ئەمانەن :-
١-چینی کاهینەکان ...٢- نووسەران ...٣- جەنگاوەران ...٤- گشتیاران .
٥- پێشمەندەکان .
ڕێگە نەدەدرا خەڵکی لە چینێکەوە بچنە سەر چینێکی دیکەو هیچ خاوەن پێشەیێکیش بەبێ ڕەزامەندی پیاوانی ئاین ماف ئەوەی نەبوو پێشەکەی خۆی بگۆڕێت ، زۆر لە ساسانیەکان و نەوەکەی شاپوورو چەندانی دیکە سەردانی ماڵی خوایان کردووە ، لە شارەکانی مەککەو مەدینەدا .
سەرچاوە :- www.kurdmedya.com

٠٦٣٢/٦/٧ کۆچی دووایی پێغەمبەری ئیسلام – محەمەد عەبدوللا عەبدولمتەلیب – د.خ– لە شاری مەککە ، شایانی باسە لە سەردەمی خۆی نە مێژووی کۆچی دیاریکرابوو نە قورئانی پیرۆزیش لە کتابێکی رێك کۆکرابووەوە ، تا ئەو کاتەی کە ئیمامی عوومەری کوڕی خەتاب دەسەڵاتی خەلافەتی ئیسلامی گرتە دەست، کە دوای ١٥ ساڵ لە کۆچی دووایی پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێ ، لەگەل مێژووی کۆچی کە کۆچی دووایی پێغەمبەر بە ١١/٣/١٢ کۆچی دانراوە بەپێی مێژووی زاینی .

لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر –محەمەد - درووودی خوای لەسەر بێ ، ئەبوو بەکری سەدیق جێگەی گرتەوە بە یەکەم خەلیفەی ئیسلام و بووە هۆی دووبەرەکی و سەرهەڵدانی دووبیروو بۆچوونی جیاواز لە ناو ئاینی ئیسلام بەدوو مەزهەبی شیعە بەسەرکردایەتی ئیمامی عەلی و ، مەزهەبی سووننە بەرابەرایەتی پێغەمبەری کۆچ کردوو – د ، خ – دەست گیر بوون بەرێنماییەکانی پێغەمبەر درووودی خوای لە سەر بێ .

لە دوای ئەو سەرهەڵدانە لە دوو مەزهەب و دەرکەوتنی چەندین بیروو بۆچوونی دیکەی جیاواز ، وەك فاتمی و وەهابی و عەلەوی و ئیسماعیلی و ، چەندین لایەنی دیکە لەناو قەوارەی ئاینی ئیسلام .

بەڵام گەر رێگە راستەکەی ئیسلام دەست نیشان بکەین . کە یەکەم خوای گەورەی میهرەبان و دووەم پێغەمبەرو سێیەم قورئانی پیرۆز ، کە ئەمە راستی ئاینی ئیسلامەو هەر بیروو بۆ چوون و برووای دیکە دەرکەوتبێ... یاخوود دەرکەوێ ، ئەوا شێواندنی ئاینی ئیسلامە لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ئاینی ئیسلامدا .

## ٠٦٣٤

٠٦٣٤/٣/٧ سەرکەووتنی سووپای ئیسلام بە سەر جوولانەوەی بەرهەڵستکاری هۆزە عەرەبەکان لە پێناو دەرچوونیان لە دوورگەی عەرەب و فراوانکردنی سنووری جووگرافی و لکاندنی بەو دوورگەیەو پەیداکردنی شووین و جێگەی گونجاو و ژیان و رزگاربوونیان لە مەترسی هەردوو ئیپراتۆریەتی بیزەنتی و فارس .




ئەم نەخشەیە فتوحاتی ئیسلامی دیار دەکات لە سەردەمی ئەبو بەکری سەدیق بەرەو باکوورو رۆژهەلاتی دوورگەی عەرەبی بەرەو وولاتی نێوان دوو زێ . واتە میزۆپۆتامیا .

ئەو هۆزە عەرەبانە داوایان لە خەلیفە ئەبووبەکر کرد یارمەتیان بدات بە پەلاماردانی وولاتی نێوانی دوو زێ - میزوپۆتۆمیا - و هەرێمی شام کە بەشی رۆژئاوای ئێستای سووریا و فەلەستینی ئیستاو هەروا ئوردنی لەخۆ دەگرت .... خەلیفە ئەبووبەکر سووپایەکی لەو هۆزە عەرەب و هەلگری ئاینی ئیسلامی نوێ پێك هێناو بەرەو هەرێمی شامی ژێردەستی بیزەنتیەکان بە سەرکردایەتی - یەزیدی کوری ئەبوو سوفیان - شەرحەبیل کوری حسنە - عەمرۆ کوری ئەلعاس - هەروا ئەبی عوبێدەی کوری جەراح - بە رێکەووت بەرەوناچەکەدا .

هەروا سووپایەکی دیکەی بەرەو ئێراق رەوانە کرد بە سەرکردایەتی خالیدی

كوری وەلید ، كە توانی سەركەووتن بەدەست بێنێ لە كەناری رۆژئاوای زێی فـورات ... دوای ئـەوە روویكـردە هـەرێمی شـام بـۆ یارمـەتی دانـی سـووپای عـەرەبی ئیـسلام ، دژی دەوولـەتی بیـزەنتی ، كـە لـە ئـەنجام سـەركەووتنیان بەدەست هێنا و توانیان شاری دیمەشق داگیربكەن .

كە ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی كـە دوورگـەی عـەرەبی بـە تـەواوی كەوتـە ژێـر دەسەلاتی ئیسلام و بە دەرچوونیان لە هێرشەكانی هەردوو دەوولەتی فارس و بیزەنتیكان... دوای سەركەووتنیان ، خەلیفە ئەبووبەكر ئەو ناوچانەی كە داگیریـان كردبـوو دابەشـی كـرد بـۆ چـەند وویلایـەتێك و لەهـەر وویلایـەتێك ئەمیرێكی ئیسلامی لێ دامەزراند .

لەگەڵ ئەوەشدا وولاتی نێوان دوو زێێ و شام شەڕی تێدا بەردەوام بـوو دژی چـەكدارانی ئیـسلام .... ئـەو شـەڕو پێكدادانـە چـەندین سـاڵی خایانـد لـە ناوچـەو هەرێمـە جیاجیاكـانی نێـوان ئیـسلام و دانیـشتووانی رەسـەنی ئـەم ناوچەو هەرێمانە لە كوردو فارس و ئارامی و ئاشووریەكان .

سەرچاوە:– ئەتلەسی مێژووی عەرەبی و جیهان / ئامادەكردنی سەیفەدین كاتب .
دار الشرق . المؤسسه العلميه لوسائل التعليميه – بيروت – سووريا /٢٠٠٥ .

٦٣٤/٨/٢٣٠ كۆچی دوایی خەلیفەی ئیـسلام ئەبووبـەكری سـەدیق ، كە یەكـەم خەلیفـەی ئیسلام بووە ، لە دوای سێ ساڵ لە خەلافـەتی، دوای ئـەو ئیمـامی عوومـەری كوڕی خەتاب جێگەی گرتەوە بە خەلیفەی ئیسلام.

**٠٦٣٥**

٠٦٣٥/٢/٢٥ فتووحاتی ئیسلامی بە سەرکردایەتی ئیمامی عومەری کوری خەتاب زیاتر هەنگاوی بەرەو دژووارترین دەناو لە ئاکام توانیان وولاتی فارس داگیربکەن بە سەرکردایەتی سەعدی کوری وەقاس لە شەڕی قادسیەی یەکەم لە داگیرکردنەکانیان بەردەوام بوون بەهۆی بەهێزکردنی سووپای ئیسلام لە هەرێم و ناوچەکەدا .




لە ناوە رۆکی ئینسکلۆپیدیای مێژوونامەکە باسم لە فتوحاتی ئیسلامی کردووە وەك داگیر کەرو ئیمپرتۆریەت . ئەم نەخشانەش بەلگەن بۆ سەلماندنی ناوەرۆکی کتابەکەم لە هەموو لایەنەکانیەوە ...؟...!. بۆ کورد.

ئەویش بەناچارکردنی دانیشتووانی ناوچە داگیرکراوەکان و کردنیان بە ئیسلام و دوور لەخواستی خۆیان ... هەروا هەنگاونان بەرەو خاکی کوردستان و ئەرمینیا لە ٦٤١/١٢/١٠ لەشەڕی نەهاوەند و جێگەی خۆیان بەهێزکردوو ناوچەی فەلەستینیان داگیرکرد ... کە ئیمامی عومەر لە ٦٣٨/١/٢٣ چووە ناوقوودس و بە بەردوام بوونیان لەداگیرکردنی گەلان و

خاکەکەیان لەناوچەو هەرێمە جیاجیاکان .

<u>سەرچاوە</u>:– ئەتلەسی مێژووی عەرەبی و جیهان / ئامادەکردنی سەیفەدین کاتب .
دار الشرق . المؤسسه العلمیه لوسائل التعلیمیه – بیروت – سووریا /٢٠٠٥

## ٠٦٣٦

٠٦٣٦/٢/١٤ کاتێـک سـووپای عـەرەبی ئیـسلام لـە سـنووری ئـەو ئیمپراتۆریەتانەیـدا ، سەرەتایەکی نویٚ لە قۆناخێکی مێژوویی نوێدا دەستی پێکرد بە دروشمی – ئازادی بوون بە ئیسلام – ...؟...! لـە پێنـاو بڵاوکردنـەوەی ئـاینی ئیسلام و راکێـشانی زۆرتـرین خـەڵك بـۆ پـەیرەوکردنی ئـەو ئاینـە نوێیـە ... سـەرەتا سـەرنجی هـەڵگری بـروای مانیـەکانی وەك چەندین پـەیرەوێکی ئـاینی بـۆ لای خۆی راکێشا .

بەڵام دواتر بۆیان دەرکەووت کە ئەو دروشمە جۆرێکە لە شێووە رامیاریـەتی ... دەووڵەت – خەلافەت – بۆ کۆمەڵە ئاینە نا موسڵمانەکان و تا لەبەرامبەر ئیسلام نەبوونیان – باج – جزیە –ی بەسەردا بچەسپێنن . باجەکانیش تـەنها لەسەرٚ پیاوان نەبوو واتە لەسەر – ژنان و کچان و – منـداڵان – و تەنانـەت – شـێت –یـش نـە سەپێنرابوو . کـە بـری باجەکـەش – ٤٨ درهـەم بـۆ توویـژە دەووڵەمەندەکان و ٢٤ درهەمیش بۆ توویژە هەژارەکان.

<u>سەرچاوە</u> :– بۆ زانیاری زیاتر بروانە – قورئانی پیرۆز – سوورەتی ئەلتەوبە ئایەتی/٢٩ .

٠٦٣٦/٨/١ لـە شـەڕی یـەرمووك هێزەکـانی سـوپای ئیـسلام سـەرکەووتنیان بـە سـەر هێزەکانی سووپای رۆمەکاندا هێنا.

## ٠٦٣٧

٦٣٧/٢/٢٥ لە رێگـەی فتووحـاتی ئیسلامی شـاری مووسـڵ لەلایـەن هێزەکـانی سـووپای ئیسلام داگیرکرا . ئەو هۆزانەی کە بەشداری داگیرکردنی شاری موسلیان کرد – تغلب – أیاد – النمر – بەسەرکردایەتی – ربعی کوالافکل العنزی – بوو ، هـەروا ئـەو هۆزانـەی کـە لـە بیابانەکـەی نێـوان رۆژئـاوای شـاری موسـل و سەلاحەددین – تکریتی ئێستا – نیشتەجێ بوون .

بەڵام لەدوای داگیرکردنی شاری مووسڵ و دەووروبەری ئەو هۆزانە روویان لە هەردوو شاری مووسڵ و سەلاحەددین کردو تێیدا نیشتەجێ بوون ... واتە

عەرەب بەر لە داگیرکردنی مووسڵ نیشتەجێی ئەو شارانە نەبوونە ، ئەوانیش مەر لەوەڕێنەکان بوون لە ناوچەکە ، کە لە دوورگەی بیابانی عەرەبی روویان لەو ناوچەیە کردبوو لە دوای داگیرکردنی لەرێگەی فتووحاتی ئیسلامیدا .



ئەم وێنەیە پردێکی شاری مووسڵە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەم کە لەو کاتە دانیشتووانەکەی لە ٩٥٪ . کوردو کلدو ئاشووری بوونە و عەرەب تەنیا مەڕلەوەڕێن و بازرگان و کاسبکارەکانی تیا نیشتەجێ بووە ....!.

٦٣٧/٩/٢ • هەڵگیرسانی شەڕی قادسیەی یەکەم لە کاتی دەسەڵاتی خەلیفەی ئیسلام عوومەری کوڕی خەتاب ، کە ئەو شەرە گرنگیەکی تایبەتی گەورەی خۆی لە گۆڕەپانی گۆرانکاریەکاندا هەبووە لە پرۆسەی شاڵاوو هێرشەکانی عەرەب بەرەو وڵاتی نێووان دووزێیْو دەوڵەتی فارسی و بەرەو شام ، کە لە وڵاتی نێووان دووزێیْ . کە بەرەو ناوچەی مەدائن – سەلمان پاکی – رۆژهەڵاتی ئێستای شاری بەغدا هاتن و لەو کات ، کە کوردو فارس و ئارامی و ئاشووری نیشتەجێی ناوچەکە بوون.




ئەمە نەخشەی هەڵگیرسانی شەڕی قادسیەی یەکەمە لە پێناو داگیر کردنی خاکی دانیشتووی گەلانی وولاتی نێوان دووزێیْ و بە ئیسلام کردنی دالنیشتوانەکان . کە لەوکاتە تەنیا عەرەبە رەوەندکان و مەڕلەوەرێنەکان لە ناوچەیەدا بوون .

کە لەوکات بە هیچ جۆرێك عەرەب لەو ناوچانە نەبوونە تەنیا بەدووە مەر لەوەڕێن و حووشترەوانەکان نەبیْ کە هەر ڕۆژەو لەجێگایەك بوون بۆ لەوەراندنی ئاژەڵەکانیان .

دوای ئەوە بەرەو خاکی کوردستان بەرێکەووتن ، کە لە ئەنجام رووبەرووی هێزەکانی فارس بوونەوە بەسەرکردایەتی (یەزدەگوردی) سێیەم‌وبووە هۆی هەلاتنی و دووایی بەکووشتنی رۆستەم ، بەیارمەتی کوردە خۆفرۆشەکان لەو کاتدا.

لەوکاتەو تاکوو ئێستاش عەرەب شانازی بەو شەڕانە دەکەن بە داگیر کردن و کووشتن و تۆقاندنی مرۆۋ ، جا لە هەر نەتەوەیەك و لە سەر خاکێکی داگیر کراو ... گەر عەرەب دەسەلاتی هەبیْ لە هەموو کاتیْ زیندوویەك و مردوویەك بەیەکەوە لە گۆر دەنێن ، لە پێناو داگیر کردن و بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆیان بە ناوی ئیسلام نەك لە خزمەتی ئیسلام .

<u>تێبینی :</u>– هەروەك لە نەخشەکان دیاری کراون لە گەڵ وێنەکاندا .

**٠٦٣٨**

٠٦٣٨/١/٢٣ بە وەرگرتنی زانیاری لە سەر خاکی کوردستان و ناوچە جیاجیاکان ... و یەك

لەوانە ناوچەی جەزیرەو شاری قامیشلۆ ، کە دەکەوێتە رۆژئاوای باشووری کوردستان ... بۆ زانیاری جووگرافیای ئەم ناوچەیە ، کە جەزیرە دەبێ هەردوو ووشەی - بادیە - دەشت - و - مەعمورە - ئاوەدانی - روون بکەینەوە ... چونکە جەزیرە بە مانای فراوانەکەی - بادیە - و ( مەعمورە - دەگرێتە خۆ ... واتە دەشت بریتیە لە بەشە چۆڵەکەی جەزیرە ، کە خەڵکی تیا ناژیت و کەم ئاویشە وتەنها بۆ لەوەراندن و بەخێووکردنی مەرو مالآت گونجاو بووە .

بەڵام هەرچی ئاوەدانیەکەی بووە خەڵکی تیا دەژی و لە بواری کشتووکاڵی کار دەکەن .... ئەو جەزیرەی کە ئێمە باسی لێووە دەکەین ئەو خاك و دەڤەرەیە ، کە لە نێوان هەردوو کەناری چەپی زێی فووراتەو لە دەستە راستی رووباری دیجلەیەو درێژ دەبێتەوە .

بۆ زانیاری زیاتر هەردوو زێی فوورات و دیجلە لە شاخ و چیاکانی ئاراراتی باکووری کوردستان هەڵدەقوولێن ، کە خاوەنداریەتەکەی هی کوردەو داگیرکراوە و دووژمنانی کورد لێی سوودمەندن ... ئەویش بە هۆی خۆ پەرستی و بەرژەوەندنی تایبەتی سەرکردە کوردەکان لە بنەماڵەو هۆزو تیرەو پارت و رێکخراو گروپ لە دەسەڵاتداریەتی ئیماراتەکانی کورد و چەندین شتی دیکە .



شارۆچکەی شەنگاڵ

لە سەرەتای بوونی کورد تاکوو ئەمرۆ بۆ کورد خۆی بە ئامانجی خۆی نەگەیاندراوە لە هەموو بوراەکان ، بە تایبەتی لە بواری نەتەوەیی و




نیــشتیمانی . کــەلە ســەردەمە جیۆلۆجیەکانــدا هــەروەك لــە شــێووەو شێووازەکەیدا پێك هاتەی خاکەکەی دەردەکەوێت دەریاچەیەکی فراوان بووە لە کێشووەرەکەدا .

هەروا لە سەرچاوە رۆژئاواییەکانی ناسراوە بە – میزۆبۆتامیا – واتە وولاتی نێوان دوو زێیێ ... بە ووتەیەکی دیکە – رافدین – لەو روانگەوە ناوچەی جەزیرە بۆ سێ دەقەر دابەش دەکرێت ئەویش :-

١– جەزیرەی بالا : ئەویش تەواوی بەشی باکووری شاخاوی دەگرێتەوە لە چوارچێووەی باشووری تورکیا .

٢– جەزیرەی ناوەند : ئەویش دەکەوێتە نێوو سنووری وولاتی سووریا .

٣– جەزیرەی خواروو : ئەویش دەکەوێتە نێوو وولاتی سووریاو بەشێکیش دەکەوێتە سەر سنووری ئێراقی بە زۆر دروستکراو بە پێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ .

لەم بارەیەوە وولاتناس – یاقووتی حەمەوی – لە پەرتوکی – معجم البلدان – دا نووسیویەتی و دەلێ :–

جەزیرە ئەم شووێنەیە کە دەکەوێتە نێوان هەردوو زێی دیجلەو فوورات و دراوسێی وولاتانی شامە– ئەویش بەشێك لە وولاتی سووریاو فەلەستین و



(جبل سنجار/ معسكر روماني)

ئوردن – دەگرێتە خۆ لە ناوچەکەدا ... دەڤەری – موزەر – و – دیاربەکر – دەگرێتە خۆ لە باکووری کوردستان .

هەر لە بەر ئەوەش بەو ناوە ناوزەند کراوە ، کە ئاوو هەوایەکی دروست و لەبارو گونجاوی هەیەو دەڤەرێکی بە پیت و فرە شارو کۆشك و قەڵای زۆری لێیە ... وەك – حەران ، رەها ، رەقە ، سەرۆکانی ، نووسێبین – شەنگال ، خاپوور ، ماردین ، ئامەد ، مەیافارقین ، موسل – و چەندین جێگەی دیکە لە هەرێم و ناوچەکەدا .

لە بەر ئەو هۆیانە لە ٦٣٨/١/٢٣ زاینی ، کە دەکاتە بەرامبەر ساڵی ١٧ ی کۆچی لە لایەن سەرکردەی ئیسلام و لە شاڵاوەکانی فتووحاتی ئیسلامی لە لایەن عەیازی کوری غەنەم داگیردەکرێت و بەبێ بەزەیی پیْ هاتنەوە بە زەبری شمشێر هەڵس وکەووت و خواستەکانی خۆی لەم دەڤەرە جێ بەجێ دەکات..؟

هەروا شاری قامیشلۆ شارێکی مێژوویی دێرینی باشووری خۆرئاوای کوردستانەو چەندین شووێنەواری مێژوویی تیایە ، کە دەکەوێتە چوارچێووەی جەزیرەی ناوەند .

هەروا لە رووی جووگرافیەوە دەکەوێتە ئەو بەری باکووری رۆژهەڵاتی ئێستای سووریا و ، ئێراق دەکەوێتە سنووری رۆژهەلات ... هەروا پارێزگای دێرە زووری سووری دەکەوێتە بەشی باشووری و پارێزگای رەقەش سنووری

رۆژئاوای پێك دێنیٚ له هەرێمەکەدا .
ئەمەو چەندین زانیاری دیکه له ناوەرۆکی مێژوو نامەکە روونی دەکاتەوە .
٠٦٣٨/١/٢٣ له دوای داگیرکردنی شاری مووسڵ و دەورووبەری که لەو کاتە دانیشتووا
رەسەنەکانی لە کوردو ئارامی و مەسیحیەکان پێك هاتبوون ... کە فارو
عومەر خەتاب ، کە دەکاتە کوری ئیمامی عومەر هەروا عەتەبەی کوری فرق
سلمی کرد به والی له سەر مووسڵ ... هەر ئەویش مزگەووتی جامع و خانو
ئیمارەی دروستکرد ... دوای ئەوە چەندین والی دیکەی لیٚ دامەزراوە لەکات
دەسەلاتی دەووڵەتی ئیسلامی له وولاتی نێوان دوو زێیٚ ، واتە — میزۆبۆتام
— لەناوچەکەدا .

## ٠٦٣٩

٠٦٣٩/١/١٢ له دوای پەیدا بوونی ئاینی ئیسلام و دەستکردن به فتووحاتی ئیسلامی ا
ناوچەی شەنگاڵ و شاری شەنگاڵ له باشووری کوردستان لەلایەن هێزەکان
سووپای ئیسلامی داگیرکراوە .
١- لە پێناو داگیرکردن و بەعەرەب کردن و فراوانکردنی سنووری وولاتـ
عەرەب .
٢- به ئیسلام کردنی دانیشتووانی شارو ناوچەکە ، که له کورد و ئارامیەکا
پێکهاتبوون .
هەروەك کوردستان و به تایبەتی هەرێمی باشووری کوردستان که له سەرەتا
فتووحاتی ئیسلامی تاکوو تەواوبوونی ئەم مێژوو نامەیە له بەعەرەب کردن
داگیرکردن بەردەوام بووە لەهەموو بوارەکاندا .
جێگەی باسکردن و روونکردنەوەیە کە ، سنجار ، یان شەنگال ، یان سەنگار
، کە شارێکی وولاتی نێوان دوو زێیٚ — میزۆبۆتامیا — بووە ، کە مێژوو
دەگەرێتەوە بۆ گوندە کۆنەکانی سەردەمی بەندایەتی و ئەو بەردو پاشماوە
کە لەو ناوچەیە ماوەتەوە ... ئەو راستیە دەسەلمێنن کە ئەم شووێنە
یاخوود ئەم ناوچەیە شووێنی مرۆڤی کۆی سەردەمی پێش مێژوو بووە لـ
هەرێمەکەدا .




العراق في الفترة الآرامية( كلمة بيث، بالآرامي، تعني منطقة)

هەروا شاری شەنگالْ لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری ناسراو بووە , لە ساڵەکانی ٩١١ تا ٦١٢ ی پێش زایین , کە ئەم شارە یەکێك بووە لە بنکە سەرەکیەکانی ئەم ئیمپراتۆریەتە و ، لە پێناو بەرەو پێش چوون و بەرەو زێی فوراتی سەروو , . لە چەندین سەرچاوەدا هاتووە ، کە ناوچەی شەنگال و شارەکە بۆ حەسانەوەی سووپای ئاشووریەکان بووە بەناوی – سنگارا – sinjare – , دوای رووخاندنی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی بابلیەکان و لەژێر دەستیان ماوەتەوە تا رووخاندنی دەسەڵاتی بابلیەکان لە ساڵی ٥٣٩ پێش زایین , دوای ئەوە فارسەکان شەنگال و ناوچەکەیان کەووتۆتە ژێر دەسەڵات .

دوای ئەوانیش شەنگال کەووتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئەگریگیەکان ... دوای ئەوە لە سەدەی یەکەمی زایینی چوار پاشای لێهاتوو لەو شارو ناوچەکەدا پەیدابوون و ئەوانیش – میتان , حەتدا , حەریان , سەنگارا –.



معسكر روماني

دوای ئەوە شاری شەنگال بووە بارەگای میرنشینێك لە دەوولەتی ئارامیەکان و بنکەیەکی سەرەکی بووە بۆ کاروانی بازرگانەکانی ئەوکات ، لەنێوان وولاتی دوو زێی – میزۆبۆتامیا – و باکووری شام ، بەتایبەتی لەنیوان شارەکانی ماردین و نەسیبین لە باکووری کوردستان ، لە پەیوەندیەکی بەهێزدا لەگەڵ خاوەنداریەتی – حەتدا و حەدیابی ئارامی .

لەو کاتەشدا ئیمارەتی شەنگال دراوی تایبەتی بەناوی خۆی دەرکردووە .
ئەم میرنشینە ماوەیەکی باش دەسەڵاتی لەسەر شەنگال و ناوچەکە گێڕاوە تا ساڵەکانی ١٠٦ – ١١٤ زایین. لە ناوچەکەدا .

دوای ئەوە ئەم میرنشینە بەداگیرکردنی لەلایەن ئیمپراتۆریەتی – تراجان – کۆتایی پێهێنراوە و هەڵووەشێنراوەتەوە لەشارەکەدا .

دوای ئەوە شەنگال بۆتە مەڵبەندی بنکەی هێزەکانی سووپای رۆمانیەکان و دوای ئەوەش لەساڵی ١١٤ تا ساڵی ١١٦ ، تیایدا ماونەتەوە و لە سەردەمی ئیمپراتۆر – مارکۆس ئفدلیۆس – و ، دوای ئەوە بەرەو هەڵووەشاندنەوەی رۆمانەکان کۆچیان کردووەو بەناوچەکەدا ، بەتایبەتی دوای شکستە گەوورەکەی کە بەرامبەر ساسانیەکان بەریان کەووت .

دوای ئەوە لە سەدەکانی پێنج و شەشی زایینی بیروو بروای ئایینی مەسیحی گەیشتە شەنگال و ناوچەکە ، کە یەکەم کاهینی مەسیحی بەناوی – فاری – بووە لە ساڵی ٥٤٤ ، لە پێناو بڵاوکردنەوەی رێنمایەکانی ئایینی مەسیح ...

دوای ئـەوە یەکـەم کەسـایەتی لـەو ناوچـەدا — جبرائیـل سـنگاری — بـووە کـە وانـەی پزیـشکی خووێنـدبوو لـە قوتابخانـەی — جندیـشابوور — لـەلای شـای فارس , دوای ئەوە توانیوویەتی چارەسەری نەخۆشیەکانی شاژن — شیرین — بکات و بەم هۆیە بووە سەرکردەی پزیشکەکان .

هـەروا بـەناوبانگترین کاهینیش — ئیلیـا — بـووە لـە سـاڵی ٧٥٠ زاییـنی و ئـەم کەسایەتیە زاناو بلیمەتـە بـووەو چـەندین کـەنیسـەی لەشـەنگال هـەبووە لەوانـە :— عێن قەننا , کنووشیا — ئـەوەی دووەمیش تـا سـاڵی ٨١٩ زاییـنی ئـاوەدان بووە لەناوچەکەدا لە باشووری کوردستان .

٠٦٤٠

٠٦٤٠/١٢/٢ لەم رۆژەدا بۆ یەکەم جار ناوی عەرەبی لە شاری مووسڵ نـرا . کـە ئـەمـەش لـەو کاتـەی کـە هێزەکانی سووپای ئیسلام بەسەرکردایەتی ئیمـامی عومـەری کـوری خـەتاب ، لـە رێگـەی فتووحـاتی ئیـسلامی ئـەو شـارەی داگیرکـردو هـۆزە عەرەبەکانی لە دوورگەی بیابانی عەرەبی بەرەو شارو رۆژئاوای مووسڵ هێنا. جێگـەی ئامـاژە پێکردنـە کـە دروسـتکردنی شـاری مووسـڵ بـۆ چ مێژوویـەك دەگەرێتەوە .

بەڵام نووسەرو مێژوو نووس و گەرۆکی ناوداری جیهان — زنیفۆن — لە سـاڵی ٤٠١ ی پێش زاینی ، ناوی مووسڵی لەوکات دیارکردووە کە پێـی دەگـوترا — مسیلا — لە نزیك نەینەوا ، کە ئەوان وێرانکرد بوو ... کە خۆی بەو ناوچەیەدا تێپەربوو... ئەو گردەی کە دەکەوێتە رۆژئاوای زێی فوورات ئـەوە مووسـڵ بـوو ... لە هەمان کات — تەها باقرو ، فوئاد سەفەر — لە — المرشد الی مـوگن الاپـار و الحـچاره — الرحلـه الپالپـه ص/١٧ — بـۆ تایبەتمەندیـەتی شـاری مووسـڵ ، ناوە عەرەبەکەی دەگەرێتەوە بۆ ساڵی ٦٤٠ زاینی. لە ناوچەکەدا .

لە هەمان کات لـە سـەردەمی ساسـانیەکان ناسـراو بـوو بـە — نـوێ ئەدەشـێر — واتە ئەردەشێری نوێ ... بەر لە فتووحاتی ئسیلامی ... مەسیحی و ئـارامی — فارس و یەهوودی — جوولەکە — تیانیشتەجێ بووە ... بەڵام دوای ئـەوەش ناوی مەجووس گۆرا بەناوی فارس . کە مەجووس ناوزەند کـرا ... ئـەویش بـە زەردەشــتیەکان دەگــوترا مــەجووس و هــەروا بــە — المیترائــیین — واتــە — یەزیدیەکان .

لەگەڵ ئەوەشدا نووسەرو پرۆفیسۆرو مێژوونووسەکان لەنێوان فارس و کور
جیاوازیان نە دەکرد ، ناوی کورد دەهات لەژێر ناوی فارسەکان ، یاخوود
عەجەم – وا دیاریشە کە نیازیان ئەوە بووە ، کە مەجووس و فارس و کور
بوونە ، یاخوود کورد و فارس بەیەکەوە ... بەڵام لە دوای فتووحاتی ئیسلام
، چەندین هۆزی عەرەبی شاری حیجازی سعوودیەی ئێستاو یەمە
لەریزەکانی سووپای ئیسلام بوون ، کە نیشتەجێی دەوروبەری شارو نا
مووسڵ بوون .

هەروا بەر لە فتووحاتی ئیسلامی عەرەب دانیشتووی شاری مووسڵ
دەووروبەری نەبوونە ، تەنیا مەر لەوەڕێن و حوشترەوانەکان نەبێت ..
ئەویش لە رۆژئاوای شاری ئێستای مووسڵ و نەیانتووانیووە لە زێی دیجل
بپەڕنەوە هەتا بۆ مەر لەوەڕاندن ... تاکوو ساڵەکانی شەستی سەدەی بیست
لە رۆژهەڵاتی زێی دیجلە تەنیا گۆری نەبی یونس و شوورەی ئاشوور هەبوو
کە دانیشتووانەکەی کورد بوونە ، لەگەڵ گوندەکانی کورد . کە دوای
شەستەکان حکوومەتی ئێراق گەرەکی زهوری دروستکردو بەدەیا باڵەخانەو
خانووی بۆ دام و دەزگا حکوومیەکانی لێی دامەزراند .

کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ببێتە گەورەترین گەرەك و چەندین گوندو
باخچەو زەوی کورد بەر ئەو گەرەکە بکەوێت ... جگە لەوەش شاری مووسڵ
بەند بووە بەباشووری کوردستان لە هەموو بوارەکانیدا ، بەتایبەتی لە
ئابووری و بازرگانی و کشتووکاڵی . لەناوچە عەرەبەکان کە زۆر دووربووە لە
شارو وولاتە عەرەبییەکان.

کە لەو کات سنوور نەبووە لەنێوان شاری مووسڵ و باشووری کوردستان و
باکووری کوردستان و رۆژئاوای کوردستان ، تاکوو دیاریکردنی سنووری
نێوان ئێراقی دروستکراو لەگەڵ تورکیاو سووریا ، کە موسل بەشێك بوو
لەکوردستان نەك لەگەڵ عەرەب .

بۆ نموونە :– گەرۆکی بەریتانی – pdwolf – لە سەدەی شانزەهەمدا
دەڵێ :– گەیشتینە شاری مووسڵ لە دوای پەڕینەوەمان بە بەلەم دەرکەوت
کە مووسڵ دەکەوێتە وولاتی کوردەکان ... هەروا نووسەری تورکی ، چەلەبی
– حاجی خەلیفە – کە موئەریخێکی بەناوبانگی جووگرافی و بیبلۆگرافی بووە
لە سەدەی هەڤدەم لە – جیهان نما – دەڵێ:– دانیشتووانی شاری مووسڵ

کوردن و بەعەربی و کوردی ئاخاوتن دەکەن .
هەروا – ئەولیا چەلەبی – لە وەسیەتنامەکەی ج ٤ ل/٧٥ نووسیویەتی و دەڵێ:– کە کوردستان لە ئەرزەرۆم درێژ دەبێتەوە بۆ موسل و بەغداو بەسرە ... مەبەستیش بەس کوردستان بووە ، لەناو دەووڵەتی عوسمانی . هەروا – کییە – دەڵێ:–
شارە گرنگەکانی کوردستان ... لە تورکیا . دیاربەکر ... لە ئێراق مووسڵ . لە ئێران ئورمییە . هەروا چەندین نووسەرو رووناکبیرو گەریدەی دیکە لە سەر شاری مووسڵیان نووسیووە ، کە بەشێکە لە کوردستان ... وەك :– گەرۆکی فەرەنسی – ئولیفیە کە لە ساڵی ١٧٩٥ سەردانی شاری مووسڵی کردووە ... هەروا گەریدەی بەریتانی – جاکسۆن کە لە ١٧٩٧/٧/٢٥ سەردانی شاری مووسڵی کردووە ... کە مووسڵ پایتەختی جەزیرەی کوردستان بوو لە هەرێمەکەدا

## ٠٦٤١

٠٦٤١/٢/١١ کۆچی دووایی سەرکردەی ناوداری جیهان –هرقل –و گەرانەوەی قیرس لەئاوارەیی و دووایی کە هرقلیەکان دەسەڵاتیان گرتەوە دەست و گەیشتنە ئەو بڕووایەی کە پەیمانی ئاشتبوونەوەیان لەگەڵ عەرەب مۆر بکەن ، دوای ئەوە قیرس گەراوە شاری ئەسکەندەریەی میسر .
لە مانگی /٦٤١/٩ لەگەڵ شاندێك لە مەسیحیەکان بەرەو سەنگەری بابلیلەکان بەرێکەووتن ، لە پێناو گفتوگۆکردن لەگەڵ عەمرۆ کوری عاس ، ئەمەش بە هۆی پالە پەستۆو سەر هەڵدانی فتووحاتی ئیسلامی بوو بۆ ناوچەو هەرێمەکانی میسر . کە شاری ئەسکەندەریە لەلایەن ئەسکەندەری گەورە لە ساڵی – ٣٣٢–ی پێش زاینی دروستکرابوو..

## ٠٦٤٢

٠٦٤٢/٩/١٢ سەرکردەی ناوودارو سەرکردەی نوێی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی لە سەرەتای دەسەڵاتی – قنستانز – کە یەکەم هەنگاوینا بە لابردنی سەرکردەی ناوداری بێزنتی– هرقل – لە دەسەلات ، کە لەو کاتە هێرشەکانی فتووحاتی ئیسلامی بەرەو هەرێمەکانی میسر هەنگاویان دەنا .

لـه پێنـاو داگیرکردنـی خـاكو بـه ئیـسلام کردنـی گـەلان و لـه هـەمان کـات داوایـان لـەهێزەکانی سـوپای بێزەنتـی کـرد ، کـه لـه ناوچـەی شـاری ئەسـکەندەریەی میسر بچنه دەرەوە ، بەپێی پـەیمانی نێـوان سـەرکردەکانی عەرەبی ئیسلامو بەرپرسانی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی لە ناوچەکەدا .

٣٠ /٠٦٤٢/١١ وولاتـی کـورد لـه زنجیره چیاکانی هەمـەدان , شـارەزوور , و ئـەربیل دەسـت پێدەکات و بە رووباری دیجله لـه دەڤەری جەزیره لـه مووسڵی ئێستا کۆتـایی دێت .....هەروەك فەزلوللاّ عومەر دووپاتی دەکاتـەوە لـەگەڵ لێکـۆڵەرەوەکان ... که هەوڵیان داوه به دوای رەگ و ریشەی نەتەوەیی کورد بچنەوە ... لەوانه توێژەر سۆن – soune – که نەتەوەی کوردی ئێستا ... که له رەگـەزی ئارییین و دەگەرێنـەوە بـۆ میـدیاکان کـه شـاری هەمـەدانیان کردبـوو بـه پایتـەخت و بنکەی دەسەلاّتی خۆیان .

جـا شـاری هەمـەدان ، کـه دەکەوێتـه هـەرێمی رۆژهـەلاّتی کوردسـتانی ژێـر دەسـەلاّتی ئێـران ... ئـەویش لـه دوای مـۆرکردنی پـەیمانی زەهـاو لـه سـاڵی ١٦٣٩ ی لـه نێـوان ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی و فارسـیدا ... کـه ئـەم شـاره مێژوونووس و لێکۆڵینەوەرانی تایبەت بە لێکۆڵینەوەی مێژووی کۆن ، کۆکن لەسەر ئەوەی که شاری هەمەدان یەك لەشاره مێژوویه کۆنەکانی کوردستانه ، که مێژوویەکەی دەگەرێتەوه بۆ زیاتر له ٩٠٠ ساڵ بەر له زایین .

هەروا شارێك بووه لـه بنکه هەره سەرەکیەکانی شارستانیەتی گەلانی هندو ئەوروپایی و ناوی له کتابی تەوراتی ئایینی جوولەکەدا هاتووه به ناوی مادی . ناوهێنانی هەمەدان بۆ یەکەمجار بۆ سەدەی ١١٠٠ بەر لـه زایین دەگەرێتـەوه ، کـه لـه نووسـراوەکانی مێخـی تایبـەت بـه شـای ئاشـووری تێگـل بلا سـەری یەکەم – ١١١٥ – ١١٠٢ – بەر له زایین .

ئەمـەش بـه شـێوەی ئامیدانـه یـا ئامـدانا ... لـەلای گریگەکانـەوه بـەناوی ئەکبەتانای دێرین ناسراو بووه .

له نووسراوه ئەخمیشیەکاندا به شێووازی هەکمقانا هاتووه ... له مێـژووی هیرۆدۆتس به شێووازی ئەلباتان یا ئەلبتانا .

بەلاّم به زمانی میدی ، ئەوا به شێووازی هانك متانا هاتووه ... بـەلاّم شـاری هەمەدان ناوەکەی خۆی لەناوی خوودی میدیەکانەوه وەرگرتـووه . ئەمـەش لەبەر ئەوەیه ، که ناوەکەی له نووسـراوەکانی ئاشووری بەشێووازی ئامدانه

هاتووە کە ئامادانا نیشتگەی میدیاکانە .... مێژوو لاپەرەکانی خۆی پرکردۆتەوە لە قوناخە یەك لە دوای یەکەکان لەسەر باری کوردو دوای ئەوە هێزی بەئیسلام کردن و بە عەرەبکردن و داگیرکردن ... بەناوی ئاینی نوێی ئیسلام ، لە ساڵی ٦٤٣ لەلایەن جریری کوری عەبدوڵلاّ بەجلی داگیرکراوە و لە مامەڵەی شۆڤینیانەی بەر چاو تەنگ بەردەوامن لە هەموو بوارەکاندا لە هەرێم و ناوچەکاندا .

٣٠ /٠٦٤٢/١١ لە دوای داگیرکردنی ناوچەی شارەزوور , بە تایبەتی شارۆچکەی خورماڵ لە لایەن هێزە چەکدارەکانی ئیسلام بە ناوی بە ئیسلام کردنی دانیشتووانی ناوچەکەو داگیرکردنی لە خورماڵ ... کە پەرستگایەکی ئاییني زەردەشتی لێبوو ... نەك گردێکی قەڵاکە لە سەر چاوەی کانیاوێك لەلایەنی رۆژهەڵاتی باشووری و راستەوخۆی رۆژهەلات ، بەرزبوو بە ٩ قوبەی بەرز ، کە بە کۆمەڵگەی کەوانەیی دروستکرابوو لە بەردو گەچ و خشت... کە تاکوو ئێستاش ئەو پەرستگایە لە هەستی دانیشتووانی ناوچەکە دەزرینگێتەوە . لە دوای داگیرکردنی لە لایەن هێزی چەکداری ئیسلام ... کرا بە مزگەووتی بە ئیسلام بووەکان لە هەرێمی باشووری کوردستان .

سەرچاوە :- حدود کردستان الجنوبیە تأرخیاً و جغرافیاً - چاپی دووەم/٢٠٠٥.

٠٦٤٣/١١/١٩ ئیمامی عوسمانی کوری عەفان خەلافەتی ئیسلامی گرتە دەست لە دوای کووشتنی عومری کوری خەتاب لەلایەن - ئەبا لۆلۆە - کە ناوی تەواوی مەیروز بوو ..... لە کاتی دەسەڵاتی ئیمامی عوسمان توانیان کەشتی جەنگی دروست بکرێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی سووپای بیزەنتی لەسەر کەنارەکانی میسر و شام . لەکاتی دەسەڵاتی ئیمامی عوسمان توانرا قورئانی پیرۆز لە یەك کتێب کۆ بکریتەوە و چەندین دانەی لیٚ کۆپی کراوەو ناردرا بۆ پایتەختەکانی دەووڵەتی ئیسلامی ... کە دانە بروا پێکراوەکەی لە شاری تاشقەندی پایتەختی ئازربایجانە ، هەردانەیك لەو دانەیەدا چاپ نەکرێت بەراست نازانرێت لەلایەن دام و دەزگا ئایینەکانی ئیسلام لە جیهاندا .

سەرچاوە:- مێژووی عەرەبی و جیهان - ئامادەکردنی سەیفەدین کاتب - دار الشرق - المؤسسة العلمیة لوسائل التعلیمیة . بیروت / سووریا /٢٠٠٥ .




ئەم نەخشەیە فراوانکردنی دەسەلآتی عەرەب و ئیسلامە

**٦٤٤م**

١/١١/٦٤٤م هێزە چەکدارەکانی کوردو هێزەکانی سووپای فارس هاووکاری یەکتر بوون ، لە پێناو بەرەنگار بوونەوەو بەرگری کردن لە یەکتر لە سەر خاکی خۆیان . بەهۆی هێرشەکانی داگیرکەری عەرەب بەناوی فتووحاتی ئیسلام لەناوچەکانی شاری دیالە و باکوورو رۆژهەلآتی شاری کووت و عیمارەو تکریتی ئێستا – ئەو ناوچانە لەو کات دانیشتووانی عەرەبی تیا نەبوو بەهیچ جۆرێك ، تەنیا رەشماڵەکانی مەر لەوەڕێن حووشترەوانەکان نەبێت– کە بەرەو خاکی کوردستان هەنگاویا ننا بەتایبەتیش لەسەرەتا بەرەو شارەکانی ئەهوازو فارس هەنگاویان دەنا .

کە ئەمانەش هەمووی لە ئەنجامی شەڕی خووێناوی لە نێووان هێزەکانی ئیسلام و هێزەکانی فارس بە ناوی فتووحاتی ئیسلامی و توانیان سەرکەوتن بەدەست بێنن ، لە رێگەی کووشتنی بە کۆمەڵی بێ ووێنەی دوور لە ویژدانی مرۆڤایەتی و بە تالآنکردن و دەربەدەرکردن و ئەنفال و تۆقاندن و سووتاندن ، کە بەو کردەوانە توانیان سەرکەوتن مسۆگەر بکەن.

شایانی باسە کردنە کە بەر لە وەش بەیەك ساڵ عومەر عەزە قەیس لە شاری چەلوانـەوە بـەرەو ناوچـەی شـارەزوری باشـووری کوردسـتان هـەنگاویاننا بەهێزێکی گەوورەی چەکدار .

بـەڵام نـەیتووانی ناوچـەی شـارەزور داگیر بکـات ، بـەڵام بۆجـاری دووەم بـەهێزێکی گـەورەتر بـە سـەرکردایەتی عەتەبـە فرقـەد روویکـردە ناوچـەی شارەزورو لە ئەنجامی شەڕیکی خووێناوی تـووانی ناوچەکە داگیر بکات لـە رێگـەی ناشیرنترین کـردەوە ،کە لـەو داگیر کردنـەش نـەیانتووانی بەتـەواوی لەناوچەکە بمێننـەوە بەهۆی بەرگری کـردن لـە ناوچەکە لەلایـەن جەماوەری کوردی ناوچەکە .

شایانی باسە کە هەر لەو رۆژە خەلیفە عوومەری کوڕی خەتاب کۆچی دوایـی کرد ، کە خەلیفەی دووەمی ئیسلام بوو، لە دوای ئەبووبەکری سەدیق .

شایانی باسـە کـە لـە سـەردەمی خەلیفـە عوومـەر مێـژووی کۆچـی دانـراوە... شـاری تکریـت بـەر لـە هـاتنی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی نـاوی ئـەو شـارە سەلاحەدین بـووە ، بـەڵام بـەهۆی بـەتورککردن نـاوی لـە شـاری سـەلاحەدین گـۆڕاوە بـۆ شـاری تکریـت . واتـە تـورکی ، کـە ئێـستاش تکریـت و سەلاحەدینیشی پێ دەگووترێ لە ئێراق .

## ٦٥٦ز

٠٦٥٦/٣/١ کووشتنی خەلیفەی ئیسلام عوسمانی کوڕی عـەفان لـە تەمـەنی ٣٥ ساڵیدا ، کە ئەو تووانی قورئانی پیرۆز یەك خات لـە کتێبێکی پیرۆزی ئاینی ئیسلام ، کە بەدەستەکانی خۆی نووسیوویەتیەوەو بەراست ترین قورئان دادەنرێتو دەستنووسەکەی ئێستا لە شاری تاشقەندی پایتەختی کۆماری ئۆزبەکستانە ، کە بۆتە سەرچاوەی بەچاپگەیاندنی قورئانی پیرۆز لە جیهان .

هـەروا لـە دوای لێکۆڵینەوەیـەکی وورد دەرکـەوت کـە خەلیفـەی ئیـسلام عوسمانی کوڕی عەفان لە ناو ماڵەکەی خۆی تیرۆرکرا ، کە سێیەم خەلیفەی ئیسلام بوو ، لـە کـاتی دەسـەڵاتی ئەو تـووانی تـوونسو جەزائرو مـەراکشو ئەنـدەلوسو دوورگـەی قـووبرسو دوایـی بەرەو ئێـراق بخاتـە ژێـر دەسـەڵاتی ئیسلام.

٠٦٥٦/٧/١ لە دوای رێکنەکەووتن لە نێووان ئیمامی عەلیو معاویە لە سەر بیروو بۆ چوون

و دەسەڵات بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی نێووانیان و بەردەوام بوونی ئە
دوژمنکاریە لەنێووانیان. لە و بەشە ئێراقەی ئەوکات ، کە لە ڕێگەی بـ
ئیسلام کردن و فتووحاتی ئیسلامی کەووتە ژێر دەستیان لە باشوور
ئێستای ئێراق ، وەك پارێزگاکانی ئێستای نەجەف و کەربەلا و قەزا
کووفەدا .

## ٠٦٦١

٠٦٦١/١/٢٤ لە کاتی نووێژی نیووەڕۆ ئیمامی عەلی بەدەستی عەبدولرەحمان کوری ملج
– شەبیب – تیرۆرکرا ، لە شاری کووفە لە ڕۆژئاوای پارێزگای بابل – حلە
– لە باشووری ئێستای ئێراق ئەویش لە ئەنجامی دژایەتی کردنی لەگەڵ
بنەماڵەی معاویەدا .

٠٦٦١/٥/١٧ حەسەنی کوری عەلی دەستی لە خەلافەت هەڵگرت و بۆ معاویەی کوری ئەبو
سفیان ... کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە خەلافەت گوواستراوە بۆ نەوە
ئەمیە ... ئەویش بە گەیشتنیان بەو ئاواتەی کە چاوەڕوانی بوون و لەپێناو
هەوڵیان بۆ دەدا .... ماوەی دەسەڵاتی ئەمەویەکان لە ٥/١٧ تاکو
٦٨٣/٨/٣٠ بەردەوام بوو ، ئەویش بە دوو قۆناخ تێپەڕبوو کە :
١– ماوەی دەسەڵاتی سفیانیەکان :– ئەو ماوەیەش کە دەسەڵاتی خەلافەتیا
گرتە دەست ، کە معاویەی کوری سفیان و کورەکەی یەزید ... کە ئەم قۆناخ
ماوەی ٢٣ ساڵ بوو لە دەسەڵاتداریەتیان .
٢– ماوەی دەسەڵاتی مەروانیەکان :– ئەم ماوەیەش خەلافەت گوواستراوە
مەروانی کوری حەکەم ، تاکوو مەروانی کوری محەمەدی کوری حەکەم ،
دوا خەلیفە بوو لە نەوەی ئومیە کە ماوەی دەسەڵاتەکەیان ٦٤ ساڵ بوو
٧٨٣/٨/٣٠ تاکوو ٧٤٩/٨/٢٠ . لەژێر دەسەڵاتی ئەمەویەکان سنوور
جووگرافی لە دەریای ئەتلەسی تاکوو سنووری چین فراوان بوو .
لەگەڵ ئەوشدا دەسەڵاتەکەیان بەرەو کزی هەنگاوی دەنا بەهۆی شۆرش
راپەرینە ناوخۆییەکانی ناو دەسەڵاتی ئەمەویەکان و یاخی بوون لە
دەسەڵاتەکەیان ... کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە پایتەختی دەسەڵاتەکەی
لەشاری کوفە بگوازنەوە بۆ شاری دیمەشقی پایتەختی ئێستای سووریا .

لـەو کاتەشـدا ئیمـامی عـەلی پایتــەختی دەسـەلاتەکەی لەشـاری مەدینــەی سعوودیە گوواستنەوە بۆ شاری کوفەی ئێستای ئێراق .
دوای ئەوە خەلافەت بەرەو هەڵووەشاندنەوە هەنگاوینا بۆ شانشینی میراتی ، بەتایبەتی لەلایەن ئەمەویەکان ، کە لەباوك بۆ کورەکەی یاخوود لـە یـەکێك بۆ دوانی دیکە یاخوود زیاتر ... هەروەك عەبدولمـەلك کـوری مـەروان ئەنجامیدا . لەگەڵ چەندین کاری دیکە لە بواری کۆمەلایـەتی وئـابووری و بازرگـانی ، جگە لەهەڵوویست و خواستی ئایینی لەدەسەلاتی ئیسلامدا .

سەرچاوە:– ئتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان / ئامادەکردنی سەیفەدین کاتب – دار الشرق – المؤسسة العلمیة لوسائل التعلیمیة . بیروت / سووریا /٢٠٠٥

٦٦٥م

٦٦٥/٣/٢٤م بۆ یەکـەم جـار تورکمـان گەیشتنە نـاو خـاکی ئێسـتای ئێـراق لـەو کاتـەی کـە عوبێدوللای کوری زیاد کە والی خۆراسان بوو .... ئەویش ژمارەیان نزیکەی ٢٠٠٠ هـەزار کـەس لـە تورکمـانی خـەزەر دەبـوو بـە چـەکدارکردنیان لـە ریـزی سووپاکەی لـەپێناو بـەرگری کـردن لەبەنـدەری بەسـرە لـە باشـووری ئێسـتای ئێراق .
هەروا فەزلی کوری یەحیای بەرمەکی ، کە والی خۆراسان بوو دوای عوبیـدوڵلا لـە سـاڵی ٧٥٦ نزیکـەی ٢٠٠٠٠ هـەزار تورکمـانی هێنـا ئێـراق و نیشـتەجێی کردن – لەحەربیە – ی تـەك شـاری بەغدا ، لـە دوای پەرەپێـدانی شـاری بەغدا لەلایەن خەلیفەی ئیسلام ئەبوو جەعفەری مەنسوور لە شارەکەدا .
ئەمەش سـەرەتای نیشـتەجێ بـوونی تورکمـان بـوو لـە ئێـراق و کاردانـەوەی لـە سەر بوارە جیاجیاکانی دانیشتووانی رەسـەنی ئێسـتای ئێـراق ... کـە ئەمـەش هۆکارێکی بنەرەتی بوو بۆ پتـەوکردنی ئـاینی ئیسـلام ، لـە پێنـاو داگیرکردنـی خـاکی گەلان ، بەتایبـەت خـاکی کوردسـتان لـە هـەموو بوارەکـان بـە تایبـەتی لـە بواری نەتەوەیی و نیشتیمانیدا .

سەرچاوە:– سنووری کوردستانی باشوور – مێژوویی و جوگرافی ل/٢٩٠، ئەلرەقیب یوسف چاپی دووەم /٢٠٠٥ .

٠٦٧٧

٠٦٧٧/٧/١ کۆچی دوایی خاتوو عائشەی کچی ئیمامی ئەبووبەکرو خێزانی پێغەمبەر دروودی خوای لە سەربێ .

٠٦٨٠

٠٦٨٠/١٠/١ ئیمامی حووسێنی کوڕی ئیمامی عەلی ، لە ئەنجامی دووژمنایەتی بنەماڵەکەی لە گەڵ بنەماڵەی یەزیدی کوڕی مەعاویە تیرۆر کرا لە شاری ئێستای کەربەلا ، لە باشووری ئێستای ئێراق .

٠٦٨٤

٠٦٨٤/٨/١٨ دوای کووشتنی حوسێنی کوری ئیمامی عەلی ، بزووتنەوەی – تەوابین – پێك هات – واتە تۆبەکار – بەسەرکردایەتی سوولیمان سەرد خوزاعی ... ئەویش لەپێناو وەرگرتنەوەی حەقی حوسێنی کوری ئیمامی عەلی ... ئەم بزووتنەوەیەش رووی لە هەرێمی جەزیرە کردو هەوڵی ئەوەیاندا ، کە لایەنگری زۆر بۆخۆیان کۆبکەنەوە ، کە دانیشتووانی ناوچەکە کوردبوون ... بۆماوەی چوار ساڵ لەناوچەکە مانەوەو لایەنگریان بۆخۆیان پەیداکرد ، بەتایبەتی لەناو دانیشتووانە کوردەکان ... بەلام ئەمەویەکان سووپایەکی زۆریان پێکهێناو هێرشیان کردنە سەریان و لە ئەنجام ئەم بزووتنەوەیە هەرەسی پێ هێنرا لە شەرێکی دژوار لە – عێن وردە – لەهەرێمی جەزیرە لەباکووری کوردستان.

تێبینی :– هەرێمی جەزیرە دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای کوردستان... کە هەرێمێکی کوردستانە بۆیە پێی دەوترێت جەزیرە .
چونکە دەکەوێتە نێوان هەردوو زێی دیجلەو فوورات لە سەر رووی شاری سەلاحەدین – تکریت – تا سەرچاوەکانی هەردوو رووبار یەك دەگرێتەوە ... کەلە هەرێمی جەزیرە کورد لەناوچەکانی سەروو نیشتەجێ بوونە بەتایبەتی لە بەشەکانی خۆرهەلات و باکووری خۆرهەلات ، بەر لە عەرەب و نەتەوەکانی دیکە ... ئەم هەرێمەش چەندین قەلاو شوورای تێدایە لەوانە :– نەسیبین – دارا – حەسەن کێف – ماردین – ئۆرفە – دیاربەکر – ئەرزن ، لە ناو خاکی کوردستاندا .

## ✍ ٠٦٨٥

٠٦٨٥/٤/١ کۆچی دووایی یەزیدی کوڕی معاویە و لە دووای خۆی کوڕەکەی جێگەی گرتەوە... شایانی باسە ئەو بنەماڵەیە لەگەڵ بنەماڵەی ئیمامی عەلی ، هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی دووژمنکاریان بەردەوام بووە ، لە باشووری ئێراقی ئێستا لە سەر بیروو بۆ چوون و دەسەلاتی دەوڵەتی ئیسلام .

## ✍ ٠٧٠٥

٠٧٠٥/١/٢ عەبدولمەلیك کوری مەروان دراوی زێری چاپکرد لە شاری دیمەشقی پایتەختی ئێستای سووریا بەناوی – دینار – کە بازنەکەی واتە قەوارەکەی – ١,٩–سم بوو . کە لەسەری نووسرابوو – الله احد الله الصمد لم يلد ولم يولد .

سەرچاوە:– ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان – ئامادەکردنی سەیفەدین کاتب – دار الشرق – المؤسسة العلمية لوسائل التعليمية – بيروت – سووريا /٢٠٠٥ .

٠٧٠٥/١٠/ کۆچی دووایی عەبدولمەلیکی کوری مەروان ، لە سەردەمی خەلافەتی ئەو دەوڵەتی ئیسلام ، کە تووشی چەندین دابەش بوون هات بەهۆی لێك ترازانی هەڵوێستی بەرپرسانی ئیسلامی لە پەرەسەندن و پێشکەووتن و گەشەکردنی باری کۆمەلایەتی و رووبەروبوونەوەی بیری زانستی و رۆشنبیری لە ئاستی زیاتری زانیاری لە ناوچەو هەرێمە جیاجیاکانی ژێر دەسەلاتی ئیسلام .

## ✍ ٠٧٠٨

٠٧٠٨/١١/ دامەزرێنەری بنەماڵەی – بەرمەکی – لەم رۆژەدا خالید بەرمەکی لەدایك بووە ... کە یەکەم کەسیش بووە بۆتە ئیسلام لەو بنەماڵەیەداو دژی ئەمەویەکان رەفتاری کردووەو یارمەتی دەری دامەزرێنەری دەووڵەتی عەباسی بووە ... هەروا بۆتە یەکێك لەسەرکردەو پیاوانی ئەبوو موسلمەی خۆراسانی و هاوکاری بووە لە بەهێزکردنی لایەنگیرانی لە پێناو پتەوکردنی دەسەلاتی عەباسیەکان . دوای مردنی خالد بەرمەکی لەسالی ٧٧٩ یەحیای کوری جێگەی باوکی گرتەوە لە خزمەتکردنی دەووڵەتی عەباسی لەهەموو بوارە جیاجیاکان .

جێگــەی ئامــاژە پێکردنــە کــە بەرمەکیــەکان بنەماڵەیــەکی کــوردی نــاوداری کوردســـتان و عـــەرەب و جیهـــان بوونـــە ... ووشـــەی بەرمـــەکیش نازنـــاوێکی ئاینیــە... رووناکبیرو فەیلەســوف و نووســەری کــورد –خەلــەکان – خــاوەن کتێبی – وفیات الاعیان و انبا و أبنا و الزمان – دا دەڵێ :–

بەرمەکیـــەکان لـــە هـــۆزی – زراری – کوردینـــە . هـــەروا زۆر لـــە نووســـەرو فەیلەســوفەکانی پێــشوو گووتویانــە کــە بەرمەکیــەکان فارســن . بــەڵام ئــیبن خەلەکان دەڵێ :– ئەوە کارێکی سەر سوورهێنەر نیە ، کە هۆکارێکی ئەوە بێ کــە بنەماڵەیــەکی کــوردی نیــە ... لەبــەر ئــەوەی ووشــەیەکی نەتــەوەیی نیــە و بەرمەکیەکانیش – فارس و ئاگر پەرست بوونە ... کە ووشەی فارسی مانای ئەوەیە کە ووشەیەکی رامیاری و ئاییینیە .

لە بەر ئەوەی کە کورد خاوەن دەسەڵات بوونە لە باشووری رۆژئاوای ئاسیا ، بەر لە سەدەی شەشی پێش زایین ... بەتایبەتی لەکاتی دەسەڵاتی میدیاکان کــە فــارس ســـەربەو ئیمپراتۆریەتـــە بوونـــە ... ئەمـــەش بـــەردەوام بـــووە لەســەردەمەکانی – ئەرشــاکیین و ساســانیەکان و تــاکوو دەرکــەووتنی ئــاییینی ئیسلام . کە کــورد و فــارس بربــڕەی پــشتی ئیمپراتۆریــەتی میدیابوونــە ، کــە هــەڵگری بــڕوای ئــاییینی زەردەشــتی بــوون . هــەر وەك موئــەریخی یۆنــانی – هیرودۆت – باس لە هێرشەکانی ئەخمینی دەکات و دەڵێ:–

پیاوە ئازاکانی کورد لە شەڕی – کوگمیلا – لە نزیك شاری هــەولێر لە ساڵی ٣٣١ بــەر لــە زایین لــە نێوان دارای سێیەم و ئەسکەندەری مەکدۆنی روویداو سەرکەووتنیان بەدەست هێنا لەم شەڕەدا و ئەسکەندەر کوژرا .

زۆر لە نووسەرو رووناکبیرو رۆژهەڵاتناسەکان باس لەوە دەکەن کە فارس بەر لــە کـــورد خـــاوەن نەتـــەوەو خـــاك بوونـــە ... بـــە تایبـــەتی عـــەرەب لـــەدوای دەرکەووتنی ئاینی ئیسلام و لە رێگەی فتووحاتی ئیسلامی ... باسکرا کە ووشــەی فــارس مانــای رامیــاری و ئــاینی و رۆشــنبیری دەگەیــەنێ ، نــەك نەتەوەیی ... لە بەر ئەوەی دەرکەوتنی ووشەی فارس – لــە تێکۆشــەر یا وەك ئەمرۆ پێشمەرگە هاتووە .

دوای ئــەوە ئــەم ووشــەیە و فــارس لــەدوای کۆتاییــەکانی هــەرەس هێنــانی ئیمپراتۆریــەتی میــدیا دەرکــەوتوون ... کــە دەســەڵاتی میــدیاش دەســەڵاتێکی

کوردی بووە ... کە فارس و کورد نەوەی میدیاکانن و لە نژاد ئارین ، بەر لەو دیاریکردنەش فارس و کورد لێك جیانەبوونە لەهەردوو لایەنی نیشتیمانی و نەتەوەیی و ئاینیدا ... کە ئەمەش بەڵگەیەکی دروستە لەهەموو بوارەکان بە پێی پێپەربوونی قۆناخەکانی مێژوودا .

بەڵام لەدوای کۆتایی هاتنی دەوڵەتی میدیاو دەرکەووتنی ئایینی جوولەکەو مەسیح ... بە تایبەتی ئایینی ئیسلام باری جیهان بە تایبەتی لە کیشووەری ئاسیا وڕۆژهەڵاتی ناوەراست چەندین گۆرانکاری بەخۆوە بینی و چەندین لایەن لێك ترازان ، بەتایبەتی لەبواری نەتەوەیی و نیشتیمانی و ئایین لە ناوچەو هەرێمەکاندا .

### ٠٧١٨

٠٧١٨/٨/٣ دوای ئەوەی کە عومری کوری عەبدولعەزیز دەسەڵاتی گرتە دەست و دراوی ئەمەوی چاپکرد بەناوی – دینار – لەشاری دیمەشقی پایتەختی ئێستای سووریا و پایتەختی دەسەڵاتی ئەمەویەکان ، کە قەبارەی –٢–سم بوو ... لەپێناو بووژاندنەوەی ژێرخانی ئابووری و بازرگانی لە ژێر دەسەڵاتەکەیدا .

سەرچاوە :– ئەتلەسی عەرەبی و جیهان – ئامادەکردنی – سەیفەدین کاتب – دار الشرق – المؤسسة العلمية لوسائل التعليمية – بيروت – سووريا /٢٠٠٥ .

### ٠٧٢٠

٠٧٢٠/٢/٩ هەشتەم خەلیفەی ئیسلام لە بنەماڵەی ئەمەویەکان عەبدولعەزیز کۆچی دوایی کردووە .

### ٠٧٢٤

٠٧٢٤/١/٢ نۆیەم خەلیفە لە بنەماڵەی ئەمەویەکانی ئیسلام یەزیدی کوری عەبدولمەلك کۆچی دوایی کردووە.

٠٧٤٣




٠٧٤٣/١٠/٢ هونەرمەنـدو مۆزیکـا ژەنـی کـورد – ئیـسحاق ئیـبراهیم مووسلی – لە شاری کوفەی باشووری ئێستای ئێراق لە دایك بووە .
جێگەی ئامازە پێکردنە کە لە ئایین جوولەکەیەکی کورد بووە لە باشووری کوردستان و بۆتـــە ئیـــسلام ... لـــەو ســـەردەمدا بـــەناوبانگترین گـۆرانی بێـژ بـووەو لەهـەمان کـات وانـەی مـۆزیکی گووتۆتـەوە بـەئامێرەکانی ئـەو کـات . بـەهۆی توانـای گـۆرانی و مۆزیکـا و دەرکـەووتنی کەسـایەتی بـەهۆی ئـەم بـوارە ... بۆتـە هاورێی مەهدی و هارونە رەشید ، کە هەردووکیان خەلیفەی عەباسی بوونە ... ئەم کەسایەتیە لەکارە هونەریەکانی بەردەوام بووە تاکوو لە ٨٠٣/١٢/٢٠ لەشاری بەغدا کۆچی دوایی دەکات .

سەرچاوە :– الموسوعە العربیە ٤/١ .

٠٧٤٥

٠٧٤٥/١٠/٣ ئەمەی خوارەوە دەقی راسپاردەکەی – ئیمامی ئیبراهیمی عەباسیە بۆ ئەبوو موسلمەی خۆراسانی :–
ئەی عەبدولرەحمان :– تۆ پیاوێکی لە ئێمـەی لـە بنەماڵـەی پێغەمبـەری – د.خ – بۆیە راسپاردەکانم وەربگرەو بیپارێزە ... سەیری ئەو بەرەی راستت بکە ، کـە خۆرهەلاتـە . خەلافەتایـەتیان بکـە و چارەسـەری کێشەکانیان بکـە . خـوا دەزانێت ئەم هەوڵەمان بێ ئەوان تەواو نابیت .
سەیری بەری – رەبیعـە – بکە فەرمان و داواکانیان بزانە . سـەیری بەرەی – مزر – یش بکە ... کە ئەوان دووژمنی سەرەکی و نزیکی بنەماڵەکەتن . بۆیە

گوومانت لە هەرکەسێکیان بوو بیانکووژەو لێیان بدەو ئەگەر توانیشت مەهێڵە لە خۆراساندا یەکێك بە عەرەبی قسەبکات .
تەنانـەت ئەگـەر منالێکیـان گەیـشتە تەمـەنی پێنـج سـاڵی بیکـووژە . ... هـەروا سەرپێچی – سوولەیمانی کوری کەسیری خوزاعی – مەکە . گەر لەگەڵێشیدا نـەگوونجایت و تووشـی کێشەیەك بوویت. بـەڵام بیگـەرێرەوە . مەبەسـت لـەوە نیە کە ئەبوو موسلم لە بنەماڵەی پێغەمبەر بووبێت .

سەرچاوە :– تەبەری – تاریخ الامم و الملوك /٦/١٤ – ١٥ .

## ٠٧٤٧

٠٧٤٧/٦/٩ رووداوەکـانی دەسـەڵاتی بنەماڵـەی ئەمـەوی ئیسلامی لـە بـوارە جیاجیاکـان بەرەو پێشبردنی باری دەسەڵاتی ئاینی ئیسلام ، کە ئەنجامەکەی بووە هۆی لێك ترازانی بیروو بۆچوون و هەڵوێستو بـروای جیا لـە ئـاینی ئیسلام ، کـە بەشـێووەیەکی فـەرمی کـەرت بـوونی ئـەو ئایینـە بەدوو مەزهـەبی شیعەو سوونە لەو رۆژەدا دەستی بەتەشەنە کردن کرد لەسەر خاکی خوراسان و داوا کردنـی بنەماڵـەی هاشـم ، کـە نـزیکترین بنەماڵـە بـوون لـە پێغەمبـەر دروودی خوای لە سەر بێت بەدیاریکردی گونـدی – حەمیمـە –ی باشـووری دەریای مردو– بحر المیت – لەسەر رێگای کاروانی حاجیەکان کە ئەنجامی بووە هـۆی بەرپابوونی شۆرشـی دەسـەڵاتی ئەمـەوی بەسـەرکردایەتی ئـەبوو مووسلمەی خوراسانی بە سەرکەوتنی بە سەر مەروانی دووەم .
کە – مووسلمەی خوراسانی لە نژاد کورد بووە – ئەم شەرە پـەرەی سـەند لە فەلەستین و حوومس و ناوچەکانی دیکە . ئەویش بە هـۆی گوواسـتنەوەی دەسـەڵاتی بـۆ– حـران – لەلایـەن مـەروانی دووەم کـە لـەو رۆژە مەزهـەبی شـیعەو سـوونە سـەری هەڵـدا لـە دووژمنکاریـەتی نێووانیـان . کـە تـاکوو ئێـستاش لـەجیهانی ئیـسلامی بەتایبـەتی لـە ئێـران و ئێـراق و سـووریاو چەندین جێگەی دیکە وەك ئەفگانستان و پاکستان.
لـە مـاوەی سـەر هەڵـدانی ئـەو دوو مەزهەبە تـاکوو ئێـستا بەسـەدا شـەڕی دژوارو خووێنـاوی لە نێووانیانـدا بەرپابووە ، بە تایبـەتی لـە ئێراق ، کە تـاکوو تـەوواو بـوونی ئـەو مێژوونامەیە . شـەڕی نێـووان شیعەو سوونە

بەشـێووەیەکی نافـەرمی بەردەوامـە ، بـە تایبـەتی لـە دوای رووخانـدنی دەســـەڵاتی رژێمـــی بەعـــسی ئیـــسلامی ســـوونە لـــە ئێـــراق لـــە رۆژی ٢٠٠٣/٤/٩دا.

٠٧٤٩.

٠٧٤٩/٨/٢٠ عەباسـیەکان بـەهۆی کۆمـەڵێ نهـێنی و لـە سـایەی ئازایـەتی کەسـایەتی ناوداری کورد ، ئەبوو موسلمەی خۆراسانی ، بوونەتە دەسەلاتدار .... ک پادشـای هـەموو وولاتـی ئیـسلام بـوون .....کـە یەکـەم جـار پایتـەختی شارۆچکەی کوفەی باشووری ئێستای شاری بەغدا بووەو دوایی پایتـەختی گوواستەوە شاری بەغدا .

یەکـەمیان عەبـدوڵلای کـوری محەمـەد :- عەباسـی سـەفاح - هاتنـە سـەر دەســـەڵاتداو لەســـاڵی ١٢٥٨ بـــە کـــووژرانی - موعتەســـەم کۆتـــایی بـ دەسـەڵاتەکەیان هـات .... واتـە ٥٤٤ سـاڵ عەباسـیەکان دەسـەڵاتدار بـوون لەسـەر وولاتـی ئیـسلام .... لـە نـاوەرۆکی مێـژوو نامەکـە باسـی چـۆنیەتی کووشـتنی ئـەبوو موسـلمەی خۆراسـانی کـراوە ، لەلایـەن خەلیفـە ئـەبوو جەعفەری مەنسوور لەناو دیوەخانەکەی خۆیدا لەشاری بەغدا .

٠٧٤٩/٨/٢٠ لـە ٢٠/ ٧٤٩/٨ بـە کۆتـایی هـاتنی دەووڵـەتی ئەمـەوی و دەسـت پێکردنـی دەســـەڵاتی دەووڵـــەتی عەباســـی ... ئـــەویش لـــە دوای ســـەرکەووتنی داوای عەباسیەکان لە بنەرەتدا هاوکار بوون لەگەل داوای -آل البیت- واتە خەلیفـ و ئیمامـەکانی ئـاینی ئیـسلام ... لـە دوای کۆچـی دوایـی بێغەمبـەر -د.خ - ئەمـەش بـووە هۆکـاری ئـەوەی ، کـە عەباسـیەکان توانیـان سـەرکەوتنەکان بگـوونجێنن لەگـەل ئاواتـەکانیان و بـە دامەزرانـدنی دەووڵـەتی عەباسـیان راگەیانـد لـە شـاری کوفـە ، کـە بنکـەی سـەرەکیان بوولـە رۆژانـی یەکـەمی خەلیفەی یەکەمی ئەبوو عەباسی ئەلسەفاح .

دوای ئـــەوەش خەلیفـــەی دووەمـــی عەباســـی -ئـــەبوو جەعفـــەری کـــوری مەنسوور- لە شاری بەغدا ، کە لەو کاتە وەك گوندێکی گەوورە بوو ... بە هەوڵی ئەو شاری بەغدا توانی ئاوەدان و بووژاندنەوە و گەشە کردنێکی بەر چاو بە خۆوە ببینیٚ لە نێوو شارەکانی جیهان... کە ئەو کات لە شێووەو

شێووازێکی شارستانی خۆی دەرخست ، بەهۆی بوونی شوونەوارە مێژووییەکانی بابل و حەزەر و هەولێر ونەمردو چەندین جێگەی دیکە لە وولاتی نێوان دوو زێ ... میزۆبۆتامیا لە ناوچەکەدا .

دوای ئەوە سنووری دەوولەتی عەباسی زۆر فراوان بوو لە سەردەمی هارونە رەشید ، کە لە رۆژهەلاتی هندستان و چووە ناو چوار چێوەی ناوچەکانی رۆژهەلات وەك ، ئێرانی ئێستاو و ئەفگانستان و سنە و خوارزم و دوواوەی زێی دوورگەی عەرەبی لە باشوورو باکووری ئەفەریکیا ، جگە لە وولاتی مەغرب ... دوای ئەوەش دەوولەتی – ئەدارسە – هەروا فراوان بوویەرەو رۆژ هەلات و باشوری دەریای ناوەراست و، هەروا دوورگەی قووبرسی و رۆدس و گریت و سقلیە و بەرەو باکووری وولاتی کەرەج و قەوقازو رۆژهەلاتی دەریای رەش هەنگاوینا لە کێشووەرەکەدا .

ئەم نەخشەیە فراوان بوونی دەسەلاتی عەرەب و ئیسلام دیار دەکات لە داگیر کردنی خاکی نەتەوەکان . و دەر چوون لە دوورگەی بیابانی گەوورەی عەرەبی ...؟...!.

کە لەو کاتیش شاری بەغدا بووە مەلبەندی بازرگانی وژێرخانی ئابووری و بازرگانی دەوولەتی عەباسی و کاریگەری مەزنی لە بەهێز بوونی ئەو

دەسـەڵاتە هـەبوو ، لـە هـەموو بوارەکـان لـە سـەردەمانی زێرینـی دەوڵـەتی
عەباسـی ، لە سـەردەمی خەلیفەکانی ئاینی دەستی پێکرد ، یەك لە دوای
یەك لە سەرەتای دەوڵەتی عەباسی تاکوو ناوەندی دەسەڵاتی مەئموون لە
سەر دەوڵەتەکەدا .

دوای ئـەوە دەوڵـەتی عەباسـی بـەرەو کزبوون هـەنگاوینا ، ئـەویش بـەهۆی
سەرهەڵدانی وویلایەتی بچووك لەلایەن پێکهاتەی نوێ ، وەك تورك و مەگۆل
و فـارس و هنـدی و، بـەردەوام بـوون تـاکوو کـەووتنی پایتـەختی دەوڵـەتی
عەباســی ، کـــە شـــاری بەغـــدا بـــوو لەســـەر دەســـتی مەگۆلـــەکان لـــە
١٢٥٨/١/٨دەوڵەتی عەباسی رووخێنرا .

سەرچاوە :– ئەتلەسی عەرەبی و جیهان – ئامادەکردنی – سەیفەدین کاتب – دار الشرق – ا لمؤسسة العلمیة لوسائل التعلیمیة – بیروت – سووریا /٢٠٠٥ .

٠٧٤٩/٨/٢٠ لەو کاتەی کە سەردەمی دەسەڵاتی عەباسیەکان بوو ، لەم رۆژەوە دەستی
پێکـردوو بـەردەوام بـوو تـاکوو سـاڵی ٨٤٦ ... کـە دیاردەیـەکی سـەیری
شارستانی لەناو دانیشتوواندا پەیدا کرد ، بە تایبەتی لە ئێراق . کە ئەو
خێزانە عەرەبانەی بەهۆی فتووحاتی ئیسلامی روویان لە وولاتی نێوان دوو
رێ – میزۆبۆتامیـا – کردبـوو ..... لـە ٣٧ خەلیفـەی عەباسـی تـەنیا سێ
خەلیفە لە دایك و باوك عەرەب بوون .

ئەوانیش – ئەبوو ئەلعەباسی سەفاح – مەهدی کوری مەنسوور – محەمەد
ئـەمین هارونـە رەشـید – ئـەوانی دیکـە باوکیـان عـەرەب و دایکیـان لـە
دانیشتووە رەسەنەکانی ئێراقی ئێستا بوونە . وەك کوردو فاس و ئارامی لە
وولاتی نێوان دووزێ .

که ئەمەش هۆکاری بەهێزبوونی جێ پێگەی عەرەب بووە لە فراوانکردنی
سـنووری جـووگرافی ، ئـەویش بـە داگیرکردنـی خـاکی گـەلانی دیکـەو
نیـشتەجێ بوونییـان لەسـەر ئـەو خاکـە ، ئـەویش بـە زەبـری شمـشێرو
تۆقاندنی دانیشتووانی رەسەنی وولاتی نێوان دووزێ لە هەموو بوارەکاندا
... مێژووی روادوەکانیش شاهدن لە شایەتی دان لەسەر راستیەکان .

٠٧٤٩/٩/٢٣ بە هـۆی بـاری نـا لـە بـاری ژێـر دەسەڵاتی ئەمەویـەکان بە تایبـەتی بە بلاو
بوونـەوەی نەخۆشـی تـاعوون و لە ناوچوونی زۆربـەی خـەڵك ، لە ئـەنجامی
برسـیەتی و هـەژاری و لێـك ترازانـی پەیووەنـدی کۆمەڵایـەتی بـووە هۆکـاری
سەرەکی لە کەووتنی دەوڵەتی ئەمەویەکان.

٠٧٤٩/١٠/٢٩ هێزە چەکدارەکانی کورد ، یارمـەتی هێزەکانی سووپای خەلیفە مەروانیان دا . دژی سلێمان کە رووی کردبووە کوردستان و نەدەچووە دەرەوە .
شایانی باسە خەلیفە مەروان دایکی کـورد بـووە ، کە لـە کـاتی خـۆی بـاوکی والی بـووە لـە کوردسـتان . کـە لـەو کـاتیش لـە کوردسـتان لـە دایـك بـووە ، لەپاش باوکی بەرپرسیاریەتی والی گرتۆتە دەست لەسەر دوورگەی ئەرمینیا لـە ناوچـەی شـاری ، دوای ئـەوە خەلیفـە مـەروان بەیارمـەتی کـورد دژی خەلیفە ئیبراهیم جەنگاوەو دوواییی بەرەو شام هەنگاوینا بەرەو بەعلەبەگ و شام ، کە بووە هۆی ئەوەی کە هێزەکانی خەلیفە ئیبراهیمی بەزانـدو چـووە نـاو شـاری دیمەشـق لـە شـام و دەسـەڵاتی خەلافـەتی راگەیانـد لـە هـەرێمی شامدا .

٠٧٤٩/١٠/٣٠ لـە ئاکامی بـەردەوامی شـەڕی ناوچـەی کووفـە لـە نێـوان هـەردوو مەزهـەب نـوێی شـیعەو سـوونـنەی ئیسلام ، کە کەووتـە ژێـر دەسـتی شـەرکەرەکانی ئیسلام ، بە هۆی دەروازی کوڕی عەباس بووەو بە باوکی عـەباس خـەلیفـەی ئیسلامی ئەمەویـەکان لـەناو چـوون و ئالای سپی مەزهـەب سوونـنە ، بـەرە بـەرە دەهاتـە خـوارێ و ئـالای رەشـی مەزهـەب شـیعە بەرزدەکرایـەوەو شۆرشەکە بەردەوام بوو تـاکوو گەیشتە رۆژ ئـاوای زێـی گـەورەو رۆژئـاوای شاری بەغدا.

٠٧٥٠

٠٧٥٠/٨/٨ پایتـەختی ئیـسلام ماویـەکی کـەم لـە شـاری مەککـە مایـەوە ، بـەهۆی بـەرپابوونی شـەڕیکی خووێنـاوی و کۆتـایی هێنـان بـە خـەلیفەکانی سـەدری ئیسلام . لەلایـەن ئەمەویـەکان و دامەزرانـدنی زنجیرەیـەك لـە ئیمپراتۆریـەتی خەلافەتی عەرەبی بە ناوی ئەمەوی لە هەرێمی شامدا .
هـەروا دەسـەڵاتی ئـەوانیش زۆری نەخایاند لەلایـەن بنەماڵـەی عەباسـیەکان بەهاوکاری گەلانی دیکەی غەیرە عـەرەب لـە دانیـشتووانی کـوردی باشـوورو فارس ، لە ئەنجامی شەڕیکی سەختدا لە سـەر زێـی بادینـان لـە خووارەوەی مووسڵ لەناو بران و ئیمپرتۆریـەتی خەلافەتی عەباسـی دامـەزراو پایتـەختی لـە شـام گواسـتراوە بـۆ شـاری بەغـدا لـە نزیـك کـەلاوەکانی تەیـسفوونی

پایتەختی ساسانیەکان . کە باو باپیرانی ساسانیەکان بەر لە سەدەیەك رووخاندبوویان.
شایانی باسە هێنانی پایتەختی خەلافەتی عەرەبی ئیسلامی عەباسی بۆ بەغدا بەپێی دەیا نەخشەی دارێژراوو، واتە راستەوخۆ بۆ لای خوواروی شووێنی دێرینی خاك و ژیانی کوردو بەکردەوە کوردی خستە ژێر تینی گووشاری رووبەرووی بەردەوامی عەرەب و تەعریبکردن .
چونکە هیچ نەتەوەو دەوڵەتێکی دیکەیان لە نێووان نەبوو، هەم خۆیی و هەم نیشتمانکەی بوونە لە مبەرێکی مرۆیی و خاکی لە نێووان هۆزەکانی عەرەب ، لەلایەك و گەلانی فارس و ئەرمەنی و بێزەنتی لە لایەکی دیکەوە... لافاوی بەخووری عەرەب ، کە لە ماوەیەکی کورتدا خوارووی میزۆبۆتامیای گرتەوە.
بەلاّم نەیتووانی لە بنارەکانی چیای زاگرۆس . واتە لە سەر سنووری تەواوی خاکی کوردستان زیاتر تەشەنە بکات و بتەنێتەوەو لەوێ وەستا ؛ بەهۆی بەرگری توندی کورد لە خاك و نەتەوە لە کوردستان ، واتە لە رۆژئاواو باشووری کوردستان.
٠٧٥٠/٨/٩ بانگەشەی عەباسیەکان لە ماوەی سی سالّی رابردووی لە رێکخستنی نهێنی نێوکانیان ، کە پشتیان بە کۆمەلانی خەلکی هەرێمەکانی خوراسان و ئەودیووی رووبارو شارۆچکەی کووفە بە ستبوو ، لە دەست پێکردنی ئەو کارانە . کە دەگەراوە بۆ سالّەکانی ٧٣٠ ، کە ئەو پشت بەستنەش لە سەر کۆمەلێك بەلێن و پەیمان وەستابوون ، کە عەباسیەکان بەدانیشتووانی ئەو هەرێمانەیان دابوو .
لەوانەش کەمکردنەوەی باجەکان و زیاد کردنی یاداشتەکان و بەرزکردنەوەی پلەو پایەیان لە دەسەلاّتی ئایندەیان دا... بەلام دوای سەرکەووتنیان بە دامەزراندنی دەولەتی عەباسی لە پاداشتی ئەو هاوکاری کردنە ، بەشێکی زۆر لە دانیشتووانی کووفەو دەووروبەری ، بە تایبەتی کۆمەلە نژادە غەیرە عەرەبیەکان کە بە (موالی) ناسراو بوون ، خەلیفەی عەباسی کەووتە راوودوونانیان و لێدان و کووشتنی زۆربەی ئەوانەی رۆلی سەرکردایەتی و کاریگەریان لەسەر خستنی بانگەوازەکە دا هەبوو.
لە وانیش ئەبوو مووسلمەی خوراسانی کە بەنژاد کورد بوو . ئەو

راوودوونانەش بووە هۆی دورست بوونی رق و بێزاری دانیشتووانی ئەو هەرێمانە ، لەوانەش هەڵگری بیری ئایینی مانیەکان بەرامبەر بە خەلافەتی عەباسیو ئەو دەوڵەتە تازە دامەزراوە عەرەبەدا – مانیەکان – واتە هەڵگری بڕووای ئاینی مانی کە لە کوردو فارس پێك هاتبوون ولقێکی مەزهەبی ئاینی زەردەشتی بووەن .

ئەمە لەلایەكو لەلایەکی دیکەوە عەباسیەکان بەهۆی کۆمەڵێ کاری نهێنی لە سایەی ئازایەتی ئەبوو مووسلمەی خوراسانی ، کە بووە پادشای هەموو ئیسلام و لە دوای هاتنە ناو خاکی ئیستای ئێراق بە هۆی فتووحاتی ئیسلامو داگیر کردنی خاکی گەلان ، کە پایتەختیان بووە گوندی کووفە ، کە ئێستا قەزایەو دوای ئەوە چووەتە شارۆچکەی بەغدا ، کە ئێستا پایتەختی ئێراقە ، لەم رۆژەدا عەبدوللای کوڕی محەمەد . کە ناو زەند بووە بە – عەباسی سەفاح – بووە دەسەڵاتدار تاکوو کوژرانی بەدەستی – معتەسەم –و کۆتایی بەدەسەڵاتی عەباسیەکان هات لەساڵی ١٢٥٨، کە ٥٤٤ ساڵ عەباسیەکان دەسەڵاتدار بوون.

کە هەموو رێیو شووێنو فێرکردنو رێگە نیشاندەریان ئەبوو مووسلمەی خوراسانی کورد بووە ... دوای ئەوە ئەبوو جەعفەری مەنسوور لە ناو دیووەخانەکەی خۆی تیرۆری کرد... ئەمەش هونراوەکەی شاعری ئەبوو جەعفەری مەنسوورە کە زۆر دژایەتی ئەبوو مووسلمەی خوراسانی دەکرد ، ئەمەش رەووشتەکانی عەرەبە(باوکی گووناهبار خوا لە بەندەنا گۆری تابەندە لە خۆی نەگۆری ... تۆڵەی مەنسوور بوویو تەمای غەدرت هەبوو... بەڵێ دەزانین باوکە کوردەکانیشت هەر ئەهلی غەدر بوون .

خووێنەرو گەلی کورد تێبگە کە...؟...گەر عەرەب بەرماری نووێژ کردنیان لە ئاسمان بشەکێتەوە لە چاکەو پیاوەتیان ... جێگەی بڕووا نین ... چونکە عەرەب درۆو دزیو فێڵ کردنو خیانەت بەئازایەتی دەزانن... !. ..؟

٠٧٥٠/٨/١٥ لـه کۆتاییـەکانی دەسـەڵاتی عەباسـی وولاتـی شـام کەووتـه ژێـر دەسـتی عەباسـیەکان و دووایـش شـاری دیمەشـق ، دوای ئـەوە مـەروانی دووەم لـه گووندی بوێسری میسری دەسگیر کراو کووشتیان و سەریان رەوانه کرد بۆ خەلیفەی باوکی عەباسی، ئەو فتووحاته پەرەی سەند، کە لـەدووایی شاری کووفه بووە پایتەختی دەسەڵاتی نوێی مەزهـەب شیعەکانی ئیسلام ، دوای ئەوە پاسەوانەکانی ئەبوو ئەلعباس . کە هەمووی لە دانیشتووانە فارسەکان بوون و وردە وردە فارسەکان پلەو پایەی گرنگیان گرتە دەست کە هەموویان دانیشتووانی خوراسان بوون.

٠٧٥٠/١١/٢٩ دەرکـەووتنی هەڵوویـستی مانیـەکان بـۆ سـەرەتاکانی دامەزرانـدنی ئـەو دەووڵەتـە دەگەرێتـەوە ، کـە لـە دوای ئـەوەی – عەبدوڵلای کوری محەمـەد – ناسراو بە – ئـەبوو ئەلعەباسـی سەفاح – وەلیدی کوری سـەعدی ئـەزدی – لەشاری کوفه – بەیعەت – ی پێدرا .... بەو رووداوەش کۆتایی بەدەسەڵاتی خەلافەتی ئەمەوی هـات ، لەلایەکی دیکە رۆڵـی بنەماڵـەی عـەرەبی ئیـسلام و هاوپـشتیووانی لـە رەگـەزو ئاینـەکانی دیکـە دەرکـەووت لـە هـەرێم و ناوچەکەدا.

کە لە نێوانیانـدا – مانیـەکان – بوون... سـەرەتاکانی هەڵوویستیـشیان بە هاوکـاری کردنـی بانگـەوازو پـشتگیری لـە دامەزرانـدنی دەووڵەتەکە دەسـتی پێکـرد ... لـە بەرامبـەر ئـەو بەڵێنانـەی کـە عەباسـیەکان بـەوانیان دابـوو کـە دەستی یارمەتی و پشتیووانیان بۆ بانگەوازەکە درێژکرد... لەوانە :–

١– ئەو ناوچانەو هەرێمانەی کە بنەماڵە عەباسیەکان پشتیان پـێ بەسـتبوو، لـە شـاری کوفـەو هـەردوو هـەرێمی خۆراسـان و ئـەودیوی رووبـار بـوون ... کوفەی نزیك شاری بابلی پایتـەختی ئاینی مانیەکان... ئەو دوو هەرێمـەش دوو مەڵبەندی گرنگی پەیرەوانی مانیزم بوون .

٢– یـەکێك لـە سـەرکردە هـەرە دیارەکـانی ئـەو بانگـەوازە ، کەسـایەتیەکی هەرێمی خۆراسان بوو بەناوی – بەهزادانی کوری ونداد کوری هورمزد – کە بـە –عەبـدولرەحمان – ئـەبوو – موسـلمەی خۆراسـانی ناوزەنـد بـوو – لای مێژوونووسەکانی عەرەبی ئیسلام ناسراوەو ناوبراوە، کە ئەبوو موسلمەی خۆراسـانی کـورد بـووە لـە نـژاددا... لـە زۆر جێگـەی دیکـەش باسـی ئـەبوو

موسلمەی خۆراسانی کراوە.

سەرچاوە:- عەبدولرەحمان بەدەوی - من تاريخ الأسماء من الاسلام - د - بەهائەدین بازارگاد - کرونۆلوژی تاریخ ئیران - ل ۹/ .

## ۰۷۵۳

۰۷۵۳/۷/۷ مانیەکان و بەشداریکردنیان لەو راپەرینانەی کە لە سەردەمی یەکەم خەلافەتی عەباسی ئەنجامدرابوون ... ئامانجیش لەو هەڵوویستە دروستکردنی فشارێك بوو لەسەر ئەو دەسەڵاتە و گەیشتن بوو بەو بەڵێنانەی کە پێشتر پێیان دابوون ، بە گەراندنەوەو دەستکەوتنیان بەو ئەرك و مافانەش بوو ، کە پێشتر لێیان زەوت کرابوو .

لەبەر ئەم هۆکارانە چەندین راپەرینی رامیاری و سەربازی لەلایەن مانیەکان ئەنجامدرا ، لەوانە راپەرینی .... بەهافەرید ... ئەم راپەرینە ... لەلایەن ... بەهای کوری فافەرەیدون ...کەخاوەن گوندی - زۆزن - ی نزیك شاری نیشابووری هەرێمی خۆراسان سەرکردایەتی کرا .

ئەویش بەر لە کووشتنی ئەبوو موسلمەی خۆراسانی راگەیەندرا ... ئەو - کارەی - بەها - سەرەرای مەبەستی ئاینی ئامانجێکی رامیاریشی لە پێشەوە هەبووە ... کە بەپێی ئەو بیروباوەرەوە لە هەمان کات بانگەشەش بێت ... پێ دەچێ پەیرەوێکی نزیك بە مانیزم بووبێت و نوێگەرێتی تیاکرابێت ...هەروا - مەزدەك ئەو هەولانەی لەسەردەمی پێنجەمی زاینیدا کردی لە پێناو سەلماندنی -ئەو بۆچوونەش بوو - بەها - لەسەر پەیرەوو لایەنگیرانی - مەی خواردنەوەو داوێن پیسی وخواردنی گۆشتی ئاژەڵی مردوو سەربرینی ئاژەڵی نەخۆش و - ساوا - ی قەدەخەکراو .

دوای ئەوە داوای لێکردن کە کرنووش بۆ رۆژ ببەن و رۆژی حەوت نوێژ بۆ دروستکراوی ئاسمان و زەوی و جیهان و زیندەوەران بکەن ... هەروا دەبێ باوەریان بە رۆژی دوایی و پاداشتی بەهەشت و سزای دۆزەخ هەبێت ... هەروا بۆ دەستە بەرکردنی باری دارایی راپەرینەکەش داوای لەلایەنگیرانی کرد ، کە یەك لەسەر حەوتی دەرامەتیان پێشکەش بکەن ... کە ئەم داوایانەش داوای مانیزمیەکان بوون .

بـەڵام جیاوازی ئـەوە کـە – بـەها – بـاوەری بـەکتاب پەرستی هێنـاو بـە پێچەوانەی مانیزم ، کە باوەری بە دوانە پەرستی هەبوو .

سەرچاوە :– الآثار الباقية عن القرون الخالية . ل/٢١٠ – زرين كوب – تاريخ مردم ئیران ٢٠ /٦١ رخۆلد شیولر – تاريخ ئيران – درقرون – وەرگێرانی جەواد مەلا نوری – ل/١٣٨ .

## ٠٧٥٤

٠٧٥٤/٦/٢٧ بەرپابوونی راپەرینی – شنیاز – لە گوندی – ئاهـەن – ی سەر بە شاری نیشاپوور ... هۆکاری ئەو راپەرینەش دەرکەووتنی ئەو رامیاریەتە هەڵەیەی – ئەبوو جەعفەری مەنسوور – بوو ، کە لە – ئەبوو موسلمەی خۆراسانی – هاورێی داو کووشتی .... ئەمەش بۆتۆڵەسەندنەوەشی سەرکردایەتی ئەو جووڵانەوەیـەی لـەو گونـد دەسـتپێکرد ... ئـەم راپەرینـەش دوای دوو دژە هەڵوویستی دەووڵەت و خەلافەتی عەباسی بوو ... کە لەلایـەن دانیشتووانی هەرێمی خۆراسان و کەسایەتیە ناسراوەکانیان ئەنجامدرا .

لەهەمان کات بەرپەرچدانەوەیەکی گەوورەش بوو دژی رامیاریەتە هەڵـەکانی دەووڵەتی عەباسی ، کە ئـەو کارەش بەهۆی پشتیووانی دانیشتووانەکانی هەرێمی خۆراسانەوە بوون ... کە ئەمـەش بووە هـۆی ئـەوەی کـە بەهـەزاران کـەس لـە هەرێمـەکانی خۆراسـان و دەیلـەم و تەبرەسـتان پەیوەنـدیان پێووەکردنلە ناوچەکەدا .

هـەروا مەبەسـتیش لـە پێنـاو تۆڵـە سـەندنەوەی مـافی ئـەبوو موسـلمەی خۆراسـانی بـوو لـە دەسـەڵاتدارانی دەووڵـەتی عەباسـی و دژایـەتی کردنـی خەلافەتی عەباسی لەوکاتدا دەستی پێکرد . لەو بارودۆخـەدا ، کە – ئـەبوو جەعفـەری مەنـسوور ، هـەواڵی ئـەو راپەرینانـەی پێگەیـشت ، هێزێکـی گەوورەی لەژێر سەرکردایەتی – عومـەری کوری عـەلا – رەوانـەی مەڵبەنـدی راپەرینەکە کرد .

بـەڵام بـەهۆی بـەرفراوانی دەسـەڵاتی – سـتباز – و بـەتوانای بەرێوەبردنـەوە ئەو هێرشەی هێزەکانی سووپای عەباسیەکان تێك شکاند .

دوای ئەو تێك شکانە ، دووبارە ئەبوو جەعفەری مەنسوور هێزێکی دیکـەی زۆری بەسـەرکردایەتی – جومهـوری کـوری مـرواری عەجـەلی – نـاردە سـەریان و ، بـە دەسـت پێکردنـی شـەری دژوواری نێـوان بەرهەڵـستاکارانی

دەووڵەتی عەباسی و عەباسیەکان بەرپابوو ، بۆ ماوەی دوو مانگ و ١٠ رۆژ لـە شـووێنێك بـەناوی – جۆرجنیـان – لـە نێـوان ناوچـەی – رەق – و – هەمەدان – دا لە هەرێمەکەدا .
کە لە ئەنجام زیاتر لە ٧٠٠٠ هەزار کەس کووژران و بەدیلگرتنی ١٤٠٠٠ هـەزار کـەس لـە لایـەنگرانی – سـنیازا تێـك شـکان و لەئاکامـدا هێزەکـانی دەووڵەتی عەباسی سەرکەووتنیان بەدەست هێنا لەناوچەکەدا .
سەرچاوە :– تەبەری – تاریخ الأمم و الملوك . ٤٩٥/٧ .
٠٧٥٤/٦/٢٧ بـە هـۆی راپەرینـەکانی بـیری مـانیزم و بڵاوبوونـەوەی کـووژرانی ئـەبوو موسلمەی خۆراسانی و راپەرینەکانی دژ بە دەووڵـەتی عەباسی و خەلافەتی ئەبوو جەعفری مەنسوور ، لە وولاتـی نێوان دووزێیّ و خـاکی کوردسـتان و دەووروبـەری ... لـە هـەمان کـات و لـە پێنـاو یارمـەتی دانـی راپەرینـەکانی مانی و سنیازا ، لە هەرێمی خۆراسـان وهەمـەدان و پەرینـەوەی بۆ هـەرێم و ناوچەکانی دیکە لە رۆژ هەڵاتی کوردستان .
ئـەوە بـوو راپـەرینی ئیـسحاق نـورکی – لـە هـەرێمی تورکـستان ، کـە مەڵبەندێکی مانیەکان بوو – شەر هەڵگیرسا ... بە سەرکردایەتی – ئیسحاق – کە یەکێك بوو لەلایەنگیران و هەوادارانی – ئەبوو موسلمەی خۆراسانی – و سەرکردەکانی ئەو هەرێمە . دوای کووژرانی ئەبوو موسلمە .
ئیسجاق سـەرکردایەتی راپەرینەکەی کرد ... راپـەرینەکەی بـە بیرووباوەری دوانـە پەرسـتی بەگـژ ئـەو دەسـەڵاتەدا چـووەوە ... جووڵانـەوەی ئـەو کەسایەتیە تورکە ، ئەگەر بەتەواوی مـانیزم نەبووبێت .... ئەوا لە هـەرێمی مانیـەکان و لـە بـارودۆخێکی دەسـەڵاتی رامیـاری وئـایینی دەووڵـەتی – ئۆیکۆری – تورك سەری هەڵدا .
جگە لەوەش لەتوانایەکی بەرزی ئابووری و کۆمەڵایـەتی سەرچاوەی گـرت .... لەبەر ئەوە مانیزم فاکتـەری سـەرەکی ئەو جووڵانەوەیە بووبێت , دوای ئەوەی کە هەڵوویستی دووژمنکاری خەلافەتی عەباسیان بۆ دەرکەووتبێت و لە پێناو مانەوەیاندا دەستیان دابێتە راپەرین لەناوچەو هەرێمەکاندا .
سەرچاوە :– تەبەری – هـ . س /٦ /٤٨٨ . فارووق عومەر موازی – هـ . س – ٢٨٩/١ / ١١٨ – ١١٩

### ٠٧٥٥

٠٧٥٥/٦/١٦ لـه دوای هێنـانی ٢٠٠٠٠ هـەزار چەكداری توركمـان . لـه سـەدەی نۆیـەمی زایـنی ،، خەلیفـەی عەباسـی – موعتەسـەم – سـووپایەكی چـەكداری لـەو توركه هاوردانه پێك هێناو نیشتەجێی كردن له شاری سامەرای پایتـەختی ئەو كاتەی دەووڵەتی عەباسی له باكووری شاری بەغدا .
جێگـەی باسـكردنه كـه دەبـێ ئێمـه ئـەوه لـەیاد نەكـەین ، كـه سـەرەتای سـەرهەڵدانی نەتـەوەی توركمـان ، لـه بیابانەكـەی نێـوان هـەردوو وڵاتـی مـەنگۆلیاو چینی میللی بـووه ... كـه لـەو سەردەمانەشـدا هـەرێم یـاخوود وڵاتـی مـەنگۆلیا ، لـەژێر دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی چـینی بـووه . كـه ئێستاش بەشێكی له ژێر دەسەڵاتی چینیه بەناوی مەنگۆلیای ناوخۆ ... كه نەتەوەی توركمانیش لەو نەتەوه دەربەدەرانەی كه له ئەنجامی شەڕی نێوان ئیمپراتۆریەتـەكانی پێك هـاتوون و لـه ئـەنجامیش دەووڵـەتی عوسمـانی پـێ دامەزرا له هەرێمی ئەنازۆلی ئێستای و وڵاتی توركیا.

### ٠٧٦٢

٠٧٦٢/٦/٢٩ نووێكردنەوەو ئاوەدانكردنەوەی شاردێی بەغدا لەلایەن ئەبوو جەعفەری مەنـسووری خەلیفـەی عەباسـی ، كـه لـەو كـات دانیـشتووانی بەغـدای دورسـتكراو زیـاتر لـه هـەزار مـاڵ عـەرەبی تیـا نـەبوو ، كـه ئـەوانیش داروودەسته و پێووەندەكانی دەسەڵاتدارانی ئیسلام بوون لـه ناوچـەكەدا ، بەڵكوو دانیشتووانەكەی له ئاشووری و ئارامی و كوردوفارس بوون..



شاری بەغدا

٠٧٦٢/٧/١ دانیـشتووانی کـورد لـە شـاری بەغـدای پایتـەختی ئێـستای ئێراقـی بـە زۆر دروستکراو ، بەر لە فراوانکردنی شاری بەغدا بوو ، لەلایەن خەلیفە ئەبوو جەعفەری مەنسوور ... بەر لەوەی کە ئەم شارە خشتەکانی دامەزرانی یاخوود دروستکردی ئەو شارە کورد لێی نیشتەجێ بوونە . کە لەو کاتە لە هەموو سنووری ئێستای ئێراق دانیشتووانی عەرەبی لێ نەبووە.

تەنیا مەر لەوەڕێن و بە دووەکان نەبێت ، بەڵکوو نیشتەجێ بوونی عەرەب لە سنووری خاکی ئێستای ئێراق ، لەگەڵ فتووحاتی ئیسلامی دەستی پێکردووە ئەویش .



ئەم وێنەیە گەرەکی دانیشتووانی کورد لە شاری بەغدا

یەکەم :- بڵاوکردنەوەی بەزۆر ئاینی بەسەر نەتەوە جیاجیای دانیشتووی ئێراق و ئەویش :-

أ:- داگیرکردن و نیشتەجێ بوونی عەرەب لە ئێراق لەرێگەی ئاینی ئیسلام.

ب :- دەرچوونی عەرەب لە دوورگەی بیابانی عەرەبی نەك هەر بۆ ئێراق بەڵکوو بەرەو شام و وولاتی دیکەی وەك ، فارس و بەرەو میسری قبتی و ئەفریکیاو دوایی بەرەو وولاتانی دیکەی جیهان .

کە تاکوو ئێستا ئاینی ئیسلام تیری داگیرکردن و دەست بەسەراگرتنی خاك و بەعەرەب کردنی نەتەوەکانی وولاتانی جیهانە ... کە کێشەو گرفتی ناوچەو هەرێم و جیهان ، بەندە بەعەرەب و هەڵگری ئاینی ئیسلام لەهەموو بوارێك بەتایبەتی لەبواری نەتەوەیی و نیشتیمانی لە جیهاندا .

لە بەر ئەوەی – مەقدس– لە – أحسن التقاسیم– ل/١٢١ – دەڵێ : – بخصوص بنائها ان منصوراً حشر الصناع و الفعله من الشام و الموصل و الجبل . ای البلاد الکردیه – چونکە لە شاری بەغدا گەرەك هەبووە بەناوی کورد ... بەڵام بەهۆی لافاو لە ساڵی ١٠٦٢ ئەو گەرەکەیە ناو رووخاندویەتی ، کە لە گەرەکی باب شێخ بووە ، لە نێوان شەقامی کفاح و شەقامی شێخ عومەر ... بەغدا بەر لە دەستپێکردن بە پەرەپێدانی لەلایەن

خەلیفەی عەباسی ئەبوو جەعفەری مەنسوور و نیشتەجێ بوونی عەرەب لەو شارە ، لە هێزی چەکدار و پەیوەندەکانی خەلیفەو بەر لەویش ناوێکی غەرمی ئاری هەبوو ئەویش : – کەلە – بغ – و – داد – بوو .
کە ماناکەی پێدان ، یان پێدانی لەلایەن خواوە ، ئەو خوایانەی کە لە لایەن مرۆڤ دروستکرابوو – بت – کە لەخوای ئاریەکان بوو . کە لە کتابی پیرۆزی زەردەشتی – ئاڤێستا – هەیە بەسێ وێنە بەناوی – بڤانی پشت – کە ئەویش – یستا / ١٩ و ٢٠ و ٢١ – کە خوای – بڤاش – کە کیشوونی ئاریەکان بووە لە ئێراقی ئێستا دەیان پەرست ، بەر لە ٢٠٠٠ هەزار ساڵ پێش زایین .
تێبینی :– بۆ ئەوەی بگەیتە بروایەك ئەوا دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ – رفائیل بابۆ ئیسحق – أحوال نصاری بغداد فی عهد الخلافه العباسیه – کە بەغدا ئەم ناوانەی هەبووە : – بغداد – بغداژ – بغژاژ – بغژان – مغداد – مغداژ – مغژان – بعژین – بغدام – مغدام – هەروا .

### ٧٦٣· ✍




٠٧٦٣/٣/٢١ حەسەنی کوڕی هانی ناسراو بە – ئەبوو نەواس – یەکێك بوو لە شاعیرە گەورەکانی بەناو عەرەبی لە سەردەمی عەباسیەکان لە شاری بەغدا ... کە لە شاری ئەهواز چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ... کە ئەبوو نەواس یەکێك بووە لە کەسایەتیە دیارەکانی ئاینی مانیزم و باوەڕێکی پتەوی بە هەردوو خوای ڕووناکی و تاریکی هەبووە ... کە ڕوویەکی ناسراوی سەردەمەکەو

دەوولەتی عەباسی بووە .
ئەم شاعیرە لەلای کاربەدەستەکانی دەوولەت ، بە یەکێك لە کە سایەتی
گەورەکانی مانیزم ناسراو بووە ... ئەو دەرکەوتنەش وایکرد کە خەلیف
مەهدی لێ ئاگاداربکرێتەوەو ، ئەویش بە فەرمانێکی تایبەت بانگ هێشت
کۆشکی خەلیفەی عەباسی کرا ، دوای سەلماندنی تاوانەکەی ئەبوو نەواس
لە زیندانی زەنادقە زیندانی کرا .
بەلام بەهۆی ئازایەتی و لێهاتووی ئەم کەسایەتیەو پێویستی خەلیفەش
وای کرد کە ئازادی بکات .
مانیزم لای ئەبوو نەواسی شاعیر ، واتایەکی گرنگ و تایبەتی هەبووە ل
هەموو بوارەکاندا ... بەبروای ئەبوو نەواس ، کە ئایینی ئیسلام ئاینێک
کـــۆت و بەنـــدی ژیانـــەو هـــەموو ئارەزووەکـــانی زەوت کـــردووە ...
داواکاریەکانی ئەبوو نەواس ئەوە بوو ، کە لە سەر هەموو موسوڵمانی
پێویستە بۆ رزگار بوونی لە چوارچێوەی سنووورداری خۆیان لە ئایین
ئیسلام دوورکەونەوە و لە ئاییینی مانی نزیك بکەونەوە .
بەلام ئەمە مانای وانە بووە ، لەلای ئەبوو نەواس کە کاری لە خراپ
بـەردەوام بـن لەمـەی خواردنـەوە ... ئەمـەش جێگـەی سـەرنجە کـە ئـە
سەرچاوانەی باسیان لە ئاییینی ئەو شاعیرە کردووە تۆمەتی دوور لەباوەر
مانیزمیان دەدانە پاڵ ، . لەوانە باوەرنەبوونی بە رۆژی دوایی ... لەسەر ئە
بروایە بوو کە کێ لەو دونیا لەبەهەشت یان لە دۆزەخ گەراوەتەوە .
ئیتر ئەم کەسایەتیە گەر بەئاشکراش ئەو بروایەی نەبووبێ ، بەلام ل
دەروونـەوە خـاوەن بـروا بـوون بـووە بـە ئـاییینی مـانی و هەڵوێـست
بیرووبۆچوونی مانیزم .
سـەرەرای ئـەوەی کـە هەنـدێ شـارو شارۆچـکە ، بەتایبـەتی لـە باشـوور
ئێـستای ئێـراق خۆشەویـست نەبوونـە ... ئـەبوو نـەواس شـاعیرێک
بەناوبانگی ئێراق و عەرەب و جیهانیە ..... سەرچاوەکانیش وای بۆ دەچ
، کە ئەبوو نەواس عەرەب نەبووەو لەعەرەبە بەعەرەبکراوەکان بووە ، واتە
متعرب – ... سەرەرای ئەوەش بەردەوام بوو لەکارەکان لەهەموو بوارەکان
بەتایبەتی لە شیعرەکانی تاکوو لە ٨١٣/٩/١ کۆچی دوایی دەکات .

ئێستاش چەندین شووێن بەناوی ئەو شاعیرەیە ، بەتایبەتی شەقامی ئەبوو نەواس لە شاری بەغدای پایتەختی ئێستای ئێراق .

نووسەر:- مەبەستم ئەوە بوو کە لە ساڵەکانی بەر لە ٧٠٠ زایینی عەرەب لە سنووری ئێستای ئێراق و لۆرستان کوردستان و ئەهواز نەبوونە ... تەنیا ئەو عەرەبە مەڕ لەوەڕێن و ڕەووەندەکان و بازرگانەکان نەبێت .... بەڵام دوای ئەوەی ، کە لە هێرشەکانی ئیسلام بەناوی فتووحاتی ئیسلامی روویان لە رۆژهەڵاتی بیابانی دوورگەی عەرەب کردووە ، ئەویش لە پێناو بەئیسلام کردنی یەکەم و داگیرکردن و فراوانکردنی سنووری جووگرافی و عەرەب دووەم لە سەر هەرێم و ناوچەکاندا .

ئەمەش مێژوو شاهیدە ، کە عەرەب بەر لە ئاییني ئیسلام دەرکەووتنێکی وایان نەبوو ، کە دانیشتووانە عەرەبەکان لە یەمەن و دوورگەی عەرەبی تێپەریان نەدەکرد لە کێشووەری ئاسیادا .

سەرچاوە :- ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان - ئامادەکردنی - سەیفەدین کاتب دار الشرق - المؤسسة العلمية لوسائل التعليمية . بيروت - سووريا /٢٠٠٥ .

### ٠٧٦٦

٠٧٦٦/٢/١٦ ئیخوانە توومینیەکان دوو دەووڵەتیان پێکهێنا ... یەکەمیان بە ناوی دەووڵەتی تورکە باکووریەکان بوو لە ساڵی ٥٥٢ ی زایینی ... دەووڵەتی دووەم ، بە ناوی دەووڵەتی تورکە رۆژئاواییەکان بوو لەساڵی ٥٧٦. کە دەووڵەتی دووەمی تورك شەڕیان دژی ئیسلام دەکرد ، لەناوچەی زێی سیمۆن - کە ژمارەی هۆزەکانیان لەهۆزی پێکهاتوو نەك لە تورك ، بەڵکوو بەناوی تورك . کە پێنج لەو هۆزانە لەباکووری زێی ئیلە بوون و پێنج هۆزەکەی دیکەش لەباشووری بوون... شەڕەکان بەردەوام بوون لەلایەن - خاناشمی رۆژئاوا دژی ئیسلام .

ئەمەش بووە هۆی دابەش بوونی ئەو دەووڵەتە تورکە رۆژئاواییەو ئەمەش لە ئاکامی هەڵس و کەووتی نا لە بار دژی دانیشتووانی ناوچەکەو هەڵگری ئاییني ئیسلام ، تا ئەو کاتەی تورکە - قارلوق - لەساڵی ٧٦٦ جێگەیان گرتنەوە لەهەرێمەکەدا .

سەرچاوە :- بارتوولە - مێژووی تورك لەئاسیای بچوك ل/٣٧ .

## ٠٧٦٧

٠٧٦٧/٢/٦ راپەرینەکەی – ئۆستازسیز – یەکێك بوو لەراپەرینە گەورەکان و بەرفراوا
لــە هــەرێمی خۆراســان .... کــە لــە ســەردەمی خەلیفــەی عەباســی ئــەبو
جەعفــەری مەنــسوردا بــەرپابوو .... ئــەو راپەرینــەی – ئۆستازســیز-
لایــەنگیرێکی ئــەبوو موســلمەی خۆراســان و یــەکێکی دیکــە بــوو لــ
فەرمانــدەکانی ناوچــەی – بــادیگس – ئەمــەش دوای کــووژرانی هــاورێ و
سەرکردەکەی بە مەبەستی تۆڵەسەندنەوەی .... راپەرین لە دژی دەووڵەتی
عەباسی راگەیاندرا .

کە سەرەتای راپەرینەکانیش لەو ناوچەیە سەری هەڵدا .... ئەم هەست و
هــۆش و هەڵوویــستانە زۆری نەخایەنــد خــەڵکانێکی زۆر لــە دانیــشتووانی
ناوچەکانی – هیرات و سیستان و مەرئەلروز – پەیوەندیان بەو راپەرینانا
کــرد... بەجۆرێکی وا لــە مــاوەی یەك مانگدا ژمارەی لایەنگیرانی گەیشتا
٣٠٠,٠٠٠ – هەزار کەس لە ناوچەکەدا .

ئــەم راپەرینــەش کاردانــەوەی لــە ســەر دەووڵــەتی عەباســی هــەبوو ، بـا
بڵاوبونــەوەی جووڵانەوەیــەکی وای بــەرفراوان لەناوچــەیەکی ســتراتیژی د
بووە هۆی نیگەرانی دەووڵەتی عەباسی بەسەر کردایەتی ئەبوو جەعفەری
مەنــسوور ، کــە ســەرەتا – ئەجــشەمی مــرورزی – کەســایەتی ناســراوی
لایەنگیری خەلافەتی راسپاردو رووبەروویان بێتەوە .

ئــەوە بــوو دوای شــەرێکی ســەخت ، کــە بــووە هــۆی کــووژرانی زۆربــەی
ســەرکردە دیارەکــانی هێزەکــە ، لەوانــە – مــەعازی کــوری موســلمە و
جــوبرائیلی کــوری یــەحیاو ، حــەمادی کــوری عــەمرۆ و ، ئــەبوو نــەجمی
سەجستانی و ، داودی کوری کرار – کە دەرفەتێکی باش و گەورەیان بۆ –
ئوستازسیز – و لایەنگیرانی رەخساند و بووە هۆی ئەوەی کە دەست بەسەر
زۆربەی خۆراساندا بگرن لە هەرێمەکەدا .

تەنانەت دانیشتووانی – مورالروو – ی خۆراسان و لایەنگیرانی خەلیفەش
پەیوەنــدیان پێــووەکردن ... ئــەو شکــستە گەوورەیــەش دووچــاری
عەباسیەکان هات و داوای لە – مەهدی – کوری کرد ، کە بە سووپایەکی
بەهێزو گەوورە هێرش بکاتە سەر راپەرینەکان و ، مەهدیش سووپایەکی
ئامادەکرد بەسەرکردایەتی – حازمی کوری خەزیمەی . هەروا – هەیسەمی

کوری شوعیه و ، نەهری کوری جەحینی سەعدی و ، بوکاری کـوری سـەلمی عـەقیلی – رووبـەرووی راپەرینەکـە بوونـەوەو لـە ئاکامـدا راپەرینەکـەی – ئوستاسیز – شکستی هێناو لە ئاکامدا ١٤٠٠٠ هەزار کەس بەدیل گیران لـە هـەمان کـات دەسـتگیرکردنی ئوستاسـیز ، کـە لـە سـاڵی ٧٦٧ بـە تۆمـەتی زەندەقە کووشتیان.

سەرچاوە :– ئیبن ئەسیر – هـ.س /٥/٢٩– المقدس . اليك التاريخ ٦/ ٨٦ – ٨٧ .

## ٠٧٧٥

٠٧٧٥/١٠/٧ کۆچـی دووایـی خـەلیفـەی عەباسـی ئـەبوو جەعفـەری مەنسوور بـووە ، کـە مرۆڤێکی لێهاتوو خزمەت گوزار بووەو خەریك بـووە بـەئاوەدان کردنـەوەو دورستکردنی شاری بەغدا ، کە ئێستا شاری بەغدا، زیاتر لـە پێنج ملیۆن کەسـی تیـا دەژیو لـە چـەندین نەتـەوە پێك هـاتووە ، بە تایبـەتی کـورد کـە دانیـشتووانی کـورد لـە شـاری بەغـدا زیـاتر لـە ٣٠٠٠٠٠ر١ ملیـۆن کـورد دەبن.

## ٠٧٦٦

٠٧٧٦/١٠/١٩ راپەرینی – موقەنـەعی – خۆراسـانی لـە گونـدێکی نزیـك شـاری – مـەرۆی – هەرێمی خۆراسان دەستی پێکرد . کە کەسایەتیەك بوو بە ناوی – موقەنەع – و بانگەوازی راپەرینێکی کرد بۆ روو بەروو بوونەوەی دەسـەڵاتی خـەلیفـە مەهدی کوری ئەبوو جەعفەری مەنسوور و دەوڵەتی عەباسی کرد .

ئەمەش یەکەمین راپەرینی رامیاری و ئایینی ناسراوی زەندقە بوو .... واتـە مانیەکان – ئەو خەلیفەیە رووبەرووی بووەوە ... نـاوی بـاوکی – موقەنـەع – بـوو – کـە لـەلای مێـژوو نووسـان ئاشـکرا نیـەو چـەند نـاوی دیکـەی وەك – هاشم و عەتا – هـەبووە ... کە کارمەندێکی دیاری ناوچـەی مـەرۆ بووەو لـە پێنـاوی پـەروەردەکردنی کورەکەیـدا رەنجـی زۆر کێشاوە – موقەنـەع – کـە یەکێك بوو لەسەرکردە و هاوڕێ نزیکەکانی ئـەبوو موسلمەی خۆراسـان ... کە هەوڵەکانی لەپێناو تۆڵەسەندنەوەی مافی ئـەبوو موسلمەی خۆراسانی بوو لەخەلیفەی عەباسی ئەبوو جەعفەرو کورو لایەنگیرەکانی .

بـەلام ئـەم سـەرکردەیە هـەر زوو لەلایـەن عەباسـیەکان دەسـتگیرکراو دوای

ئازادکردنیـشی دەسـتی کـردەوە بـە راپـەڕین ، کـە سـەرەتا لـە قـەڵاکانی – بەسیام و سـەنجردەوکێش – رووبـەرووی خەلافـەتی عەباسـی بـووەوە . کـە زۆر لە مانیزم و مانیەکان پەیوەندیان پێوەکرد ، لەو کاتەی کە رووبەرووی عەباسیەکان بوونەوە ، ئەو مزگەووتانەی کەوتبووە سەر ڕێگایان هـەموویان وێرانکردو زۆر لەو کەسانەی ببوونە موسلمان کووشتیانن

لـە دوای چـوار سـاڵ لـە بـەرگری و پێکـدادانی لەگـەڵ دەووڵـەتی عەباسـی وخەلیفەکانی ، لەئاکامدا لەساڵی ٧٧٩ دەستگیرکراو بەدەستی – سەعیدی جەرش – لەسـەر فـەرمانی خەلیفـە مەهـدی کوری خەلیفە ئەبوو جەعفـەری مەنسوور کووژراو ، کەللە سەرەکەی بەدیاری بۆ خەلیفە ناردرا ... کە ئەو کاتە لەشاری حەلەبی ئێستای سووریا بوو .

تێبـینی:– وادیـارە بـە پێـی نووسـراوەکانی مێژوونووسـان جووڵانـەوەو راپەرینـەکانی مانیزم و بیری مانیـەکان لەلایـەن کوردو فارسەکان بووەو لـە ناوچە جیاجیاکانی لۆرستان و هەمەدان و قەسر شیرین و عیلام بوونە .

دژی ئیسلام وخەلیفەو دەسەڵاتی عەباسی کە لەو کاتـەی عـەرەب لـە ڕێگـەی فتووحاتی ئیسلامی دەسـتی کـرد بـەداگیرکردنی خاکی گـەلانی سـەر رووی زەوی ... لەوانـەش کـورد و خـاکی کوردسـتان بـە زەبـری شمـشێر ... کـە ئەمەش سەلمێنراوە لەلایەن لاپەرە و تۆمارگاکانی مێژوو لە جیهان.

سەرچاوە :– تاریخ الأمم و الملوك/٦٠ / ٣٦٧ – ٣٦٨ – زرین کوب – تاریخ مردم ئیران – ٢ / ٦٥

## ٠٧٨٢

٠٧٨٢/٨/٥ کۆچی دوایی شاعیری گەورەی مانیەکان و رۆشنبیری سەدەی ئەو کات – بەشـاری کـوری بـورد – لـە شـاری بەسـرەی باشـووری ئێـستای ئێـراق ، لەبنەماڵەیەکی بەرەسەن دانیشتووی هەرێمی خۆراسانی ئێستای ئێران .

شـایانی بـاس کردنـە کـە بنەماڵـەی بەشـاری پـاش کۆچـکردنیان بـۆ شـاری بەسـرە و نیـشتەجێ بوونیـان ... بەشـار بەشـێوەیەکی گونجـاوی ئـەو سـەردەمەدا پـەروەردەکراو لـەدوای تـەواوکردنی خووێندنـەکانی لـەو کـات توانایـەکی باشـی لـە بوارەکـانی فەلسەفەو مـەنتق و زمانـەوانی پەیـداکرد . جگە لەبوونی بەشاعیرێکی دیار و بە توانا .

ئـەم کەسـایەتیە هـەوڵی زۆری بـێ وێنەیـدا لـە رێگـەی شـعرەکانیەوە رووی گـەش و گـەورەیی و لێهـاتووی مانیـەکان بـەرز بکاتـەوە و رابگـرێ و لـەم بارەیەوەش بەشار دەڵێ :- الّرچ موچلمه والنـار موشرقه - و النار معبوده مژ کانت نار .

دەرکـەوتنی تـەنیا لـە رێگـەی شـعرەکانی نـەبوو ، بـەڵکوو لـە رێگـەی ئـەو ووتار و ووتانە بوو کە لە کۆبوونەوە و شووێنە گشتیەکان لەشاری بەسرەو دەووروبـەری ئـەنجامی دەدا ... لەهـەمان کـات هـانی خـەڵکی دەدا لەخراپـە کاری و مەی خواردنەوەو بەرەڵلایی دووربکەونەوە .

ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـە - حیمـادی کـوری عجـرد - بـە شـاری بـە مانیزمێکی راستەقینە بناسێ .

هەر بەو هۆکارەش ئەو باوەر پێ بوونـەی کـە لەبـەر دادگـای باڵای خەلافەت زینـدانی بکرێـت و دوای ماوەیـەك لـە ژێـر ئـازار و ئەشـکەنجە ژیـانی پـێ لەدەست بدرێت .

سەرچاوە :- ئیبن ئەسیر الکامل ڤ التاریخ / ٦٨/٥ . ئیبن خەلەکان . وفیات الأعیان و انبا و اخبار زمان - ٢٧١/١ .الأسفهانی . هـ.س - ١٣ /٢٤٦ .

### ٠٧٨٥

٠٧٨٥/٨/٤ باوکی هاروونـە رەشیدی والی بەغدا ، محەمـەد کۆچـی دووایـی کـردووە کـە رێکخەری پۆستە بووەو لە هەمان کات بڵاوی کردۆتەوە لە شارەکەدا .

### ٠٧٨٦

٠٧٨٦/٧/٣ وەرگـرتنی دەسـەڵاتی خەلافـەتی عەباسـی لـە لایـەن هارونـە رەشـید ... لـەو کاتـەی کـە هاروونـە رەشـید گەیـشتە پایـەی خەلیفـەی عەباسـی دەرفـەتێکی باشــی بـۆ بەرمەکیـەکان هێنـا کایـەوە ، کـە دام و دەزگـا دەووڵەتیـەکانی دەسـەڵاتی عەباسـی پرکـردەوە لـەخزم و کـەس و کـار و نـزیکترین کـەس لـە خـۆی - وادیـارە هارونـە رەشـید بەرمـەکی بـووە - تـا ئـەو کاتـەی گەیـشتنە کۆشکی خەلافەت .

دوای ئـەوە یـەحیای بەرمـەکی خەلیفـە - موسـا عیـسای - لـە وویلایـەتی

خۆراسان دەرکردو – جەعفەر – ی کردە والی هەرێمی خۆراسان .... بە بۆچوونی – عەجمی مەحمود خەتاب ئەلجەنابی – تەنها لە کۆشکی خەلیفە هارونە رەشید – ٢٥ , نۆری – سیخووری ئەو بنەماڵەیە ، واتە – بەرمەکیەکان – لەسەر دەوڵەت هەبوون .

ئەوەش مانای ئەوە بوو کە بەرمەکیەکان کاریگەری خۆیان لەسەر سەرجەم دەسەلاتەکە دروستکردبوو . کە بەر لەوە شووێنەواری وای بەخۆوە نەدیبوو . ئەو کاریگەریە لەوەدا بوو ، کە ئەو بنەماڵەیە دەیانوویست دەروازەیەك و پشتیووانیەکی رامیاری گەوورە بۆ بلاوکردنەوەو چەسپاندنی بیروو باوەرەکانیان بکەنەوەو لە ئاییني ئیسلام بدەن .

لەبەر ئەوەی کاریگەری هەڵگری بروای مانی لەسەر خەلافەت پێك هاتەی سەربازی عەباسیەکانیشی گرتبووەوە... فەزلی یەحیای بەرمەکی – لەکاتێکدا والی خۆراسان بوو . سووپایەکی گەوورەی لە – ٥٠٠,٠٠٠ هەزار چەکدار پێك هێنا ، کە بەشێك لەو سووپایە زەردەشتی و مانیەکان بوون – واتە کوردو فارس ، لەسەر فەرمانی هارونە رەشید ، هێنرایە شاری بەغدا . کە – ٢٠٠٠٠ هەزار – ی لەو سووپایە لەگەڵ خۆی هێنا بەغدا .

سەرچاوە :– الدوری – الجذور التاریخیة للشعوب ل/٥٢ – ئیبن ئەسیر – الکامل في التاریخ ٩١/٥ .. هارونە رەشید – مؤسسات الخلافة في عهد ة ل/٨٦٨ .

٧٨٦/٩/١٣٠ دامەزرێنەری بنەماڵەی ئیدریسەکان لە شاری مەراکش – ئیدریس – کۆچی دووایی کردووە.

٠٧٨٨



٠٧٨٨/٦/١١ لـــــــــه دایکبـــوونی کەســـــایەتی نــــــاوداری ئـــــایینی ئیـــــسلام – ئیمــــــــام عوبێـــدوڵڵای ئیمام موسای کازم – کەنازناوی کوردەواریانەی پێووە لکاوە بەناوی – کۆسەی هەجیج – لە شاری بەغدای پایتەختی ئێستای ئێراق لە وولاتی نێوان دوو زێیٚ – میزۆبۆتامیا – جێگــەی ئامــاژە پێکــردن و ڕوونکردنەوەیــە ، کــە ئـەم کەسایەتیە لە ٨١٥/٨/١١ لە گوندی هەجیج لە ڕۆژهەلاتی کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلاتی ئێران کۆچی دوایی کردووە .

ئـەم کەسـایەتیەش دەکاتـە بـرای ئیمـام ڕەزا لـە شـاری مەشـهەد ، کـە پیرۆزیـەکی زۆری لـە دڵ و دەروونـی خەڵکـدا هەیـەو مەزارەکـەی بووەتـە شووێنی نزاو پاڕانەوەی ڕۆژانەی خەڵکێکی زۆر کە لە ناوچە جیاجیاکانی جیهان سەردانی دەکەن .

جا لێرەدا دەمەویٚ زیاتر ئاشنای ئەم ناوە کوردەواریە بن ، کە هەجیج گوندێکە لە ناوچەی هەورامانەو دەکەوێتە سنووری جووگرافی و کارگێری قەزای – باوە – ئەودیووی ئێران ، گوندێکە دوو ڕووی هەیە ، کە بە لاپاڵی چیایەکەدا دروستکراون ، گوندی هەجیج بە پاکوو خاوێنی و کەش و هەوایەکی تەندروست ناسراوە .



هـــەروا مەزارگـــەی هـــەجیج شـــوێنی دەســـت نوێـــژو خووێندنـەو مانـەوەی ســـەردانەكانی بـــۆ دابینكـــــراوە ... مەزارگەكـە لـە سـاڵی ١٩٩٩ لەســـەردەمی ئیدارەی ئەوقاف و كاروباری خێرخوازی شاری باوە نۆژەنكراوەتەوە ، كە مەزارگەكە دەكەوێتە سەر ڕێی گوندی هـەجیج و شێووەیەكی بیناسازی جوانی هەیەو لە دووردا وەك نیشانەیەك بۆ گوندەكە بەدیار دەكەوێ ، لە دەووروبـەری مەرقەدەكـەدا چـەندین زێـوان و خزمـەتگوزار لـە ژن و پیـاو دەبینرێ ، كە هەموو ئەوانە دەروێشەو هەجیجە دڵسۆزەكانن و لە پەنای ئەو مەزارەدا ژیان بەسەر دەبەن .

جگە لە مەزاری كۆسە ، خانەقایەكی خودا پەرستیش لە نیووەی باشووری گوندەكەدا هەیە ، كە تایبەتە بە مووریدەكانی نەقشەبەندی و لەكاتی خۆیدا شێخ حیسامەدین بنیاتینـاوە و ئێستاش بە خانـەقای شێخ حیسامەدین ناودەبرێ لە ناوچەكەو لە جیهاندا .

### ٠٧٩٣

٠٧٩٣/٣/٢٧ كۆچی دوایـی ئیمامی مالك ، كە خـاوەن دانەری مەزهـەبی مالكی بووە . بـەڕێنمایی چـوارەم دادەنـرێ لـە دووای مەزهەبـەكانی شـافعی و حەمبـەلی و حەنەفی ... شایانی باسە ئیسلام لەو چوار مەزهەبە پێك هاتووە ، ئـەویش لە پێناو ڕێكخستنی باری كۆمەڵایەتی لە هەموو بوارە جیاجیاكانی ژیاندا .

### ٠٨٠٦

٠٨٠٦/١١/١٧ سـەرهەڵدانی ڕاپـەڕینی مانیـەكان بە سـەركردایەتی – ڕافـع كـوری لـەیس – لەشاری سەمەرقەند... سەمەرقەند ئەو شارە بووە كە مەڵبەندێكی مانیەكان

بوو . کە کاریگەری راپەرینەکە بەرادەیەکی زۆر کاریگەری لەسەر دەسەڵاتی خەلافەتی - هارونە رەشید - هەبوو ... لەبەر ئەوە ناچار بوو کە خۆی سەرکردایەتی ئەو هێزە چەکدارە بکات بۆ لێدانی راپەرینەکەی سەمەرقەند .... بەڵام بەر لەوەی بە ئامانجەکە بگات لە رێگا تووشی نەخۆشی دەبێت - بەو هۆیە لە - توونسی - لە ساڵی ٨٠٧ کۆچی دوایی دەکات ... ئەو گەشتەی خەلیفە کە بووە هۆی مردنی لە دوولاوە کاریگەری مانیەکانی بەسەرەوە بووە ... لەلایەك راپەرینی ناوچەیەکی مانیەکان کە خەلیفە عەباسی بۆ ئەو هێرشەی هاندا تا رێگای دوورو درێژی - بەغدا - سەمەرقەند - ببرێت و لێی بدات .

بەڵام لەبەر مردنی نەیتوانی ئەم کارە ئەنجام بدات ... لەلایەکی دیکەوە بەهۆی - فەزلی سەهلی فارس - داوا لە هارونە رەشید کرا کە - مەئمون - بۆ ئەو هێرشە هاورێیەتی بکات .... ئەو کەسایەتیە واتا - فەزل - لە کەسایەتیە مانیە دیارەکانی ئەو سەردەمە بوو . دوای مردنی ئەو خەلیفە - مەئمون - ی کورە گەورەی ......بە پشتیووانی بەشێکی زۆرلە دانیشتووانی خۆرهەلات , بە تایبەتی - فەزلی کوری سەهل - بانگەشەی دەسەڵاتێکی ناوچەیی بۆخۆی راگەیاند .

ئەمین .... لەشاری بەغدای پایتەخت خەلافەتی وەك خەلیفەیەکی عەباسی و جێنشینی باوکی لەلایەن بەشێکی زۆرلە دانیشتووانی ئەو ناوچەیە راگەیاند ... بەمەش دوو دەسەڵاتی دژ بەیەك بەیەکپارچەیی خەلافەتی عەباسیەکانی هەڵتەکاند ... واتە لەنێوان ساڵەکانی ٨٠٧ - ٨٢٣ و لەسەر دەمی خەلافەتی ئەمین و ململانێی لەگەڵ مەئمونی برایدا بوارێکی دیکەی بە مانیەکان دا ، کە بکەونە نێوو ئەو ناکۆکیەو بەشداری کاریگەری خۆیان لە پشتیووانی کردنی مەئمون لە دژی ئەمین بکەن .

## نامەیەکی - مانی - بۆ - شاپووری یەکەم

راپەرێنەرانی جیهان دوانن . ئەوانیش دووشتی کۆنن ، کە رووناکی و تاریکین ... دوو دروستکەرن ، کە چاکەو خراپەن . هەردووکیشیان لە ناویەکدا پێنج مانان کە - رەنگ و تام و بۆن و هەست و دەنگ - ن .

هەردووکیشیان دەبیستن و دەبینن و زانان . ئەوان سەرەتا جیابوون دواتر

تێکەڵاوبوون .... بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوان وێنـە نـەبوون دەربکـەون و روبـدەن . ئەگەر تاریکی و رووناکی هێنـا بێـت و دوای تێکـەڵاوبوونیان وەک سـێبەرو خـۆر دەرکەووتبن .

ئەوا تـارکی دووژمنـە بـۆ رووـنـاکی ... دیـارە خـۆ رووـنـاکیش تـارکی دروسـت نەکردووە . چونکە رووناکی کاری چاک دەکات و خراپە ناکات و کـۆنی ئـەوانیش بەڵگەیە بۆ ئەو راستیە . سەرەرای ئەوە مادده نابێت دوو خەسـڵەت و دوو شـتی جیاواز بێت ... وەکوو بەفر ... ئەوەی دەبێتە سارد نابێتە گـەرم . ئـەوەی بـووە چاکە نابێتە خراپە . ئەوەی خراپ بوو ، چاکە ناکات . بۆیە هـەردووکیان زینـدوو کاریگەرن . هەروەک چـۆن چـاکە ئەسـەلمێنرێت . خراپـەش بەهـەمان شـێوواز ئەسەلمێنرێت .

سەرچاوە :- الیعقوبی - تأریخ الیعقوبی ١٢٩/١ - ١٣٠ .

## ٠٨٠٩

٠٨٠٩/٣/٢٤ کۆچی دووایی خەلیفەی ئیسلام - هاروونە رەشید - لـە شاری بەغدا.... شـایانی باسـە خەلیفـە هـاروون رۆڵـی گرنگـی هـەبووە لەبـەرو پـێش بردنـی باری شاری بەغدا لەهەموو لایەنێکدا .






ئەم دوو نەخشەیە ئەوە دەسەلمێنن کە عەرەب و هەڵگرانی ئایــنی ئیسلام لە ڕگەی شەپێراقی ئێستایان داگـــیر کردووە لە گەڵ هەرێمی شام ، بە تایبەتی ئێراقی ئێستا لە نەخشەی /١ کەناوی شارەکانی جەلەولاو شارەزووری ناوچەکانی دیکەی تیایە و لە دوای داگیر کردن ردوویەتیانە خاوەنداریەتی خۆیان ...؟...!

٨٠٩/١٠/١٥ نووسەرو ڕووناکبیرو وەرگێڕو دکتۆر – ئەبوو زەید حنین ئیسحاق عەبادی ، یاخوود عەباد – ناسراو بە حنین کوری ئیسحاق – لە شارۆچکەی – حیرە – چـاوی بـەجیهان هـەڵهێناوە . ئـەم شارۆچـکەیەش کەوتۆتـە باشـووری ئێـستای ئێـراق و پایتـەختی دەوڵـەتی – خـەجیین – بـووە ئـەوکات لـە ناوچەکەدا .

بنەماڵەی ئیسحاق لە سەدەی سێی زاییینی لـەم شـارە نیشتەجێ بوونـە . کـە ئەم شارۆچکە دوای فتووحاتی ئیسلامی ناوی گۆڕاوە بۆ – حیرەی نەعمان یاخوود حیرەی مونزر و , هەروا بەناوبانگ بوو بە ، کۆشکی فوریق و دێـر . لە بەرئەوەی ئەو کات نـە عـەرەب و نـە ئیسلام لەوناوچەیە ، واتـە باشـووری ئێراقـی ئێـستا نیـشتەجێ نەبوونـە ، تـەنیا مـەر لـەوەڕێن و حوشـترەوانەکان نـەبێت ، ئـەویش بـەهۆی بوونی لەوەرگـەی ئاژەڵداری و کۆچکردنی عـەرەب لەبیابانی دوورگەی عەرەب بەهۆی نەبوونی لەوەرگا .

حـەنین لـەو شارۆچـکەیە ژیـانی منـداڵی و خووێـندنی بەسـەربردووەو زۆر

ئارەزوومەنـدی فێربـوونی پیـشەی بـاوکی بـووە ، کـە دەرمانـسازبووەو دەرمانخانەی هەبووە لە شارەکەدا .

هـەر بـەو هۆکـارەش تـوانی خوێنـدنی پزیـشکی و مەبدەئەکامی زانست لـە حیرە فێربێت و هەڵگری ئایینی مەسیحی بووە بەمەزهـەبی کاسۆلیك . دوای ئـەوە زمـانی فارســی خوێنــدووە لەگـەڵ پیـشەسازی و پزیـشکی لـە ئەکادیمیای یسابووری بەناوبانگ لە خۆزستانی وولاتـی فارس لەوکاتـدا ... ســابووری دووەم ، کـــە شــایەکی بنەماڵـــەکانی ساســانی بـــووە ، بەدامەزراندنی ئەو ئەکادیمیەو پەیمانگەیە .

دوای ئـەوە گەراوەتـەوە شـاری بەغـدا ، و لـە سـاڵی ٨٥٧ و لەلایـەن دکتـۆر یۆحناماسویە زیاتر فێری پیشەکەی بووە ... بەڵام دوای ماوەیەك لێـی زوێـر بووەو جێی هێشتووە ... حەنین زمانـەکانی عەرەبی و فارسـی و سریانی و یۆنانی بەباشی زانیووە . ئەم زانایەش لەسەردەمی خەلیفە مـەئمون گرنگی پێدراوە بە وەرگێراندنەوەی کتێبە بە بەهاکانی یۆنانی ، دوای ئەوە لـەکاتی خەلیفە متەوەکل عەلەڵلاّ لە نێوان ساڵەکانی ٨٤٧ – ٨٦١ ، کرا بە وەرگێـری کتێبە بـە بەهاکان ... ئـەم کەسایەتیە لـە ماوەی ژیـانی تـوانی لـە بوارەکـانی نووسین و وەرگێران سەرکەوێت و ٩٥ کتابی یۆنانی وەرگێرێتە سەر زمانی سریان و ٣٥ کتابیش وەرگێرتە سەر زمانـی عەرەبی .

سەرچاوە :– گۆڤاری هلال . مانگی /٥/٢٠٠٨ ل/١٧٠ .

## ٠٨١٥

٠٨١٥/٨/١١ کۆچـی دوایـی شـاعیرو زمانـنـاس و ئـەدیبی مـانیزم لـە شـاری بەسـرەی باشووری ئێستای ئێراق – ئـەببانی کوری عەبدولحەمید – جێگـەی ئامـاژە پێکردنە کە – ئـەببان – یش باوەرێکی راستـەقینەی دوانـە پەرستی شـاری بەسـرە هـەبووە ... کە شـارەزایەکی بـێ وێنـەی هـەبووە لـە زمـان و ئـەدەب و شــیعر و کەلــەپووری فارســی ئــەو کــات . کــە ئــەوەش کاریگــەری لەســەر گەشــەپێکردن و پێگەیانـدنی بـیروو هۆشــی زانـینی ئـاینی هــەبێ ... کــە کەسایەتیەکی چاونەترس و مەردانە بووە .

لــە بــەر ئــەوە بـیری مـانیزی خـۆی راگەیانـدووەو هـەوڵی بڵاوکردنــەوە و

راکێـشانی پـەیرەوانی بۆ ئایینەکـە کـردووە ، بەرادەیـەك ئەوەنـدە هـۆگرو پابەنـد بـوو ... کـە لای خـەڵك بـە شـێت ناسراوبوو ... بـەڵام شـێت نـەبوو ... تەنانـەت هاوریییـەکی خـۆی بـەناوی – موعـەزلی کـوری گـەیلان – بەچـەند دێرێـك لـە شـیعر وەسـفی کـردووە .... ئـەو تێروانینـەی – موعـەزل – بـۆ – ئـەببان – جێگـەی سەرسـوورمان بـووە لـەکاتی خـۆی ... کـە یەکـەم رۆژی جـەژنی رەمـەزان نوێـژی کـردووە ... چـونکە بەبۆچـوونی ئـەو نـەدەبوو پەیرەوێکی ئایینی مانیزمیەکان نوێژ بکات .

بەڵام زۆر لەوە نزیك بووە کە ئەو نوێژەی بۆ – جەژنی بما – کردبێ کە چەژنی رەمەزانی ساڵی ٧٨٥ رێکەووت بوو لەگەڵ دوا رۆژی ساڵی مانیەکان ... ئەمـە تـا ئـەو کاتـەی کـە کۆچـی دوایـی کـردووە بانگەشـەی بـۆ بیروباوەرەکانی دەکرد لە ناوچەکەدا .

سەرچاوە :– الحافظ – ٤ /٤٤٧ – الاصفهانی : الاغانی ١٠١/١ البغداد

– خزانه الادب و لب لسان العربی ٣ / ٤٥٨ .

**لێرە دەمەوێ باس لە کاریگەری مانیزم لە سەر دەووڵەتی عەباسی دا بکەم ئەویش :–**

کە دەووڵەتی عەباسی پێنج ساڵ دوای دەرکەووتنی ، یاخوود سەرهەڵدانی مانیزم دامەزرا ، کە سەردەمێك لە ململانێی بیری و رامیاری کەلتوورو داب و نـەریتی ئـاینی دروسـتکرد ... کـە کاریگـەری چـەندین لایـەن و بـوارە جیاجیاکانی بەسەرەوە بوو .

وادیاربووە کە دەرکەووتن و سەلماندنی کاریگەری ئاینێك ئەوەنـدە ئاسـان نیە ... بەڵام دەکرێت لە دەرئەنجامی دەرکەووتنی یەکێکیان لە ئاستی ئـەوی دیکە دا رادەی کاریگەری یەکەم بەسەر دووەمەوە بزانریت .

دواتر شێوازەکەی بە خۆ گوونجاندنی بیروو باوەرە کۆنەکانە بۆ چەسپاندنی ئامانجەکان لەگەڵ پەیامە نوێیەکە بەدیار بکەوێ . بەو پێیـەش مـانیزم لـە سـێ سـەدەو نیـوو بـەر لـە ئیسلام دەرکـەووت وناسـرا ، لـە نێـوان ململانێـی بیروباوەرەکان – جوولەکە , – زەردەشتی , ئێزیدی , مەسیحی , مەرفیونی , دیسانی , بەرگ سپیەکان – تا گەیشتنە ئەو قۆناخەی کە قورسایی خـۆی پاراست و بەرەنگاری هەموو هەرەشەو گورەشە و پاڵەپـستۆی زەبرو زەنگی گەوورە پیاوانی ئەوان و هێزەکانی سەردەم ببووەوە .

هەروا چۆن ئەوانی بەر لەوەش کاریگەریان لە سەر مانیزم دروست کردبوو ... لەو روانگەدا – کارل برکمان –ی خۆرهەڵاتناس لە سەر ئەو باوەرە بووە کە – مانیزم – لە مەڵبەندی راستەقینەی خۆی بابل کاری لە ئاینی ئیسلام و لە پێگەی یەکەمی خۆی لەشاری مەککە کردبوو لە هەرێمەکەدا .

لەبەر ئەوەی دەووڵەتی عەباسی لەسەر بنەماو یاساکانی ئاینی ئیسلام و قورئانی پیرۆز ، کە دەستووری نەگۆری ئیسلامەو لەسەر بانگەشەی رازی بوون لەنەوەکانی محەمەدی کوری عەبدوللای کوری عەبدولموتەلبی پێغەمبەری ئیسلام – د.خ – دامەزرابوو .

کە دەسەڵاتێکی ئاینی بوو بەر لەوەی دەسەڵاتێکی رامیاری بێت . لە بەرەو بە جیهان بوون ، هەرچەند لە ناوەرۆکدا دەسەڵاتێکی رامیاری و نەتەوەیی و فراوانکردنی سنووری جووگرافی و بە ئیسلام کردن و بەعەرەبکردن بوو. بۆیە کاریگەری خۆی لەچەند بوارێك لەسەر ئەو دەووڵەتە جێ هێشتبوو ... لەوانەش کاریگەری ئاینی لە کێشووەرەکەو جیهاندا لەسەر نەتەوەو ناوچەو هەرێم و جیهان .

تێبینی:– من نەم ویستووە بە تێرو تەسەلی باس لە هەموو بوارەکان بکەم ، لە بەر ئەوەی مێژوونامەکە تەنیا لەبارەی رووداوە گرنگەکان و هەمە لایەنەکانە لە هەموو بوارە جیا جیاکاندا .

بگەرێنەوە سەر ئەو سەرچاوانە ١– تاریخ الشعوب الاسلامیە / ٩١ .
دووەم مؤلف مجهول اخبار العباسی ل/ ١٩٤ .

## ٠٨٣٣

٠٨٣٣/٨/١٠ خەلیفەی ئیسلام خەلیفە مەئموون کۆچی دوایی کردووە ... شایانی باسە کە خەلیفە مەئموون سووێندی بە قورئان خوارد کە ، دەبێ لە داواکاریەکانم لانەدات و داوای لە محەمەد ئالووسی شاکرو هەردوو براکەی ئەحمەدو حسێن کرد ، بە لێکۆلینەوە بە لە سەر درێژی هێلی نیووەی رۆژ دا .

لە پێناو زانینی قەبارەی دەریاو خرۆکەی زەوی کە ، یەکەم خاڵی ئەو هێلەیان لە دەشتاییەکانی شاری سنجار بوو لە باشووری کوردستان . دووەم خالیش شاری کووفە بوو، لەو کاتەی کە زانرا زەوی هێلکەییە ، ئەویش لە رێگەی وەرگێرانی بە دەیا کتێبی زانستی و گەردوونی و فەلسەفەی یۆنانی ، بۆ

سوود لێووەرگرتن و  بە دەیا زانیاری دیکەدا .

**٠٨٣٦**

٠٨٣٦/١٢/١٦ ئـاوەدان کردنـەوەو دروسـتکردنی شـاری سـامەڕا  لـە جێگـەی  گونـدی – موتیرە – کە شاری سامەڕا ئێستا سەر بە پارێزگای سەلاحەدین – تکریت – ە لە باکووری ڕۆژئاوای شاری بەغدا بە دووری ١١٨ کیلۆ مەتر .

جێگەی روونکردنەوەیە کە شاری سامەڕا دەکەوێتە سەر کەناری ڕۆژهـەڵاتی زێی دیجلە ، هەروا دەکەوێتە سەر هێلی ٤٣ بە پلەی ٤٥ خوولەك . هـەروا لـە سەر هێلی ٣٤ بە پلە ٣٥ خوولەك . کە شاری تکریت لە باکووریەتی . هـەروا شاری بەغدا دەکەوێتە باشووری . لە ڕۆژئاوای شاری ڕومادیە . لە باکووری ڕۆژئاوای شاری مووسڵە . لە باکووری شاری کەرکوکە .



بەر لەو مێژووەی سەرەوە دانیشتووانی ئەم شارە هەلگری ئاینی مەسیحی بوونە لە کورد و ئارامی کلدۆ سریانی ، بە تایبـەتی کە کەنیسەیەکی تیا بـووە ، کـە شـووێنەوارەکانی دەگەڕێتـەوە بـۆ بـەر لـە مێـژووی زاینـی و دواییش مەسیحیەکان . لـەو کاتـەی کـە – موعتەسـەم – ی عەباسی بەرەو ئەو ناوچە هات ، ئەویش بە گەران لە دوای جێگایەك بۆ بنیاتنانی شارێك و کردنـی بـە پایتـەختی دەسـەڵاتەکەی ، لـەو کاتـەی کـە گەیـشتە ئـەو جێگایەی کە ئێستا شاری سامەڕایە و دیتی کەنیسەك لـەو جێگایە هەیە و ماوەی سێ ڕۆژ مایەوە و گەیشتە ئەو بروایـەی کە ئـەو جێگایـە گوونجاوە لە گەڵ خواستەکەیدا .

هەر لەو کات هەڵسا بە کرینی ئەو زەویە و لە هەمان کات کرینی زەوی کەنیسەکەش بە ٤٠٠٠ چوار هەزار دیناری ئەوکات و لەو مێژووە نەخشەی ئاوەدانکردنەوەی بۆ دەست پێکرد ، کە ناوینا بە — سوورە مەن رەئا — لە دوای تەواو کردنی ئەو خانوو و کۆشکانەی کە لەو کات دیاریکردبوو لەو جیگایەدا .

دوای تـــەواو کردنـــی کارەکـــانی لەگـــەڵ دارو دەســـتەکەی پایتـــەختی دەسەڵاتەکەیان گوواستەوە ئەم شارە ، دوای ئەوەش خێزانی دیکەی لە عەرەب روویان لەو شارو دەوورووبەرە کرد و تێیدا نیشتەجێ بوون ، کە نازناوی — عەسکەری — بە خۆوە لکاند .

دوای ئەوە هارونە رەشید یەکەم جۆگەی ئاودێری لێ دروستکرد لە شارەکەو کۆشـکی لێدروسـتکرد بـە نـاوی خـۆی ، دوای ئـەویش لـە سـەردەمی — مەئموون — ی عەباسی لە ساڵی ٨١٣ گوندی مەتیرە بە ناوی رەسەنی خۆی بنیتنایەوە ، کە بووە هاوینەهەواربۆ شاری بەغدا .

دوای ئەوە لە ساڵی ٨٥٩ — متەوەکلی — عەباسی شارەکەی بە ناوی خۆی کرد و مزگەووت و منارەکەی لێدروستکرد بە ناوی — ملویە — دوای ئەوە لە ساڵی ٩٤٤ ناسـر دەوولـەی حەمـەدانی پرژینێکـی لێدروسـتکرد . دوای ئەویش لە ساڵی ١٨٨١ شێخ زین عابدین سەلماسی پەرژینەکەی تەواو کرد . ئەویش لە رێگەی یارمەتی دانی لە لایەن یەکێك لە مەلیکەکانی هندستان . هەر لەو ساڵەدا یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی لێدروستکرا .

دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٧٨ لە سەر دەمی دەسەڵاتی عوسمانی یەکەم پردی لێدروستکرا لە سەر زێی دیجلە کە سامەڕای دەبەستەوە لە گەڵ کەرتەکەی دیکەیدا . دوای ئەوە چەندین کاری دیکەی لە ئاوەدانکردنەوەی بۆ کراوە لە وانەش پرۆژەی بەنداوی — سەرسار — لە ساڵی ١٩٥٢ لە شارەکەدا .

سەرچاوە:— رۆژنامەی — تەئاخی — ژمارە / ٥٥٠٩ .

**٠٨٣٨**

٠٨٣٨/١١/٢٣ کوردان زۆر شانازی دەکەن کە هەواڵێکی ... واتە ئەسحابە . پێغەمبەر — د.خ— ناوی — کابان —ی کوردی بووە ...کوری کابان کە — مەیمونی ئەبوو

یەسیر –بووە ، لەلای کورد زۆر خۆشەویستە ... کابان وەك سەلمانی فارسی . کــە فــارس خــۆی پــێ رادەنــێن زۆر لــە پێغەمبــەر – د.خ– نزیــك و فەرموودەکانی لەبەر بوون .

لەچەرخەکانی سەرەتای دەوڵەتی ئیسلام خاوەری ئیسلام نێووی کورد لە زۆر شـوێندا دەهاتـە بەرچـاوو ... لـەم رۆژەدا بەسـەرکردەی سـەرداریان – جەعفەری کوری فەهرجیس – لەلای موسل شۆرشێکیان دژی – موعتەسـەم عـەباس – هەڵگرسـاندو والـی موسلیان وەدەرنـاو خەلیفە چاری ناچار بوو لەشـکرێکی یـەکجار زۆری بەسـەرکردەی – ئیتـاخ – نـاو نـاردە سـەریان و جەعفەر کووژراو کوردەکان قەلاچۆکران و بەتەواویش تالان کران ...

سەرچاوە :– ئیبن ئەسیر – رووداوەکانی ساڵی /٢٢٤..
.محەمەد ئەمین زەکی – کوردو کوردستان .

٠٨٤٧

٠٨٤٧/٨/١١ خەلیفەی عەباسی– واسف مووعتەسـەم – لە شـاری سـامەرا کۆچـی دوایـی کردووە ، کـە لـە دووای مردنـی بـاوکی دەسـەڵاتی خەلافـەتی عەباسـی گرتـە دەست لەجێگەی باوکی لە هەموو کاروبارە جیاجیاکاندا .

٠٨٦١

٠٨٦١/١٢/١١ تیرۆرکردنـی خەلیفـە متـەوەکل لـە لایـەن بەرهەلـستکارانی لـە گـەڵ کورەکـەی موونتەسـرو ئامینـە فـەتح خافـان ... دووای تـیرۆر کردنـی خەلیفـە متـەوەکل... محەمەد جەعفەر متوەکل جێگەی گرتـەوە بـە وەرگرتنـی دەسـەڵاتی خەلیفـە یـی بە هەڵسووراندنی کاروبارە جیاجیاکانی خەلافەتەکە لەدەسەڵاتدا.

٠٨٦٦

٠٨٦٦/١/٢٢ لــەو کاتــەی مـساور دژی والــی مووســڵ جــەنگا ... کــورد هاوکـاری مـساور بـوون .... شۆرشـی – زەنـج – و –سـەفغاری – کـە دژی بەغـدا دەجـەنگان کـورد یاریـدەدەری شۆرشـەکە بـوون ... – بـەعقوبی لەیـسی سـەفغاری– لـە

پاداشتی ئازایەتی ئەهوازیدا بە – محەمەدی کوری عەبدوللای کوری هەزار مەرد – بەڵام محەمەد دەیوویست هەر بە خۆی هەمکارە بیٚ . – ئەبوو ئەلهەیجای کوری حەمدانی – تازە ببووە والی مووسڵ ، هاواریان بۆ هێناو گووتیان :–

محەمەدی کوری بیلال و کوردەکانی هرزەیانی دەووری نەینەوایان داوەو هەر کوردەکان ٥٠٠٠ هەزار چەکدار دەبن ... ئەبوو ئەلهەیجا لە – مەعروبە – کە لە سەر چۆمی – خازر – ە ، چووە سەریان و لەشەڕدا لەبەر کورد شکاو هاتەوە موسل و ، دووبارە خۆی بۆ شەڕێکی دیکە ئامادەکرد ، کە بە لەشکرێکی زۆر چووە سەریان ... محەمەد کەوتە تەنگانەو داوای شەڕ وەستانی کردو بەڵێنیدا , کە کورەکانی دەگرەو دانیٚ و خۆیشی بدا بەدەستەوە .... کە چووەوە بۆ ئەوەی کورەکانی بنێریٚ کوردەکانی خۆی تێگەیاند کە بچنە ئازربایجان و خۆ رزگاربکەن .

ئەبوو ئەلهەیجا کەلەو کارە گەیشت محەمەد پەکی کەوتوو خۆی گەیاندیٚ و دەووری گرتن ... لەدوای ئەوە کە ئەبووئەلهەیجا توانایان نەماوە ئەو ماڵ منداڵ و خێزانانەی بەتاڵان بردبووی بۆی گەراندنەوە ... لە دوایی کوردی حەمیدی و کوردەکانی چیای – داسن – ئاژاوە کۆتایی هات .

سەرچاوە :– لوسترانگ – بلدان الخلافە الشرقيە – وەرگێرانی . بەشیر فەرەنسیس و گۆرکیس عواد – ل/١٨ .

## ٠٨٧١

٠٨٧١/١١/١٨ سەرهەڵدانی دەرکەووتنی داوەتی قرمەنیەکان لەناوچەی ووڵاتی بەحرێنی ئێستا و ئەحسا . ئەم ناوەش دەگەرێتەوە بۆ سەر ناوی پیاوێکی خۆزستان ، بەناوی حەمدانی کوری ئەشعەت ، کە لە رەشایەکانی دەووروبەری شاری کوفەی ئێستا دەژیا .... بەر لەوەی کە ناوزەندبیٚ بەناوی قرمت ... بە بروای دکتۆر فلیپیش ، ئەم ناوە مانای – مامۆستای نهێنی – بووە . داوەتەکانی ، فرمتی ، لەژێر داوەتەکانی دیارنە بووە نهێنیەکان بووە .

ئەم پیاوە کە ناوی حەمدان بوو چاوی بە پیاوێکی – باگی المزهب – کەووتووە کە ناوی حەسەن ئەهوازی بوو .... کە ئەو کاتە ئەهوازو

دەوورووبـەری بـە لۆرسـتان ئاوزەنـد بـووەو خـاکی کوردسـتانە . ئـەم نـاو حەسـەنەش هەنـدێ وەڵامـی نهـێنی و زانـستی لـەلا بـووە ، کـە هۆکـاری دەووڵەمەندبوونی خەڵك بووە . کە ئەمەش کاریگەری کردۆتە سەر دەروونی –حەمدانی ئەشعەت .

دوای ماوەیەك وەك ئیمامی منتەزەر چاوەروانی لێدەکراو هەڵپسا بە دەست نیشانکردنی ١٢ نـەقیب لـە بەرێوەبەرایەتیەکان بە بڵاوکردنـەوەی داواکانی ... ئەبوو سەعید جەنابی زۆر گەرم و گوور بووە لە سەر ئەو کارەو توانی لەدوای مردنی حەمدان سەرکردایەتی قرمەنیەکان بکات و دەووڵەتی قرمەنی دابمەزرێنێ و چەندین کەسی پێکهتوو بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و دەستی کرد بە هێرش بردن تاکوو توانی وولاتی نێوان دووزێ بەتەواوی و هەندێ لـە هـەرێمی شـام داگیر بکـات و بـەرەو شـاری حجاز لـە دوورگـەی عـەرەبی بەشێووەیەکی توونـدو تیژ هێرشـی کـردە سـەر ئـەو حاجیانـەی کـە بـۆ ماڵی خوا چووبوون و بیان کووژن .

ئەبوو تەها سلێمان لەساڵی ٩٢٧ چووە ناو مەککەو دەستی بەسەرا گرت و هەرچـی ئاسـەوارو شـووێنەوار هـەبوو شـکاندی و تـالانی کـرد ... لەوانـە هەڵکەنانـدنی بـەردی رەشـی کەعبـە ، بـە شـکاندنی دەرگاکـانی کەعبـە و تێکـدانی ئـەوەی تیـای بـوو هێنایـە شارۆچـکەی – هجـر. عەباسـیەکان نەیانتوانی هیچ بکەن بەتایبەتی بەگەراندنەوەی بەردی رەش .

بـەڵام فاتمیـەکان بـەهۆی پەیوەنـدی بـەهێزیان لەگـەڵ قرمەنیـەکان توانیـان بـەردی رەش لـە دوای ٢٢ سـاڵ بگەرێننـەوە کەعبـە لـە شـاری مەککـە..لـە کۆتاییـەکانی دەسـەلاتی فرمـەنی لەسـاڵی ١٠٢٧ بـوو لەسـەر دەسـتی عیونیەکان بووە ، کە لقێك بوون لەنەوەی عەید ئەلقیس کەلە دەوورووبەری عیوون نیشتەجێ بوون لەشاری ئەحسای ئێستای وولاتی بەحرێن .

سەرچاوە:– ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان – ئامادەکردنی سەیفەدین کاتب.

دار الشرق/ المؤسسه العلمیه لوسائل التعلیمیه ، بیروت ،سووریا /٢٠٠٥ .



١٨ /١١/ ٠٨٧١ مێــژوو نووســان دەڵــێن عەرەبــەکان کــۆتری نامەبــەریان بـەکارهێناوەو دەلـێن لـەو کاتـەی ، کـە لـە خۆراســان شــەڕی گــەوورە دەســتی پێکـردو تـا گەیشتە وولاتــی مــەغریبی ئێستاو لـەوێووە پەریـەوە بۆ ئەنـدەلووس . کە لەخـەڵکی وولاتـان فێربوون لـەکاتی شـەڕو کووشـتاردا ئـەم کـۆترە نامـە بەرانـە بـەکاربێنن ... حەمـدان قرمـەتی = حمـدان القرمگـی - کـە پێشرەوایەتی بزووتنـەوەی فەرامیتـەی کـردووە ، بەهۆی کۆترەوە نامـەی بۆ ئـەم رابەرانـە دەنارد ، کە پـەیامی ئـەم بزووتنەوەیان بلاّودەکردەوە .

هەروا دەلێن لەسەرەتای بلاّوبوونەوەی ئیسلامدا ، کۆتریان پەروەردە دەکرد بـۆ رێگاو شووێنی دوور لـە وولاّتـی نێوان دووزیّ و شاری بەغدا ، لـە سـەر دەمــی خەلیفــە موعتەســەم بــەکاریان هێنــاوە ... هــەروا میــسریەکانیش لەســەرەتای ســەدەی دوانزەهــەم زۆر بایــەخیان بـەم جـۆرە کـۆترە داوە بـۆ گوواستنەوەی نامە لە نێوانیاندا .

هەروا بە درێژایی چەند سەدەیەك ئەم کارەیان ئەنجام داوەو دەلێن . یەکەم کەســیش کــە بــەکاری هێنــاوە ســوولّتان نــورەدین بــووە ، لــە کــاتی فەرمانرەواییەکـەی لەسـالّی ١١٤١ ... بـۆ ئـەوەی ئـەم کۆترانـە لـە چـوون و هاتنـەوەدا چـەند شـووێنێکیان لـە نێـوان شـارەکاندا بـۆ دروسـت کرابـوو بـۆ حەسانەوە لە بڕینی رێگاکانیاندا .

شایانی باسـە کە دەلێن پیاوێك لـە دوورگەیـەکی یۆنـان لەسالّی ٧٧٦ بـەر لـەزایین ئـەمجۆرە کـۆترەی هێنـاوە بـۆ وولاّتـی یۆنـان . هـەروا لـە یاریـەکانی ئۆڵـەمپی بـەرەلاّی کـردووەو گەراوەتـەوە جێگـەی ، واتـە سـەر هێلانەکـەی کە بێچووی تێدابووە .... بەم جۆرە بەکارهاتووە ، پـەیتا پـەیتا خـەڵکی یۆنان و

رۆمان و عەرەب ومیسریەکان بۆ نامە گوواستنەوە بەکاریان هێناوە . هەروا لە یاریەکانی ئۆڵەمپی لە پێشبرکێی گالیسکە لە رۆمان بەکارهاتووە کە هەر تیپێك لەرۆژی یاریەکە کۆترێکی لەگەڵ خۆی هێناوە ، کە نیشانەی وولاتەکەی ، یا نیشانەی جل و بەرگی یاریزانانی لەسەر بووە.

زانایان وای بۆ دەچن کە مێژووی بەکارهێنانی ئەم جهۆرە کۆترانە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی هۆمیرۆس = ی شاعیری خاوەن داستانی –ئەلیازە –ی بەناوبانگ , کە ئەوان لەکاتی خۆی لەشەری = تەراودە = بەکاریان هێناوە .... زانای بەناوبانگ – تشالزداروین – هەڵساوە بە بەراووردکردنی کۆتری نامەبەری ئینگلیزی لەگەڵ چەندین جۆری کۆتری دیکە ، کە پێیان دەلێن تەقلەباز ، یاخوود پالەوان ، ئەم دوو جۆرە بیلوودزیانی لەسەرو رەنگ و دەستەدا هەیە .

هەروا لەلایەکی دیکەوە – مستەر بیرش – دەڵێت :– پێش ئەمانە مێژووی رۆمانەکان باسی ئەم کۆترانەیان کردووە . هەروەك – پیلینۆس – دەڵێت :– لە مێژووی رۆمانەکان باسی سێ جۆرە کۆتر کراوە لە رەچەڵەکی نایاب و چاکیان لێك جیاکردۆتەوە . ئەکیەرخان ، کە پاشایەکی هندی بووە لە ساڵی ١٦٠٠ کە ئارەزوی زۆر بۆ کۆتر چووە زیاتر لە ٢٠هەزار کۆتر لە کۆشك ولە باڵەخانە شاهانەکەی هەبووە .

کە لەگەڵ پاشای فارس ئالوو گۆری کۆتری نایابیان کردووەو کاریان پێکردوون ... جۆرەکانی کۆتر بۆ ٥٠٠ جۆر دەست نیشان دەکرێت ... هەروا لەو کاتەی کە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، لەلایەن سووپای ئەلمانیا لە نێوان ساڵەکانی ١٨٧٠ – ١٨٧١ گەمارۆدرابوون .

ئەم جۆرە کۆترانە بەکارهاتوون ... لە ساڵی ١٩٥٦ ئەمەریکا وازی لە بەکارهێنانی کۆتر هێناوەو رووی لە تەکنۆلۆژیای سەردەم کردووە .... واتە کۆتری نامەبەر بایەخی زۆر پێدراوە لەلایەن وولاتانی شەرکەر لەجیهان وهەروا وولاتانی دیکە و کۆمەڵگاکانی کورد لە کوردستان .

٠٨٧٣

٠٨٧٣/١٠/٢٨ کەسایەتی ناوداری ئایینی ئیسلام ومەزهەبی شیعەی عەرەبی ئیسلام –

ئیمام حەسەن عەسكەری – لە شاری سامەرا كۆچی دوایی دەكات ئەویش بەهۆی دەرخواردانی ژەهر .
ئەم بنەماڵەیە هەموویان لە سامەرا نێژراوون لە مزگەووت ، یاخوود مەزراگەی هەردوو ئیمام حەسەن عەسكەرو عەلی عەسكەر .... كە بۆتە جێگایەكی خواپەرستی و مەزارگەیەكی پیرۆزی ئایینی ئیسلامە لە سامەرا بەتایبەت لە لایەن مەزهەب شیعە لە جیهانی ئیسلامیدا ، لە باكووری شاری بەغداو رۆژهەڵاتی پارێزگای سەلاحەددین لە ئێراقی ئێستادا .
سەرچاوە :– گۆڤاری – میزۆبۆتامیا – ژمارە /٢ . ل/١٢٥ .

## ٠٨٧٤

٠٨٧٤/١٠/١٦ دامەزراندنی دەووڵەتی سامان لە هەرێمی دواوەی زێیٚ . جێگەی ئاماژە پێكردنە كە سامانیەكان دەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەیەكی فارسی كۆن . كە باپیرەیان – سامان – لە سەردەمی خەلافەتی ئەمەوی – هیشام عەبدولمەلیك ، چووە پاڵ داواكاریەكانی عەباسیەكان ، كە ببووە ئیسلام ... لە خۆراسان و لە ریزی باوەڕەكانی ئەبوو موسلیمەی خۆراسانی كاری دەكرد.
ئەوە بوو دەووڵەتی سامانی دامەزراند ... ئەم دەسەڵاتەش بەر فراوان بوو لە سەرخاكی ئێستای ئێران ، تاكوو ناوچەكانی تەبرستان و رێگاو چیاو سبجستانی گرتەوە . كە داواكاریەكانی زیندوو كردنەوەی جیاكەرەوەی فارسی بوو لە ماوەی زیندوو كردنەوەی زمانی فارسی و رۆشنبیریەتیەكەیدا.
تێبینی :– زۆرجار لە نووسینەكانم باسم لە نژادی كوردو فارس كردووە ، كە تاكوو كۆتایی هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی میدیا ... نەتەوە نەبووە بەناوی فارس ، بەڵكوو كورد بوونە و لە دوای ئەو مێژووە بوون بە فارس سەری هەڵداوە ... بۆ نموونەش:–
ناوی سامان – ووشەی سامان ، ووشەیەكی كوردیە نەك فارس بەناوی نەتەوەی فارس ... بەڵام بوونی ئایینی ئیسلام گۆڕانكاری زۆر بە سەر نەتەوەو خاك وزمان وكەلتورو داب و نەریتی نەتەوەكانی ناوچەو

هەرێمەکاندا هێنا ...بەتایبەتی لەکیشووەری ئاسیاو دوایی لە کیشووەری ئەفەریکیا لە جیهاندا .

سەرچاوە :– پارنودلد – فاسیلی فلادیمیروفتیش .
مێژووی تورك لە ئاسیای بچوك ل/٣٧

٠٨٧٥

٠٨٧٥/٧/١٤ بەرمەکیەکان لە بنەماڵەیەکی رەسەنی دانیشتووانی ئێستای ئێران بوونەو هەڵگری ئاینی بووزی بوونە ... بەڵام لەدوایی باوەریان بە ئاینی مانیزم هێناوە . باپیرە گەورەیان – بەرمەك – خزمەتکاری پەرستگایەکی شاری – بەلخی – هەرێمی خۆراسان بووە ، خالیدی بەرمەکی – یش لە سەردەمی خەلیفە ئەبوو ئەلعەباس سەفاحدا بەپرسی دیوانی خەراجی دەوڵەت بووە .

بەڵام دەرکەوتنیان لە بواری رامیاریدا بۆ خزمەتی ئاینەکەیان بۆ سەردەمی خەلافەتی – موسا هادی – دەگەرێتەوە . کاتێك ئەو خەلیفەیە وویستی لە هارونە رەشیدی برای بدات و لە جێنشینەکەی خۆی دەری بکات تا – جەعفەری – کوری لە شووێنەکەی دابنێ .
بەڵام بە هاوکاری ولێهاتووی – یەحیای کوری خالیدی بەرمەکی – ئەویش بەهۆی پشتیووانی کردن لە براکەی لە ئاکام ئەو هەڵەش سەرکەووتنی نەدیت . لە ئەنجامدا بە مردنی – موساهادی – لە ساڵی ٨٧٦ داو لایەنگیری بەرمەکیەکان سەرکەووتنی براکەی بۆ پایەی خەلافەت کۆتایی بەو کێشەیە هێندرا .
بۆیە لە بەرامبەردا خەلیفە – هارونە رەشید – یەحیای بەرمەکی – کردە یەکەم وەزیری خۆی و راوێژکارو بەرێوەبەری کاروباری دەسەڵاتەکەی خۆی . لەو کاتەشدا خەلیفە هارونە رەشید نیازی مەراسیمێکی گەورەی هەبوو بەگەیشتنی بە پایەی خەلافەت لە شاری بەغداو لەسەر داوای ئەو کەسایەتیە بەرمەکیە ئاهەنگەکە دواخرا .
لەماوەی ١٧ ساڵ لە دەسەڵاتی یەحیاو کورەکانیدا ... سەرەرای ئەوەی دەسەڵاتی بەرزیان لەو دەووڵەتە هەبوو ... جێگەی متمانەی خەلیفەش بوون

.. بـەڵام لـەو ماوەیەشـدا تـەنها بـە بنـەماکانی ئایینەکەیانـەوە – مـانیزم – پابەندنـەبوون . بـەلکوو زۆر خزمـەتیان بـە هـاو پـەیرەوەکانیان کـردوو ئـەو پایەیان بۆ خزمەتکردنی ئایینی – مانیزم – بەکارهێنا ... یەحیا ... هانی – سەهلی کوری هارونی کوری راهیوون – ی هاوولاتی – دەشتی میسان – داو چـەندین کتێـب لەسـەر خێڵەکـەی و نـەزانی عـەرەب و رەسـەنایەتی شارستانیەتی فارس و ئایینەکانی لەوانە – مانیزم – بنووسێت . هەروا لە دارشـتنی کتـێبی – کلیلـەو دیمنـە – دا بـە شـیعر کـە – ئایـانی کـوری عەبدولحەمیدی کوری لاحق – بە ئامانجی گەیاند و بری – ١٠٠٠٠ هەزار – دیناری ئەوکاتی وەك خەڵات پێشکەش کرد .

لە هەمان کات فەزلی کوریشی بە ٥٠٠٠ هەزار – دینار پاداشت کرد . ئەو هەڵوویستەی بەرمەکیەکان لەسەردەمی بەهێترین خەلیفەی عەباسیەکان بوو کـە سـاڵێك ...؟ دەکـردو سـاڵێکی شـەڕی دووژمنـەکانی .... هـەروا رۆڵـی باشیان لەسەردەمی خەلیفە مەئمونیش هەبوو لە پێناو بەرگری کردن لە بروای مانیزمدا .

سەرچاوە :– الدوری – الجذور التاریخیة للشعوب . ل/٤٨ – تەبەری .
تاریخ الامم و الملوك ٦/ ٤٨٤ .

 ٠٨٨٢

٠٨٨٢/٨/١٥ کۆچی دوای شاعیری گەورەی مانیەکانەو رۆشنبیری سەدەی ئەو کات – یەشـاری کـوری بـورد – لـە شـاری بەسـرای باشـووری ئێـستای ئێـراق لـە بنەماڵەیەکی بەرەسەن دانیشتووی هەرێمی خۆراسانی ئێستای ئێران.

شـایانی باسـکردنە کـە یەشـاری دوای کۆچـکردنیان بـۆ شـاری بەسـرەو نیشتەجێ بوونیـان ... یەشاری بەشێووەیەکی گوونجاوی ئـەو سـەردەمەدا پەروەردەکراو لەدوای تەواوکردنی خووێندنەکانی لەو کات توانایەکی باشی لـە بوارەکـانی فەلسەفەو مـەنتیق و زمانـەوانی پەیـداکرد .... جگـە لـەبوونی شـاعیرێکی دیـارو بـەتوانا .... ئـەم کەسـایەتیە هـەوڵی زۆری بـێ وێنەیـدا لەرێگـەی شـیعرەکانیەوە رووی گـەش و گـەورەیی و لێهـاتووی مانیـەکان بەرزبکاتەوەو رایگرێ و لەم رووەوەش دەلێ ... الأرچ مقلمه والنار مشرقه – والنـار معبـوده مـژکانت نـار ... دەرکـەووتن و ناسـینی یەشـاریش تـەنیا

لەرێگەی شیعرەکانی نەبووە ... بەڵکوو لە رێگەی ئەو ووتارو ووتانەی کەلە کۆبوونەوەو شووێنە گشتیەکان لەشاری بەسرە و دەووروویەری ئەنجامی دەدا هانی خەڵکی دەدا لەخراپەکاری و مەی خواردنەوەو بەرەللآی دوورکەونەوە ... ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە – حمادی کوری عجرو – یەشاری بە مانیزمێکی راستەقینە بناسیّ .

هەر بەو هۆکارەش بوو کە ئەو باوەر پیّ بوونەی کە لەبەر دادگای بالای خەلافەت زیندانی بکرێت و دوای ماوەیەك لەژێر ئازارو ئەشکەنجە ژیانی پیّ لەدەست بدرێت لە شارەکەدا

## ٠٨٩٤

٠٨٩٤/٣/١٣ ئەندازیار و موئەرخ و زانای بەناوبانگ – ئەحمەد داودوننەد – ناسراو بە ئەبوو حەنیفەی دینوری – لە ناوچەی دینور لەناوچە شاخاویەکانی رۆژهەلاّتی کوردستان لە دایك بووە.

زمانی ئەندازیاری و فەلەك وجووگرافیا ومێژووی خووێندوو. لە شارۆچکەکەی خۆی – مەرسەدێکی – واتە دووربین ، داناوە بۆ وەرگرتنی زانیاری لە باری کەش و هەواو گەردوون ...لەماوەی ژیانی سەردانی هەرێمەکانی شام و دوورگەی عەرەبی و کەنداوی فارسی کردووە ... لە ماوەی ژیانیدا زیاتر لە ٢٠ دانراوی لە دوای خۆی جیّ هێشتووە وەك – الانواو – الباه – الشعر و الشعراو – الفصاحه – الجبر المقابله – البلدان – و دەیا دانراوی دیکەی گەردوون و جووگرافیا و مێژوو و کۆمەڵنناس و ئەندازیاری ... ئەم مرۆڤە کوردەش لەماوەی ژیانی لەکارەکانی بەردەوام بووە تاکوو لە ٩٠٢/١٢/٥ کۆچی دوایی دەکات .

سەرچاوە:– الواق بالوفيات ٣٧٧/٦ ... معجم الادباو /٤٩١ .
معجم المؤلفين ٢١٨/١.

## ٠٩٠٨

٠٩٠٨/٩/٣٠ دامەزراندنی دەووڵەتی فاتمیە لە کێشووەری ئەفریکیا بەسەرکردایەتی عوبێدوڵلاّ – ئەلمەهدی – داوای ئەوەی دەکرد کە ئەو خاوەن مافە بە بوونی

به خەلیفە . کە کوری محەمەدی کوری ئیسماعیلی کوری جەعفەر سادق بووە ... لەو کات هەوڵەکانی ڕێگە خۆشکەر بوون بۆ داواکاریەکانی ئیسماعیل ، کە پێی دەگووترا ، باوکی عەبدوڵڵای شیعی و هۆزی – کتامە – لە ناوچەکەدا .




ئەم نەخشەیە دەوڵەتی فاتمیەکان دەردەخات

هەر لەوکات هەوڵیدا ئەو هۆزەی کۆکردەوە لە پێناو سەرکەووتنی و دەوڵەتەکەشی ناوزەند بوو بە دەوڵەتی – عەبیدیە–
جێگەی ئاماژەیە کە ئەم بنەماڵەیە لە ڕەچەڵەکداو لە نژادا عەرەب نەبوونەو بەهۆی قۆناخە تێپەر بووەکانی مێژووی پەرەسەندن و پێشکەووتن بوونەتە عەرەب ئەویش :– نژاد و ڕەگەزی عەرەب یەکێکە لە نژاد و ڕەگەزی سامی . کە هەموو داب و نەریتەکانیان پەیوەندن بەسامیەکان و زمانەکەشیان لقێکی زمانی سامیە ... نووسەرو نژادنناس و ڕەگەزنناس و زماننناسەکان عەرەبیان دابەشکردووە بۆ دووبەش ... کە ئەویش :–
یەکەم :– العرب البائده – و دووەم :– العرب الباقیە –و ، هەروا عەرەبی باقیە دابەشی دووبەش کراوە ئەویش :–
یەکەم :– قەحتانیەکان و . دووەم :– عەدنانیەکان .

قەحتانیەکان لە بنەرەتدا دانیشتووی باشووری دوورگەی عەرەب بوونە کە ئەویش ئەمیرو سەرەك هۆزو تیرەو بنەماڵەکانی یەمەن بوون ، کە ئێستا کۆماری یەمەنی پیّ دەگووترێت ... هۆزەکانیش هۆزی ، سەباو حەمیر، کە لەوانە چەندین کۆمەڵی دیکە جیابوونەتەوەو بە دوورگەی عەرەبی بڵاوبوونەتەوە ... ئەویش:-

بە پێکهێنانی ناوچەیەکی دەسەڵاتدار وەك - مەنازرە - کە لە ناوچەی حیرە هاتبوون و ، هەروا ئەمیرەکانی غەساسنە و کەندە و ئەزەد و ئەلائەوس و خەزرجیان لیّ جیابووبووەوە .

بەڵام عەدنانیەکان پێیان دەگووتریّ عەرەبی بە عەرەبکراو کە بنەماڵەی ئیسماعیل ، یەك لەوانە بووە و لەناو عەرەب ژیاون لەدوای بوونیان بە عەرەب بە هۆی پێدانی ژن و دروست بوونی خزمایەتی ، یەکێك لە کورەکانی ئیسماعیل کە ناوی عەدنان بوو کە عەدنانیەکان لەدوای ئەو دەرکەوتوون .

دوای ئەویش معد و دوای ئەویش نزاری کوری نعد .

ئا ئەلێرەدا دەردەکەویّ کە عەرەب بوونیان نەبووە لە ئێستای ئێرا ق و شام و ئەفەریکیا و مسر و چەندین ووڵاتی دیکە ... ئێستا کە بە نیشتیمانی عەرەب دادەنرێت تەنیا لەدوای فتووحاتی ئیسلامی عەرەب توانی بەهۆی ئاییمی ئیسلام سنووری جووگرافی فراوان بکات لەرێگەی داگیرکردن و بەعەربکردن وبە ئیسلام کردن .

شایانی باسە هەروەك گەرۆك و مێژوونووس و جووگرافیناسەکان لەلاپەرەکان دیاریان کردووە ، کە هەرێمی شام ناوی تەواوی خۆی سام بووە واتە بەناوی یەکێك لە کورەکانی نوح کراوە بە هۆی بوونی دەسەڵات لەو هەرێمەو بە هیچ جۆرێك عەرەب لەو ناوچەو هەرێم و ووڵاتانە نەبووینە.

جا دەووڵەتی فاتمی کەلە مێژووودا بەدەسەڵاتی کوردی ناسراوە و فراوان بوو لە رۆژئاوا لەسەر ئەدارسەکان و رۆستەمیەکان و لەدوای ئەوە شاری - مەهدیان - کردۆتە پایتەختی ووڵاتەکەیان .

لە هەمان کات دەووڵەتی فاتمی بەرەو رۆژهەلات هەنگاویان ناوەو هەوڵی ئەوەیان داوە ، کە ووڵاتی میسری ئێستا بخرێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و

دوایــی بــەرەو وولاتــی نێــوان دووزێ واتــە – میزۆبۆتامیــا – ... ئــەویش وەرگــرتنی میراتــی خەلافــەتی عەباســی ... لــە دوای مردنــی کــافور - ئەخمەشیدی – لە میسر دەرگایان بۆ کراوە بۆ چوونە ناومیسر ... دوای ئەوە سەرکردەی سووپا جەوهەر سقلی بگاتە ناو فستات و لە ١٦٨/١١/٢٥ دەستی کرد بە دروستکردنی شاری قاهیرەی پایتەختی میسر .
دوای چــوار ســاڵ دەوولــەتی عەبیدیــەکان قاهیرەیــان کــردە پایتــەختی دەسەلاتەکەیان و ناویاننا دەوولەتی فاتمیەکان .
دوای ئەوە دەسەلاتی فاتمیەکان لە ساڵی ٩٦٩ توانیان هەرێمی شام بخەنە ژێر دەسەلاتی خۆیان و دەوولەتی فاتمی بەردەوام بوو لە دەسەلاتەکەی لە هــەموو بوارەکــان ، تــاکوو ساڵی ١١٧١ و ئــەو دەوولەتــە کۆتــایی پــێ هێنــر لەکێشووەرەکەدا.

سەرچاوە:– ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان – ئامادەکردنی سەیفەدین کاتب – دار الشرق – المؤسسه العلمیه لوسائل التعلیمیه – بیروت – سووریا /٢٠٠٥.

## ٠٩٠٩

٠٩٠٩/٩/٢٠ ناوچەی شارەزوور لە باشووری کوردستان کە یەکێك بووە لە ناوچە هەرە بەناوبانگــەکان ، لــە ســەردەمی ئیــسلامی لــە کوردســتان . جێگــەی ئامــاژە پێکردنــە ، کــە مەبەســت لەو دەســەلاتداریەتە کــە هەنــدی شارو ئاوەدانی لە کوردستان لــەو کاتــە دەرکــەوتوون ، بــە دەســەلاتداریەتی شارو ناوچــەکانی ناســراوبوون و نــاوی مــیروو دەســەلاتداریان ئاشــکرا نیــەو لــەو ماوەیــەدا ســەربەخۆ بــوون و دەســەلاتداریەتیانەی کــە دیــارو رۆشــن نەبوونــە ... لــەم مێــژووەش تــاکوو ســاڵی ٩٢٩ ناوچــەی شــارەزوور ســەربەخۆ بــووە... بەڵگەش:–
١– لەو ناوچەیەدا والی دەسەلاتی عەباسیەکانی تیا نەبووە.
٢– لە ماوەی ئەم بیست ساڵەشدا هیچ باج و سەرانەیەکیان بۆ دەوولەتی خەلافەتی عەباسی نەناردووەونەداوە .
بــەلام دوای ئــەوە ناوچەی شارەزوور لە ژێــر دەســەلاتی خەلافــەتی عەباسی دەمێنێتەوە... بەلام جارێکی دیکە سەربەخۆ بۆتەوەو تاکوو ساڵی ٩٥٤ ، کە بووهیــەکانیش پێیــان داگیرنــەکراوە لــەدوای شــەڕێکی دژووار و زۆر ، ناچار

دەبن پاشەکشەیان کردووە ، ئەویش بە هۆی توونـدو تۆڵی دانیشتووانی شـارەکە ، کـە زۆر دلێرانـە بـەرگریان لەناوچـەکە کـردووەو بـەردەوام بـوون لەبەرگری کردن هـەر وەك لەسـەرەتای فتووحـاتی ئیسلامی لـەژێر دەسـەڵاتی خەلیفـەی ئیسلام عومـەر کـوری خـەتاب بـەری شـالاۆە درندانـەکـەی گرتـووە لەهەموو بوراەکان .

بـــەڵام شمـــشێری دووژمنکـــاری و داگیرکـــردن و کووشـــتن و تۆقانـــدن و ئـەنفالکردن ، وایکـرد ناوچـەی شـارەزوور مـل کـەچ بێـت و روو لـەئاییني ئیسلام بکات بە ترشی نەك بە شیرینی .

ئەمەش بەبەڵگەی چەندین نووسراو ، لەلایەن وولاتناسی ئیسلامی ئەوکات ، کە سەردانی ناوچەی شارەزووریان کردووە و یاداشتیان نووسیووە ، کە دانیشتووانی ناوچەکە یاخی بوون لە مل کەچ کردن بۆ دووژمنکانیان و هیچ میروو بەرپرسێکی خەلیفەی تیا جێگە نەبۆتەوە .

لە بەر ئەوەی شاری – نەریز – کە لە هەرێمی ئازربایجان لـە نزیك شـاری – ئەدەبیل – ە لـە لایـەن هـۆزە کـوردە هەزبانیـەکان فـەرمانرەوایی لـێ کـراوە و سەربەخۆیی راگرتووە و ناوچەکەیانیان ئاوەدان کردۆتەوەو پـەرەیان پێداوە لەهەموو بوارەکان .

هەروا چەندین ناوچە دەسەڵاتداریەتی سەربەخۆیان پێك هێناوە . لەوانەش کـە بەناوبانگترین کەسـایەتی کـورد – دەیسەمی ئیبراهیم کـوردی – کـە لـە هەرێمی ئازربایجان و هەندێ ناوچەی دیکە لەتاران و ئەرمینیا توانیوویەتی دەسەڵاتێکی بەهێز دروست بکات ... کە پێشوو جێگری والی ئازربایجان بـوو، تـوانی دوای کـووژرانی والیەکـە ، خـۆی بکـات بـە ئـەمیری هەرێمەکـەو بیری فراوانخوازی بگرێتە بەرو هەر لە ساڵی ۹۲٦ سەربەخۆیانە هەرێمەکەی بەرێوەدەبرد لە کێشووەرەکەدا .

## ۰۹۱۲

۰۹۱۲/۸/۱۸ کۆنترین دەسەڵات لە شێووەی میرایەتی . میرنشینی عەیشانە بوون ، کە لـە نێوو تیرەیەکی کوردی سەر بە هۆزی گەوورەی بەرزیکانی بووە ... هـەر وەك نووسـەرو مێژوونوسـی نـاوداری کـورد – ئـیبن ئەسـیر – لـە دانراوەکـەی –

الكامل في التأريخ – ئاماژەی پێکردووە ، لە ڕووداوی ئەم مێژووەی سەرەوە ، کە ئاماژە بە عەیشانیەکان دەکات و ناوی دوو میر دێنێ بەناوی – نداد و غانم – کە کوری – ئەحمەد بوونە و سووپایەکی بەهێزی ئەو کات شارو ناوچەکانی – دینەوەرو هەمەدان و نەهاوەند و چەندین ناوچەی دیکە دەسەڵاتداریەتیان تێدا گێراوە بۆ ماوەی ٥٠ ساڵ .

بەم جۆرە میرنشینە کوردەکان لەهەرێمە جیاجیاکان دەست پێدەکات و بەرەو میرنشینی دیکە هەنگاو دەنێ بەپێی پەرینەوەی قۆناخەکان ... وەکوو میرنشینی– ڕوادی – لەساڵی ١٠٤٨ و میرنشینی محەمەدی کوری شەداد لە ساڵی ٩٥١ و میرنشینی – حەسنەوی لە ساڵی ١٠٥٦ ... کە دەبنە میراتگری میرنشینی عەیشانیەکان و میرەکان خالۆزاو پورزای یەکتر دەبن ... ئا لەم سەردەمەدا کوردستان بە قۆناخێکی گەورەی شارستانیەتدا لەهەموو بورەکانی ژیاندا تێپەربووە لەو کاتی بارودۆخی کوردستان .

## ٠٩٣١

٠٩٣١/١/٢٤ دامەزراندنی حکوومەتی دۆستەکی لە دوای هەڵوەشاندنەوەی ئەحمەدی کوری مەروان لە لایەن دۆستەك – دۆشتیك – کە لە خانەوادەی حەمیدی – حمودی – بووە ... ئەویش کورێکی هەبووە بەناوی –باز – ئەبوو شووجاع – و ناوی منداڵیشی حوسێن بووەو نازناوی ئەبوو عەبدوللاشی هەبووە . ئەم کەسایەتیە لە ٩٤٥/٨/١٣ لەشاری دیار بەکر لەدایك بووە لە هەرێمەکەدا

.

بەهۆی ئازایەتی و چاونەترسی بێ وێنە بووە ، لەو کات خەڵکێکی زۆر دەووری داوەو . ئەویش خواستی پاشایەتی ئامانجی بووە ..لە ساڵی ٩٥٥ لە دوای داگیرکردنی ناوچەی جەزیرو سعرد لە کوردستان ، حکوومەتی خۆی دامەزراندووە ... کە باوکی لە ساڵی ٩٥٨ کۆچی دوایی دەکات ، جلەوی دسەڵات دەکەوێتە دەست بازی کوری و ئەویش ئاواتی فراوانکردنی دەسەڵاتەکەی بووە لە مەلازکردوو ماکۆی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆی ... لە هەمان کات شارێکی بەناوی – شاباز – دروست کردووە ، لە دواییدا لەلایەنی شانشین عادل ئەیوبیە .

دوای ماوەیـەك ناوەکـەی گـۆڕاوە بۆتـە – شـاری عـادل جـەواز – ئـەویش لـە نێـوان سـاڵەکانی ٩٦٣ تـا ٩٦٤ بـووە ... هـەروا شـارەکانی ئـەرجیش و دیاربـەکرو میافارقین وئۆرفەو ئەخلات و وان و بەدلیس و چەندین جێگـەی دیکەشی خستۆتە ژێر دەسەڵاتەکەی خۆی .

دوای ئەوە میرەکانی حەسەن کێف و جەزیرەو دیاربەکرو بۆتان وسروج و نەسیبین ... هـەموویان چوونە ژێـر فـەرمانی و شـاری دیاربـەکریان کردۆتـە پایتـەختی ئـەو دەسـەڵاتە .... لـەو کاتـەش ئـەلقادر بـلای عەباسـی نازنـاوی شاباز ئەبوو شووجاعی پیٚ بەخشی لە هەرێمەکەدا .

سەرچاوە:– شەرەفنامە – ل/٤٠ – ٤١ .

## ٠٩٣٥

٠٩٣٥/١١/٣٠ هەر لەو کێشەو ململانێیەی داگیرکردن و خۆ بەهێزکردنی کۆمـەڵێك لـە تـورك بەسەرکردایەتی – گکم – و لە گەلیان کوری – رائق – بەرەو ناوچەی واسـت هاتن و ، دوای ئەوەش لە ساڵی ٩٤٥ لەوکاتەی کە – معز الدولە – ی کـوری بۆیە گەیشتە خاکی ئێستای ئێراق ، دەوڵەتی – بویهیـە – ی لێدامەزرانـد ، کە هەندێك لە سووپاکەی لە تورکمان بوون .

بەڵام شاکر سابر لە لاپەرە/٥١ لە کتابەکەی بەناوی – موجز تـأریخ الترکمـان فی العراق – بە هەڵە چووە ، کە تورکمـان لەشارەکانی – کـەرکوك و هـەولێرو مووسڵ و تکریت – سەلاحەددین – هەبووبن .



لەبەر ئەوەی مووسڵ و کەرکوك و هەولێر ، ئەو کاتە لە ژێر دەسەڵاتی دەوولەتی – حەمدانی – بووەو باسی تورکمانی لێووە نەکراوە... بەڵام – ئیبن ئەسیر – باسی ئەوەی کردووە ، کە – معز ئەلدولە – هەندێ ناوچەی لە شارەکانی بەسرە و کووت لە دەست دابووە لە ناوچەکەدا .

تورکمانەکان .... ئەمەش لەکتابی – الکامل فی التاریخ .

هەروا شاکر سابر لەجێگایەکی دیکەش تووشی هەڵە بووە کە دەڵێ :– شەپۆلی تورکەکان لەئازربایجانەوە بەرەو ئێراق هاتن و گەمارۆی موسلیان داو ، هەروا دەستیان بەسەر – جەزیرەی عومەر – داگرت و لە موسل و تەلەعفەر جێگیربوون .

بەڵام ئەو پێناسەیەی شاکر سابر بەناوی ئیبن ئەسیری نووسیووە ... راستی تیا نیە ، لە بەر ئەوەی ئیبن ئەسیر باسی رووداوەکەی ١٠٣٠ یکردوە ، کە تورکمان – ئوگز – بەرەو جەزیرەی عومەر هاتوون – جەزیرەی بۆتان – و بەرەو تەلەعفەرو سنجارو دیاربەکر و ، هەروا دەستیان بەسەر موسل داگرت لە هەرێمەکەدا .

بەڵام ئەمیر قرواشی کوری مەقالید عقیلی بەرەو چیای – مەلحول – باچیای – ساتیدما – یا ، شاری – سن – کە بەرامبەر چیایەکەیەو دەکەوێتە رۆژهەڵاتی زێی دیجلە ... لەوێ هێزەکانی کۆکردەوەو حیلەش بەسەرکردایەتی – دبیس کوری مزیدی ئەسەدی و هێزەکانی بەسەرکردایەتی ئەبی فەتیح جاوانی بوو ، کە ئەمیرێکی کورد بوو لە کوردە جاوانیەکان ، لە حیلەو بەهانای هێزە کوردیەکان هات و – قرواش تورکمانی – کووشت و زیاتر لە ٢٠٠٠ هەزار چەکداریشی لێ کووشتن ، بەر لە گەیشتنی ئەو دوو ئەمیرەی کە لە سەرەوە باسکراوە .

ئەویش لە ناوچەی تەلەعفەر ، کە بووە هۆی هەڵاتنی – گز – لە موسل – لە دوای تاڵان کردنی بەرەو ناوچەی نەسیبین هەڵاتن ، کەلەنزیك شاری قامشلۆیە و کەس لە تورکمان لە موسل و تەلەعفەر نیشتەجێ نەبوون . بەڵام لەناوچەی جەزیرەی عومەر لەلایەن ئەمیری ئەلدولە بووە بەرەو ئازربایجان هەڵاتن و بووە هۆی دەرکردنیان لە باشووری کوردستان و باکووری کوردستان .

تێبینی:- بوونی نەتەوەی تورك لە ئێستای ئێراق ، لە ناوەرۆکی مێژوو نامەکە بەر لەو مێژووە باسکراوە و دوای ئەوەش کە تورك بوونیان چۆن بووە لە ئێراق .

## ٠٩٥١

٠٩٥١/٢/٨ دامەزرێنەری حکوومەتی محەمەدی کوڕی شەداد لە لایەن - محەمەد شەداد - ئەم سەرکردە کوردە هەلسا بە ئاوەدان کردنەوەی ناوچەی - کارتوو ئارات - لە هەموو بووارە جیاجیاکان ، کە ئەو حکوومەتە زیاتر لە ١٥٠ساڵ لە دەسەڵات بەردەوام بوو . لە ناوچەکانی - قریاخ و کوردستان و نەخچەوان - لەو پارچە خاکەی کوردستان کە ئێستا کەووتۆتە ژێر دەسەڵاتی کۆماری ئەرمینیای یەکیەتی سۆڤیەتی جاران . بە تایبەتی پارێزگای یەریڤان و دەووروو بەری لە هرێمەکەدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە شەدادیەکان خاوەنی ئیمارەتی کوردی بوونە ، کە لە ساڵی ٩٥١ تا ساڵی ١١٩٩ ، دەسەڵاتدار بوون ... کە چەند پارچەیەك لە ئەرمینیای لە ژێر دەسەڵات دا بووە ، وەك ناوچەی - حەران - کە ئێستا ناسراوە بە ئازربایجان ...ئەم نازناوەش دەگەڕێتەوە بۆ دامەزرێنەری ئیمارەتی محەمەدی کوری شەداد .



کـه ئـەو ئیمارەتـەش لـه شـاری – دفـین – دەسـتی پێکـرد ... کـه بـەرەو فرەووانی هەنگاوینا تاکوو شارەکانی – باردا و کانجا – که ئەم شارانه له هـەرێمی ئازربایجان بـوون . دەسـەلأتی شـەدادیەکان هاووپەیمانیـەتیان لـه گــەڵ سـەلجووقیەکان بەسـت و چـەندین شـەڕیان دژی ئیمپراتۆریـەتی بێزەنتیەکان کرد ، ئەویش له ساڵی ١٠٤٧ ، تاکوو ساڵی ١٠٥٧ ، که ئەو کاتـەش ئیمـارەتی شـەداد لـەو پـەری بەهێزیـدا بـوو . کـه دەسـەلأتی درێژدەبووەوە له نێووان زێی کوراو زێی ئاراسدا .
دوای ئەوە هێزەکانی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی – قستەنتینی شەشەم – له ساڵی ١٠٠٠ تاکوو ساڵی ١٠٥٥ شەری دژی شانشینی ئەرمینیا – کاگیلی دووەم – بەرپاکرد ... بەر لـەوەش قستەنتین چەندین نامـەی بـۆ – عـەلی لەشکری – نـەوەی محەمـەدی شـەداد ، که ئـەمیری ئیمارەتی شـەداد بوو و رەوانـــەکرد و داوای لێکـــرد کـــه بـــچێته رێــــزی هێزەکـــانی ســـووپا وئیمپراتۆریەتی بێزەنتی دژی شانشینی ئەرمینا .
دوای ئەوە عەلی لەشکری رەزامەندی له سەر داوای ئیمپراتۆریـەتی بێزەنتـی کرد ، به مەرجێك ، ئەو زەویانەی که رزگاری دەکات بیخاتـه ژێر دەسـەلأتی خۆیدا .
له گەڵ ئەوەشدا ئەو کارە شەڕگەربازەش به توواناى شـەدادیەکان بـوو ، بـەلأم لـه کۆتـایی بـه هـۆی برواکـردن بـه ئیمپراتۆریـەتی بێزەنتـی و سـەلجووقیەکان ، کـه لـه ئـەنجام دەسـەلأتی شـەدادیەکان لـه لایـەن سەلجووقیەکان کۆتایی پێ هێنرا به سەرکەووتنی سەلجووقیەکان له هـەرێم و ناوچەکەدا.

### ٠٩٦٠

٠٩٦٠/٣/٣ دامەزرانـدنی یەکـەم ئیمـارەتی تـورکی ئیـسلامی بـه نـاوی دەوولـەتی – قراخانیەکان – که لەو سەردەمەیەدا تورکەکان بوونه هەڵگری بروای ئاییـنی ئیـسلام ، کـه نیـشتەجێی سەرچـاوەی –زێـی سـیمۆن – بـوون . کـه ئەمیرەکـەیان سـەردەمەکەی کـرد بەسـەردەمی ئیـسلام و رزگـارکردنی شـارە ئیـسلامیەکان . کە لـەوکات باجیـان دەدا ئـەو کەسـانەی کـه هـەڵگری بـروای

ئاینی ئیسلام نەبوون .

جێگەی ئاماژە پێکردنە ، کە ئاینی ئیسلام لە نێوو نژادی تورك بڵاوبووەوە بە شێووەیەکی بەرفراوان ، لەو کاتەی کە دەووڵەتی – سامانیە – ڕۆڵی باڵای هەبوو لەناوەندەکانی ئاسیا لە سەدەکانی ٣ – ٤ کۆچیدا . لەوکاتەدا جووگرافیە ئیسلامەکان لە دوای کەسانی تورك دەگەران و باسیان لێووە دەکرد ، بەناوی ئەوەی کە تورك دژی ئاییینی ئیسلامە .

بەڵام ئەو بیروبۆچوونە بە پێچەوانە بوون ... لە بەر ئەوەی سەرهەڵدان و بوونی نەتەوەو دەسەڵاتی تورك ، بەهۆی ئاییینی ئیسلام بوو ، کە وەك چەکێك بوو لەپێناو بەهێزکردن و باڵادەستکردنی تورك و پێکهێنانی نەتەوەی تورك .

لە بەر ئەوەی بوونی تورك بەهۆی کۆکردنەوەی نەتەوە دەربەدەرەکانی دیکەی ئاسیای ناوەندو بچووك بوو ، لە بیابانی مەنگۆلیای نێوان ڕووسیای قەیسەری وووڵاتی چین ، ئەویش بە پەرەسەندنیان بەرەو ئاسیای بچووك ، کە تورکیای ئێستایە بەتایبەتی کوردستان .

سەرچاوە :– بارتولد – ل/٧٧ .

 ٠٩٦٧

٠٩٦٧/١٢/٧ هەر لە سەردەمی ئەمەویەکان دراوی دەسەڵاتی ئەمەوی چاپکرا بەناوی – دینار– لەلایەن ئەلحوکم المنتە سری کوری عەبدولرەحمان لەشاری زەهرای ئەندەلووس ... کە قەبارەکەی – ٢,١سم– بوو ... بەردەوام بوونی خەلیفەکانی ئەمەوی بە چاپکردنی دراو لە لایەن ئەمیرەکان ، کە دەسەڵاتیان دەگرتە دەست و لەو ووڵاتانەی دەسەڵاتیان بەدەست بوو لە پێناو بووژاندنەوەی باری ئابووری و بازرگانی و کەمکردنەوەی کێشەی کرین و فرۆشتن .

 ٠٩٦٩

٠٩٦٩/١١/١٤ بە بڕیاری سەرکردەی دەووڵەتی فاتمی –جەوهەر سقلی – المعزالدین الله الفاگی– دەستکرا بە دروستکردنی مزگەووتی – ئەزهەر – لە شاری قاهیرەی پایتەختی ئێستای میسر ، کە ئێستا بۆتە مەڵبەندێکی ئاییینی و



زانستی و ئاداب و مێژوو و چەندین بواری دیکە بەناوی زانکۆی – ئەزهەر . جێگەی ئاماژەیە ئەم بنەماڵەیە لە رەچەڵەك و لە نژاد عەرەب نەبوونە ودەوڵەتی فاتمی ناسراوبووە بە دەسەڵاتداریەتی کورد لە لایەن کورد ... واتە عەرەب خاوەنی نە شووێنەوارو نە شارستانیەت نەبوونە – قورئانی پیرۆز – بە زمانی عەرەبی نەبوابە ، عەرەب نەدەبووە ئیسلام وگەر ئیسلامیش نەبووایە عەرەب نەیدەتوانی لە دوورگەی عەرەبی دەرچن ، تەنیا بازرگان و ئاژەڵ لەوەرێنەکانی نەبن ، ئەویش بەهۆی نالەباری باری کەش و هەواو نەبوونی لەوەرگە لەدوورگەی عەرەبی لە هەموو بوارەکاندا .

سەرچاوە:– ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان – ئامادەکردنی سەیفەدین کاتب – دارالشرق العربی – بیروت – سووریا /٢٠٠٥ .

## ٠٩٧٠



٠٩٧٠/١١/٢ سەرۆکی حکوومەتی دۆستەك – شابان – ئەبوو شووجاع لەدوای بەهێزبوونی دەسەڵاتەکەی بەهۆی پشتگیری لێکردنی لەلایەن میرەکانی کورد ، توانی دراو بەناوی خۆیەوە لێداو لە ووتارە

هەینیەکان ناوی لە تەك ناوی خەلیفەی عەباسی دا دەخووێندرایەوە ....
کاتێ ئەبوو تەغلەی حەمەدانی و عەزد دەولەی دەیەمی بوون و بووە هۆی
هەڵگیرسانی شەڕی نێوانیان .

باز یاریدەدەری عەزد دەولەی داو لە پاش کۆچی دوایی عزد دەولە لەساڵی
٩٨٢ ، باز بەنیازی داگیرکردنی موسل بوو و بەلەشکرێکی زۆر لە شەنگال
دەرکەووت ... سەماح دەولەی کوری عەزد دەولە بەسەرکردایەتی ئەبوو
سەعید بارامی کوری ئەردەشێر ، لەشکری ناردە پێش و هەردوو لەشکر
لەناوچەی – باجلایا – بەگژ یەکدا هاتن و لەپاش شەڕێکی خوێناوی
لەشکری سەماح شکاو بەرەو دوواوەی کشانەوە .

دوای ئەوە دووبارە هێزی چەکداری بەسەرکردایەتی ئەبوو ئەلقاسم سەعید
ناردە سەربازو ئەمجارەش لەرۆخی چەمی خاپوور تووشی یەك هاتن و
دووبارە باز سەرکەووتنی بەدەست هێنا ... دوای ئەوە مووسڵی گەمارۆدا
لەسەر داوای دانیشتووانی شاری موسل و ماوەی سێ مانگی بۆ دانان ، کە
دەستیان بۆ درێژ نەکەن ... ئەوانیش لەم ماوەیەدا شارەکە چۆڵ بکەن .

هەر لەو کاتە ئەبوو عەلی کردە حوکمداری شاری موسل و خۆشی گەراوە
شاری دیاربەکرلە هەرێمەکەدا .

بەم شێوەوە مووسڵیش کەوتە ژێر دەسەلاتی شاباز ئەبوو شووجاع ...
دوای ئەوە بەهێزێکی چەکداری زۆر بەرەو شاری بەغدا کەوتە رێ ، کە
سەماح سەرسام ببوو لەو کارەداو هێزێکی زۆری بەسەرکردایەتی زیادی
کوری کاکۆیەی ناردە سەر رێی بازو لەسەر رێی شاری تکریت –
سەلاحەدین – تووشی باز هاتن ولە ئەنجامی شەڕێکی گەوورە هێزەکانی باز
شکاو گەراوە بۆ دیاربەکر ، دوای ئەو بازو سەماح رێکەووتن بە کۆتایی
هێنانی کێشەکانی نێوانیان لەناوچەو هەرێمەکاندا.

سەرچاوە :–ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان – دارالشرق العربي –
ئامادەکردنی د. سەیفەدین کاتب – بیروت – سوریا /٢٠٠٥ .

٩٩٠.

٣ /٣/ ٩٩٠. شارۆچکەی مەندەلی سەر بە پارێزگای دیالە لە باکووری شاری بەغدای
پایتەختی ئێراقە ... شارۆچکەی مەندەلی و دەووروبەری لە باشووری

کوردسـتان و شـار و ناوچـەیەکی کـوردی و کوردسـتانیە ... هـەزاران سـاڵە خۆراگرانـە دانیـشتووانی شـارو ناوچـەکە بـەرگری لـە کـورد و کوردایـەتی خۆیـان دەکـەن ، کـە هـەردەم کـەوتبووە ژێـر سمـی ئەسـپی داگیرکـەران و بـەردەوام خـووێنی رۆڵـەکانی بەخـشیووە بـە خاکەکـەی لـە هـەموو بـوارە جیاجیاکان لە ناوچەکەدا.

جێگـەی باسـکردن و رونکردنەوەیـە کـە شـاری مەنـدەلی یەکێکـە لـە شـارە کۆنەکانی کوردستان ، دەکەوێتە ئەو پەری سنووری باشووری کوردستان ، یەکێکە لە یەکەم قەزا ئیداریەکان بوو ، لە گەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی ئێراق لەسـەر رووبـەری ٨٤,٠٠٠ هـەزار کیلۆمـەتر چوارگۆشـەی خـاکی هـەرێمی باشووری کوردستان و شاری مەندەلیش لەناو ئەو سنوورەدایە.

شـاری مەنـدەلی ناحیـەکی سـەر بـە قـەزای بەلـەدرووز و ئـەویش سـەر بەپارێزگای دیالەیە ... مەڵبەندی شاری مەندەلی ٨٠ کم لەشاری بەعقوبە دوورە ... لە بارەی مەندەلی و جێگەو شوێنی – ئیبن خوردازیە – دەڵێ:– بەنـدەنجین و بیرازولـروز لەیـەك – کـورە – دا بوونـە ... هـەروا – یـاقووتی حەمویش دەڵێ:–

بەندەنجین شارێکی بەناوبانگە ، کە لەلای نەهرەوانە و دەکەوێتە ناحیـەی – جەبـەلی – شـارەکە دەکەوێتـە سـەر سـنووری نێـوان ئێـراق و ئێـران لـەلای رۆژئاوای – شاخی پشت کـەوە – و لـەلای باکووریـەوە زنجیرە گردۆلکـەی – قەشقە – یە ، لەلای رۆژئاوای زنجیرە چیای حەمرینە و لـەلای باشووریەوە قەزای بەدرە و ناحیەی عەزیزیەیە .

هەروا لەبارەی دێرینی و کۆنی شاری مەندەلی جوامێر مەندەلاوی دەڵێ :– مێژووی شاری مەندەلی بەپێی ئەو بیروبۆچوونەی کە بەعسیەکی بـەریتانی لـە سـاڵی ١٩٦٦ سـەردانیان کـردووە ، دەردەکـەوێت کـە مێـژووی شـارەکە دەگەرێتەوە بۆ ٦٠٠٠ شەش هەزار ساڵ بەر لـە زایین ، خـوودی شـارەکەش بووە لە شارەکانی لۆلۆبییەکان ، کە باپیرانی لۆرەکانن و ئەوانیش بەشێك بوونـە لـە نـژادی کـورد ... هـەروا یـەکێك بـووە لـەو شـارانەی کەووتۆتـە نێـوو قەلەمرەوی دەوڵەتی میدیا لە ناوچەکەدا .

لەگـەڵ سـەرهەڵدانی ئـاییـنی ئیـسلام و رەوانـەکردنی سـووپای ئیـسلام بـۆ

ئێراقی ئێستا – هاشم عوتبە – بەئاشتی شارەکەی داگیرکردووە , بەناوی فتووحاتی ئیسلامی – هەروا لەسەردەمی ئیمامی عەلی – بوو بە گۆرەپانی شەڕی نێوان سووپای ئیمامی عەلی و خەوارجیەکان .
هەروا شاری مەندەلی ماوەیەك سەر بە ئیمارەتی عەنازی کوردی بووە لە ساڵەکانی ۹۹۰ و ، ناوچەیەکی دیکەی فراوانیان لە کوردستان لەژێر دەسەلاتدا بووە کە – کرمانشا ، هەلوان ، شارەزوور ، داقووق ، دەسکەرە ، , مەندەلیج , نوعمانیە – ی لەخۆگرتووە , جگە لەوەش ئەم ناوچەیە لەنێوو ئیمارەتی – حەسنەویهی – کوردی و دوایش لەنێوو ئیمارەتی بابان دابووە .

لەگەڵ ئەو هەموو گۆرانکاریانەشدا , لەشەری نێوان دەووڵەتی سەفەوی فارسی و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەر ماوەی بەدەست لایەنێکیانەوە بووە , تا دوای رووخاندنی دەووڵەتی عوسمانی ، لەگەڵ تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهان .
هاووڵاتیانی شاری مەندەلی لە پیاوە ماقولانی ئەوکات لە کورد و تورکمانی شارەکە ئەنجوومەنێکی دەسەلاتداریەتیان دامەزراند بۆ بەرێوەبردنی کاروباری هەمەلایەنەی شارەکەیان.
گەر بگەرێینەوە بۆ رووداو و بەسەرهاتەکانی مێژوو , بەپێنووسەکانی ئیبن خەلدون و حەمەوی و ئیبن ئەسیر و خەلەکان , وایان دیارکردووە کە شاری مەندەلی هەر چوار دەووری شارو ناوچەی کوردی بووە ... لەلای باشووریەوە هەردوو شاری بەدرە , جەسان ، بووە , لەلای باکووریشیەوە شاری خانەقین و گوندەکانی – مکاتوو – کانی ماسی – یە , لەلای رۆژهەلاتی کوردستانی دیووی ژێر دەسەلاتی فارس بووە ، کە هەردوو شاری – سۆمارا و گەیلان – بووە , کە تەنها چەند کیلۆمەترێك لەشاری مەندەلیەوە دوورن ... هەروا بەرزاییەکانی چیای – جکاسوو , حەمرین – لەیەکیان جیادەکاتەوە .
شارو دێی کورد وەکوو ملوانکەیەك وان بەگەردەنی شارەکەوە وەکوو ناحیەی قەزانیە و گوندەکانی – دوورو دیشنج و کیری و کچکۆتیل و جاریە – کە گوندەکەی شەهید جوامێر سایەمیرەیە .. ئەم شارەش چەندین

گەرەك و شووێنەواری مێژووی گرنگی تیا بووە و تیایە .
بەلام رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی ئێراقی دروستکراو لەسەر خاکی گەلانی
ولاتــی نێــوان دووزێــی – میزۆپۆتامیــا – درێخیــان نــەکردووە لــە گــۆرینی
دیمۆگرافیــای جــووگرافی و نەتــەوەیی لەشــارەکەدا ، هــەر وەك شــار
شارۆچــکە و گونــدەکانی دیکــەی هــەرێمی باشــووری کوردســتان ، ئــەویش
لەراگوواســتن و بەعــەرەبکردن و دەربەدەرکــدنی دانیــشتووانە کوردەکــان
هێنانی عەرەبی هاوردە ، نەك هەر لە باشووری ئێستای ئێراق .
بــەلکوو لــە ولاتــانی دیکــەی عــەرەبی ، بەتایبــەتی لــە بیابــانی دوورگــەی
عەرەبی بۆ ناوچەکەیان هێناوە , بە تایبەتی لە سەرەتای شەرە یەك لەدوای
یەکــەکانی فتووحــاتی ئیــسلامی ، لــە پێنــاو داگیرکردنــی خــاکی گــەلان و بە
ئیــسلام کردنــی گــەلان و داگیرکردنــی نیــشتیمانەکەیان ، بــەزەبری شــیر
داگیرکەرانە ، نەك رزگارکردن و بەرپاکردنی باری ئارامی و ئاشتی لە هەمو
بوارە جیاجیاکان لە هەرێم و ناوچەو جیهان .
تێبینی :– من نامەوێ بەتەواوی باس لە مێژووی پێکهاتەی ناوچەو نەتەو
و رووداوە جیاجیاکان بکەم , تەنیا ئەمــەم بۆ وەك زانیاریــەکی ســەرەتایی
بوونی بەسەرچاوەیەکی دیار لە نووسینەکاندا .

## ١٠١٥

١٠١٥/٦/٢١ دەوولـەتی – عەنازیــە – ی کوردی ، کە پایتەختەکــەی – شــاری حەلوان
بووەو بەردەوام بووە تاکوو ساڵی ١١٠٧ ، کە سنوورەکەی درێژ دەبووەو
تاکوو – ئەسەد ئاباد – ی سەر بە شاری هەمــەدانی رۆژهــەلاتی کوردستا
... .هەر وەکوو پێشوو کە لەژێر دەوولـەتی – حەسنویهە –ی کوردی بووە
کە پایتەختەکەی شاری – دینوور – بووە وسنوورەکەی درێژ دەبیــووەوە ا
ئازربایجان تاکوو بەشێك لە خۆزستان و زێی بچووك و تاکوو نەهاوەند ، ک
لە ٩٥١/٦/٩ دامەزراوە لە کێشووەرەکەدا .
کەواتــە ئــەو ناوچانە هــەمووی لــە ژێــر دەســەلاتی ئیماراتــە کوردیــەکان بوو
دوای ئەوەش کەوتۆتە ژێر دەستی ئیماراتی بابان .
گــەر بگەرێینــەوە بــۆ مێــژووی رابــردووی گونــدو شارۆچــکەو شــارەکان
هــەرێمی باشــووری کوردســتان ... کــە شــاری مەنــدەلی و دانیــشتووانەکە

بەستراببوونەوە بە دانیشتووانی شارستانیەتی زاگرۆس و لە هەمان نژاد بوون کە ئەویش – ئاریە – کە گوندو شارۆچکەیان لیْ دروست کردووەو کاری هەمە جۆری کشتووکاڵیان ئەنجامداوە بەر لەوەی کە مرۆڤی دیکە بگەنە ئەو هەرێم وباشوور و ناوەندی ئێستای ئێراقی بەزۆر دروستکراو .

هەر وەك شووێنەوارناسەکان بە پێنووسەکانیان ئەو راستیەیان لەلاپەرەکانی تۆمارگای مێژوو تۆمارکردووە ... کە شەپۆلەکانی مرۆڤ لەسەرەتادا لەناوچە شاخاویەکان ، لە زاگرۆس بەرەو ناوەندو باشووری ئێستای ئێراق , هەنگاویان ناوە ... واتە لە سەر خاکی کوردستان – لە رێگەی شارۆچکەی مەندەلی و دەوورووبەری ,

باشترین بەڵگەش ئەوەیە کە یەکەم دانیشتووان لە ئێراقی ئێستا کورد بوونە – گردی تەمرخان – لەناوچەی – فەرەئالووس – لەباکووری مەندەلی – کە لە شووێنەوارە گرنگەکانی – جرموو – بووە ، بەر لە هەزارەی حەوتەمی پێش زایین .

ئەمەش کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بەردینی و هەروا شووێنەواری – گردی چکامای – چۆخە مامی – لەهەمان ناوچەیە ، کە دۆزینەوەی شووێنەواری لیْ بەردەوام بووە لە شارستانیەتی زاگرۆس بە ٥٠٠٠ ساڵ بەر لەساڵی زایینی لە هەرێم و ناوچەکەدا .

ئەمەش بووە راستیەك ، کە لێکۆڵینەوەو تووێژینەوەی شووێنەواری لەساڵی١٩٧٧ دەستی پێکرا لە – گۆمی بەنداوی حەمرین – لە – گردی سنکور – کە دەکەوێتە باکووری چیای حەمرین ، ئەو راستیانەی دووپاتکردۆتەوە کە شووێنەواری ئەو خانووانەی لەیەك چوونی لەگەڵ شارستانیەتی زاگرۆس لەسەر خاکی کوردستان بەگشتی و هەرێمەکان بەتایبەتی لە سەر خاکی کوردستان .

سەرچاوە :– باقر یاسین – لە پێشەکی مێژووی شارستانیەتی کۆن ل/٤١٧ ...
هەروا گۆڤاری سۆمەر – بەشی یەکەم و دووەم ب/ ٤٠ – ١٩٨٤ .

**١٠٣٧**

١٠٣٧/١٠/١٤ سەرەتای دەست پێکردنی دەسەڵاتی سەلجوقیەکان ... جێگەی ئاماژە پێکردنە کە سەلجوقیەکان دەگەڕێنەوە سەر رەچەڵەکی یەکیْ لە بنەماڵە

تورکمانـەکان ... کـە ئـەو نـاوەش بـەناوی بنەماڵـەی سـەلجوقی کـراوە ...
لەسەرەتاوە ئەو دەسەڵاتە بچووکە ، یاخوود ئەو هێزە بچووکە هاوکاریان
لەگەڵ گەزنوییەکان دەستی پێکرد .

بەڵام سوڵتانی گەزنوی - مەسعوود قەدر- ترسی لە دڵ پەیدا بوو بەهۆی
تواناو بەهێزبوونی سەلجوقیەکان و هەوڵیدا سنوورێکیان بۆ دابنێ ... بەڵا
لــەدوای ئــەوە هێــزی ســەلجوقیەکان ســەرکەوتنیان بەدەســت هێنــاو
دەسەڵاتەکەیان بەرەو رۆژئاوا هەنگاوینا .




لـە مـاوەی سـەدەیەك دەسـەڵاتی سـەلجوقیەکان فراوان بـوو ، تـاکوو گەیشتـ
کـەنارەکانی دەریـای ناوەنـد . لـەو کاتەشـدا خـەلیفـەی عـەباسـی -ئـەلقائـ
بئــەمرللا -دیــتی بــارێکی لــەباری بــۆ گوونجــاوەو ، لەلایــەکی دیکــەش
ســەرهەڵدانی هێــزی ســەلجوقیەکان و رزگــاربوونی لەدەست توانـاو هێــز
بوهیە فارسەکان وسەرکەووتن بەسەریان .

ئەویش بەیارمەتی هێزی سەلجوقیەکان . کە بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ
نێوان فارس و هێزی سەلجوقی لە ئاکامدا - تگرل بگ- گەیشتە ناو شار

بەغدای پایتەختی ئێستای ئێراق و سەرکەووتنی بەسەر هێزەکانی بووهی فارسی و خۆ سەپاندنی وەك خەلیفەی عەباسی و هەتا لەسەر بووهیەکانی فارسی لە ناوچەکەدا .

سەرچاوە :- ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان – ئامادەکردنی دکتۆر سەیفەدین کاتب – دارالشرق العربی – بەیروت – سووریا /٢٠٠٥.

## ١٠٤٧

١٠٤٧/٦/٢٨ دامەزراندنی دەووڵەتی غوریەکان ، لە وولاتی عووری شاخاوی لە سەردەمی دەووڵەتی عەباسی ، لە نێوان دۆڵی – هلمند و هەرا – لە ئەفگانستانی ئێستا ، بەسەرکردایەتی عزەدین حوسینی کوری حەسەنی کوری محەمەد ، بە بەربەرەکانی کردنی دەووڵەتی گزنویەکان تاکوو گەیشتنە ئاستی لەناوبردنیان لە ساڵی ١١٨٦ و خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆی و دەسەڵاتەکەی دەووڵەتی غوریەکان فراوان بوو تاکوو گەیشتە هندستان .




دوای ئەوە ئیماراتی تورکی لێ دروست بوو ، کە یەکەم شانشینی قتبەدین ئەبیکی بوو لەهند .... دوای ئەوە لە ١٢١٥/٥/٢٥ دەسەڵاتی غوریەکان کەوتە ژێر سایەی دەسەڵاتی خەوارزمەکان و هەردووکیان لەهێرشەکانی مەگۆل لەساڵی ١٢٣١ کۆتاییان پێهات لەکێشووەرەکەدا .

سەرچاوە :- ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان – ئامادەکردنی – دکتۆر سەیفەدین کاتب – دار الشرق العربی – بەیروت – سووریا/٢٠٠٥ .

١٠٤٧/٦/٢٨ هێزێکی چەکداری تورکمان لە هێزەکانی سەلجوقی بۆ یەکەم جار گەیشتنە شاری مەندەلی ... بەڵام ئەو هێزە بۆ داگیرکردن بوو نەك مانەوەونیشتەجێ بوون .... لەگەڵ ئەوەشدا تورکەکان بەزمانی تورکی ئاخاوتنیان نەدەکرد ، بەڵکوو زمانی مەگۆلەکان و ئەزەری ئاخاوتنیان دەکرد .

لەبەر ئەوە نیشتەجێ بوونی تورکمان لەمەندەلی و قەزانیە لەدوای نیووەی یەکەمی سەدەی سیانزە بوو ... ئەویش بەهۆی شەپۆلەکانی مەگۆلی ، یاخوود قەرەقوینلویا ئالاق قوینلوو لە ناوچەکەدا .

بەڵام نیشتەجێ بوونی عەرەب لەشاری مەندەلی لەگەرەکی – نەقیب – کە دەکەوێتە بەشی رۆژئاوای مەندەلی... کە گەرەکێکی نوێ بوو بەجیاواز لەگەڵ گەرەکە کۆنەکانی شارەکە ... ئەمەش لە دوای داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوو ، دوایش لەلایەن رژێمی بەعسی لەدوای ساڵی ١٩٦٣ دا.

گەرنا عەرەب لەو ناوچە نیشتەجێ نەبوونە . لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتووانی قەزانیە لە کوردو تورکمان پێك هاتبوون ... ئەو ناوەشی لە ناوی لقو فزانلوو ، لە عەشیرەتی باجەلانی کوردیەوە هاتووە .

لەبەر ئەوەی لەسەردەمی مەگۆلەکان کوردەکانی للۆرو کەلهورو پێك هاتەی لەگەڵ باجەلانی فەزانیە ، کە زمانیان کوردی بووەو فەزانیەش مەڵبەندی سنجەقی ناوچەی مەندەلی بووە لەسەدەی سیانزەهەم تاکوو سەدەی حەڤدەهەم لە هەریم و ناوچەکەدا .

سەرچاوە:- عەباس عەزاوی – مێژووی ئێراق .ج /٦ ل/٢٧٣.

## ١٠٥٠

١٠٥٠/١/١ گەورەترین کەرت بوون لە کەنیسەی ئاینی مەسیحی ڕوویدا کە بەدوا کەرتی رۆژئاواو رۆژهەلات ناسرا بەناوی – الارندوکس – کە ئەویش کەنیسەی رۆژئاوا لەکەنیسەی رۆژهەڵاتی جیابوونەوە و بووە هۆکاری دژایەتی کردنی یەکتری ، لە بوواری ئاینی لە و سەردەمەدا لە جیهان .

## ١٠٥١

١٠٥١/١/١ داگیرکردنی پارێزگای ئەسفەهان لەلایەن سەرکردەی سەلجووقی – تگول بەگ – دوای ئەوە بەرەو شاری تەبریز هەنگاوینا تاکوو داگیرکردنی ناوچەکە دا .

## ١٠٥٥

١٠٥٥/١٢/ هێزە چەکدارەکانی تورك بە سەرکردایەتی – تگول بەگ – ی سەلجووقی گەیشتە ناو شاری بەغداو دەسەڵاتی ئالْ سەلجووقی تێیدا چەسپێندرا ، لە پێناو بەهێز کردنی جێگەی خۆی دوای ئەوەش کچە براکەی خۆی بۆ خەلیفەی عەباسی خوواست و بووە هاوسەری ، واتە بوونیان بە زاواو خەزووری یەکتر .

## ١٠٥٦

١٠٥٦/٣/ لە پێناو بە هێزکردنی هاوکاری و دۆستایەتی و برایەتی لە نێووان خەلیفەی عەباسی – بئەمرللا – و سەرکردەی دەووڵەتی سەلجووقی – تگول بەگ – کە خەلیفەی عەباسی خووشکی براگەووەرەی تگول بەگ ، جفری بەگی خوواست ، لە هەمان کات تگول بەگ کچەکەی خەلیفەی عەباسی خوواست ، کە ئەمەش بووە هۆی ، یەکەم بەهێزکردنی جێگەی سەلجووقیەکان و ، دووەم دەسەڵاتی عەباسی و فراوان کردنی هەردوو دەسەڵاتی زاواو خەزوری یەکتری عەباسی و سەلجووقی لەناوچەو هەرێمەکەدا .

## ١٠٥٧

١٠٥٧/٥/١٠ دوای بەرەو لاوازبوونی رۆڵی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بە توانەوەی بنەماڵەی
مەكدۆنی ، ئەویش بەهۆی بوونی كێشەی توونـد لـەنێوان هـەردوو چینی
سەربازی و مەدەنی لە ئیمپراتۆریەتەكەدا.
جێگەی ئاماژە پێكردنە كە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی هاوكاری توركەكانی
دەكرد لەدێر زەمانەوە ... كە هاوپەیمانیەتی لەنێوان تورك و بیزەنتیەكا
بەردەوام بوو ، ئەویش لەدوای سەدەی شەشەمی زاینی بەر لەبوونی وەا
نەتەوەیەكی دیار ، بەڵكوو وەك بنەماڵە بوون ... ئەو توركانەش لەرێز
سووپای بیزەنتی وەك گێرەشێووێن كاریان دەكرد .
هەروا لەلایەكی دیكەش كۆمەڵەیەكی دیكەیان لەرێزی سووپای ئیسلا
كاریان دەكرد ... كە ئەو سووپایە لەسەر سنووری رۆژهەلاتی ئیمپراتۆریەتی
بیزەنتی مۆڵگەدار بوون دژی بیزەنتیەكان ... ئەو بنەماڵە توركانەش رۆڵێك
دیاریان نەبوو ، هەروا كاردانەوەیان لەسەر دەسەلاتی بیزەنتی و ئیسلا
نەبوو ، تاكوو دەركەووتنی دەسەلاتی سەلجوقیەكان لەسەر سنوور
رۆژهەلات لەسەدەی پێنجەمی كۆچیدا .
لەو كاتەش دەسەلاتی ئیسلام دەسەلاتێكی لاوازبوو بەرامبەر بە دەسەلاتی
بیزەنتی لە ناوچەكەدا ... كە دەسەلاتی ئیسلام لە پەیوەندیەكی كەرت بوو
دەژیا لەبواری رامیاری و مەزهەبیدا .
هەر لەسەرەتای بوونی ئیسلام ، بە تایبەتی لەدوای كۆچی دوایی ئیمام
عەلی ، دوو مەزهەبی شیعەو سووننەی دژ بەیەكتری دەركەووت و ر
لەدوای رۆژ ئەو دژایەتیە پەرەی سەندو بەردەوام بووە تاكوو ئێستا ... بەا
دوای لاوازبوونی دەوڵەتی بیزەنتی و دەركەووتنی رێگەی خۆشكەر ب
بەهێزبوونی دەسەلاتی ئیسلامی و فراوان بوونی لەهەرێمەكەدا ... كە س
هۆكار بۆتە هۆی بەهێزبوونی دەسەلاتی ئیسلامی ئەویش:—
ئایینی — ئابووری — رامیاری — هۆكاری دەركەووتنی سەلجوقیەكانیە
قۆستنەوەی باری ئایینی ئیسلام بوو ، ئەویش لە پێناو بەهێزكرد
دەسەلات و بوونی لەناوچەو هەرێمەكاندا ، بەرامبەر بە مەسید
دراوسێكانیان .




کە ئەویش ئەرمەن و بیزەنتی بوون ، کەشەڕەکەشیان لایەنی خۆبەختکەری – جیهاد –ی گرتە بەر بەتایبەتی لەناوچەی – کەرج – کە دەکەوێتە شاری – تەفلیس – لەباکووری کوردستان .

هەروا هەرێمەکانی ئەرمەن ، کە ئەویش زۆربەی هەرە زۆری لەسەر خاکی کوردستان و دوای ئەویش بیزەنتیەکان ... لەو کاتەش – تگرل بەگ هەوڵەکانی ئەوەبوو هەموو شتێك لەژێر دەسەڵاتی خۆی بێت و بنەماڵەی تورك زیادبکات ، بە رامیاریەتی بە تورك کردن لەنەتەوە جیاجیاکانی دیکە بەتایبەتی گەلی کورد لە کوردستان .

سەرچاوە:– ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان – ئامادەکردنی – دکتۆر سەیفەدین کاتب – دار الشرق – بەیروت – سووریا /٢٠٠٥ .

## ١٠٥٨

١٠٥٨/٢/٢ قەڵای شاری مووسڵ کەوتۆتە سەر خاکە بەرزەکانی شاری مووسڵ کە دەروانێتە سەر زێی دیجلە ، لە هەمان کات چاوگەی کبریتە ، کە دەکەوێتە باکووری شاری مووسڵ– حەمام عەلی – کە کەس بەتەواوی نازانێ لەبنەرەتا کێ ئەو قەلایەی دورست کردووە ، بەڵام لەو کاتەی کە کورد نیشتەجێی رۆژهەڵاتی زێی دیجلە بوونە بەپێی نووسراوەکانی گەرۆکی ناوداری جیهانی– زینەفۆن – بەر لە ٤٠٠ساڵ پێش زایین ، ئەو تەنیا کوردی دیووە لەو دەڤەرەی ئێستای پارێزگای مووسڵدا .

هـیچ نەتـەوەو دانیـشتاوانێکی دیکـەی لەو هەرێمـە نـەدیووە . تـەنیا کور
نـەبێ ، چـونکە زینـەفۆن‌و هاورێکـانی کە لـە شـاری بەغـدا بـەرەو ئـەو ناوچ
بەرێکەووتن و دوایی بەرەو شام هەنگاوویاندەنا .

## ١٠٦٣

١٠٦٣/١/٤ مردنـی تگـرل بـەگ و جێگرتنـەوەی لەلایـەن ئەلـەب ئەرسـەلان و لـە دوا
هەوڵێکی زۆر توانی سەرکەووتن بەسەر بیزەنتیەکان لەشەری – مـەلازکرد
لـە بـاکووری کوردسـتان بەدەسـت بـێنێ لـە سـاڵی ١٠٧١ و ئیمپراتـۆر
بیـزەنتی– رومـانووس دیـوگین – دەسـتگیربکات و دوایـی ئـازادی کـرد .
ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە سنوورێك بۆ ئیپراتۆریـەتی بیـزەنتی دابد
لە فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتەکەیان .




دوای مردنـی ئەلـەب ئەرسـەلان لـە سـاڵی ١٠٧٢ ، کورەکـەی مەلکشا جێگ
گرتـەوەو ، لـەو کاتەشـدا کـە دەسـەڵاتیان درێـژبووەوە لـە رۆژهـەڵاتی چ
تاکوو دەریـای ناوەنـد ... لـە رۆژئـاوا دەسـەڵاتەکەی تووشـی ململانـێ بوو
لەگەڵ بوهیەکان و گزنوییەکان و فاتمیـەکان و بیزنتیـەکان ... لـەدوای مرد
مەلکشا لـە سـاڵی ١٠٩٢ دەووڵـەتی سـەلجوقی دابـەش بـوو ، لـە چـەند
ناوچەو هەرێمدا .
ئەویش وەك دەووڵەتی سەلجوقی لە شام و یەکێك لـە ئێـراق و ئـەوەی دیک

لەکرمانی ئێرانی .... واتە ئێراق و ئێرانی ئێستا ... چونکە ئەو کاتە نە ئێراق هەبوو نە ئێران .... کە ئێراق ئەو کاتە پێی دەگووترا وولاتی نێوان دوو زێ ، واتە – میزۆپۆتامیا – و ئێرانیش پێی دەگوترا وولاتی فارس لەکێشووەرەکەدا .

سەرچاوە:– ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان – ئامادەکردنی – دکتۆر سەیفەدین کاتب – دار الشرق – بەیروت – سووریا /٢٠٠٥ .

## ١٠٦٤

١٠٦٤/٣/٣ تیرۆرکردنی – ئەلەب ئەرسەلان – کە خاوەنداریەتی هەموو وولاتی فارس و وولاتی نێوان دوو زێ – میزۆپۆتامیا – ی هەبوو لەگەڵ نیووەی زیاتر لە باکوورو رۆژهەلاتی کوردستانی هەبوو، دوای کۆچی دوایی ئەویش کورەکەی – مەلیك شا – جێگەی گرتەوە ، لە هەلسووراندنی کاروباری دەسەلاتەکەی لە سەر ئەو ناوچە و هەرێمانەی کە لە ژێر دەستیدا بوو لە کێشووەری ئاسیادا .

## ١٠٧٦

١٠٧٦/٨/٥ دامەزراندنی دەسەلاتی خەوارزم لە ژێر دەسەلاتی عەباسیەکان لە وولاتی خەوارزم لە باشووری دەریاچەی – ئارال – کە لە زێی جیحوونی دەکردەوە . ئەویش بەسەرکردایەتی سەرکردەی تورك – ئانووشتکین – کە باوکی قتبەدین محەمەد بۆی بە جێ هێشتبوو ، بە نازناوی خوازمشا لە ١٠٩٧/١٢/٩ و بەردەوام بوونی تاکوو ساڵی ١١٢٨دا .

هەروا محەمەد خوارزمشا توانی دەسەلاتی خۆی فراوان بکات لەسەر سگستان و دەسەلاتی غەزنوییەکان بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی ... بەلام دوای هاتنی کورەکەی – ئاتسز – لە ساڵی ١١٢٨ ، کە بووە یەکەم سوڵتانی دەووڵەتی خوارزمی و بەربەرەکانی مەگۆلەکانی دەکرد .




کــە ئەمــەش یەکــەم هەڵــە بــوو کــەکردی ، کــە مەگۆلــەکان هاتنــە نــاو
دەســەڵاتەکەی... بــەڵام دوای مردنــی لــە ســاڵی ١٢٠٠ کورەکــەی محەمــە
عەلائــەدین تکــش ، تــوانی دەســەڵاتی خــۆی لەســەر هــەموو وولاتــی فــارس
بــچەسپێنیّ و هــەموو هــۆزو تیرەکــان بخاتــە ژێــر دەســەڵاتی خــۆی لــە فــارس
تورك و مەگۆلەکان .

ئــەویش بــەهۆی چــەندین هەڵــەی رامیــاری بــووە بــە لــە ناوچــوونی دەووڵــەتی
خــوارزمی لەســاڵی ١٢٣٠ ، بەدەســتی مەگۆلــەکان کــە دوا شانــشینەکەیا
جەلالەدین منکبرتی بوو لە کێشوورەکەدا .

سەرچاوە:— ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان — ئامادەکردنی —
دکتۆر سەیفەدین کاتب — دار الشرق — بەیروت — سووریا /٢٠٠٥ .

## ١٠٧٧

١٠٧٧/٧/٢٥ بە دابەش بوونی دەووڵەتی سەلجوقی گەوورە لە شام و ئێراق و ئێران ، لـ
ئاسیای بچووکیش ئیمارەتێك پێکهات بەناوی — سەلاجقەی رۆم — لە لایە
سـلێمانی کـوری قتلمـیش و دەسـەڵاتەکەی بـەردەوام بـوو تـاکوو چـووە نـا
دەووڵـەتی عوسمـانی ... لـە دواییدا پایتەختەکـەی گوواسـتەوە بـۆ شـاری
قوتیە — لە ناوچەکەدا .

سەرچاوە:— ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان — ئامادەکردنی —
دکتۆر سەیفەدین کاتب — دار الشرق — بەیروت — سووریا /٢٠٠٥ .

## ١٠٧٨

١٠٧٨/٧/١٤ رابـەری ئاینی ئێزیدیـەکان – شێخ عـودەی کوری موسافر چاوی بـە جیهان هەڵهێناوە .... شێخ عودەی مرۆڤێکی زاناو زیرەك و بەتوانابووە بە تایبەتی لەبەراوردکردن لـە نێوان ئاینـەکانی جوولەکەو مەسیح و ئیسلام ئەویش بە کۆکردنەوەی کتابە پیرۆزەکان و کتابەکانی دیکەی کە شیکردنەوەی ئاینیان تیا روون کرابووەوە .



لەسـەرەتا داوای هـەڵگری بـڕوای ئـاینی ئیـسلامی کـردووە ، بـەڵام ئـەم مرۆڤـە بـەهۆی دەسـتگیری بـە تەسـەوفی ئـاینی و هەولی بەهێزو پتـەوکردنی ئاینی ئێزیـدی بووەو لـەو هەوڵـە بـەردەوام بـوو تاکوو لە ١١٦١/١٢/٢١ کۆچی دوای دەکات و تەرمەکەی لە مەڵبەندی ئاینی ئێزیدی لە لالشی دەنێژرێت .

جێگـەی ئاماژە پێکردنە کە شێخ عودەی لـە ترسی دەسـەڵاتی عەباسیەکان بەرەو لالش هەڵاتیەو لەویَ خۆی گرتۆتەوەو جیَ نشین بووە .

هەروا بنەماڵەی شێخ عودەی کە کورد بوونەو لەناوچەی هەکاری سەریان هەڵـداوەو بـەرەو ناوچـەی دهـۆك و شـەنگال هـەنگاویان نـاوە . کـە چـەندین بیروبۆچوون باس لە چۆنیەتی بیروبۆچوون و هەڵوویست و رەفتارەکانی شێخ عودەی کوری موسافر دەکەن .

بـەڵام ئـەوەی لـە نووسـراوەکان دیـاری کـراوە وەك :– مێـژوونووس – کـوری عەتبە – لـە مێـژووداو ، هـەروا یعقوب سـرکیس و ، یـان نەسا کتـابی ، راهـب رامیـشوع و ، چـەندین نووسـەرو مێـژووناس ، چ لـە بـارەی ئاینـەوە و چ لـە بارەی بوونی بنەماڵەی شێخ عودەی ، لێکۆڵینەوەیان کردووەو شێخ عودەیان بە مرۆڤێکـی بـەتواناو زیـرەك زانیـووەو دووپـاتی کوردایـەتی ئـەم مرۆڤـەیان

کردۆتەوە لە سەر خاکی کوردستاندا .

## ١٠٧٩




١٠٧٩/٣/١٥ مێــــــــژوونووس و روونـــــــاکبیر - هەمزەی ئەسفەهانی - لـــە نووســـینە مێژووییەکانیـــدا ئەلێت :- لە یەکەم ســـاڵی کۆچـــیدا نـــەورۆز رێکـــەووتی رۆژی ٦/١٨ و رێکـــەووتی یەکـــەم رۆژی زولقیعدەی کردووە ... لەکاتی دەسەلاتی خەلیفە متەوەکل دا رۆژی نەورۆز کە مەبدەئەکانی (جەمعی کۆکۆدنەوەی -خراج - بوو ... کە دوو مانگ پێشخرا .

مەبەست لە مەش زووتر باج کۆکردنەوە بووە ، لە ساڵی ٢٤٥ی کۆچیدا .. خەلیفە موعتەزەر مێژووی کوردی کردیە بە ٦/١١. لە دواییدا لەکاتی - مەلیك شا - ی سەلجووقی دا کە رۆژنامە گۆرا زانایانی گەردووناسی- فەلەك - بەمەبدەئەکانی ساڵی تازەیان قبوول کرد . کە رێکەووتی ١٠/ رەمەزانی /٤٧١ ، کۆچی دەکرد کە بۆتە مەبدەئەکانی ساڵی تازەدا .

هەروا لە وولاتی میسریشدا جێگەی بروا بوو کە - مەقدیزی- و رێکەووتی /١٠ ، یاخوود /٩/١١ی دەکرد .. بە بڕوای خۆم . واتە هەمزەی ئەسفەهانی دەڵێ:-

مێژووی رۆژانی مەلیك شا زۆر بە جێیەو زۆر نزیکە لە راستی ، چونکە رۆژی یەکەمی بەهار ٣/٢٢ زاینی دەکاتو کاکلەکەی وەك لەسەرەتا ئاماژەمان پێ کردووە ، کە نەورۆز یەکەم رۆژی بەهارە -

بەپێی نووسراوە جۆراو جۆرەکانی زاناو پرۆفیسۆرو نووسەرو مێژووناس و

جووگرافیناس ، دووپاتی دەکەنەوە کە هەریەك بە شێوەو شێووازێك و بە بیروو بۆچوونێك .

بەڵام هەر هەموویان دووپاتی پابەند بوونی نەورۆز بە لە دایك بوونی زەردەشت دەکەنەوە ، هەر وەك لە دانراوە گرنگەکەی – ول دیوورانت – قصة الحضارات- بەرگی یەکەم ٢/١ ، لە وەرگێرانی – زهکی نەجیب محەمەدو محەمەد بەدران – و دانراوەکەی – سلێمان مەزهەر- قصە الدیانات – وەرگێرانی کتابی پیرۆزی ئاڤێستا لەلایەن یۆنانیەکان هەر وەك لە – قصة الحضارات – باسی لێووە دەکات ... کە ئەم سێ سەرچاوەجێگەی بروا پێکردنن لە هەموو رویەکـــدا .

هەروا لەو کاتەی کە زەردەشت لە دایك دەبێ بلێسەی ئاگر لەسەر گووندەکە بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوەو دانیشتووانی گوندەکە هەموویان گووندەکە بەجێ دێلن و بەرەو دەشتایی رادەکەن ، دوای چەند کاتژمێرێك دەنگ و باسیان دەگاتێ ، کە مندالە چاوەروانکراوەکە لە دایك بووەو لەو ناوچەیەش خووێندەوار هەبووە بە تایبەتی قوتابیانی – بوورزین – کە مامۆستاو فێرکەری زەردەشت بووەو مرۆڤێکی زاناو رووناکبیرو لیهاتوو بووەو لە هەمان کات جیا لە هەموو مندالێکی لە دایك بوو زەردەشت بەدەنگێکی بەرز پێکەنیووە بە رووخۆشی و پێکەنینەوە.

دوای گەوورە بوونی زەردەشت و لە تەمەنی حەوت ساڵی بۆتە قوتابی– بـرزین کـروس – کە بە لێهاتووترین و زیرەکترین قوتابی دەرچووە لە فێربوونی شعرو ووتارو کشتووکاڵ و پیشەسازی و پزیشکی و چەندین بوواری دیکە ، کەماوەی هەشت ساڵ خووێندویەتی لەو کاتدا .

لێرەدا ووشەی نەورۆز یانی نووێ بوونەوە... ئاگری نەورۆزیش یانی بوون و سەرکەووتن و مووژدەو ئازایەتی و خەبات و قووربانی دان لە هەموو بوواره جیاجیاکانی ژیان لە دەسەڵات و پێشکەووتن و گەشەکردن و بەیەکەوە ژیان .

واتە لەدایك بوونی زەردەشت لە ساڵی ٧٠٠ی پێش زاین و دوای ٤٨ ساڵ بۆتە ئاینی رەسمی ئیمپراتۆریەتی میدیا . ئەو ئاینە ئاینی رەسمی کوردی و فارسی بووە تاکوو هاتنی ئاینی ئیسلام ، ئەویش لە رێگەی بە

ئیسلامکردنی گەلانی ناوچەو هەرێمەکان بەتایبـــەتی کـوردو فارس . کە لـە سـەرەتا بـەزەبری کووشـتن و بـرین و تـالآن و سـووتاندن و تۆقانـدن کـراون بـە ئیسلام لە ڕێگەی فتووحاتی ئیسلامیدا .

واتە مووژدەی لە دایك بوونی زەردەشت ، ئەو بڵێسە ئاگرە بووە کە لـە سـەر ئـەو گوونـدەی کـە لێـی لـە دایـك بـووە ، کـە بـەرەو ئاسمـان بـەرز بۆتـەوەو نەورۆزیش بەر لەو مێژووە بە ٤٠ ساڵ بە ڕەسمی بوونی خۆی سەلماندووە ، بە مێژووی بوونی نەتەوەی کوردو کوردستان و گەلانی هاونژاد کە ئاری بوونە.

لەگەڵ ئەوەشدا میدیەکان ٨٣٧ ساڵ بەر لە مێژووی زاین ، کە دوا هـەواڵ لـە بـارەی دەسـەلآتی میدیـەکان ، کـە لـە تابلۆیـەك تۆمـار کـراوە لـە لایـەن – سلمانسری سێیەم – کەبەرەو شارۆچکەی – پارسوا – هەنگاویناوە لە چیاکانی کوردستان ، کە لەو کات ٢٧ سەرۆك و ئەمیر دەسەلآتداریەتی ٢٧ وویلایەتیان دەکرد ، کە پێیان دەگوتن– ئەمادای ، مادای ، مییدیین – کە نەژادی – هنووری – بوونـەو پایتەختـە کـەیان وویلایـەتی – ئیکباتانـا– ی هەمـەدانی ئێـستا بـووە ، کـە زیـاتر لـە چـوار ریـان بـووە هـەر وەك لـە کتـابی(تـەوراتی) جولەکـەکانیش باسـی کـردووە کـە بـە دەوڵـەتی مادديـەکان ناوزەند بووە .

کە لەو کاتە بوونی فارس و هیچ نەتەوەیـەکی دیکـە لـە ناوچـەو هەرێمـەکانی ژێـر دەسـەلآتی ئـەو ٢٧ ئیماراتـە نـەبووە ، کـە توانیویانـە بـەرگری لەدەسەلآتەکەیان بکەن و هەر سەرکەووتنێکیان بەدەست هێنابایە ، ئەویش بە رزکردنەوەی بڵێسەی ئاگر بۆتە هێمای سەرکەووتنیان ، چونکە لـەو کات لـەو کارەیان زیاتر بە دەستەوە نەبووە . وەك ئێستای ڕاگەیاند کە هەیـەو بـەردەوام بـووە تـاکوو توانیویانـە مێـژووی کـورد سـەقامگیر بکـەن لەیەکـەم ڕۆژی بەهار کە ١/١/١ ساڵی کوردیە.

کە تـاکوو ئێـستاش وەك هێمایـەکی بـەرز ڕاگیراوە ، کـە جـەژنی نەتـەوەیی ڕاستەقینەی کوردە لە جیهان ، ئەویش نیشانەکەی بەبەرزی بڵێسەی ئاگری نـەورۆزە بـە نـوێ بوونـەوە لـە هـەموو بوارەکـانی پەرەسـەندن و پێشکەوتن و گەشەکردن .

ئەمـە لـە لايـەكو لەلايـەكى ديكـەش وەك لەسـەرەوە باسـم كـرد ، كـە قـصـە الحضارات زۆر بە پێزى باسى لە ميديـەكان و زەردەشـت و ئـايـنى زەردەشـتى دەكـات ، كـە هـەتا داراى يـەكـەم يـەكێك بـووە لـە كورەكـانى زەردەشـت ، كـە پەيووەنديە سەرەتايەكانى نێووان گەلانى ناوچەو هەرێمەكە لە نێوان كوردو يۆنـانى و ئيتالْيـەكان هـەبووەو ئـەوان سەرچـاوەى ناوزەنـدى مـيـديا بوونـە ، هەر وەك لەقصة الحضارات باسى لێووە كردوە.. بەلأم كورد..!.

تێبينـى:- بـاوكى زەردەشـت نـاوى - بوورشـاسبا - بـووە و نـاوى دايكـى - دگدوڤا- بووە .

## ١٠٨٦



١٠٨٦/٤/١٨ زۆر جـار باسـى ئـەوەمان كـردووە ، كـە سـەلاحەدينى ئـەيوبى هەسـتى نەتەوايـەتى و نيـشتيمانى زۆر لاوازبـووەو بـرواى بـە نەتەوەكـە و نيـشتيمانەكەى نـەبووە ، بـەلْكوو هـەموو هەولْـەكانى لـە دەسەلأتەكەيدا بە هێزكردنى عەرەب و فراوانكردنى سنوورى جووگرافى خاك بووە ، بۆ عەرەب لە رێگەى ئاينى ئيسلام بە هێزكردنى ، و گـەر سـەلاحەدين نەبوايە ئاينى ئيسلام دەگەرايەوە سەر دۆخى جارانى لـەكاتى پێغەمبەر - د.خ - لـە چوارچێوەى دوورگـەى بيابـانى عـەرەبى و يـەمـەن و زيـاتر نـا ، بـە هۆى دژايەتى كردنى ئەو ئاينە لەلايەن ئاينى مەسيحى و ئاينەكانى ديكەى وەك ئاينى مانى و زەردەشتى و جوولەكە . كە هەولْەكانى سەلاحەدين تەنيا شەركردن و دژايەتى كردنى مەسيحيەت بوو ، لەناوچەو هەرێمە جياجياكان ، لە شام و وولأتى نێوان دوو زێى و ئەفەريكيا و چەندين جێگـەى ديكە بە

تایبەتی لەسەر خاکی کوردستان .

بۆ نمونە : – سەلاحەدینی ئەیوبی لەوکاتەی هەرێمی دیار بەکری خستە ژێر دەسـەلاتی خـۆی بـەهیچ شـێووەیەك یارمـەتی ئـەمیرەکانی کـوردی نـەدەدا و بەتایبەتی بنەماڵەی نەوەی مەروان – دوستەکیەکان – کە خاوەنی دەووڵـەتی دۆسـتەکی کـورد بـوون .... و لەهـەمان کـات هاوکـاری نـەکردن بـۆ ژیانـەوەی دەووڵەتەکەیان و ئیماراتەکانیان.

بەڵکوو بە پێچەوانەوە یارمەتی نورەدین محەمەد قرە ئەرسەلانی نـەوەی – ئـەرتق – ی سـەرکردەی دەووڵـەتی سـەلجوقیەکانی دا ، کـە ئـەوان بـوون دەووڵەتی دۆستەکیان لەناوبرد .

لەگـەڵ ئەوەشـدا سـەلاحەددینی ئـەیوبی کتێبخانــەی گـشتی دیاربـەکری تـالانکرد کـە زیـاتر لـە ١,٤٠٠,٠٠٠ ملیـۆن کتـابی ئیـسلامی و رامیـاری و نەتەوایەتی و نیشتیمانی و کۆمەلایەتی و ئ دەبی و شیعرو نامەی تیابووە ، کە گەووردترین کتێبخانە بوو لە جیهانی ئیسلامی ئەو کات . بەتایبەتی ئەو بەڵگەنامەی کە لە سەربوونی کوردی تیابوو .

هەروا سەلاحەدینی ئەیوبی یارمەتی کوردی نەدەدا لـەو کاتـەی شۆرش دژی تورکمـانی داگیرە هاوردەکـانی بـەرپاکردو هـەتا لـەو پەیمانـەی کـە لـە نێوان کوردو تورکمان مۆرکرا لە ساڵی ١١٨٥ ، کە ئارەزووی نەدەکرد کـورد بـەهێزو سـەرکەوتووبێت لـەژێر دەووڵـەتی کـوردی ..... بـەڵام ئـاواتی ئـەوەبوو کـورد بۆلای خۆی راکێشێ و بیانبات بۆ شام و وولاتی میسر ، بە شەڕپێکردنیان دژی سەلیبیەکان .

هـەروا نمونەیـەکی دیکـەش ، کەلەو کاتـەی لـە زێـی گـەووەرەوە تـاکوو کۆتـایی ناوچـەی شـارەزوور لـە باشـووری کوردسـتان ، لـە بـەر دەسـتیدابوو بـەپێی پەیمانی لەگەڵ بنەماڵەی ئەتابەکیەکان لە ساڵی ١١٨٥ لە مووسڵ و ئیمـارەتی – قەمجاقیە – ی تورکمانی ژیاندەوە ، لـە کـەرکوك و شـارەزوور لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ... واتـە یارمـەتی دەری عـەرەب و تورکمـان بـوو دژی کوردو خاکی کوردستان .

لەبەر ئەوەی بە عەرەبکردن و داگیرکردنـی خـاکی کوردستان بەچوار قۆناخدا تێ پەر دەبێ ئەویش :–

یەکەم : قۆناخی دووەم ، لە ڕێگەی فتووحاتی ئیسلامی بە سەرکردایەتی خەلیفەی، ئیسلام عومەری کوری خەتاب لە ناوچەکانی پارێزگای مووسڵ و کەرکوك و دیالەو کووت وبەرەو خاکی کوردستان ، لەئەنجامی شەڕی خووێناوی لە نێوان کوردو عەرەبی هەڵگری ئایینی ئیسلام .

دووەم : لەلایەن سەلاحەدینی ئەیوبی ، کە شەڕی دژی سەلیبیەکان کردو کورد بووە هۆکاری سەرکەووتنی دەسەڵاتەکەی ، بە بەرفراوانکردنی سنووری جووگرافی عەرەب و بەهێزکردن و ژیانەوەی ئاینی ئیسلام .

سێیەم : لەگەڵ ڕاگەیاندی دەووڵەتی عوسمانی ، کە ئەمەش هۆکارێکی کاریگەر بوو لەماوەی زیاتر لە ٤٥٠ ساڵ ، کە ئیپراتۆریەتی عوسمانی تورك بەهۆی بەرگری کردن لە ئیسلام و بەرزکردنەوەی ئالای ئیسلام ، گەیشتنە ئەو قۆناخەو عەرەب بەلێشاو بەرەو خاکی گەلان ، بە تایبەتی کوردستان دەهێناو نیشتەجێی دەکردن و کوردی دەربەدەر دەکرد لە سەر خاکی کوردستان بە تایبەتی لە باشووری کوردستان .

چوارەم : لەدوای وەرگرتنی دەسەڵاتی بەعس لە سووریاو ئێراق ... بە شێووەو شێووازی نوێی بەعەرەبکردن و داگیرکردنی خاکی کوردستان بەهێزوپتەوتربوو ، لە ژێر دروشمە شۆڤینیەکانیان- ئوومە عەرەبیە واحید - زات رسالە خالیدە - ئێراق و سووریای عەرەب و چەندین دروشمی دیکە.... ئەمە جگەلە تورك وفارس لەناوچەو هەرێمەکەدا لەسەر خاکی کوردستان لە کێشووەرەکەدا .

<u>سەرچاوە:</u>- سوود لەکتابی - حدود کوردستان الجنوبیە تاریخاً و جغرافیاً - وەرگیراوە .


**١٠٩٢**

١٠٩٢/١١/١٨ کۆچی دووایی مەلیك شای فارس لە شاری بەغدا ، کە لەوکات ئەو والی بەغدا بوو، کە رۆژئاواو رۆژهەڵاتی شاری بەغدای کردبووە مەڵبەندی گەردوونناسی ، لە رۆژانی دەسەڵاتی ئەو ئیسلام چووە قۆناخی هێمای سەرکەووتن هەتا لە ووتارە ئاینیەکانی رۆژی هەینی بەناوی ئەو دەخووێندرایەوە لە شارەکەدا .

## ١٠٩٥

١٠٩٥/١/١١ جوولانەوەی خاچەکان بەر پەرچدانەوەیەکی مەسیحیەکان بوو رووەو ئیسلام ... کە رەگەکانی دەگەرێتەوە لە گەڵ سەرهەڵدان و پەیدابوونی ئایینی ئیسلام ... هەروا دەرکردنی ئیسلامەکان لە دوورگەی عەرەبی و روو بەروبوونەوەی لە نێوان ئیسلام و بیزەنتیەکان ... ئەم جوولانەوەیەش وەك جەستەیەکی زیندوو بوو لە ماوەی چەند سەدە ، ئەمە کاری کردە سەر گۆرانکاری لە قۆناخێك بۆ قۆناخێکی دیکە و بەردەوام بوونی تاکوو ساڵی ١٢٩١ ... کە ئەمەش هۆکارێکی بوو چەندین لایەنەی لە خۆ دەگرت .ئەویش:-

یەکەم :- هۆکاری ئایینی و بیروو بۆچوون بوو ، لە سەر رێنمایی و ئامانج و ئاواتەکانی داهاتووی ئەم دوو ئاینە لە سەر گۆی زەوی و دوا رۆژەکەشی قیامەتە لە دوای نەفخە سوورەکەدا...؟...!.

دووەم :- هۆکاری نەتەوەیی و بوونی خاك و دەسەڵات بوو ، لەهەموو بوراەکانی رامیاری و ئابووری و بازرگانی و سەربازی و شووێنەوار و شارستانیەت لە جیهاندا .

جووڵانەوەی خاچەکان لە ئەورووپای رۆژئاوا سەری هەڵداو بەرەو هێرشکردنە سەر ئیسلام و عەرەب بوو ، لە کیشووەری ئاسیا ، بەتایبەتی لەدوورگەی بیابانی عەرەبی ، کە وولاتی یەمەن و سعوودیەی ئێستا دەگرێتە خۆ ... هەروا بوونی ئیسلام لە شام و ئێراقی ئێستاو ئەنادۆلی تورکی ئێستا ، کە بەشێکی گەورەش کوردستانی گرتەوە ، بە تایبەتی لەباشوورو باکوور لە کێشووەرەکەدا .

ئەمەش دەگەرێتەوە سەر ئەو هۆکارانەی کە کۆمەڵگای رۆژئاوا لەو ماوەیەدا کێشەو ململانێی توند و تیژی ناوخۆیی بەخۆوە دیت ، لە نێوان ئەمیرانی دەرەبەگایەتیدا ... کە ئەمەش ببووە هۆی بێزاری و بڵاوبوونەوەی برسیەتی و رووخاندنی ژێرخانی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە کێشووەرەکەدا .

سەرچاوە:- سەلاحەدینی ئەیوبی - موسوعە الحروب الصلیبیە
-دانانی دکتۆر سلابی - چاپی یەکەم - بەیروت /٢٠٠٨.

### ١٠٩٩

١٠٩٩/٧/١٥ لـە ئاکـامی شـەڕیکی کووشـندەو دژووار لـە نێـووان هێـزە چـەکدارەکانی ئیسلامو مەسیحی ، لە ئەنجام شاری قوودس لەلایەن هێزە چەکدارەکانی سەلجووقی داگیر کراو – گود فروادی بۆبۆن – کرا بە شانشین لەسەر شاری قـوودس و دەووروویـەری ، ئەمـەش لەشـالاوی دووەم بـوو ، کـە لـە شـەڕی خاچـەکان کـە ڕێکخرابـوو لەلایـەن دەرەبەگـە فەینـسەکان و ئیتایـەکان بەسـەرکردایەتی – گـودفروادی بۆبۆن – و – ریمۆن دوسانجیل – و – هۆگ دومیرفرو – و – یۆهیمۆندی یەکەم – و – ئەمیر تارانتیا – کە تووانیان لەو شـالاوە شـاری ئەدیـسە بخەنـە ژێـر دەسـتیان و دوایـش شـاری تـارس و ئەنتاکیەدا .

بـەر لـەوەش شـاری قـوودس داگیر کرابـوو بـە دامەزرانـدنی شانـشینەکە و دامەزراندنی ئیمارات لە شارەکانی ئەنتاکیەو ئەدیسەو تەرابلسدا .

### ١١٠٨



١١٠٨/٨/١١ بـــە هـــۆی رووخانـــــدن و چـــاکردنەوەی شـــوورەی دەووری شاری مووسڵ لـە لایـەن بەرپرسان و والـی ئـەو کاتـەی پارێزگـای مووسڵ ، بە تایبەتی لە دوای داگیرکردنی لەلایەن ئیسلام ، لە هێرشەکانی فتووحـاتی ئیسلامی کە یەکەم خەمخۆری ئەم شوورەیە – پەرژین – کە سایەتی ناوداری کوردو سەرکردەیەکی لێهاتوو عیمادەدین زەنگی بووە .

کـەناو زەنـد بـوو بـە سـەرکردەیەکی تـورک ، کـە ئـەوکات تـورک لـە پارێزگـای مووسڵ و جەزیرو شام نەبووە ، بەڵکوو سەرکردەیەکی کورد بووە و کە بۆتـە

والی موسل دەستی كردووە بە بنیاتنانەوەی شوورەكە بەشێووەیەكی رێك و گوونجـاو ، بـە دروسـت كردنـی خەنـدەقێك لـەرووی دەوروویـەری شـوورەكە لەپێناو بەرگری كردن لەلایەك و ، لە پێنـاو بەهێز كردنـی دەسـەڵات لـە شاری موسل ... لەدوای ئەو مێژووەدا .

جێگـەی ئامـاژە پێكردنـە كـە شـوورەی مووسـڵ ، بـۆ یەكـەم جـار لەلایـەن سـەعیدی كـوری عەبـدوڵلا نەخـشەی بـۆ كێـشاوە ، ئـەویش كـە خەلافـەتی وەرگـرت دوای بـاوكی لـە سـاڵی ٦٨٥ بـە بنیاتنانـەوەی ... دوای ئـەویش لەلایەن مەروانی كوری محەمەد ، ئەویش بە فراوانكردنی شوورەكەو مانەوەی تاكوو وەرگرتنی خەلافەتی مووسڵ لەلایەن هارونە رەشید لە ساڵی ٧٩٧ ، كە ئەو شوورەكەی رووخاند .

بەڵام بەهۆی شۆرشی شاری مووسڵ و ، مووسڵ بەبێ شووره مایـەوە تـاكوو بـوونی شـەرەف دەولـە ئەلعقـەیلی ، كـە ئـەویش هەڵـسا بەدروسـتكردنی شـوورەیەك بەشـێووەیەكی ناتـەواو .... تـاكوو هـاتنی عیمـادەدین زەنگـی لەساڵی ١١٠٨ بەناوی دوو گۆرەپان ... ئەویش سووری سەلجوقی و سووری ئەتابكی كە ئەمانە لەلایەن زەنگی دروست كرابوو .

شوورەی شـاری مووسـڵ ٩ دەرگـای هـەبووە ، لـەكاتی ئـەتابكی كـە درگـای عیمـاد لەسـاڵی ١١٣٣ لەگـەڵ چـەندین نـاوی دیكـە لەشـارەكەدا ... دەبێـت ئەوەش بزانین كەشاری مووسڵ ، یەكەم خشتی ئاوەدانكردنەوەو بنیاتنانی لەلایەن كورد بووە ، بەر لە ٤٢٠ ساڵ پێش زایـن ، لـە پردی ئاسنینی شاری مووسڵ پردی نوێی ، كە سەدام حوسێن لەسەر زێـی دیجلە دروسـتی كردبـوو ... واتـە كـورد لـە رۆژهـەڵاتی تـەواوی شـاری مووسـڵ بوونیـان هـەبووە و لـە ۆژئاوای زێكەش ئاوەدانی تیانەبووە ، تاكوو دوای مێژووی زایـنی و كۆچی ئیسلامیش لەشارەكەدا.

## ✍ ١١١١

١١١١/١٢/١٨ كۆچـی دووایـی نووسـەرو ئـەدیبو رووناكبیری نـاوداری جیهـانی ئیمـامی غەزالی . كە رۆڵی كاریگەری هەبوو لە بووارەكانی رامیاریو كۆمەلایـەتی ، بـە تایبەتی لە بوواری ئاینی وەك رابەرێك.



تێبینـــــــی:-
ئەمـــــــەش وێنـــــەی
گۆڕەکەیەتی

## ١١١٧

١١١٧/٥/٥ نورەدین مەحمود کوری عیمادەدین زەنکی ، لە شاری حەلەبی شام چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ... دوای ئەوە لە تەمەنی ٢٩ ساڵیدا لە ساڵی ١١٥٥ بۆتە فەرمانرەوا .... کە فەرمانرەوایەکی داد پەروەر بووە و لە رێی ئایینی ئیسلام زۆر شەڕی کردووە .... هەروا قەڵاو پەرژین و دیواری لە زۆر گوندو شارۆچکەو شارەکان دروستکردووە ، لە پێناو بەرگری لە خۆو دەسەڵات کردن لە ناوچەکەدا .

هەروا زۆر فێرگەی خووێندنی ئاینی دامەزراندووەو ماوەی ٢٨ ساڵ فەرمانرەوایی کردووە تا لە ١١٧٣/٨/١٢ کۆچی دوای دەکات .

لێرەدا بە پێی سەرچاوەکانی مێژووی رەسەنی کورد شەرەفنامەو کوردو کوردستان و میدیا ، وا دەردەکەوێت کە هەر لە سەرەتای ساڵی زاینی و بەر لەساڵی زاینیش کورد ، لە زۆربەی هەرە زۆری وولاتانی کێشووەری ئاسیا دەسەڵاتداربوونە ، چەند فەرمانرەواو چەند ئەمیرو چەند شانشین و بەتایبەتی لەوولاتەکانی میسرو شام و وولاتی نێوان دوو زێ -میزۆبۆتامیا - و وولاتی فارس و باکووری کوردستان و ئەنازۆڵ .

بەلام بەداخەوە ئاورێك لە مێژووی سەرکردە کوردەکان و بەراوردێك لەنێوانیان و لەگەڵ سەرکردە سەرهەڵدانەکانی بەر لەساڵی زایینی و دوای ئەویش ، بەتایبەتی لەدوای بوونی ئایینی ئیسلام و ، دوای ئەویش و بەر لەویش ، لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەکانی رۆمان و مەگۆڵ و بیزەنتی و عوسمانی و فارسیدا .

بەلام بەداخەوە لە هەموو بارودۆخێك و قۆناخێك و سەردەمێك قوربانی دانی کورد بەسەرکردایەتی کورد چ لە شەڕی خۆکوژی و چ لە شەڕی دووژمنانیان ، بۆتە یارمەتی دەری دروست بوونی دەووڵەت و دەسەڵاتی وولاتی دیکەی

نەتـەوەی غـەیرە کـوردو ، هـەتا دروسـت بـوونی نەتـەوە لەسـەر بەرژەوەنـد
کـوردو ، پاراسـتنی بەرژەوەنـدی تایبـەتی سـەرکردە کوردەکـان لەسـەرەتا
بـوونی کـورد بـەر لـە ٢٠٠٠ هـەزار سـاڵی زایـینی وتـاکوو نووسـینی ئـ
مێژوونامەیەدا.
هەر بۆ بەشی کورد بە ئاوات و ئامانجەکانی خۆی نەگەیشتووە ، نەك لەلایە
گـەلی کوردسـتان لـە سـەر خـاکی کوردسـتاندا ، بـەڵکوو هۆکارەکـە
سەرکردایەتی کـورد بـوو و لـەو شـوێنانەی کـە تیـای دەسـەڵاتداربوونە ، ل
هەرێم و ناوچەو کێشووەرەکەدا .

١١١٧/٥/٥ بەشی رۆژئاوای مەڵبەندی ناوچیا – اقلیم الجبـال – بە کوردسـتان نـاوبراو
، مستوق دەلیٚ:–
لـە دەوورووبـەری نیـووەی سـەدەی شەشـەمی کۆچـیدا سـوڵتان سـەنجەر
سەلجوقی ئەو ناوچە چیایەی کرماشانی جیاکردەوەو ناوینا – کوردستان
هەروا سولەیمانشای برازای خۆی لەسەر داناو باج و پیتـاکی کوردستان لە
کات دوو ملیۆن دینار بوو ..... کە لە دانیـشتووانەکە وەردەگیرا .... هەروا
مـروج ئەلزەهـەب –ی مەسـعوودی لـە سـاڵی ٩٤٣ زایـنی نـاوی چـەند هـۆز
کوردی هێناوە ئەویش :–
١– شاهیجان :– لەلای دینەوەرو هەمەدان .
٢– ماجوردان :– لە کەنگاوەر .
٣– هەزەبانی دیرات :– لە ئازربایىنجان .
٤– هەروا شارنجان :– لازیا ، مازدنکان ، باریسان ، جـەلالی ، جـەیارق
. جاوانی موستەکانی . ئەمانە لەناو چیاکان دەژیان .
٥– دەیابلا :– لە شام دەژیان .
هـەروا کـوردە مەسـیحیەکان وەك تـیرەی یـەعقوبی – جورقـان– لـە موسـل
چیای جودین .... جگە لەمەش ناوی سەدان هۆزو تیرەی کورد نووسراوە .
سەرچاوە:– شەرەفنامە . ل/١١٩–١٢٠ .

١١١٩

١١١٨/٨/١٦ کۆچـی دووایـی سـولتان محەمـەدی سـەلجووقی ، کـە دوای خـۆی کوڕەکـەی
مەحمود جێگەی گرتەوە لە سەر دەسەڵاتدا .

## ١١١٩

١١١٩/٤/١٤ ئایینی ئیسلام کاریگەری بە هێزی لە سەر دەروون و هەست و نەستی گەلی کوردستان هەبووە ، ئەویش بەهۆی داگیرکردن و بە عەرەب کردن و بە ئیسلام کردن و داگیرکردنی خاکی کوردستان و مانەوەی بە دەیا رێگەی جۆراو جۆری رێبازی ئایینی وەك تەریقەتەکان .

که لەدوای تەریقەتەکانی مروڤیە و بەر لەوەش دەیا تەریقەتی دیکە هەبوونە وەك ، تەریقەتی حەیدەری و سەهرەوەردی و خەڵوەتی ... هەروا تەریقەتی – رفاعی ، کە لەلایەن ، ئەحمەدی رەفاعی – هاتۆتە کایەوەو تەکیەکانی لەشارەکانی کەرکوك و جەلەولاو مەندەلی هەبووە .

ئەم تەریقەتەش هەر لە زووەوە پێگەی لەکوردستان داکووتا و تەشەنەی کردووە لە هەرێمەکەدا . بەتایبەتی لەناوچە کوردنشینەکانی دەووروووبەری شاری بەغدا ، لە بەر ئەوەی ئەم تەریقەتە لە ناوچە عەرەب نشینەکانی دەووروووبەری بەغدا سەری هەڵداوە.

بۆیە لە بەر ئەوە کاریگەری هەبووە لەسەر ناوچە کوردیەکانی کوردستان لە هەرێمەکەدا ... هەروا تەریقەتی – کوبرەوی – کە لەلایەن شێخ نەجمەدین کوبرەوی خوزامی لە ساڵی ١٢٢٠ ی زایینی دامەزراوە ... ئەم تەریقەتەش لە ئاسیای ناوەراست و ئێراندا پەیرەوانی هەبووە و شارەزایانی ئەم تەریقەتەش لە کوردستان هەڵکەوتوون .

واتە ئەو رێبازو بیرووبۆچوونە جیاجیایانە کاریگەری لە سەر باری کورد لە کوردستان هەبووە ، نەك لە پێناو سوود مەندیەتی گەلی کوردستان بەڵکوو بەزیان بەخشی کورد لە هەردوو لایەنی نەتەوەیی و نیشتیمانیدا لە سەر خاکی کوردستان . ئەویش کاریگەری لەسەر لاوازکردنی هەست و بروای نەتەوایەتی ونیشتیمانی و زاڵ بوونی بروای ئایینی لەسەر بروای نەتەوەیی و نیشتیمانی ، بێ ئەوەی گەلی کوردستان هەست بەو کاریگەریە بکات بە هۆی زاڵ بوونی کەسایەتی ئایینی ، لەپێناو کەسایەتی و بەرژەوەندی تایبەتی لەسەر بەرژەوەندی گشتیدا لە هەرێمەکەدا .

## ١١٢٧

١١٢٧/١/١١ دروستکردنی منارەی سەنگاڵ لە هەرێمی باشووری کوردستان لەلایەن – بەندەی هەژاری کوردی تاق سنقر – کە بەرامبەر مانگی موحەرەمی ساڵی

٥٢١ كۆچی دەكات .

جێگــەی ئامــاژە پێكردنــە ، كــە دروســتكردنی شــەنگاڵ دەگەرێتــەوە بـ قۆناخــەكانی مێــژوو .... لــە بــەر ئــەوە چەندین شووێنەواری دێــرین و پاشمــاوەی شارســــــــتانیە جیاجیاكـــان لـــە ناوچــەكە دەبینــرێ ، كــە زۆر لەگەشــتیارو گەریــدەی ئــەوروپایی



ســەردانی شــەنگاڵیان كــردووەو یاداشــت و رۆمــان و چــیرۆكی ئەفــسانەیا لەسەر نووسیووە ، بەپێی خواستی خۆیان , لەوانەش گەریدەی ئینگلیزی جیمس بنكهام – لە ساڵی ١٨١٦ ، كە لە شام بەرەو شەنگاڵ رۆیشتووە لەرێگــەی نەسبین .... لــە نێــوو جەرگــەی شــەنگاڵ چاوت بــە ، فەرجاخ و دوورەیە عــەباس و ، چــەندین شــووێنەواری دیكــە دەكــەوێت و جگــە لــەوەش چاوت بە شوورەی رۆمــان دەكــەوێت ، كــە لەوكات رۆمانــەكان مــاوەی ٧٠٠ ساڵ داگیریان كردووە .

هــەروا لــە ساڵنامەی وویلایــەتی مووسڵی عوسمانیدا هاتووە ، كە شــەنگا بەیەكێك لەناوچەكانی جەزیرە دەژمێردرێت ، كە دانیشتووانەكەی لــە كــورد ئێزیدیــەكانن و دەكەوێتــە رۆژئــاوای شــاری مووســڵ ... هــەروا بــەپێ سەرچاوەكانی بوونی كوردە ئێزیدیەكان لــە ناوچــەكەدا ، دەگەرێتــەوە بۆ بـ لە دامەزراندی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری .

شــەنگاڵ لەســەرگردو تەپۆلكــەی قــەدپاڵی چــیای شــەنگاڵ دامــەزراوەو لـ بــەرزترین لووتكــە كــە ٤٨٠٠ پــێ لەســەر ئاســتی دەریــا بەرزدەبێتــەوە دەكەوێتە نێوان بازنەی پانی ٢٢ و ٣٦ ی باكوورو هێڵی درێژی ٤٧ و ٤١ رۆژهەڵات لە ناوچەكەدا .

بەمــەش ئــەم شــووێن و پێگــە جووگرافیــە لــە رابــردوودا یارمــەتی داوە ببێت دووریــانی رێگاكــانی كاروانــە بازرگانیــەكان ... لێــرەدا مــن بــەكوورتی باســ

شەنگالم کرد ، بەهۆی ئەوەی مێژوونامەکە بەوەندە رازیە نەوەك کتێبێکی تایبەتی لەسەر شوێنەکانی کوردستان .
سەرچاوە :- گۆڤاری لالش – ژمارە / ٢٣ .

١١٢٧/١/١٧ دامەزراندی دەوڵەتی – ئەلئەتابکیە- لە شاری حەلەبی ئیستای سووریا لەلایەن عمادەدین زەنکی ... ئەویش لە دوای گەمارۆدانی هێزی خاچەکان لە ساڵی ١١١٧ ، کە لەو کاتە دانیشتووانی ناوچەکە دەووریان لە نەجمەدەین ئەیلگازی دابوو دژی خاچەکان لە شەڕی – سهل بلاگ – لە ساڵی ١١١٩ و دەستگیرکردنی سەرکردەکەیان – روگیە داسالرنۆ – ی ئەمیری ئیناکیەکان ... دوای ئەوە حەلەبی کردە خاوەنداریەتی خۆی و دەوڵەتی ئەرتەقیەی لێدامەزراند . .

بەڵام لەلایەن عمادەدین زەنکی لە ناوبرا ... دەوڵەتی ئەتابکیە دەگەراوە بۆ عمادەدینی زەنکی کوری ئاق سنقر ، کە – ئەتابك – باش جێگر کە سوڵتانی سەلجوقی ئێراق بووە .... لەساڵی ١١٣٢ بووە والی لە سەر مووسڵ و دەوڵەتی ئەتابکیەی لێدامەزراندا ... دوای ئەوە عمادەدین لەساڵی ١١٢٧ توانی شاری حەلەب داگیربکات بەلە ناوبردنی دەوڵەتی ئەرتەقیە .. بەڵام دوای ئەوە عمادەدین لەساڵی ١١٤٦ تیرۆرکراو دەوڵەتی ئەتابکیە دابەش بوو بە دوو دەوڵەتلە ناوچەکەدا .

یەکەمیان :- لە شاری حەلەب و ، دووەمیان :- لە شاری مووسڵ .. دەوڵەتی ئەتابکیە لە مووسڵ کەوتە ژێر دەسەڵاتی سەیفەدین غازی یەکەمی کوری عمادەدین و بەردەوام بوو لەدەسەڵاتەکەی تاکوو ساڵی ١٢٦٢ ... بەڵام دەوڵەتی ئەتابکیە لەحەلەب بەسەرکردایەتی کورەکەی نورەدین ... دوای ئەوە شاری دیمەشقیشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی و هەرێمی شامی گرتە خۆ و لەدوای مردنی لە ساڵی ١١٧٣ کورەکەی سالح ئیسماعیل جێگەی گرتەوە ، دوای ئەوە سەلاحەدینی ئەیوبی لە ١١٧٣/٨/١٣ خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی کە ئەو بنەماڵەیە دژی خاچەکان لە شەڕو پێك دادان و فراوانکردنی دەسەلات بەردەوام بوون لە هەرێم و ناوچەکاندا .

سەرچاوە :- ئەتلەسی مێژووی عەرەب وجیهان – ئامادەکردنی دکتۆ سەیفەدین کاتب- دار الشرق – بریروت – سووریا /٢٠٠٥

## ١١٣٠

١١٣٠/١٢/٤ سولتان مەحمودی محەمەد – مەلیك شا – کۆچی دوایی کرد ، کە لە دوای خۆی کوڕەکەی جێگەی گرتەوە ، کە لە هەمان کات ڕووبەڕووی مەسعوودی مامی بووەوە ، کە بووە هۆی بەرپابوونی شەری نێووان مامو برازا ، کە لە ئەنجام بەسەر مامی سەرکەووتو لە دەسەڵاتەکەی بەردەوام بوو.

## ١١٣٢



١١٣٢/١١/١٢ عمـــــادەدین زەنگی هێرشێکی سـەربازی کـردە سەر قەلای عەقرە وداگـیری کـرد و دەسـتی کـرد بەرووخانـدنی پەرژینەکـەی – دیـوار– بـە هـۆی ئـەوەی کـە دانیشتووانەکەی پشتگیریان لەخەلیفەی عەباسی ئەلمستەرشد بلای عەباسی دەکرد ... لەو کاتەی کەگەمارۆی شاری مووسڵی دا ، کە عیمادەدین زەنگی حووکمرانیـەتی پارێزگـای مووسـڵی ئێـستای دەکـرد ...و لـەو کاتـەی کـە سولتان حوسین ئەلولی کوری سولتان حەسـەن بـەگ – دەسـەلاتی ئیمارەتی بادینانی لە ١٥٣٤ گرتە دەست .

دوای ئـەوەی کـە ئیمـارەتی بادینـان بـەرەو بـەهێز بـوون هـەنگاوی دەنـا لەبوارەکانی ئاوەدانکردنەوەو ئابووری ، هەلسا بەنۆژەنکردنەوەی پەرژین – دیوار– ی رووخێندراوی قەلای عەقرە وئاوی لەهەمان شووێنی جێگەی بە دانیشتووانەکە گەیاند.

هەروا مێژووی نوێ کردنەوەی لە سەر دیوارەکان نووسی ... ئەویش لە سەر بەردێکی مەرمەڕ وەك تابلۆیەك ، کە ئێستا ئەو تابلۆیەش لەشاری لەندەنە بـەهۆی داگیرکردنـی لەجـەنگی یەکـەمی جیهـان ... کـە قـەلای عـەقرە

ژێرزەمینێکی تیایە کە تاکوو ئێستا نهێنیەکانی دیارنیە... دواى ئەوەش هێزەکانی سووپای عوسمانی بەسەرکردایەتی مستەفا رەشید پاشا هێرشیان کردە سەر عەقرەلە هەرێمەکەدا .

بەلام دانیشتووانی قەلای عەقرە بەرگریان لەقەلاکەیان کردووە... کە ئەویش بووە هۆی ئەوەی کەمستەفا رەشید دوو لوولە تۆپەکانی لە سەر گردی بواجە لە قەلاکەو کە تاکوو ئێستاش کە ناوزەند بووە بە – کری – تۆپا ، یاخوود – گردی تۆپەکان – لە باشووری کوردستان.

## ١١٣٥

١١٣٥/٣/٣٠ لە دایك بوونی فەیلەسوفی جوولەکەو زانای لاهووت لە ئایینی جوولەکە و پزیشك ودەرمانساز – موسا مەیمون – لە شاری قەرتبە لە ئەندەلووس ... ناوی تەواوی – ئەبوو عمران موسا بن مەیمون قرتبی – بوو. لە دوای کێشەی نێوان ئیسلام وجوولەکە ، موسا دەچێتە میسرو ماوەی ٣٠ سال لەو وولاتە جیٚ نشین دەبیٚ وکاری پزیشکی دەکات لەگەل دانانی کتابەکانی پزیشکی وفەلسەفیەکان ، لەگەڵ شیکردنەوەی کیتابی تەوراتی پیرۆزی جوولەکە ، تا ئەو کاتەی کە لە ١٢٠٤/١٢/١٣ کۆچی دوایی کرد لە وولاتی میسر .

## ١١٣٧



١١٣٧/٩/١٩ سەرکردەی کوردی موسلمان سەلاحەدینی ئەیوبی لە شاری – سەلاحەدین – تکریت – چاوی بەجیهان هەلهێناوە . ئەم شارەش مەلیکەکانی فارس دروستیان کردووە ، لەکۆنەوە لەسەر بەردی مەزن و کردوویانە بە کۆگای پێداویستیەکان و قەلاکەشی بۆ چاودێری کردنی

جمووجوڵی دووژمنان بووه.

هەروا لە کاتی دەسەڵاتی عومەری کوری خەتاب ، خەلیفەی ئیسلام دەستی بەسەردا گیراوە لەساڵی ٦٣٧ زایینیدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە سەلاحەدینی ئەیوبی لە بنەماڵەیەکی کوردە . لە هــۆزی – روادیــەو لەبنــەرەتا نیــشتەجێی شارۆچــکەی دوویــن – ە ، کە دەکەوێتــە کۆتــایی سـنووری ئازربایجــان لـەنزیك شــاری تــەبلیس لـە وولاتــی ئەرمینیا ... ئەم بنەماڵەیەش دەگەرێنەوە سەر بنەماڵەی ئەیوبی کوری شادی ... باوکی سەلاحەدین ، نەجمەدین ئەیوب و ، مامی ئەسەدەدین شێرکۆ ، کە بەرەو ئێراقی ئێستا کۆچیان کرد ، لە شامەوە بنەماڵەیەکی ئاسایی نەبوون ، بەڵکوو لەبنەماڵەیـەکی زاناو توانـادار بـوون لـەبواری هەڵسوورانی کاروباری رامیاری و ئیداری .

دوای گەیـشتنیان بـۆ وولاتـی نێـوان دوو زێـیٚ – میزۆبۆتامیـا – لـە سـەدەی شەشەمی کۆچی و نیشتەجێ بوونیان لە پارێزگای سەلاحەدین – تکریت – شادی باپیریـان تـوانی هەنـدێ کـاری ئیـداری لـە قـەڵای سـەلاحەدین بگرێتـە دەست ... کە دەرەبەگێکی بە هروزخادم بوو ، کە یـەکێك بـوو لـە ئـەمیرەکانی سولتانی سەلجووقی – محەمەد مەلکشا .

شـاری سـەلاحەدین دەکەوێتـە سـەر کـەناری دیجلـە بـەلای راسـتەوەو ، لـە باکووری شارۆچـکەی سـامەرا – یـە کـە رێگایـەکی سـەرەکی بـووە لـە نێـوان شـاری بەغـداو شـام ... کـە ئـەوکات زۆربـەی هـەرە زۆری دانیـشتووانەکەی لـە کوردن بـوون ... واتـە زیـاتر لـە ٨٥٪ دانیـشتووانی پارێزگـای تکریتـی ئێستا کوردبوونە نەك عەرەب لە پرێزگاکەدا .

ئەم بنەماڵەیە توانیان کاروبارەکانی دەووڵەت بگرنە دەست و لـەو کاتـەی کە شادی کۆچی دوایی دەکات ، نەجمـەدین جێگـەی دەگرێتـەوە ... سـەلاحەدین لەشاری تکریت لەدایك بووە ... ووشـەی تکریـت لـە بـە تـورك کردنـەوە هـاتوو لەو کاتەی کە دەووڵەتی عوسمانی ئەو ناوچەیەی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی ... کە پارێزگای سەلاحەدین و پارێزگای تکریتی پیٚ دەڵێن .

سەرچاوە :– سەلاحەدینی ئەیوبی – موسوعه الحروب الصلیبیه –
دانانی دکتۆر سلابی – چاپی یەکەم – بەیروت /٢٠٠٨

## ✍ ١١٣٨



١١٣٨/٢/١٠ سەركردەی كوردی موسلمان سەلاحەدینی ئەیووبی لە شاری سەلاحەدین- تكریت - چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .

شایانی باسە ناوی - تكریت - لەبەتوركردنەوە هاتیە ، لە دوای داگیركردنی شارەكە كە ناوی رەسەنی خۆی بەناوی سەلاحەدین ئەیووبیو بنەماڵەكەی بووە. كە دەكەوێتە باكووری شاری بەغدای پایتەختی ئێراق .

## ✍ ١١٤٩

١١٤٩/٥/١١ ئەبوو ئەلسەعادات مەجدەدین موبارك ئەبوو ئەلكەرمی جەزیری ، كە نازناوی بە - أبن أپیر- بەناوبانگە لەناوچەی جەزیرەی باشووری كوردستان چاوی بەجیهان هەلهێناوە ، كە بەجەزیرەی ئیبن عومەر ناوزەندە ... هەر لەوێ گەوورە بووەو دوایی چۆتە شاری مووسڵ ولە لای - محەمەد سەعیدی كوری موبارەك - ی خووێندوە و گوێی لەفەرموودەكانی پێغەمبەر- د.خ- گرتووە و بۆتە دۆستی ئەمیر موجاهیدەدین قایماز لە شارەكەدا .

دوای ئەویش بۆتە هەڤالی نورەدین ئەرسەلانی كوری ... ئەم كەسایەتیە بەناوبانگە رووناكبیرو رۆشەنبیرو فەیلەسوفە ، لەماوەی ژیانی چەندین بەرهەمی هەبووە لەوانە - جامع الاصول ، النهایە فی غریب الاحادیپ ، الانعاف فی تفسیر القرآن ، البدیع فی فن الكتابە ، دیوان الرسائل ، كتاب شافی ، المصگفی المختار فی الادعیە والافكار - ئەم مرۆڤە میوانگەیەكی لەدەووری شاری مووسڵ دروست كردبوو ، كەخەلك زۆر رووی تێ دەكرد وبەردەوام بوو لە نووسینە هەمەلایەنەكانی ، تاكوو لە ١٢٠٩/٧/٦ كۆچی دوایی دەكات و هەرلەوجێگایە تەرمەكەی بەخاك دەسپێردرێت .

شایانی باسە ، بە پێی نووسراوە مێژوویەکان وا دەردەکەوێت کە ئیبن ئەسیر مرۆڤێکی کوردبووەو هەر بەم بۆنەیە بۆتە وەزیر لەلایەن ئەخزەلی نەوەی سەلاحەدینی ئەیوبی و، لەهەمان کات جەزیرەی ئیبن عومەر کە ئەو ناوی تەواوی عومەری کوری عبدالعزیز بووە و ، هەرئەویش ئاوەدانی کردۆتەوە ، کەناوی ئەو گوندە – مەرعەقید– ی پێگووتراوە و ، دوای ئەوە ناوزەند کراوە بەجەزیرە لەکێشووەرەکەدا .

سەرچاوە :–شەرەفنامە – ل/١٧٠ .

## ١١٤٦



پەردی ئاسنین لە مووسل

١١٤٦/٩/١٤ دورســـــتکردنی پردی ئاسنین لە سەر زێی دیجلە لە شـاری مووسـل ، کە ناوزەند بوو بە نـاوی پـردی شانـشین غـازی ، کە بەناوبانگترین دەرگایە ، کە بووە هۆی بەستنەوەی رۆژهەلاتی شاری موسل بە رۆژئاوای شاری موسلو رۆلی کاریگەری هەبوو لەهەموو بووارە جیاجیاکاندا .

ئەو پردەش لەلایەن شانشین سەیفەدین غازی دورستکراوە...شایانی باسە رۆژهـەلاتی مووسـڵ دانیـشتووانی کـوردو ئـارامی و ئاشـووری و کـوردە ئێزیدیەکان بووەو ، کاتی خۆی عەرەب رووی لە رۆژئاواو باشووری مووسڵ کردووە بەرەو ناوشارو دەووروبەری رۆژئاواو باشووری هاتوون ، لەرێگەی فتووحـاتی ئیـسلامی داگیر کـراوەو . دوای ئەوە پەرەی سەندووە بەپێی قۆناخە جیاجیاکان کە تاکوو لە سالی ١٩١٩ دانیشتووانی رەسەنی کورد لەشاری مووسڵ لە ٨٥٪ بووە بەلام ئێستا ...؟...!.

## ١١٤٩

١١٤٩/٥/١١ دورستکردنی مزگەوتی – عەتیق– لە شاری مووسڵ لەلایەن سەیفەدین غازی یەکەمی کوڕی عیمادەدین زەنکی و ئەتابکیۆنەکان کە گرنگی زۆریان بەو مزگەووتەدا ، بە جوانکاری هونەری و تاکوو ئێستاش ئەو مزگەووتە ماووەو مەراسیمەکانی ئایینی ئیسلامی لێ ئەنجام دەدرێ لە شارەکەدا .

## ١١٥٢

١١٥٢/٤/٨ تورکمانە کۆچکردووەکان روو لە کوردستان دەکەن ، لە دوای سەرکەووتنی دەووڵەتی سەرلجوقی بە سەر ئیمارەتەکانی کورد لە کوردستان بە تایبەتی لە هەرێمی باشووری کوردستان ، ئەویش بەداگیرکردنی گوندوشارۆچکە وشارەکان ... کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە دانیشتووانی کورد لە شووێنەکانی خۆیان رەو بەرەو شاخەکانی کوردستان بکەن ، نەك هەر لەکوردستان .

بەلکوو لەزۆربەی زۆری شارەکانی دیکەی ئێستای ئێراق ئەویش بە بەتالان بردنی مولك و سامان ومەڕومالآت ودانەوێلە وگۆرینی ناوچەوگوندوشارۆچکە ، لە ناوی کوردی بۆ ناوی تورکمان ، کە ئێستاش لەهەندێ شووێن ناوی تورکمان لەسەر گوندوناوچە وشارۆچکە بەدەردەکەوێت.

کە ئەمەش پیشەی تۆرانیەکان بووە ، وەك عەرەب لەدوای داگیرکردن ودەست بەسەرداگرتنی ناوچە وگوندوشارۆچکەو شارەکان ، لەرێگەی فتووحاتی ئیسلامی و، هەڵسانیان بەگۆرینی ناوی کوردی بۆ ناوی سەرکردەو شێخەکان وتیرەکانیان ، لەسەر خاکی ئێراق و، بەتایبەتی لە رۆژئاواو باشووری کوردستان.

بەلآم لە دوای هەرەس هێنانی دەووڵەتی سەلجوقی لەم رۆژەدا بەنەمانی دەووڵەتێکی ناوەندی بەهێز تەنیا ئەو ئیماراتانە نەبێت ... کە ئەمەش بووە هۆی دروست بوونی بۆشایەکی بەرفراوانی بەتۆڵەوە وەرگرتەوە لەلایەن گەلی کوردستان ، کە لە ١١٨٦ شۆڕشێکی بەرفراوانیان بەرامبەر تورکمانە داگیرکەرەکان وهاوردەکان بەرپاکرد ، لە وولآتی جەزیرەو ، مووسڵ

ودیاربـەكرو ، خـەلات و، شـارەزوور و ، ئازربایجـان و ، شـام . بەكووشـتن و راوودوونانیان لە هەرێم و ناوچەكەدا .
كـە ئەمـەش چـەندین سـاڵی خایانـد بـەگرتنی رێگـە لێیـان وگێرانـەوەی ئـەو مـەروماڵات وسامانانەی كە بـەتالانیات برد بوو... بـە دەركردنیان لەزۆربـەی زۆری ناوچە جیاجیاكانی كوردستان بەگێرانەوەی بۆ ژێر دەسەلاتی كـورد لـە هەرێم و ناوچەكاندا .
ئەم شۆڕشە لە مەلبەندی شارەكانی ، كە كەوتبوونـە رۆژهـەلاتی زێیـی دیجلـە وباكووری چیای حەمرین ، لە كاتی خۆی كە دەوڵەتی عەباسی بـە سـەری دا زاڵ ببـوو لـە شـاری بەغـدا ... كۆتـایی هـاتنی ئـەم شۆڕشـە كێشەوگرفتەكانی نێـوان كـوردو توركمـان لەلایـەن وەزیـری دەووڵـەتی ئەتابكیـە – موجاهـدین قیمان – بوو لە شـاری مووسڵ ، كـە پیاوێكی خاوەن كەسایەتیەكی لێهاتوو بـوو . ئـەویش بەكۆكردنـەوەی سـەرۆك هـۆزو تیرەكـانی كـوردو توركمـان ، لـە ئەنجامی رێكـەووتن لەسـەر كۆتـایی هێنـان بـەم كێشە وگرفتانـە بەگێرانـەوەی مافی كوردو ماوەدان بەنیشتەجێ بوونـی توركمان.
كـە ئەمـەش زیـانێكی گـەووره بـوو لـەكورد درا ، لـەو كاتـەداو كاردانـەوەی كاریگەری خۆی نواند تاكوو ئێستاش لەسـەر باری نەتـەوەیی و نیشتمانی گەلی كوردستان ... لەو بارودۆخەدا سەلاحەدینی ئەیوبی هەلوویستی دیار نـەبوو بەرامبـەر بـەتوركمان و بـەرگری كـردن لـە كـورد وخـاكی كوردسـتان لـە هەرێمەكەدا .

## ١١٥٣

١١٥٣/٣/٢٧ لـە كتـابی پـیرۆزی ئاڤێـستەدا كێـووی – سـیلان – بـە كێـووی هۆكینریـە ناسـراوە و ، بـە ووتـەی مامۆسـتا حەمـەدوللای مستەوفی قـەزوینی كێـوی – سـولان – یـان – سـیلان – ە و لـە ئازربایجـانیش لای ئێرانیـەكان لـە شـووێنی توورسـینای ئیسرائیلیەكانی خاقانی شێروانی شـاعیری گـەوورەی سـەدەی ١٢٠٣ ئەو كێووەی ناوزەندكردووە و بە قیبلەی زەردەشتیەكانی داناوە .
هەروا یاقووتی لە – معجم البلدان – دا باسیكردووە و دەڵێ :–
سیلان شـاخێكی گەوورەیـەو دەڕوانێـت بەسـەر شـاری – ئـەردەبیل – كـە لـە خاكی ئازربایجاندایە ... لەم شاخەدا چەند گۆڕێك هەیە كە شووێنی ئەولیاو



پیاو چاکانه که شووێنێکی بەرزو پیرۆزە .
جێگـەی ئامـاژە پێکـردن و ڕوونکردنەوەیـە ، کـە حەمـەدوللای مـستەوفی قەزوینی لە – نزهە القلوب – کە لە ساڵی ١٣٣٩ نووسیوویەتی و دەڵێ :–
کێوی سیلان لـە ئازەربایجاندایەو شاخێکی بەناوبانگەو وولاتی – ئەردەبێل – و سەراو – و پێشکین – و ئاباد – و – ئاراچاك – و – خیاو – لە بەردەم ئەم کێووە سەخت و بڵندانە ، کە لە دووری ٥٠ کیلۆمەترەوە دەبینرێت ، هەروا لووتکەی شاخەکەش هەرگیز بەفری لێ نابرێ ، هەروا کانیاوی ساردی بێ وێنەی تیایە ، کـە لـە زۆرینـەی ساڵدا ئاوەکانیـان دەبێتـە شـەختەو ، شووێنی حەوانەوەی نامۆکانە .
هەروا زەکەریا محەمەد قەزوینی ، کە لە سالی ١٢٠٣ لە قەزوین لەدایك بووە و لە ١٢٨٣/٤/١ لە شارۆچکەی بەغدای وولاتی نێوان دوو زێێ کۆچی دوایی کردووە ، کە لە کتێبی – اپار البلاد و اخبار العباد – دا دەڵێ:–
زەردەشت لـە ئازربایجـان ژیـاوەو لـەناو مرۆڤدا گۆشـەگیربووە لـە کێـووی – سیلان – خواپەرستی کردووە و کتێبی بەناوی – بستا – ئاوێستا – داناوە .
هەروا شەهرستانی ، کە لە سالی ١١٥٣ کۆچی دوایی کردووە ، لە کتێبی – الملك و النحل – دا لە دایك بوونی گیانی زەردەشت دەباتەوە بۆ کێووێك لە ئازربایجـان ، هەرچـەند نـاوی کێـووی نـەهێناوە ، بـەلام وادیـارە کـە هـەمان کێووی سیلان بێت ، کە بەرزترین کێووی ئازربایجانە .
لە وەرگێرانی فارسی – ملك و نحل – کە بە یارمەتی – ئەمزەلەدین سەدر – دوور خـراوە بـۆ ئەسـفەهان لـە کۆتـایی سـەدەی پانزەمـدا . بـە ئـەنجام

گەیشتووه و دەڵێت :-
خواوەند گیانی زەردەشتی لەسەر درەختێکی بەرز لەنگەر پێگرت لە بەرزای
کێوێك کە لە کێووەکانی ئازربایجان و ، فەرمانیدا درەختەکە سەوز بێت
سـێبەری - زەردەشـت - یـش تێکـەڵ بـە شـیری مانگـابوو و لـەناو
جووڵاوەتەوە ، ئەوسا باوکی زەردەشت ئەشیرەی کردۆتە خۆراك و نوتفی ئا
لە رەحمی دایکیا سووراوەتەوە و بووەتە پارچەیەك گۆشتی برژاو ، با
جۆرە کاتێك لە دایکبوو بە پێکەنین و ئاوازی خۆشی دنیای هەژاند
ئەوانەی لەوێ بوون گوێیان لێبوو .
هـەروا میرخوانـد لـە - رەوزەی سـەفا - لـە باسـی فەرمانڕەوایـەتی
گوشتاسب - دەڵێ :-
لە مێـژووی - بنـاکتی - و فەرهـەنگی نووسـراودا هـاتووە ، کـە زەردەش
حەکیمی رۆژگارێکی دیارو دەرکەوتووە ، ئەو کاتەی کە زردەشت لە دایك بو
خەندە لەسەر لێوی بوو ، جیا لە هەموو منداڵێکی لە دایك بوو ، هەروا ڕوو
لە تـەواوی ئامادە بووان بوو و دانیشتووانەکەش هەستی بەو ئاوازەی یـ
دەنگی خەندەی کردووە ، کە چۆن و بە چ شێووەیەك دەنگەکە گەوورە بوو
بەرزبۆتەوە بە شاخێك لە شاخەکانی - ئەردەبیل - دا و رۆیشتووە .
هـەروا پـەرتوکێکیش لـە ڕێگـەی کێووەکـە و بنمیـچی خانووەکـەوە هاتۆتە
خـوارەوە بۆ نـاو دەسـتی یـەکێکی دیکـە لـەو چیرۆکانەی گەیـشتووەو ئـە
دەڵێ:-
ئاشـتی بە مانـای پشکۆی ئـاگرە زەردەشـت دەسـتی داوەتـێ ، بـەڵام دەسـ
نەسووتاندووە ، لـە ئاوێـستاو پەرتووکـەکانی پەهەلەویـشدا ئەوەی لە ناو
ئـەو کێووەدا دیـارە ووشـەی - سوولان - یـان ووشـەی دی ، کـە ئـەو ناو
لێوەرگیرابێت نەبینراوە ، لەوانەیە لە پشت ئەو ناوەشەوە ناوی دیکە هەبێ
... هەروا لـەو کێووەشدا زەردەشت بەپێی نووسراوەکان لەساڵی خۆشیی
گـوڵ و گـوڵزاردا حـەوت نامـەی لەگـەڵ حـەوت - ئامـشەسپەند - ە کـا
هاورێکانیدا گۆڕیووەتەوە .
لە یەکەمیاندا تووانیوویەتی پرسیار لە ئاهورامزدا بکات لە ڕۆژی ڕووبا
- دانیتی - ، لە دووەمیاندا لەگـەڵ - وهومن - لـە کێـووی - هـۆکر - و
ئـاو ، سـێیەم لەگـەڵ - ئارتـا - ئارتـاو هیـشتا - ئاردیبەهـشت - ی ئا

ڕۆیشتووی بەردەوام ، چوارەم لەگەڵ – شتویەر – شەهریوور – ی میوانی خانووی لادێ ، پێنجەم لەگەڵ – سپەندارمەد – لەکانی گەورە کە لە کێووی ئەسنوون دەردەچێت ، شەشەم لەگەڵ – خورداد – لەکێووی – ئەسنوون – ، حەوتەم لەگەڵ – ئەمرداد – لەخاکی ڕۆخی – دانیتی – کێووەکانی – هۆگر – و پڕ لە ئاو گوڵ و ڕێحان ، کە دوو لووتکەن بەیەکەوە لە دایك ئەبن ، کە – سیلان – یان پێك هێناوە .

ئەو دوو لووتکەیەش لە بەرزترین کێووەکانی نزیك شاری – تەورێزن – کە بە شێووەی دوو کەللە شەکر جوودای تەنیشت یەکتری دەبینرێت .

ئەم بۆچوونە لە پەرتووکەکانی دیکەی پەهلەویشدا خۆی سەلماندووە ، کە لە – بندهش – داهاتووە :–

هەموو ئاوەکان لە کانی – ئاردەویسوور – ی ئاناهیت – عەشتار – کە کانی پڕ ئاوی سازگاری خۆر ئاوایە بەرچاو دەکەوێت ، لە ڕێگادا سەد هەزار جۆگەلی زێرینی ئامادەکراو لەگەڵ ئاوی گەرم ، لەو جۆلانەوە بەردەوام بە دامێنی کێووە بەرزەکە دەڕۆن و لە لووتکەکەیدا کۆدەبنەوە ، لەگەڵ لووتکەی ئەو کێووەدا گۆلاون – ئۆردوییس – هەیە کە ئاوەکان دەرژێنە ناوی و لەوێووە بە جۆگەلەی زێرینی دیکە ئاوەکان بەرەو دەرەوە دەڕۆن لە بەرزایەکی بەرامبەر هەزار کەس بەرز ئاوەکان پەیووەستدەبن بە کێووی – ئائووسین – و دوایش بە دەریا دەگەن .

لێرەدا گرنگترین دیاردەکانی کێووی – سیلان – کە یەکێکە لە کێووەکانی – هۆگر – بوونی گولاوێکە لە لووتکەکەیدا لەگەڵ بوونی کانییەکی گرنگی ئاوی گەرمی کانزایی ، کە لە دامێنی کێووەکەدایەو بەرزی لووتکەکەی ٤٨٥٠ مەترە و ، سیلان گولاوێکی بەرێژەی گەورەو جوانەو خاوەنی ئاوی سازگاری بێ ئەندازە ساردە ، لە دەووروبەری ئەو گولاوە کۆلەکەی بەفر بە شێووەی چرایەو ئاوی لێ دەچۆڕێ و جوانی ڕووی ئەو گولاوە دەردەخات

تێبینی :–

ئەمە تەنیا کورتەیەك بوو لە مێژووی چیای سیلان ، دەتووانی بگەڕێیتەوە سەر کتێبی – جواد مفرد کهلان گزارش زادگاری زرتشت و تاریخ ئەساتیر ئیران – چاپی یەکەم / ١٣٧٥ ، لاپەرە /٧١–٧٦ ... هەروا لە ناوەڕۆکی مێژوونامەکە باس لە چۆنیەتی بوونی زەردەشت و ئاگری نەورۆز و بوونی

کوردایەتی زەردەشت لە مێژوودا .

## ١١٥٤

١١٥٤/٣/١٨ ســـــەرکردەی مەگۆلـــەکان جـــەنگیزخان لەدوورگـــەی بیابانی مەنگۆلیا لە دایك بووە . کـە بـاوکی نـاوی بەسـووکە بـووە و دایکـی نـاوی ئـاولون بـووە... هـەروا پێـك هاتـەی تیرەکـەی ، واتـە – عەشـیرەت – ی دەگەڕێتەوە بۆ سەر تیرەی – تـايگوت –. لەوکاتـــەی کـــە جـــەنگیزخان تەمـــەنی پـانزە سالان بوو بەربەرەکانی هەردوو تیرەی تـایگوت ونیرۆنـی کـرد ، کە هەردوو تیرەکەی دەگەڕاوە سەر تیرەکانی باوکی لە ناوچەکەدا .




واتە دوو بنەماڵە لەو ناوچەیە دا ... دوای ئەوەی کە تەمەنی جەنگیز خان گەیـشتە ٤٠ سـالی و لەسـالی ١١٩٣ تیرەکـانی ناوچـەکە یـەکیان گـرت بـۆ لـەناوبردنی وجـەنگیزخانیش چـەند هـەزار کەسـێکی لـەخۆی کـۆکردەوە لـە پێناوبـەرگری کـردن لـەخۆی ودژایـەتی کردنـی ئەوتیرانـە ، لـە ئـەنجام شـەڕ لەنێوانانیانـدا هەلگیرسـاو ، لـە ئاکامـدا جـەنگیزخان تـوانی سـەرکەووتن بەدەسـت بێنـیٚ و هێـزی چـەکداری وولایـەنگیری بـۆ خـۆی دروسـت بکـات لەهەموو بوارەکانی دەسەلاَتداریدا لەناوچەکەو بەرفراوان بوون بەرەو هـەرێم و ناوچەو جیهان.

سەرچاوە :– شەرەفنامە ل/٨٢ – ٨٣ .

## ١١٥٥

١١٥٥/٣/٧ لـۆری بـچووك خـاوەن سـەرکردەیەکی راسـتەوخۆی خۆیـان نەبوونـەو لـە ژێـر فەرمانرەوایی والی وویلایەتی بەغدا بوون .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە نـاوی لۆری بە سـەر ئـەو کوردانـەدا سـەپێنراوە

کە وەختی خۆی لە – کول – ی فانرود ژیاون و لە دواییدا لەبەر زاوزێی زۆر نەوە جێگەیان بەرتەنگ بووەو دەستە بەدەستە وتیرەبەتیرەیان لێ جیابۆتەوەو هەرلایە رووی کردۆتە لایەکەوە ... هەر کۆمەلێکیان لەهەر جێگایەك دەگیرسانەوە ، کە ناوەکەیان دەکرد بەناونیشان و بەوە دەناسران کە لە ناوچەی لۆرستان پەرت وبلاوەیان لێدەکرد...وەك :–

هۆزی جەنگەرۆیی و ئۆتری ... ئەو تیرە لۆرانەی کە بە بنچینە نەچنەوە سەر کۆنە دانیشتووانی – کول – لۆری تەواو و رەسەن وبێ گەردنین وەك هۆزەکانی:– کرۆسکی – لێنکی – رۆژبیانی – ساکی – شادلویی – داروعەیانی – مەحەمەد کەماری – کە بە لۆری رەسەن دانانادرێن وزرە لۆرن ... بەلام هۆزی جەنگیرویی کەفەرمانرەواکانی لۆری بچووك لەوانن ... لە لۆرە رەسەنەکانن ودەچنەوە سەر تیرەی شەلیۆری .

هەروا تیرە لۆریەکانی – کارانە ، زەرەنگەر ، فەزلی ، ستوەند ، ئالانی ، کاهکاهی ، دەخوارکی ، دری ، برارەند ، مانگرەدار ، ئەتارکی ، بولعەبباسی ، عەلی ماماس ، کێجایی ، سلکی ، خودەکی ،نەدرۆیی – گەلێك هۆزوتیرەی دیکەش لەو لۆرە رەسەنانەن ... بەلام هۆزەکانی :– سامی ، ئەسپان ، سەهی ، ئەرکی – ئەگرەچی بەشێوەی لۆریشدا داخێون لۆرنین وتەنیا هەرئەوەندەیە کەبۆرە پیاوێك ورەمەکی بوون ولەگوندەکانیان دا بەمسکێنی دامەزراون.

دوای ئەوەش لۆرستان خرایەوە سەر شاری بەغدا ... حوسامەدین شوهلی کە لە تورکەکانی ئەفشارو سەربەسەلجوقیەکان بوو ، کرایە فەرمانرەوایی لۆرستان وهەندێ ناوچە لەخۆزستان.

سەرچاوە :– شەرەفنامە ل/ ٨٢ – ٨٣ .

**١١٦٥**

١١٦٥/١١/ کۆچی دوایی متەسەوف کوردی بە ناوبانگ ، ئەبوو ماجدی کوردی ، کە لە چیای حەمرین ژیاوە وچیای حەمرین بەسنووری خاکی کورد دێت.

جێگەی باسکردنە کەدروستکردنی قوبە لەسەر گۆری زانای کورد – مەحەمەد عەلی کوردی – لەچیای حەمرین لەخالی رێگای سەرەکی لە رۆژئاوای باکووری شارەبان ، ئەمەش لە سەرداوای خۆی بووە . کە سنووری

نێوان کوردستان وئێراقی بەزۆر دروست کراوبووە .
مەبەستیش لەوگۆڕە بوونی هێمایەکی سنووریە ، بەلام بەعسیەکان لەکاتی دەسـەلاتی عەبدوالکـەریم قاسـم ئـەو گۆڕەیـان شـوێن بـزر کـردووەو دووبـارە گۆڕەکـە نۆژەن کرایـەوە و ، بـەڵام دووبـارە لەلایـەن رژێمـەی بـەعس ، عەرەبە داگیرکـەرەکان هـەڵیان وەشاندەوە ... ئـەم کەسـایەتیەش زانایەکی بـەناوبانگ بووەوچەندین دانراوی بەهێزی هەبووە .

سەرچاوە :– حدود کوردستان الجنوبیه تاریخاً و جغرافیاً . عەبدولرەقیب یوسف . چاپی دووەم .



١١٦٥/١١/٧ لەوکاتـەی نووسـەر و رووناکبیر – ئـیبن ئەلـشێخ – سـەردانی شاری ئەسکەندەریەی میـسر دەکـات و لـە بەشـی دووەمـی کتێبەکەیدا بەناوی – ئـەلف بـێ – باسـێکی تێروو تەسـەل لەسـەر منـارەی ئەسـکەندەریە دەنووسـێ و باسـی دەکات .

جێگـەی روونکردنەوەیـە کـە مێـژووی دروسـتکردنی منـارەی ئەسـکەندریەی ئێستای وولاتـی میسر دەگەرێتـەوە بـۆ ٢٨٠ سـاڵ بـەر لـە مێـژووی زایـنی لـ شـارەکەدا ... مەبەسـتیش لـە دروسـتکردنی ئـەو منارەیـە بـۆ رێ نیشـاندان و رێنمـایی کردنـی دەریاوانـەکان بـووە لـە ناوچـەکەدا ، لـە کـەنارە نزمـەکا یاخوود نەویەکانی میسردا .
ئەمـەش لـە رێگـەی ئـەو ئـاگرەی کـە لـە بنەکـەی منارەکـەدا بـە بـەردەوام داگیرسـابوو ... ئـەو رووناکیـەش دەووروبـەری روونـاك دەکـردەوە بـەهۆ

چەندین ئاوێنەی – مسین – کە رووناکیەکە تیشکی دەدایەوە بە ئاراستەی ناوچەکانی دەووروو بەری منارەکەدا .

ئەم منارەیەش لە سەردەمی دەسەڵاتی – بەتلیمۆسی یەکەم – دروستکراوە و لە سەردەمی بەتلیمۆسی دووەمیش دروستکردنی تەواو کرد ... کە لەلایەن – سۆستراتۆس – ی تەلارساز و ئەندازیاری گریکی نەخشەسازیەکەی بۆ کراوە ، دروستکردنی منارەی ئەسکەندەریە لە بەردی کلس – قسل – بە ئەنجام گەیاندراوە و هەرچی ئەستوونەکانی هەبووە لەبەردی گرانێت دروستکراون .. هەندێ لە رووگەی منارەکە بە بەردی مەرمەڕ و برۆنس رازابووەوە .

هەروا جوانکاریەکانی دیکەشی بە قوورقووشم و بۆیە رووپۆش کرابوون لەسەر پردۆکەی شووشەیی دا . ئەو پردۆکانەش لەسەر پشتی قرژاڵی دەریای بوون ... منارەی ئەسکەندەریە لە چوار نهۆم پێکهاتبوو کە بەرزیەکەشی لە نێوان ١٢٠ – ١٣٥ مەتر بووە ... کە یەکەم نهۆمی بەرزیەکەی ٦٠ مەتر بووە ... هەروا شێوەو چوارگۆشەییەکەی و چەندین پەنجەرەی لەخۆ دەگرت .

هەروا لە نهۆمی یەکەم نزیکەی ٣٠٠ ژووی تیابووە و تەرخان کرابوون بۆ نیشتەجێ بوونی کرێکارانی منارەکە و خانەوادەکانیان و ئەمبارکردنی کەرەستە و ئامرازە تایبەتیەکانی پەیوەست بە منارەکەدا ... منارەی شاری ئەسکەنەریە لە دووری ٧٠ میل لەناو دەریا دەدیترا .

گرنگترین لەوەش لە لووتکەی منارەکەدا چەندین ئاوێنەی زەبەلاح هەبووە کە تیشکیان دەشەکایەوە ، ئەمەش وای دەکرد کە ئەو پاپۆرو کەشتیانەی لە دوورەوە دەهاتن بەرەو منارەکە ببینرێن ، لەکاتێکدا بە چاوی ئاسایی نەدەبینران و ئەو ئاوێنانەش لە دووربینی گەورەکەر دەچوون ، وا مەزەندە دەکرێت کە زانایانی شاری ئەسکەندەریە لەو گاڤەدا ئاوێنەیان دروستکردبێت .

هەروا لە ساڵی ٧٠٠ زاینی ئەو فانۆسە کەوت و ئاوێنەکەش تێکشکا بەمەش لەوکاتەوە منارەکە لە ئەرکە بنەرەتیەکانی خۆیدا داماڵدرا .

بەر لەوەی منارەی شاری ئەسکەندەریە بەر بوومەلەرزە بکەوێت و بە

تەواوەتی بوومەلەرزەکە ، لەسەدەی چواردەمی زاینی وێران و نگرۆی بکات
مەسعوودی مێـژوو نـووس باسـێکی ووردی دەکات و بـەرزی منارەکـەش بـا
نزیکەی ٢٣٠ باڵ خەملاندووە .
هەروا لـە ساڵی ١٣٠٣ لـە سـەردەمی – ئەلناسـەر محەمـەد قەلاوون – بووما
لەرزەیـەکی دیکـە روودەدات و قـەڵا و پـەرژینی ئەسـکەندەریە وێـران دەکات
مێژوو نووس و رووناکبیر – مەکریزی – باس لـەو وێرانکاریـە دەکات ، ووتا
لـە سـەر ئـەوە دەکات ، کـە لـە سـاڵی ٧٠٣ زایـنی – کۆبیبرس ئەلجەنشکیر -
منارەکەی نۆژەنی کردۆتەوە .
هەروا نووسەرو مێژوو نووس و گەڕیدەی ناوداری عەرەبی – ئیبن بەتووتە -
لـە ساڵی ١٣٠٥ بۆ جاری دووەم سەردانی شاری ئەسـکەندەریە دەکات ، لـا
دوای بوومەلەرزەکـە ، بـە نیـوو سـەدە بـەم شـێووەیە بـاس لـە منـارەی
ئەسکەندەریە دەکات :–
کـە رۆیـشتم منارەکـەم بـینی ، وێرانکـاری بـاڵی بەسـەردا کێـشرا بـوو
بەشـێووەیەك نـەدەکرا بچیتە ژوورەکانی ، نـەدەتوانرا سـەر بۆ سـەرەوە بـەرز
بکەیتـەوە ... دوای ئـەوە سـولتان ئەشـەرف قایتبـای سـەردانی ئەسـکەندەریا
دەکـات و فـەرمان دەدات کـە لەسـەر دارو بـەردی منارەکـە قەڵایـەك دروسـت
بکەنەوە .
ئەمەش لەکاتی شاڵاوەکانی توورکە عوسمانیەکان بوو بۆ سەر وولاتـی میسر
، هەروا بە کردەنیش لە ساڵی ١٤٨٠ ئەم قەڵایە دروست دەکاتەوە . بەڵام وەك
منارەکـە و بەشـێووازێکی دیکـە ، کـە بـەتاوەری قایتبـا ناسـرا ، کـە تـاکوو
ئەمرۆش هەر ماوە لە وولاتەکەدا .

## ١١٦٨

١١٦٨/١٠/٥ دامەزرانـدنی ئیمـارەتی کـوردی بـەناوی – ئیمـارەتی جـەلائیری – لـە شـاری
کەرکوك لەلایەن – بابا ئەردەلان – کـە دەگەڕێتـەوە بۆ پشتی – مامولی – ی
سەر بەهۆزی گۆڕان – کە هۆزێکی گەوورەی کوردەو لەکوردستان نیشتەجێز
، لە باکوورو باشوورو رۆژهەڵات و رۆژئاوای ئێستای کوردستان .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە لە ئینسکۆپیدیای تورکی ، بەزمانی تورکی هاتووە ، کە لە شاری ئەنکەرە لە ساڵی ١٩٧٢ بە چاپگەیاندراوەو لە بەشی ٢٠/ ی ئەم کتابەدا هاتووە ... کە تەیموری لەنگ لە ساڵی ١٤٠٣ پەلاماری ئەو شارەی داوەو بەتەواوی وێرانی کردووە ، هەتا بەشارۆچکەو گوندەکانی لەگەڵ شاری – تاووخ – کە مەڵبەندی بووە ... لەکاتی دەسەڵاتی ئەحمەد جەلائیری کوردی ... کە ئەوکاتیش کەرکوك و ناوچەکەی کەجێگەی کانیاوەکانی نەوت بووەو هەڵکەوتەکەی وایکردووە ، لە هەموو قۆناخە یەك لەدوای یەکەکانی پەلاماربدرێت بەهۆی بوونی بە شارێکی کوردی و بوونی بەخاکی کوردستان .

## ١١٦٩

١١٦٩/١/٢ یوسف سەلاحەدین کوڕی برای نەجمەدین ئەیووب دەسەڵاتی گرتە دەست ، کە ئەمەش لە دوای کووشتنی شێرکۆ بوو.

## ١١٧١

١١٧١/٩/٤ دامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبی ... لە سەر دەستی سەلاحەدینی ئەیوبی ، لە هەرێمەکانی شام و وولاتی نێوان دوو زێیٚ – میزۆبۆتامیا – ئەویش بەهۆی هەرەشەکانی خاچەکان لەو هەرێمانەو ناوچەکانیدیکە بەتایبەتی لە پێناو داگیرکردنی شاری قوودس لە فەلەستین .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە هێرشەکانی مەگۆلی تەتەر بۆ ئەم هەرێمانەو کوردستان ، لە دوای رووخاندنی دەوڵەتی عەباسی لە ١٢٥٦/١/٨دا ، کە کوردستانیش یەکێك بوو لە ناوچە داگیرکراوەکان لەلایەن مەگۆلەکان لە هەرێمەکەدا .




ئــەویش بــووە هۆکــاری وێرانکردنــی گونــد و شارۆچــکە و شــارەکان کاردانەوی لە سەر باری کوردو بە کۆچکردنی بەرەو هەرێمەکانی شام وەا :- سووریای ئێستاو فەلە ستینیش و ، هەروا وولاتی میسر..کۆچبەرانم کوردیش لە پیاوانی زاناو رووناکبیرو پیاوانی ئاینی بوون .

کورد لەو کاتدا رۆڵی باڵایان هەبوو لە بنیاتنانی شارستانیەتی ئیسلامی عەرەب زیاتر ، لە بنیاتنانی شارستانیەتی کورد لە کوردستان و گرنگی دا بەئیسلام وخوودی کورد خۆی .

هەروا هێرشەکانی مەگۆل بۆ سەر کوردستان و ، بەتایبەتی بۆ ناوچە؛ شــارەزوور لـــە ١٢٤٤/٦/٩ ، کــە بەهــەمان شــێووە و کاردانــەوەی لەســە کەسایەتیەکانی کورد کرد ، بۆ کۆچکردن بەرەو شام و وولاتی میسر ک ژمارەیان لە ٣٠٠٠ کەس تێدەپەری ، لەگەڵ خێزانەکان لە هەرێمەکەدا .

لەگەڵ گەیشتنی ئەو کۆمەلە کەسایەتیەی کورد بۆشاری دیمەشقی ئێستا؛ سووریا ، شانشین ناسر پێشوازی لیکردن و لە سووپاکەی دایمەزراندن ، ل پێنــاو بە هێزکردنــی هێزەکــانی خــۆی بــە ســەرکردایەتی ئــەمیر بەهائــەدی یەعقوب شارەزووری لەساڵی ١٣٠٦ ، دوای ئەوە لە شەڕی - عێن جالوب

رۆڵـی باڵایـان بینـی و سـەرکەووتنیان بەسـەر مەگۆلـەکان بەدەسـت هێنـا ... لەگەڵ ئەو کۆچکردنەدا بابیریە و للوسبەکانی کوردیش کۆچیان کردبوو بۆ هەرێمی شام.

سەرچاوە:- ئیبن خەلەکان - وفیات والاعیان .

## ١١٧٣

١١٧٣/٨/١٣ دەووڵەتی زەنکیەکان توانیان خۆیان بەهێزبکەن لە هەرێمی شام و پایتەختی دەسەڵاتەکەشیان شاری حەلەب بوو .... ئەم دەسەڵاتە رۆڵی باڵای هەبوو لەبەربەرەکانی کردنی هێرشەکانی خاچەکان ... بەڵام بنەماڵەی ئەیوب و شێرکۆی کوردی ، کە نزیکترین کەسی بوون لە بنەماڵەی لاب زەنکی ... نورەدین شێرکۆ کە دادوەری شاری حمس بوو رەوانەی میسر کرا لە پێناو رێکخستنی کاروبارەکانی و رێگە گرتن لەخاچەکان - هێزی چەکداری مەسیحیەکان - بە وەرگرتنی دەسەڵات لەسەر میسردا .

بەڵام لەدوای مردنی شێرکۆ کورەکەی سەلاحەدین کە سەرکردەی سووپا بوو توانی بەشێوەیەکی لێهاتوانە کارەکان رێک خات و دەووڵەتی فاتمی هەڵووەشێنێتەوە و شارەکان بۆ خەلیفەی عەباسی بگەرێنێتەوە ... بە مردنی نورەدین ماوە زیاتر بۆ سەلاحەدین رەخسا بە دامەزراندنی دەووڵەتێکی

فراوان و بەهێز .
سەلاحەدینی ئەیوبی لە ماوەیەکی کەم توانی ببێتە سەرکردەی جیهانی
ئیسلام ، بە گەراندنەوەی جیهانی ئیسلام و فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتی
ئیسلام ، بەتایبەتی فراوانکردنی سنووری جووگرافیای خاکی عەرەب
دەرچونیان بە شێوەیەکی بەرچاو لە دوورگەی عەرەب ، کە بە دووە
داگیرکردن و بە عەرەبکردن و بە ئیسلام کردن دێت ، لە دوای فتووحاتی
ئیسلامی ، بە تایبەتی کورد لە خاکی کوردستان .
سەرچاوە:– ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان – لە ئامادەکردنی سەیفەدین کاتب
– دار الشرق – المؤسسە العلمیە لوسائل التعلیمیە – بەیروت – سوریا – ٢٠٠٥.

## ١١٧٤

١١٧٤/٨/٢ لە دایك بوونی زاناو رووناکبیری ئاینی ئیسلام – شێخ جەمالەدین ئەبو
عومەر عوسمان ئەبووبەکر یونس ، لە ئەرستای مەلبەندی شاری – سەعد
ی میسر ... کە لە نەژاد کوردەو باپیرانی لە ناوچەی شارەزووری پارێزگای
سلێمانی لە هەرێمی باشووری کوردستان بەرەو میسر رەو دەکەن لە
هەرێمەکەدا .
کە کوری ئەبوو عومەر ئیبن ئەلحاجب بووە ... کە لە رێزمانە بەناوبانگەکانی
زمانی عەرەبی بووە , هەر لەو شارە خووێندن تەواو دەکات لەفێرگەی
فازلیەدا ... لە شاری قاهیرە کراوەتە مامۆستاو وانەی گووتۆتەوە بەهۆی
زیرەکی و داوایان لێکردووە بیکەنە قازی ... بەڵام ئەو داوایەی
رەتکردۆتەوەو لە میسر بەرەو شام رەو دەکات و لەشاری دیمەشقی شام
نیشتەجێ دەبێ .
ئەم زانا کوردە لەسەر مەزهەبی شافعی دەبێت ، بەڵام دوایی روو وەردەگێڕێ
و دەچێتە سەر مەزهەبی مالکی و لە مزگەووتی گەورەی شاری دیمەشق
بۆتە مامۆستاو چەندین کتێبی داناوە لەوانە :–
نامیلکەیەك بۆ پەرەپێدانی مەزهەبی مالکی – شافیە – لە – سەرف – و
کافیە– لە –نەحو – دا ، لەگەڵ چەندین نامیلکەو کتێبی دیکە لەسەر ئاینی
بە شیکردنەوەکەشیدا... دوای ئەوە کەوتە شاری ئەسکەندەرونەو لە
کارەکانی بەردەوام دەبێت تاکوو لە ١٢٤٨/٤/٢٦ لەتەمەنی ٤٦ سالیدا

کۆچی دوایی دەکات ولە دەری دەرگای دەریا لە گۆرستانی سالح کوری ، ئەبوو شامە دەنێژرێت لە ناوچەکەدا .

هەروا باوکی ئیبن حاجب بەر لەوە بچێتە میسر بەردەداری ئەمیر عیزەدین سەلامی کورد بووەو لە شاری – سەند – زاخۆ – لەلای ئامێدیەوە لە هەرێمی باشووری کوردستان ژیاوەو لە بەر ئەو پەردەداریە باوکی ناوی ئیبن حاجبی بەسەردا براوە .

سەچاوە :– – شەرفنامە – لاپەرە / ١٨٧ – ١٨٨

## ١١٧٦

١١٧٦/٧/١٠ دوای ئەوەی کە سەلاحەدینی ئەیوبی توانی زۆربەی هەرە زۆری هەرێمی شام بخاتە ژێر دەسەلاتەکەی ... گەراوە میسرو هەر لەگەڵ گەیشتنی بۆ شاری قاهیرەی پایتەخت ، بریایدا بۆ یەکەم جار بەدروستکردنی دوو قوتابخانە ئەویش :–

١– دروستکردنی قوتابخانەی شافعی لە تەك گۆری ئیمامی شافعی ناسراو بە قوتابخانەی سەلاحیە لە شارەکەدا .

٢– قوتابخانەی حەنەفی ، ئەویش بەناوی ئیمامی حەنەفی ، کە ئەمە دوو مەزهەبن لە ئاینی ئیسلام لە چوار مەزهەبەکەدا . کە – ئەحمەدی و ، مالکی و ، شافعی و ، حەنەفیە ... دوای ئەوەش ئەمیرەکانی دەووڵەتی ئەیوبی ، دەستیان کرد بەدروستکردنی قوتابخانە لە شارۆچکەو شارو ناوچەو ئەو هەرێمانەی کە لەژێر دەسەلاتی دەووڵەتی سەلاحەدینی ئەیوبی دابوون .

سەچاوە :– سەلاحەدینی ئەیوبی – موسوعە الحروب الصلبیە –
دانانی دکتۆر سەلابی – چاپی یەکەم –بیروت/٢٠٠٨

## ١١٧٩



١١٧٩/٦/٨ یەكــەم دراو لــە ژێــر دەسەڵاتی سەلاحەدینی ئــەیوبی چــاپكرا ، لــە شاری قاهیرەی میسر ، بە ناوی دیناری ئەیوبی ، لـە زێـر لـە سـەردەمی شانــــشین ناســـر سـەلاحەدینی ئـەیوبی ، كـە قەبارەكـەی - ٢سـم - بوو ... دوای ئەوەش دووجاری دیكە چاپكرا لە شاری ئەسكەندەریەی میسر لە ساڵەكانی ١١٩٣ - ١٢٣٥ ، كە ئەمەن رۆڵـی كاریگـەری هـەبوو لەسـەر بـاری ئـابووری و بازرگـانی و پەیوەنـد كۆمەڵایەتی لەو وولاتەدا.

سەرچاوە :- ئەتلەسی مێژووی عەرەب و جیهان - ئامادەكردنی دكتۆ . سەیف الد كاتب - دار الشرق العربی - بەیروت - سووریا / ٢٠٠٥ .

## ١١٨٠

١١٨٠/٥/٢٨ دەسـتپێكردنی نووسـینەوەی چـیرۆك ، یـاخوود پەخـشانە - یـا بـە سـ هاتـەكانی خۆشەویـستی - شـیرین و فـەرهاد - یـا - خەسـرۆ و شـیرین لەلایەن شاعیری نیزامی - كە ئەویش پێشكەشی كرد بە - جیهان بەهلەو - دادوەری ئازربایجان .



کۆشکی شیرین

ئەویش لەدوای تەواو بوونی لە ساڵی ١١٨٢ ، کە زۆر گرنگی بەو چیرۆکە دراوە لەلایەن عەرەب و نەتەوەکانی دیکە ، بەهۆی سەرنج راکێشی و بەهێزی چیرۆکەکە لە رووداوی خۆشەویستیەکی بێ وێنە لەو سەردەمەدا ... دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٣٣ رۆژهەڵاتناسی تشیکی - هربرت دودا - نووسراوەیەکی دانا بەناوی - فەرهاد و شیرین - لەسەر خەسرو شیرین لەلایەن شاعر نیزامی - ئەم چیرۆکەش بۆ چەندین زمانی بیانی وەرگێردراوە لە جیهاندا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە چیرۆکی بەناوبانگی شیرین و فەرهاد چیرۆکێکی کوردیەو بەناوی شاری - قەسر شیرین - ناونراوە ، لەرۆژهەڵاتی کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەڵاتی فارس لە ئێران و ، هەتا چیرۆکی خۆشەویستی لە نێوان فەرهاد و شیرین کوردیەو هەردوکیانیش هەر کوردن و لەسەر خاکی کوردستان بووە ، ئەم خۆشەویستیە رووی داوەو هەر لەسەر خاکی کوردستان شیرین و فەرهاد لەدایك بوونەو کۆچی دوایشیان لە سەر خاکی کوردستان بووە .

سەچاوە - گۆڤاری میزۆپۆتامیا - ژمارە/٢ لاپەرە /٧٦

**١١٨١**

١١٨١/٥/١ زانای بەناوبانگی مەزهەبی شافعی و لە نەژاد کورد - ئەبوو عومەر عوسمان کوری عەبدولرەحمان ، لە ناوچەی شارەزوور چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ... لە مەشاهیرالاکرادی ... ئەمین زەکی بەگ دەڵێ :- کە لە ساڵی ١١٨٢ لە

دایك بووه .. ئەم کەسایەتیە ئاینیە کوردە بەهۆی زیرەکی و توانای زانینی چەندین کتێبی لەسەر زمان و ئەدەب نووسیووە .. لەکارەکانی بەردەوام بووە تاکوو لە ١٢٤٥/٥/٢٩ هەر لەشارەزوور کۆچی دوایی دەکات لەهەرێمی باشووری کوردستان .

## ١١٨٢

١١٨٢/٥/٧ پەیوەندیەکانی نێوان سەلاحەدینی ئەیوبی و دەوڵەتی بیزەنتی لە بارێکی ناهەموار دەخوولایەوە... بەڵام ئیمپراتۆر – مانۆیل کۆمنین – کە دژی سەلاحەدین و ئاینی ئیسلام بوو .

لە هەمان کات هاوپەیمانانی خاچەکان بوو... بەڵام لەو کاتە کە ئیمپراتۆر–ئەندرۆس نیقۆسی کۆمنین ، دەسەڵاتی گرتە دەست باری پەیوەندی رووەو بارێکی لەبارتر هەنگاوینا و بەهاتنی ئەو پەیوەندیەکی بەهێز لەنێوان سەلاحەدینی ئەیوبی و ئیمپراتۆر ئەندرۆسی دروست بوو ، ئەویش بەهۆی بەرژەوەندی هاوبەش لەنێوانیاندا ... لەهەمان کات دژی سەلاجقەکان بوون ، کە سەلجوقیەکان سووپای بیزەنتیان لەناوبرد لە شەری – میربووکیفالۆن – لەکۆتاییەکانی ساڵی ١١٧٦ دا .

هەروا رق هەڵسانی دژی خاچەکانی – لاتین و ئیتالیەکان – بەهۆی دەست بەسەرا گرتنی تواناو ئابووری بیزەنتیەکان ... ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە ئیمپراتۆر ئەندرۆس نیقۆسی کۆمنین ، زیاتر لە سەلاحەدینی ئەیوبی نزیك ببێتەوە لە پەیوەندیەکانیاندا .

ئەم لێك نزیك بوونەوەیەش لەئەنجامی پاراستنی بەرژەوەندی هەردوو لایەنی هاوبەش بوو دژی – لاتین – خاچەکان بەشێوەیەکی گشتی و سەلجوقیەکان بەتایبەتی .

بەڵام وولاتانی رۆژئاواو ئەوروپا ئەو لێك نزیك بوونەوەی لە نێوان ئیمپراتۆر ئەندرۆس نیقۆسی و سەلاحەدینی ئەیوبی ، کە هەوڵێکە بۆ پێ شێل کردنی رایەلەی ئاینی لەبیزەنتی و رەش کردنەوەی داب و نەریتەکەیەلە جیهاندا ... لە بەر ئەوە شەڕی نێوان بیزەنتیەکان و ئاینی ئیسلام لەسەرتای پەیدابوونی ئیسلام بەردەوام بووە .

لەهەمان کات ئەندرۆس نیقۆسی ویاریدەدەرەکەی – ئیسحاقی دووەم ئەنجیلۆس – ئەم رامیاریەتەیان گۆری بەنزیك بوونەوە لەسەلاحەدینی ئەیوبی ، کە دووژمنی هەرە گەورەی خاچەکان بوون ... بەلام هەوڵیاندا زیاتر هانی هێزەکانی سەلاحەدین بدەن بۆ ئەوەی ئیمارەتەکانی خاچەکان لە رۆژهەلات لەناوببەن ... ئەم لێك نزیك بوونەوە هۆی ئەوە بوو کە ئەندرۆس نیقۆسی دوور خرایەوە لەئیمارەتی – کیکیان .

لە دوای سالی ١١١٦ و بەرەو شاری دیمەشقی شام بەرێکەووت ... کە لەلایەن نورەدین مەحمود پێشووازی لێکراو رێزی لێگرت ... کە ئەمەش هۆکاری کاریگەر لە پەیوەندی نێوان سەلاحەدینی ئەیوبی و ئەندرۆس نیقۆسی دروستکرد و لەسالی ١١٨٥ هاوپەیمانیان لەنێوانی مۆرکرا ، لە چەند خالێکی هاوبەش لەوکاتدا .

بەلام بەر لەوەی کە سەلاحەدینی ئەیوبی وەلامی مەرجەکانی نێوانیان بداتەوە ، ئەندرۆس ئیقۆسی لە شاری قوودس لە دەسەلات لادراو لەمانگی/٩/١١٨٥ کووژراو ، ئیسحاق ئنجیلۆس بووە ئیمپراتۆر لەجێگەی ئەدرۆس نیقۆس لە هەرێمەکەدا .

سەرچاوە :– سەلاحەدینی ئەیوبی – دانانی دکتۆر سەلابی– چاپی یەکەم – بەیروت/ ٢٠٠٨.

## ١١٨٥

١١٨٥/٤/٤ لە رێکەووتنامەی نێوان سەلاحەدینی ئەیوبی و ئەمیری مووسڵ مەسعوود مودود عمادەدین زەنگی مۆرکرا ... ئەویش بەهەلگرتنی دەسەلاتی عزەدین مەسعوود لەسەر ناوچەی شارەزوورو کارەکانی و وویلایەتی قەرابلی و هەموو ئەو بەشانەی کەوتبوونە دواوەی زێی ، لەکارەکانی سەلاحەدینی ئەیوبی بەرامبەر وازهێنانی لەسەر دەست بەسەراگرتنی شاری موسل .. هەروەك ئیبن ئەسیر باسی کردووە ، کە هەولێرو کەرکوك و تاکوو کۆتایی ناوچەی شارەزوور لە بەردەستی سەلاحەدینی ئەیوبی دابووە .

## ١١٨٧

١١٨٧/٤/ یەکێك لە کورەکانی سەلاحەدین ئەیووبی ، دوای لە شانشینی لیبیا – قمسی تەرابلسی– کرد ، کە ماوەی پێبدا کە هێزەکانی بە هەرێمەکەیدا

تێپـەڕێت . دوای ئـەوە شانـشینی لیبیـا ڕەزامەنـدی لـە سـەر داواکـەی کـرد بەمەرجێ ئەو سوورانەوەی هێزەکانی دەبێ پێش ڕۆژئاوا بوون لە هەرێمەکە دەرچێت ، ئەگینا تووشی هیلاکەت دەبێت .

١١٨٧/٥/١ بـە هـۆی بڵاوبوونـەوەی ناونـاتۆرەو ووتـەی نـا لـەبار لەسـەر خووشـکی سەڵاحەدینی ئەیووبی ... کە سەلاحەدین سووێندی خووارد ، کە سەری- ریتـۆ - بـە دەسـتەکانی خـۆی پەلبـدا . لەهـەمان کـات بـەخۆیی و ٨٠٠٠٠ هەشـت هـەزار چەکدارو چەندین لقـی دیکـەی چەکدار لـە میسرو موسـڵ و مادرین چوونە ریزەکانی چەکدارەکانی کوڕی سەڵاحەدین لە نزیك ئەستارا . ئەویش لـە پێنـاو بە ئەنجامگەیانـدنی ئەو کـارە بەرامبـەر بە نـەیارەکانی و گەڕاندنەوەی نازناوی ناوداریەتی بنە ماڵەکەیدا .

١١٨٧/٧/٢ هێزەکـانی سـووپای سـەلاحەدین بەسـەرکردایەتی کوڕەکـەی هێرشـیان کـردە سەر شاری تەبەریە لە فەلەستین ، بە هۆی کردەوەیەکی نەزانی ، کە یەکێك لە چەکدارەکانی ئاگری بەر دایە یەکێك لە کۆگاو بووە هۆی ئاگر بەربوون لـە شـارەکەو لـە ئاکامـدا هـەمووی سـووتاند تـەنیا قەلعـەی شارەکە نـەبێت بە رزگار بوونی لە سووتاندن ومانەوەی لە شارەکەدا .

١١٨٧/٧/٣ هێزەکـانی سـووپای - ئەفرنجـە - بـەرەو بیابـانی ووشـکانی هەڵکشان کـە سفووریەو تەبەریە لێك جیا دەکاتەوە ، کە بە ١٥٠٠٠ هـەزار سووارو سـەرباز بـەرەو دەریـای جـەلیل کەووتنـە ڕێ ، کـە لـە پێـشەوەیان - رینیـۆ قمـسی تەرابلـسی- بـووەو لـە دوواوە بالیـان بـیلان و لەناوەنـد شانـشین - گـی دۆلوسـینیان - بـوو بۆ پارێزگـاری کـردن لـە - ڕۆڤن - سـەرەك ئەسـاقفەی عەکا .

کـە بیرنـارد لـە لینـا هـەڵگری سـەلیبەکە بـوو لـە دوای شـەڕیکی کووشـندەو دژووار لە نێووان هێزەکانی سـووپای ئیسلام بەسـەرکردایەتی سـەلاحەدین و هێزەکـانی سـووپای مەسـیحی ، کـە لـە ئـەنجام هێـزە مەسـیحیەکان بـەرەو دوواوە کشانەوە بە هۆی سەرنەکەووتنیان.

١١٨٧/٧/٤ لە دوای شەڕێکی دژووار لە نێووان هێزەکـانی سووپای ئیسلام و هێزەکـانی سـووپای مەسـیحی ، ئـەویش بـە سـەرنەکەووتنی هێزەکـانی سـووپای مەســیحی بەرامبــەر بــەهێزەکانی ســووپای ئیــسلام بەســەرکردایەی

سەلاحەدینی ئەیووبی ، کە لەو شەڕە سەلیبە بەهادارەکەی مەسیحیەکان وون ببوو و تاکوو ئێستا دیار نیە ، کە سەلیبەکە سەلیبێکی گەوورە بووەو لە چەندین کیلۆمەتر دەدیترا . کە لە دارو ئاسن دوروست کرابوو.
جێگەی باسکردنە کە سەلیبی مەسیح ، هیمای بەرزی ئاینی مەسیحە ، وەك رێگە نیشاندەرێکی ئاینی و دروشمە باڵاکان و ، وەك ئاڵایەکی سەرکەووتنی مەسیح و ئاینی مەسیحیەکانە لە جیهاندا .

١١٨٧/١٠/٢ لە دوای کۆچی دووایی سەرکردە – نورالدین زەنکی– سەلاحەدینی ئەیووبی بە هێزێکی زۆر هێرشی کردە سەر سەلیبیەکان‌و شاری قوودسی رزگار کردو دەسەڵاتەکەی بەرەو فراوانکردن هەنگاوینا ، لە پێناو خزمەتکردنی عەرەب‌و فراوانکردنی سنووری جووگرافی عەرەب لە سەر بەرژەوەندی گەلانی دیکە لە ناوچەو هەرێمە جیاجیاکان ، بە تایبەتی لە سەر خاکی گەلی کورد لە کوردستان .
کە سەلاحەدینی ئەیووبی دژی کوردو کوردستان‌و بە عەرەبکردن‌و بە ئیسلام کردنی کوردو گەلان بەردەوام بووە .
شایانی باسە سەلاحەدینی ئەیووبی سەرکردەیەکی کوردی ئیسلام‌و . لە پێناو عەرەب بووەو هەموو توانای لە پێناو بەرزکردنەوەی هەستی نەتەوەیی‌و سنووری جووگرافی عەرەب بووە لە هەموو بووارە جیاجیاکاندا.
بەڵگەش :– گەر سەلاحەدینی ئەیووبی‌و هێزەچەکدارەکانی کورد نەبوونایە لە بەربەرەکانی کردنی سەلیبیەکان‌و بە سەرکەووتنیان .
کە عەرەب نەیدەتووانی بەم جۆرە سنووری جووگرافیای نیشتمانی عەرەبی فراوانتر بێت .
کە دژی کوردو نیشتمانی کورد بووە، لەهەمان کات گەر سەلاحەدین لە شەڕەکان سەرکەووتنی بەدەست نەهێنابایە بەسەرکردەیەکی کوردی خائینیان دادەنا...؟.
هەروا مەحەمەد عەلی پاشاش بە هەمان شێووە ، هەرچەندە لە هەندێ سەرچاوەی مێژوو نووسان‌و رامیاریەتی ئیمپراتۆریەتەکانی فەرەنساوررووسیای قەسەری‌و بەریتانیا ترسی زۆریان لە محەمەد عەلی پاشا

هـەبوو . لـە دامەزرانـدنی دەوڵـەتێكی فراوانـی كـوردی لەسـەر كوردستان
دەوروووبەریدا .
گـەر سـەركردە كوردەكـان لــە دوای هەرەسـی ئیمپراتۆریــەتی میــدیا ئـە
ئازایـەتی و لێهاتوویـیـەیان لـە پێنـاو كـوردو خـاكی كوردسـتان بـەكار بهێنایـ
تـاكوو ئێـستاش كـورد خـاوەنی بـەهێزترین دەسـەڵاتو دەوولـەتو سنووری
دەووڵەتەكە دەبوونو لەئاستی پێشەوەی وڵاتان دەبوون لە هەموو جیهاندا .
خووێنەری بەرێز:ـ
من مەبەستم ئاییني ئیسلام نیە... بەڵام گەر ئاسانكاری لە لایەن سـەركردەو
سـەرەك هـۆزو تیرەكـانی كـورد نەبووایـە بەهۆی خوواستی تایبـەت ، عـەرەب
نەیــدەتووانی خــاكی داگــیر بكــات هــەروا فــارسو تــوركیش.. ئەمــ
راستیەكەیە..!.

١١٨٧/١٠/٩ لەو كاتەی هێزەكانی سووپای ئیسلام گەیشتنە شاری قوودس سەلاحەدین
ئـەیوبی فـەرمانی دا ، كـە هەرچی خـانوو و باڵـەخانـەو جێگـەی شـووێنەوار
شارسـتانیەتی ، كـە خاچـەكان دروسـتیان كردبـوو بیرووخێـنن لـە شـار
دەورووبەریـدا ... هـەروا بـە رووخانـدنی ئـەو پەژینـەی كـە چـوار دەوورە
میحرابی قوودس كرا بوو .
هەروا ئەو جوانكاریەی كە لە سەر قووبەكەی ماڵی قوودس كرابوو ... دوای
ئەوە بریاریدا كە كەسايەتی ئاینی زیائەدین هەكاری كردە ئەمیندار لەسە
شاری قوودس .
هـەروا ئـەو خاچـەی كـە لـە زێـر دروسـتكرابوو لەسـەر قووبـەی مـاڵی قوودس
هێنرا خوارەوە ، كە ئەم كارەش بووە هۆی ئەوەی كە موسولمانەكان دڵخۆش
بكـات ... دوای ئـەو هـەموو كارانـەی سـەلاحەدین هەڵسا بـە دروسـتكردنی
باڵەخانەی مزگەووتی ئەقسا بەجوانترین شێوواز لەو سەردەم لە شارەكەدا .
سەرچاوە :ـ سەلاحەدینی ئەیوبی – دانانی دكتۆر سەلابی – چاپی یەكەم – بەیروت/٢٠٠٨.

## ١١٩٠

١١٩٠/٢/٨ قـەلای هـەولێر پەرەسـەندنێکی باشـی بـەخۆوە بینیـووە لـە سـەردەمی – ئەتابیـەکان – بـە تایبـەتی لـە سـەردەمی سـولتان موزەفەرەدین کە لەو



مێـژووە حـووکمرانی هـەولێری گرتـە دەسـت تـاکوو سـالّی ١٢٣٣ لەسـەر بوارەکـانی ئاوەدانکردنـەوەی دام و دەزگاکـان و بـەرێوەبردنی کاروبـاری دانیـشتووان ، لـە دوای کۆتـایی دەسـەلاّتی عەباسـیەکان و سـەرەتای حکوومرانی – ئیلخانی – کـە لـەو کـات هێـزو توانـای مەگۆلـەکان لەهـەرێمی باشووری کوردستان تێك شکێنرا بەتایبـەتی لەدەوروبـەری پـەرژینی قـەلاّی ئەوکاتی هەولێر لە هەرێمەکەدا .

لـەو کـات مەگۆلـەکان ئـەو توانایـەیان نـەبوو قـەلای هـەولێر داگیربکـەن تـا ئەوکاتەی حکوومرانی مووسل – بەدرەدین لوئلو یارمەتی دان ... کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە مەگۆلەکان توانیان شوورەی قەلاّی هـەولێر و دەرگاکـانی وێران بکەن و بیسووتێنن لە ١٢٥٨/١٢/٢٩.

هـەروا قـەلاّی هـەولێر خـۆراگر بـوو بەرامبـەر هێرشـە یـەك لـەدوای یەکـەکانی دووژمنـانی ، لەوانـەش هێزەکـانی تـەیموری لـەنگ بـۆ جـاری دووەم لەسـالّی ١٤٠١ کە زیانێکی زۆر بەشووێنەواری قەلاّو دانیشتووانەکەی گەیشت .



سەرەرای ئەو هەموو وێرانکاریانەی کە بەسەرهەولێرو قەڵاکەیدا هات ، هە
لەخۆراگری بەردەوام بوو ... بۆ نموونە لەسەردەمی حکوومرانی — ئەمی
ئاسیان — قەڵای هەولێری گەمارۆدا بۆ ماوەی یەك ساڵ ، ئەویش لە ساڵ
١٤٣٥ لە پێناو مل کەچ پێکردنی کورە مامی ئەمیر میرزا عەلی ... دوا
ئەوەش گەمارۆدانی قەڵای هەولێر لەسەردەمی حکوومرانی — ئەلەق قوینلو
لەساڵی ١٤٦٧.

سەرەرای گرنگی پێدان بە پاراستن و ئاوەدانکردنەوەی قەڵاکە لەلایەن ئەمی
عەلی حاجیلۆ لە ساڵی ١٤٧٤دا . لەگەڵ ئەو هەموو کارەساتە لەسەردەم
دەوڵەتی عوسمانی دووبارە دەستکرا بەرێکخستنەوەی قەڵای هەولێرو دا
و دەزگا میریەکان وەك ، خانووی سەراو چەندین شووێنی دیکە و بەردەوا
بوونی باری ئارامی و ئاسایشی شارەکە .

بەڵام هەولێرو دەورووبەری دووچاری هێرشکردنە سەری بەردەوام بوو
لەداگیرکردن ، بەسەرکردایەتی نادرشای ئەفشاری لەساڵی ١٧٣٢ و ماوە
دوو مانگ دانیشتووانی شاری هەولێر لە خۆراگری بەردەوام بوون .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە جێگەی پەرستگای بەناوبانگ لەقەلای هەولێ
وەك توویژینــەرە شــووێنەوارەکان بــۆی چــوونەو گەیــشتوونەتە ئــەنجام
لێکۆلینەوەکان ، بەپێی تۆمارگەکان و شووێنەواری ئاشووریەکان ، کە بەج
ماون ، یاخوود دۆزراونەتەوە ، کە ئەو پەرستگایە چوار خوای لەخۆ گرتوو

و ناوزەندی ئەوکات بە – ئەربائیلۆ – کە شاری چوار خواکانی پێ گووتراوە ...کە لەوکات گرنگی باشی پێدراوەو لە خرسیاو تابلۆیەك دۆزراوەتەوە لە شێووەی لاکێشی ، کە ناوی مەلیکەکانی ئاشووری لەسەر بووە ... کە نووسەرێك لە نووسراوەکەی ناوی پەرستگای خوای لەهەولێر دیاریکردووە بەناوی – عەشتار – لەسەر دەستەی – قەندەلانۆ – کە ئەمەش نووسەری بەناوبانگ – باقر یاسن – لە مێژووی شووێنەوارە کۆنەکان – باسی کردووە ... کە ئاشوور ناسربال لەنێوان ساڵەکانی ٨٨٤ – ٨٩٥ ی بەر لەزایین تێیدا دەسەڵاتدار بووە لە ناوچەکەدا .

هەروا مەلیك – شمش ئەددا –ی پێنجەم ، لە نێوان ساڵەکانی ٨٢٣ – ٨١١ تێیدا دەسەڵاتدار بووە ... هەروا ئاشوودانی سێیەم ، لە نێوان ساڵەکانی ٧٧٢–٧٥٤ ی بەر لەزایین تێیدا دەسەڵاتداربووە... هەروا – سنحارب لەنێوان ساڵەکانی ٧٠٥ – ٦٨١ بەر لەزایین تێیدا دەسەڵاتدار بووە . هەروا ئاشووربانبال لەنێوان ساڵەکانی ٦٦٨ – ٦٢٧ بەر لەزایین تێیدا دەسەڵاتدار بووە ، ئەویش لە هەرێمی باشووری کوردستاندا .

کە ئەمەش نووسەر جەمال بابان، لە – کتابی ناوی شارەکانی کۆنی ئێراقی – باسی کردووە لە ١٩٨٦ ...هەروا لەچەندین نووسراو کتێبی دیکەی مێژوویی شووێنەوارو شارستانیەت و شارەکانی کۆنی رۆژهەڵاتی ناوەراست و ئاسیای بچووك باسکراوە .

تێبینی :– عەشتار ، یاخوود ئاشوور ، ناوی ئەو پەیکەرانە بووە ، کە وەك خوا پەرستراوە ، نەك بەناوی نەتەوە ، یاخوود ئایین... لە بەر ئەوەی ئێستا هەندێك لە برا مەسیحیەکان وا خۆیان ناوزەندکردووە ، کە لە نەتەوەی ئاشوورن ، یاخوود نەتەوەی ئاشوور ... نەتەوە نیە بەناوی ئاشوور بەڵکوو ئەو پەیکەرانە بوونە کە ناویان بەناوی ئاشوور و عەشتار هاتووە لە سەردەمەکانی ئیمپراتۆریەکەیاندا .

 ١١٩٣

١١٩٣/٣/٥ کۆچی دووایی سەرکردەی کوردی موسلمان سەلاحەدین ئەیووبی لە دوای بە دیهێنانی ئامانج و ئاواتەکانی عەرەب لە هەموو بوارە جیاجیاکان و گۆرەکەی

له دیمەشقی پایتەختی سووریایە



گەر بەراووردێك لە نێووان ئەو دانراوانــــەی کــــە لــــە ســــەر ســـــەلاحەدینی ئــــەیووبی و بنەماڵەکـــەی نووســـراوە ، لـــە چەندین لایەن خۆی دەردەخات ، کە سەلاحەدین ئەیووبی خزمـەتی گـەورەی هـەبوو بۆ داگیرکـەرانی خاکی کوردستان . بە تایبەتی لە لایـەن عـەرەب ، لـە بـەر ئـەوەی سـەلاحەدینی ئـەیووبی ، یەکـەم کەس بوو کە لە مێژووی ئیسلام ، قوودس و چەندین ناوچە رزگار بکات لـ ژێر دەسەڵاتی مەسیحیەکان و ئاینەکانی دیکەدا .

هـەروا ئـەویش لـە پێنـاو خزمـەتکردن و فراوانکردنـی سـنووری جـووگرافی عەرەب و دەرچوواندنیان لە دوورگەی عـەرەبی و هەرێمـەکانی وولاّتـی یەمـە و کۆچـکردنیان بـەرەو هـەرێم و ناوچـەی دیکـە ، ئـەویش بـە رێنمـایی ئامۆژگاریەکانی سەلاحەدینی ئەیووبی بوو بە رێگە خۆشکەری نیشتەجێ بوونیان .

راسـتە سـەلاحەدین سـەرکردەیەکی ئیـسلامی کـورد بـوو ولـە هـەمان کـات دەســەڵاتەکەی لــە کــورد پێــك هــاتبوو لــە ناوچــە و ئــەو هەرێمانــەی کــ سـەلاحەدین دەسـەلاتداریەتی تێدا دەکـرد ، ... بەڵام سوودمەند نــەبوو بـ کــورد لــە هــیچ بوواریــك ، بــە تایبــەتی لــە هــەردوو بــوواری نەتــەوەیی نیـشتیمانیدا . و بـەلکوو زیـان بەخـشێکی بێ ووێنـە بـوو بـۆ کـوردو خـاکی کوردستان .

بەڵگەش :– لە دوای مردنی خۆی ، کورو برایـەکانی کەووتنە گیانی یەکتری لە پێناو سامان و دەسەڵات ...؟ . لە هەمان کات بیروو بۆ چوون و هـەڵس کـەووتی سـەلاحدینی ئـەیووبی کاردانـەوەی لـە سـەر زانـاو رووناکبیر نووسـەر و پیـاوانی نەتـەوەیی و ئـاینی کـورد هـەبوو، بە بەهێکردنی بیری

ئاینی و زاڵ کردنی بە سەر باری نەتەوەیی و نیشتیمانیدا و بە خۆ لە بیرکردن و ... بە هێزکردنی دووژمنانی کوردو خاکی کوردستان .

بەلاّم بە داخەوە زۆر لە نووسەران و رووناکبیرانی سەدەی بیست و یەك ، پێنووسی نووسینەکانیان بە بەرزکردنەوەی توانا و لێهاتووی سەلاحەدینە و ناوزەندکردنی بە سەرکردەیەکی کورد ....! . راستە سەرکردە بوو ، بەلاّم سەرکردەی کورد نەبوو لە پێناو رزگارکردنی کوردستام و دامەزراندنی دەووڵەتی کوردیدا .

بەلکوو سەرکردەی عەرەب بوو ، بە رزگارکەری عەرەب و بووژاندنەوەی ئاینی ئیسلام بوو لە هەموو بووارە جیاجیاکان و هەر سەلاحەدینی ئەیووبیش بوو هیماو توواناى عەرەب و ئیسلامی بەرزکردەوە ....؟.

دوای ئەویش :- ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دامەزرێنەری وولاّتی میسر - محەمەد عەلی پاشا - کە لە ناوەرۆکی مێژوونامەکە باسکراوە .

پادشایانی سەردەمە نوێیەکان بەردوو بناخەی باڵەخانە دێرینەکانیان هەڵدەوەشاندەوەو باڵەخانەی دیکەیان پێ دروست دەکرد بۆ ئەوەی شانازی پێوە بکەن لە دوا رۆژدا ....!.

سەلاحەدینی ئەیووبیش هەوڵیداوە بەردی هەرەمەکانی میسر دەر بهێنێ و شوورای شاری قاهیرەی پایتەختی میسر پێ بینا بکات ... ئا لەو کاتەدا سەلاحەدین بیروو هەستی نەتەوەیی و نیشتیمانی کوردی لە گۆرنا ، لە پێناو زیندوو بووژاندنەوەو دەرخستنی عەرەب و ئاینی ئیسلام و مێژوو لە لاپەرەکانی تۆمارەکانیدا تۆماریان بکات ...بەلاّم ئەم کارانەی سەلاحەدین ئەیووبی بۆ عەرەب بوو نەك بۆ کورد وکوردستان .

لە بەر ئەوەی تاکوو ئێستاش عەرەب ، سەلاحەدین بە عەرەب و سەرکردەی عەرەب دادەنێن بە هۆی سوود وەرگرتنیان بە ١٠٠ ٪ لە سەلاحەدین . خۆ ئەگەر سەلاحەدین شکستی بهێنابایە ، ئەوا عەرەب ناوزەندیان دەکرد بە سەرکردەی کوردی خائن ، وەك ئەبوو مووسلمەی خۆراسانی ، کە ئەبوو جەعفەری مەنسوور لە ناو میوانخانەکەی خۆیدا کووشتی....!.

بە سەدا کورد هەبووە و هەیە کە خزمەتی دووژمنانی کوردیان کردووە نەك کورد ، جا لە نووسەر و رووناکبیر و کەسایەتی ئاینی و هونەرمەندو شاعیر

و گۆرانیبێژ وو...هەروا...!.
دەڵێم بە داخەوە سەرکردە کوردەکان جا لە ڕێگەی ئاین و لە ڕێگەی کارو
رامیاری و لە ڕێگەی نەتەوەیی و لە ڕێگەی بنەماڵە ، لە هەموو کات
ساتێك خزمەتی بێگانەیان کردووە و ئاوات و ئامانجی گەلی کوردستانیان لە
ژێر خاك ناوە ...!.
هەروا بگرە لە سەرەتای دروست بوونی ئیماراتی کوردی بەر لە مێژووی
زاین ، تاکوو سەدەی بیست ویەك . لە دژایەتی کردنی یەکتری و کووشتن
برین زیاتریان نەبووە ، لە پێناو سامان و کورسی و خۆ دەووڵەمەند کردن
لە سەر خووێنی گەنجی کورد و گەلی کوردستان و لە سەر خاکی کوردستان

## ١١٩٥

١١٩٥/١٢/٦ سەرداران و ئەمیرانی میسر بوونە سووێند خۆری و ئازایەتی بارودۆخەکە
پەیمانی سەروەریان مۆرکرد لە ١١٩٢/٩/٢ ... لە بەر ئەوەی سولتان
سەلاحەدین بەر لە مردنی فەرمانڕەوایی میسری دابووە دەست عوسمان
کورە گەورەی ... ئەویش دوای مردنی باوکی کەوتە خۆو خۆی نەیارکرد
کاروباری میسری لێك لەبارکردو ئەوسا لە گەڵ مەلیك عادلی مامیدا کاك
مامە و برالەی خۆیان کردو بە جووتە هێزەکانیان بەرەو شام بەرێکرد
گەمارۆی مەلیك ئەمزەلیدا.
ئەم کوردە کە برایەك لەلایەك و براو مامێك لەلایەکی دیکەوە هێزەکانی
بەگژ یەك وەنا و مەلیك ئەفزەل دووجار هێزی هێرش بەرانی بەپاشد
کشاندەوەو سەری سێ جارە زۆر بەتووندی دەووری دراو مەودای لە
بەرتەسك کراو تووشی برسیەتی هات ، لەساڵی ١١٩٦ شامی جێ هێشت
عوسمان فەرمانڕەوایی شامی دادەستی عادل و خۆیشی بەرەو میسر
گەڕایەوە .
جێگەی ئاماژە پێکردنە کە – ئەمین زەکی بەگ – لە مێژووی ئیماراتی کورد
لە – ٢– ٢٢٦ دا دەڵێ :–
مەلیك عادل کۆمەڵێك لەمیرەکانی ئەیوبی ڕازی نەبوون ، کە کەمەلیك عەز

پەلاماری مەلیك ئەفزەل بدات و بوونە ناوبژیوان و لەهێرشی یەکەمدا گەراندیانەوە دوواوە .... بەلام بۆ سالی دوایی دووبارە هێرشی هێنایەوە سەر وولاتی شام و مەلیك عادل لایەنگیری مەلیك ئەفزەلی دەکرد ، بۆ ئەوەی نەتوانێ بەشی براکەی داگیر بکاو بۆ جاری دووەمیش پێك هاتنەوە .

هەروا مەلیك عادل ، کە زانی شەری ئەو دوو برایە کۆتایی نایەو لەو سونگەیەشدا لەشکری موسلمانان تێ دەچێ و فەرەنگیش گوێیان لەکلاو دەرپەراندووەو نینۆك لێك دەخشێنن و هەر ئەوان سەرکەوون و وازی لە ئەفزەل هێناو لە گەل عەزیز رێکەووتن و بە جووتە گەرانەوە سەر شام و مەلیك ئەفزەلیان دەرکرد و قەلای سەرخەدیان دابەو بۆ خۆی بوو بەپادشای وولاتی شام .

زۆر سەیرە بنەمالەی سەلاحەدینی ئەیوبی هەتا توانیان کوردیان لە پێناو عەرەب و ئاینی ئیسلام و بەهێزکردنی جێ پێگەی عەرەب و فراوانکردنی سنووری جووگرافی عەرەبیان پتەوکرد ، لە دواییدا خۆیان لەناو خۆیان بەگژیەکدا چوون کوردیش .... ؟ . نووسەر .

 ١١٩٦

١١٩٦/١١/٢٤ سەیف ئەلائیسلام تگیلین – توگرولتەگین –ی کوری نەجمەدینی ئەیوب ، کە پاشای یەمەن بوو ، کۆچی دوایی کردو ، دوای ئەو کورەکەی کە ناوی – مەتحەدین ئیسماعیل – و نازناوی مەلیك – موعیز– بوو جێگەی گرتەوە.. کە ئەمەش نەوەی سەلاحەدینی ئەیوبی بووەو لە نەژاد کورد بوونە .... بەلام بە داخەوە .... ؟.

سەرچاوە:– شەرەفنامە – لاپەرە /١٦٥ .

## ١١٩٨




١١٩٨/١٢/١٠ کۆچـــی دوایـــی زانـــاو فەیلەسـوفی ئیسلام – محەمـەد ئەحمەد محەمـەد ئەحمەد رشد ... ناسـراو بـە ئیبن رشـد و بـە نازناوی حەفید . شایانی باسە کە باوك و باپیری قازی فقهی بەناوبانگ بوونە ... کە باپیری قـازی بـووە لەشـاری قرتبـە ... زۆر لـە فتواکـانی تـاکوو ئێـستا بـە دەسـت نووسـی خـۆی لـە کتێبخانـەی نیـشتیمانی فەرەنـسا پـارێزراوە .. ئـەم زانایـە لەسـاڵی ١١٢٦ لەشـاری قرتبـە لـەدایك بـووە ... لـە فقهـی ئیمـامی مـالکی خوێنـدووەو هـەروا فەلـسەفەی خوێنـدووەو دوای بـاوکی بۆتـە قـازی لـە قرتبـە .... کـە تـاکوو ئێـستاش نووسـینەکانی ئـەم مرۆڤـە کاردانـەوە و کاریگـەری خـۆی هەیـە بـە تایبەتی لەبوارەکانی ئاینی ئیسلامدا .

سەرچاوە:– موسوعەی فەلسەفە – بەرگی/٣ دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی .

## ١١٩٩

١١٩٩/١٠/٢٣ مێـژوو نووسـی بـەناوبانگی کـورد – ئـەمین زەکـی بـەگ – دەڵـێ :– کـاتێ کـە مەلیك ئەفزەل کرایە پادشای میسرو سەرپەرشـتی مـەلیك مەنسووری برازای لێبرا ... کە تۆڵە لە مەلیك عادل بکاتـەوە ناردیە لای مـەلیك زاهـری برای ، کە پادشای حەلەب بوو .

لە هەمان کات دژی مامی یاریدەی براو بۆخۆشی خەریکی خۆ سازکردن بوو ، کە بچێتە جەستەی مامی . مەلیك عـادل کە بەو سەر و بەینەی زانـی ، لـە ژێرەوە پەیوەندی نێوان ئەفزەل و سـەردارانی تێـك داو بەهێزێکی زۆر چووە سـەر میـسرو ئـەفزەل و مـەلیك مەنـسووری دەرکـردو میـسری خـستە ژێـر دەسەڵاتی خۆیەوە

هەروا ئەمین زەکی بەگ دەڵێ:- کە لە میسریان دەرکرد ، دوای ئەوە ڕەوانەی قەڵای سەخەد کرد لە باکووری کوردستان و ماوەیێك تێدا مایەوە. مەلیك زاهیری برای هێزێکی لەحەلەب هێنا بۆ ئەوەی شام بگرێتەوەو وریایی مەلیك عادل پەیوەندی نێوان ئەو دوو برایەی تێکداو مەلیك زاهیر هاتەوە حەلەب و مەلیك ئەفزەل بە نائومێدی گەرایەوە قەڵای سەرخەد و لەدوای مەلیك عادل بەزەیی پێداهات و قەڵاکانی :- نەجم و سروج و حمسادی دایەوە دەست .

جێگەی باسکردنە کە وەك لە پێشەوە باسمان کرد ، کە هەتا سەلاحەدینی ئەیوبی مابوو مەلیك ئەفزەل لە دەسەڵاتدا بوو لە سەر شام ، لە دوای مردنی سەلاحەدینی ئەیوبی - عەزیز عوسمان - ی برای ئەفزەل لەگەڵ مەلیك عادلی مامیدا ، سێ جار هێرشیان کردە سەر شام و ئەفزەلیان دەرکردو قەڵای - سەرخەد - کە قەڵایەکی کەونارایە لەشام و لەنێوان مۆران و چیای بەلەدروزەو ئێستاش گوندێکەو شووێنەواری کۆنی کوردی تیایە - کە مەلیك ئەفزەل لەو قەڵایەدا دەژیا تاکوو مەلیك عەزیز لە وڵاتی میسر کۆچی دوایی دەکات.

لە دوای ئەوە ئەفزەلیان ناردو بۆماوەیەکی کوورت لەسەر میسر پادشایەتی دەکرد.. لەو کاتەدا کە مەلیك عادل بەم کارەی زانی بەهێزێکی گەوورە چووە میسرو بەزۆری زۆردار مەلیك ئەفزەلی دیسان لەسەر تەختی پادشایەتی لابردو قەڵای - شمشانی- پێ سپارد - قەڵای شمشان کۆنەو قەڵایەکە لە سەرچەمی فوورات لە باکووری کوردستان و لەباشووری قەڵای مەنسوورە... لە ئەتلەسی عوسمانی بە - ساماد - نوسراوە - دوای ئەوە مەلیك ئەفزەل تاکوو ١٢٢٥/١/١٣ کۆچی دوایی کرد لە باکووری کوردستان .

سەرچاوە :- شەرەفنامە / لاپەرە /١٦٦-١٦٧ .

## ١٢٠٢

١٢٠٢/٩/٢ دوای سەرکەووتنی بە سەر دووژمنەکان و تەواوی بیابانی مەنگۆلیا - جەنگیزخان - شایەتی خۆی لە ئاهەنگێکی گەوورەدا ڕاگەیاندو داوای لە هۆزەکانی ناوچەکە کرد .

ئەویش کە یەکیەتیەکی پتەو پێك بێنن لە پێناو فراوانکردنی دەسەڵاتەکەی و

بــەرەو پێکهێنــانی نەتەوەیــەکی ســەربەخۆ لەهــەموو بوارەکــانی نەتــەوەیی لەناوچەکەدا.

١٢٠٢/٩/٢٠ لە پادشای یەمەن مەلیك موعیز ئیسمالی کوری سەیف ئەلاّ ئیسلام تگتەکین کوری نەجمەدینی ئەیوب لە شاری زوبەید – زوبەید شارێکی دیارە لەیەمەن و کەووتۆتە باشووری رۆژهەلاّتی بەندەری – حودیدە . بەدەستی سەردارانی لەشــکری خــۆی کــووژرا... لەبــەر ئــەوەی مــوعیز پیــاوێکی داوێــن پــیس و هەمیشە سەرخۆش و بیّ وەفا بووە ... کە دەست درێژی دەکردە سەر مالّ و نامووسی ژێر دەستانی خۆی ... هەر ئەو موعیزە ، لەلای شەرم بوو بلیّ من کوردم و دەیگووت من لەتۆی واتا لە نەوەی ئەمەویەکانم .

لە پاش کووژرانی موعیز مەلیك ، ناسری کوری کەلەتەمەنێکی منداڵی دابوو جێگەی گرتەوە ... یەك لەزانا بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەدا کە ناوی – ئەبوو ئەلفەنایم موسلیم کوری مەحمودی شیرازیە – کتێبێکی بەناوی – عجایب الاسفار و غرائب الّخبار –ی بەناو ئەو مەلیك موعیزە داناوە بەهۆی سەرەرۆیی لەکارەکانی لە یەمەندا .

سەرچاوە :– شەرەفنامە – لاپەرە/١٣٥ .

## ١٢٠٥

١٢٠٥/٨/١٨ نووسەرو شاعیری کورد – شەمسەدین ئیبراهیم جزری – ناسراو بە – فاشوشە چاوی بە جیهان هەلهێناوە – جێگەی ئامـاژە پێکردنە کـا ناسراوبووە بە نووسینە بەنرخەکانی لەو کات ، کە بە شێووەیەکی گشتی لەبواری ئایینی ئیسلام رۆڵی کاریگەریان هەبووە ... سەرەرای بوونی کوردایەتیان و لاوازبوونی هەستی نەتەوایەتی بەهۆی بارودۆخی ئەو کات و پەیوەندیە کۆمەلاّیەتیەکان لەپەرە سەندنی بیری ئایینی لەهەرێمەکەدا .

سەرچاوە:– شذرات الذهب /٥/٤٥٦.

## ١٢٠٧



١٢٠٧/٩/٢٠ شـاعرو هـەڵگری بـروای سـۆفی لـە ئـایینی ئیـسلام – محەمـەد محەمـەد حسین بەهائـەدین لـە شـاری – بـەلخ – چـاوی بـە جیهـان هـەلهێناوە ... کـە ئـەمرۆ ئـەم شارۆچکەیە دەکەوێتە ئەفگانستان ... ئەم شاعیرە ناسراوە بە جەلالـەدینی رۆمی ... دوای ئەوە بنەکاڵەی محەمەد محەمەد بە هائەدین لە ترسی هێرش و شـالأوەکانی مـەگۆل بـەرەو – نیـساپور – رۆیـشتن . لـەوێ بـە شـاعیری بەناوبانگی فارسی گەوورە فەریدەدین عەتار گەیشت ... کە دیوانی – اسرار نامە –ی پێشکەش کرد .

جێگـەی ئامـاژە پێکردنـە ، کـە بەهائـەدین لـە بنەماڵەکـەی شـانازیان بەکوردایـەتی خۆیـان کـردووە ، تـاکوو کۆچـی دوایـی کـردووە . دوای ئـەوە روویان لەشام کردووە و دوای چووە بۆ حەج کردن .

دوای ئەوە بەرەو هەرێمی ئەنازۆڵ بەرێکەوتووە و لەشاری قوینە جێگیربووە ... کە مامۆسـتایەکی زیـرەك و لێهـاتوو بـووە ، لەسـەر دەسـتی بـاوکی فێـری زانیاریەکی باش بووە.

هـەروا لـە قوینیـەش لەلایـەن مەگۆلـەکان دەربـەدەرکراون . ئـەم کەسـایەتیە لـەدوای پەیـداکردنی توانایـەکی بـێ وێنـە لـەبوارەکانی زانـست و ئـەدەب و فەلسەفەو شعرو پەرەپێدانی رێگەی تەسەوف .

لەگەڵ ئەوەشدا بە دەیا پارچە شعرو دانراوی هەمەلایەنەی بەرهـەم هێنـاوەو بۆتە رێگە نیشاندەری زاناو فەیلەسوف و شاعیرو ئەدیبانی عەرەب و بیانی و کـوردی ... بـەردەوام بـوونی لە بەرهەمـەکانی تـاکوو لـە رۆژی ١٢٧٣/١٢/١٧

كۆچی دوایی دەكات و لەشاری قوینە بەخاك دەسپێردرێت .
سەرچاوە:- مجلة العربية / ٥٨٨ - نۆڤەمبەری /٢٠٠٧.

## ١٢١١



١٢١١/٦/١٥ زاناو مێژوونووسی گەورەی كورد - ئیبن خەلەكان - لە شاری هەولێر چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ، كە ناوی تەواوی - ئەبوو ئەلعەباسی شەمسەدینی ئەحمەد ئیبراهیم بووە ... ئەم كەسایەتیە ناودارە نەمرە چەندین كتێبی بەبەهای داناوە وەك : - وفیات الاعیان - انباو أبنا و الزمان -ی مێژوویەكی بەناوبانگی لە هەموو زیاتر بووە .

تێبینی:- گوندی خەلەكان لە دۆڵی خەلەكانە لە شارۆچكەی كۆیە سەر بە پارێزگای هەولێرە لەهەرێمی باشووری كوردستان .. ئەم كەسایەتیە مێژوونووسە گەورەیە ، بەردەوام بووە لە بوارەكانی كاركردن تاكوو لە ١٢٧٢/٧/٢٩ لە شاری دیمەشقی وولاتی شام كۆچی دوایی دەكات تەرمەكەشی هەر لەوێ بەخاك دەسپێردرێت لە شارەكەدا .
سەچاوە :- شەرەفنامە - لاپەرە/١٧١

## ١٢١٥

١٢١٥/٥/٢ یافعی لە مێژوویەكەی خۆیدا دەڵێ :- مەلیك مەسعوود یوسفی كور مەلیك عادل لە سەر فەرمانی باپیری هێزێكی بردە سەر یەمەن و پادشایەتی یەمەنی دەستەكەوت .
دوای ئەوە نیازی دەست بەسەراگرتنی خاكی حیجازی كەووتە سەر و لە هەڵمەتێكدا خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆی .. دوای ئەوە لەشاری مەككە مەڵبەندی ئایینی ئیسلام لە ١٢٢٨/١١/٣٠ كۆچی دوایی دەكات و هەر لەو

لە گۆڕستانی حاجیانی ئەو شارە نێژراوە .

ئەم کەسایەتیە لەلایەن شێخ سەدیق کوری بەدر کورد نێژراوە ، ئەم شێخ سەدیقەش لەشاری هەولێر لە دایك بووە و کۆچی بەرەو وولاتی سعوودیە کردیەو لەوێ خەریکی دینداری بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە .

سەرچاوە :- شەرەفنامە / لاپەرە /١٨٠-١٨١ .

١٢١٥/٥/٢ شاعیرو نووسەرو رووناکبیری کورد – ئیبراهیم لوقمان ئەحمەد محەمەد فەخرەدین شەیبانی ئەلئەسعەرد – لەشارۆچکەی – ئەسعەرد – لەنزیك – میافارقین – لە رۆژهەلاتی زێی دیجلە لەدایك بووە .

جێگەی باسکردنە کە ئەم مرۆڤە پلەی وەزیری وەرگرتیە لەسەردەمی مەلیك سەعید محەمەد زاهر لە – بیبرس – لە نیوان ساڵەکانی ١٢٧٧- ١٢٧٩ کە بۆماوەی دوو جار لەکاتی مەلیك مەنسوور قەلاوین لەساڵەکانی ١٢٧٩- ١٢٩٠ ئەم پۆستەی بەدەست هێناوە .

کە پیاوێکی نەرم و لە سەرخۆ بووە ... لەو کاتە مەلیك کامل محەمەد ئەیوب ئەمەد – واتە دیاربەکر – کردیەوە نامەکانی کە ئاراستەی بەرپرسەکانی دەکرد بەناوی – ئیبن لوقمان – بووە .

هەروا لەپۆستەکانی دیکە کاری کردووە وەك دەووڵەتی سولتان مەلیك سالح ئەیوب لە میسر لەنێوان ساڵەکانی ١٢٤٠ – ١٢٤٩ ... بەردەوام بووە لەکارەکانی تاکوو لە ١٢٩٣/١٢/٢ کۆچی دوایی دەکات لەمیسرو چەندین دەست نووسی شیعرو بوارەکانی دیکە لەدوای خۆی بەجێ دەهێڵێ لەم وولاتەدا .

سەرچاوە : فوات الوفیان ٤٣/١ ... المنهل الصاق / ١٣٨ .

## ١٢١٨ 

١٢١٨/٨/٣ کۆچی دوایی کوری سەلاحەدینی ئەیووبی – ناسر سەلاحەدین – لە تەمەنی ٧٥ ساڵیدا بەهەمان بیروو بۆچوونی باوکی... کە رۆڵی گرنگی هەبوو لە فراوانکردنی سنووری جووگرافی نیشتمانی عەرەب و بەهێزکردنی ئاینی ئیسلام و لە پێناو بەعەرەبکردنی کوردو خاکی کوردستان ، کە لە دوای مردنی خۆیشی ١٦ کوری جێ هێشت .

## ١٢٢٠

١٢٢٠/٣/٨ دامەزرانـدنی ئیمـارەتی ئـەردەلان لـە بەشـی رۆژهـەلاتی کوردسـتان و ئـەو ئیماراتە بەرەو فراوانی هەنگاوینا تاکوو پارێزگای کەرکویشی گرتە خۆی و ئەم ئیمارەتە بەردەوام بوو تاکوو ١٨٦٥/٥/٢٧ .
هەروا ئیمارەتی دووەمی بابان لە ١٥٩٧/٨/٤ لە لایەن ئیبراهیم پاشای بابان دامەزراو پایتەختەکەی قەلاچۆلان بوو لەباشووری کوردستان .
دوای ئــەوە ئیــبراهیم پاشــای بابــان لــە ١٧٨٤/١١/٢٦ دەســتی کــرد بەدروسـتکردنی شـاری سلێمانی و دوایـی کردیـە پایتـەختی ئیمارەتەکـەو تــاکوو لەســالی ١٨٥١ کۆتــایی بــەم ئیمارەتــەهات و بــووە ژێــر دەســتەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەشێووەیەکی راستەوخۆ لە هەرێمەکەدا .
سەرچاوە : محەمەد ئەمین زەکی – مێژوو وولاتان و ئیمارەتە کوردیەکان لە سەردەمی ئیسلامیدا . وەرگێرانی عەلی عەونی – چاپی دووەم – لەندەن /١٩٨٦ .

## ١٢٢٥

١٢٢٥/١٠/٦ هێزەکانی سووپای تەتەر بەسەرکردایەتی جەنگیزخان لە رۆژئاوای چینی میللـی دەرکـەووتن و بـەرەو وولاتـی خـەوارزمو سـەمەرقەندی رووسـیای قەسەری هەنگاویاننا ، کە هەمووی لە ماوەیەکەی کورت دا داگیر کردوو کردیـە خاوەنداریـەتی ژێردەسـەلاتەکەی خـۆی ، کـە بـووە هـۆی تـەنگ پـێ هەلـچنین بـە هـەلگری بـرِوای ئـاینی ئیـسلام ، کـە ئەمـەش بـە خـۆ دوورخستنەوەی خەلیفە ناسرەدین ئەللا خەلیفەی ئیسلامو خۆ دوورە پەرێز گرتن لە رووداوەکاندا .

## ١٢٢٦

١٢٢٦/١٢/٢٢ مەلیك مەنسوور ئیبراهیم کوری مەلیك شێرکۆی محەمەدی کوری ئەسەدی شێرکۆی مامی سەلاحەدینی ئەیوبی چاوی بە جیهان هەلهێناوە ... ئە مەلیکە خاوەنی شاری حمس و دەووروبەری بووە ... واتە ئیمارەتی حمس ... ئەمەش لەدوای مردنی باوکی هات ، لە سالی ١٢٣٩ کە ماوەی ئەمیر ئیمارەتی حمس شەش سال بوو ... دوای ئەوە لە سالی ١٢٤٠ تووش

شەڕهات لەگەڵخەوارزمەکان .

کە لە هەرێمەکانی شام نیشتەجێ بوون بەهاوکاری سووپای حەلەب لە ئاکامدا سەرکەووتنی بەسەریاندا هێناو لەناوچەی رۆژهەلات دەری پەراندن تاکوو رۆژهەلاتی زێی فوورات ... هەروا دەستی بەسەر ناوچەی – حەران – داگرت بەیارمەتی بەدرەدین لولوی خاوەنی مووسڵ ، بەم هۆیەش هەموو دیلەکانی ژێر دەستی خەوارزمەکانی ئازادکردوو گەراندیەوە جێگەی خۆیان لەوانەش مەلیك – ئۆرانشای – کوری سولتان سەلاحەدینی ئەسفەر ... لەو شەڕە گەوورەش توانی دەست بەسەر ناوچەی خابووردا بگرێت . دوای ئەوە بۆ جاری دووەم لە ساڵی ١٢٤٢ شەڕی لەگەل خەوارزمەکان بەرپاکردەوەو بەسەریاندا سەرکەوت .

دوای ئەوە لە ساڵی ١٢٤٦ لەگەڵ مەلیك نەجمەدین سالح ئەیوبی رێکەووتیان مۆرکرد و بۆجاری سێیەم و چوارەم لەگەڵ خەوارزمیەکان تووشی شەڕ هاتن و سەرکەووتنیان بەدەست هێنا ، کە ئەمەش بۆوە هۆی ئەوەی کە لەلایەن مەلیکی میسر جێگەی دەست خۆشی لێکردن بوون .

دوای ئەوە لەسەردانەکەی گەڕایەوە لەلایەن مەلیکی میسر لە شاری دیمەشق لە ١٢٤٦/٥/١٩ کۆچی دوایی کردو تەرمەکەیان هێنایە شاری حمس و لەتەك گۆڕی باوکی بەخاکیان سپارد .

دوای ئەوە کورەکەی مەلیك – ئەشرەف موزەفەرەدین – دەسەلاتی ئیمارەتی حمسی گرتە دەست لە هەرێمەکەدا .

سەرچاوە :– الاعلام ٤٣/١ – مشاهیر الکرد ٢٦٧/١

## ١٢٢٧

١٢٢٧/٨/١٨کۆچی دووایی سەرکردەی هێزەکانی سووپاو ،سەرکردەی تەتەرەکان جەنگیز خان .

## ١٢٢٩

١٢٢٩/٢/١١ گرێدانی ڕێکەووتننامە لە نێوان قەیسەری ئەڵمانی – فریدریا دووەم – لە گەڵ – سوڵتان سەلاحەدین – ئەویش لە پێناو بەرپابوونی ئاشتی لەجیاتی شەڕو پێکدادان لە نێوان هەردوو ئاینی سەرەکی لە جیهان ئیسلام و مەسیحی ، بەتایبەتی لە ناوچەی شام و شاری قوودس لە ناوچەکەدا .

جێگەی باسکردنە کە ئەم ڕێکەووتنە لە تابلۆیەکی گەورەی جوان و قەشەنگ دروستکراوە و لە مۆزەخانەی – شالاپورژ – لە ڕۆژئاوای شاری ڤینایە ، کە و دەکەوێتە جوانترین ناوچە لە ئەوروپا ، لە سەر جێگایەکی بڵند لە سەر کەندی سەوز لە کەناری زێی دانووب ، کە بەناوبانگە بە کۆشك و تەلاری بێ وێنە لە ئەوروپادا .

هەروا خاڵێکی گرنگ لەو ڕێکەووتنە ئەوە بوو ، کە شاری قوودس دابەش بێت لە نێوان مەسیحیەکان و ئیسلامەکان ، کە شاری قوودس بگەڕێتەوە بۆ خاوەنداریتی لاتینیەکان و جێگە پیرۆزەکانیش بۆ ئیسلام و جوولەکەکان بێت ، ئەویش لە پێناو بەیەکەوە ژیان لە نێوان ئیسلام و مەسیحی و جوولەکە لەناوچەکە و شارەکەدا .

هەروا بەر لەو کاتەشدا تەقینەوەکەی دانیشتووان لە ئەوروپادا بە شێوەیەکی بەرچاو لە پێناو درێژکردنەوەی دەسەڵات و بە دەست هێنانی سەرکەووتن و کۆکردنەوەی کەلتوور و شووێنەوارە گرنگەکان لە جیهانی مەسیحیدا ، ئەویش کە بۆ جاری چوارەم شاری – قوستەنتینیە – لەلایەن خاچەکان داگیرکرا.

کە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان بوو لەساڵی ١٢٠٤ لە شالاوە بەر فرەوانەکەیان ، کە ئەویش بووە هۆی تالانکردن و بردنی هەرچی شووێنەواری کۆنی سەردەمی بیزەنتیەکان هەبوو بردیان ، کە ئێستا لە مۆزەخانەکانی ئەوروپا بەر چاو دەکەون ، بە تایبەتی لەشاری بوندەقیە کە ئەو کات دەسەڵاتێکی سەربەخۆیی هەبوو لە کێشووەرەکەدا .

سەرچاوە:– www.daraubayat.com

## ١٢٢٩

١٢٢٩/١١/٢ قەڵای هەولێر مەڵبەندی دەزگای میرە – ئەتابەکیەکان – بووەو سەراو بەندیخانەشی تێدا بووە . بەندیخانەش بەناوبانگ بوو. زانای بەناوبانگی ئەم شارە – ئیبن ئەلمستەوفی – ئەم بەندیخانەی بەبەندیخانەی – حەلەبی – حەلەب – ناو دەبات . لەهەندێ نووسراودا روونی دەکاتەوە کە – ژێر زەمین و مەغارە – لەژێر خانووەکانی قەڵادا هەبوونە لەکاتی تەنگانەی شەڕدا بۆ جۆرەها مەبەست بەکارهێنراون .

جگە لەم نووسراوانەش گەلێ تەمەندارانی شاری هەولێر لە ئافرەت و پیاو ئامارژە بۆ ئەم ژێر زەمین و مەغارەو نەخشەو نیگاری خانووەکانی سامانداراني گەرەکی سەرای قەڵای هەولێر دەکەن ... واش دیارە کە ئەم نەخش و نیگارانە لەلایەن هونەرمەندانی پێشووی شاری هەولێر وەك – هونەرمەند وەستا ئیسماعیل و ، وەستا نورەدین سەتەندەچی – هەر ئەو دوو هونەرمەندەش لە سەردەمی – سەفەویەکان و تەتەرەکاندا چاتی گومبەتی دەرگای باشووری قەلایان دروستکردووە .

بەڵام ئەوەی شایانی سەرسوورمانە جوانکاری خەپەنگ و شانە سینەکانی ماڵە دەسەڵاتدارەکان و دەوڵەمەندەکانە . ئەوەشیان وانەبێت تەنانەت هەر دیاردەیەکی قەڵای هەولێر بێت . بەڵکوو دیاردەیەکی ئەوپەری جوانی جیهانیە لە هەرێمەکەدا لە باشووری کوردستان .

سەرچاوە :– ئەتلەسی مێژووی عەرەب وجیهان – ئامادەکردنی دکتۆر سەیفەدین کاتب – دار الشرق – بریروت – سووریا /٢٠٠٥.

## ١٢٢٣

١٢٢٣/١٠/ کەسایەتی ناوداری شاری هەولێر موزەفەرەدین باوکی سەعید کوکیری کۆچی دوایی کردووەو گۆڕەکەی تاکوو ئێستاش لە شاری هەولێرە لەباشووری کوردستان بەرامبەر پارێزگای هەولێر .

شایانی باسە کە جەماوەری شاری هەولێر رێزی زۆر لە موزەفەردین دەگرن و رۆژانە سەردانی دەکەن و وەك پیاوێکی ئایینی لە نیازی گەیاندنیان بە ئاواتە خوازەکەیان لە شارەکەدا .

##  ١٢٤١

١٢٤١/٤/٩ فـراوان بـوونی ئیمپراتۆریـەتی مەگۆلـەکان لـە دوای مردنـی جـەنگیزخان لـ
سـاڵی ١٢٢٧ لـە رۆژهـەڵاتی کۆریـا و بـەرەو رۆژئـاوای ئێـران و هـەروا لـ
باشـووری رووسـیا تـاکوو بـاکووری ، کـە زەریـای هێمنـە لـە باشـوورییەوە .
دوای جـەنگیزخانیش – ئـەقتاح – کـە جێگـەی گرتـەوە لەسـەر فـەرمانرەوای
مـەگۆل ... کـە فـەرمانرەوایی – خـەوارزمـەکان – هـەرەسیان هێنـا لـە فـارس
ئازربایجان .




لە دوای ئەوەی کە مەگۆلـەکان توانیـان بەسـەریاندا زاڵ بـن بـە لـە ناوبردن
سەرکردەکەیـان – جەلالەدین منکبرتی – لـە سـاڵی ١٢٤٠ و لـە هێرشـەکانیا
هـەنگاویان بەرەو ئەوروپا هاوێشت ... لە ئەنجام توانیـان بەسـەر هێزەکا
سووپای هۆڵەندی سەربکەوون لە شەری – لیگنتز – و دوای ئەوە هەوڵیان
بەرەو وولاتی مەژەر هەنگاو بنێن .
دوای ئـەوە توانیـان شانـشینەکەیان – بـیلای چـوارەم – ببـەزێنن لـە مـانگ
/ ١٢٤١/٤ ... کــە هێــرش و شــاڵاوە درندانەکــەی مەگۆلــەکان هــەنگاو
بـەرفراوانی دەنـا بـەهۆی کـرداره نـا مرۆڤایەتیەکـەیان لـە کووشـتن و بـرین
تۆقانـدن لـەو جێگایانـەی کـە دەسـەڵاتیان بەسـەریدا دەشـکا ، بەرامبـەر
دانیــشتووانەکان کــە دەنگووباســەکانیان گەیــشتە جیهــانی ئیـسلامی

مەسیحی ، و بووە هۆکاری دڵتەزاندن .

بە تایبەتی لەو کاتەی کە هەرەشەکانی مەگۆل لە لاباڵی رۆژهەڵات لە جیهانی ئیسلامی و بە ترسناکی مەگۆلەکان بەرە و ناوچەو هەرێمەکان و خەلافەتی عەباسی بەرەو هەڵووەشانەوە و کەووتن هەنگاوینا ، کە لەو کاتەی لە کەنارەکانی شام ژێر دەستەی خاچەکان بوون و هەوڵەکانیان لە پێناو داگیرکردنی میسر و وولاتانی دیکە بوو لە کێشوورەکانی دیکە لە جیهان .

سەرچاوە:- www.starlight.demon.co.uk/mooncal

 ١٢٤٧



١٢٤٧/٥/٨ دراوی دیناری زێر لە شاری مووسڵ بەچاپگەیەندرا لەلایەن بەدرەدین لۆلۆی زەنکی ، کە قەبارەکەی - ٢,٤سم - بوو .شایانی باسە ئەوکاتە شاری موسل ناوی موسل نەبووە ، کە لە ناوەرۆکی مێژوونامەکە بەشێوەیەکی دیار باسی لێووەکراوە .

سەرچاوە :- ئەتلەسی مێژووی عەرەب وجیهان - ئامادەکردنی دکتۆر سەیفەدین کاتب- دار الشرق - بریروت - سووریا /٢٠٠٥.

 ١٢٤٩

١٢٤٩/٦/٦ هێزەکانی سووپای شانشین لوویسی نۆیەمی سەلیبیەکان ، هێرشی کردە سەر - دمیات - ولە ئەنجام داگیری کرد ، لەپێناو گێراندنەوەی ناوچەو هەرێمە داگیرکراوەکانیان لەژێر دەستی ئیسلامەکان.




## ١٢٥٣

١٢٥٣/٣/٣ بـە کۆچـی دوایـی دوا مـەلیکی بنەماڵـەی سـەلاحەدینی ئـەیوبی مـەل
سـەلاحەدینی مـەلیك زاهـر سـەلاحەدین نەجمـەدین ئـەیوب ، کـە بـووە هـۆ
ئەوەی دەسـەڵاتدارانی ئەو بنەماڵەیە لـەدوای بوونی عـزەدین تورکمانیان
پادشـای میـسر لـە ١٢٥٤/٢/٢١ و ، لـەو رۆژەدا پادشـایەتی میـسر کەوت
کۆیلایەتیـەوەو خانەدانی ئـەیوبی سێبەری لـە سـەر وڵاتـی میسر رۆی و
یەکجاری ناویان لە رووپەری پادشایەتی میسر سرایەوە .
جێگەی باسکردنە کە ئەو – موعیزە – لـە کۆیلەکانی مـەلیك سالحی نەو
سـەلاحەدینی ئـەیوب بـووە .... لەبـەر ئـەوەی هەنـدێك کۆیلانـەی بـەر
ئەیوبیەکان لەگەڵ پادشایانی عوسمانی دا هاوچەرخ بوون .
سەرچاوە :– – شەرەفنامە – لاپەرە /١٩٢

## ١٢٥٨

٨ / ١ / ١٢٥٨بە ئامۆژگاری سوڵتان هۆلاکۆ ، کە بۆ سـەرۆکی وەزارەتـەکانی عـزەدین ئە
فەزلی نارد ، ئەویش بۆ داگیرکردنی شاری هەولێر لە باشووری کوردستان
بەهێزێکی گەوورە بەسەرکردایەتی ئەرقیونویان .
بـەڵام دانیـشتووانی شـاری هـەولێر لـە قـەڵادا توانیـان بـەرگری تـەواو لەق
بکـەن ئەمـەش لـەدوای یـەکگرتنیان بەسـەرکردایەتی تاجـەدین کـە لـەو کا

خەلیفەی شاری هەولێر بوو ، کە توانرا هێزی سووپای هۆلاکۆ تێک بشکێنرێ و بەسەریان سەرکەوون ، کە تاکوو ئێستا هەولێر بەوە ناوزەندە بەناوی هەولێری هۆلاکۆ شکێن لە کوردستان .

٨ / ١ / ١٢٥٨ منارەکەی دانیاڵ پێغەمبەر لە شاری کەرکوک کۆنترین مزگەووتە تا ئێستا ، کە منارەکە بەسەرەشی بێت و نزیکەی ١٠٠ مەتر لە مزگەووتی گەوورەی سەر قەڵای کەرکوک دوورە ، کە ئەو مزگەووتە مێژووی دروستکردنی دەگەرێتەوە بۆ بەر لە ئەم مێژووە لە شارەکەدا .

جێگەی شێکردنەوەیە ، کە ئاینەکانی نەتەوەکانی شاری کەرکوک ئەوەندە کۆنن و رەگێکی قووڵی هەیە و لەناو ئەو شارەدا بە جێماوە ، وەك کەلتوورێك بۆ هەموو نەتەوە و ئاینەکان .

تەنیا عەرەب نەبێت لەو شارەدا ، لە بەر ئەوەی عەرەب چەند ساڵێکە روویان لەو شارە کردووە ، ئەویش یەکەم لەرێگەی فتووحاتی ئیسلامی و دووەم لە رێگەی دەسەڵاتداریەتی سەلاحەدینی ئەیوبی و سێیەم لە رێگەی دەسەڵاتی


مەرقەدی دانیال

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی . دوای ئەوانەش بە هۆی دامەزراندنی دەووڵەتی ئێراق ، لەسەر خاکی وولاتی نێوان دوو زێێ – میزۆبۆتامیا – و بە تایبەتی هاتنی رژێمی بەعس لە ئێراق ، کە ئەمانە هۆکاری گەیشتنی عەرەب بوون ، بۆ پارێزگای کەرکوك و مووسل و تکریت و دیالە و چەندین ناوچەی دیکە و هەروا ئێراقی ئێستا ...؟.

لە دوای دامەزراندنی دەووڵەتی جوولەکە لە فەلەستین لەساڵی ١٩٤٨ هەڵگری ئاینی جوولەکە ، روویان لە ئیسرائیل کرد چ بە خۆشی خۆیان و چ

لەسـەر داوای حکوومـەتی نـوێی جوولەکـە و چ بـە پاڵەپەسـتۆی حکوومـەتی ئێـراق لـەو کاتـدا ... کـە جوولەکـە وەك ئـایین و نەتـەوەکانی دیکـە لەشـاری کەرکوك ژیانیان بەسەر بردووە و بەشداری تـەواویان لـە ئاوەدان و شـووێنوار و پاراستنی کردووە جگە لە بوارەکانی دیکەش .

لە هەمان کات پاشماوەی گەرەك و مەرەقەد و تەوراتگە و هونەری بیناکاریان تـاکوو ئێـستاش گـەرەك و کۆچـەی ماڵـەکانیان لـە کـەرکوك دەرازێنێتـەوە ... جوولەکـەو ئـاینی جوولەکـە کـە یەکێکـە لـەو گۆرانـە ئاینیانـەی کـە لەناوچـەی کەرکوکدا سەری هەڵدا و تـاکوو ماوەیـەکی بـاش رۆڵێکی گـەورەیان بینیـووە لـە گەشـەکردنی بـاری کۆمەڵایـەتی و ئـاینی لـەو شـووێنانەی کـە جوولەکـە و ئاینی جوولەکەی تێدا بڵاوبۆتەوە .

کە هاتنی جوولەکە بۆ وولاتی نێوان دووزێی کۆن ، بە سێ قۆنـاخ بـووە و لـە کوردسـتان بڵاوبوونەتـەوە ... ئاشـووریەکان وەك بەنـدی شـەڕ هێناویـانن کـە دەگەرێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زایین .

دوای ئەوانیش کلدانیەکان وەکوو بەندی شەڕ هێناویانن بۆ بابل لە سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زایین ، قۆناخی سێیەمیش دەگەرێتـەوە بـۆ سـەرەتای ئـاینی ئیسلام ، لـە کـاتی خـەلیفە عومـەری کـوری خـەتاب کـە هەنـدێك هـۆزی جوولەکەی هێناو دابەشیکردن ... هێرشی یەکەمی جوولەکە بەسەرکردایەتی شەلماسـەری سـێیەمی ئاشـووری – بـووە پـێش زایـین ، بـۆ سـەر ناوچـەو هەرێمـەکانی – یـەهوزدا – و دەسـت بەسـەراگرتنی ژمارەیـەکی زۆریـان بـە هێنانیان بۆ ناوچەکانی ئاشوور و نیشتەجێکردنیان لە ناوچە جیاجیاکان بۆ ئەوەی بە ئاسانی نەتوانن بگەرێنەوە .

قۆناخی دووەم هێرشی – تەجلات بلاشری سێیەم – بوو بۆ سەر ئیسرائیل و دەسـتگرتن بەسـەر ناوچـەکەیاندا و نیـشتەجێکردنیان لەسـەر ناوچـەکانی کوردسـتان ... لـە سـاڵی ٧٢٢ ی پـێش زایـین – شەلمانـسەری پێنـچەمی ئاشـووری – بـە هێرشـێکی سـەربازی بـۆ سـەر ئیـسرائیل و پایتەختەکـەی گەمارۆدا ... بەڵام لە ساڵی ٧٢١ ی پێش زایین کۆچی دوایی کرد .

لەدوای مردنی ئەو پایەدارە گەمارۆ لەسەر سامەرە سێ ساڵی خایاند لەسـەر دەمـی پاشـا – سـەرجۆنی – دووەم ، تـوانرا ئیـسرائیل داگـیر بکـات و

دانیشتووانەکەی راگوویزێ لە ناوچەکەدا .

کە گیراوەکان ژمارەیان گەیشتە ٢٧,٢٨٠ هەزارکەس و نیشتەجێکردنیان لە شارەکانی – سلخ و – بوزان و – دوّلی خاپوور و – شاری مازی و لە کوردستان ، کە دەکاتە ناوچەکانی ئێستای کوردستان ، واتە هێرش لە دوای هێرشی بەردەوام بوو ، لە لایەن سەرکردەکانی ئاشوور و کلدان لە ساڵەکانی ٦٧٢ و ٥٩٧ و ٥٨٦ ی پێش زایین لە هەریم و ناوچەکەدا .

هەروا هاتنی دانیالێ پێغەمبەر بۆ شاری کەرکوك لەگەڵ هاوەڵەکانی رۆڵیان لە پێگەیاندن و گەشەکردنی لایەنە ئاینیەکانی جوولەکەکان کردووە لە شاری کەرکوك دەوورووبەریدا ... نووسەرو مێژوونووسی عەرەب – ئەحمەد سوسو لە نووسینەکانی دەڵێ :–

دانیاڵ پێغەمبەر یەکێکە لەو پەیامبەرانەی کە هاوسەردەمی – نەبوو خزنەسری دووەم – بووە ... هەر وەك یەکێك لەو چوار پێغەمبەرە گەورانە لە دوای – حزقیال – ە و لە خێزانێکی خانەوادەیە و لەوانەیە کەلە – ئۆرشەلیم – لەدایك بووبێت ... ئەحمەد سوسە ، کە پێشتر جوولەکە بووەو بووە بە ئیسلام ... باس لەوە دەکات کە – ئەبووخزنەسەر – لەگەڵ سێ لاودا هێناویانە بۆ بابل لە سەرەتای یەکەمی فەرمانرەوایی یەکەمی ساڵی ٦٠٥ پێش زایینی .

هەروا سوسە دەڵێ :– دانیاڵ لە بارەگای کۆشکەکەی لەگەڵ هاوەڵەکانی بەخێوکرا ... هەر لەوێش فێری زمانی کلدانی بووە و هونەرو زانیاری کلدانیەکانیش بەباشی فێری بووەو لەگەلی گوونجاوە ... بەڵام شووێنی گۆری دانیال پێغەمبەر وەکوو ئەوەی – بنیامینی ئەنگیلی – ئاماژەی پێ دەکات ، لە سەدەی دوانزەهەمی زاینیدا ، لەشاری – شوشە – شووشان – ە کە کۆنە پایتەختی ئیسلامی ئێرانی بووە ، یان خۆزستان بووە و گۆرەکەی یەکێکە لەو چواردە کلێسەی کە هەیە لەو ناوچەیەدا .



٨ / ١ / ١٢٥٨رۆژهـــــــەڵاتناس و تووێـــــــــژەرو مێژوونووســـــــان هـــەموویان لـــە ســەر ئـــەوە كـــۆكن كـــە هۆكاری سەرهەڵدان و نەشـــــونماكردنی مەزهـەبی كاكەییـەكان دەگەرێتەوە بۆ سوڵتان – ئیسحاق شێخ عیسا – بەرزنجی كوری بابا عەل هەمـەدانی كـوری یـەعقوب كـوری یوسـف كـوری سـەید مەنـسوور كـور عەبدولعەزیز كوری عەبدوللای كوری ئیسماعیل كوری موحدەسی كور ئیمام موسا كازمی – كورد – ، كە ئێستا مەزاركەی لەشاری بەغدا پایتەختی ئێراقە .

وا دیارە لەو دەورووبەرە شێخ عیسا لەگەڵ براكەی شێخ موسا لەشار هەمـەدان لـە رۆژهـەڵاتی كوردسـتان ، بـەرەو وولاتـی سـعوودیەی ئێسـ بەرێكەوتوون بۆ بەجێگەیاندنی رێورەسمی حەجكردن لەشاری مەككە . ك دەگەنــە شــاری مەككــە ، لــە خــەودا دەبیــنن ، كــە هــەردووكیان لــەكات گەرانەوەیان ، كە ئەو بەردە رەشە گەورە هەڵبگرن بۆ هەر جێگایەك برۆن تا ئەو كاتەی كە داوایان لێدەكرێت .

ئـەویش لـە دوای گەرانـەوەیان هەڵدەسـتن بەدروسـتكردنی مزگـەوتێك لـە جێگایەی كە لێی راوەستاون ، ئەو جێگایەش گوندی بەرزنجەیە لە باشوور كوردستان ... لەدوای ماندووبوونێكی زۆر نووستن بەرامبەر گوندی بەرزنج لـە كووخێـك كـە لـە دارودرەخـت لەلایـەن جووتیارەكـان دروسـتكرابوو لـە جێگایـەدا... ئـەوانیش بـەپێی رێنماییـەكانی خەونەكـەیان لـەو جێگای مزگـەوتێكیان دروسـتكردو بەردێكی رەشیان لـە شێووەی بـەردە رەشـەكە مەككە لە یەكێك لە سووچەكانی مزگەوتەكەیان دانا .

كەلەو كاتەش خەلافەتی عەباسی هەرەسی پێ هێنرابوو لەلایـەن مەگۆلـەكا ... لـە دوای تـەواوكردنی مزگەووتەكـە – تەكیـە – دانیـشتووانی ناوچـەكە ل

دەروێش و ئاینـدارەکان روویـان تێکـرد بـۆ خواپەرسـتی و لـە هـەمان کـات خزمـەتیان دەکـرد ... دوای ئـەوە براکـەی شـێخ عیـسا کـە شـێخ مووسـا بـوو بـەرەو گونـدی – شـەولە – بەرێکـەووت کـە نزیـك بـوو لەگونـدی بەرزنجـە ... ئەویش هەوڵەکانی لـە پێنـاو دروسـتکردنی هەمان شێوەی تەکیـەی براکـەی بوو ، کە لە بەرزنجە دروستیکرد بوو ، هەر لەویٚ ژنێکی هێنا بەناوی – فاتمە – بـەڵام نیـشتەجیٚ بوونەکـەی زۆری نەخایانـدو هەنـدیٚ لەئیـسلامە توونـد رەوەکان بەرەبەرەکانیان دەکردو لەئەنجام تیرۆریـان کـرد . شێخ عیسای بـرای کـە زانـی براکـەی شـێخ موسـا کـووژراوە بـەرەو گونـدی – شـەولە – بەرێکەووت و تەرمەکـەی لـە گونـدی بەرزنجـە بەخاك سپارد لـەناو تەکیەکـەو خێزانی براکەی – فاتمە –ی خواسـت و بوونـە هاوسـەری یـەکتری کـە دوایـی سیٚ کوری لێبوو .

کـە ناویـان شـێخ عەبدولـستارو عەبدولکـەریم و عەبـدولقادر بوون . لەلایـەکی دیکە وا دەگێرنەوە کە شێخ عیسا لەو کاتە چووە مەککە بۆ – العمرە – سیٚ دەروێـش لـە ئیـسلامەکان کـە لەلایـەن خـواوە نێردرابـوون داوایـان لێکـرد کـە ژنێکـی دیکـە بهـێنیٚ ... بـەڵام شـێخ عیـسا ئـەو داوایـەی دەروێـشەکانی رەتکردەوە بەهۆی گەوورەیی لەتەمەندا .

بەڵام دەروێشەکان بەردەوام بوون لەداواکەیان بۆ ماوەی سیٚ جارو لەئەنجام شێخ عیسا رەزامەندی لەسـەر داواکـەیان کـردو ژنـی دووەمـی هێنـا بـەناوی – دایـە رێبـاز– کـە کـچی حوسـین بـەگ بـوو لەعەشیرەتی جـاف و لەهـەمان کـات حوسێن بەگ سەرەك عەشیرەتی جـاف بـوو ... ئـەم کـارەش لـە دوای چەندین جار داواکردن لەحوسێن جاف ، ئەویش بەپێدانی کچەکەی بە شێخ عیسا کـە دوای سیٚ جار ئینجا حوسێن جاف رەزامەندی لە خوازبێنیەکـە کـرد ئەمـەش لەدوای چەندین مەرجی گران ، کە ئەمەش لەساڵی ١٢٧٢ بوو لە ناوچەکەدا .

دوای ساڵێك لەهاوسەرێتی – داربـراك خـاتوون – سـەید سولتان ئیـسحاق – لـەدایك بـوو ... لـە دایـك بـوونی سـولتان ئیـسحاق لەسـاڵی ١٢٧٣ بـوو . کـە کاکەییـەکان بروایـان وابـوو کـە لـەدایك بـوونی سـولتان ئیـسحاق بەهـەمان شێووەی لەدایك بوونی حەزرەتی عیسای مەسیحیەکان بووە ...

جـا چـیرۆکی هەمـەجۆری سـەرهەڵدانی کاکەییـەکان لەچـەندین لایـەنی

دیاریکراوەو هـەر هـەموویان بـەرەو یـەك ڕێگـای سـەرەکی هـەنگاو دەنـێن کـە سەرهەڵدانی کاکەییەکان لەم کاتەدا بووە لەهـەرێمی باشووری کوردستان ... ئەویش لەدوای کۆچی دوایی شێخ عیسا لـە ١٣٥٦/٢/٦ لەگوندی بەرزنجەی هەرێمی باشووری کوردستان .

سەرچاوە :- سی ، جی ، ئەدمۆندز – کرد – ترك – عەرەب . ل/١٧٠ – هەمان سەرچاوە – ٦٧ – ٦٨ – ٦٩ عەبدولکەریم مدرس .علماً کان خدمه العلم والدین –چاپی یەکەم / ١٩٨٣.




١٢٥٨/٢/٦ ئـەرتووگوڵ کـوڕێکی بـوو بـە ناوی عوسمان ، کە دەگەڕاوە سـەر ئـەو بنەماڵـەی کـە دەوڵـەتی عوسمـانی دامەزراند ، لـەو کاتـەش بـوو کـە مەگۆلـەکان بەسـەرکردایەتی هۆلاکـۆ شاری بەغدایان داگیر کرد ، کـە پایتـەختی خەلافـەتی عەباسـیەکان بـوو، کـە ئـەو داگیرکردنـە بـووە هـۆی وێرانکردنـی شـاری بەغداو دەورووبەریدا .

کـە دانیشتووانەکە لـەو کـات زۆربـەی زۆری لـە کـوردو ئاشـووری و ئارامـی و فارس بـوون . لـە دوای ئـەو هـەموو کارەساتە، لـەدایك بـوونی عوسمـان بـووە هۆی بەرەو بەهێزبوون لە بارێکی لاوازو گوواستنەوەی بەرەو قۆناخێکی نوێ لـە هـەموو بـوارە جیاجیاکانی بـەرەو دامەزراندنی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی لەهەرێمی ئەنازۆلی ئێستای تورکیا .

١٢٥٨/٢/١٣ لـەدوای داگیرکردنـی شـاری بـەغداو دەورووبـەری لەلایـەن هێزەکـانی سـووپا بەسـەرکردایەتی هۆلاکـۆ ، لـە ئـەنجام هـەر چـەند دامو دەزگـای کـارگێڕی و قوتابخانـەو پەرتووکخانـەو مزگـەووت و کەنیسە هـەبوو وێرانـی کـرد ، بـێ ئەوەی بیر لە دوا ڕۆژی ڕوداوەکان بکاتەوەلە ناوچەکەدا .

١٢٥٨/٢/٢٠ لە دوای وویرانکردنی شاری بەغداو دامو دەزگا کارگێڕیو پەروەردەییو ئاینی لەلایەن هێزەکانی سوپای هۆلاکۆ ، دەستی کرد بە بەرەو باشبردنی باری شارەکەو دەووروبەری ، بەتایبەتی یارمەتیدانی مەسیحیەکانو ڕێز گرتنی- بەتریرک ملیخای دووەم - و دابین کردنی جێنشین کردنی لەسەر کەناری زێی دیجلە لەشاری بەغدا.

**١٢٦٠**

١٢٦٠/٩/٣ بەرپابوونی شەڕی - عین جالوت - کە هێزەکانی سووپای ئیسلام بەسەرکرایەتی شانشین موزەفەر سەیفە دین سەرکەووتنیان بەدەست هێنا بەسەر تەتەرەکان بەسەرکرایەتی سەرکردەی تەتەرەکان - بیپرس - لە هەرێمەکەدا .

١٢٦٠/٩/٣ هێزەکانی سووپای مەگۆڵ بەسەرکردایەتی هۆلاکۆ بەرەو هێرشکردنە سەر شاری ئۆرشەلیمو قوودسو ناوچەکانی دیکە هەنگاوی نابوو ، بەڵام

هێزەکانی سوولتان – بیبرس – توانیان هێزەکانی سووپای هۆلاکۆ تێك بشکێنن و ناوچەکەو دەورووبەری و فەلەستین بەتەواوی رزگار بکەن لە ژێر چەپۆکی هێزەکانی سووپای هۆلاکۆلە ناوچەکەدا .

## ١٢٦١

١٢٦١/٨/١٥ نەخشەکێشان لە پێناو گرتنەوەی شاری قووستەنتینیەی پایتەختی بێزەنتیەکان لەل ایەن – میخائیلی هەشتەم بالیلوج – و دوای گەرانەوەی بە گێرانەوەی شاری قووستەنتینیە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی ، خۆی بووە ئیمپراتۆر لە سەر کەنیسەی – ئایا سۆفیا – ئەویش دوای چوونە ناو شاری قووستەنتینیەی ئەستەمبوڵی ئێستای دەوڵەتی تورکیا.

١٢٦١/١١/٢٦ عزەدین عەبدولسەلام دیمەشقی ، کە نازناوی سوڵتانی زانایانی پێدراووەو لە شاگردانی ئامێدی کورد بووە ... کە ئیمامی جومعەی شاری دیمەشقی شام بووە ، لەوکاتەی مەلیك ئیسماعیل پادشای دیمەشق لە ساڵی ١٢٤٠ قەڵای شەقیفی بۆ خاچ پەرستان چۆڵ دەکات .

لە سەر ئەم کارە نارەوایە لەلایەن عزەدین بەتووندی بەرپەرچدەدرێتەوە و تووڕەیی خۆیان ئاشکرا دەکەن و مەلیك سالح ئیسماعیل لەو کارەدا بە کژیەکدا دەچن و عزەدین لە ئیمامی جومعەی دەخات .

دوای ئەوە لەگەل ئەبوو عومەر ئیبن ئەلحاجب دا دەگیرێن وهەر هەردووکی خستە زیندانەوەو ، لەدواییدا ئەم کەسایەتیە بەرەو میسر رەوودەکات و سوڵتانی میسر رێزی لێدەگرێ و دەیکاتە بەرپرس و ئیمامی جومعەی مزگەوتی – عەتیق – و لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر لە قوتابخانەی سالحیە وانە دەڵێتەوەو تاکوو لەم رۆژەدا کۆچی دوایی لە شاری قاهیرە دەکات و هەر لەوێش تەرمەکەی بەخاك دەسپێردرێت لە شارەکەدا .

سەرچاوە : شەرەفنامە – لاپەرە /١٨٦-١٨٧ .

## ١٢٦٢

١٢٦٢/١١/١٥ موعاویەی کوری ئەبوو سوفیان یەکەمین خەلیفەی دەوڵەتی ئەمەوی بوو لە شام و یەکەم حووکمرانی ئیسلام بوو ، کە باجی نەورۆزی لە بەهاران و باجی میهرەگانی لەپایزدا ژیاندەوە ... هۆی ئەو ژیاندنەوەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو

تەنگ و چەڵەمەدارابییەی کە لەئەنجامی توندوتیژی رامیاریەتەکەی تووشی هاتبوو .

لەو کاتەی کە موعاویە دەسەڵاتی خەلیفەی ئەمەوی گرتە دەست خەڵکێکی زۆر دژی وەستان بەتایبەتی – شوورات , واتە , خەوارجیەکان – عەلەویەکان ... ئەویش بۆ ئەوەی دەسەڵاتەکەی سەربگریٚ و بچەسپیٚ . بەم هۆیە دەستەیەکی لەبەهێزترین میرو والی لەووڵاتەکانی ژێردەسەڵاتەکەی خۆی دامەزراندوو پەیمانی نووسراوی پێدان .

کە هەر باج و سامانێکی لەو ووڵاتانە دەستیان دەکەویٚ بۆخۆیان بێت و تەنیا لە وتاری رۆژی هەینی و جەژن و بۆنەکاندا ناوی موعاویە وەك خەلیفەی ئیسلام بێنن و لەگەڵ وەرگرتنی باجی نەورۆزیش رێگە بدریٚ دابوو دەستووری ئەو جەژنە بەرێووە بچێت .

ئەم خەلیفەیە بۆ وەرگرتنی باج و سامان تەنیا ووڵاتی شامی بەدەستەوە بوو , ئەوەی دەستیشی دەکەووت بەشی هەموو خەرجیەکانی دەریاو بەهێزکردنی حیزبی ئەمەوی و پێکەونانی سووپای بەهێز بوو بۆ پەلاماردانی ووڵاتان و بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلامی نەدەکرد . بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەو گرفتی ئابووری ئەم هەنگاوانەینا : –

١– پێشخستنی کشتووکاڵ لە رێگەی دابەشکردنی زەوی بەسەر پیاوانی دەسەڵاتدارو گرنگی دان بەجۆگەو بنەوان بۆ ئاودانی بەرووبوومی کشتووکاڵ.

٢– دانانەوەی داب و دەستووری و وەرگرتنی دەستوو دیاری و باجی نەورۆزو میهرەگان لەخەڵکەکە ... ئەم هەنگاوەی موعاویەش بۆخاتری چاوی رەشی کورد و نەوە رۆژهەڵاتیەکان ، نەورۆزی ژیاندەوە ، بەڵکوو لەپێناو وەرگرتنی باجەکە ئەو هەنگاوەینا .

ئەم کارەی موعاویە نە هەر تەنیا ئەو رەسمە کۆنەی ژیاندەوە بەڵکوو ئەو جەژنانەشی بایەخ پێداو ژیاندیەوە ...بەتایبەتی جەژنی نەورۆز ... چونکە دەکەوێتە سەرەتای بەهارو ساڵێکی تازە ، کە هەموو ساڵێك لە هەمان رۆژدا ئەم رۆژە خۆی نویٚ دەکاتەوە .

دوای نەمانی موعاویە خەلیفەکانی دیکەی ئەمەوی رێگەیان بەو جەژنەداو

باجی خۆیان كۆدەكردەوەو گەنجینەی دەوڵەتەكەیان پیٚ پردەكرد . لە پێنا
مانـەوەی دەسـەڵاتە هەمیشەییەكەیان ، لەوانـە خەلیفـە عەبدولمـەلیك مـەروا
بوو ، كە لە ساڵی ١٣٠٥ دا كۆچی دوایی كرد .
رێگەی بەجێبەجێكردنی دابوو نەریتی نەورۆزداو باجی نـەورۆزی وەرگرت
یەكێك لەوالیەكانی كە – حەجاجی كوری یوسفی سەقەفی – بوو زۆر بەگەرمی
ئەو رۆژەی لە ئێراقی ئێستاو وولاتی چیاكان و – واتـە كوردستـان – و ئێرا
و خۆرساندا كردووە بـە داب و نـەریت و لـە رۆژی نـەورۆز دەست و دیاری
بەخشیـشی ئـەو جەژنـەی كـۆ دەكـردەوە ، بەتایبـەتی لەوكاتـەی كـە شـاری
كـووتی دروسـتكرد وپایتـەختی ئێـستای ئێراقـی گوواسـتەوە ئـەو شـارە . و
دابوونەریتی ئەو رۆژی لەكۆشكەكەی خۆی لەو شارەدا ژیاندەوە .
هــەموو خەلیفــەكانی ئەمــەوی گرنگیــان بەجــەژنی نــەورۆزدا ، لــە پێنـاو
بەرژەوەنـدی دەسـەڵاتەكەیان تـەنیا خەلیفـەی هەشـتەمی ئەمـەوی – عومـەر
عەبدولعـەزیز – نـەبێت كـە جـەژنی نـەورۆزی قەدەخـەكرد ... بـەڵام دوای
مردنـی ئــەو خەلیفــەی نۆیــەمی دەوڵــەتی ئەمــەوی – یەزیــدی كــوری
عەبدولمەلیك – كە لە ١٣١٩/٢/٢٢ دەسەڵاتی گرتە دەست و جەژنی نەورۆزی
ژیاندەوەو باجی وەرگرت و پەیرەوی رێنماییەكانی خەلیفەی موعاویەی كرد
لە هەموو بوارەكانیدا .

سەرچاوە:– وزارة التربية – تأريخ الحضارة العربية الاسلامية ل/٦ – بەغدا/ ١٩٨٢ ل/١١٤

## ١٢٦٣

١٢٦٣/١١/٤ كۆچی دوایی سوڵتان هۆلاكۆ لە تەمەنی ٥٠ساڵیدا ... ناوی تـەواوی هۆلاكۆ
– قۆلاخۆ – بووەو بەباشترین و لێهاتووترین سەركردە دادەنرێت لـە ئازایەتی
و چاونەترسـی لەهـەموو بووارەكـانی دەسـەڵاتداریەتیدا لەسـەر ئـەو ناوچـەو
هەرێمانــەی كــە دەســەڵاتی بەســەریدا دەشــكاو دام و دەزگاكــانیش لــە
دانیـشتووانی ئـەو ناوچـانە بـوون نـەك لـە لایـەنی دیكـە بـۆ ئـەوەی بتـوانیٚ
سەركەووتن لە ئامانجەكانیدا بە دەست بهێنیٚ بەسەر دانیشتوواندا .

## ١٢٦٥



١٢٦٥/٥/٤ لەدایك بوونی شاعیری ناوداری ئیتالی و جیهان – دانتی – لە شاری فلۆرەنسای وولاتی ئیتالیا .... سەرچاوەکانی مێژووی ئەدەبی جیهان ئەوەندە باسی ژیانی منداڵی دانتی ناکەن ... تەنیا ئەوەندە نەبێ کە دەڵێن جارێ تەمەنی ٩ ساڵ بووە ، کە چاوی بەکچێکی جوان کەوتووەو ناوی – پاتریس – بووە ... حەزی لێکردووەو ئەو حەزو خۆشەویستیە بوونەتە سەرچاوەی سروشتی داهێنانە ئەدەبیەکانی دوا رۆژید .

کەچی لە ئەنجامدا بۆ یەکتری نەبوون ... دانتی زۆر زیرەك و تێگەیشتوو بووە ... هەر لەمنداڵیەوە پەیمانی بەخۆی دابوو ، کە تەنیا زانستی نوێی سەردەمەکەی وەرگرێ و بەماوەیەکی کەم فێری مۆزیکا بوو لەگەڵ ئەوەشدا بەشداری لەکاروباری سیاسیدا کرد .

لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا کرا بە ئەندامی کاربەدەست لە حکوومەتی فلۆرەنسا کە لەو کاتەدا راپەرینی رامیاری توونـد لە نێوان پارتەکەی دانتی و ناحەزەکانی هەبوولە وولاتەکەدا .

بەهۆی بەرزبوونەوەی ئەم کێشەیە دانتی و دەستەیەك لە ئەندامانی پارتەکەی لەساڵی ١٣٠١ بۆ ماوەی ١٤ ساڵ دوورخرانەوە ... دوای ئەوە گەرانەوە وولاتەکە ... ئەم شاعیرە ناودارە لە کارە رامیاریەکان و شیعرەکانی بەردەوام بوو لە پێناو گۆرین و چاکسازی تاکوو لە ١٣٢١/٧/١٤ لە تەمەنی ٥٦ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد لە وولاتەکەیدا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – عەبدولرەحمان بەدەوی بەرگی ١/ .

١٢٦٥/٥/١٥ لـه دایـك بـوونی شـاعیری مـەزنی ئیتـالی – دانتیـه ئـەلگیاری – لـه شـار
فیرنتسه لـه بنەماڵەیـەكی بەناوبانگ ... دانتیـه بیرووبۆچوونەكانی فەلسەفی
رامیـاری لاهـووتی هـەبووه ... بنەماڵەكـەی ، واتـه بـاوك و بـاپیرانی كـار
پیـشەسازی و بازرگـانی و پارەیـان دەكـرد ... بـاپیری – كتـشاكویدا
لەكۆتایی سەدەی یانزەم ئیمپراتۆری ئەلمانی كۆنرادی سێیەم بووه ... ك
لەسەر خاچەكان لەساڵی ١١٤٧ كوژراوه .

دانتیه یەكەم كتابی لەساڵی ١٢٩٣ دانا كه ٣١ پارچه شعری لـەخۆ گرتبو
ئەم شـاعیره نـاوداره لـەكارەكانی شعر و رامیاری و فەلسەفەیەكانی بەردەو
بوو تاكوو له ١٣٢١ كۆچی دوایی دەكات ... كه بەچەندین قۆنـاخ تێپـەریو
به كێشەو گرفت له بووارەكانی ئایینی و رامیاری و فەلسەفەدا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە . عەبولرەحمان بەدەوی – بەرگی ١/

١٢٦٥/١٢/٢٣ لـه دایـك بـوونی زانـاو فەیلەسـوفی نـاوداری ئـاینی مەسـیحی و ناسـراو بـه
جیهـانی ووردبین – – ژوهـن دونـس ئەسـكوت – لـه گەرەكـەكانی كۆنتیـه
ئسكتلەندا ... له بنەماڵەیەكی دەووڵەمەندی دەرەبەگی خـاوەن زەوی گەوو
. ئەمــەو لەلایــەكی دیكــه لــەدایك بوونەكــەی بــه ١٢٦٦/٣/١٧ دادەنـێن .
بۆیەكـەم جـار خووێنـدنی لـه فرنشكن دەست پێكردووه ... هـەر لەسـەرەتا
منـداڵی و خووێنـدنی خـاوەن هەسـت و بـیروو توانایـەكی بـێ وێنـەی هـەبو
لەگەشەكردندا .

ئـەویش بەخووێنـدنی ئـاینی لاهـووت بـۆ مـاوەی ١٠ سـاڵ بەپـشتیووان
مامەكەی – ئیلیا دۆنس – كه چاودێری كەنیسەكان بووەو لـه ١٢٩١/٣/١٧
وێنـەی كـاهینێكی كێـشاوه كـه لـەو كاتـه تەمـەنی ٢٥ سـاڵان بـووه ... لـه
كاتەشدا لـه ئۆكـسفۆرد و لـه شـاری پاریـسی پایتـەختی فەرەنـسا لـه نێـوا
ساڵەكانی ١٢٨٧–١٢٩٠ دەستی كرد بەخووێندن .

دوای ئـەوه لـه زانكـۆی پـاریس لـەنێوان سـاڵەكانی ١٢٩٤ – ١٢٩٧ زانـست
لاهـووتی و فەلـسەفەی خوێنـدووه ... دانراوەكـانی ئـەم فەیلەسـوفه لـه ٢
بەرگـەو لەسـاڵی ١٦٣٩ بـه چـاپكەیەنرا ... ئـەم مرۆڤـه لەژیانیـدا درێخـ
نـەكردووه لـه كارەكـانی تـاكوو لـه ١٣٠٨/١١/١٨ لەشـاری كـۆڵنی ئـەلمان
كۆچی دوایی دەكات .

سەرچاوە :- موسوعەی فەلسەفە - بەرگی /١ دکتۆر عەبدولرەحمان بدوی .

## ١٢٦٧

١٢٦٧/٩/٢٢ لە دایك بوونی جەلالەدین محەمەد عەبدولرەحمان عومەر قەزوینی لەشاری مووسڵ... دوای ئەوە لەگەڵ باوکی روویان لەشاری هەولێر لە باشووری کوردستان کردووە ، کە مەزهەب هەڵگری بڕوای شافعی بووە ... دوای ئەوە لەگەڵ باوکی روو لەووڵاتی رۆم دەکەن . خووێندنی لە بووارەکانی زانستی تەواوکردووە و هەروا لە بواری یاسایی توانای باشی هەبووە ... دوای ئەوە گەراوەتەوە شام و لەشاری دیمەشقی ئێستای پایتەختی سووریا کاری دادگاو خووێندنەوەی وتاری هەینی ئەنجام داوە ... دوای ئەوە رووی لەووڵاتی میسر کردووە.

دوای ماوەیەك گەراوەتەوە شام ... توانای باشی هەبووە لەنووسینی شیعرو بەردەوام بووە لەکارە هەمەلایەنەکانی تاکوو لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی دەکات و لەگۆرستانی سوفیەکان بەخاك دەسپێردرێت لە ووڵاتەکەدا .

تێبینی:- ئەم کەسایەتیە عەرەب نەبوورەو بنەماڵەکەی لەناوچەی دەریای قەزوین هاتوون .

## ١٢٧٣

١٢٧٣/١/١٧ رووداني بوومە لەرزەی زەوی ووێرانکەر لە هەرێمی ئازربایجان ، کە بووە هۆی،گیان لە دەست دانی بە سەدا هاووڵاتی و زامدار بوونی بە دەیا هاووڵاتی دیکەو ووێرانکردنی بەسەدا خانوو کێڵگەی کشتووکاڵی ، کە لەوکات تەنیا کەنیسەی سریانیەکان نەبێت بەبێ زیان لێکەووتن مایەوە ، کە هەموو مەسیحیەکانی ئەو هەرێمە روویان تێ دەکرد بۆ خوا پەرستی و مەراسیمەکانی ئاینی مەسیحی لە ووڵاتەکەدا .

## ١٢٧٦

١٢٧٦/٢/١٧ رەشە بایەکی خۆڵاوی بێ ووێنەی سوور ، ناوچەکانی مووسڵ و هەولێری گرتەوە بۆ ماوەی شەش کاتژمێر بەردەوام بوو، کە بووە هۆی دورستکردنی ترسێکی تۆقاندن لە دەروونی دانیشتووان . هەر لەم رۆژەدا تۆرانیەکان قەشەی شاری ئازربایجانیان تیرۆر کرد لە گەڵ سی هاووڵاتی دیکە.

## ١٢٨٠

١٢٨٠/١١/١٥ کۆچـی دوای فەیلەسوفی لاهووتی مەزن – ئەلبتریس ماگنوس – ناسراو بە ئەلبرتسی مەزن لەشاری کۆلۆنیا لە ئەلمانیا... شایانی باسە ئەم فەیلەسوفە مامۆستای قەدیس تۆمائەکوینی بووە ... لە بەر ئەوە بەنازناوی ئەلبرتس ئەلتیتوونی ، یاخوود ئەلبرتس کۆلونی ناوبانگی دەرکردووە ... دوای ئەوە روو لەئیتالیا دەکات و لە زانکۆی بادوخا دەخوێنێ لەسەر مەبدەئەکانی فەیلەسوفی ناوداری جیهان ئەرستۆ .

دانراوەکانی ئەم فەیلەسوفە بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٦٥١ لە ٢١ بەرگدا بەچاپگەیەنراوە ... دوای ئەوە دیسان لە ٣٨ بەرگ بەچاپگەیەنرا ، چونکە چاپی یەکەم چەندین ناتەواوی و دەست نووسەکانی کۆنەکرابوونەوە ئەویش بەچاودێری p.jammy لە فەرەنسا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – بەرگی /١ – عەبدولرەحمان بەدەوی .

## ١٢٩١

١٢٩١/٥/١٨ شاری قوودس و دەوورووبەری لە دوای شەڕیکی خوێناوی بێ وێنە لە نێووان هێزە چەکدارەکانی سووپای مەسیحی و هێزەکانی سووپای ئیسلام ، لە ئەنجامی ئەو شەڕە هێزە چەکدارەکانی ئیسلام توانیان هەرێمەکە بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و، کە مەسیحیەکان توانای بەرگری و پاراستنی هەرێمەکەیان لە دەست نەما ، کە ئەمەش بەسەرکردایەتی نەوەکانی سەلاحەدینی ئەیووبی و کوردە بەشدار بووە چەکدارەکانی بوون دژی هێزەکانی مەسیحی لە ناوچەکەدا .

بەم هۆکارەش نەتەوەی عەرەب توانی بکەوێتە وە سەر پێی خۆی و ئاواتەکانی جێ بە جێ بکات لە فرەوانبووندا .

## ١٢٩٥

١٢٩٥/١١/١٠ لە زاناو ئەدیبی ناسراوی کورد – فەخرەدین ئیبراهیم ئیسحەق یحیا ئەمەدی – واتە دیاربەکر – لە باکووری کوردستان چاوی بەجیهان هەڵهێناوە...خوێندنی لەشارەکانی دیمەشق و بەغداو ئەسکەندەریەی میسر

تەواوکردووە ...چەندین پلەو پایەی بەدەست هێناوە بەهۆی زیرەکی و ئازایەتی بەتایبەتی لە بوارەکانی ئاییندا ... لەبەر ئەوەش توانیوویەتی کارەکانی ئەوقاف بگرێتە دەست و لەریزی سووپاش کاری کردووە . ئەم کەسایەتیەش بەردەوام بووە لەکارە جۆراوجۆرەکانی تاکوو لە ١٣٧٦/٥/٢١ لەمیسر کۆچی دوایی دەکات .

سەرچاوە :- شذرات الذهب ٢٥٥/٦ ... الدليل اشافي ٩/١.

## ١٢٩٧

١٢٩٧/٦/٣٠ هێزە چەکدارەکانی ئیسلام بەسەرکردایەتی شێخ عەلائەدین هێرشیان کردە سەر شاری ئەمەد- دیاربەکر - لە باکووری کوردستان ، بەبێ دەست پاراستن دەستیان کرد بەکووشتنی مەسیحیەکان بە ناشیرین ترین شێووە ئازاریان دانو بەسەدانیان لێ کووشتن ، لەوانە مەترانی مەسیحی- گریگۆر یۆس- ، لە هەمان کات هەرچی کتێبو نووسراوو کەلووپەل هەبوو هەموویان تالان کردو سووتاندیان .

## ١٢٩٦

١٢٩٦/١٠/٣٠ نووسەری ناوداری کورد و نووسەری کتێبی کوردو کوردستان - ئەمین زەکی بەگ - دەڵێ :-

لەدوای وەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن خازانخان ئەفراسیای کردەوە بەفەرمانرەوایی لۆرستان ... دوای ئەوە لە خازانخان بەرەو شاری بەغدا هەنگاوینا ، ئەویش بەفیتی ئەفراسیای دلرەش و تەرەکەباز ، کە فەرمانیدا بەقەڵاچۆکۆدنی کورد ، کە نزیکەی ٥٠ هەزار کوردیان کووشت و مولك و سامان و ژن و منداڵ و پیریان بەتاڵان بردو وای لێهاتبوو ، کە کورە کوردێکی دوانزە ساڵانیان بە ١٢ درەهەم دەفرۆشت و گۆلکەیان بە پێنج درەهەم دەفرۆشت و ، لەهەمان کات نرخی بەرانێك - بەران - بە درهەمێك بوو .... ئەمەش لەتۆڵەی ئەوەبوو کە ئەو کوردانە لە دژی خانی یارمەتی میر نەورۆزیان دەدا لە ناوچەکەدا .

سەرچاوە :- شەرەفنامە - لاپەرە /٨٢ .

 ١٣٠٣




١٣٠٣/٨/١٥ گەریدەو نووسەرو موئەریخی بەناوبانگ – محەمەد عەبدوڵڵا محەمــەد ئیــبراهیم تــەنگی – ناسراو بە – ئیبن بەتووتە – لە تەنگەی وولاتی مەغرب لەدایك بووە ... شایانی باسە کە ئەم دانـــەرە بەناوچـــەو هەرێمـــە جیاجیاکان زۆرگەراوە ، لەوانە وولاتـــی مـــەغرب و میـــسرو ناوچـــەکانی شـــام و حیجـازی سـعوودیە و ئێـراق و وولاتـــی فارس و کوردستان و یەمەن و بەحرێن و توورکمانستان.

هەروا هەندێ ناوچە لەچین و هندو وولاتی تەتەرو ناوەراستی ئەفەریکیا کە مـاوەی سـوورانەوەکەی ٢٧ سـاڵی خایانـدووە لـە سـاڵی ١٣٢٥ تـاکو ١٣٥٢ زایینی . ئەم موئەریخە چەندین دانراوی جێ هێشتووە وەك کەلتوورێکی بێ وێنـە لەوانـە – تحفـە النقـار فی غرائـب الامگـار و عجائـب الاسـفار – کـە بـۆ زمانەکانی پرتووگالی و فەرەنسی و ئینگلیزی – وەرگێردراوە . هـەروا ئیبن بەتووتە جگە لەزمانی عەرەبی ، زمانەکانی فارسی و تورکی بە باشی زانیووە لە ئەنجامی ئەم گەشتەیدا .

لـە دوای ئـەم سـوورانەوەیەو بەدەسـت هێنـانی زانیاریـەکی بـاش لەوکاتـدا گەراوەتـەوە شـاری مـەراکش و لـەوێ لـە ١٣٧٧/٥/١٠ ماڵئـاوایی دەکـات . نووســینەکانی وەك سەرچــاوەیەکی گــرنگ لەلایــەن نووســەرو دانــەروو مێژوونووسان بایەخێکی بێ وێنەی هەیە لەهەموو بوارەکاندا .

تێبینی :– جێگەی باسکردنە کە ئەم نووسەرە لە سوورانەوەکەیدا بەناو خاکی کوردستان بە شێووەیەکی بابەتیانە باسی کوردی نەکردووە و زۆر لە سەرکردەو تیرەو

هۆزەکانی کوردی-بە توورك یا فارس ناوزەند کردووە ، هەروا لەگەڵ ناوچەکانی کوردستان ... (نووسەر).

## ١٣٠٥

١٣٠٥/١١/٥ لە دوای چۆل بوونی کورسی رەسوولی – پاپا – بۆ ماوەی یەك ساڵ ، بە هۆی دابەشی کەرادلە ، و کە بووە هۆی ئەوەی کە سەرۆکی ئەسقفە بووردو هەڵبژێرن- برتراندی گوت- بە هۆی هەلوێستی بوێرانەی لەگیانی ئاشتیانە لە سەر ئینگلتەراو ئەو دووبەرەکیەی کە لە نێوان شانشینی فەرەنسا وپاپا هەبوو ، لەوکات لە شاری لیۆن بە ناوی – ئقلیمنزس- کە فیلیب ئامادەبوو، داوای یارمەتی لە پاپا کرد بە کۆتایی هاتنی کێشەکان لە نێوان فەرەنسا و ئینگلتەرا لەبارەی ئەلگسکوونیا .

## ١٣١٠



١٣١٠/٧/١ بۆجاری دووەم ئیمپراتۆریەتی ئاشووری لە دوای کەووتنی لە شاری نەینەوا – مووسڵ – کە لە ساڵی ٦١٢ کەووتنی یەکەمی بوو لەلایەن ئیمپراتۆریەتی میدیای کورد ، کە لەو کاتە ئاشوورییەکان وا دەرنەکەووتبوون ، کە هیچ لایەنگیریەکیان نەبوو لە خۆپاراستن بە هۆی هەڵوێستی خۆپەرستی و ماوەنەدان بەگەلانی دیکە ، بە تایبەتی گەلی کورد لە ناوچەی مووسڵی کوردستانی کورد .

کە لەو کات بەهۆی نەبوونی هاوکاری لە نێوان ئاشووروو میدیادا ، لەو کاتیش لە هەولێر بەکەووتنی هەر چوار کەنیسەکەو قەلای هەولێر ، کە

ئـەو کـات ناوزەنـد بـوو بـە – ئـەربائیلۆ – کـە بـۆ جـاری یەکـەم وکۆتـای
ئیمپراتۆریەتی ئاشووری و کەوتنی بەخۆوەدی لـە هەرێمەکـەدا . لـە وڵات
میزۆبۆتامیا .

## ١٣١٧

١٣١٧/٣/٦ رەوشـی تەسـەووف لـە کوردسـتاندا ، کە دوای تەریقـەتی قادری و تەریقەت
نەخشەبەندی بە دووەم و گەورەترین تەریقەتی ئایینی ئیسلام لە کوردستا
دەژمێردرێت .
جێگەی ئاماژە وپێکردنە کە ئەم تەریقەتە لە شاری بۆخارا لەلایەن کەسایەت
بەناوبانگی ئایینی ئیسلام – بەهائەدین محەمەد – سەری هەڵداوە ... کە بە
پێیەی رێورەسمەکانی زیاتر پابەندی شەریعەتی ئایینی ئیسلام بوون ... لـە
کاتیشدا بیروباوەری ئایینی بووە هۆکارێکی بەهێزی ململانێی بە ئـەنجا
گەیاندن ، بە سەرکەوتووانە لـە هـەموو بووارەکانی ئایینی و دوورکەووتنـەو
لەبیروبۆچـوون و بـروای نەتـەوەیی و نیـشتیمانی ... کـە زۆربـەی مـەلاکان
ئاینی روویان لەم تەریقەتە دەکرد لـە بەر ئەوەی لـەنێوو خـەڵکی سادەدا زۆ
بڵاوببووەوە لەلایەن مەزهەبی سووننەو شیعەی هەڵگری ئایینی ئیسلام .
هەرچـــەندە لـــە ســـەدەی ٦٣٠ کۆچـــی لـــە کوردســـتان پـــەیرەوان
دەرنەکـەووتبوون . بـەڵام لـەکۆتایی سـەدەی ٦٣١ ی کۆچـی بـۆ بەدەسـ
هێنـانی ئـەم تەریقەتـە کەسایەتی نـاوداری کـورد – سـەید عـەلی کـوری – ک
خـەڵکی ناوچـەی ئامێدی بووە لـە باشـووری کوردسـتان ، رووی لەمەڵبەند
شـێخەکانی تەریقـەتی نەقشەبەندی لـە سـەرمەنقەند کـردووەو تەریقەتەکـە
وەرگرتـووە ... کـە چـەندین سـاڵ لـەو شـارە لـە خزمـەتی شـێخەکانیان بـووە
تاساڵی ١٥١٩ لەناوچەی قەزوین لەلایەن ئۆزبەکیەکان دەکووژرێ.
لەبەر ئەوەی لە رۆژهەڵاتی کوردستان بەشێووەیەکی گشتی تەریقەتی قادری
جێگەی خـۆی بەشـێووەیەکی بـەرفراوان زاڵ کردبوو ... هـەر چـەند تەریقەتی
دیکەی ئاینی ئیسلام هاتبوونە ئاراوە ، بەڵام لەسەر ئاستێکی تەسکدا ...ک
لـە سـەردەمی – قـەرەقۆینلۆکان – تەریقـەتی – حروفیـە – هـەبوو ، کـە ئـە

تەریقەتە ئایینیە تەریقەتێکی شیعە بوو ، کە لە سەدەی ٦٢٩ ی کۆچی لەلایەن – فەزوڵڵا ئیستریادی – هاتۆتە کایەوە کە لە لێکدانەوەی – خەون – شارەزابووە .

هەروا تەریقەتی ئەم مرۆڤە لە سەر بنەمای پیرۆزکردنی مرۆڤ دامەزراوەو داوای لە تەیمور لەنگ و سولتان و میرەکان کردووە کە بێنە ژێرباری باوەرەکەی ... کەچی لە ساڵی ١٣٩٤ ی زایینی لەلایەن میران کووژراوە ... پاش کووژرانی – میران شا – لەلایەن قەرەقۆینلۆکان قەرە یوسف گرنگی بە حروفیەکان داوە ... تەریقەتی حروفیە لە ئەنادۆڵ لەخۆی نزیك خستۆتەوەو لەقەلەمرەودا پارێزگاری لێ کردوون ، لەبەر ئەوەی دووژمنی سەرخستیان – میرانشا – بەدەستی قەرە یوسف کووژراوە .

پاش ئەو گرنگی پێدانە دەرگای کوردستان لەبەردەم موریدانی حروفیە کرانەوەو چالاکیان تا ئەوپەری وولاتی رۆم رۆیشتووە ... هەرچەندە حروفیەکان لەتەك فەرمانرەوایی قەرەقۆیتلۆکان کاریان کردووە ... بەڵام میرو خەڵکی کوردستان روویان لەم تەریقەتە نەکردووە لەبەر ئەوەی پەیرەوی مەزهەبی شیعەیان دەکرد ... سەرەرای ئەوەش کاریگەری خۆی لەسەر خەڵکی کوردستان هەبووە .

سەرچاوە :– مێژووی ئێراق لە نێوان دوو داگیرکردن – دانانی – پارێزەر – عەباس عەزاوی – بەشی /٨ .

## ١٣٢٦

١٣٢٦/٨/٢١ لە بنەماڵەی ئۆرخانی دووەم – عەلائەدین – لە تەمەنی ٧٠ ساڵیدا کە هەموو هەوڵەکانی بۆ دامەزراندنی دەووڵەتی عوسمانی تەرخان کردبوو، ئەویش تووانی دراو لێبدا لە مس . لە هەمان کات دامو دەزگای دەووڵەتی دامەزراندو براکەی ئۆرخان کاری کردنەوەو– فتووحات – بگرتە دەستو هەوڵیدا بە بەفراوانکردنی دەسەڵاتو فراوان کردنی پارچەی سنووری جووگرافی لە هەرێمەکەدا ، بە بڵاووکردنەوەی ئاڵای دامەزراندنی دەووڵەتی عوسمانی ، لە وولاتە دراووسێکان بە تایبەتی. لە سەر خاکی کوردستان.

## ١٣٢٧




١٣٢٧/١١/١٧ لـــه یـــەکێك لـــه شـــــارەکانی دوواوەی زێ و لـــــه گونـــــدی خواجـــــەئیلگار تـــەیموری لـــەنگ لـــــــــەدایك بـــووە....بـــاوکی جووتیـــار بـــووە.. لەســــــــەرتا تـــەیموری لـــەنگ گـــەنجێکی تەمـــەڵی دڵ رەق و بـــەهێزبووە و هـــەردەم حـــەزی لەشەڕو کێشە دروستکردنی گرفت بووە ... لەهەمان کات دەستی دزیکردنی ماڵی خەڵکی هەبووە .

جارێـــك چـــەند مـــەرێك دەدزێ و لـــە ئاکامـــدا بەردەبێتـــەوەو قاچـــی تووشـــی نەخۆشـــی دەبـــێ و دەلـــەنگێ ، بۆیـــە ناوزەنـــد بـــوو بـــە تـــەیموری لـــەنگ ، کـــە بەزمانی کوردی و فارسی پێیدەگووترێ لەنگ واتە – الاعرج – و بە تورکیش پێی دەگووترێ – ئاقاق – ، تاکوو ئەم گەنجە بووە یەکێك لەسەرکردەکانی مەگۆل و لەشێوەی جەنگیزخانی دەکرد لەهەڵس و کەووت و هەڵوویست و ئامانجەکانیدا .

سەرچاوە :– مێژووی ئێراق لە نێوان دوو داگیرکردن – دانانی – پارێزەر – عەباس عەزاوی – بەشی /٧ .

## ١٣٣١

١٣٣١/١٠/٤ کۆچـــی دوایـــی جووگرایننـــاس و رامیـــاری و شـــاعیری نـــاوداری کـــورد – ئیسماعیل عـەلی ئـەیوبی – . شایاینی باسـە کـە ئیسماعیل عـەلی ئـەیوبی ناوزەنـد بـووە ، بـە بـاوکی فیـدا ، و لـە شـاری دیمەشقی پایتـەختی ئێستای سـووریا لــە دایـك بـووە ... کــە بنـچەی دەگەڕێتـەوە بـۆ شاهنـشای کـوری

نەجمەدینی کوری ئەیوبی برای سولتان سەلاحەدینی ئەیوبی .

باوکی فیدا جووگرافینناس و رامیاری و شاعیر بووە ... لەکاری خۆیدا لەجووگرافیا پاشا بووەو رۆڵی بالآی هەبوو . ئەنجوومەنێکی زانستی بەناوبانگی هەبووە ، کە زانایان چاودێریا دەکردو ئەویش هاوکاری دەکردن... گرنگترین پەرتوکی رۆژ ژمێری وولاتانە ، کە بەم پەرتوکە توانی گەورەترین ناوبانگ دەربکات...تائێستا گرنگترین پەرتوکی جووگرافیایە لەجیهانی جووگرافیادا.

## ١٣٣٢



١٣٣٢/٥/٢ لە دایك بوونی نووسەرو رووناکبیر و مێژوو نووسی بە ناو بانگی جیهانی ، عەلامە - ئیبن خەلدون- لە وولآتی توونس ... ئەم کەسایەتیە مرۆڤێکی لێهاتووی بووارەکانی ژیان بووە ، لە بوواری رامیاری و نەتەوەیی و کۆمەلآیەتی و ئەدەب و زانست و شیعروئایین ... کە ووتە بەنرخەکانی تاکوو ئێستاش جێگەی رێزلێگرتنە لە جیهاندا .

## ١٣٣٧

١٣٣٧/٧/٢ داگیرکردنی شاری بەغدا لەلایەن شێخ حەسەن جەلایری ، ئەویش بە لە ناوبردنی حکوومەتی مەگۆل لە ئێراقی ئێستا و بە دامەزراندنی حکوومەتی جەلایریە کەناونرا بە - ئەلایلگانیە - کە یەکەم شانشینی شێخ حەسەن کە بەر لەوە ناوی شێخ حسنیە بووە .

ئەو شێخ حەسەنە کوری شێخ حوسێنی کورکان بووە و پێی گوتراوە -

خێڵ - دوای ئەوە کچی ئورگاتمانی کوری ئاقیفا - ئاق یوگا- ی کور
ئیلگانویان جەلایری هێناوە.




کە دەگەرێتــەوە ســەر رەچـەڵەکی ئیلگانویـان . جـەلایرەکان تـیرەك بوونـە لـ
تیرەکـانی کـە دەسـەڵاتی مەگۆلیـەکان لـیٚ پێکهێنـراوە ... لەحکوومەتەکـە
جـەلایری نەخـشەیەکی فـراوان دروسـت کـراوە ، کـە ناوچـەو هەرێمـەکان
کوردستانی تیا دەست نیشان کراوە ... من نامەویٚ بەدرێـژی باسـی بکـە
چـونکە مێژوونامەکـە ، تـەنیا کردنـەوەی دەرگایـەکی مێـژووی پووختـە لـ
روودا وەکاندا .

سەرچاوە :- مێژووی ئێراق لە نێوان دوو داگیرکردن -دانانی - پارێزەر - عەباس عەزاوی - بەشی /٨ .

## ١٣٤٠

١٣٤٠/٦/٢٤ هەڵگیرسانی شەری - ئەلهەویس - لە نێووان هێزەکانی سووپای دەریـایی
جــەنگی شانــشینی فەرەنــسا شانــشین - فلیبــی شەشــەم - و کەشــتیە
دەریایـەکانی سووپای شانشینی بەریتانیا شانشین - ئەدواردی سێیەم -
کـە لـەو شـەرە زۆربـەی کەشـتیە جەنگیـەکانی فەرەنـسا لـەناو چـوون ، ئـەم
شـەرەش هـیچ کاردانەوەیـەکی ئـابووری لەسـەر بـاری شانـشینی فەرەنـسا
نـەکرد ، بـەهۆی یارمـەتی سـەرمایەدارە دەرەبەگـەکانی فەرەنـسا ، کـە رۆڵـی

سەرەکیان هەبوو لە دەسەلاتی فەرەنسا.

/ ٥ / ١٣٤٥ رووخانــدنی تــەلاری کۆشــکی کیــسرا لــە رۆژهــەلاتی شــاری ئێستای بەغدا ، لـە دوای ســەرکەووتنی عەرەبــە ئیسلامەکان ، لـە رێگـەی فتووحــاتی ئیــسلامی بەسەر هێزەکانی فارس ،




کە تا ئێستاش پاشماوەکانی ماوەو هەوڵی چاککردنەوەی نادرێت لە لایەن حکوومەتەکانی کە لەئێراق دەسەلاتیان گرتۆتە دەست لە ناوچەکەدا .

## ١٣٥٦

١٣٥٦/٢/٦ لە دوای مردنی شێخ عیسا ، براکانی سوڵتان ئیسحاق لێی توورەبوون کە بووە سەرهەڵدانی کێشە لە نێوانیان و داوایان لە سوڵتان ئیسحاق کرد ، کە ئەو میراتەی باوکی کە بەجێی هێشتووە دابەشبکرێت لە زەوی وخانوو کێڵگە کشتووکاڵیەکان و ئاژەڵ و سامانەکانی دیکە... سوڵتان ئیسحاقیش ئەم داوایەی جێ بەجێکردو هیچی بۆخۆی نەبرد ، تەنیا هەندێ پێداویستی ئەوکات .

دوای ئەوە داوایان لە سوڵتان ئیسحاق کرد کە لە گوندی بەرزنجە بروات . ئەویش گوندی بەرزنجەی جێهێشت و بەرەو – پردێوەر – بەرێکەووت و لەدایکی – دار براك – و هەندێ لەهاورێکانی وەك – بنیامین و داودو پیرموسا و مستەفا ... هەروا لەگەڵ حەوت کورەکەی و دەروێشەکانی کە بروایان بەبیری ئەو بوو ... لەو کاتەی کە گوندی بەرزنجەی جێ هێشت بەرهەڵستکارانی ئیسحاق بەبراکانی ئیسحاقیان گووت:–

بەهۆی بردنی مافوورەکانی و رایەخەکانی تەکیەکە ئیسحاق هەموو کەسایەتی و لێهاتوویی بۆ خۆبردو هیچی بۆئێووە نەهێشتەوە . دوای ئەو ناوناتۆریە براکانی سووپایەکی پێك هێنا بەسەرکردایەتی سێ لە براکانی ئیسحاق و ناوی سووپایەکەیان نا سوپای – جیجك – وبەرەو دوای سوڵتان

ئیسحاق ویاوەرەکانی بەرێکەوتن و لەئەشکەوتی – مەرنۆ – لە شارەزوو
تووشی یەك بوون وویستیان خۆی و یاوەرەکانی هەموو بکووژن .
لەو کاتەی کە تووشی یەك دەبن زۆر بیرووبۆچوون هەیە لەسەر لەناوچوون
براکانی ئیسحاق بەفەرمانی خوا ... بەڵام بەهەرحاڵ سوڵتان ئیسحا
لایەنگری زۆر دەبێ بەهۆی هەڵس و کەوتوو پەیوەندی و ووتەکانی . ک
ئەمەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی بیرووبۆچوون ، لەلایەن خەڵکی هەرێمەکە ل
باشووری کوردستان ، بەتایبەتی لەپارێزگای کەرکوك و سلێمانی
هەندێکیش لە هەولێر ، لە ناحیەی گوێری سەر بە پارێزگای هەول
لەباشووری کوردستان .
لەلایەکی دیکە رۆژهەڵاتناس – سی . جی – ئەدمۆند دەڵێ :– بڕوا
کاکەییەکان دەگەڕێتەوە سەر ڕێگای سۆفیەکان و لەرێکخستنەکانی پێشو
لە هەرێمی لۆرستان سەری هەڵداوەو بەرەو ناوچەی شارەزوور و هەوراما
هاتووە ، لەرێگەی کەسایەتی ناوداری کورد – شاه خۆشین – کە چەن
هاورێیەکی هەبووەو هەروا بەرامبەر بە سوڵتان ئیسحاقیش... لەهەمان کا
رۆژهەڵاتناس مینۆرسکی دەڵێ : –
کاکەییەکان ئاینەکەیان ئاینێکی کوردیە ... لەلایەکی دیکەش محەمەد ئەم
هەورامانی دەڵێ :– کاکەییەکان پەیوەندیەکی روون و بەهێزی ئاینیان هەیا
ئەوەش پەیوەندە بەناوچەیەك ، یاخوود چەندین ناوچەی دیاری کر
لەهەرێمی باشووری کوردستان .
واتە لەو کاتەی کە سوڵتان ئیسحاق لە – پردێوەر – جێ نشین بووە . کو
گەورەکەی بەناوی – محەمەد گەورە سوار – سەرپەرشتی کاروبار
براکانی بکات – هەفتەوانە – و داوای لێکردن ، کە شێخایەتیەکە لەدوا
یەك ئاڵووگۆڕ بکەن بەناوی – پیرە – کە ئەو برا گەورەیان بەناوی – کاکە
دەستی پێکردو ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هەڵگری بیرووبڕووا
کاکەییەکان لەهەر جێگایەك بن پەیوەندی بەهێزیان هەبێت لەهەم
بوارەکاندا .
کە لەو سەردەمە شێخ ، یاخوود گەورە ، یاخوود رابەری مەزهەب
کاکەییەکان دەستی پێکرد لە پەیوەندیە هەمەلایەنەکانی ئەو مەزهەبە ل
جێگایانەی کە کاکەییەکانی تیایە لە ناوچەو هەرێمەکاندا .

سەرچاوە :– کاکەییەکان – لێکۆڵینەوەیەکی ئەنتەرو پۆلۆژیە لە ژیا

کۆمەڵایەتی . د. نوری یاسین هەرزانی ، پەیمانگای شووێنەواری کورد – لەسەر ئەرکی ماڵی ئاراس بۆ بڵاوکردنەوە – چاپکراوە لە هەولێر – باشووری کوردستان .

١٣٥٦/٩/١٩ بـەر پـابوونی شـەڕ لـە نێـووان لایـەنگیرانی شانـشینی فەرنـساو بەرهەڵستکارانیدا ، کە لـە ئاکامـدا شانشینی فەرەنسا – جانی دووەم – لـە کۆشکی شانشینی بەریتانیا بەند کرا ، بە هۆی بەزینی هێزەکانی سووپای فەرەنسا لـە – موبیرنـۆی – و بلـۆك كردنـی سـێیەکی فەرەنـسا . لەلایـەن شانشینی بەریتانیا بە باج سەندن بەبری ٣,٠٠٠,٠٠٠ ، سێ ملیۆن ریالی زیر بەرامبەر بەو بلۆك كردنە.

## ١٣٦١

١٣٦١/٦/١٦ کۆچـی دوایـی متەسـەوفی تێئـوری ئـەلمانی – تـاولر گوهـانس – لـە ئیستراسبورگ ... شایانی باسە ئەم زانایە لە ساڵی ١٣٠٠ چاوی بە جیهان هـەلهێناوە لـە ئیستراسبۆرگ ... پەیوەنـدی بـەرێگای دۆمینکـان کـردووەو لەساڵی ١٣١٥ ماوەی دوو ساڵ لەخووێندن و لێی بەردەوام بووە .

دوای ئـەوە لەسـاڵی ١٣٢٥ بـەرەو کلـن – کۆلۆنیـا – چـووەو لـەوێ دەسـتی بەخووێنـدن کـردووە ... دوای ئـەوە لـە ساڵی ١٣٣٩ بۆتـە مامۆستا لـە شاری بازلی سویـسری و دوای ئـەوە لەساڵی ١٣٤٧ گەراوەتـەوە ئیستراسبورگ .... ئـەم زانایـە چـەندین دانـراوی هـەبووە بـەپێی بیروبۆچـوونەکانی لەهـەموو بوارەکانی ئایینی و فەلسەفە تاکوو کۆچی دوایی دەکات لە شارەکەدا.

سەرچاوە :– مەوسوعەی فەلسەفە – بەشی /٢ – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی .

## ١٣٧١

١٣٧١/٧/١٥ بـۆ یەکـەم جـار تـەیمووری لـە نـگ دەرکـەووت بەراگەیانـدنی سـەربەخۆیی لەناوچەی تورکمانستان و خۆی بەشانشینی هەرێمەکە راگەیاند لـە دوواوەی زێ ... تـەیمووری لـەنگ کـوری ترگـای کـوری ئیگـای ژکتـان بـووە ... دەرکەووتنەکەشی لە نێوان ناوچەی کەس و سەمەرقەند بووە . تـەیمووری لـە نـگ هـەروەك فتووحـاتی ئیـسلامی و چـاولێکەری لـەو کـارە دەسـتی کـرد بەداگیرکردن و فراوانکردنی دەسەڵاتی لە سەر زۆربەی هەرێم و ناوچەکان لـە کێشووەری ئاسیاو ئەورروپاو هەندێکیش لە ئەفەریکیا.




ئەمـــەش بـــەهۆی هاوكـــاری كردنـــی لەلایـــەن هۆزێـــك بەســـەركردایەتی شەمـــسەدینی فـــاخوری و پیركـــە ، كـــە ئەمانـــە لـــە ئاسیای بـــچووك دیـــارو بـــەهێزبوون ... لەهـــەمان كـــات یارمـــەتی دەری تـــەیمووری لـــەنگ نـــەوەكانی جـــەنگیزخان بـــوون كـــە رۆڵـــی باڵایـــان هـــەبوو لـــە بـــە هێزكردنـــی جـــێ پێگـــەی تـەیمورو دەسەڵاتەكەی لە ناوچەكەدا .

سەرچاوە : مێژووی ئێراق لە نێوان دوو داگیركردن – پارێزەر عەباس عەزاوی – بەشی/٢ .

## ١٣٧٣



١٣٧٣/٦/٨ لـە بۆنـەی ئاهـەنگی یادكردنـەوەی یادی سەد ١٠٠ساڵەی دامەزرانـدنی سـینەمادا لـە باڵەخانـەی – بـاخی فیردەوۆسـی– لـە تـارانی پایتـەختی وولاتی فارس كۆبوونەوە ئەنجامدرا ، كـــەخۆی لـــە ٢٠٠٠ دوو هـــەزار ئاهـــەنگ گێـــر دەدا ، كـــە بـــۆ ئـــەو ئاهەنگە بانگ هێشت كرابوون.

## ١٣٧٩

١٣٧٩/٨/٩ کۆبوونەوەی – کەرادلە – واتە ئەندامانی ئەنجوومەنی مەسیحیەکان لە جیهاندا – لە گەڵ فەرەنسیەکانی هەڵگری ئاینی مەسیحی کە لە شاری – ئەناتیی – ئەنجامدراو پیلانی شۆرش دارێژرا ، لە نێوان دوو بیروو بۆچوون ... لە نێوان هــەردوو مەزهــەبی کاســۆلیكو پرۆتــستانت ، ئــەویش بــە راگەیانــدنو بلاووکراوەیەکی دیاریکراو لە هەڵبژاردنی– ئیریان – بۆ وەرگرتنی پۆستی پاپا بە تاکە بە هۆی پاڵەپەستۆ لە لایەن – گۆکای – رۆما .

کە هەموو کەرادلەکان لایەنگیریان بۆ – تلیان – کردوو لە ٩/٢٠ کۆبوونـەوە لـە سەر ئەوەی کە – ربرت ئەلژنیفی – پاپای دیاریکراووە ... ، کە – ربرت – پۆستی دەسەلاتی پاپای گرتە دەست بەناوی – کلمنتنی حەوتەم– ، بەلام – ئیریان – هەر دەست گیر بوو بە پۆستی پاپا لە رۆما.

کە ئەویش بووە هۆی سەرەتای کەرت بوونی پۆستی دەسەلاتی پاپاو لە گەڵ ئەو دووبەرەکیە لە نێوان دەسەلاتەکانی پاپا بەردەوام بوو تاکــــوو مردنی – کلمنتنی حەوتەم – لە ساڵی ١٣٩٤ و، بەهاتنی – بندکتی سیانزەهەم – ... دوای یۆنیفاسی نۆیەم – کە داوای کرد بەگێرانی ئاهەنگێکی جەژنانەی گشتی ئەنجام بدرێت لە ساڵی ١٣٩٩ لە پێناو یەکخستنی ئەو دوو بەرەکیە لە نێوان دوو مەزهـەبی ئـاینی مەسـیحی کاسـۆلیكو پرۆتـستانت بەتایبـەتی لـە رۆمـاو فەرەنسا.

## ١٣٨١

١٣٨١/٥/١ بەرپابوونی شۆرشـی کۆمەلایـەتی لـە بەریتانیا... لـە دوای یـەك مـانگ لـەو مێـژووە ، بــووە هــۆی رووبــەروو بوونــەوە لــە نێــوان هێزکــانی ســووپای دەسـەلات و هێزەکـانی کەنیسەی ئاینیو زانستی ، کـە ئەمـەش بـووە هـۆی لێکــەوتنی زیــانێکی زۆر لــە دام و دەزگــای کەنیــسەو دامو دەزگاکــانی دەووڵەت لەم وولاتەدا .

## ١٣٨٢

١٣٨٢/١١/٢ پادشایەکی – چەرکەس – کە پادشایەتی وولاتی کۆنی میسریان کردووەو نەوەی ئەو کۆیلانەن ، کە لە و رۆژەوە دەسەلاتی میـسریان گرتۆتـە دەست ... یەکەمیان مەلیك زاهر سەیفەدین برقوق کۆیلەی ئەمیر... بەلگای عومەر

بووه ... كه بەلگاش لە پێشوو یەكێك بووه لە كۆیلەكانی مەلیك سالحی ئەیووبی و دەسەلاتی میسریان لە دەست ئەیووبیەكان دەرهێناوە بەهۆی لاوازی ئەو كاتی بنەماڵەی نەوەی سەلاحەدینی ئەیووبی لەو كاتی ولاتی میسر دا .

شایانی باسە كه بنەماڵەكان و نەوەكانی سەلاحەدین ١٣٥ ساڵ لە وولاتی ئەو كاتی میسر دەسەلاتدار بوونە لە گەڵ بنەماڵەی – خدێوی – محەمەد عەلی پاش – و نەوەكانی تاكوو شۆڕشی میسر لە ساڵی ١٩٥٢. ئەویش با رووخاندنی رژێمی شانشینی و راگەیاندنی رژێمی كۆماری لە وولاتەكەدا .

## ١٣٨٩



١٣٨٩/٨/٩ سولتان ئۆرخان دامەزرێنەری سەرەتای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی كۆچی دوای كردووه ، كه مرۆڤێكی شۆڤێنی بەرچاو تەنگی دژ بە نەتەوه جیاجیاكانی ناوچەو هەرێمەكان بووه لەپێك هێنانی نەتەوەی توركدا .

ئەویش بەبێ ئەوەی پەیووەندیەكانی بەرەو هاوكاری و دۆستایەتی ببات و پەلاماری هەموو گەلانی ژێر دەستەو ناوچەكانی دەووروبەری دەدا ، لە ب تورككردنێكی بێ وێنە لەپێناو بەهێز كردنی دەسەلاتی لە هەمو بووارەكان ، بە تایبەتی لە بوواری سنووری جووگرافی و نەتەوەیی ئابووری و لە پێناو بەرزكردنەوەی بوونی كەسایەتی تورك لەسەر جیهان .

## ١٣٩٦

١٣٩٦/٩/٢٧ بەرپابوونی شەڕ لە نێووان هێزەكانی سووپای ئیمپرتۆریەتی نوێ عوسمانی ، كه ٢٠٠,٠٠٠ دوو سەد هەزار چەكدار بوون بە سەركردایەتی سولتان بایەزید – هێرشی كردە سەر هێزە چەكدارەكانی مەسیحی سرب

لە هەرێمی بەڵكان ، بە سەرکردایەتی – ئیستفن لازار– دا .
ئەویش بەپەرینەوەی هێزەکانی سووپای عوسمانی لەزێی دانووب و شاری نیکۆیگی ، ئەویش بە گەمارۆدانیان بە برپابوونی شەڕیکی خوێناوی . بێ بەزەیی هاتنەوە لەلایەن عوسمانیەکان ، لە ئەنجام هێزەکانی سووپای عوسمانی سەرکەووتنیان بەدەست هێنا بە سەر هێزەکانی سربە مەسیحیەکان لە سربەستاندا .

## ١٤٠٢

١٤٠٢/٧/٢ هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان هێزەکانی سووپای تەیمووری لەنگ و هێزەکانی سووپای عوسمانی ، کە ١٢٠ سەدو بیست هەزار چەکدار دەبوون بە سەرکردایەتی بایەزید ، لە ئەنجام شاری سیواس و دەووروبەری لە باکووری کوردستان داگیر کرا لە لایەن هێزەکانی تەیمووری لەنگ و شەڕەکە بەرەو شاری ئەنکەرە هەنگاوینا لە ئەنجام هێزەکانی تەیمووری لەنگ سەرکەووتنی بەدەست هێنا بە دەستگیرکردنی سولتان بایەزیدی عوسمانی و بەندکردنی تاکوو مردنی لە١٤٠٣/٣/١٠ ، لە تەمەنی ٤٤ساڵیداو ماوەی بەندکردنەکەشی١٣ ساڵ بوو.

## ١٤٠٥

١٤٠٥/٢/١ لە دوای کۆچی دووایی سولتان بایەزید خانی یەکەمی سولتانی عوسمانی، نەوەکانی یەك لەدوای یەك جێگەیان دەگرتەوە ، ئەویش بە دابەشکردنی دەسەڵاتەکان ، هەریەك لە بەشێك و بووارێکی دەسەلات . لە هەلسووراندنی کاروباری دەووڵەتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە هەموو بووارە جیاجیاکاندا .

## ١٤٠٦




١٤٠٦/٣/١٩ کۆچــی دووایــی زانــاو روونــاکبیری عــەرەبیو جــیهانی مامــۆستا – ئـیبن خـــەلدوون – لــە شـــاری قـــاهرەی پایتەختی میسر.

شـایانی باســه کــه ئـیبن خەلــدوون پێــشەنگی زانــستی کۆمەڵناســی و پێـــــشەنگی فەلـــــسەفەی مێـــــژوو- پێـشەنگی تێئـووری ئاوەدانکردنـەوەو گەریــدەی بــەناوبانگو مووعجزەیــەکی عەرەبیە کە تاکوو ئێستا هاوشیوەی کـەمە لە مێژوودا .

## ١٤٠٩

١٤٠٩/٣/٢٥ لـە دوای دەیا شـەڕو کێشەو ململانـێ لـە نێـوان هـەردوو مەزهـەب ئاین مەسـیحی ... کاسـۆلیكو پرۆتـستانت ... کـۆنگرەی – پیـزا – گرێـدرا ، ل پێنـاو دیاریکردنی پاپا بەرەزامەنـدی هـەموو مەسـیحیەکان لـە جیهـان ، ب بـەلاوە نـانی بـیروو بۆچـوونو جیـاوازی مەزهــەبی . ئـەویش بـەدانانی گریگۆری – بەپاپا .

لە ئەنجام – بندکتی سیانزەهەم – بەرەو شانشینی ئەسپانیا هەڵات بە هۆی نەبوونی لایەننگیر لە پێناو بوونی بەپاپا لە سەر ئاینی مەسیح . سەرەرای ئەوەش کێشەکان چارەسەر نەکرا لە دوای دامەراندنی گریگۆر بەپاپای مەسیحیەکان لە جیهان . بە هۆی کێشەی نێوان فەرەنساو ئیتالیا

کە ئەو دوو وولاتە مەڵبەندی پیاوانو کەسایەتی ئاینی مەسـیحی بوون کـە فەرنـسا زۆربـەی پرۆتـستانتو ئیتالیـا زۆربـەی کاسـۆلیك بـوون ، ئـ کێشانە تاکوو ئێستاش بەردەوامە .

بەڵام لە شێوەو شێوازێکی دیکەی بەرەو چارەسەر کردن لە هەموو بووا جیاجیاکـانی ئـاینیو پەیووەنـدی لەگـەڵ ئاینـەکانی دیکـەی جیهـا پەیووەندنی نێوودەولەتی ، بەتایبەتی دەووڵەتی فاتیکان لەجیهاندا.

## ١٤١٢

١٤١٢/٢/٣ هۆزەکانی لوڕ– شۆل و شووانکارەکانیشیان ، کە هۆزی لوڕ کۆنترین هۆزن لە دوو بنەماڵەی گەورەو بچووك پێك هاتبوون ، کە هۆزێکی زۆرن و بەربلاو بوونەتەوەو پادشاو میری خۆیان هەبووەو بەشی زۆریان لە ویلایەتی میسرو شام بوون .

شامیەکانیان زۆرتر بوون ، واتە وولاتی ئێستای سووریاو ئووردن و فەلەستین ، کە زۆر ئازاو راستگۆ بوونەو لە هۆزە گەورەکانی کورد بوونە لە کوردستان.

سەرچاوە:– شەرەفنامە /١٢٤.

## ١٤١٤




١٤١٤/١١/٥ لە سەر داوای پاپا – یۆحەنا یستی سێیەم – لە رۆمای پایتەختی ئێستای ئیتالیا ، کۆنگرەی نێودەوڵەتی لە نووێنەری هەموو مەزهەبەکانی مەسیحی ، بە تایبەتی پرۆتستانت و کاسۆلیك گرێدرا بە هەلبژاردنی پاپا .

ئەویش بەئامادەبوونی ٢٩ کەرادلە و ٣٣ لە سەرۆك ئەساقفەکان و ١٥٠ ئەسقەف و ١٠٠ سەرۆك دێرەکان و ٣٠٠ لە زانایانی لاهووتی و ٤٠ لە نووێنەری زانکۆکان و ٢٦ لە ئەمیرەکان و ١٤٠ لە دەرەبەگە دەوڵەمەندەکان و ٤٠٠٠ لەپیاوانی ئاینیدا .

شایانی باسە کە یەکەم کۆنگرەی نێودەوڵەتی گەورەی مەسیحی بوو لەجیهاندا لە دوای کۆنگرەی ساڵی ٣٢٥ ، بەبریاردانی دوای کەنیسەکانی مەسیحی، ئەویش بە دوورخستنەوەی یۆحەناو گریگۆری و بندکت لە دەسەڵاتی پاپایی بە دامەزراندنی ئەنجوومەنێکی گشتی بە پێی یاساکانی ئاینی مەسیحی پیرۆز .

ئـەویش لـە پێنـاو بـەڕێووەبردنی کاروبـاری تـەواوی مەسـیحیەکان لـە جیهاندا لە پێناو بەرەو چارەسەر کردنی کێشە هەلوواسراوەکان.

## ١٤١٥

١٤١٥/٩/٢ لـە دوای کۆچـی دووایـی– هـسن – ی سـەرکردەی – بوهیمیـەکان– لـە بـەرپابوونی شۆرشی بوهیمیـەکان ، کـە زیـاتر لـە ٥٠٠ سـەرکردەو پیـاوانی ئـاینیو خـاوەن سـامانەکان لـە بۆهیمیـەکانو مۆرافیـەکان کۆبوونـەوە لـە ئەنجوومەنی کنستان.
ئەویش بە مۆرکردنی بەلگەنامەی ئەو ٥٠٠ بەشدار بووانە لە لایەنگیرانی تیشكو لایەنگرانی هسیان کردو چوونە سەر مەزهەبی کاسۆلیك ، لە پێناو بەرگری کردن لە مەبدەئەکانی مەسیح دژی یاساکانی کە لە لایەن مرۆڤەوە دەردەچـێت بـە چەووسـسانەوەی مـرۆڤ لـە لایـەن مرۆڤـەوە لـە هـەموو بووارەکاندا .

## ١٤٢٠




١٤٢٠/١/١٧ بـۆ یەکـەم جـار نـاوی شـاری کـەرکوك لەلایـەن – تـەیمووری شـەرەفەدین عـەلی یـەزدی – لـە – کتـێبی – زەفەرنامـە – نـاوی هـاتووە دوای ئـەوەش بـە چـل سـاڵێك لـە دوای عـەلی یـەزدی نووسـەری کتـێبی – دیاربەکریـە – کـە لەلایـەن ئـەبوو بـەکری تـەهرانی ئەسفەهانی کـەوا پێدەچـ سالی ١٤٧٠ کتێبەکەی نووسیبێ ، لە زۆر جێگەدا بەناوی شاری کەرکوکەو باسی کردووە .
کـە شـاری کـەرکوك سێـچارەگی دانیـشتووانەکەی کـورد بوونـەو کـە ئەوکاتـ تـورك و عـەرەبی بـە دەگمـەن لێ هەبوونـە یـاخوود نەبوونـە ... لـە بـەر ئـەوەی

پارێزگای کەرکوك عەرەبی تیا نیشتەجێ نەبووە تاکوو دوای چەندین ساڵ لە فتووحاتی ئیسلامی ، کە تاکوو دامەزراندنی دەوڵەتی ئێراق لەسەر خاکی گەلانی دیکەی وولاتانی نێوان دوو زێێ – میزۆبۆتامیا – عەرەب لە پارێزگای کەرکوك و سەلاحەدین و مووسڵ بە رێژەیەکی کەم هەبوونە .

بـەڵام دوای دامەزرانـدنی دەوڵـەتی ئێـراق و سـووریا و وولاتـانی دیکـەی عەرەبی بەتایبەتی وولاتـی سعوودیە ، کە بە لێشاو روویان لەو پارێزگایانە کـردووە ، هـەروا پارێزگاکـانی کـووت و عیمـارە و بەتایبـەتی دیالـە وەك داگیرکەرێك ، نەك وەك میوان و زەوت نەکردن و داگیرنەکردنی خاکی گەلانی وولاتی نێوان دوو زێ بەتایبەتی خاکی کوردستان .

سوود لە کتێبی دکتۆر جەمال رەشید – کەرکوك لە سەردەمە کۆنەکان – چاپخانەی ئاراس / ٢٠٠٢ وەرگیراوە .

١٤٢٠/٣/٨ بنەماڵـەی عوسمانیـەکان دەگەرێنـەوە سـەر تیرەیـەکی تورکـان لـە سـەرەتای سـەدەی سـیانزەهەمی زاینـی ، کـە لـە نێـوان دوورگـەی بیابـانی نێـووان مەنگۆلیاو چینی مللی دەژیان ، ئەویش کە خەریك بوون بە کاری پیشەی بە بـەخێووکردنی مـەرو مـالاتو چـنین ، لـە دوای ئـەوە دەسـت بەسـەراگرتنی جەنگیزخان بە سەر هەرێمەکانی وولاتی نێوان دوو زێێ – میزۆبۆتا میا – و ناوچەکانی رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك.

کـە ئـەویش بـووە هـۆی ئـەوەی ، کـە سـلێمانی بـاوکی عوسمـان بـەرەو ناوچەکانی باکووری کوردستان هەنگاوبنێ تا گەیشتنە هەرێمی ئەنازۆڵو بە جێگیربوونیان ، بە تایبەتی لە شاری ئەفلات لە باکووری کوردستان لە رۆژهەلاتی ئێستای تورکیا .

## ١٤٢١

١٤٢١/١/٦ مردنـی قـەرە یوسـف بـووە هـۆی دوودڵـی و سـەرنواندن وهـەروا نەتەوەکـەی تووشـی دڵناخۆشـی بـوون و بـووە بـلاوە پێکردنـی دەسـتەکانی سـەبا . لـەو کاتەشدا شـارخ بـەرەو تـەبرێز بەرێکـەووت بـۆ دەسـت بەسـەراگرتن بـەبێ هـیچ بەرگریەك لە شاری تەبرێز .... بەڵام ئەسبان بەرەو شـاری بەغدا هـەنگاوینا و هـەروا جیهانـشا .... ئـەبوو سـەعید بـەرەو شارۆچکەی جەسـان ... جەسـان شارۆچکەیەکە لە تەك بەدران – واتە ناوچەی بەدەرو جەسانی کوردسان لە باشووری کوردستان .

بەڵام ئەمیر ئەسکەندەر کە لەکەسایەتیە ئازاو چاونەترس و دیاریوو لەو کاتە

بەهۆی مردنی باوکی و کەسووکاری لەدەووری کۆبوونەوەو لەشاری کەرکوك چوونە لای شارەخ و بووە شەر لە نێوانیان لە ١٤٣١/٩/٩ کە ئەوکات پێی دەگوترا – بەخشی – لە سەر سنووری ئاشکرد و شەرەکە دوو رۆژ بەردەوام بوو لە نێوانیان و چەندین کەس لە هەردوولایەنیان کووژراو رۆژی سێیەم ئەمیر ئەسکەندەر لەو شەرەدا بەزی وبەرەو لای زێی فوورات رۆیشت و لەوێ بەرەو شاری ماردین لە باکووری کوردستان هەنگاوینا .

ئەویش بە هۆی ئەوەی ئەوەك عوسمان بەگ هێرشی بکاتە سەرو کۆکچە موسای لەگەڵدابوو– دکر –... ئەمەش لەشەرەفنامەدا ئەمەی دیاریکردووە ، کە کوردەکانی خۆراسان بوون لەو کاتەش شا تەهماسب ئیمارەتەکەیدا دەست کەسایەتیەك کە ناوی شەمسەدین بوو ... ل/٤٢٤ .

لەدوای ماوەیەکی زۆر هەردوو لایەنی چەکدار لەنزیك شاری ماردین بەیەك گەیشتن و هێزی چەکداری ئەمیر ئەسکەندەر زۆر بوو ... بووە هۆی ئەوەی کە لە هێزەکانی عوسمان بەگ لادەن و بگەرێنەوە ناوچەی ئەمیر ئەسکەندەر ، بەڵام لە ئاکامدا تووشی شەڕ هاتن و شەڕەکەش ماوەی ٢٥ رۆژی خایاندو ئەمیر ئەسکەندەر سەرکەووتنی بەسەر عوسمان بەگ بەدەست هێنا ... دوای ئەوە شارەخ گەراوە خۆراسان و ئەمیر ئەسکەندەریش گەراوە تەبرێز و لەسەر کورسی دەسەڵات دانیشت .

دوای ئەوەش ئازربایجانیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان .... دوای ئەوە شەڕ لە نێون هێزەکانی شارەخ و هێزەکانی ئەمیر ئەسکەندەر بەرپابوو هەتا کاری لە دراوسێکانی کرد ... بەڵام جیهانشا وئاسیان لە بەغدا مانەوە ... واتە بەپێی نوسراوەکانی شەرەفنامە کورد دەسەڵاتداریەتی فروانی هەبووەو زاڵ بوونی بە هۆی بەهێزبوو ... بەڵام شەڕی نێوان سەرکردە کوردەکان بە ئامانجی نەگەیاندوون لەکوردستان .



## ١٤٢٨

١٤٢٨/١٠/١١ بەردەوام بوونی شەڕ لە نێوان شارەخ و ئەمیر ئەسکەندەر . ئەمانە سەرکردە کوردەکان بوون بە پێی شەرەفنامە... بەڵام جیهانشا لایەنگیری براکەی ئەمیر ئەسکەندەر بوو ، کە ئەمەش بووە هۆی بەرپابوونی شەڕی نێوانیان لە دەووروبەری شاری سەلماس لە رۆژهەڵاتی کوردستان ، کە ئەمیر ئەسکەندەر لەو پەری بەهێزی و ئازایەتی دابوو لەو شەڕەدا .

بەڵام بەهۆی هەڵەکانی سەرنەکەووت و بەرەو هەرێمەکانی رۆم رۆیشت ... کە لەو کاتیش قەرە عوسمان لایەنگیری شارەخ بوو ... کە شاری بەغداو دەووروبەری لەو شەڕەدا بە دووربوون . ئەم شەڕەش کە لەنێوان سەرکردەکان بوون لەپێناو دەسەڵات وپارەو سامان ... ئەمە لەلایەك و لەلایەکی دیکەش شەڕ بەردەوام بوو لەنێوان بارانیەکان وبایندەریەکان ...

سەرچاوە :– مێژووی ئێراق لە نێوان دوو داگیرکردن –پارێزەر عەباس عەزاوی بەرگی /٣ .

## ١٤٢٩

١٤٢٩/٤/٢٠ سولتانی عوسمانی سولتان – محەمەد فاتحی – دووەم لە دایك بووەوحەوتەمین سولتانی عوسمانی بووە لەو بنەماڵەیەدا .

## ١٤٣٢

١٤٣٢/٥/٣٠ ئاگر له گیان بەردانی زاناو رووناییری فەرەنسی خاتوو – ژاندارکی ژن – لا فەرنسا ، بەهۆی بەهێزی بیروو باوەری ئاینی لەلایەن دەسەلاتدارانی فەرەنسا ، کە بە زیندوویی ئەو کارە نامرۆییەیان بەرامبەر بەو ئافرەتا ئەنجامدا .
جێگەی باسکردنە کە رژێمی ئەو کاتی فەرەنسا لە لایەن دەرەبەگ و سەرمایەدارەکان بە رێوە دەچوو لە وولاتەکەدا .

## ١٤٣٦

١٤٣٦/٧/١٦ لە هەوڵێکی بێ وێنەدا کە لە لایەن زانای ئەلمانی – گۆتەنبێرگ – بۆ یەکەم جار دۆزینەوەی چاپخانە هاتە کایەوە ، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کا بەسەدان رۆژنامەو گۆڤار و کتێب دەردەچوون و بڵاودەکرانەوە ، کە سەدەی نۆزدەم شاری – ڤینسیا – ببووە ناوەندی بازرگانی و رۆژنامەیەك لەو بازارەدا دەردەچوو بەناوی – گەزەتە – کە ببووە هۆی بڵاوکردنەوەی زانیاری و هەواڵی رووداوەکانی ئەو شارە .
لە سەدەکانی ناوەند لە ئەوروپا – پامفلیت ، Pamphlet – پەیدابوو گەلێك لە پیاوە ناودارەکانی ئەو کات و ئەو سەردەمە بیروڕاو هەستی خۆیان لەو رێگەیەوە بەخەڵك دەگەیاندو وردە وردە بەرەو بە هێزبوون هەنگاوینا لە جیهان .

سەرچاوە :– تێگەیشتنی راستی – کەمال مزهەر –شوێنی لە رۆژنامەنووسی کوردیدا – ١٩٧٨ .

## ١٤٤١

١٤٤١/٢/٤ هەوڵدان لە پێناو لێك نزیك بوونەوەی کەنیسەی سریانی وکوورسی رەسوولی – پاپا – ، کە سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٢٣٧ بە رێگەی نامە گۆرینەوە لە نێوان پاپا گریگۆریۆسی نۆیەم و پەتریریکی سریانی ئەگناتیووسی داود بەرەو راگەیاندنی بەتریریکی سریانی بە یەکگرتنی تاکا کەسی بەکوورسی رەسوولی، دوای ئەوە کۆری هەرێمی کەنیسەکانی رۆژهەلات کۆبوونەوەیەکیان گرێدا لەدورگەی قووبرس.

ئەویش لەسەر داوای پاپا بندکتی دوانزهەم بوو... ، کە لەو کۆرەدا ئەسقفی سریانیەکان یەکیەتی تەوواوی لەگەڵ کەنیسەی کاسۆلیك راگەیاند ،... بەڵام سریانەکانی قووبرس هەندێکیان رێگەی لاتینی لە خواپەرستی گرتە بەرو هەندێکیان چوونە ناو کەنیسەی سریانی مارۆنیەکان.

لە دوای ئەوە هەوڵی دیکە زۆر درا ، لە سەر ئاستی کۆڕی مەسکوونی ، کە کۆڕێکی فلوورنتینی بوو لە رۆژانی پاپا یاخوود جانیووسی چوارەم وبەتریرك ، لەئاکام پاپا بڕیاری تایبەتمەندی بەسریانیەکان راگەیەندرا.

شایانی باسە کە ئەرمینیا یەکەم هەرێم بووە بەهەڵگرتنی بڕوای ئاینی مەسیحی لە ساڵی ٣٠١ وگریگۆری منەوری دووەم ناسراو بەناوی قەدیس گریگۆریۆس منەوەر ، کە یەکەم کەس بووە پالپشتی کەنیسەی ئەرمەنی کردیە و . هەر بە ناوی خۆشیەوە بووە ، کە کەنیسەی ئەمەرن سەر بەخۆبووەو ریوورەسمێکی تایبەتی هەبووە لەداب و نەریتدا .

## ١٤٤٢

١٤٤٢/٢/٤ پاپا ئۆژیپیووسی چوارەم لە مەراسمێکی شکۆداری ئایینی دڵخۆشکەر ، یەکگرتنی قبتیە مەسحیەکانی میسری بە کەنیسەی رۆما راگەیاند لە کەنیسەی خاتوو مریەمەی عەزا لە شاری بلفۆرنسای ئیتالیادا .

١٤٤٢/٨/٢١ بەر پابوونی شەڕ لە نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی بەسەرکردایەتی سوڵتان موورادی دووەمی دکتاتۆرو هێزەکانی سووپای شانشینی رۆما ، لەپێناو داگیرکردنی قووستەنتینیە، بەڵام هەوڵەکانی هێزەکانی سووپای عوسمانی هەرەسی پێهێنرا بەرامبەر بە هێزەکانی سووپای شانشینی رۆما.

## ١٤٤٤

١٤٤٤/٧/١٣ لە ئاکامی شەڕ لە نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی و هێزەکانی سووپای سرب و مەژەر ، بە داگیرکردنی چەندین ناوچە لە لایەن هێزەکانی سووپای عوسمانی و بە بەردەوام بوونی شەڕو کێشە لە ئەنجامدا سەرکەووتنی سەرکردەی مەژەری لە ووڵاتی سربیا بەسەر هێزەکانی سوڵتان مووڕادی

عوسمانی لە شاری نیس راگەیاندرا .
لە دوای سێ رووداو ڕێکەوتنی ئاشتبوونەوەیان لە نێوان مۆر کرا بە بەجێهێشتنی هێزەکانی سووپای عوسمانی لەو ناوچانەی کە داگیری کردبوو ، بەگەڕاندنەوەی بۆ ژێر دەسەڵاتی سربەکان بۆ ماوەی ١٠ ساڵ بەدەست درێژی نەکردنە سەر ناوچەدا .

١٤٤٤/١١/١٠ بەرپابوونی شەڕ لە نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی و هێزەکانی سووپای شانشینی سرب – لادسلاس – لە دوای مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی ئاشتی لە نێوانیان بەهێرش نەکردنە سەر سربەکان .
بەڵام لەناوچەکەدا لە دوای شەڕێکی توندو دژوار بە کووشتنی کردینال – سیزارینی – کە بووە هۆکاری هەڵگیرسانی ئەو شەڕە بە سەرکەوتنی عوسمانیە ئیسلامەکان لە ناوچەکەدا.

## ١٤٤٥

١٤٤٥/٨/٧ بلاووکردنەوەی پاکانە بەناو بانگەکەی پاپا – ئۆژینۆس – ی چوارەم ، لە بارەی ناوونانی نەسرانی ، بەڵکوو نەسرانی نیەو کلدانیە.
شایانی باسە کە کێشەی مەزهەبی و نەتەوەیی لە نێووان مەزهەبی کاسۆلیكو ئۆرزکسیەو نەتەوەو ئاین ، پێك هاتەی ئاینی مەسیح لە سەدا نەتەوە پێك هاتووە . لەوانە کورد لە کوردستان ، بەڵام چەندین بیری جیاواز هەیە لە نێووان مەسیحیەکان بەگشتی و مەزهەبەکان بەتایبەتی ، لە نێووان کلدان و نەسرانی و ئەرمەنی و ئاشووررو سریانی ، کە هەر یەك لەوانە خۆی بەراستر دەزانێ لە وویدیکە ، کە ئەو کێشەیە بەردەوامە لە بیرووبۆچوونە جیاجیاکانی ناو پێکهاتەکاکانی ئاینی مەسیحیەکاندا .

١٤٤٥/٩/٧ لە دوای یەکگرتنەوەی هەردوو کەنیسەی یۆنان و کەنیسەی رۆژئاوا ، کە لە بەلگەنامەی فەرمی کەنیسەی رۆمانی تۆمار کراوە بە پاکانەی بلاووکراوە . لە لایەن پاپا – ئۆژینۆس – ی چوارەم ، کە ئەویش لە دوای بڕیاری – تیمتاوس – ی مەترانی نەسرانیەکان و ئیمان هێنان بە مەزهەبی کاسۆلیك لە هەرێمی قووبرس لە پێش – دوومنیکی ئەندراوس – ی مەترانی قوولسالب – رۆدس – ی دووەم لە شاری لاتران ، کە پاپا رایگەیاند ، کە لێرە

بەدوواوە سریانیەکان لە نەستووره ناویان بە کلدان دەگووترێ لەو رۆژەوە مێژووی دەربەدەر بووەکان بەکلدانی قووبرسی دادەنرێت.


١٤٥٠



١٤٥٠/٦/١٨ هێزێکی گەوورە لە جووتیــــــارو کرێکــارانی شـــارو شارۆچـــــکەکانی بـــەریتانیا بـــەرەو شـــاری لەنـــدەنی پایتەختی بەریتانیا بەرێکەوتن و کە لە شاری – پلاك هیس – چـــەکدار کـــران بەســـــەرکردایەتی سەرکردەکەیان – جاك کید – ئەویش بە هۆی باری گرانی وەرگرتنی باج و چەندین زولم و زۆرداری دیکەی رژێمی شانشینی بەریتانیا .

ئەویش لە پێناو هەلووەشاندنەوەی دەستووری کرێکاری و دامەزراندنی حکوومەتێکی نوێدا ، کە لەو کاتە حکوومەتی بەریتانیا– جاك کیدی – بە کۆمۆنیست تاوانبار کرابوو، دوای ئەوە سەرکردەکانی سووپای بەریتانیاو هەندێ لە پیاوانی لەگەڵ سەرکردەی سووپای شۆرشگێرانی جووتیارو کرێکار چاویان بەیەك کەووت لە شاری – سفنووکس– ، کە بووە هۆی سەرسوورمانی هەموو خەلك بەسەرکەووتنی شۆرشگێران کە لەو کاتەی بەرەو لەندەن هەنگاویاننا.

لەوکاتەدا ئەنجوومەنی شانشینی بەریتانیا لە چەند رێنماییەکیدا داوای ئارامکردنەوەی باروودۆخەکەی کرد ، بە دەستگیرکردنی– لۆری سای و ملیچ کرومر – کە دوکار بەدەستی نا لە باری نارێك بوون ، لە کارەکانیان بەرامبەر بەگەلانی بەریتانیا ، دوای ئەوە کەووتنە ژێر دەستی سەرکردە

شۆرشگێرەکان ، کە لـە ٧/٤ی هەمان ساڵ لـە سێدارەیان دان و سەرەکانیان بـەدوو سـنگی کووتراوەکـانی دیـواری باڵەخانـەی شانـشینی بـەریتانیا هەڵوواسران.

## ١٤٥١

١٤٥١/٢/٧ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان موورادی چوارەم کۆچی دوایی کردو کوڕەکەی سوڵتان ئەبوو فەتحی دووەم جێگەی گرتەوە ، لەدوای مردنی تەرمی سوڵتان موورادی چوارەم گواسترایەوە بۆ شاری بۆرسەی خاکی باکووری کوردستان .

شایانی باسە کە بە پێی نووسراوی نووسەرو رۆژنامەنووس و مێژووناس و جووگرافیناس و کۆمەلناس و دەیا بیروو بۆچوونی تووێژێنەرەکان ، بگرە لـە دوای رووداوەکەی لافاوەکەی کەشتیەکەی حەزرەتی نووح .

من گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی کە بنەماڵەو سەرکردەکانی دامەزرێنـەری ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی کـورد بوونـە ، هـەروەك سـەلاحەدینی ئـەیووبی و دامەزرینـەری دەوڵـەتی میـسر محەمـەد عـەلی پاشـا و رووناکبیری نـاوداری جیهانی کەواکبی و بنەماڵەی سەرۆکی پاکستان زولفەقار عەلی بۆتۆو مستەفا حـەقادی دەرهێنـەری فلیمـی سینەما لـە سـەر سـەلاحەدینی ئـەیووبی ، کـە دانیـشتووی شاری حەلـەبی ئێستای سووریا و بەدەیا بنەماڵەو کەسایەتی دیکەدا .

بەڵام بە داخەوە دەڵێم بە هۆی کێشەو ململانـێ و شەڕی ناووخۆی کورد لـە کوردسـتان . هـەر وەك بەڵگـەی زینـدووی لـە باشووری کوردستانی لکێنـراو بەئێراق ، شەڕی نێووان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیتی نیشتمانی کوردستان ، کە سەرەتای دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی دوای ١٩٦٥و کە تاکوو ئێستاش نـە لـە شەرو نـە لـە ئاشتی دایـە بە بەردەوامی لەکێشەو گرفت و ململانێدان.

ئەمە لـە لایـەك و لەلایـەکی دیکـەش ، بەر لـە مێژووی زاینـی بـە ٨٣٠ ساڵ زیاتر کورد خاوەنی ٢٧ وویلایـەتی دەسەڵاتدار بووەو تاکوو دابەشکردنی کوردســتان بــەپێی نەخــشەی دارێــژراو لــە پــەیمانی ســایکس بیکــۆی

١٩١٦/٥/١٦ ، جێبەجێکردنی بەپێی نەخشەی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤، ئیماراتە کوردیەکان لە کوردستان بەردەوام بوونە لە شەڕو کێشەو ململانێی ناووخۆیی ، کە بووەتە هۆکاری کاردانەوە لەسەر دەروونی گەلی کوردو کەسایەتیو بنەماڵە جیاجیاکانو دوورکەووتنەوەیان لەسەر گۆڕەپانی نەتەوەیی لەسەر خاکی کوردستان .

ئەویش بە نەگەیشتنی کورد بە ئاواتەکانی تاکوو ئەمڕۆ... ئەم هۆکارانە بوونە لە کاردانەوەی بنەڕەتیو سەرەکی لە دژایەتی کردنی گەلو نیشتمانەکەیانو خزمەت کردنی گەلانی دیکەو گەیاندنیان بە ئاواتو ئامانجەکانیان ، بەتایبەتی لە رووی نەتەوەیی و نیشتمانی جگە لەبووارەکانی دیکەدا .



١٤٥١/٢/١٨ سوڵتانی عوسمانی حەوتەم ناسراو بە سوڵتان محەمەد ئەلفاتح دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی گرتە دەست ، کە تەمەنی ٢٢ساڵ بوو، هەوڵی چاکسازی دا لە هەموو بووارە جیاجیاکانی دەسەڵاتەکەیدا ، کە چەندین زمانی دەزانی لەگەڵ مێژوناسی بەرفراوانو رۆڵی سەرەکی بینی لە بەهێز کردنو فراوانکردنی سنووری جووگرافی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە هەموو لایەنەکاندا .

## ١٤٥٢

١٤٥٢/٤/١٥ لە دایك بوونی هونەرمەندو نیگارکێشی سەدەکانی ناوەراست- خاتوو کاترینا - لە نزیك گووندی - فنتشی- بەدووری ٦٠ میل لە شاری فلۆرنستی رووسیای قەیسەری... شایانی باسە کاترینا دایکی کچە جووتیارێکی رۆشنبیر بووەو باوکی - پیرو دانتونیا-پارێزەرێکی دەوولەمەند بووە لە وولاتەکەدا .

## ١٤٥٣

١٤٥٣/٤/٦ هێزەکـانی سـووپای ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی بەسـەرکردایەتی محەمـەد ئەلفاتح گەیشتە دەورووبەری شاری قووستەنتینیە ، کە سووپاکەی زیاتر لـە ٢٥٠ دووسـەدو هـەزار چـەکدار دەبـوو، لـە ووتەیەکیـدا ، داوای سـەرکەووتنی لـە سـەربازو سـەرکردەکان کـرد بـە سـەر هێـزی سـووپای بێزەنتیەکان بە هەموو جۆرە چەکێکی ئەو کات ، لە خۆ ئامادە کردنێکی بێ ووێنە لە هەموو بووارەکانی جەنگ کردندا .

١٤٥٣/٤/٢٢ لـە دوای گـەمارۆدانی دەورووبـەری شـاری قووسـتەنتینیە لـە هێرشـێکی بەرفراوان و شەڕیکی دژوواردا بەسەرکردایەتی سوڵتانی عوسمانی محەمەد ئـەلفاتح و هێزەکـانی سـووپای بێزەنتـی بەسـەرکردایەتی جۆسـتنیان ، لـە ئـەنجام هێزەکـانی سـووپای بێزەنتـی سـەرکەووتنی بەدەسـت هێنـا لەگێڕاندنەوەو داگیر کردنی بەندەرەکەدا .

١٤٥٣/٥/٢٩ کەووتنی شاری قووستەنتینیەی پایتەختی بێزەنتیەکان لەلایەن هێزەکانی سووپای عوسمانی کە بووە هۆی کەووتنی ناوچەو هەرێمەکانی بەلکان .




١٤٥٣/٥/٢٩ هێزەکانی سووپای عوسمانی ، کە پێک هاتبوو لە ١٥٠سەدو پەنجا هەزار سەرباز ، سەر لە بەیانی هێرشیان کردە سەر شاری قووستەنتینیەو داگیریان کرد بەشێووەیەکی زۆر درندانە جگە لە پەلاماردانی دانیشتووانی شارەکەدا .

بەڵکوو پەلاماردانی کەنیسەکان بە بەتالان بردنی هەرچی لە ناو کەنیسەکاندا هەبوو ، لە کەلووپەل و نووسراوو کتێب و پاشماوەی شووێنەوارو کەلتووری ، بە تایبەتی ئەوەی پەیووەندی هەبوو بە ئاینی مەسیح و وویرانکردنی شارەکە . کە ماوەی ١٠٠٠ ساڵ لە ژێر دەسەڵاتی رۆمانی و بێزەنتیەکان بوو .




١٤٥٣/٦/٢٩ بـەهۆی شـۆڤێنیەتی دەسـەڵاتی عوسمـانی بـە وێرانکردنـی شـاری قوستـەنتینیە ، خـەڵکی شـارەکە پەیکـەری مریەمـەی عـەزرایان بـەرز کـردەووەو لـە ناکـاو پەیکەرەکـە کەووتـە خووارەوتێکـشکا ، لـە دوای سـەرنەکەووتنی گفتووگـۆی نێووان سـوڵتانی عوسمـانی محەمـەد ئـەلفاتح و نووێنـەری دانیشتووانی شارەکەدا .

هـەروا لـە هـەمان کـات هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی بەسـەرکردایەتی محەمـەد ئـەلفاتح لـەماوەی چـەند مـانگ تـووانی شـارەکە داگـیر بکـات ، سـەرەرای بـەرگری کـردن لەشـارەکە لەلایـەن هێزەکـانی سـووپای بێزەنتـی، لەهـەمان کات زانایـانی ئـاینی ئیسلامی ئایـەتی ئـەنفالیان بۆ سـەربازەکانی عوسمـانی دەخووێندەوە وداوای سەرکەووتنیان بۆ دەکردن .

## ١٤٦٢

١٤٦٢/٩/١٦ لـە دایـك بـوونی فەیلەسـوف ئیتـاڵی – پیترومبۆناتسی – لـە شـاری منتوفای ئیتاليـا ...خووێنـدنی لـە زانکـۆی یادوفـا تـەواوکردووەو مۆڵـەتی وانـە گووتنـەوەی بەدەسـت هێنـاوە لـە بـواری پزیشکی لەسـاڵی ١٤٨٧ .... دوای ئەوە بە مامۆستای یاریدەدەر دامـەزراو لـەبواری فەلسەفە لـەزانکۆی یادوفا .

دوای ئەوە بۆتە مامۆستا لەبواری فەلسەفە .

لەدوای سالّی ١٥١٠ کتابێکی داناوە بەناونیشانی دەروون بۆ ئەرستۆ .... دوای ئـەوە لـە ١٥١١/١٠/٢٤ بـە مامۆسـتای فەلـسەفە لـەزانکۆی پۆلونیـا دامەزراوە . دوای ئەوە لە سالّی ١٥١٦ کتابێکی بەناونیشانی – خلود النفس – دانـا کـە بـووە هـۆی جێگـەی نـارەزایی دەربـڕین بەتایبـەتی لـەبواری ئاینیـەوە ... دوای ئـەوە لەشاری بوندقیـە ئـەم کتێبـە سـووتێندرا و پاپـا داوای کـرد بـچێتە رۆمـا . دوای هـەوڵێکی زۆر ، پاپا لێـی خـۆش بـوو لەگـەڵ ئەوەشـدا بریـاری زینـدانی کردنـی لـە ١٥١٨/٦/١٥ ی بـۆ دەرچـوو ، بـەلاّم دەستگیر نەکرا .

دوای ئەو گرفتانە کە هاتە پێش ، کتابێکی دیکەی بەناونیشانی – بەرگری – بلاّوکـردەوە بەهەرەشـەکردنی بـۆ سـەر بەرپرسـانی فاتیکـان ... ئـەم فەیلەسوفە لەکارە هەمەلایەنەکانی فەلسەفەو ئاینی بەردەوام بووە تاکوو لە ١٥٢٥/٥/١٨ لە پۆلۆنیا کۆچی دوایی دەکات .

سەرچاوە :– مەسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی– بەشی/٢ .

## ١٤٦٣

٢٤ /١٤٦٣/٢ لە دایك بوونی فەیلەسوف ئیتالی – پیکۆ دلامرندولا – لـەخێزانێکی ناودار لەشارۆچکەی مۆدیتا لـەباکووری ئیتالیا . شایانی باسە لـەدایك بوونی ئەم فەیلەسوفە جێگـەی سەرسوورمان بـوو لـە جـوانی و زیرەکـی و توونـدوتۆڵی لەهـەموو لایەنـەکان . کـە مرۆڤێکـی بێ وێنـە بـوو لـەناوپیاوەکانی سـەردەمی راست بوونەوە لەئیتالیا لەسەدەی پانزەهـەم . میراتگری راستەوخۆی دانتی و ئیلیــزێری و بردکــە بــووە ... هــەوڵی داوە لــەپێناو گوونجانــدنی شارستانیەتی کۆنی یۆنانیەکان و رۆمانیەکان و مەسیحیەکان لە جیهاندا .

ئەویش بەداواکاریـەکانی ئیمـان و پێداویستیەکانی هۆشمەندیـەتی ... ئـەم فەیلەسوفە هەستی ئایینی بەهێزبووە ، ئەویش لـەو نامیلکـەی کـە بـۆ یەکـەم جـار بـلاّوی کـردەوە بەناونیـشانی – ئاکامـەکانی فەلـسەفە –. لەلایـەکی دیکەش بە مرۆڤێکی بێ ئایین دەژمێـردرا لەلایـەن پیاوانی ئایینی مەسیحی بە تایبەتی پاپا ... ئەم مرۆڤە بەردەوام بوو لـە کـارە بە نرخـەکانی تـاکوو لە

١٤٩٤/١١/١٧ کۆچی دوایی دەکات لە تەمەنی ٣١ ساڵیدا .

سەرچاوە:– مەسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی –بەشی /٢ .

٥ / ٩ / ١٤٦٣ دەرکـەووتنی میرنـشینە کوردیـەکان لـە دوای داگیرکـردن و بـە زۆر کردن ئیسلام لەسـەردەمی فتووحـاتی ئیـسلامی ... کـە سـەرەتایەکی دەسـەڵات کوردی بووە بەشێووەیەکی ناوچەیی و هەرێمی لە سەرخاکی کوردستان ناوچەکانی دیکە ، کە توانراوە دەسەڵاتی میرایەتی تیابگێرن .

لەوانـەش میرنـشینی – پـازۆکی – وەکـوو سـەرجەم میرنشینە کوردیـەکان دیکـە دەرکـەووتووەو لـە بەشـی بـاکووری کوردسـتان بـوون ... قەلـەمیرەو پازۆکیـەکان دەکەووتە باکووری دەریاچەی شاری وان و لـە کۆتاییـەکانی کیفـی – و – ئـەرگێش – و عـادل جـەوازو ئەلـشکردرۆ شـێووە... گـەوور مێژوونووسـی نـاوداری کـورد – شـەرەفخانی بەدلیـسی – پێـی وابـووە ک بنـچەو بنەماڵـەی میرانـی پـازۆکی سـەر بـەهۆزی – سـووێرین – لـە هـەرێم دیاربەکردا لە باکووری کوردستان .

یاخوود بۆ بنەماڵەی کوردەکانی رۆژهـەڵاتی – ئێـران – دەگەرێنەوە . هەرو مێژوونووسی کـورد – محەمـەد ئـەمین زەکـی – یـش رەچـەڵەکی پازۆکیـەکان بـۆ کوردەکـانی دانیـشتووی رۆژهـەڵات لەکوردسـتان دەگەرێنێتـەوە ... بـەڵا مێژوونووسی مەملوکی – ئیبنتگری بردی – باسـی کردووە کـە پازۆکیـەکا لەسـەر سـنووری رۆم لـە رۆژئـاوای شـاری دیاربـەکر نیشتەجێ بوونـە ، ک قەڵای – کەرکـەریش – سـەر بـەو میرنشینە بووە . کە خێڵی گـەوورە بوونە توانیویانــە بــەجۆرێکی بــاش ئیــدارەی خۆیــان بگێــرن و بــچنە نێــو پەیوەندیەکان لەگەڵ میرنشینە کوردیەکان و هێزەکانی دیکە لەناوچەکەدا بەتایبەتیش پەیوەندیان لەگەڵ ئۆزن حەسەن بەهێزبووە .

ئاماژە بەوەش کراوە کە لەو دەووروبەرەدا دەستیان بەسەر قەڵای کەرکەرد گرتووەو پاش ساڵێك ، واتـە لـە ساڵی ١٤٦٤ داویانـە بـە ئۆزان حەسـەن ... پازۆکیەکانی رۆژئاوای شـاری دیاربـەکر چالاکیان زۆربووە ...بەڵام لەرووی جووگرافیەوە مەڵبەندی سەرەکیان لەباکووری دەریاچەی وان بووە سـەرەرای ئەوەی کە لەو ناوچەیەدا جمووجۆڵیان بەرچاو نەبووە ...میرە پازۆکیەکان ب دوولق دابەش بوونە ئەویش :–

یەکەم :- بەخالید بەگلو ناوزرند بووەو دەکا . بەڵام باس لەلقی دووەمی میری پازۆکیەکان ناکات .... لەگەڵ ئەوەشدا میر حوسێن عەلی ، کە یەکەم میری پازۆکیەکان بووەو سەر بەخالید بووەو بە – گلوەکانە – ناوبانگی دەرکردووە ... وا دیارە ئەم کەسایەتیە بەو دوولقە ناوزەند ، یاخوود دابەشکراوە .

وا دەرکەووتووە کە لەسەردەمی ئۆزۆن حەسەندا هەوڵیان داوە ئیدارەیەکی سەربەخۆیان هەبێ بەهۆی گوونجاو و لە باری ئەوکات ، بۆ ئەوەی سەرکردەو میرە کوردەکان سەربەخۆیی لەنێووە قەڵەمرەوەکانیاندا دەست بخەن لە هەرێم و ناوچەکەدا .




کورێك لەکورەکانی حوسێن ، پاش مردنی باوکی دەسەڵاتی میرنشینەکە دەگرێتە دەست وەکوو شەرەف نامە ئاماژەی پێکردووە . لە ساڵی ١٤٩٨

رووی ل دەمیرنشینی بەدلیس کردووەو لەگەڵ خالیدی کوریدا هاوکاری میر
شەرەف کردووە ، لە ململانێیەکانی لەگەڵ میر ئیبراهیم دا .
دوای ئـەوە لەگـەڵ سـەفەویەکانی فارسـدا مـیر خالیـد بـەگ روو لـە شـ
ئیسماعیلی سەفەوی کـردووە ئـەویش واتـا شـا لـە لەشکرەکەیدا بەشدار
شەڕی پێکردووە .
میر خالید دەستێکی باڵاو زیرەکانەی هەبووو لەبەر ئەوە ناویاننا – جۆلا
خالید – هەروەك شەرەفنامە – ئاماژەی پێکردووەو دەڵێ :–
شا ئیسماعیل دەستی لە زێر بۆ دروست کردووە ، وەك سیاسەتێك بۆ ئەوە
میرەکانی کورد بەگژی یەکدا بدات و جێ پێگەی خۆی لەسەر میرەکانی کور
بەهێزبکات . ناوچەی – س – خنووس و مەلازگردو ئۆحکات مۆشی – سا
بە بەدلیسی بە میرات دایتە خالید بەگ و براکانی بەم هەڵوێستانەش دو
هاوپەیمانی پێشووی لە یەککردووەو گیروگرفتی خستۆتە نێوانیان و م
شەرەف ناوچەکانی سەر بە بەدلیسی لە پازۆکیەکان سەندۆتەوە . دوا
ئەوە میر خالید هەوڵی داوە هەڵەکانی نێوان سەفەویەکان و عوسمانیەکا
بقۆزێتەوە لە ناوچەکەدا .
ئەویش بەلێدانی دراو بەناوی خۆی و سەربەخۆیی خۆی راگەیاند . کە ئ
کارەش بەقۆناخێکی درەوشاوەی میرنشینەکە ناوزەند کرا . لەبەر ئەوە
لەزۆر بواردا بەئاراستەی سەربەخۆ بوون هەنگاوی گرتووە لە بەرێوەبردن
کاروباری میرایەتی خالید بەگ .
دوای ئەوە رووی لە سوڵتان سەلیمی عوسمانی کردو لایەنگیری خۆ
نیشاندا بۆ سولتانی عوسمانی .
بەڵام نەیتوانی هاوسەنگی لە نێوان دەسەڵاتەکانی سەفەوی و فارسی
عوسمانی رابگرن ، و لەئاکامدا لەشەڕی جالیدیران ، خالید بەگ لەلایە
سولتانی عوسمانی سولتان سەلیم دەکووژی و دوو کوری لەدوای بەج
دەمێنێ بەناوی ئیدریس و وەلید ... بەم جۆرە مێژووی بوونی میرنشین
پازۆك کۆتایی پێ دێت لەسەر خاکی کوردستان .

سەرچاوە :– شەرەفنامە ... کوردوکوردستان

## ١٤٦٩




٣ / ٥ / ١٤٦٩ لە دایك بوونی نووسەرو تووێژەرو کەسایەتی ناوداری جیهان و خاوەن کتێبی – ئەمیر – . نیکۆلۆمبیکا میللی ... لە شاری فلۆرانس لە بنەماڵیەکی مامناوەندید .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە باوکی نیکۆلۆمیکیافیلی – برنارد – لەبنەمالەیەکی بەناوبانگ بوون و برنارد گرنگی بەبواری خوێندن و پێشکەووتنی منداڵەکانی دەدا ... کە پارەیەکی زۆری بۆ کرینی کتێبی لاتینی خەرج دەکرد .... بۆیە بنەماڵەکەی بەرەو هەژاری هەنگاوی دەناو لەتەمەنی ٢٩ ساڵیدا بە سەرۆکی دیوانی دووەم و ئەندامی شوورای دەکەسی دەسەلاّتدار لە فلۆرانس هەڵبژێردرا .

هەروا نکۆلۆ میکیافیللی لەساڵی ١٥١٢ کاری نووسینی ووتارەکانی دەست پێکردوو لە ساڵی ١٥١٣ لە ماوەی ٤ مانگدا کتێبە بەناوبانگەکەی بە ناوی – میر – نووسی . دوو بەرهەمی گەوورەش ئەو ، واتە هونەری شار ١٥٢٠ و مێژووی فلورانس ١٥٢٥ یەك بەدوای یەك بەچاپگەیەندران و بڵاوبوونەوەو کاری ووتارەکانیشی کۆتایی هات .

میکیافیللی بەردەوام تێئۆریەکانی خۆی وەك چارەسەرو بەردە بازێك بەرەو پراکتیکی سیاسی دەبینی ... ئەم نووسەرو کەسایەتیە بەناوبانگەو هەست و نەست و هەڵوویستێکی توونـدرەو لەبوارەکانی رامیاری و کۆمەلاّیەتی و دەسەلاّت لەنووسینەکانی بەردەوام بوو تاکوو لە ١٥٢٧/٧/٢٢ کۆچی دوای دەکات .

هەروا میکیافیللی لەکتێبی خۆیدا بەردەوام گلیەیی و گازاندە دەکات کە لەکاتی دوورخستنەوەیدا ناچار بوو تەنها کاتی خۆی لەگەڵ ژنان و مریشکو

و جووجەڵە بەسەر ببات ... لەو کاتەشدا دونیای سیاسەت پێویستی زۆری بــەو هــەبوو لــە تێئوریەکانیــدا و ، لــە هــەمان کــات ئــاواتی میکیــافللی دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەهێزو سەقامگیر بوو لەئیتالیا .

سەرچاوە :- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی /٣ .

## ١٤٧٢

١٤٧٢/٢/١٦ زانای گەردووونناسی پۆلـۆنی- نیکۆلای کۆپـەرنیکۆس- لـە شاری تـۆرونی پۆلۆنیای بروسیا لە دایك بووە .

## ١٤٧٣



١٤٧٣/٢/١٩ لــە دایــك بــوونی زانــای گەردوونناس و زانای هۆڵەندی و لــە هــەمان کــات دامەزرێنــەری زانــستی گەردوونناســی نــوێ - کوبرنیکـۆس - لـە شـاری تـۆرون لــە بومرانیــا ... لــەدوای تــەواوکردنی قۆنــاخی خووێنــدن چــووە زانکــۆی کراکــۆۆ ... لــە ســاڵی ١٤٩٤ چــووە زانکــۆی پۆلۆنیــا لــە ئیتالیــا ئــەویش بەخووێندنی یاسای کەسی ... لەگەڵ ئەوەشدا لە خووێنـدنی گەردوونناسـی بەردەوام بوو.

بۆ یەکەم جار نیشانی - رصد - فەلەکی لە ١٤٩٧/٣/٩ ئەنجامدا ... دوای ئەوە لە ١٥٠٠/١١/٦ لە رۆما نیشانی مانگیرانی ئەنجامدا ... دوای هـەوڵ و مانـدووبوونێکی زۆر لـە سـاڵی ١٥٠٣ بروانامـەی دکتـۆرای بەدەسـت هێنـاو لـەکارەکانی بـەردەوام بـوو تـاکوو لـە ١٥٤٣/٥/٢٤ لەشـاری فرونیـورك لـە برووسیا کۆچی دوایی دەکات .

سەرچاوە :- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی /٢ .

## ١٤٧٥




١٤٧٥/٣/٦ لـە دایـك بـوونی وویّنەکیّشی توانا داری ناوداری جیهانی – مایکل ئەنجیلۆ– لە شاری – کیریس–ی لە ئیتالیا .

شایانی باسە ئەم هونەر مەندە بەهرەمەنـدە کـە نـاوی مایکـل ئەنجیلۆ یە بە ناوی یەکێك لە فریشتەکانی خواوەند کراوە .

## ١٤٧٨

١٤٧٨/ ٢ / ٧ لـە دایـك بـوونی روونـاکبیرو رامیـاری و فەیلەسـوف نـاوداری ئینگلیـزی – تۆماس مۆریس – لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا لەبنەماڵەیەکی دیار ...کـە بـاوکی قازی بووە لـە دادگـای بـاڵای بـەریتانیا .... مـۆریس چـووەتە زانکۆی ئۆکسفۆرد ، کە لـەو کاتـە تەمـەنی چـواردە سـاڵان بـووە .... هـەردوو زمانی لاتینی و یۆنانی بەباشی فێربووە .

هەروا یاسای تەواوکردووەو بۆتە پارێزەر ... لە سـاڵی ١٥٠٤ هەڵبـژێردراوە و بۆتە ئەنـدامی پەرلـەمانی بەریتانیا ... داوای شانشینی هنـدری حەوتـەمی رەتکـردەوە لەسـەر پـارە لـەو کـات ... لـەو کاتـەش هنـدری هەشـتەم بـووە شانشین لەسەر بەریتانیا کە دۆستی مۆریس بوو ... کە ئەو مۆریسی کـرد بـە راوێـژکارو ، دوای ئـەوە بـووە بـە ئەنـدامی ئەنجوومـەنی گـشتی بـەریتانیاو دوایی بووە و وەزیری دارایی ... بەڵام دوای سێ ساڵ کێشە لە نێوان هندری هەشتەم و مـۆریس پەیـدابوو ، لـەئاکامی ئـەو کێشەیە لـە ١٥٣٥/٧/٦ بریـاری لەسێدارەدانی بۆ دەرکردو لە سێدارەدرا لە شارەکەدا .

سەرچاوە :– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی ٣/ .

١٤٧٨/١١/١ دەرچوونی بریارێك لە لایەن پاپا – سكستۆس– ی چوارەم ، ئەویش بە دامەزراندنی شەش قەس ، لەوانەی كە هەڵگری مۆڵەت و بروانامەی بەرزی خووێندنی ئاینیان هەیە.

ئەویش لەپێناو پێك هێنانی دەستەیەكی دادگایی و پشكنین لە پێناو لێكۆلینەوە لەسەر كارە نا لەبارو نەگوونجاوەكان لەگەڵ ئاینی مەسیحی و یەكخستنی بیروبۆچوونی جیاوازو دانی دەسەڵاتی تەواو بە دەسەڵاتی شانشینی ئیسپانیا .

## ١٤٧٩

١٤٧٩/١/٢٨ ئۆزۆن حەسەن... واتە حەسەنە درێژ ، كوری عەلی بەگی كوری قەرە ئەیلول عوسمانی میری هۆزی– ئاقۆینلو– بووە ، كە مەرە سپیانی تەتەرو لە سەردارانی لە شكری تەیمووری لەنگ بوو . كە دەووڵەتی مەرەسپیانی لە سەر دارو بەردی دەووڵەتی مەرە رەشیان– قەرەقۆینلوو– دامەزراندنووەو پایتەختی لە دیار بەكرەوە بردۆتەوە شاری تەرێزو لەوێ مردووە ، كە دروشمی ئالاكەیان لە سەر شێووەی مەرێكی سپی بووە .

ئەم هۆزە بە بەردەوامی بەربەرەكانی كوردو فارسیان كردووە لە پێناو بە هێزكردنی دەسەڵاتیان لەسەر خاكی گەلانی دیكەدا ، چونكە تەتەرەكان لە ئاسیای بچووك ، واتە لە دوورگەی بیابانی نێوان مەنگۆلیاو چین بەرەو كوردستان و ناوچەكانی دیكە هەنگاویان ناوە ، كە هەر ئەوەش بووە هۆی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی دەوڵەتی عوسمانیەكان .

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەر وەك لە چەندین جێگەی دیكە لەناوەرۆكی مێژوونامەكە دیاركراوە ، كە دەووڵەتی عوسمانی لە تورك پێك نەهاتبوو ، بەڵكوو لە گەلانی كیشووەری ئاسیاو هەندێكیدیكەیان لە كیشووەری ئەوروپا ، لە گەلانی دەربەدەر كراو پێك هاتبوو ، ئەویش لە ئەنجامی شەری نێوان ئیمپراتۆیەتەكانی بەر لە دەوڵەتی عوسمانی . بەپەرت و بڵاوە پێكردنیان و هەژار كردنیان و بە ناچار كردنیان بە پەنا بردنە بەر هەر دەسەڵات و بنەماڵەیەك لە پێناو یارمەتی دانیان بە دابین كردنی بژێووی ژیانیان ، ئەویش بووە هۆكاری بنەرەتی لە دامەزراندنی دەووڵەتی

عوسمانی و نەتەوەی تورك لە ئاسیادا .

١٤٧٩/١/٢٨ مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی درێژخایەن لە نێوان دەسەڵاتی عوسمانی و وڵاتی بووندقیە ، بە بەجێهێشتنی شاری ئەشتوودرەی ئەلبانی بەرامبەر بە هەندێ دەسکەووت ، نیازی عوسمانیەکان کە هەنگاو نان بوو بەرەو ئەورووپا ، کە ئەو کاتە کۆماری بووندەقیە گرنگترین و بەهێزترین کۆمار بوو لە کێشوەری ئەورووپادا .

## ١٤٨١

١٤٨١/٥/٣ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان محەمەد ئەلفاتحی دووەم کۆچی دوایی کرد ، لە تەمەنی ٥٣ ساڵیدا ، کە ماوەی دەسەڵاتەکەی ٣١ ساڵ بوولە سەر ئیمپراتۆریەتەکەدا .

١٤٨١/٥/٣ ڕامیاریەتی ئاینی و نەتەوەیی شا ئیسماعیل لە وڵاتی فارس لە ناوچە داگیر کراوەکانی کوردستان و عەرەبستان دا ، لە پێناو نانەوەی تۆوی دووبەرەکی بوو لە نێوان مەزهەبەکانی شیعە و سوننە ، لە نێوان مەلاو گەوورە پیاوانی ئاینی کوردو عەرەب ، لە نێوان فارس و کورد ، لە ئاکام ناچار کران کە نامەی داواکاری پشتگیری بۆسوڵتانی عوسمانی ڕەوانە بکەن.

١٤٨١/٦/٣ لە دوای کۆچی دوایی سوڵتانی عوسمانی سوڵتان محەمەد ئەلفاتح لەناوچەو هەرێمە جیاجیاکان دەست کرا بە ئاهەنگ گێران و سەماکردن ، بەبۆنەی مردنی ئە سولتانە ، ئەویش بەهۆی درندەیی دەسەڵاتەکەی بوو لە ئازاردان و ئەشکەنجەدانی گەلانی ژێر دەسەڵاتەکەیدا ، بە تایبەتی گەلی کورد لە کوردستان .



١٤٨١/٧/٢٠ لــــه ســــەردەمی دەســەڵاتی سوڵتانی عوسمانی ، سولتان بایەزیـــدی دووەم ، ســـــــەرکردەی ئیمارەتی مۆسکۆی رووسیای قەیسەری –ئیڤانی سێیەم – تــــــــووانی ئیمارەتەکەی لە ژێر دەســەڵاتی رژێمــی ئیسلامی عوسمانی رزگار بکات دوای ئەوە دەستی کرد بە فراوانکردنی سنووری ئیماراتەکەی بەرەو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی رژێمی عوسمانی، دوای ئەوە بەرەو باکــووری کــوردستان.

هــەروا بــەرەو ئــەنازۆڵو ئــەوروپای رۆژهــەڵات ، کــە لــەوکات دەســەڵاتی عوسمانی سەرقاڵی رێکخستنی کاروباری ناوخۆو شەرەکان بوو لە پێناو فراوانکردنــی ســنووری دەســەڵاتو بــە هێزکردنــی دەســەڵات لــە هــەموو بووارەکاندا بەتایبەتی لە بوواری ئاینی مەزهەب سوونئە بەرامبەر مەزهەبی شیعەی فارس لە کێشووەرەکەدا .

## ١٤٨٣ 

١٤٨٣/١١/١٠پێکهاتەی بنەماڵەی لۆسەری لە بارووددۆخێکی نەوەو کەشو هەوایەکی وا دورست بوون ، کە لە شارێکی بچووك بوون ، دانیشتووانی لە ٣٠٠٠ سێی هەزار هاووڵاتی زیاتر نەدە بوو، کە لەو رۆژە – مارتن هانز – چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .

هەروا بە هۆی توندڕەوی هەلسو کەووتو رەفتارەکانی . باوکی گەیشتە ئەو بروایەی کـە بـە کارهێنـانی داری جادووکـەری باشـترین رێگەیـە بـۆ چارەسەرکردنی هەر کێشەیەك کە سەر هەڵدەدات ، لە لایەن دروستکەری

كێشە هەمەلایەنەكان .

١٤٨٣/١١/١٠ روونــاكبیرو چاكــسازی نــاوداری مەســیحی و دامەزرێنــەری رێبــازی پرۆتستانتی – مارتن لۆسەر – لە شاری ، ئیسلین ، ی لە باكووری ئەلمانیا لەچاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە شارەكەدا .

جێگەی ئاماژە پێكردنە كە مارتن لە قوتابخانەی – مەگدبۆرگ – و – بزناخ – دەستی بەخوێندن كردووەو لەساڵی ١٥٠١ چووەتە زانكۆی – ئیرفۆرت – و بروانامەی زانكۆی لەساڵی ١٥٠٥ بەدەست هێناوە – بەهۆی هەڵوویستی توندوتیژی دایك وباوكی لەساڵی ١٥٠٥ رووی كردۆتە – ئۆگستین – لە ئێرفۆرت و لەساڵی ١٥٠٧ بۆتە قەشەی مەسیحیەكان . مارتن بەهۆی زیرەكی و لێهاتوویی توانیوویەتی لەساڵی ١٥٠٨ ، وانەی فەلسەفە لەزانكۆی – فیتنبۆرك – لەسەر ئاستێكی بەرز بلێتەوەو كتێبەكەی ئەرەستۆی بەجوانی شێكردۆتەوە .

هەروا لۆسەر لەساڵی ١٥٠٧ چۆتە شاری – رۆما – ی پایتەختی ئیتالیا و لەنزیكەوە ئاگاداری باری گشتی مەسیحیەكان و كاروكردەوەی پاپای ڤاتیكان بووە ... كە لەو دەمەدا پاپا پێویستی بە پارەو سامان هەبوو بۆ خەرجی خۆیی و خزمەت كردنی كتێب و كەرادلەكان .

ئەویش لە پێناو بەدەست هێنانی ئەو ماڵ و پارەیەش پەنای بردۆتە بەر – چێكی لێخۆشبوون – داوای دەكرد كە هەرچی بكرێ خودا لەگوناهەكانی خۆیی و خزمەكانی خۆش دەبێ ... لەو كاتەشدا قەشەیەكی دۆمەنیكی بەناوی – بۆمەنناتتس – لە ساڵی ١٥١٦دا سەرپەرشتی فرۆشتنی ئەو چێكانەی لێخۆشبوونی دەكرد ... مارتن ئەو كارەی كە بەچاوی خۆی بینی زۆر پێی پەست بوو ، چونكە كاری وا لەمەسیحیەكاندا رووی نەداوە . كاتێك كە گەرایەوە ئەلمانیا دوای لێكدانەوەیەكی قووڵ و هەڵسەنگاندنی ووردی پرەنسیپەكانی ئایینی مەسیحی كرد .

مارتن هەڵسا بەیاننامەیەكی راگەیاندو ٢٥ كێشەی گرتە خۆ لەدژی – چێكی لێخۆشبوون – و لە ١٥١٧/١٠/٣١ لەسەر دەرگای كنێسای فتنبورگ لە فرانكۆرت هەڵیواسی ، كە تتس بەم كارەی زانی رووی كردە فرانكۆرت و لەوێ بەیاننامەكەی مارتن لۆسەری بڵاوكردەوە ... دوای ئەوە قوتابیانی

شارەکە بەیاننامەکەی تتسلیان سووتاند.
دوای ئەوە مارتن بەیاننامەکەی بۆ خاوەنی سامان و خانەدانەکانی ئەلمانیا دەرکردو داوای لێکردن کە پشتگیری لەو بزووتنەوەیە چاکسازییە ئاینیە بکەن ... دوای ئەو رووداوانە ل ەسالی ١٥١٨ پاپا – لیوی دەیەم – مارتنی بانگ کردە رۆما بۆ لێپرسینەوە لەسەر ئەو کردەوانەو رەخنەکانی ... لەو کاتەشدا زانکۆی فرانکۆرت و نووێنەری سەکسۆنیا لەسەر مارتن لۆسەر بەجواب هاتن و مارتنیش بەردەوام بوو لەسەر پەلاماردانی دەسەڵاتی پاپا ... بەو هۆکارە پاپا – لیوی دەیەم – مەرسوومێکی لە دژی لۆسەر، کە لە ٤١ کێشە پێك هاتبوو راگەیاند .
دوای گەیشتنی مەرسوومەکە بەدەست لۆسەر سووتێندرا . دوای ئەوە لۆسەر کنێسەیەکی نوێی بەناوی کنێسای پرۆتستانتی دامەزراندو گرنگترین پرنسیپەکانی ئەو چاکسازیە لەچوار خاڵ پێك هاتبوو کە ئەویش:–

١– هەڵووەشاندنەوەی چێکی لێخۆشبوون .
٢– قەشەکان چیتر رەبەن نەکەن .
٣– هەڵووەشاندنەوەی قووداسی لێخۆشبوون لەگوناهی مردوان .
٤– هەڵووەشاندنەوەی ئەو رێورەسمە ئاینیەی کە قەشە نان و شەراب دەگۆرێ و بەجەستەی مەسیح خوێنەکەی .

هەوڵەکانی لۆسەر بەرەو گەشەدان بەرز دەبووەوە و لەسەر کارەکانی بەردەوام بوو تاکوو لە ساڵی ١٥٤٦/٢/١٨ کۆچی دوایی کرد لە وولاتەکەدا .
سەرچاوە :– رۆژنامەی – الصباح – پاشکۆی هەفتانە ژمارە /٢٤٧

## ١٤٩٢

٢ / ١ / ١٤٩٢ لەم رۆژەدا هێزەکانی سووپای – قشتالە – توانی بچێتە ناوشاری گرناتەی ئەسپانی و ئالأی – قەدیس یاقب لە تەك خاچی جەنگ – لە سەر باڵەخانەی سوور – قصر الحمراو – بەرزبکاتەوە ، کە ئەم رۆژە کرا بە رۆژی جەژنی سەرکەووتن لە هەموو وولاتانی هەڵگری ئایینی مەسیحی ... هەروا فەرمانی پاپا لە هەموو کەنیسەکانی جیهان لێدرا بەم بۆنە مەزنە کە تێیدا

سەرکەووتنیان بەدەست هێنا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە تارقی کوری زەید لە ساڵی ٧١١ ی زایینی بەهێزێکی گەورەی هەڵگری بڕوای ئایینی ئیسلام ، توانی ئەسپانیا داگیربکات ... ئەبوو عەبدوڵڵا کە دوا شای گەرناتە بوو ... کە ماوەی هەشت سەد ساڵ لەژێر دەسەڵاتی ئیسلام بوو .



دوای گەڕاندنەوەی شاری گەرناتە و بەوەدەرنانی دەسەڵاتی ئیسلام لە ئەسپانیا . ئەبوو عەبدوڵڵا و بنەماڵەو بنەماڵەی دارو دەستەکەی و بەرپرسانی هەمووی بە چەند کەشتیەك ڕەوانەی ئەفریکیا کران و کۆتایی بەدەسەڵاتی ئیسلام لەو وڵاتەدا هات ، هەروا لەچەندین وڵاتی دیکەشی کە لەو کاتە دەسەڵاتی ئیسلام بەرەو کزی و لاوازی هەنگاوی دەنا .

ئەویش لەبەر دوو هۆکا ری سەرەکی ئەویش :-

یەکەم :- بە ئیسلامکردنی بەزۆرو ماوەنەدان بە بیرزورای جیاوازو دژایەتی کردنی هەڵگرانی ئایینی مەسیحی و ناوزەندکردنیان بە کافر تاکوو ئێستاش لە وڵاتەکەدا .

دووەم :- بەعەرەب کردنی بەزۆر چ لە رووی نەتەوەیی و چ لە رووی خاك کە دوو هۆکار بوونە تاکوو ئێستاش لەلایەن ئیسلام پەیرەو دەکرێت بە تایبەت عەرەب کە ئایینی ئیسلام بەهی عەرەب دەزانن .

هەر لەوکاتەشدا ئەبوو عەبدوڵڵا کلیلی باڵەخانەی سووریان دا دەست شا - فرودینالد و شاژن ئەیزابلا ... کە وێنەکێشی ناوداری جیهان وێنەی ئەو ڕێ و رەسمەی لە تابلۆیەکی گەورە وێنە کێشابوو ، کە بۆتە کەلتوورێکی وڵاتی ئەسپانی ... کە شاری گەرناتەو باڵەخانەی سوور بە شێووازێکی

ئیسلامی بەنەخش و نیگار رازاندرابووەوە .
ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـە هێزەکـانی قەشـتالە تـوانی دەسـت بەسـە
تەواوی وویلایەتی ئەندەلووس دابگرێت لە ساڵی ١٢٦٢ و بووە هۆی ئـەوە
کە ئەندەلووس هەموو بنکەکان لە دەست بدات .
سەرچاوە :– گۆڤاری هلال . مانگی ٥/‏/٢٠٠٨ – ل/١٦٦ .

١٤٩٢/٣/٣٠ بـە هـۆی زۆری ڕووداوەکـان ، لـە ئەسـپانیا شانشین – فردینانـدۆ ئیـزابیلا –
مەرسـوومێکی راگەیانـد ، بـە دوورخـستنەوەی جوولەکـەکان لـە هـەمو
تەمەنێك بێ جیاوازی بە بەجێ هێشتن و دەرچوونیان لە خاکی ئەسپانیا
ماوە نـەدانیان بـە گەرانـەوەیان و لـە گـەڵ ئەوەشـدا ئـەوەی سەرپێـچی ئـە
مەرسوومەی بکردایە لە سێدارە بدرێت ، ئەم مەرسوومەش تاکوو ٧/٣١، ی
هـەمان سـاڵ دەبـێ ئـەم مەرسـوومە جـێ بـەجێ بکرێـت ، واتـە مـاوەی چوا
مانگ مۆڵەتیان بۆ جوولەکەکان دیاری کرد لە وولاتەکەدا .




١٤٩٢/١٠/١٢ لـە دوای هـەوڵ و مانـدو بـوونێکی
بـەردەوام ئـەویش بـە دۆزینـەوەی
کیـــشووەری ئـــەمریکا لەلایـــەن
گـــەڕۆکی نـــاوداری ئەمـــەریکا و
جیهان – کریستۆفەر کۆلۆمبس –
لـــە دوای هـــەوڵو تەقـــەلاو
مانـــدوبوونێکی زۆر بـــۆ ئـــەو
کێشووەرە و بوونی لە جیهاندا .

## ١٤٩٤

١٤٩٤/٦/٧ پاپـا ئەلکـسەندەری شەشـەم بـلاو کراوەیـەکی راگەیانـد ، کـە حکوومـەتی
ئەسـپانیا خاوەنداریـەتی ئـەو زەویانـە دەکـات ، کـە خاوەنـەکانیان روو لـ
ئاینی مەسیح ناکەن .
لـە رۆژ ئـاواداو ئـەو زەویانـەی لـە رۆژهـەلات بـۆ پورتووگالیـەکان بـوو، کـ
هێلێکی خەیالی بوو لە نێوان ئیمپراتۆریەتی ئەسپانیاو پورتوگالو بەو لێ
جیا کەرەوەییە ، کە لە باکوور بۆ باشوور بە درێژایی ٢٧٠ میل لە رۆژئـاوا

ئەزوورو دوورگەی – راس الأخضر – بوو، بەڵام پورتووگالیەکان ئەو ڕاگەیاندنەیان ڕەتکردەوەو بووە هۆی بەرەو بەر پابوونی شەڕی نێوانیان، بەڵام ئەویش بە مۆرکردنی پەیمانی – تۆردیسیلاس – کۆتایی هات بە دیاریکردنی هێڵی سنووری هاوسەنگی نێوانیان لە ناوچە و هەرێمەکەدا .

## ١٤٩٥

١٤٩٥/٤/٢٧ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان سلێمان خانی یەکەمی قانونی لە دایك بووە ، کە دەیەم سوڵتانی عوسمانی بووەو دەسەلاتی بەشێوەیەکی یاسایی بەرێوە دەبرد ، لە دوای مردنی سوڵتانی عوسمانی سوڵتان سەلیم ئیسماعیل پاشا دەسەلاتی گرتە دەست لە سەر تەواوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا .

## ١٤٩٧

١٤٩٧/٦/١ لە گەشتەکەیدا گەڕۆکی ناوداری جیهانی – کۆلۆمبس– لەگەرانێکی گران و بەردەوام گەیشتە کیشووەری ئەمەریکای باشوورو ، کە لەو کاتەش – جۆن کابۆت– گەیشتە دوورگەی کیب بریتۆن لە کەنداوی سانت لۆراس لە ڕۆژی ٦/٢٤ی هەمان ساڵدا ، کە یەکەم ئەورووپی بوو بگاتە ئەو کیشووەرە لە نیووەی گۆی ڕۆژئاوای زەویدا .

لە دوای سەردەمی هەوڵەکانی گەڕۆك لایف ئەریکسۆن لە ساڵی ١٠٠٠دا.
کە ئەم گەریدانە ڕۆڵی باڵایان هەبوو لە هەموو بووارەکان بە تایبەتی لە بوواریجووگرافیدا لە جیهان .




نەخشەی دۆزینەوەی کێشوەرەکان

**١٥٠٠**

١٥٠٠/٦/٢٦ تەریقـەتی سـەفەوی فـارس لـە ئێـران ، کـە ببـووە بزووتنەوەیـەکی ئـاینم
رامیـاریو بـەهێز بـوون ، هەرچـەندە کـووژرانی یـەك لـە دوای یـەکم
سەرکردەکانی نەك بە هەڵووەشاندنەوەی ، بەڵکوو ببووە هۆی خۆشکردنم
زەمینـەی بـە هێـزی دەسـەڵاتو دەسـەڵاتی رامیـاری بگرنـە بـەر لـە جبهانم
ئیسلامیدا .

لە کاتێکدا کە ئەمیرەکانی ئاقۆینلوو بەر ببوونە گیانی یەکترو لەو کات
ئیـسماعیل تەمـەنی لـە سـیانزە سـاڵان بـوو. بـەپێی رێـوو شـووێنەکانم
خەلیفەی تەریقەتی کەووت بەخۆ ئاشکرا کردن بەرەو ئەردەبیل کەووتە رێ
بـە درێـژایی رێگـا لایـەنگیرانی باوبـاپیرانی ئەهاتنـە رێـزی لەشـکرەکەی
ژمارەیان بەرەو زیاد بوون دەچوون .

شایانی باسە کە مەزهەبەکانی هەمەلایەنی ناو ئاینی ئیسلام هۆکاری لێ
ترازانی تەواو بوو لە نێوان بیروو بۆ چوونە جیاکانی کۆمـەڵگای ئیسلام
لەگـەڵ رێنماییـە بنەڕەتیـەکانی ئـاینی ئیـسلام بـەپێی دەسـتووری نـەگۆر

ئاینی ئیسلام کە قورئانی پیرۆزە .
بە تایبەتی لە نێوان ئەو دوو مەزهەبە دژ بە یکتریەکەی شیعەو سووننە ، جگە لەوەش تەریقەتەکانی قادریەو نەقشەبەندیو چەند بیروو بۆچوونی دیکەی جیاواز لە ناو ئاینی ئیسلامو کاردانەوەی لە سەر باری نەتەوەییو رامیاریو نیشتمانیو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیریو مێژوو زمانو کەلتوورو دابو نەریتدا لە ناو کۆمەڵگاکانی دیکەدا لە جیهانی ئیسلامیدا...؟.

## ١٥٠٢

١٥٠٢/٢/١٢ راگەیاندنی مەرسوومی شانشینی لەلایەن شانشینی ئەسپانیا بە هۆی بەرپابوونی راپەرینو خۆپیشاندان لە شارو ویلایەتەکان بە ئاگادار کردنەوەی هەڵگری بڕوای ئاینی ئیسلام چ بە چوونە ناو ئاینی مەسیحیو چ بە بەجێ هێشتنی ئەسپانیا.
بەو هۆیەوە ئیسلامەکان نارەزایی خۆیان بەرامبەر بەو مەرسوومە دەربری .
جێگەی ئاماژە پێکردنە کە عەرەبە دانیشتووانەکانی ئیسلامی لە ئیسپانیا ، هەندێکیان بە هۆی هێرشەکانی فتووحاتی ئیسلامیو هەندێکیان بەهۆی کارو بازرگانی روویان لەو وڵاتە کردبوو .
بەڵام بە هۆی هەڵوێستی شۆفێنیانەی عەرەبە توندڕەوەکان لە رامیاریی و هەڵوێستی بە داگیرکردنو بە عەرەبکردنی گەلانی رەسەنی ئیسپانیا ، کە ئەمەش بووە هۆکاری دەرکردنی ئەو مەرسوومەلەو وڵاتەدا .
چونکە عەرەبە دانیشتووانەکانی وڵاتی ئیسپانیا نەك هەر بۆ کاری دابین کردنی بژێووی ژیان نیشتەجێی بوون . بەڵکوو هەوڵی دورستکردنی دوو دڵیو نانەوەی دووبەرەکی بوون لە نێوان پێك هاتەی ئاینی لەم وڵاتەدا ، بە تایبەتی لە نێوان ئیسلامو مەسیحی...کە ئەمەش بووە هۆی کاردانەوەی لە سەر پەیووەندی کۆمەڵایەتی بکات لە هەموو بوارەکان لەوڵاتەدا .

## ١٥٠٤

١٥٠٤/٢/٢٩ لە دوای بلاووکردنەوەی رۆژنامەی رۆژەکان بە روونکردنەوەی باری رۆژانەی ئەستێرەکانی سووراوە– سیار – لە ماوەی ٣٢ ساڵی دادێ ، کە لەو کتابە

نووسـراوه ، کـه کۆلـۆمبس وای پێـشبین کـردووه . کـه خـسوفی مـانگ وەك سـکی پیـاوێکی برسـی پـر دەکـات، دوای ئـەوه چـەندین روونکردنـەوه لـه بارەی زانستی گەردووناسی نوێی تایبەت بە موزەنەبەکان دیاریکرا .

١٥٠٤/١١/١٥ کۆچی دوایی شانشین ئیزابیلای شانشینی ئیسپانیا .. شایانی باسه کە ئیـزابیلا لـه ١٠/١٢ی هـەمان سـاڵ ئامۆژگاریـەکانی نووسـیەوه ، کە لـە دوای مردنـی لـه سـەر تەرمەکـەی ئاهـەنگ بگێـرن و ئـەو سـامانەی کـه لـه کۆگاکـان کۆکراوەتەوه بە سەر هەژاران دابەش بکرێت .

بۆ ئاگاداری خووێنەر گۆڕی شانشین ئیزابیلا له شاری غەرناتەیە.

## ١٥٠٩

١٥٠٩/٩/١٣ دەسـتپێکردنی دوا گەشـتەکەی کریـستۆفەر کۆلـۆمیس لـه زەریـای ئەتلەسی .

## ١٥١٢

١٥١٢/٤/٢٥ لـه دوای بـەجێ هێـشتنی دەسـەڵاتی عوسمـانی لەلایـەن سـوڵتان بایەزیـدی دووەم بـۆ کوڕەکـەی ، سـوڵتان سـەلیمی دووەم و بـوونی بـه سـوڵتانی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی ، بـه پـشتیووانی هێـزی سـووپا لـه بەهێـز بـوونی جێگـەی لـه سـەر دەسـەڵاتی عوسمانی لـه – فتووحـاتی عوسمـانی – واتـه بەرەو داگیرکردن و فراوانکردنی سنووری جووگرافیدا .

سـوڵتان سـەلیم بـۆ هانـدان و بـانگکردنی دەووڵـەتی رۆم و پـەلاماردانی دەوولەتی تازه دامەزراوی مەزهەب شیعەی فارسی لـه ئێران ، لـەپێناو لـەناو بردنی . کە دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تا ئەو کات و ساته دا رووی پەل هاوێشتن و فراوانکردنی سنووری جووگرافی بـەرەو ئـەورووپا بـوو، نـەك رۆژهەڵاتی ناوەراستدا.

بەڵام کاردانەوەو هۆکاری دورست بوونی دەسەڵاتی مەزهەب شیعەی فارس لـه ئێـران و رۆژهـەڵاتی ناوەراسـتداو هەوڵـدان لـه پێنـاو فراوانکـردن و بەهێز بـوونی لـه کوردسـتان و قـەفقاس و ئەرمەنـستان و دوایـی بـەرەو عەرەبـستان هـەنگاوینا ، کـه بـووه هـۆی مەترسـی راسـتەقینه لـه سـەر دەسـەڵاتی

ئیمپراتۆریــەتی عوسمــانی لەناوچــەو هەرێمــە جیاجیاکــان بەتایبــەتی لــە رۆژهەڵاتی کوردستان.

چونکە لــەو کاتــە دەســەڵاتی مەزهــەب شــیعەی فارســی پاڵەپەســتۆی زۆری خستبووە سەر دانیشتووانی کورد لەسەر خاکی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی فارس ، بەوەرگێرانی بیرووباوەری مەزهەب سوونەی ئیسلام بۆ مەزهەب شیعە بەناوی – جەعفەری– لەو کاتەش دەسەڵاتی ئیمارەتەکانی کورد توانیبوویان جێپێگەی خۆیان پتەو بکەن و هەنگاویان بەرەو بەهێز تر دەنا ، کە ئەمانە بوونە هۆکاری روو وەرگێران و پەلامارەکانی هێزی سووپای عوسمانی و بەرەو رۆژهەڵاتی ناوەراست بە تایبەتی کوردو خاکی کوردستان.

بە بەرپابوونی بە دەیا شەڕی ئاینی و خاک و نەتەوەو دەسەڵات لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئیمپراتۆریەتی فارسی سەفەوی لە ئێران و ناوچەکانیدیکەدا .

## ١٥١٣

١٥١٣/٤/٢ گەریدە بەناوبانگەکانی جیهان ، لە دوای دۆزینەوەی کێشووەر و هەرێم و ناوچەو بەردەوام بوونیان لەم کارەدا ، کە دوایین دۆزینەوە دۆزینەوەی کــــەنارەکانی فلۆریدا بوو لە سەر دەستی دۆزێنەری ئەسپانی – برۆنس لیووث – لە کێشووەرەکەدا .

١٥١٣/١١/٥ بریاردانی مەرسوومێك لەلایەن شانشین – لیۆ – ی شانشینی ئیتاڵیا بە تێکەڵاوو کردنی هەردوو پەیمانگای زانستی لە یەك پەیمانگادا ، ئەویش بە هۆی سەرهەڵدانی تەنگژەی دارایی ، کە زانکۆی کۆشکی بیرۆز– کە ، فاتیکانە– لە گەڵ زانکۆی مەدەنی، کە هەردوو پەیمانگەکە لەو رۆژە بووە زانکۆی رۆما بە دابین کردنی بالەخانەو پارەو پێداوویستیەکان.

دوای ئەوە کە ناوزەند بوو بە ناوی – سابیندسا – و ئەو پەیمانگایە لە کاتی پاپا ئەسکەندەر باشترین بووژانەوەی بەخۆوە دیت لەووڵاتی رۆما .

## ١٥١٤



١٥١٤/٢/١٥ ئەستێرە ناس و ماتماتیكناس و كەسایەتی ناوداری ئیتاڵی و جیهانی بەناوبانگ - گالیلۆ – لە شاری بیزای ئیتاڵیا چاوی بەجیهان هەڵهێناوە .
ئـــەم كەســـایەتیە لـــەكارە هەمەلایەنـەكان سـەركەووتوانە بــەردەوام بـــووە تـــاكوو لـــە ١٦٤٢/٨/١ كۆچـــی دوایـــی دەكات لە وولاتەكەیدا .

١٥١٤/٣/١٩ بە هۆی باری ناوچەو هەرێمەكان بەسەرهەڵدانی كێشەی مەزهەب ئاینی لە نێوان دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەسەلاتی شا ئیسماعیلی سەفەوی فارسی ، كە بەو هۆكارە كۆبوونەوەیەكی گەوورە پیاوانی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئەنجامدراو سوڵتان سەلیمی دووەم سەركردەی دەووڵەتی مەزهەب سووننەی ئیسلامی رایگەیاندو ووتی:–
شا ئیسماعیلی سەفەوی مەزهەب شیعەی ئیسلام ، ترسی زۆری خستۆتە سەر دەسەلاتەكەمانو مەزهەبی سووننە ، كە جێگەی گومان لێكردنە .
لە بەر ئەوی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەسەلاتی ئیسلامی سووننە بووە ، بە پێچەوانەی دەسەلاتی شا ئیسماعیلی سەفەوی فارسی لە ئێران ، كە دەسەلاتی فارسی مەزهەب شیعە نەك هەر كاردانەوەی لەسەر دەسەلاتی عوسمانی هەبووە بەڵكوو كاردانەوەی خراپی لە سەر جیهانی ئیسلامی هەبووە . لە هەموو لایەنێكدا .
ئەمەش بە هۆی كردەوە جۆراو جۆرەكانی دەسەلاتی شا ئیسماعیلی فارسی سەفەوی بەرامبەر بە مەزهەبی سووننە لە ناوچەو هەرێمەكانی ژێر دەسەلاتی عوسمانی ، كە ئەو هۆكارانە بووە هۆی كاردانەوە لەسەر

هەلوویـستی سـولْتان سـەلیمی دووەمو شـەڕی دژ بەدەسـەلاتی فارسـی ڕاگەیاند ، کە لە شاری ئەردنە بەرەو ولاتانی فارس بەڕێکەووت .
سەرەرای نامە گۆڕینەوەی بەسوودی نێوانیان ، کە شەرەکە بەسەرکردایەتی سولْتان سـەلیمی دووەمـی سولْتانی عوسمـانی بـوو ، تـاکوو داگیر کردنـی شـاری تـەوەرێز ، کـە خـاکی کوردسـتان . لـە بـاکووری ڕۆژهـەلاتی ببـووە گۆرەپـانی شـەڕی داگـیر کـردنو هـەلاتن ، لـە نێـوان هێزەکـانی سـووپای شەڕکەری عوسمانی و سەفەوی فارسی لە سەرخاکی کوردستان .

٢٤ / ٤ / ١٥١٤سولْتان سـەلیمی یەکـەم فـەرمانی پێشرەویەتی کردنـی سـووپاکەیدا بـەرەو ڕۆژهـەلات لـە بـاکووری کوردسـتان ، تـا گەیـشتە شـاری ئـەرزیخان ، کـە لـەو کاتەشـدا هێزەکـانی سـووپای ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی مانـدوو بـوونێکی زۆریـان بەخۆوە بینی لـەو کۆچکردنە بۆئەو ناوچانە بەهۆی کـەمی ئازوقـەو خۆراك و پێداویستیەکانی دیکەی جەنگ .
بەتایبـەتیش لـەو کاتـە نەخـشەی پلانـی – خـاکی سـووتاویان – بەرزکردبووەوە بە پـەیرەوکردنی . کـە – محەمـەد خـان ئوسـتانەلوو – والـی دیاربەکر لەباکووری کوردستان ، واتە – ئامەد – پاشەکشەی دەکرد ... و – نـوور عـەلی خەلیفـە ڕوومـلـوو – یـش والـی ئـەرزیخان پاشەکـشەی کـرد و هەردوو والی بڕیاریان دا ، کە دژی هێزەکانی سووپای عوسمانی بووەستن و یارمەتی دەری سەفەویە فارسەکان بن.
لەو شەڕەش کە لەهەر جێگایەك بڕۆیشتنایە هەموو شتێکیان دەسووتاند کە بە کەڵك دووژمن بهاتایە ... ئەو کارەشیان لە پێناو دابەزاندنی وورەو توانـای سـووپا بـوو لەگـەڵ ئـەو هەراسـانکردنەی هێـزی سـووپای سـولْتان سـەلیم بەردەوام بـوو ... کە پێشرەویەتی هێزەکـانی سووپای دەکـرد بۆ نـاو خـاکی ئێران لە هەرێم وناوچەکاندا .
لەهـەمان کـات شـا ئیـسماعیلی سـەفەوی فـارس پلانـی وابـوو کـە سـووپای عوسمانیەکان بۆ قولاٌیی ناوچە چیاییەکانی خاکی ئێران وەربگێرێ و لـەوێ پەلاماری هێزەکانی سووپای عوسمانی بدات و لەم شەڕە سەرکەووێت . هـەر لەوکات و ساتەکانی هێرشی هـەردوو لا سـولْتان سـەلیم – ورووژێنـەری – بۆ

شـا ئیـسماعیل سـەفەوی دەنـارد ، لـە پێنـاو تـورەکردنی شـا ئیـسماعیل بریـاری رووبەرووبوونـەوە بـدات . دژی هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی شەڕەکە بەفەرمی هەڵبگیرسێ.

لەئەنجامـدا شـەڕەکە دەسـتی پێکـرد لـە نێوان هـەردوو لایـەنی دووژمنکار هەڵگری بڕوای ئیسلامی مەزهەبی شیعە ، کە شا ئیسماعیل سـەفەوی فارس و ... مەزهـەب سوووننە کـە سـوڵتان سـەلیم بـوو لەسـەر خـاکی کوردسـتان جێگـەی ئامـاژە پێکردنـە کـە ناوچـەی چاڵیدێران ٣٨٤ کیلۆمـەتر لـە شار تەورێز دوورەو دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای – شاری خوویی– کە دەکەوێت نێوان دوو زنجیرە چیاو دەشتەکە بەلای رۆژهەلات و رۆژئاوا درێژ بۆتەوە . ا هەندێك شووێن ئەو دوو زنجیرە چیایە بە جۆرێك لێك دوور دەکەوونەوەو ك دەشـتاییەك دروسـت دەکـەن . کـە چـیاکان بەچـاو نابینریـت . دەشت چاڵیدێران وەك دەشتێکی پان و بەرین دەردەکەوێ ، کە دەکەوێتـە باکوور رۆژهەلاتی دەریاچەی وان لەباکووری کوردستان .

پاش چەند مانگێك شەڕەکە لە ٨/٢٣ دەستی پێکردوو لە ئاکام کوردستان گـەلی کوردسـتان زیـان بـەخش بـوون بـەهۆی بـوونی خـاکی کوردسـتان ب گۆڕەپـانی شـەڕی نێـوان سـەفەوی فارسـی و ئیمپراتۆریـەتی عوسمـان لەهەرێمەکەدا .

سەرچاوەکان :– کورد لەمێژووی دراوسێکانی – سیاحەتنامەی ئەولیاچەلەبی کوردو کوردستان – محەمەد ئەمین زەکی .

١٥١٤/٨/٢٣ بـەرپابوونی شـەڕی چـالدێران لـە نێـوان هێزەکـانی سـووپای ئیمپراتۆریـــەتی عوسمـــانیو هێزەکـانی سـووپای فارسـی سـەفەوی لـە سـەر خـاکی کوردستان ، ئەویش



بە هۆی پشتگیری کردنی هێزەکانی سووپای عوسمانی لەلایەن هێزە چەکدارەکانی کورد ، کە ئەمەش بووە هۆی سەرکەووتنی هێزەکانی سووپای عوسمانی بەسەر هێزەکانی سووپای سەفەوی فارسدا.

ئەم کارەش بە کارەسات هەڵگەراوە بۆ کوردو خاکی کوردستان ، ئەویش بە دابەشکردنی کوردستان لە نێوان هەردوو دەسەڵاتی دژ بە یەکتری ، کە بە یەکەم دابەشکردنی سەرەکی کوردستان دادەنرێت لەمێژووی کوردو کوردستان .

ئەویش بە هاوکاری‌و یارمەتی سەرەك تیرەو هۆزو ئەمیرەکانی کورد ، بەپشتگیری کردنی هێزەکانی سووپای عوسمانی‌و نەقۆستنەوەی ئەو هەل‌و مەرجە لە بارانەی کە بۆیان هاتبووە پێشەوە لە ئەنجامی شەڕی نێوانیان ...؟!. بەبەدی هێنانی ئاوات‌و ئامانجەکانی گەلی کوردستان..!!.

١٥١٤/٩/٥ لە گەرمەی شەڕی نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی بە سەرکردایەتی سوڵتانی عوسمانی سوڵتان سەلیمی دووەم‌و هێزەکانی سووپای فارس ، لە دوای داگیرکردنی شاری تەورێز بە ئاموژگاری سوڵتان سەلیم ، دەستیان گرت بەسەر کۆگاو خەزنەکان .

ئەوەی لە ناو کۆگاکە هەبوو هەمووی رەوانەی شاری ئەستەمبوڵ کردو دوای هەشت رۆژ لە جێ بەجێکردنی مەرامەکانی دەسەڵاتی عوسمانی لە هەرێمەکەدا ، شاری تەورێزی جێهێشت لە دوای وویرانکردن‌و تالانکردن .

## ١٥١٥

١٥١٥/٨/٩ دوای ساڵێك لە کۆتایی هاتنی شەڕی نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی‌و هێزەکانی سووپای فارسی سەفەوی لە سەر خاکی کوردستان ، ئەویش بە دابەشکردنی کوردستان لە نێوان ئەو دوو دەسەڵاتە دژ بە یەکتریە . بە پشتیووانی کردنی هێزەکانی سووپای عوسمانی لە لایەن سەرەك هۆزو تیرەو میرەکانی کورد لە سەر خاکی کوردستان .

دوای ئەوە کە بووە هۆکاری مۆرکردنی رێکەووتننامەی نێوان میرنشینەکانی کورد لە باکووری کوردستان لە گەڵ دەسەڵاتی عوسمانی ، بە یارمەتی مەلا ئیدریسی بەتلیسی لە پێناو پەلامارنەدان‌و

هەڵنەگیرسـاندنی شـەڕو بەیارمـەتی دانـی کـورد، بـەڵام دوای ١٥ سـاڵ دەسـەڵاتی عوسمانی لەو ڕێکەوتننامەیە پەشیمان بوونەوە ،. ئەوەش لە پێناو پەلاماردانیان و گەماڕۆدانیان . گەرچی لەو ماوەیەش چ دەسەڵاتی فارسـی سـەفەوی و چ دەسـەڵاتی عوسمانی درێخیان نەکرد بەرامبەر بە کورد لە ئازاردان و ئەشکەنجە پێگەیاندن بە کوردو خاکی کوردستان . بە تیبەتی لە باکوورو ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

## ١٥١٧

١٥١٧/١/٢٤ هێـزە چـەکدارەکانی کـورد بـە سـەرکردایەتی مـیر سـەید عـەلی شـارەکانی کەرکوك و موسڵ و دەوورووبەری خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی ، بە یارمەتی جـەماوەری شـارەکان . لـە پێنـاو بـەهێزکردنی جێپێگـەی خـۆی بـە خزمەتکردنی‌دانیشتووانی هەرێمەکە لە هەموو بووارەکان و ئەویش بەپێك هێنانی دەووڵەتی کوردی و سەربەخۆی ڕاگەیاند .

لە هـەمان کات دەسـەڵاتی فارسـی سـەفەری پیرۆزبایی لێکردو ، ئەویش بەلێنی بە فارس دا ، کە دەست لە کاروو باری ناووخۆی دەسەڵاتی فارسی وەرنـەدات ... بـەڵام دوای سـێ مـانگ ئـەو میرە کوردە بەهۆی پێشبرکێیی سوواری ئەسپ گیانی لە دەست دا.

١٥١٧/١/٢٥ سەرەتای سەرهەڵدانی دورست بوونی دەووڵەتی عوسمانی و تێپەربوونی بە قۆناخە یەك لە دوای یەکەکانی دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمـانی ، لـە هەموو ناوچەو هەرێمە جیاجیاکانی ژێر دەسەڵاتی لە جیهان . بە تایبـەتی لە ئەورووپاو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفەریکیا.

کـە بەسـەردەمی خەلافـەتی عوسمـانی دادەنرێـت بـە مەڵەنـدی خەلافـەت و دادووەری خەلیفـەی ئیـسلام و خزمـەت کردنـی عـەرەب و فراوانکردنـی سـنووری جـووگرافی عـەرەب ، بـە گوواسـتنەوەی لـە دوورگـەی بیابـانی عـەرەبی بۆ ناوچەکانی دیکـەی سـەر خـاکی گـەلان بەتایبـەتی خـاکی کـورد لەباشووری کوردستان و ڕۆژئاوای کوردستان .

ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی کـە پارچـەیەك بـووە لـە ئیسلام و بـەهێزترین دەووڵـەتی ئیـسلامی بـووە لـە جیهـان ، کـە ئەمـەش سـەرەتای مێـژووی دەسـەڵاتی عوسمـانی بـووەو تـاکوو جـەنگی یەکـەمی جیهـان ، کـە کـورد

خاوەنی چەندین ئیماراتی هەمە جۆرو لایەن بووە ، چونکە دەسەڵاتی عوسمانی لە ناوچە جیاجیاکان بە تایبەتی لە کوردستان بەناوی دەسەڵاتی تورك نەبووە، بەڵکوو دەسەڵاتێکی ئیسلامی و خۆچەسپاندن بووەو ئاینی ئیسلامی کردۆتە سەری رەمەکانی لە بە هێزکردنی دەسەڵاتەکەی لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

سەرەرای ئازاردان و ئەشکەنجەدانی کوردو ئەرمەن ومەسیحی بە تایبەتی ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردە میرەکان و سەرۆك هۆزو تیرەکانی کورد . هەردەم ئاسانکاری تەواویان بۆ دەسەڵاتی عوسمانی و عەرەب و فارس کردووە ، بە هۆی کاردانەوەی ئایینی ئیسلام لە سەردەروونیان و ...بیرنەکردنەوەیان بەلێك جیا کردنەوەی کێشەی نەتەوەیی و نیشتمان و دەووڵەتی کوردی لە کوردستان ، لەگەڵ بیروو باوەری ئاین و دەسەڵاتەکانی هەڵگری بیرووباوەری ئاینی و کردنە ئامانجی خۆ بەهێزکردنیان...!.

##  ١٥١٩

١٥١٩/١٠/٢٦وەرگێرانی بەڵگەنامەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەلایەن دکتۆر- جەلیل تەمیمی- بەناوی - تۆب مایی سەرای - لە ژێر ژمارە /٤٦٥٦ ، کە لە لایەن گەلانی جەزائر ئاراستەی دەسەڵاتی عوسمانی کرا بوو ، بۆ ئەوەی جەزائر بکەووێتە ژێر پاراستنی دەسەڵاتی عوسمانی ، کە لە لایەن کەسایەتی ناوداری هەرێمی جەزائری - خەیرەدین- نووسرابوو بۆ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان سەلیمی دووەم لە شاری ئەستەمبوڵ .

##  ١٥٢٠

١٥٢٠/٩/٢٢ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان سەلیمی دووەم ، لە تەمەنی ٥١ سالیدا کۆچی دوایی کردووەو ماوەی دەسەڵاتەکەی ٩ساڵ بووە ، کە بە درندە ترین شێووە دەسەڵاتەکەی دەبرد بەرێووە . لە داگیرکردن و پەلاماردان و تاڵانکردن و وێرانکردن ، بەتایبەتی لە سەر خاکی گەلی کوردستان .

١٥٢٠/١١/٢٨ لە گەشتەکەیدا - فردینال میلیگان - گەیشتە زەریای هێمن ، کە ئەمەش بووە یەکەم دۆزێنەری کێشوورەی ئەوروپا بە چوونە ناو ئاوی ئەو دەریایەدا.




١٥٢٠/١٢/١٢ لە سەردەمی دەسەڵاتی سوڵتان سلێمان قانونی ، تـــووانی بـــەهێزەکانی ســـــووپای پورتووگـــالی لـــە هەرێمـــەکانی دەریای سوورو ئەو مەڵبەندانەی کە لێی نیشتەجێ ببوون ، ببووە ئارامگـەیان و بیپـارێزین تـاکوو کەنداو ، کە ئێستا عەرەب پێی دەڵــێن کەنــداوی عــەرەب لــە ناوچەکەدا .

بەڵام لە راستیدا کەنداوی فارسەو ، جگە لەوەش کە کاتەکانی بەر لە نیشتەجێ بوونی عەرەب لەو ناوچانە ، کورد نیشتەجێی ئەو ناوچانە بوونەو خاوەن ئیماراتی خۆیان بوونەو کاروباری ئیماراتەکەیان بەڕێوە بردووە لە ناوچەکەدا .

شایانی باسە کە شارەکانی ئێستای کووت و سووێرەو عەزیزیەو عیمارەو قەزای مەجەری سەر بە عیمارە ، تا دەگاتە نزیك شاری بەسرا لە سەرەتای سەدەی هـەژدەم ئـاوەدان کراوەتـەوەو عەرەبـە رەوەنـدەکان روویـان لـە ناوچەیەدا کردووە ، لە پێناو پەیدا کردنی لەوەڕگەو خوواردنگە بۆ مەڕو ماڵات و بەخێوو کردنیان ، نەك نیشتەجێ بوونیان.

بەڵام داب و نەریتی عەرەب تاکوو ئێستاش وایە . گەر خیووەتەکەی لە هەر جێگایەك هەڵدا ، ئەوا بە خاکی ئوومەی عەرەبی دەزانێ لە دوای چەند ساڵێکدا ....!.

## ١٥٢١

١٥٢١/٨/٢٥ لە دوای شەڕیکی خووێناوی لە نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی و هێزەکانی سووپای مەژەر لە هەرێمی بەڵکان ، لە ئەنجام هێزەکانی سووپای عوسمانی تووانی شاری بەلگراد داگیر بکات و سوڵتانی عوسمانی بە خۆی گەیشتە شاری بەلگرادو نووێژی لەناو کەنیسەیەکی سەرەکی مەسیحیەکان

لـە شـارەکە کـردو دووایـی کردیـە مزگـەووت بـۆ خوواپەرسـتی لەلایـەن ئیسلامەکان لە شارو ناوچەکەدا .

١٥٢١/١٢/١ مـۆرکردنی پـەیمانی بازرگـانی لـە نێـوان دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی و کۆمـاری بووندقیـە ، بـە پـشتگیری و ڕێنماییـەکانی ڕێکەووتننامـەی پێشوو لـە نێوانیان‌و دووپاتکردنـەوەی زیاتر لـە کۆماری بووندقیـە ، کـە دەتووانـێ هەرسـێ سـاڵ جـارێ قوونـسلیەکەی لـە ئەسـتانە بگۆرێ‌و لەرێگەی دادگا چارەسەری کێشە هەڵوواسراوەکانی نێوانیان بکەن بە نووێنەری هەر یەك لەو دوو وڵاتە ، بەپێی بەندەکانی ڕێکەوتنەکەدا .

## ١٥٢٢


١٢ — الشاه طهماسب .

١٥٢٢/١١/١٠ لە دوای مردنـی شـا ئیـسماعیلی سـەفەوی کورەکـەی — تـەهماسـب — جێگـەی گرتـەوە لـە هەڵـسووراندنی کاروبـاری دەووڵـەتی فارسـی سـەفەوی ، کـە ئەوکاتـ تەمەنی دە ساڵان بوو بە وەرگرتنـی دەسـەڵات بەسـەر قزلبـاش‌و سـەرکردە مەزهـەب شـیعەکان ، کـە دوانـزە ناوچـەی کارگێری لەخۆدەگرت .

دوای ئەوە شا تەهماسب بەرەو رۆژهەڵات هەنگاوینـاو سـەرکەووتنی بەسـەر عـەلی خـانی ئۆزبـەکی بـە دەسـت هێنـا ... بـەڵام دوای ئـەوە بـەرەو رۆژئـاوا گەرایەووەو شاری بەغدای داگیر کرد ، کە لـەو کـات — عـەلی زیلفـەقار — کـە سەرکردەی کورد بوو کاروباری بەغداو دەووروویـەری دەبـرد بـەرێووە ، کـە سـەر بـە دەسـەڵاتی عوسمـانی بـوو ، لـە هـەمان کـات هێـزەکـانی سـووپای عوسمانی توانیان هێزەکانی شا تەهماسب لە ناوچەکە دەربکەن .

١٥٢٢/١١/١ دەست پێکردنـی شـەڕی بیـست سـاڵە لـە نێـوان دەسـەڵاتی شـا تەهماسـبی فارسی و دەسەڵاتی سوڵتان سلێمان قانونی ، کە خۆی لە زنجیرە شەڕێکی

دژووار دەخوولایەوە... كە شەڕە گرنگەكان لەسەر خاكی كوردستان بوونو بەشێكی زۆری قووربانیەكان لەكوڕە هۆزوتیرە كوردەكانی ژێر دەسەلاتی هەردوو دەسەلاتی شەركەر بوو لە هەرێمەكەدا .

كە ئەو شەڕانەش لەپێناوی سەركەووتنی یەك لەو مەزهەب شیعەو سووننە ئیسلامیەدا بوون ، كە گەلی فارسی مەزهەب شیعەو دەوولەتی عوسمانی مەزهەب سووننە ، بەلام كارەساتەكەش بۆ كوردو خاكی كوردستان بوو، كە كۆتایی هاتنی شەڕەكان بە مۆركردنی رێكەووتننامەی ئاشتی ئەماسیە كۆتایی هات لە ١٥٥٥/١١/١٦ ، لە نێوان هەردوو دەسەلات و وولاتی شەركەر لەناوچەو هەرێمەكاندا .

١٥٢٣/١١/١٠ دامەزرێنەری دەوولەتی فارسی شا – ئیسماعیلی – سەفەوی لە رامیاریەتی بەرێووە بردنی كاروو باری ئاینی مەزهەب شیعە زۆر بەرچاو تەنگ بوو ، دژی مەزهەب سووننەو . لە هەمان كات لە رامیاریەتی نەتەوەییش ، كە زۆر بەرچاو تەنگو شۆڤێنی بوو لە مامەلە كردنی لەگەڵ هۆزەكانی ئازەریو قزلباشیو شاملۆو ئیستاجلوو تلەلوو قاچارو ئەفشارو زولقەدردا .

كە ئەمانەش ببوونە هێزی سەرەكی دامەزراندنی دەوولەتی فارسو لەشكر كێشەكان لە ناوچەكەدا .

شایانی باسە كە رامیاریەتی كوڕی شا ئیسماعیل لەسەر سێ بیروو بۆچوون دامەزرابوو ئەویش :-

١- نەهێشتنی دەسەلاتی سەرداره خۆجێیەكانی كوردو دانانی سەرانی قزلباش ، لە پێناو خزمەتكردنی دەسەلاتەكەیانو بنەمالەو هۆزەكانیاز لە جێگەی ئەوان ، واتە كورد لە رۆژ هەلاتی كوردستان.

٢- ناچار كردنی خەلكی ناوچە داگیر كراوەكانی كوردستان بۆ دەست هەلگرتن لە مەزهەبی سووننەو چوونە سەر مەزهەبی شیعە بەناوی مەزهەبی جەعفەری لە هەرێمەكەدا .

٣- بەكارهێنانی ئەو پەری توندو تیژی ، لە پێناو چاو ترساندنی خەلك دانیشتووانەكەو سەركووتكردنی بێ بەزەییانەی هەمە جۆره بەرهەلستی و ملنەدان .

شایانی باسە كە شا ئیسماعیل بەر لە مردنی لە لە شكر كێشیەكانید

که به ناو کوردستان دا دەسوورایەوە لە ئەرزنجان هەنگاوینا بۆ باکووری کورستان .

دوای ئەوە بەرەو هەرێمی شاری دیاربەکرو لەوێ بۆ شاری موسڵو دوایی بەرەو ناوچەی بەغداو لورستانی کورد ، کە دەستی لە هیچ جۆرە زەبروو زەنگێ نەدەپاراستو بەدەیا کاری ناهەمواری دیکەی لەگەڵ کوردو خاکی کوردستان ئەنجامدا ، لە دوای خۆشی کوڕەکەی شا تەهماسب بەهەمان کارو کردەوە رەفتاری دەکرد بەرامبەر بەو ناوچانەی دەکەووتە بەر دەستی لە ناوچەو هەرێمە جیاجیاکان .

##  ١٥٢٤

١٥٢٤/٨/٢٤ کەسایەتی ناودارو شۆرشگێری ئەڵمانی – هانزمیلر– کۆمەڵێك جووتیاری لە دەووری خۆی کۆکردەوە لە شاری – شتیگلن – بە نوێ کردنەوەی داواکانی لە – منستر– بە پێك هێنانی رایەلەیەك بەناوی – الاخوە الانجیلیە– ، بەڵێنی دا بەرزگار کردنی کرێکارە کشتووکالیەکان لە هەموو ئەڵمانیا .

کە تەواوی شارەکانی ئەڵمانیای لە خۆ دەگرتو بەرەو بەهێز بوون هەنگاویان دەنا تا ژمارەیان گەیشتە ٣٠٠٠٠ سی هەزار جووتیاری چەکدار لە باشووری ئەڵمانیاو دانی باج بۆ حکوومەتی ئەڵمانیا رەتکردەوە بۆ کەنیسە و دەرەبەگەکان دوای ئەوە بریاریاندا بە ، یان رزگاریو ئازادی لە سەر ئەڵمانیا یان مردن لە سەر خاکی ئەڵمانیا .

##  ١٥٢٥

١٥٢٥/٣/٢٧ بەرپابوونی راپەرین لە دوانزدە ناوچەی بۆدایۆی وولاتی ئەلمانیا لە یەك کاتو ساتدا ، کە کۆمەڵێك لە کرێکارانی کشتووکالیو کرێکارانی کارگەکان دەسەڵاتی کارگێریان گرتە دەست لە شارەوانیەکان بە تایبەتی لە شارەکانی – هایلیرۆن ، رۆتنبرگ، فیرتسبۆرگ– و حکوومەتی کۆمۆنەیان راگەیاند لەشاری فرانکفۆرتدا .

ئەویش بە پێك هێنانی دەسەڵاتی ئەنجوومەنی شارەوانیو بەدەرکردنی پیاوانی ئاینیو دەرەبەگ ، لە دەسەڵات بە هۆی تاکرەویو

چەووساندنەوەو دکتاتۆریەت لە دەسەڵاتیان و پاوانکردنی قووتی هەژاران ، لە سامانی زەوی و کاری کشتووکاڵی و کارگەو مەنجەمەکان .

١٥٢٥/٤/٤ لە دوای راپەرینی کرێکارانی کشتووکاڵی لەئەڵمانیاو بەردەوام بوونی بە گرتنەوەی هەموو شارەکان ، ئەویش بە پێشوازی لێکردنیان . لە لایەن زۆربەی پیاوانی ئاینی و رووناکبیرەکان لەو راپەرینەو لایەنگیری خۆیان بۆ جووتیاران و کرێکارو کرێکاری کشتووکال راگەیاند دژی دەسەڵاتی تووندڕەوی لە ئەڵمانیا.

١٥٢٥/١٠/١٨ لە کۆتایی سەدەی پانزەهەم ئەفگانستان کەووتە ژێر دەسەڵاتی تەیموورییەکان ، کە بووە دوو دەوڵەتی لێك جیاواز ، دوای ئەوە ئیماراتی لێك ترازاو ، کە لەو ساتەش حسێن بیگراتە لخووری لە سەر هەرێمی خراسان دەسەڵاتدار بوو.

لە هەمان کات محمد بایز شا زەهیرەدین توانی شاری کابووڵ داگیر بکات و خەزنە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی ، بەڵام دوایی ئەو ناوچەیەی و شارەکانی کابووڵ و خەزنە گواستراوە بۆ سەرسنووری هندستان و کەووتە ژێر دەسەڵاتی لۆرییەکان ، کە لەو کاتە لۆرییەکان لەناو شانشینەکەیان تووشی کێشەو ململانێ و دووبەرەکی هاتبوون.

١٥٢٥/١٢/٦ چاوپێکەووتن لە نێوان سوڵتانی عوسمانی سوڵتان سلێمان قانونی و باڵوێزی فەرەنسا ئەنجامدرا ، کە باڵوێزی فەرەنسا نامەی شانشینی فەرەنسای بە سوڵتانی عوسمانی داو، دوای ئەوە سوڵتانی عوسمانیش پەیمانی پێدا ، کە بەر بەرەکانی وولاتی مەجەر بکات ، لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندی هەردوو دەسەڵاتی عوسمانی و فەرەنسا لەسەر هەرێمەکەدا .

## ١٥٢٦

١٥٢٦/٤/٢٥ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان سلێمان قانونی لە شاری قووستەنتینیەی پایتەختی دەسەڵاتی عوسمانی ، بەرەو وولاتی مەژەر بەرێکەوت ، لە پێناو بەربەرەکانی کردنی وولاتی مەجەری بە ١٥٠ سەدو پەنجا هەزار سەربازو ٣٠٠ تۆپ و ٨٠٠ کە شتی و بریاری جەنگی راگەیاند .


السلطان سليمان القانوني ابن سليم الأول
926 - 973 هـ / 1520 - 1566 م

کە لەو کاتەدا خۆی سەرکردایەتی هێزەکانی سووپای دەرکرد و لەگەڵ سێ لە وەزیرەکانی لە ڕێگەی - مارین سربی - نزیك قەڵای بەلگرادو تووشی شەڕ هاتن ، لە ئەنجام شەڕیکی خووێناوی بەرپابوو بە گەیشتنە دۆڵی - مۆهاکس - کە شاری مۆهاکس دەکەوێتە باشووری هەرێمی ئەو کاتی وولاتی مەژەر نزیك سنووری یوگسلافیا.

١٥٢٦/٨/٢٩ هێزەکانی سووپای عوسمانی بە سەرکرایەتی سوڵتان سلێمان قانونی ، پەلاماری وولاتی مەژەرو گەلانی مەژەری دا ، لە ناوچەی مۆهاکس و دوای ئەوە لە ٩/١٠ ی هەمان ساڵ شاری بۆدابستیان داگیر کرد ، کە لەو کاتەش - کلمنت - ترسی گەیشتێ و داوای کرد ، کە ئەوروپا بەهیچ شێووەیەك روو وەرنەگێرێ بۆ مەزهەبی پرۆتستانتی مەسیحی و بەتەنیا بەڵکوو شان بەشانی ئیسلام بن لە هەرێم و ناوچەکەدا .

١٥٢٦/٩/١٠ لە دوای داگیر کردنی دۆڵی مۆهاکس لەلایەن هێزەکانی سووپای عوسمانی ، تووانرا شاری بوود داگیر بکەن ، کە بووە هۆی داگیرکردنی تەواوی وولاتی مەجەرو بە کووشتنی شانشین - لویس ... و لە دوای ئەو سەرکەوتنە . دەستیان بەسەر کەنیسەکان داگیرا ، بەتایبەتی کەنیسەی بەناوباگی مەجەر - متیاس - کە پێی دەگوترا ، کەنیسەی - تنوریج - ، دوای ئەوە کەنیسەکە کرا بەمزگەووت و بەزەغرەفەی هونەری عەرەبی رازاندرایەوە لە شارەکەدا .

١٩٢٦/٩/١١ دوای داگیر کردنی وولاتی مەژەرو بەردەوام بوونی شەڕو پێکدادان لە نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی بەسەرکردایەتی سوڵتان سلێمان قانونی و هێزەکانی سووپای مەژەر بەسەرکردایەتی جێگری شانشینی کوژراو شانشین - فیلادیسلانی دووەمی جاجلیۆ - بەرپا بوو لە هەرێمەکەدا .

لە ئەنجام بووە هۆی سەرکەووتنی هێزەکانی سووپای عوسمانی. لەلایەکی

دیکـەش هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی گـەمارۆی دەووروبـەری شـاری ڤیەنای پایتەختی ئیمپراتۆریەتی رۆمای پیرۆزیاندا .

## ١٥٣١

١٥٣١/١٠/١١ هەڵگیرسـانی شـەڕی لـە نێـوان هێزەکـانی سـووپای مەزهـەب کاسـۆلیکی مەسیحی و هێزەکانی سووپای مەزهەب پرۆتستانتی مەسیحی، کە سووپای کاسـۆلیك ، ژمارەیـان ٨٠٠٠ هەشـت هـەزار سـەرباز دەبـوون و سـووپای پرۆتستانەتەکانیش ،ژمارەیان ١٥٠٠ سەرباز بوون ،
ئـەویش بەسـەرکەووتنی کاسۆلیکەکان شەڕەکە کۆتـایی هـات ، لـەو شـەڕە سەرکردەی پرۆرتستانتەکان – زونجلی– و ٥٠٠ لە چەکدارەکان کووژران ، کە دانیشتووی شاری – زیورخ – و دەووروبەری بوون .

## ١٥٣٣

١٥٣٣/٥/١٠ لە دایك بوونی سوڵتانی عوسمانی سوڵتان سەلیم خانی دووەم ، کە دایکی رووسـی بـووەو نـاوی – رۆسـلانی– بـووە ، دوای ئـەوە لـە ١٥٦٦/١٢/٢٤ دەسـەڵاتی سوڵتانی عوسمانی گرتە دەست لە سەر ئیمپراتۆریەتەکەدا .
١٥٣٣/٧/٢١ بەردەوام بوون لە هەڵگیرسانی شەڕی بیست ساڵە لە نێوان ئیمپراتۆریەتی فارسـی سـەفەوی و ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی ، کـە کارەسـاتێکی گـەوورەی کـردە سـەر بـاری کـوردو کوردسـتان ، کـە ئولامـە سوڵتانی تکـەلوو دادوەری ئازربایجـان ، کـە یـەکێ بـوو لـە سـەرکردەکانی قزلباشـی لـە دەسـەڵاتی فارس...بە هۆی بوونی کێشەو ململانێی دەسەڵات لە شا تەهماسب یاخی بووو پەنای بردە بەر سوڵتان سلێمان قانونی.
کە ئەمەش بووە هۆی لێك ترازانی پەیووەندی لە نێوان سەرکردە کوردەکان ، لەگەڵ دەسەڵاتی عوسمانی ، کە سەرکردە کوردەکـان هـەوڵی رزگـار بوونی ئیمارات ونیشتمانەکەیان دەددا لە نێوان دوو هەڵوێستی جیاواز لە نێوان دەسـەڵاتی فارسـی سـەفەوی و ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی لەسـەر خـاکی کوردستان .
١٥٣٣/٩/٧ لە دایك بوونی شانشین ئەلیزابیتی یەکەم کە بەناوبانگترین شانشین بوو لـە ئینگلتــەرا ... جێگــەی باســکردنە کــە ئــەم بنەماڵەیــە بــەردەوامن لــە بەرێووەبردنی دەسـەڵاتی شانشینی لـە بـەریتانیا و ناوچـەو هەرێمـە ژێـر دەستەکانیاندا .

## ١٥٣٤

١٥٣٤/٧/١٣ سولتانی عوسمانی سولتان سلێمان قانونی کاروباری کارگێریەتی ئیمارەتی سۆرانی خستە سەر سنجەقی هەولێر لە باشووری کوردستان ، لە هەمان کات حوسێن بەگ . کە ئەمیرێکی کوردی ئێزیدی بوو کردی بە میری سۆران ، . دوای ئەو بریارە سەیفەدین کە یەکێك بوو لە میرەکانی سۆران ، هۆزەکانی ناوچەکەی لە خۆ کۆکردەووەو سەرەتا قەلای هەولێری داسنیەکانی وەرگرتەووەو دوای ئەوە دەستی بەسەر هەموو مەلبەندەکەدا گرتەوە لە شارەکەدا .

لە هەمان کات حوسێن بەگ هەولێ زۆری دا کە میرسەیفەدین لە ناویان بمێنێتەوە ، بەلام نەیتوانیو دوای ئەوە لە سەر ئەو هەلوێستە ، لە لایەن سولتانی عوسمانی بانگ کرا بۆ ئەستەمبوڵ ... لە دوای گەیشتنی بۆ ئەستەمبۆل بە بریاری سولتان حوسێن بەگی لە سێدارە درا .

هەر لەو کاتەش میر سەیفەدین بە سەربەخۆیی مەلبەندی سۆرانی بەرێووە دەبردو چەندین جار هێزەکانی سووپای عوسمانی هێرشیان دەکردە سەر ، بەلام لەگەڵ میر سەیفەدین هیچیان پێنەدەکرا لە ناوچەکەدا .

١٥٣٤/٧/١٣ لە پێناو جێگیرکردنی ئەو سەرکەووتنانەی کە سولتان سلێمان خۆیی و هێزەکانی بەدەستی هێنا بوو ، لە گەڵ هێزێکی گەوورە بەناو خاکی کوردستان رووی کردە ناوچەی تەورێزو دوای ئەوە هەر بەناو خاکی کوردستان بەرەو گەرمیان و بەغدا هەلکشا، سولتان سلێمان لەو سوورانەوەیدا هەموو ئەو ناوچانەی کە لە بەر دەستی قزلباشیەکان بوو دەری هێناو خستیە ژێر دەسەلاتی خۆی ، دوای تەواو بوونی خواستەکانیدا ، سولتان بەناو خاکی کوردستان بەرەو ئەستەمبوڵ گەرایەوە .

دوای ئەوە شا تەهماسب شاری تەورێزی لە بەر دەستی عوسمانیەکان دەرهێناووەو لە بەرەو چوونی بۆ شاری وان لە باکووری کوردستان ، کە خۆی سەرکردایەتیسووپایەکەی لە هێرشەکانی دەکرد لە ناوچەکەدا .

١٥٣٤/٧/١٤ هێزەكانی سووپای عوسمانی توانیان بگەنە شاری بەغداو دەوروروبەری ، كە لەو كاتەش والی بەسرا – راشد كوڕی مفامس– بوو . پشتگیری خۆی بۆ سوڵتانی عوسمانی راگەیاند ، كە ناوچەكانی ژێر دەستی كەووتە ژێر پارێزراوی دەسەڵاتی عوسمانی.

دوای ئەو كارە بەپێی هەلوویستە جیاجیاكان كە ئەنجامی بووە هۆی دورست بوونی كێشە لە نێوان والی بەسرە راشدو بەرپرسانی عوسمانی ، بەهۆی بەردەام بوونی هێرشەكانی هێزی سووپای عوسمانی بەرەو شاری بەسرەو بۆ ئەوەی بیخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان ، لەئاكامدا راشد مفامس بەرەو شاری نەجدی وولاتی سعوودیە هەڵات و بەم جۆرە ناوەراست و باشووری ئێستای ئێراق كەووتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەكان .

١٥٣٤/٩/١٣ هێزەكانی سووپای عوسمانی بەسەركردایەتی – فەخرەدین– پەلاماری مەسیحیەكانیدا لە باكووری ئەفریكیا ، كە لەو كاتەش شانشینی پورتووگال – جاكی سێیەم– كە بەو هەولەی زانی داوای كرد كە هەندێ ناوچە چۆڵ بكەن ، بۆ ئەوەی بنكە بەرگریەكان بەهێز بكرێت .

ئەویش بە هۆی بوونی هێزەكانی عوسمانی لە جەزائرو یارمەتی دانیان بە هۆی ئاینی ئیسلام ... كە كاردانەوەی هەبوو لەسەر هەڵوویستی پورتووگاڵ لە مەغریب ، كەچی توونس لە لایەن هێزەكانی سووپای عوسمانی داگیر كرابوو ، كە بووە هۆی كارلێكردن لە پاپاو مەسیحیەكان و ئیمپراتۆری پێنجەم بە هۆی هێرش كردنە سەر مەسیحیەكان .

## ١٥٣٥

١٥٣٥/٣/٢٢ سەرەرای گەشە كردن و زۆربوونی بیری – لا معەمەدیەكان – لە هەردوو وولاتی ئەڵمانیا و هۆڵەندا ، لە هەولێكی زۆر ئەو بیرەیان رەتكردەوە ، كە مەزهەبە برایەتیەكان لە منستر بڵاوویان دەكردەوە لە پێناو بەهێز كردنی دورشمی باش و سەركەووتنی شۆرشەكەیان هەڵگرتبوو ، بە بڵاوبوونەوەیان لەشارەكانی وەك:– كۆڵۆنیاو تریرۆ ئەمستردام و مدین لە وولاتەكەدا .

لە هەمان كات بەردەوام بوون لەدوعا كردن ، واتە پارانەوە لە خوا لەپێناو سەركەووتنی لامعەمەدیەكان . كە كاردانەوەی ناهەمووارى كردبووە سەر

مەزهەبەکانی کاسۆلیك و پرۆتستانت و بووە هۆی ئەوەی کە لەشاری ئەمستەردام زیاتر لە - ٥٠ - کەشتی جەنگی بەرەو ئەو شارانەی ، کە لە لایەن هێزەکانی لامعەمەدی گەمارۆ درابوون ، لەو کاتەش دەسەڵاتی هۆڵەندا لە کارێکیدا ئەوەی هەڵگری ئەو بیرە بوو ، پەرت و بڵاوەی پێکردبوون.

بەلام لە ٣/٢٨ی هەمان ساڵ هێزەکانی لامعەمەدی شاری- دیروست فریزلاند- یان داگیر کرد ، لە ئەنجامی شەڕیکی توونددا کە زیاتر لە ٨٠٠ کەس لە لا معەمەدیەکان لە ناو بران .

شایانی باسە کە لقێکی لا معەمەدیەکان لە ئەڵمانیا بەرەو شاری - بنسلفانیا - بەرێکەوتن و لە شاری - جرمانتۆن- و لەدەوروبەری نیشتەجێ بوون ، کە ئەو کات ژمارەیان - ٢٠٠٠٠٠- دووسەد هەزار کەس دەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا معەمەدیەکان لە رووسیا رەویان کرد بەرەو ئەو ناوچانەی کە هاوبیروو هاو هەڵوێست و هاورەفتاریان بوون .

هەروا معەمەدیەکان دەگەرێنەوە سەر بنچەی مۆراخی ، کە لە باشووری داکۆناوالبرتا نیشتەجێ بوون ... لە رۆژهەڵاتی شاری بنسلفانیا تاکوو ئێستاش نیشتەجێن بەناوی - ئەلمینوونیوون ولامینیوون - هەروا هۆی ناوزەند بونیان بەو ناوە لە سەریان دەگەراوە بۆ سەر ناوی - جاکووب ئەمین- کە ناوی سەرکردەیەك بوو لەو کاتدا .

شایانی باسە کە مەزهەبێکی جیابوونەوەن لە هەردوو مەزهەبی کاسۆلیك و پرۆتستانت لە ئاینی مەسیحی ، کە ئیمانیان بە بەکارهێنانی ئاژەڵ و هێلی ئاسنین و ئوتومبێل نیەو تەماشای وێنەی جوولێنەرو خوێندنەوەی رۆژنامەو دەیا کاری دیکە نەبووە ، لە هەمان کات تەرەکتۆرو دەراسەش بەکار ناهێنن، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو بووارەکانی کشتووکاڵی سەرکەووتوون و بەباشترین شێووەو شێوازو ، کە بەرهەمەکانیان بێ وێنەن لە نەبوونی نەخۆشی لە هەموو بووارەکانیدا .

## ١٥٣٦

١٥٣٦/٧/١٢ کۆچی دوایی مەزنترین پیاو و لایەنگیری مرۆڤایەتی سەردەمی راست بوونەوە - ئاراسمۆس ئەرزمی - لە شاری بازلی سویسری . شایانی باسە ئەم زاناو رووناکبیرە ناودارە لەساڵی ١٤٦٦ لەباوکێکی غەیرە شەرعی

لەدایك بووە – واتە بیژی بووە – لەشاری رۆستردام لەهۆلەندا . کە ئەمەش
هۆکـاری کاردانـەوە بـووە لەسـەر ژیـان و هەڵوویـست ورەفتارەکـانی ئـەم
مرۆڤـەدا ...چـووە دێـری رەهبـان ئمـواس لەگونـدی سـتایژن لـەنزیك شـاری
خودا لەناوەراستی هۆڵەندا .
بەڵام نەیتوانی لەگەڵ ژیانی دێرایەتی بگوونجیٚ ... هـەر بـەو هۆیـەوە رووی
کردە فەرەنسا و ئینگلتەرا و ئیتالیاو سویسرا ... لە ساڵی ١٥١٧ پاپا لیۆی
دەیـەم لـە بـاری رەهبەنـە ئـازادی کـرد ... دوای چـەندین کێـشەو گرفـت
ئـەرزمس لەسـەر داوای هنـری هەشـتەم لـە سـاڵی ١٥٠٩ چـووە کۆشـکی
شـایانەو هـەر لـەو کاتـە کتابێکی بەناونیشانی – مـدح الجنـون – ی دانـاو
لەهـەمان کـات هەڵـسا بەگووتنـەوەی وانـەی زمـانی یۆنـانی و شـێکردنەوەی
کتـابی پـیرۆزی ئینجیـل .... ئـەم مرۆچـە لەژیانیـدا بـەردەوام بـوو
لەنووسینەکانی لەچەندین بواردا تاکوو کۆچی دوایی دەکات .

## ١٩٣٧ 

١٥٣٧/٤/٢٥ مۆرکردنی رێکەووتنامەی نێوان پورتووگاڵو سەعدین لە گەڵ رێکەووتنی
بازرگـانی نێوانیـان ، کـە ئامـانجی پورتووگـاڵ نزیـك بوونـەوە بـوو لەگـەڵ
نووێنەری سەعدین ، بە چارەسەرکردنی کێشەکانو بە دوورکەووتنـەوە لـە
دەسەڵاتی عوسمانی . بە هۆی دروست ترسیان لە هەڵوویستی داهاتووی
دەسـەڵاتی عوسمـانی بـە پـەلاماردانی دوورگـەی – ئیبیریـە لـە وولاتـی
مەغریبو ئەسپانیاو مەغرب – بە بەجێبەجێکردنی ئامانجەکانیان .
ئەویش بە کاردانەوەی لە سەر باری ناووخۆو ژێر دەستەکانی پورتووگاڵ
. هـەر لەبـەر ئـەوەش بـوو کـە دەسـەڵاتی پورتووگـاڵ بـروای بـە دەسـەڵاتی
عوسمـانیو لایـەنگیرانی نـەبوو ، بەتایبـەتی لـە رووی ئاینیـەوە . کـە
جەمسەری هێرشو شەرەکانو شالاوەکانی هێزەکانی سووپای عوسمانی
لە سەر بەربەرەکانی کردنی ئاینی مەسیحی بوو بە هەردوو مەزهەبەکان.

## ١٥٤١ 

١٥٤١/١٠/١٥شارلْ پێنەجەم پێشبینی ئەوەی دەکرد بە هەلسەنگاندنی بیروو بۆچوونی
حەسـەن ئاغـاو ئامانجـەکانی ، کـە داواکاریـەکانی لەگـەڵ پیـاوانی ئـایینیو
کۆبوونـەوە کردنیـانو کـە داوای جیهـادی دەکـرد لـە پێنـاو بـە هێزکردنـی

جێپێگەی ئیسلام لە جەزائرو بەرەو داگیر کردنی خاکی گەلانی دیکەدا .
لەو کاتەش شارڵ داوای کرد کە بەرگری لەگەڵو نیشتمان بکەن بە خەباتی هاوپـەیمانو دۆسـتانە ، لـە هـەموو بـوارە جیاجیاکـان لـە پەیووەنـدی رامیاریوئابووری و نەتەوەییو نیشتمانیو ئاینیو کۆمەڵایـەتیو بە دەیا کاری دیکە .

## ١٥٤٢



١٥٤٢/٧/١٥ کۆچی دوایی ئافرەتە شۆخ و شەنگی جیهان بەجەستە جوانی و بە وێنـــــــــــــە سەرسـوورهێنەرەکە – مۆنـالیزا –... شایانی باسە لەکۆتایی ساڵی ٢٠٠٦ بــــــــەپێی نامەیــــــەکی دۆزراوە لەئەرشـیفی کلێسەکی شـــاری فلۆرەنـــسا ئاگـادار بـەم نامەیـە لـەبارەی کـۆچـی دوایــی مۆنـالیزا ، کـە ئامـاژە بـەوە دەکـات کـە خێزانـی فرانسیسکۆ دیك جیکۆنـدا بووە . هەروا لە گۆرستانی کلێسەیەکی خانمە راهبیەکان نێژراوە لەناوەراستی شاری فلۆرەنسا لە ئیتالیا ... کە مۆنـالیزا لەدایك بووی ساڵی ١٤٧٩ بووە ... هەروا وێنەی ئەو ئافرەتە لە لایـەن نیگـار کێشی نـاوداری جیهان لیۆنـاردۆ دافینـستی کێشراوەو ئێستا وێنەکەی لە مۆزەخانەی لۆڤەرە لە شاری پاریس پایتەختی فەرەنسا .

## ١٥٤٣

١٥٤٣/٥/٢٤ کۆچی دووایی زانای گەردووناسی پۆڵەندی – نیکۆلاس کوێر نیکۆس –

که دانەری کتێبی – سوورانەوەی دەستەی ئاسمان – بووە.. لەوکاتـەی ک
زانی ئەستێرەکان لە دەووری رۆژ دەسووڕێنەوەو زەویش بە دەوری خۆید
دەسوورێتــەوە ، کـە هـەر هـەمووی یـەك بازنـە دروست دەکـەن لـە هـەمو
رۆژێکدا.


شەرەفخانی بەدلیسی

١٥٤٣/٢/٢٥ لـەدایك بـوونی – شــەرەفەدین شەمـسەدین – کـە لـە سـاڵی ١٥٩٧ ، بەشـــی یەکـــەمی شـەرەفنامەی تـەوواو کـردو لـە ئاداری ١٥٩٩ کۆتـایی هێنـا بـە تــەوواو کردنینووســینەوەی کتێبــی شــەرەفنامە ، کــە بــە سەرچـــاوەیەکی ســـەرەکیو بنـــەڕەتی مێـــژووی کـــورد دادەنرێــت لــە هــەموو بــوارە جیاجیاکاندا.

شایانی باسە کە شەرەفخانی بەدلیسی لە شارۆچکەی – گەرهوری – لـ
ناوچەی قوومی ئێستای ئێران لە دایك بووە ، لە تەمەنی نۆ ساڵان ، ماوەی
سێ ساڵ لـە قوتابخانـەی شا تەهماسبی کوڕی شا ئیسماعیلی سـەفەوی
خووێندویەتی . کە ئەم قوتابخانەیە تایبەت بووە بە کورانی میرو گەوور
پیپیاوانی ئەو سەردەمەدا لە ژێر دەسەڵاتی فارس لە ئێراندا .

##  ١٥٤٤

١٥٤٤/٩/١٨ بەرپرسوسەرکردەی هێزەکانی سووپای عوسمانی – خـەیرەدەین برورسـ
– لە گەڵ هێزەکانی سووپا لە شاری تۆلۆن بوون ، کە لـەو کاتـەدا شارڵکاز
پـەلاماری بـاکووری رۆژهـەڵاتی فەرەنسایدا ، بـەڵام دوای ئـەوە ناچار بـوو
بەرەو ئەڵمانیا بروات ، لـەو کاتـەش جوولانـەوەی یـاخی بوونی پرۆتستانت
دژی کاسۆلیك دەستی پێکرد لە وولاتەکەدا .
کە بەشێووەیەکی گشتی دژی شارڵکان بوو بە تایبـەتی... لە ئـەنجام بوو

هۆی مۆرکردنی پەیمان لەگەڵ شانشنی فەرەنسا ئەویش بەچۆڵ کردنی شاری تۆلۆن لە لایەن خەیرەدینی سەرکردەی هێزەکانی سووپای عوسمانی ئیسلام و گەرانەوەی بۆ ئەستەمبوڵ .

شایانی باسە کە لەو باروو دۆخەی ئەو کات ... لەلایەك سەرهەڵدانی شەری نێوان دوو مەزهەبی کاسۆلیکی و پرۆتستانتی مەسیحی، لەلایەکی دیکەش شەری نێوان مەسیحی و ئیسلام و چەندین کێشەی دیکە وەك شەری نێوان دوو مەزهەبی شیعەو سووننەی ئیسلام ، ئەمەو جگە لە داگیرکردنی خاکی گەلان بە تایبەتی خاکی کوردستان .

## ١٥٤٦

١٥٤٦/٧/٤ لەدایك بوونی سوڵتانی عوسمانی سوڵتان مورادخانی سێیەم لە شاری ئەستەمبوڵی پایتەختی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی . شایانی باسە کە لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تاکوو هەرەس پێ هێنانی لە جەنگی یەکەمی جیهان . ئەو دەسەڵاتە لەناو یەك بنەماڵە دەخوولایەوەو کەسی دیکە بۆی نەبوو دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بگرتە دەست ، جگە لەوان دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی بگرتە دەست لە سەر کاروو باری دەسەڵاتی عوسمانیدا .

## ١٥٤٧

١٥٤٧/٢/١٧ زاناو رۆژهەڵاتناس - ژاك گاسووت - لە گەشتی دووەمی بۆ ناوچە جیاجیاکانی کوردستان ، بە شێووەیەکی بەرچاو باسی شاری دیاربەکرو بەتلیس و ئەدەنەو مەلاتیەو چەندین شووێنی دیکەی لە باکووری کوردستان کردووە .

دوایی ئەوە ڤینیزی هاورێی جێ هێشتووە و بەرەو ناوچەکانی رۆژهەڵات و باشووری کوردستان هەنگاویناوە ، لە پێناو کۆکردنەوەی زانیاری بە هاوکاری و یارمەتی دانیشتووانی گووند شارۆچکە و شارەکان ، لە سەر مێژوو زمان و داب و نەریت و کەلتوورو شووێنەوارو شارستانیەتی کورد لەسەر خاکی کوردستان .

کە نووسینەکانی بەپێی زانیاریەکانی ئەو کات کاردانەوەی گرنگی هەبوو بۆ داهاتووی ئێستای کورد ، لە هەموو بوارەکان بە تایبەتی لە بواری نەتەوەیی و نیشتمانیدا .

 ١٥٤٨

١٥٤٨/١٢/٢٨ ئەلقسی ئینگلیزی جۆن ئەشیتۆن لە ووتەکانیدا دەڵێ :-
کە روحی قود خوانیە بەڵکوو هێزێکی نێردراوی خوایە . کە عیسای مەسیح کە خوا بەحەزرەتی مەریەمی بەخشی پێغەمبەر بووەو ناکرێ بڵێن خوایە یاخوود کوری خوایە . هەر بەو هۆیەوە لە مانگی/ ١٥٤٨/٤ لێژنەیەك پێکهێنرا بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر کردەی جووڵانەوەی برنارد ئەشیتۆ ، کە زۆر کەس لە بازرگان و خاوەن پیشەکان ئامادەبوون بەرامبەر ئەو دەستەیە لەمانگی ١٥٤٨/٥ لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەش کە دەڵێن:-
عیسا پێغەمبەرە ، نەك خوایە هەر وەك جووڵانەوەی . تپلیخەکان . کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەو دادگایی کردنیان یان بەندی هەتا هەتایە بووە یاخوود بەسووتاندنیان .

 ١٥٥٠

١٥٥٠/١/٢٠ بنەماڵەی زابۆلی ئیزابێلا دەستی لە شاری ترانسلفانیا کشاندەوە بۆ مزدینلەندی ئەمیری نەمسا ، کە بەپێچەوانەی مەژەرکان بوو بە وەستاندنی شەری کاتی لە نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی و نەمسا ، خەلیفەی عوسمانی هێزێکی سەربازی رەوانەی ترانسلفانیا کردو لە دوای شەرێکی دژووار تووانی شارەکە داگیر بکات .
شایانی باسە کە ئەو شەڕانەی کە لە نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی و هێزەکانی چ سووپای مەژەرو چ سووپای نەمساو چ سووپای بەریتانیا و وولاتانی دیکەدا .
لە بنەڕەتا شەری ئایینی بووە نەك هەر شەڕ لە سەر خاك ، هەروەك شەڕی نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی و هێزەکانی سووپای فارسی سەفەوی لە سەر دوو مەزهەبی دژ بەیەکتری شیعەو سوونەی ئیسلام بووە ،

سـەرەرای ئـەوەش بـە داگـیر کردنـی خـاك و رفانـدنی سـامان و بـەرووبوومی گەلانی ئەو ناوچانەی کە ببوونە گۆرەپانی نێوان ئەو لایەنە شەرکەرانەی کە لەسەرەوە باسمان لێووە کردن .

### ١٥٥١

١٥٥١/١/٩ هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی لـە چـەندین لایـەن هێرشـیان کـردە سـەر هێزەکانی سووپای نەمسا ، کـە لـە ئـەنجام هێزەکانی سووپای عوسمـانی توانی بەسەر هێزەکانی سووپای نەمسا سەرکەووێت لە ئەوروپادا .

١٥٥١/١٢/٢٩ لە دوای کۆچی دووایی شانشینی فەرنسا شانشین – فرانسوای یەکەم – و جێگرتنــەوەی لەلایــەن کورەکـەی – هنـری دووەم– ، دووبـارە پـەیمانی لەگـەڵ دەسـەڵاتی عوسمـانی نـوێ کـردەووەو هێزەکـانی سـووپای هـەردوو دەسەڵاتی عوسمانی و فەرەنسا بە هاوبەشی بۆردوومانی هـەردوو ناوچـەی سقلیەو باشووری ئیتالیایان کرد .

دوای ئەوە بەرەو دوورگەی کۆرسیکا هەنگاویاننا ، بەڵام بە هۆی جیاوازی هەڵوویـست لـە نێـوان هـەردوو سـەرکردەی هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی و فەرەنـسا دوورگەکـەیان جـێ هێـشت و هـەر یـەك بـۆ وولاتەکـەیان گەرانـەوەو نەیان توانی هاوپەیمانیەتەکە بگەیەننە ئنجام .

### ١٥٥٢

١٥٥٢/١/١ کەرت بوونی برووای مەسیحی لەناو کەنیسەکان بەناوی – سولاقا– کە ئاشووریەکان جیابوونەوە لە کلدانیەکان .

### ١٥٥٣

١٥٥٣/٤/٩ دامەزراندنی – سیم یوخنا سۆلاقا – بە بەتریارکی شاری بابل لەلایەن پاپای رۆمـا – یۆلیۆسـی سـێیەم – بـەیکگرتنی کەنیـسەی نـوێی بابـل ، لـە گـەڵ کەنیـسەی کاسـۆلیکی رۆمـانی و لەگـەڵ پاراسـتنی داب و نـەریتی نـاووخۆیی هەرێمی بابل ، کە لەلایەن پاپا ئەو کارانە پەسەند دەکران .

## ١٥٥٤

١٥٥٤/١/٨ هێزەکــانی ســووپای ئیمپراتۆریــەتی عوسمــانی بــەرەو شــاری فــاس بەرێکــەووتن و ، لــە ئــەنجامی ئــەو هێرشــانە شــارەکە داگیرکــرا ، گەرچــی لەلایــەکی دیکــە شــەڕی نێــوان هێزەکــانی سووپای عوسمــانی و ســەعدیز بەردەوام بوو، لە ئەنجام شارەکانی فاس کە تازە کەووتبووە ژێــر دەسـەڵاتی هێزەکانی سووپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی .

## ١٥٥٥

١٥٥٥/٥/٢١ مۆرکردنی پەیمانی- ئاماسیا - لە نێوان هـەردوو ئیمپراتۆریـەتی فارسـی و ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی ، کـە لـە هەوڵـەکانی هـەردوو ئیمپراتۆریەتەکـەدا سەرەتای دەست پێکردن بوو بە خاکی دابەشکردنی کوردستان لە نێوان هەردوو دەووڵەتی عوسمانی و دەووڵەتی فارسیدا .

شایەنی باسە سەرکەووتنی عوسمانیەکان لە شەڕی چاڵدێران بەسـەرەتای مێژووی هاوچەرخی تیرە کوردەکان دادەنرێت . دابەش بوونی جووگرافیـان و دابەش بوونی هۆزو تیرەکان و دابرانی مەڵبەندی تیرەکان لە سەر خاکی کوردستان .

١٥٥٥/١١/١٦ ئــەمیرە خــانزادی ســـۆران ، کـــچی حەســـەن بـــەگ و خێزانی ئەمیر سلێمان دەســـــەڵاتداری ئیمـارەتی سـۆران لـە باشـووری کوردسـتان چـاوی بــە جیهــان هەڵهێناوە ، لە بنەماڵەیەکی ناوداری کورد بووە .



جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ئەمیرە خانزادی سۆران لە دوای کۆچی دوایـی هاوسـەرەکەی دەسـەڵاتداریەتی ئیمـارەتی سۆرانی گرتۆتـە دەست . ئـەویش

لەوکاتە هات کە کێشەی لەگەڵ دادوەری سوڵتانی عوسمانی لەشاری بەغدا پەیداکردبوو . لە بارەی کارگێڕی و هەڵسووراندنی کاروباری ئیمارەتەکەیدا و بەم هۆیە سەردانی شاری بەغدای کردو لەوێ دەستگیر کراو خرایە بەندیخانەو دەرمانخواردکرا .

دوای ئەو رووداوە ئەمیرە خانزاد حکوومرانی ئیمارەتی سۆرانی گرتە دەست و دژی عوسمانیەکان وەستا ، لە پێناو پاراستنی یەکگرتوویی ئیمارەتەکەو دەستی کرد بە بووژاندنەوەی ئیمارەتەکە لەهەموو بوارەکان و پایتەختەکەی گوواستنەوە نزیك شارۆچکەی هەریرو قەلای – کەلەسوو – ی لەسەر چیای هەریر دروست کرد ، لەپێناو پارارستنی دەسەلاتەکەی لەبەرامبەر هێرشەکانی بابانیەکان .

هەر لەو کاتەش دەستی کرد بەدروستکردنی قوتابخانەو مزگەووت و قەلاو باڵەخانە ، کە تاکوو ئێستاش ئەو جیگایانەی کە ئەو دروستی کردوون هەر بەناوی ئەو ماونەتەوە لە باشووری کوردستان .

لەکاتەکانی بەرگری وەك پیاو جل و بەرگی پیاوانی لەبەر کردووەو زۆر ئازاو زیرەك ولێهاتوو بووە ، لە هەمان کاتیش ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ و جوان بووە ... ئەم خاتوونە کوردە بەردەوام بووە لەپێناو خزمەت کردنی چینی هەژارو ئیمارەتەکەی و پەیوەندیەیکی سەردەمیانەی هەبووە لەگەڵ دارو دەستەکەی تاکوو لە ١٦١٦/١/٢٠ کۆچی دوایی دەکات ... دوای ئەویش ئیمارەتەکە بەرەو لاوازبوون هەنگاوی دەنا لە هەموو بوارە جیاجیاکان .

سەرچاوە :– استذکارات من تاریخ الکرد الحدیثة – عومەر عەلی شەریف /٢٠٠٥.

## ١٥٥٨ 

١٥٥٨/١١/١٧ نووێنەرێك لە نووێنەرانی کۆشکی شانشین لە – هاتفیلد – بە درێژایی ٣٦ میل بە پەلە لە باکووری شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا بەرەو کۆشکی شانشین رایدەکرد ، کە گەیشتە کۆشکی شانشین ماری لە شاری هاتفیلد . هاواری کردو رایگەیاند و گووتی :– ئەلیزابیت تیوّدۆر بوو بە شانشین لە سەر کوورسی شانشینی لە ئینگلترا ، کە خووشکی لە دایك بووی شانشین ماری بوو نەك لە باوکی .

شایانی باسه که بەره بەیانی ئەم رۆژه ئەلیزابیت خەوونی به خۆوه دیت ، به بوونی به شانشینی بەریتانیاو بەگەیشتنی ئەو هەواڵە به شانشین ماری ... ئەویش بەوەفا داریەوه کوورسیەکەی بۆ جێ هێشت ، له دوای گەیشتنی ئەو هەواڵە ... دوای ئەو ئەندامانی پەرلەمان هەموویا پیرۆزباییان له ئەلیزابیت کرد به ووشەی – خوا شانشین ئەلیزابیت بپارێزێت – له رۆژی ۱۱/۱۹– ی هەمان ساڵ لۆردات و ئەندامانی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا و ئافرەتان و جەماوەرێکی زۆر لەهەموو ئینگلتەرا له دەوروبەری کۆشکی شانشین له هاتفیلد کۆبوونەوه ، بۆ سووێند خواردنی پشتگیری شانشین ئەلیزابیت له بەریتانیا .

لەو کاته شانشین ئەلیزابیت ووتەیەکی شانشینانەی خووێندەوه به لێهاتوویی ، که لەو رۆژەوه ئەو بنەماڵەیه دەسەڵاتداریەتی بەریتانیا له هەموو بواره جیاجیاکان دەکەن تاکو ئەمرۆ له سەر تەواوی بەریتانیادا .

 ۱۵۵۹

١٥٥٩/١/٢٣ بە هۆی باڵا دەستی مەزهەبی پرۆتستانتی مەسیحی لە بەریتانیاو بەر لە هاتنی شانشین ئەلیزابیت ، لە چەندین لایەن هەستی ئاینی ئەو مەزهەبە زامدار دەكرا ، بەڵام دوای ئەوەی كە ئەلیزابیت بووە شانشین لەسەر بەریتانیاو بە دامەزراندنی یەكەم پەرلەمان لەسەر دەستی ئەلیزابیت و زۆربەی زۆری كورسیەكانی ئەنجوومەنی گشتی پرۆتستانت بوون ، كە ئەو پەرلەمانە توانی دەسەڵاتی تەوواوی ئاینی و زانستی بداتە دەست شانشین ئەلیزابیت بە دەركردنی چەندین یاسای جۆراوجۆر وەك :-

یاسای سەربەخۆیی لە ٤/٢٩ و یاسای هەماهەنگی لە ٤/١٨، دوای ئەوە ئەم یاسایانە بوونە بنەمای دەسەڵاتی شانشین ئەلیزابیت ، بە بوونی بە دادوەری باڵای بەریتانیا لە سەر كێشەكانی ئاینی بە هاووشانی یەكتری ، بە تایبەتی دەسەڵاتی ئاینیدا ، ئەویش بە دامەزراندنی پیاوانی كەنیسەو بە سزادانی هەر كەسێكی بەرگری لە پاپا بكات زیندانی بكرێت تاكوو كۆتایی ژیانی .

بەڵام لە دوای ساڵی ١٥٦٣ ، رامیاریەتی ئەلیزابیت بەشێووەیەكی بەرچاو بەرەو گۆرینكاری هەنگاوینا بەوەی كە هەموو مرۆڤێك ئازادە لە دەربرینی بیروو بۆچوون و برووای ئاینی وەك چۆن بیەوێ ئەویش بە ئازادیەكی راستەقینە لە هەموو بووارە جیاجیاكانی ژیاندا لە وولاتەكەدا .

١٥٥٩/٥/٣٠ سەرۆك هۆزاكانی كە دەسەڵاتی سۆرانیان لێ پێك هاتبوو لەگەڵ میرەكانی كوردستان ، بە هەماهەنگیان لەگەڵ دەسەڵاتی فارسی سەفەوی هەستیان بەوە كردبوو . كە سوڵتانی عوسمانی سەرقاڵە بەوەی كە رێگەی بۆ میرقولی بەگ كە كوڕی سلێمان بەگ بووە خۆش بكات و لە ناوچەی سەماوەردا بەرەو ناوچەی حەریرو دەووروبەری لە باشووری كوردستان بگەرێنەوەو لە كاتی گەرانەوەی ، جەماوەرییێكی زۆر لە دانیشتووانی ناوچەی حەریر پێشووازیان لێكرد .

دوای ئەوە حەریری كردە پایتەختی میرایەتی و هەوڵی بەرفراوان كردنی دەسەڵاتی میرایەتیەكە یدا بەهاوكاری تیرەو هۆزەكانی سۆران لە باشووری كوردستان .

١٥٥٩/٩/٧ لە سێدارەدانی – میر سەیفەدین – ی میری سۆران لەلایەن دەسەڵاتدارانی

ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی لـە باشـووری کوردسـتان بـە هـۆی دژایـەتی کردنـی توونـدی دەسەڵاتی عوسمانیەکانی دژ بەگەلی کوردستان .

## ١٥٦٠



١٥٦٠/١/٢١ لـە دایـك بـوونی فەیلەسـوف ورامیــــاری ئینگلیــــزی – فرانسیس بیکۆن – لە شاری لەندەنی پایتـەختی بـەریتانیا ... بـــاوکی وەزیـــری دادی شانـشینی بسایت بـووە .... بیکـۆن لەتەمــەنی ١٢ سـاڵیدا چـووەتە زانکـۆی گمـبردگ ، دوای ئەوە بروانامەی لەبواری یاسا بەدەست هێناوەو بۆتـە پـارێزەر .... لـە تەمــەنی ٢٣ سـاڵیدا بۆتـە ئەنـدامی ئەنجوومـەنی گـشتی بـەریتانیا ... لـەدوای چـەندین کێـشەو گرفـت بووەتـە وەزیـری داد ، کـە باوکیـشی هـەمان پۆسـتی وەزاری بەدەســت هێنــابوو... دوای ئــەوە بــەهۆی نەخۆشـیەکی کووشــندە لــە ١٦٢٦/٤/٩ کۆچی دوایی دەکات لەشاری لەندەنی پایتەختی ئیتالیا.

١٥٦٠/٣/١٧ هێنانــە خــوارەوەی شانــشینی فەرەنــسا شانـشین – فرانـسوای دووەم – لەلایەن– کلفینیوون – کە ئەمانە کۆمـەڵێك لە پرۆتستانتی توونـدڕەو بـوون بــەدانانی – لــویس دی کونــدی– بەشانــشینی فەرەنــساو ســەرکردەی سەربازی – گوودو فروادی بارن – بە کۆکردنـەوەی ٥٠٠ چەکدار لە پێناو هێرش کردنـە سـەر شانشینی فەرەنـسا لـە گـەرەکی ئامیوواز لـە ناوەراسـتی فەرەنــسادا ... بــەڵام هەوڵەکــەیان هەرەســی هێنــا بــەهۆی ئاشــکرابوونی پیلانەکــە ، دوای ئــەوە هێزەکـانی سـووپای فەرەنـسا توانیـان گـەمارۆی ناوچەی پیلانەکە بدەن لە هێرشێکی ناکاو پیلانگێرانـی هـەموو کووشـتو زیاتر لە ١٠٠ چەکدار هەڵاتن ، بەڵام سەرکەووتنیان بەدەست نەهێنا.

## ١٥٦١

١٥٦١/١٢/٢٥ بە هۆی گوێ رایەڵ نەکردنی فەرمانەکانی سوڵتانی عوسمانی و دروست بوونی کێشە . دوای ئەوە سوڵتان سلێمان لە کارێکی دڕندانەی دژ بە مۆڤایەتی بایەزیدو هەر چوار کوڕەکەی – ئۆرخان ، مەحمود ، عەبدوڵڵا ، عوسمان – ی دەستگیر کردو لە سێدارەی دان لە شاری قەزدین .

دوای ئەوە لاشەکانیان گوواستراوە بۆ شاری سێواس لە باکووری کوردستان ... لە هەمان کات بایەزید کوڕێکی بچووکی مابوو ئەویشیان کووشت لەگەڵ براکانی لە گۆڕێکی بە کۆمەڵ نێژدران .

## ١٥٦٢

١٥٦٢/٣/١ هەڵگیرسانی یەکەم شەڕی نێوان هەردوو مەزهەبی پرۆتستانت و کاسۆلیکی مەسیحی ، سەرکردەی هێزەکانی سووپای پرۆتستانت ئەمیراڵ – کۆلینی و ئەمیر لویس و ئەنتوان دی بۆربۆن – بوون . سەرکردەی هێزەکانی سووپای کاسۆلیك دۆق – مۆنمۆرنسی – سەرکردەی سووپای فەرەنسا و دۆق – فرانسوا – بوون .

شایانی باسە کە لەو شەڕەدا کە شەڕێکی مەزهەبی بوو بەسەدان کەس لە هەردوو لا کووژران و بەسەدان برینـدار بوون ، کە ئەم شەڕانەش بە هۆی دەستکاری کردن بوو لە ڕێنماییەکانی ئاینی مەسیحی. هەر وەك چۆن لە نێوان مەزهەبی شیعەو سوونەی ئیسلام هەیە لە جیهانی ئیسلامی و مەسیحی لە جیهاندا .

## ١٥٦٣

١٥٦٣/٣/١٩ بـالاترین رووداوی ئاشـتبوونەوە لـە نێـوان مەزهەبـەکانی پرۆتـستانت و کاسـۆلیك بـوو ، ئـەویش بـە مـۆرکردنی رێکەووتننامـەی ئاشـتی و ئاشـتبوونەوە لـە نێـوان دەسـەڵاتی شانـشینی فەرنـسا ، کـە کاسـۆلیك بـوو لەگەڵ پرۆتستانتەکان .

ئەویش بە ئەنجامدانی خواپەرستی لـە نـاو کۆشك و تـەلارو بالەخانـەکانی پیاوانی گەورەو کەسایەتیەکان و بارەگاکان و دام و دەزگاکانی حکوومەت و کەنیسەکان بێت نەك روو لە گەرەك و ناوچە میللیەکان لە وڵاتدا بکەن . لە پێناو رێگە گرتن لە دروست بوونی کێشەی نێوانیان لە وڵاتەکەدا .

## ١٥٦٤

١٥٦٤/٢/١٥ لەدایك بوونی زانای ماتماتیك و گەردوونناس و فیائمی و فەیلەسوف ئیتالی – جالیلیۆ – لە شاری بیزای ئیتالیا... باوکی مۆزیکا ژەن و دانەری تیئۆری مۆزیکـا بـووە ... دوای بەئـەنجام گەیانـدنی کـارە هەمەلایەنـەکانی لـە ١٦٤٣/١/٨ کۆچی دوایی دەکات لە وڵاتەکەیدا .

تێبینی :– لەبەر هەڵە ئەم مێژووە نەسراوەتەوە– کە لە سەرەوە وێنەکەی هەیە .

١٥٦٤/٢/١٨ کۆچی دوایی هونەرمەندو وێنە کێش و فەیلەسوف و رووناکبیری جیهانی – مایکـل ئـەنجیلۆ – لـە تەمـەنی ٨٩ سـالیدا، دوای ئـەوە تـەرمی ئـەو هونەرمەندە ناوودارە جیهانیە گوواستراوە بۆ شاری ملۆرنس و گۆرەکەی لە کەنیسەی سانتا کروس– الصلیب المقدس– بە خاك سپێردرا .

ئـەویش بـە ئاهـەنگ گێرانـی چـەند رۆژێـك ، دوای ئـەوە ڤارسـای گـۆرێکی مەزنی لە سەر جووانترین شێوواز بۆ دروستکرد ، ئەم مرۆڤە لە دوای مردنی نرخی کەسایەتی و بەهرەکەیان زانی و تا دونیاش ماوە مایکل ئـەنجیلۆ لە دەروونـی هـەموو مرۆڤێکدا بە زینـدوویی دەمێنێتـەوە ، لە بـەر ئـەوەی ئەو مرۆڤـە لـەو کـارە هونەریانـەی کـە کردوویـەتی بـە خزمـەتکردنی هونـەر کەسێکی دیکە ناتوانێ جێگەی بگرێتەوە لە جیهاندا .

تێبینی:– وێنەی ئەم هونەرمەندە مەزنە لە سەرەتای کتێبەکەیە .



١٥٦٤/٤/٢٣ لــــە دایـــك بـــوونی نووســــەرو رووناكبیرو شاعیری ناوداری جیهانی – ولیم شكسپیر – كە تاكوو ئێستا كارەكانی – ملك البر وەهاملت ، وعقیل – لە سەر شانۆكانی جیهانی بڵاووبۆنەتەوە.

شایانی باسە ئەو كەسایەتیە ناوودارە خاوەنداریەتی هەموو كۆمەڵگاجیاجیاكانی جیهانە لەم بووارەدا .

## ١٥٦٥

١٥٦٥/١/١ بە هۆی سەر هەڵدانی بیروو بۆ چوونی جیا لە رێنماییەكانی ئاینی مەسیح و كاردانەوەی لە سەر بیری زاناكان ، كە ئەنجامەكەی بووە هۆی كەرت بوونی بیروو بۆچوون لە ناو ئاینی مەسیحی ، ئەویش بە جیابوونەوەی هەڵگری بروای ئەنجیلیەكان لە سەر ئاینی مەسیحیی لە جیهاندا .

١٥٦٥/١٢/ بەهۆی گەمارۆدانی توونـدو بەردەوامی مەسیحیەكان لە لایەن هێزەكانی سووپای عوسمانی ، تا ئەو كاتەی كە هێزە چەكدارەكانی مەسیحی خۆیان ئامادەكرد بەسەركردایەتی شانشینی نەمسا ، لە شاری سقلیەدا .

لە ئەنجام بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕیكی توونـدو تیژ لە نێوان هەردوولا ، كە كەشتیە جەنگیەكانی ئیسلام بەسەركردایەتی دەسەڵاتی عوسمانی پاشەكشەیان كردوو بووە هۆی گیان لە دەست دانی بەسەدا هاوولاتیو چەكدارو بریندار بوونی بە سەدا كەسیش لەو شەڕەدا .

## ١٥٦٦

١٥٦٦/٥/ لە دایك بوونی محەمەد خانی سێیەمی سوڵتانی عوسمانی، كە لە دوای مردنی باوكی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی گرتە دەست ، دایكی ناوی – سەفیە – ی لەدایك بووی ئیتالیا بووە، محەمەد خان ١٩ برای

هـەبووەو هـیچ خووشـکی نـەبووە ، لەهـەمان کـات کاروبـاری دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا دەست وەزیرەکان ، بە سەرکردایەتی کردنـی لە لایەن سەنان پاشا. لە سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا .

١٥٦٦/٧/١٩ نووسەرو رۆژهەڵاتناس و پرۆفیسۆرەکان ، لە سەر ئەو بیروو بۆچوونە کۆك بوون ، کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەردەمی سوڵتان سلێمان قانونی بەهێزترین دەسەڵات بووە لەجیهانـدا ، لـە کۆتاییەکانی دەسـەڵاتی سوڵتان هۆکارەکانی لاوازی بوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەرکەوتن بە تایبەتی لە بوواری ئابووری و سەربازی و کارگێریدا .

١٥٦٦/٩/٥ سوڵتان سلێمان قانونی لـە تەمـەنی ٧٤ سالیدا کۆچی دوایـی کـردو ماوەی دەسـەڵاتەکەی ٤٨ سـاڵ بـووە ، لـەکاتی دەسـەڵاتی ئـەو ئیمپپراتۆریـەتی عوسمـانی لـەو پـەری بـەهێزی و بەرفراوانیـدا هـەنگاوینا لـە هـەموو بووارە جۆراو جۆرەکانی دەسەڵات ، بە تایبەتی لە بوواری ئابووری و سەربازی ، کە ئـەو دوو بـووارە بـە بنـەمای بنـەڕەتی بـەهێزی دەسـەڵاتی عوسمـانی بـوو لـە جیهان .

## ١٥٦٧

/١١/١٠ ١٥٦٧ بەرپا بوونی شەڕی دووەمـی نێوان هێـزە چەکدارەکانی مەزهـەب کاسۆلیك و پرۆتستانتی مەسیحی لە ناوچەی - سان دینـی - لە نزیك شاری پاریسـی پایتـەختی فەرەنسا ، کە ئـەمیرال کۆلینی و ئەمیرال کوونـدی سـەرکردایەتی هێزەکانی سووپای پرۆتستانتیان دەکرد .

لـە هـەمان کـات ئاگـاداری شانـشینی فەرەنـسایان کـرد بـە داگـیر کردنـی پاریـسی پایتـەختی فەرەنـسا ، بـەڵام سـەرکردەی هێزەکـانی سـووپای شانـشینی کاسـۆلیك تـووانی هەوڵـەکانی هێزەکـانی پرۆتـستانت پوچـەڵ بکاتەوە بەسەرکەووتنیان .

## ١٥٦٨

١٥٦٨/٢/١٧ سوڵتانی عوسمـانی سوڵتان سـەلیمی دووەم رێکەووتننامـەی ئاشتی لەگـەڵ نەمسـا مـۆرکرد ، بـە نـووێ کردنـەوەی بەڵێنـەکان ، هـەروا لەگـەڵ مـەژەر

پۆلۆنیاو چەندین لایەنی دیکە ڕێکەووتنی ئاشتی مۆرکرد ، لە پێناو بەرەو بەیەکەوە لە ژیانی پەیووەندیو هاوچەرخی نێوو دەووڵەتی ، نەك لە سەر ڕێگەی باوکی ، کە هەموو هەوڵێکی داگیرکردنی وولاتان بوو لە جیهاندا .

١٥٦٨/٨/٨ کەسایەتیو سەرکردەی جەزائر- قلج عەلی بیلر بەگ - جەزائری بەدەست گرتنی بۆ قلج عەلی ، کە ناسراو بوو بە بەهێزی توواناى لە بەرێووەبردنی کاروباری کارگێڕیو پاڵەوانیەتی لە جەنگ بە سەرکەووتنەکان ، ئەویش بە گەڕاندنەوەی دەسەلاتی ئیسلامی بۆ سەر ئیسپانیا ، دوای ئەویش ڕزگار کردنی باکووری ئەفەریکیا لە ژێر دەسەلاتی سەلیبییەکان .

## ١٥٧٠

١٥٧٠/٣/٣١ هێزەکانی سووپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پشتگیری نووێیان ڕەوانە کرد بە پیاوو بەچەك لە پێناو گەڕاندنەوەی شۆڕش لە ئەندەلوس... لە هەمان کات فەرمان درا بە قەلەج عەلی بە جێ بەجێکردنی فەرمانەکە ، کە بووە هۆی بەرپابوونی شەڕ لە نێوان هێزەکانی سووپای هاوبەشی ئیسلامو عوسمانی لە گەڵ هێزەکانی سووپای سەلیبییەکان .

/١٢/٢٦ لە دوای کۆچی دووایی سوڵتانی عوسمانی سوڵتان سلێمان قانونی ،
١٥٧٠ ئەویش بە وەرگرتنی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەلایەن سوڵتان سەلیمی دووەم ، لە یەکەم شەڕیدا لە ناوچەی شاری لیبانتۆبوو ، کە هێزەکانی سووپای عوسمانی بەرەو شکستی هێنان هەنگاویناو ترسناکی لەسەر دەریای سپی ناوەراست نەما .

هەروا لە شاری ئیکسار لەخاکی گۆڕین بوو بەرەو وەستانی سەردەمی بووژانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە هێزی دەریایی لە... دوای ئەوە رامیاریەتی دەووڵەتی عوسمانی لە دوای جەنگی لیبانتۆ بەرەو پاراستنی جێگا پیرۆزەکانی ئیسلام ، یەکەم... دووەم پاراستنو لە دەست نەدانی دەسەلات بوو لە سەر دەریای سوورو کەنداو ، کە وەك پەرژینێکی ئاسایشی دەسەلاتەکەی بوو لە بارەی باری پاراستنی ئەو جێگایانەو دەرگای بەرگری کردنو بەر بەستەکردنیرێگای هێزەکانی سووپای پورتووگاڵ بوو بە ماوە نەدانیان .

## ١٥٧١

١٥٧١/٧/١٥ هێزه داگیرکـەرەکانی سووپای تەتـەر شاری دێرینـی مۆسـکۆیان سـووتاند بەشێووەیەکی بیّ ووێنه له مێژووی ووێرانکردن و سووتاندن لەجیهاندا .

١٥٧١/٨/٢ هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی دوورگـەی قووبرسـیان داگـیر کـردو لـه ژێردەسـتیان مایـەوه تـاکوو بەریتانیا لـه ژێـر دەسـتی هێزەکـانی سـووپای عوسمانی رزگاری کرد ، ئەویش له ئەنجامی شەڕیکی تووندو دژوار بوو له نێوانیاندا .

١٥٧١/١٠/٧ بەرپابوونی شەڕ له نێوان هێزەانی سووپای عوسمانی وهێزەکانی سووپای مەسیحی... هێزەکانی سووپای عوسمانی پێك هاتبوون لـه ٢٢٢ کەشتی جەنگی گەوورەو ٦٠ کەشتی بچووك و ٥٧٠ تۆپ و ٢٤هەزار سەرباز ، له گەڵ ١٣ هەزار سەربازی دەریایی و ٤١ هەزار مجدەف... بەڵام هێزەکانی سووپای مەسیحی پێك هاتبوون له ٢٠٧ کەشتی گەورەو ٦ کەشتی تۆپ هـەڵگرو ٣٠ کەشتی بچووك و ١٨٠٠ تۆپ و ٣٠ هـەزار سـەربازو١٢ هـەزار دەریـاوان و ٤٣ هەزار مجدەف له ناوچەکەدا .

لـەو کـاتیش ئستوولی سـووپای مەسـیحیەکان ئاڵای سـەلیبی مەسـیحیان بەرزکردبووەوه ... هـەروا ئستوولی سووپای عوسمـانی ئاڵای سـوڵتانی بـەرز کردبـووەوه ، کـه پێـك هـاتبوو لـه ووشـەی – اللـه – . لابـاڵی راسـتی هێزەکـانی مەسـیحی پاشەکـشەیان کـرد بەرامبـەر بـەهێزەکانی سـووپای عوسمـانی ، بـەڵام لاباڵی چـەپی هێزەکـانی مەسـیحی کـه بەندەقیـەکان سـەرکردایەتیان دەرکـرد... کـه هێزەکـانی لـه لایـەك لـه بەرگریـدا بـوون و لەلایەکی دیکه له هێرشکردن دا بوون له ناوچەکەدا .

که ئەمەش بووه هۆی کووشتنی بەهەزارەها سەربازی عوسمانی و له ئەنجام هێزەکانی سووپای مەسیحی بەسەرکردایەتی– دۆن جوان – سـەرکەووتنیان به دەست هێنا بەرامبەر بە هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی بەسـەکردایەتی – موسیناد عەلی .

شایانی باسه که ئەو شەره ناووزەند بوو به نـاوی شـەڕی – لیبنتۆ– کـه بـه گـەوورەترین شـەڕی نـوویێ سـەردەمی ئـەو کـات دادەنرێـت لـه نێـوان ئیسلام و مەسیحی له جیهاندا .

١٥٧١/١٠/١٧ بەرپابوونی شەڕی دەریایی لە نێوان هێزەکانی سووپای دەریایی و پیادەی عوسمانی و هێزەکانی سووپای دەریای و پیادەی مەسیحیەکان لە جەزائر ، ئەویش بە کۆتایی هاتنی شەرەکە بە سەرکەووتنی هێزەکانی سووپای مەسیحی، لەئەنجام زیاتر لە ٣٠ هەزار سەربازی سووپای ئیسلامی عوسمانی کوژران... بەڵام لە ئەنجامی بەردەوام بوونی شەڕی نێوانیان لە دوا شەری کۆتایی هێزەکانی سووپای عوسمانی سەرکەووتنیان بە دەست هێنا بەسەرکردایەتی قەلەج عەلی و پاداشت کرا بە پلەی سەرکردەو مانەوەی لە سەر ناوچەی کلیبریك لە جەزائردا .



## ١٥٧٢

١٥٧٢ /٨/٢٣ لە سەر بریارو داوای شانشینی فەرەنسا شانشین – شارلی نۆیەم – و بە ئامۆژگاری دایکی – کاترین دی – ئەویش بە ئەنجامدانی قەسابخانەی – سان برتیلمی– لە فەرەنسا ، بەرامبەر بە مەزهەبی پرۆتستانتی مەسیحی لە لایەن مەزهەبی کاسۆلیك ، کە لە ئەنجام بووە هۆی کوژرانی زیاتر لە٠٠٠ ,٦٠ هەزار هاووڵاتی لە نێوان هەردوو مەزهەبی کاسۆلیکی و پرۆتستانت بەتایبەتی مەزهەبی پرۆتستانتەکان .

سەرەرای بەرهەڵستکاری کردن لەلایەن هەندێ لە کەسایەتی و ئەمیرەکانی ئەوکاتی فەرەنساو بەردەوام بوونی ئەو شەڕە بەتایبەتی لە رۆژی ٨/٢٤ , کە رۆژی جەژنی قەدیس برتالماوس بوو لە شارەکەدا ، لە درێژەی بەردەوامی شەڕ ئەمیرال کۆلینی پرۆتستاتنی بووە راووێژکاری شانشینی فەرەنسای کاسۆلیك –شارلی نۆیەم – لە فەرەنسادا

. ئەویش لە پێناو پال پێوەنان و هاندانی شانشینی فەرەنسا بە بەربەرەکانی و هێرش کردنە سەر ئەسپانیا لە دانیشتووانەکانی ناوچەی – فلاندریا – بوو ، کە لە رەچەلەکدا دەگەرانەوە سەر بەلژیکیەکان ، ئەویش لە پێناو دامەزراندنی کۆماری – کالفینیە – بوو لە ناوچەکەو ببێتە هۆکارێك بە لە ناووبردنی شانشینی فەرنساو تۆڵە وەرگرتنەوە لێی بەو رێگایدا .

١٥٧٢/٨/٢٥ هێزەکانی سووپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هێرشێکی بەرفراوانیانی کردە سەر هێزەکانی سووپای فارسی سەفەوی و گەلی کورد ، کە لە ئەنجام بووە

هۆی کووشتنی زیاتر له ٤٠٠ چوار سەد هەزار هاووڵاتی لە هەرسێ لایەنی شەڕکەر بە تایبەتی لە مەزهەب شیعەکانی فارس و کورد لە رۆژهەلاتی کوردستان وەك قەسابخانە بە ناووبانگەکەی – سان برتلیمی – پاریس لە فەرەنسا .

 ١٥٧٤

١٥٧٤/٥/١٤ کەشتیە جەنگیەکانی سووپای عوسمانی بە سەرکردایەتی سنان پاشاو سەرکردەی جەزائر – قەلەج عەلی – ، باڵیان بە سەر دەریای سپی ناوەراستدا راکێشا ، ئەوەیش بە لێدانی کەناری کالابریاو مسینا... کە هێزەکانی سووپای عوسمانی توانیان دەست بەسەر کەشتیەکانی سووپای مەسیحی دابگرن و دەریایان کرد بە دوو بەشەوە بۆ ماوەی پێنج رۆژ ، لەئەنجام هێزەکانی سووپای عوسمانی توانیان سەرکەووتن بەدەست بێنن لە ناوچەکەدا .

١٥٧٤/١٢/١٢ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان سەلیمی دووەم لە تەمەنی ٥٢ سالیدا کۆچی دوایی کردووەو ماوەی دەسەلاتی هەشت ساڵ و پێنج مانگ بووە. لە سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا .

١٥٧٤/١٢/٢٦ دکتۆرو بازرگانی ناوداری ئەڵمانی – لیۆنارد راولف – لە گەشتەکەی بۆ ویلایەتی شارەزوورو مووسڵ سەردانی شاری کەرکوك و دوایی بەرەو شارۆچکەی پردێ و دوایی بەرەو شارۆچکەی ئاسکی کەلەك هەنگاویدەنا و گەشتەکەی بەسەر بردووە لەهەرێمی باشوری کوردستان ,

لە ئاکامی ئەو گەشتەیدا راپۆرتێکی بەزمانی ئینگلیزی بلاو کردۆتەوە ، بەلام بەداخەوە نەمزانی لە چ رۆژنامەیەك و گۆڤارێك بلاوی کردۆتەوە . لەهەمان کات لە ١٢/٣٠ی هەمان سالدا لە گەشتەکەی بەناوچە کوردیەکاندا بە باکووری کوردستاندا سووراوەتەوە و تاکوو گەیشتۆتە ئەرمینیا .

١٥٧٤/١٢/٢٦ گەرۆکی ئەلمانی – نیبۆر – کە رەنگە بەناوی بەناو بانگترین گەریدەی ئەلمانی بێت ، کە سەردانی شاری کەرکوکی کردبێ ، کە بەچەند لاپەرەیەك باسی شاری کەرکوکی کردووە لە سەفەرنامەکەیدا ، کە لە دوو بەرگی زۆر

گەورەدا لە ساڵی ١٧٨١ وەرگێراودراوەتە سەر زمانی فەرەنسی و لەشاری ئەمستردام چاپ و بڵاوکراوەتەوە . کە بەم شێوەیە باسی کەرکوک دەکات لە بارەی قەڵاکەوە دەنووسێ :-

ئەم شووێنەی پێی دەڵێن قەڵا پیسترین شووێنێکە تا ئێستا کە بینیبم و ماڵەکانی بەبێ هەڵاوێردن و لە وپەری خراپیدان ، لەناو قەڵاکە سێ مزگەووت و منارەی لێیە ، یەکێك لەم مزگەووتانە گرینگە ، چونکە گۆری




پێغەمبەرەکان - دانیال ، میخائیل و ئەلیعازر - عیزرایل -ی لێیەو جوولەکەکان گوومانیان لەوەدا نیە کە پێغەمبەرەکەیان لەم مزگەووتەدا نێژراوە لە شارەکەدا .

بەڵام موسڵمانەکان رێگەیان نادەن بچنە ناو مزگەووتەکە . کەرکوك نزیکەی ٤٠ کلدانی بانەستووری لێیە ، کەسەر بە کلێسای رۆمانن - کەرکوك شووێنی نیشتەنی پاشای پلە دوو تەوگەیە . پاشا لە شار دانانیشێ ، هەرچی باقی وویلایەتی شارەزوورە دەکەوێتە سەر رێگای تاوق تا هەولێر ، کە ئەمرۆکە سەرجەمی سەر بە پاشای بەغدایە .

نادرشا بە ئاسانی دەستی بەسەر شارەکەو قەڵاکەدا گرت ، بەڵام سەردەمانێك لە موسل سەرنەکەووت و ناچاربوو بەخێرایی لە کەرکوك بکشێتەوەو زیانێکی زۆری لە کەرکوکدا .

هەروا نیبۆر دەڵێ :- دەڵێن لە نزیك شاری کەرکوك چاڵە قیرو نەوتی لێیە ،

هـەروا شـووێنێك هەیـە پێـی دەڵـێن – بابـاگورگور – کـە لەوپـەری سـەیر
سـەمەرەدایە ، بەتایبـەت زەویەکـەی هێنـدە گەرمـە بەرادەیـەك بەشـی ئـەو
دەکـات گۆشـت و هێلکـەی لەسـەر سـووربکرێتەوە ، مـرۆڤ تـەنها پێوویـست
بەوە دەبیّ چاڵێکی چکۆلەی لەسـەر هەڵکەنیّ و مەنجەڵی بخاتـە سـەر ، زۆ
کـەس ئـەوەیان بـۆ دووپـات کردمـەوە ، کـە بینیویانـە شـەوان بڵێـسەی ئـە
شووێنە هەڵدەستیّ و بەچاوی خۆیان بینیویانە .
هەروا لە کەرکوکەوە تا شارۆچکەی ئاڵتوون کۆپری – پردیّ – لە ئێوارەی
١٢ مانگ ، گەیشتین , هیچ ئاواییەکم لە سەر رێگا نەبینی ، بەڵام رێکەووتی
زۆر بنەماڵـەی کوردەکـانم کـرد کـە مـەرو ماڵاتیـان لـەم لەوەرگـە جوانانـ
دەلەوەراند لەو نێوانەدا .

## ١٥٧٦

١٥٧٦/٨/٢٦ کۆچـــی دوایـــی هونەرمەنـــدو
وێنـــــەکێش و روونـــــاکبیری
بـەناوبانگی جیهـانی – تیـشیان –
کە تەرمەکەی لە کەنیسەی سانتا
ماریا لـە وولاتـی پۆلۆنیا نێژراوە ،
هەر بەو بۆنە حکوومەتی پۆلۆنیا
بریارەکـانی خـۆی هەڵووەشاندەوە
کـە خـۆ پیـشاندان و کۆبوونـەوەی
تێـدا قەدەخـــە کـــراو بـــوو لـــە
وولاتەکەدا .



## ١٥٧٧

١٥٧٧/٦/٢٨ هونەرمەندو شێووەکار کێشی بەناووبانگی جیهانی – پیتەر پۆڵ رۆبنز – ل
شاری ئەنتۆبرب چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .

## ١٥٧٨

١٥٧٨/٧/٣ مێژوو نووس و ڕووناکبیری بەناوبانگی کورد شەرەفخانی بەدلیسی بەهۆی نەتووانینی بەگەڕانەوەی بۆ بەدلیس... لە ئێران... لە هەوڵێکی ئاواتخواز چووە پاڵ لە شکری عوسمانی لە پێناو دورستکردنی هەلێکی گوونجاو بۆ گەڕانەوەی بەرەو شاری بەدلیس لە باکووری کوردستان ، بۆ ئەوەی بتووانێ نووسینی کتێبە بەناوبانگەکەی - شەرەفنامە - تەواو بکات و لە هەمان کات هیوا داربوو بە بەئەنجام گەیاندنی بیرۆکەی فیدراسیۆنی ئیمارەتە کوردیەکان لە کوردستان ، کە ئاواتی ئەو سەرکردەیە بوو بەگەڕانەوەی بۆ خاکی کوردستان.

١٥٧٨/٨/٤ شەڕی - وادی مەخازن - لە کردارە مەزنەکانە ، کە دەووڵەتی سعدیە پێی هەلسا لە کاتی سوڵتان عەبدولمەلیک ، ئەویش بە سەرکەووتنیان بەسەر لایەنگرانی پورتووگال لە شەڕی ملووڵی سێیەم ؛ کە ئەو شەڕە ناونرا بەشەڕی - قصر کبیر- . یان بە جەنگی وادی مەخازن لە نێوان هێزەکانی سووپای مەسیحی و پورتووگال بەهێزە چەکدارەکانی ئیسلامی لە مەغریبدا لە کێشووەری ئەفەریکیادا .

١٥٧٨/٨/١٩ بەرپابوونی شەڕێکی خووێناوی دژووار لەنێوان هێزە چەکدارەکانی سووپای ئیمپۆاتۆریەتی فارسی سەفەوی لە ناوچەی - چیلدەر - بە هاوکاریکردنی هێزەکانی سووپای توورك . کە پێرستی - ناوی بەرپرسی کوردەکان بوو ، لە شەڕی نێوان ئێرانیەکان و عوسمانیەکاندا کووژرا ... کە میر محەمەد دەسەڵاتداربوو لەسەر هەرێمی جەزیرو - ساروخان - فەرمانرەوایی خەزوو - سانسۆن - بوو .

هەروا کورەکەشی - حەیدەر بەگ - فەرمانرەوایەتی تەرجیل و ... بابە زیدبەگ کە کوری میر هەکاری بوو ... ئەم گۆرانکاریانەش لە بەرەکانی شەڕی نێوان فارس و عوسمان هاتە کایەوە ... کە لە سایەی سەر سووپای چەکداری کورد بوو ... کورد گیانی باشترین سەربازانی خۆی فیدای سەرکەووتنی عوسمانیەکان کرد لەسەر خاکی خۆی کە کوردستانە .

سەرچاوە :- م . س - لازاریف .

##  ١٥٧٩

١٥٧٩/٢/٢٨ هۆزی ئەفشار کە یەکێ بوو لەو حەوت هۆزەی کە قزلباشیەی لێ پێکهاتبوو ... بەشداری کەری سەرەکی بوون لە شەڕەکانی شا ئیسماعیلو لە هەمان کات دامەزراندنی دەوولەتی فارسی سەفەوی مەزهەب شیعەدا کردبوو ، کە ژمارەیەکی زۆر لە کاربەدەستەکانی دەوولەت لە سەرانسەری قەلەمرەوی سەفەوی دا کە هەر لەناو ئەوان دا هەڵئەبژێردرا بوون ، کە دەسەلاتی زۆریان لەئیدارەی شاهەکانی فارسدا هەبوو .
بەلام هەندێ لەسەرانی ئەو هۆزە تاووانبار کران بە هاووبەشی کردنیان لە کووشتنی مەهدی عەلیای هاوسەری شا محەمەد خوودا بەندە لە وولاتەکەدا .

##  ١٥٨١

١٥٨١/٧/٣١ لە پاڵ ئەوەدا خۆ ئامادەکاری بۆ لایەنی سەرکەووتن ، باڵوێزی تایبەت لە ئەستەمبۆڵ ، لە دوای گەیشتن بە بەنیمچە ڕێکەووتنی سەربازی لە نێوان دەوولەتی عوسمانی و شانشینی ئەسپانیا بە کۆتایی هێنان ، بە کێشەکانی نێوانیانو چوونە ناو شاری لشبۆنەی پایتەختی ئەو کاتەی پورتووگال ، بەرامبەر پێشکەش کردنی یارمەتی بۆ مەغریب ، ڕووبەروو بوونەوەی هێزەکانی عوسمانی بەرامبەر پێشکەش کردنی یارمەتی بۆ مەغریبو ڕووبەرووبوونەوەی هێزەکانی عوسمانی بەرامبەر دەست هەڵگرتن لەشاری عرائسو دەستکەووتەکان .

##  ١٥٨٣

١٥٨٣/٤/١٠ لەدایك بوونی دانەرو یاسایی و لاهووتی هۆلەندی – گروتیوس – هۆگۆ – ل دلفەتی هۆلەندی ... کە قوتابیەکی زیرەك و زانایەکی بێ وێنە بووە شایانی باسە بروانامەی دکتۆرای لە یاسا بەدەست هێناوە کە تەمەنی لە ٥ ساڵیدا بووەو زمانی لاتینی هەر لەسەرەتای منداڵیەوە بەباشی فێربووە ئەندامی شاندی نێردراو بووە بۆلای هنری چوارەمی شانشینی فەرەنسا .. هنری چوارەم ئەم زانایەی ناوزەند کردووە بەسەرسووڕهێنەری هۆلەندی

دوای ئەوە بوو بەزانا ناسێکی یاسایی – لاهووتی – داهێنەر – دبلۆماسێکی لێهاتوو ... لەساڵی ١٦٠٣ بەپارێزەر دامەزرا لە هۆڵەندا .
هەروا لەتەمەنی ١٢ ساڵیدا چووە زانکۆی لیدن لەهۆڵەنداو بۆ ماوەی سێ ساڵ مایەوە .
جێگەی سەرسوورهێنەری زانای هۆڵەندی مەزن – یوسف ئسکالیگر– بوو . لە ساڵی ١٥٩٨ یاوەری بالوێزی هۆڵەندی کرد ، کە بەرەو فەرەنسا بەرێکەووتن . لە ساڵی ١٦١٥ سەرۆکایەتی شاندی هۆڵەندی کرد بۆ بەشداری کردنی لە کۆنگرەی راوی ماسی کە لەئینگلتەرا بەسترا .
بەهۆی کێشەی ئاینی و رامیاری لە ١٦١٩/٥/١٨ بریاری زیندانی کردنی هەتایەی بۆ دەرکرا . لە بەندیخانە دەستی کرد بەدانان لە نووسینە هەمە لایەنەکانی و یەکەم کتابی بەناوی – نقم القانون الهولندی – بڵاوکردەوە ، دوای ئەوە دووەم کتابی بەناوی ( حقیقه الدیانه المسیحیه )ی بڵاوکردەوەو رێنمایی لەسەر کتابی ئینجیل دانا .
دوای دوو ساڵ لەبەندکردنی خێزانەکەی بەدزی پاسەوانەکان و رەزامەندی هەندێکیان توانی لەناو سندوقێك دانابنیٚ لە ١٦٢١/٣/٢٢ هاوسەرەکەی توانی لەبەندیخانە رزگاری بکات و گەیشتە شاری گورکوم ... دوای ئەوە چووە لای یەکێك لە هەڤاڵەکانی و دوایی بەرەو شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا رۆیشت و لە ١٦٢١/٤/١٥ گەیشتە پاریس و لەلایەن ئەمیر کوندیەی وەزیری دادی فەرەنسی پێشوازی لێکرا .
ئا بەم شێووەیە ئەم زانایە لەکارە هەمەلایەنەکانی بەردەوام بوو تاکوو لە ١٦٤٥/٨/٢٨ لە روستوك لە ئەلمانیا کۆچی دوایی دەکات ...

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٣ .

١٥٨٣/٥/٩ دادووەری هەرێمی شێروان – خادم مەسیح پاشا – بەرەو داگیر کردنی داغستانی سەر کەناری دەریای خەزەربە رێکەوت ، واتە دەریای قەزوین ، دوای ئەوە سەرکەووتنی بە سەرهێزەکانی سووپای فارسی سەفەوی داگیرکەری خاکی کوردستان بە دەست هێناو لەلایەن داگیرکەری دەسەڵاتی عوسمانی ، واتە لە دوو لایەنە خاکی کوردستان داگیر دەکرا ، بە نۆبە لە نێوان هەردوو دەسەڵاتی فارسی و عوسمانیدا ، بەر لەوەش لەلایەن

ئیسلام و هەر بەناوی ئیسلام.

## 1585

١٥٨٥/٥/٢١ مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی ئاشتی لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسی سەفەوی ، لە دوای شەڕی شەش ساڵە ، لە ئەنجام هەرێمەکانی کەرەج و شێروان و لۆرستان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی ، کە زۆربەی زۆری خاکی کوردستان بوو لە گەڵ بەشێك لە خاکی ئازربایجان و شاری تەورێز .

لەو کاتەش سەرەك ئەنجوومەنی وەزیرانی عوسمانی پاشا کۆچی دوایی کردو خادم مەسیح پاشا جێگەی گرتەوە لە سەر ئیمپراتۆریەتەکەدا .

١٥٨٥/١٢/٢٣ هەندێ لە کەسایەتی ناو هۆزی ئەفشار تاووانبار کرابوون بە کووشتنی هەمزە میرزای کوڕی شا محەمەدی فارسی ، ئەویش بەدەست تێکەڵاو کردنی لەگەڵ ئەمیرێکی تەتەری بەدیلگیرا ، کە بە هاوکاری یەکتری کووشتبوویان... بەو هۆکارە شاعەباس گومانی لە هەندێ لە هۆزەکانی ئەفشار دەکرد . کە لە هۆزە قزلباشیەکان پێك هاتبوون لە وولاتەکەدا .

١٥٨٨/٦/١٠ کۆچی دوایی سۆڤی و فەیلەسوفی ئەلمانی – ڤالانتین ڤایگل – لە نایندرۆڤ لە نزیك گانیسینیۆن لە سکسۆنیا ئەرستبرگ ... شایانی باسە ئەم فەیلەسوفە لەساڵی ١٥٣٣ چاوی بە جیهان هەڵهێناوە . ژیانی بەتەنیای و دوورە پەرێزی بردۆتە سەر ... خووێندنی سۆڤی تەواوکردووە لە گەڵ خووێندنی لاهوتی لەدوای مردنی چەندین بەرهەمی بەچاپگەیەنراوە لەوانە :– الحياة الدائمة لەساڵی ١٦٠٩ . رسالة في الحياة السعيدة ، لەساڵی ١٦٠٩ . حوار حول المسيحية الصحيحة ، لەساڵی ١٦٢٢ ... لەگەڵ چەندین بەرهەمی دیکە لەژیاندا ، کە کاردانەوەو کاریگەری خۆی نوواندووە لە دوای کۆچی دوایی کردنی لە وولاتەکەیدا.

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٣.

## 1587

١٥٨٧/١٠/٢٠ بەرپابوونی شەڕی هەشتەمی ئاینی نێوان مەزهەبەکانی کاسۆلیك و

پرۆتستانت ، كە ناووزەند بوو بە شەڕی - كوتراس- كە پرۆتستانتەكان سەركەووتنیان بە دەست هێنا بەسەر كاسۆلیكەكان و بە هەڵاتنی پرۆتستانتەكان بە سەركردایەتی - هنـدی دۆناڤار- لەو شەڕەداو سەركردەی كاسۆلیك - دۆق دوژوابووز - كوژرا .

## ١٥٨٨

١٥٨٨/٤/٥ كەنگەشە هێنەترین بیرەمەندە رامیاریەكانی سەردەمی نوێ - تۆماس هۆبز - لە دایك دەبێ ، كاتێك كە پایۆرە جەنگیەكانی ئیسپانیا خەریكی نزیك بوونەوە لەكەنارەكانی ئینگلستان بوون و ئەم وولاتە لەترسی تێك هەڵچوونی سووپا دەژیا .

ئەم زانا ناودارە لاوێكی خاوەن بەهرە بوو ... لەتەمەنی ١٤ ساڵیدا چووە زانكۆی ئۆكسفۆردو لەساڵی ١٦٠٧ لەتەمەنی ١٩ ساڵیدا خوێندنی تەواوكردو مۆڵەتی وانە گووتنەوەی وەرگرت ... باوكی تۆماس هۆبز قەشەیەكی نەخوێندەوار بوو ، كاتەكانی بەكتابی پیرۆزو مەی خواردنەوە بەسەر دەبردو دوای ماوەیەك باوكی كۆچی دوایی كرد .

دوای ئەوە لەلای مامەكەی ژیانی بەسەربرد ، هۆبز لەسەر راسپاردەی یەكێك لەهاوكارانی بەپلەی مامۆستایەتی بنەماڵەی دەست رۆیشتووی لۆردكاوندیس رازی بوو ... ئەمەش بووە هۆی سەربەخۆیی دارایی و لە ئاكامدا باهاتن و گەشەی هەمەلایەنی روحی و هزری ئەو بێجگە لەمە بەدەستپێكردنی پێشوویە كۆماری خوازەكان لە ئینگلستان چالزی یەكەم - ستیوارت - و زۆربوونی مەترسی شەڕی نێوخۆیی ، كە خانەدانەكانی لایەنگری پاشایەتی داوایان لە تۆماس هۆبز كرد كە گەلالەیەك لەفەلسەفەی رامیاری خۆی بكات ، ئەویش بەمەبەستی داكۆكی كردن لە رەوای پاشایەتی بلاوبكاتەوە . ئەم گەلالەیەش كەسەرەتای بۆ بەشی كۆتایی سیانەیەك - تریلۆژی - لەژێر ناوی - توخمە فەلسەفەیەكان - لەبەر چاوگیرا بوو كە لەساڵی ١٦٤٠ بلاوی كردەوە .

بەلام بەهۆی گۆرینی بارودۆخی ئینگلستان و بە سەركەووتنی پەرلەمانی - درێژە - بە سەر پاشایەتی لایەنگیرانی ، كە لە پایزی ساڵی ١٦٤٠ بەناچاری

لەترسـی دەستبەسـەرکردنی بـەرەو شـاری پاریـسی پایتـەختی فەرەنـس
ڕۆیشت و بۆماوەی ١٠ ساڵ لەفەرنسا مایەوە.
گـرنگترین بەرهەمـەکانی بـەناوی – لۆیاتـان ، یـان ، جەوهـەر – روخـسار
لەدەسەلات و دەوولەتی کەنیسەی مەدەنیش لەساڵی ١٦٥١ لەشاری لەندە
بلاوی کردەوە ... هۆبز بەشـەکانی یەکـەم و دووەمـی فەلسەفەی سرووشـت
ئـەنترۆپۆلۆژی لـە دوای یـەك لەسـاڵەکانی ١٦٥٥ – ١٦٥٨ دا بلاوکـردەوە .
ئـەم بیرمەنـدە لـەماوەی ژیـانی تـوانی بـەدەیا بەرهـەم بەئـەنجام بگەیـەنێ ل
سەرباری رامیاری و تووندوتیژی و حکوومەت و مـاف ... و بەردەوام بوون
تاکوو لە ١٦٧٩/١٢/٤ لەتەمەنی ٩١ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات.
سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٣ .

## ١٥٩٠

١٥٩٠/٣/٢١ مۆرکردنی پەیمانی نێوان دەسەلاتی فارسی سەفەوی و دەسەلاتی عوسمانی
لە شاری ئەستەمبوڵ ، کە بووە هۆی ئەوەی لۆرستان و شارەزوور بکەوێتە
ژێر دەسەلاتی هێزەکان و بەرپرسانی دەسەلاتی عوسمانیدا .

١٥٩٠/٤/١٨ لە دایك بوونی ئەحمەد خانی یەکەم ، کە کوڕی محەمەدخانی سێیەم بوو
لە دوای باوکی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی گرتە دەست بە سوڵتا
عوسمـانی لـە سـەر هـەمان بیروو بۆچوون لـە ڕێنماییـەکانی بـاوکی لـە سە
ئیمپراتۆریەتەکەدا .

## ١٥٩٢

١٥٩٢/١/٢٢ لەدایك بوونی فەیلەسوفی بەناوبانگی فەرەنسی و جیهانی –پیاراگسندی – ا
هـەرێمی بیروڤـانس لەباشـووری فەرەنـسا .... هـەر لەسـەرەتاوە لایـەنگیر
بیرووبۆچوونەکانی فەیلەسوفی ناوداری جیهـان ئـەبیقۆر بووەو لەهـەمان کا
ئاواتـەکانی بـوونی بەقەشـەی مەسـیحی بـووە و خـوێنـدنی ئـایینی دەسـ
پێکردوە .
لەسـاڵی ١٦١٤ بڕوانامـەی دکتـۆرای لـە لاهـووتی بەدەسـت هێنـاوە ... دوا
ئەوە دوو ڕووی وانە گووتنەوەی گرتەبەر ... ئەویش :–

یەکـەمیان :- مامۆسـتایەتی و لاهـووتی . ئـەویش لـە بـواری ئـاییـنی و فەلـسەفە لـە ئـاکس . دوای دەسـت بەسـەر داگـرتنی یەسـووعیەکان ... واتـە مەسـیحیە تـوونـد رەوەکـان . بەسـەر کۆلێـژی ئـاکس وازی لـەکارەکانی مامۆستایەتی هێنا لەساڵی ١٦٢٣ ... بەڵام دوای ئەوە بووە کاهینی یاسایی. یەکەم دانراوی لەساڵی ١٦٢٠ ئامادەکرد بەناونیشانی - ابحاث غیر تقلیدیة ضد اتباع ارسطو - ئەویش لەبارەی گەردووونناسی بوو... لەهەمان کات پەیوەندی بەفەیلەسوفی ناوداری جیهانی ئەبیقۆر و چەندین زاناو فەیلەسوفی دیکە کرد ، لە کارە هەمەلایەنەکانی بەردەوام بوو تاکوو لە ١٦٥٥/١٠/٢٤ لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا کۆچی دوایی دەکات .

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی /٣ .

## ١٥٩٤

١٥٩٤/٥/٣١ کۆچـی دوایـی نیگارکێـشی بـەناووبانگی جیهـانی- پـاولۆ تـەنتورتۆ- وگۆڕەکەی لە کەنیسەی - مادۆنادل ئۆرتووە- لە شاری بووندەقیە .

## ١٥٩٥

١٥٩٥/١/١٦ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان موورادی سێیەم ، لە تەمەنی ٤٩ سالیدا کۆچی دوایـی کـردووەو گۆرەکـەی لـە شـاری سـۆفیای پایتـەختی بووڵگاریایـە... شایانی باسە سـوڵتان موورادی سـێیەم شـاعیرێکی ناوودارو بەهرەدار بوو، لەگەڵ ئەوەشدا مامەلەی دراووسێی باش بوو لە گەڵ وولاتەکاندا .

## ١٥٩٦

١٥٩٦/٣/٣١ لەدایك بوونی فەیلەسوفی بیرکاریزانی ناوداری فەرەنسی - رینیە دیکارت - هـەروا بـە - کاریتـسۆن - یـش ناسـراوە .... شـایانی باسـە دیکـارت بەیـەکێ لەدامەزرێنەرانی فەلسەفەی نوێخواز و دامەزرێنەری بیرکاری نوێ دادەنرێت و یەکێکە لـەو زانایانـەی کە زۆرتـرین بەرهـەمی هەمە جۆری هەیـە لەسـەدەی /٢٠ - ٢١ دا .



لەبەر ئەوە دیکارت بەیەکێ لە کلیلەکان دادەنرێت لەشۆرشی زانست و شارستانیەتی تازەداو نـاوی ئـەو زانایـە بەئەنـدازەی دیکـــارتی کەلێتوێژینەوەکــــە لەســەر شێووازەکانی دیکـارتی و ئەنـدازەدا ، کـە ئاوێتـە بـووە لەگــــەڵ جـــەبر ... دیکــــارت بەرهەلـستی زۆری بیرۆکـەکانی پـێش خـۆی کـردووە . لـەپێش هەمووییانــــەوە ســــۆزی روح وێرای ئەوەی زۆر لە بیرۆکەکانی لە ئەرستۆو سۆفۆکۆم لەسەدەی شانزەهە ، یاخوود بیرۆکەی ئوگبتین رەگ و ریشەیان هاتبوو .

دیکارت لەدوو خاڵدا بەرهەڵستکاری ئەو قوتابخانەیە دەکات .

یەکەم :- دابەشبوونی جەستە سرووشتیەکان بۆ مادەو وێنە - شێووە رەتدەکاتـەوە هـەر وەکـوو زۆرینـەی فەلـسەفە یۆنانیـەکان رەتـی دەکەنـەوە

دووەم :- دۆزیان ئامانج رەتدەکاتـەوە جا خوودی دۆزەکە سرووشتی مرۆ بێ یان خواوەندی بێت ، لەشێکردنەوەی دیاریدە سرووشتیەکان .

ئــەم مرۆڤــە لەژیانیــدا بــەردەوام بــوو لەخــەبات و هەوڵــدانی لــەپێنا سەرکەوتنی بیرووبۆچوون و هەڵووێستەکانی تاکوو ماڵئاوایی لەفەرەنسا جیهــانی فەلــسەفە کــرد لــە ١٦٥٠/٢/١١ ، بەرهەمــەکانی تــاکوو ئێــستا داهـاتووش سەرچـاوەی زانـست و پەرەسـەندن و پێـشکەوتن و گەشـەدا لەهەموو بوارەکانی لە جیهاندا.

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی ٢/

١٥٩٦/٨/٢٥ لـە کتێبـی شـەرەفنامەی بەدلیسی ، وای دیـار کـردووە کـە کـورد لـە بار کۆمەڵایـەتی و زاراوە دەبێتـە چوار بـەش بـەپێی نووسینەکانی ئـەو کات.. کرمانجی... لوڕ... کەلهوور... گۆران... لە هەمان کات دەڵێ :-




سنووری کوردستان بەخەتێکی راست لە سەر کەنداووی فارسەوە تا کۆتایی مەلاتیەو مەرعەش لە باکووری کوردستان ، کە ئەم هێڵە وولاتی فارس و ئێرانی عەجەم و ئازربایجان و ئەرمەنستانی گچکەو ئەرمەنستانی گەورەیە... باشووری ئێراقی عەرەب و ناوچەکانی موسڵ و دیاربەکرە... پادشایەتی میرانی کوردستان بەناوی هۆزەکانیانەوە ناسراون . وەك :-

ئیماراتی هەکاری و سۆران و بابان و ئەردەلان .

هەروا هەندێکیان ناویان بەبرایی شارو قەلاکانیان هاتوون وەك میرانی ... مەلەنگێف و بەدلیس و جەزیری و حەزۆو ئەکیل و هەروا... شایانی باسە کە کورد زۆر زۆر دەووڵەمەندە لە هەموو بوواره جیاجیاکانی نەتەوەیی و نیشتمان و داب و نەریت و کەلتوورو شارستانیەت و شووێنەوارەکان....!!!؟ .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە هەر نەتەوەیەك لە سەر ئەو پارچە زەویەدا نیشتەجێیەو خاوەنی زمانێکی فرە زاراوە بێ ، بوونی خۆی بە درێژایی مێژوو لە پەرینەوەی قۆناخە یەك لە دوای یەکەکان دەسەلمێنێ .

لەوانەش کورد کە خاوەنی چەندین زاراوەی بە هێزە لە سەر بنەمای زمانی دایك وەك :- زاراوەکانی - کرمانجی ، لۆری ، کەلهووری ، گۆران - دوای ئەوەش :- هەردوو زاراوە بە هێزەکەی کرمانجی و سۆرانی - لە گەڵ ئەوەشدا زاراوەی هەورامی بە یەکێك لە زاراوە هەرە کۆنەکانی زمانی کوردیە ، کە لە سەردەمی زەردەشتی و ئاینی زەردەشتی و تاکوو ئێستاش ئەم زاراوەیە لە زمانی کوردی ئاخاوتنی پێدەکرێت لە کوردستان .

هەروا چەندین شێووە زاراوەی دیکە هەن وەك :- کاکەیی و شەبەك ، ئەمانە

كه زمانی رەسەنی رێك پێك دێنن له سەر خاكی كوردستان ... مانای وایە تا زماتی كوردی مابێ و بمێنێ ، كورد بوونی بەردەوام دەبێ له هەموو بوارەكان به تایبەتی له هەردوو بواری نەتەوەیی و نیشتیمانیدا .

دەبێ ئەم راستیەش بلێین ، كه یەكێك لەو زاراوە زمانەی كوردی نەماو كۆتایی پێهات . ئەوا زاراوەكانی دیكه كۆتاییان پێ نایەت ...نەك وەك نەتەوەیەك زمانەكەی بێ زاراوەی جیاجیایە ، زمانی كوردی زمانێكی زۆر دەوڵەمەندە له هەموو روویەكی زمانەوانی و هەر ووشەیەكی چەندین مانای خۆی هەیە ، له ناورستە جیاجیاكان . له رستەی رامیاری و له رستەی شیعر و له رستەی رۆمان و له رستەی كۆمەڵایەتی و له رستەی پەخشانە وله رستەی نووسیندا .

كه هەر ووشەیەك له بواری نووسینێك جێگەی خۆی دەكاتەوە لەسەر بنەمای رێزمانی زمانی كوردی و بەراووردكردنی له گەڵ زمانەكانی دیكەی نەتەوە جیا جیاكان له جیهاندا .

١٥٩٦/٨/٢٨ شەرەفنامەی بەدلیسی وای راگەیاندووە ، كه كورد له بارەی كۆمەڵایەتی و زاراوەیی دەبنە چوار بەش. ئەویش :- كرمانجی - لۆر - كەلهوری - گۆران - .... هەروا دەڵێ :-

سنووری كوردستان :- بەخەتی راست له سەر كەنداوی فارسەوە تابرانەوەی - مەلاتیا - و - مەرعەش - دەچێ . باڵی باكووری ئەم خەتە وولاتانی فارسی و ئێراقی عەجەم و ئازربایجان و ئەرمەنستانی گچكه و ئەرمەنستانی گەورەیە .... باشوریشی ئێراقی عەرەب و ناوچەكانی موسل و دیاربەكرە ... هەر وەك لەنەخشەكەیدا هاتووە لەلاپەرە / ١٢٨ .

هەروا پادشایان و میرانی ئازای كوردستان بەناوی هۆزەكانیان ناسراون . وەك :- هەكاری ، سۆرانی ، بابانی ، ئەردەلان ... هەندێكیشیان ناویان وێرای شارو قەڵاكانیان هاتوون . وەك میرانی :- حەسەنكێف ، بەدلیس ، جەزیر ، حەزۆ ، ئەكیل ، هیتریش . هەروا دەووڵەتەكانی !- مەریوان ، حەسنەدی ، لۆری مەزن : - مەزلەوی - لۆری بچووك - ئەیوبیەكان ، كه پادشای میسر و شام بوونه . هەرو١٠ دەڵێ :- شادی كوری مەروان :- باپیری سەلاحەدینی كوردی بووە - رەوەندی دوین - بوو .

١٥٩٦/٨/٢٨ تا ئەم مێژووە فەرمانرەوایانی فێنك بەردەوام بوونە ... كە دانیشتووانی ناوچەی فێنك لە چوار هۆز پێك هاتوون — یەجنویی . شوقاقی ، میران . كۆینە — فەرمانرەواكانی فێنك دەچنەوە سەر میر ئەبدالی كوری سولەیمانی كوری خالید . كە سولەیمانی كوری خالید لە هەرێمی جەزیرە كۆچی دوایی كردو كورەكانی وولاتەكەی باوكیان لەناو خۆیاندا دابەشكرد كە ناوچەی فێنك بەر ئەودال كەوت .

ماوەیەكی زۆر میر ئەبدال لەو ناوچە دەسەلاتدار بووە و دوایی كۆچی دوایی كردووە ... نەوەكانی ئەو ناوچەیان لە بەر دەست بووە ... بەلام پاش مردنی ئەودال نۆركە ئاق قوینلوو لەبەر دەستیان دەرهێناون و داگیریان كردووە و ماوەی سەدساڵ لەبەر دەستیان ماوەتەوە ... لەدوای ئەو ماوە دوورو درێژەدا ، كە داگیركەرانی ناوچەی فێنك ئاق قلوینلوو بەرەو نەمان چوون لە ناوچەكەدا .

دووبارە ئەو بنەماڵەیە گەرانەوە سەر شووێنی خۆیان لەناوچەی فێنك و كەس پەلاماری ئەو بنەماڵەی نەداوە ، كە دەسەلاتیان بەسەر ناوچەكەدا دەرۆیشت لەهەموو بوارێك تەنیا ... جارێك نەبێت لەسەر دەمی مەزنایەتی شا عەلی بەگ ، كە فەرمانیرەوایی جەزیر بوو . دەستی بەسەر ناوچەی فێنك دا گرت و دای بەمیر محەمەدی برای ... بەلام دووبارە بەیارمەتی خوودی فەرمانرەوایانی جەزیر ناوچەكە دراوەتەوە دەست بنەماڵەو نەوەكانی میر ئەبدال ... ناوچەی جەزیر كەوتۆتە باكووری رۆژئاوای مووسڵ و ناوچەی فێنكیش هەر لە ناو هەرێمی جەزیرەیە لەباشووری كوردستان.

سەرچاوە — شەرەفنامە — لاپەرە /٣٢٤/٣٢٥ .

تێبینی :— فەرمانرەوایی حەسەن كێف كە بە — مەلكان — بەناوبانگن . بەلام ئەمین زەكی بەگ دەڵێ :— ئەم نازناوە لە مەلكاتیەوە هاتووە ، كە یەكێكە لە سێ مەزهەبی مەسیحی ئەویش:—

مەلكاتی ، یاقووبی ، نەستۆری ، كە سەر بە قەددیس ئەنتۆنیۆس بوون . بەلام هەندێك لە كوردە مەسیحیەكان بە ناوی مەزهەبەكانیان ناوزەندكراون ... كۆمەڵێك لە مێژوونووسان لایان وایە كە :—

نەستوریەكانی مووسڵ ، یاخوود لای مووسڵ ، كە ئێستا بە خۆیان دەڵێن .

ئاشووری و مەسیحیە یاقوبیەکان ... کە سەردەمێك – جۆزقان – یان پێ دەگووتر ... ئەمانە بە رەسەن کوردن .

١٥٩٦/١٠/٢٦ بە هاوکاری و هەماهەنگی یەکتر هێزەکانی سووپای مەژەرو شانشینی نەمسا ، دەشتایی کرزنیان وویران کرد لە نزیك قەڵاو بووە هۆی بەردەوامی شەڕ لە نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی بە داگیرکردنی وولاتانی بەرهەلستکارانی دەسەڵاتی عوسمانی لە ناوچەو هەرێمەکاندا .

## ١٥٩٧

١٥٩٧/٨/١٣ کتێبی شەرەفنامە لەلایەن – شەرەفخانی بەدلیسی – بەدەست نووسراوەتەوە ، کە لە پەرتووکخانەکانی – ربۆدلن و ئەستەمبوڵ و پرینستۆی ئەمەریکاو پەرتووکخانەی کۆمەڵەی شانشینی ئاسیا لە بەریتانیاو پترسبۆرگی پایتەختی ئەو کاتی روسیای قەیسەری – هەن و هەڵگیراون ، کە بە سەرچاوەیەکی گرنگی مێژوویی کوردوکوردستان دەژمێردرێت ، بەتایبەتی لەبوواری نەتەوەیی و نیشتمانیدا . ئەویش بە درێژایی مێژوو وەك بەلگەنامەیەکی نێوو دەووڵەتی لە جیهاندا .

## ١٥٩٨

١٥٩٨/٤/١٥ مۆرکردنی پەیمانی نێوان هەردوو مەزهەبی کاسۆلیك و پرۆتستانتی مەسیحی ، لە دوای هەشت شەڕی دژووار لە نێوانیاندا ، بە ناوی پەیمانی – نانت – کە بە تەواوی دان بە برووای مەزهەبە جیاجیاکانی ئاین نرا ، لە فەرەنسا و تاکوو ئێستاش ئەو رێکەووتنە لەکار پێکردنی بەردەوامە ، لە لایەن جیهانی مەسیح لە جیهاندا .

## ١٦٠٠

١٦٠٠/٧/١٣ کەسایەتی کوردی ناودار ئیسمائیل مەلا حوسین لە مێژووی ئەردەلان زۆر لە سەر هەلۆخانی نووسیووە کە دەڵێ :–

هەلۆخان پیاوێکی زۆر دەست رۆیشتووبووە و وولاتی خۆی ئاوەدانی بەئیرۆ

کردووە . جگە لەقەڵای – زولم – کە پایتەختی بووە ... سێ قەڵای دیکەشی دروستکردووە کە ئەوانیش :–

قەڵای حەسەن ئاوا لەسەرلوتکەی کەژێکی بەرز . هەروا قەڵای پلەکانیشی دروستکردووە لەناو جەرگەی وولاتی گۆراندا . قەڵای مەریوان بوونی و گەنجینەی لەزێرو زیوو و ئاخناى هەبوو .... هەروا چەندین فێرگەو مزگەووت و تەکیەو خانەقای ئایینی لە کوردستان دروستکرد بوو ... ئەم کەسایەتیە باکی بەکەس نەبوو ، لە کەس نەدەترساو لەهەمان کات هەردوو دەسەڵاتی عوسمانی و فارسی لەهەڵۆخان دەترسان .

لەو کاتەشدا شا عەباسی سەفەوی فارس ، بەنیازی داگیرکردنی وولاتەکەی هەڵۆخان بوو ... بەهێزێکی گەوورە هێرشی کردە سەر لە نزیك شاری هەمەدان لە رۆژهەڵاتی کوردستان ، لە گوندی – سەهیم – تووشی شەڕ هات لەگەڵ هێزی هەڵۆخان ، ئەم گوندە لەژمارە /٦ ی گۆڤاری گەلاوێژدا بە – میهەم – نووسراوەو گوندێکە ، کە ٩٥ کیلۆمەتر لە شاری سنە دوورە – عەلی بالی زەنگەنە ، کە کوردێکی نزیك بوو لەشاو راووێژکاری بوو و ئامۆژگاری شای کرد ، کە ئەگەر بەشەڕ هات لەگەڵ هەڵۆخان لەوانەیە نەتوانێ بەسەر هەڵۆخان سەرکەێ .

بەڵام لەرێگەی راووێژکردنی کوردە خۆ فرۆشەکان بۆ شاو ، شاش دەستی کرد بە پەیوەندی بەستن لەگەڵ هەڵۆخان لەپێناو لەناوبردنی ، جا بەهەر شێووەیەك بێت . لە ئەنجامدا وای کرد کە هەڵۆخان سووێندی گەوورە بەسەر شا عەباس بخواردایە .

هەر لەپێناو لەناوبردنی داوای لە هەڵۆخان کرد ، کە خانی ئەحمەد خانی کوری بنێرێتە لای بۆ ئەسفەهان کە هەڵۆخانیش خان ئەحمەد خانی بۆ ناردو شا عەباسیش رێزی لێگرت و خاتوو کلاو زێری خوشکی خۆی لێ مارەکردو کردیە هاوکاری کردنی خۆی و چەندین کاری گرنگی پێ سپارد لەهەموو بوارەکانی کاروباری دەسەڵاتی شا عەباس .

لە هەمان کات کردیە بەپرس و راووێژکار ، لە ئەنجام نازناوی نا بە والی کوردستان و لەشکرێکی زۆری خستە ژێر دەسەڵات و ناردیە سەر هەڵۆخان .

لەو کاتەش هەڵۆخان لە قەڵای حەسەن ئاوابوو... لە دوای گەمارۆدانی قەڵای

حەسەن ئاواو بە سەرنەکەووتنیان پیلانێکی گەورەیان نایەوە ... ئەویش کا ژنــی خــان ، کــە دایکــی ئەحمــەدخان بــوو لەگــەڵ مــەلا یـاقووتی هــاودەمی هــەلۆخان خیانــەتیان بــە مێــردو ئاغـا کـردو بەدزیــەوە رێکــەووتن و دەرگـای قەلاّیان داگیرکردو هەلۆخانیان بە دیل گرت و رەوانـەی ئەسفەهانیان کرد بۆ شاعەباسی سەفەوی فارس .

ئەمە خیانەتی کورد بوو لەگەڵ کورد بۆ دووژمنی کورد ... نووسەر :-
واتــە هــەلۆخان بەدەســت بەســەری لــەلای شا عــەباس مایــەوە تـاکوو کۆچـی دوایــی لــە شــاری ئەســفەهان کــرد.... دوای ئــەوە حــووکمرانی ئــەردەلان و شارەزوور کەوتە دەست خان ئەحمەد خانی کوری هەلۆخان و جێگەی باوکی گرتــەوە .... دووژمــنی کــورد بــە هــەموو بارێــك ســەرکەووتنی بەســەر کــورد مــسۆگەرکردووە ، بــەهۆی خیانــەتی نــاو مــاڵی کــورد لەگــەڵ یــەکتر لــەپێناو بەهێزکردن و خزمەت کردنی دووژمن لەسەر خاکی کوردستان .
سەرچاوە :- شەرەفنامە – لاپەرە /٢١٣ – ٢١٤ – ٢١٥ .

١٦٠٠/١٢/٣١ دامەزراندنی کۆمپانیای هندی رۆژهـەلاّت ، کە بـەناوبانگترین کۆمپانیایە لە مێـژوودا . کە ئـەو کۆمپانیایـە رۆڵی سـەرەکیو بنـەڕەتی هـەبوو لـە ململانێـی نێــووان فەرەنــساو بــەریتانیاو ئیمپراتۆریــەتی عوســمــانی لــە رۆژهــەلاّتی ناەراســتو کیــشووەری ئاســیادا ، ئــەویش بە بــەردەوام بــوون لـە ســەر ئــەو رامیاریەتــە تـا گەیــشتە ئــەو قۆناخــەی کــە بــە پێــی نەخــشەکانی دارێــژراوی پەیمانی سایکس -بیکۆی نهێنـی لـە ساڵی ١٩١٦ ، لە سەر دابەشکردنی کوردو خـاکی کوردسـتان بە دامەزراندنی دەووڵـەتی تـازە لەسـەر ئـەو خاکـە وەك ئێرانی فارسیو تورکیای تورکو ئێراقـی عـەرەبیو سووریای عـەرەبیو ئوردنی شانشینیو ئەرمەنستانی ئەرمەن .
بـەلاّم گـەر بـەراووردێکی تووێژینـەوە دار بکرێـت لـە سـەر نەتـەوەکانی چـوار چــێووەی ئــەو دەووڵەتــە دورســـتکراوانە هــیچ نەتەوەیــەك ژمــارەی دانیشتووانەکەی لە ژمارەی دانیشتووانی رەسـەنی خـۆی زیـاتر نیـە – واتـە کــورد- ، بــەلاّم بــە هــۆی هەلکەووتــەی جــووگرافی خــاکی کوردســتانو ناوچەکەو چاوگە نەووتیەکان ، کە پێووەری ئەو دابەشکردنەی پێووە دیار

بوو لە هەمووبوارە جیاجیاکانی رامیاری‌وئابووری و بازرگانی و سەربازیدا . دوا رۆژیشی داگیرکردن بوو لەلایەن بەریتانیاو هاوپەیمانەکان .

لەو کاتەشدا وەك ئیمپراتۆربەتی عوسمانی‌و رووسیای قەیسەری‌و فەرەنساو فارسی سەفەوی‌و عەرەبی ئیسلامی لە دوورگەی بیابانی عەرەبیدا ، هەر چەند کێشەو ململانێ‌و شەڕو پێکدادان لە نێوانیان هەبووبێت ، بەڵام لە سەر کێشە سەرەکیەکان‌و بەرژەوەندیە تایبەتیەکان کۆك بوونە... بەڵام کورد تاکوو ئێستاش...؟...!. لە سەر خاکی کوردستان.

## ١٦٠٢

١٦٠٢/٦/٢٦ شاعەباسی فارسی سەفەوی زیاتر لە ٥٠ پەنجا هەزار خێزانی لە تیرەو هۆزەکانی کوردو جەمشگەزەوکی دیکە لە کوردستان بەرەو دەشتەکانی خوواروی تاران گوواستەوەو لە وویشەوە بەخۆیان‌و مالاتەکانیان بەرەو خۆراسانی ناردن ، لەو کاتەشدا پارێزگاری لە سنووری سەروی رۆژهەلاتی قەلەمرەوی عەجەمی دەکرد ، لە بەرامبەر هەرەشەی ئۆزبەکدا .

هەروا پێی سپاردن بۆ پرکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە ئەو هۆزانە ری‌و شووێنی هێنان‌و جێگیرکردنی هەندێ هۆزە گەوورە شەرکەرەکانی قزلباش بۆ کوردستان دانا .

شایانی باسە شاعەباسی فارسی سەفەوی مەهەب شیعە لە هەوولەکانی درێخی نەکردووە بەرامبەر گەلی کوردستان ، ئەویش بە دوو لایەن کوردو خاکی کوردستانی داگیر کردو لە بە فارس کردن بەردەوام بوو لە هەرێمەکەدا.

یەکەم :- بەردەوام بوو لە راگوواستنی کورد لەسەر خاکی دیرێنی خۆی بۆ جێگەی دیکەو بە جێگە گرتنەوەیان بە هۆزو تیرەکانی فارس .

دووەم :- بەردەوام بوونی بە بەمەزهەب شیعەکردنی بە هەر نرخێك بوایەو بۆی بگوونجایە هەروەك چۆن کورد بە زەبری شمشێر کراوە بە ئیسلام‌و خاکی لێداگیرکراوە لە هەرێمە جیا جیاکان .

## ١٦٠٣

١٦٠٣/٦/١١ لـه کـاتی پـەلاماردانی قـەڵای مـەریوان لـە رۆژهـەڵاتی کوردسـتان ، شـێخ حەیـدەری مـوکری لـە رێـزی سـووپای قزلبـاش دا کـوژراو قووبـادی کـوڕی جێگەی گرتـەوەو لەلایـەن شاعەباس کرا بووە سـەرکردەی گـەورەی هـۆزی مورکریو فەرماندەی مەراگە- مەراغە- لە رۆژهەڵاتی کوردستان .

بەڵام شـاعەباس تـوورەیی کـۆنی بـاوکو بـاپیری خـۆی هـەرمابوو، لـە هـەمان کات لە گەشتەکەی ، کە بۆ ناووچەی موکریـانی کردبووی داخـی دڵـی خـۆی پێ دارشت و تۆڵەی رابردووشی لێکردەوە، کە دوای ماوەیـەك قووبـاد خـانو هاورێکـانی کووشـتو فـەرمانی کووشـتنی بەکۆمـەڵی بـۆ هـۆزی موکریـانی راگەیاند .

١٦٠٣/١٢/٦ سـوڵتانی عوسمـانی سـوڵتان محەمـەدی سـێیەم ، لـە تەمـەنی ٣٧ سـاڵیدا کۆچی دوایـی کـرد ، کـە مـاوەی دەسـەڵاتەکەی ٩ سـاڵ بـووەو لـە دوای خـۆی کوڕەکەی ئەحمـەدی یەکـەم جێگـەی گرتـەوە بـە سـوڵتانی عوسمـانی لـە سـەر ئیمپراتۆریەتەکەدا .

## ١٦٠٤

١٦٠٤/٥/٣٠ نووسەری هاوزانو هاودەمی ئەو کـات مامۆسـتا جـەلال مجـەم کووشـتنی بـە کۆمەڵی موکری لە رۆژهەڵاتی کوردستان لـە لایـەن جەندرمـەکانی شاعەباسـی فارسی مەزهەب شیعە بەم جۆرە باس دەکات لە ناوچەکەدا .

سزای کوردەکانی ئەو کوردانە لە بەردەی شاردنەوەدا مابووەوە . کاتێ کـە پلـەی گـەرمی هـەتاو بـە ١٤ پلـە لـە سـەرەتاندابوو قوبـاد خـان لەگـەڵ ٩٤ کەسایەتی کوردی دیکەی موکری بەکۆمەڵ کووشتو هەر ئەو کـات بریـاری کووشتنی بە کۆمەڵی بۆ کورد دەرکرد. لە سەر خاکی رۆژهەڵاتی کوردستان.

## ١٦٠٥

١٦٠٥/٥/١٩ شاعەباسی سەفەوی فارس لە کورد داخ لـە دڵ بـوو بـەهۆی بەشداری کردنـی کورد لە شەڕی نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانیو فارسـی بـە پشـتگیری کردنـی سـووپای عوسمـانی دژی هێزەکـانی سـووپای فـارس ، لـەکاتی

شەڕەکان هەوڵی کووشتنی شاعەباسیان دا ، ئەویش لە لایەن کوردە چەکدارە موکریەکان .

## ١٦٠٦

١٦٠٦/٧/١٥ نووسەرو هونەرمەندی گەورەو بەناوبانگی هۆڵەندی- رامبرانت- لە شاری لاین لە وولاتی هۆڵەندا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .

## ١٦٠٧

١٦٠٧/١٠/٢٤ بەرپابوونی شەڕی نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی و هێزە چەکدارەکانی میر عەلی جانپوولابەگ ، لە دۆڵی ئەرسەلان بیلی لە باکووری کوردستان ، لە ئەنجامـدا هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی سـەرکەووتنیان بەدەسـت هێنـا لـە ناوچەکەدا .

١٦٠٧/١٠/٢ شەرەفخان لە کتابە بەنرخەکەیدا کە – شەرەفنامە – یە تاکوو ساڵی ١٠٠٥ لەنووسـینەکانی بـەردەوام بـووە ... بـەڵام مـن ئـەم مێـژووەم هەڵبـژارد ، کـە لـەرووداو و روونکردنـەوە نزیکە بۆئـەوەی بابەتەکە بەشـێووەیەکی دروسـت بگاتە ئامانجی خۆی لەتێگەیشتنی وەك سەرچاوەیەکی برواپێکراوی تـەواو . ئەویش :-

ئـەمین زەکـی بـەگ ، لـە بـەرگی یەکـەمی مێـژووی کـوردو کوردسـتان لەلاپەرەکانی / ١٨٦- ١٨٧ دا دەڵێ :-

خانەدانەو بنەماڵەی لەنژاد کورد جانپۆلاد هەر لەکۆنەوە فەرمانرەوایی کلس بـوو ، ئـەو لـە رۆژگـاری – چـگالەزادە – سـەنان پاشـا – دا مـیر حوسـین سەرداری ئەو بنەماڵەی بووە . هـەروا لەلایـەن سـەدری ئـەعزەم ، واتـە سـەرەك وەزیرانی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـان پلـەی جانپۆلاد شـاری حەلـەبی پێدراوە . کاتێ کە سەدر ئەعزەم بەرەو داگیرکردنی وولاتی فارس دەچێ .

لـەوکات مـیر حوسـێن چـەند بیـانوو دەدۆزێتـەوەو خـۆی لـەداواکاری سـەدری ئـەعزەم دوور دەخاتـەوە ... سـەدری ئـەعزەم ئـەو کـارەی مـیر حوسـێنی لـەدڵ گران دەبێ و لەپاش ئەوەی لەشاری تەورێز شکاو گەرایەوە ... میر حوسـێنی بردە لای خۆی و دوایی کووشتی . میر عەلی جانپۆلاد ، کە برای میر حوسـێن بوو . کە هەواڵی کووژرانی براکەی پێگەیشت ، خـۆی گەیانـدە شـاری حەلـەب

و شۆڕشی دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند و تەرابلسی شامی داگیرکردو هێرشی کردە سەر شام و گەلێك ناوچەی خستە ژێر دەستی خۆی . ئەم شۆڕشە هەنگاوی بەرەو بەهێزبوون دەناو لە ئەنجام دەوڵەتی سەربەخۆی لەشام دامەزراند .

دوای ئەوە هێزێکی گەورەی پێکەوەناو دراوی بەناوی لێدا ... دوای ئەوە پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ – ئەرشیدۆك فەردیناند –ی پادشای – تۆسکانا – لە ١٦٠٧/١٠/٢٤ مۆرکرد ، تۆسکانا دەوڵەتۆکەیەك بوو لەئیتالیاو هەوڵیدا لەگەڵ دەوڵەتانی دیکەش ڕێکەووتن مۆربکات .

بەڵام سەرەك وەزیرانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی – قویوچی موراد پاشا – کە کرابووە سووپا سالاری هێزەکانی سووپای عوسمانی ، فەرمانی پێدراو بوو شۆڕشی ئەنادۆڵ لەناوببات ... وەزیری ناوبراو هەوڵیدا بەر لەهەموو شتێك هێزی جانپۆلاد لەناوبەرێ و لەدوایی بگەرێتەوە سەر ئەنادۆڵ . هێزێکی ٤٠٠٠٠ چل هەزار سەربازی لە تورك و کورد بەسەرکردایەتی زولفەقار پاشا بردەسەر میر عەلی کە میر عەلیش بە ٢٠٠٠٠ هەزار چەکدار لەدەربەندی – بوگراس– ڕووبەڕوویان بووەوە .

بەڵام موراد پاشا ئەو ڕووبەڕووبوونەوەی لەو دەربەندە بەباش نەزانی و ڕووی کردە دۆڵی – ئەرسەلان بیلی – بۆئەوەی پشتی جانپۆلاد بگرێ . لە ئەنجام شەڕی نێوانیان بەرپابوو . لە ئاکامدا جانپۆلاد شکستی هێناو جانپۆلاد ناچار بوو بەرەو شاری حەلەب بگەرێتەوە . بەڵام بەهۆی شکانی هێزەکەی . نەیتوانی لەحەلەبیش خۆی بگرێ ڕووی لەئەستانە کردو داوای لە سولتانی عوسمانی کرد یارمەتی بدات و سولتان ئەحمەدیش بەخشی و کردیە بالیۆز لە نەمسا .

برا بچووکەکەی کە میر عەلی بوو ناردیە فێرگەی تایبەتی بارەگای یاسایی . بەڵام موراد پاشا ئەو لێخۆش بوونەی پادشای لێخۆش نەهات ... لەرێگا کە لەو کاتەی جانپۆلاد بەرەو مشەوار دەچوو لەناو قەڵای بیلگرادا کووشتیان .

لێرەدا وا دیارە کە میر عەلی کوری میر حوسێن یا برازای بووە ... چونکە شەرەفخان ناوی دە کورە ماوەکانی جانپۆلادی هێناوە ناوی عەلی نەبردووە . ئەوەو بنەماڵەی جانپۆلاد تاکوو ئێستاش ماون و لە وولاتی لوبنان نیشتەجێن و دەژین و بوونی کوردایەتی خۆیان لەیاد کردووەو گەر جار جار

چاوپێکەووتن بکەن لەگەڵ ڕاگەیاندی کورد دەڵێن ئێمە کوردین . لەوانەش کەمال جمبلات ، ولید جەمیلات ، کە نەوەی جانپولادن ، کە ڕۆڵی باڵایان هەیە لە ڕامیاریەتی و ڕامیاری دەسەڵات و ئابووری و سەربازی و چەندن لایەنی دیکە ، کە بەدروز ناوزەندن لە شامدا.

## ١٦٠٨

١٦٠٨/١٢/٤ ئابلۆقەدانی سووپای شا عەباسی یەکەمی سەفەوی لە قەڵای دەمدەم و توندکردنی ، لە هەمان کات دەوورەگرتنی لە بەرگری لە خۆ کردن لەلایەن کوردە برادۆستەکان بە سەرۆکایەتی ئەمیر خانی لە پەزێرین لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان .

١٦٠٨/١٢/٥ لە ئاکامی کێشەی بەردەوام بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی قەڵای دەمدەم لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە نێوان هێزە چەکدارەکانی کوردو هێزەکانی سووپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ناوچەکەدا .

١٦٠٨/١٢/٥ هەڵگیرسانی داستانی قەڵای – دەم دەم – لە ناوچەی موکریان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ... ئەویش گەواهی خۆراگری و ئازایەتی گەلی کورد بەرامبەر داگیرکەرو زولم و ستەم دەردەخات بە خەبات و قوربانی دان لە پێناو ئازادی و سەربەستی لە سەر خاکی کوردستاندا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ئەم داستانە لەلایەن نەبەردی و قارەمانیەتی هۆزی برادۆستی موکریان دەسەلمێنێ ... داستانی قەڵای دەم دەم ڕاستیەکی بەڵگە نەویست بووە ... چونکە دووژمن بەدەستی خۆی ئەم ڕووداوەی تۆمارکردو ئەویش – ئەسکەندەری مۆش– ی چیرۆکنووسی شا عەباس فارسی سەفەوی لە ئێرانی ئێستادا .

ئەم داستانە بەناوبانگە بە سەرکردایەتی – خانی لەپە زێرین – بووە کە دەستێکی فەوتا لەکاتی پاڵپشت و هاوکاری کردنی کورەکانی شۆڕانی لەداستانەکەدا . بە هۆی لێهاتوویی و ئازایەتی ئەم سەرکردەیە شا عەباس زۆر ڕێزی لێگرتووە و کردوویەتیە بەحاکمی ورمێ و شنۆو مەرگەوەرو تەرگەوەر . پایەی – خانی – ئەمارەتی خێڵەکانی برادۆستی پێ بەخشیووە ئەم سەرکردەیە بەهۆی ئازایەتی خۆی توانی بەشێکی زۆر دەسەڵاتی عوسمانی بهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆی شا عەباسی سەفەوی فارس ... لەبەر

ئـەوەی دووژمنـانی کـورد چـاویان بەسـەرکردەی کـوردو خـاکی کوردسـتان هەڵنەهاتووەو بەردەوام بوونە لە دارشتنی پلان نانەوە بەتێکدانی نێوان خان و شا عەباس .

ئـەویش بە بیانووی پرووپووچی مەزهـەبی ئایینی ، کـە خـانی لـەپ زێرین مەزهەب سوونەی ئیسلام بووەو فارسیش مەزهەب شیعەی ئیسلام بووە هـەروا ترسـێکی دیکـەی وەهمـی پەیدابوو لەبەهێزبوونی دەسـەڵاتی کـورد ناحەزانی خانی شایانی خستە دڵە راوکێ ... تا کار گەیشتە ئەو ئاستەی کە ئـەو قەڵایـەی بـە بریـاری خـۆی لـە موکریـان بنیـات دروسـت بکـرێ . وازی لێبهێنـرێ و تەواونـەکرێت ... کـە ئەمـەش پاشـگەزبوو لـە بریارەکـەی شا عەباس ... میر خانیش دەبووایە خۆی و هێزەکانی خۆیان بەدەستەوە بدایە رێز لەو بریارە بگرن ، لە پێناو ئاو و خاکی خۆیان بەرگری بکەن ... خانی لەپە زێرین ملکەچی ئەو بریارە نەبوو .

بەڵکوو بریارێکی دیکەی شا عەباسی شکاندا کە دەبێ ٨٠٠٠ هەشت هەزار چەکداری جەلالی لەکۆی ٢٠ بیست هەزار چەکداری خۆی دابمەزرێنێ . میر خـان هـەردوو بریارەکـەی شـای شـکاند... یەکـەمیان:- قەڵاکە بووە موڵگەی جێگـای خـۆی ... دووەمیـان :- نەیدەویـست هێـزی دیکـە لەگـەڵ لەشـکری خـۆی تێکـەڵ بکـات ... تـاکوو خیانـەت و یـاخی بـوونی تـووش نـەبێت لەخەڵکانی دیکەی ناو برادۆستیەکان .

بۆیـە شـا عـەباس - معهـد الدولـە - ی بـە ٢٥ بیسـت و پێـنج هـەزار کـەس لەسـوارو پیـادە لەگـەڵ چەك و تەقەمـەنی و تـۆپ خانەیـەکی زۆر نـاردە سەر قەڵای دمم دمم ، کە قەڵاکە یەك هەزار جەنگاوەری تیابوو لەهێزەکانی میرخان ... فارسەکان بەهاوکاری جەلالیەکان و قزلباشیەکان دەستیان بەهێرش کرد ... ئەم شەرە چەند مـانگی خایاندو بەو هۆیـەش معهد الدولە سەری نایەوە بەهۆی سەرنەکەوتنی لەم داستانەدا .

شا عەباس لەجێگەی معهد الدولـە محەمـەد بەگ بێگدەلی کـردە سەرکردەی لەشـکرەکە لەهـەمان کاتیـشدا - پیربـووداف خـانی - ی حـاکمی تـەورێزیش بەهێزێکی گەوورە لەو شـەرە بەشداربوون ... دووژمن بەهۆی ژمارەی زۆری و چـەکی زۆرو تەقەمـەنی و زۆری ئازووقـە توانیـان چـەندین لـە بورجـ

رووخاوەکانی قەڵاکە داگیربکەن ...جەنگاوەری قەڵاش لەپاش چەند مانگ خۆراگری لە کەمی ئاوو خواردن و کەمی ژمارەیان بەراورد بە ژمارەی دووژمن و لەپاش شەڕێکی خوێناوی تەنها – قەڵای ئارین – یان بەدەستەوەما بەسەرکردایەتی خانی لەپ زێرین و لەدوای شەڕێکی درێژ خایەن دەستی کرد بە گفتووگۆکردن ... بەڵام خانی لەپ زێرین بڕوای بە دووژمن نەبوو و بەردەوام بوو لە داستانەکە تاکوو جەنگاوەرو خانی لەپ زێرین شەهیدکران لەسەر خاکی کوردستان .

## ١٦٠٩



١٦٠٩/٤/٦ ئەمیرخانی برادۆست کە بە – ئەمیرخانی یەك دەست – و –خانی لەپ زێرین– ناودار بوو ، بەکردەوە بالاترین دەسەڵاتداری ناوچەکانی خۆر ئاوای دەریاچەی ورمێی رۆژهەلاتی کوردستان بوو، کە لەلایەن شاعەباسەوە بە دادوەری ورمێ داندرابوو، ئەویش بەسەرکردایەتی کردنی گەورەی خێڵەکانی تەرگەووەرو مەرگەووەرو سۆماو برادۆست و مورکیانی دەکرد ، لەو کاتیشدا قەلای دەمدەمی لە نزیك شاری ورمێی ئاوەدان کردەووەو تادەهات قەلاکەی توونـدتر دەکردو هێزەکانی خۆی زۆرترو زیاتر پرچەك دەکرد لە پێناو بەرگری کردن لە قەڵاکە لە ناوچەکەدا .

شاعەباسی فارسی لەخانی لەپ زێرین کەووتە گومان ، لەو خۆسازدانە ، کە ئامانجی سەربەخۆیی رۆژهەڵاتی کوردستان بوو، لە بەر ئەوە کەووتە خۆ لە پێناو مەهانە پێ گرتن لێی ، دوای ئەوە هێزیکی گەوورەی ناردە سەری و پاش شەڕیکی سەخت و خووێناوی ئابلوقەی درێژخایەنی قەلاکەی دا .

لە ئەنجام داگیری کردو هەزاران هاووڵاتی کورد بوونە قوربانی ،کە ئەم

رووداوە بۆتـە داسـتانێکی قارەمانانـەی تێکۆشـەرانی گـەلی کوردسـتان لـە بەرامبەر هێرشی درندانەی داگیرکەری فارسی سەفەوی مەزهەب شیعە ، لە وولاتی فارس بۆ سەر گەلی کوردستان لە رۆژهەلاتی کوردستان .

## ١٦٠٩

١٦٠٩/٨/١٩ سولتانی عوسمانی سولتان مووراد خانی چوارەم لە دایك بووەو لە دوای لابردنی مستەفای برای لە دەسەلاتی بەرێوەبردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئەو جێگەی گرتەوە لە ماوەی دە ساڵدا لە سەر دەسەلات .

## ١٦١٠

١٦١٠/١/١٠ لـەدوای پیـزانینی شانـشینی ئەسـپانیا – فیلیپـی سـێیەم – بـەوەی کـە ئەوانەی بونەتە مەسیحی و لەهەمان کات بروایان پێ نیە و بۆنە ئاینیەکانی ئیسلام بـەنهێنی لەئیسپانیا ئـەنجام دەدەن ، لـە بریارێکـدا بـە مەرسوومی شانـشینی ، کە مۆلەتی ٣٠ رۆژی پێدان لـەخاکی ئیسپانیا بچنە دەرەوە و دوای ئەوە کردیە ٢٠ رۆژ لە وولاتەکەدا .

١٦١٠/٣/٢٦ شا عەباسی سـەفەوی دەسەلاتداری فارسـی لـە ئێران لـە دوای داگیرکردنـی قەلای دەمـدەم و نەهێشتنی دەسەلاتی ئەمیرەکانی کورد بە تایبەتی خانی لـەپزێرین لـە وویلایـەتی ورمـێ و دەووروبـەری... دوای ئـەوە سـپاردنی دەسـەلات لـە ناوچـەکەدا بەکاربەدەسـتانی فارسـی ، دوایـی راسـتەوخۆ هێرشـێکی بـەرفراوانی کـردە سـەر ناوچـەی موکریـانی لـە رۆژهـەلاتی کوردستان.

لـەوێش کوشـتارێکی زۆری لـە کوردەکـان کـردو ژن و منـدالی بـەدیل گـرتو رەوانەی جێگەی نادیاریکردن .

شـایانی باسـە شـا عـەباس فـەرمانی دا بـەهێزەکانی سـوپا کـە خـۆی لـە ٦٠ هـەزار سـەرباز دەداو شـەرێکی خوێنـاوی بـۆ مـاوەی چـوار رۆژ ئەنجامـدراو بەردەوام بوو .

شایانی باسە ئەمسالە بەسالی بە کۆمەل کوژی هۆزی موکریانی ناوچەی موکریان لە مێژوودا ناوزەد کرا .

## ١٦١١

١٦١١/٣/١٦ گەریدەو مێژوو نووسی ناوداری تورك – محەمەد زیلی دەرویش – ناسراو بە – ئەولیا چەلەبی – لە شاری ئەستەمبوڵی ئێستای تورکیا لە خێزانێکی رۆشنبیر چاوی بەجیهان هەڵهێناوە ... خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەم شارەدا تەواوکردووە ، دوای ئەوە چۆتە قوتابخانەی سولتانی عوسمانی ... دوای تەواوکردنی قۆناخەکانی خوێندنی بۆتە پارێزگاری مزگەووتی – ئایا سۆفیا ، لە شارەکەدا .

هەروا بۆتە ژمێریار لەدیوانی سوڵتانی عوسمانی ، دوای ئەوە چۆتە ریزی – سەباهە – کە جەنگاوەری دەرەبەگەکان بوون لەهێزەکانی سووپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا . دوای ئەوە وازی لەم رێگەیە هێناو دەستی کرد بەگەشتکردن لەتەمەنی ٤٠ ساڵیدا . کە شار بەشارو شارۆچکە بە شارۆچکە و ناوچە بەناوچەو گوند بەگوند دەگەرا ... لەپێناو کۆکردنەوەی زانیاری لەهەموو بوارە جیاجیاکانی دانیشتووان سەرەرای ناخۆشی و ماندوبوونی زۆربەهۆی ناخۆشی و رێگاو نەبوونی کەرەستەی گوواستنەوە لەنێوان ئەو ناوچەو ئەو شارانەی کە پێیدا تێدەپەری .

ئەم کەسایەتیە چ کەنارێك لەکەنارەکانی جیهان نەبێ پێیدا تێپەر نەبووبێ و هەر بەو هۆکارەش نازناوی – بەتووتەی تورکی – پێوە لکێندرا ، بەهۆی تواناو لێهاتوویی و زیرەکی و دڵ فراوانی لەکارەکانیدا ... کە مۆرتان – j.H.mokdtmann – بەم شێووازە باسی لێکردووە کە کتابەکەی – کنز کامل للمعارف المتعلقه بالجغرافیه و بأمور الحیاه الأجتماعیه و عادات الشعوب – کە ئەم مرۆڤە لەهەموو بوارەکانی دروست بوونی کەسایەتی جێگەی سەرسوورهێنەر بووە .

دوای ئەوە شەش بەشەکەی ئەولیا چەلەبی بەناوی – سیاحەتنامەسی – لەساڵەکانی ١٨٩٦ – ١٩٠١ بە چاپگەیاندراوە بەناوی تەواوی خۆی – تأریخ سیاح – هەروا بەشەکانی ٧ – ١٠ لەساڵی ١٩٢٨ و ١٩٣٥ – ١٩٣٨ بە چاپگەیەندراوە ... ئەم کەسایەتیە بەدەیا بەرگ لە نووسینەکانی بەچاپگەیەندرا .

لەوانــەش ئــەو بەشــەی کــە لەســەر کــوردو کوردســتانی نووســیووە بــە تێبینیەکانی لەدوای گەرانەکەی بەخاکی کوردستان لەسالی ١٦٤٨ و سالی ١٦٤٨ بۆ جاری دووەم ... کە بەشێوەیەکی گشتی بەهەموو کوردستاند سووراوەتەوە ، بە دۆل و دەشت و شاخەکان و گوندو شارۆچکەو شارەکاند کە بە شاری هەولێرو مووسل و عمادیەو جەزیرە – بۆتان – و حەسەن کێف ... کە سوورانەوەی ئەم کەسایەتیە بەخاکی کوردستان گرنگیەکی مەزنی هەبوو لەروونکردنەوەی چەندین لایەندا .

کە ئەمرۆ بۆ کورد سوودمەندە ، کە ئەولیا چەلەبی لە نووسینەکانی بە شێوەیەکی سرووشتی ووشەی کوردستانی بەکارهێناوەو سرووشتی ووشەی کوردستانی بەکارهێناوە و ئەو ناوچەیە بووە ، کە چیاییەو رووبارو زێی لێ هەلقولاوە . کە هەموو لە زێی دیجلەو فوورات خۆی گرتۆتەوە ... ئەولیا چەلەبی زۆر زانیاری لە بوارەکانی رامیاری و ئابووری و سەربازی و کۆمەلایەتی و چەندین لایەنی دیکە لەسەر کوردو خاکی کوردستان تۆمارکردووە ، لەسەدەی هەڤدەمدا . کە هەموو زانیاریەکانی سوودمەندبوون بۆ ئەمرۆی گەلی کوردو داهاتووی کورد لەناوچەو هەرێمەکانی دەوروووبەری کوردستان .

١٦١١/٨/٥ لە دوای چەندین سال هێزەکانی سووپای فارسی سەفەوی مەزهەب شیعەی ئیسلام ، بە سەرکردایەتی شاعەباس تووانی ناوچەکانی ژێردەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بگەرێنێتەوە ژێر دەسەلاتی خۆی لە هەرێمەکانی ئێراقی ئێستاو سەلمان پاکو تەبریزو وانو چەندین ناوچەی دیکە لە باکوورو رۆژهەلاتی کوردستان .

کە لە شەرە دژووارەکانی ئەو کات دەژمێردرێت لە نێوانیاندا و بە نۆبە ئەو ناوچانەیان دەکەووتە بەردەست ، کە هەمووی خاکی داگیرکراوی کوردستان بوو، لە ئەنجام پەیمانی ئاشتیان مۆر کرد بەشێووەی کاتی کە مۆرکردنی ئەو جۆرە پەیمانانە لە پێناو دووبارە خۆ ئامادە کردن بوو بۆ شەرێکی دیکە لەسەر خاکی کوردستانو گەلانی دیکەدا .

## ١٦١٤

١٦١٤/٣/٣١ کۆچی دووایی نیگارکێشی سەردەمەکان – دۆمەنیکۆ گریگۆ – لە ئەسپانیا ، کە بە هونەرمەندێکی بلیمەتی ئیسپانی ناسراو بوو.

## ١٦١٥

١٦١٥/١/٣١ خان ئەحمەد خانی باوك کووژ دەسەڵاتی گرتە دەست و شاری – سنەی – کردە پایتەختی خۆی و بەبێ ویژدانانە هێرشی بردەسەر هۆزەکانی بلباس و دانیشتووانی ناوچەی موکریان و شارەکانی – ساباڵاخ و ورمێ و مەراگ لە رۆژهەڵاتی کوردستان ، داگیرکرد .

ئەمەش لەدوای شەڕێکی خوێناوی کە لەهەردوو لای هێرشبەرو بەرگری کەر بەسەدان کەس کووژران... دوای ئەوەش پیاوەکانی خۆی لەسەر ئەو جێگایانە دانا ، دوای ئەوە بەرەو شارۆچکەو ناوچەکانی رواندزو هەریرو کۆیەو ئامێدی و لە ئاکام خستیە ژێر دەستی خۆیی و هەریەك لەوانە پیاوەکانی خۆی لەکوێخواو بەرپرس دانا ، کە ئامۆزاکانی کە کورانی بارامی سۆرخاب بەگ بوون و هەریەکەی مەڵبەندێکی پێ سپاردن ... رواندزی دا بە قەرە حەسەن و ، خالید بەگی ناردە شەقڵاوەو شەنگاڵ و بەشێك لەناوچەی ئامێدی خستە بەر فەرمانی عوسمان بەگ.

هەروا بەردەوام بوو لە هێرش کردنە سەر هۆزەکانی خالتی و ئێزیدیەکان کە هەردوو لایەنی هێرشبەرو بەرگری کەر زیانێکی زۆریان لێکەووت لەئاکامدا عەلی بەگ زەلمی لەشەڕدا کووژرا ....ئەنجام خان ئەحمەد خانی سەرکەووتنی بەدەست هێناو بەرەو شاری موسل بەرێکەووت و والی موسل کەلە تورکە عوسمانیەکان بوو هەڵات بەرەو شاری حەلەبی ئێستای سووریا .

دوای ئەوە بەرەو شاری بەغدا بەرێکەووت ، کەماوەی ساڵ و نیوێك گەمارۆی شاری بەغدای دا .

بەڵام نەیتوانی بچێتە ناو شاری بەغدا ... ئەم کارانەی خان ئەحمەد خان لەسەر داوای شا عەباسی فارس سەفەوی بوو ... نەك بۆ کورد ، چونکە گەر بۆ کورد بوایە شا عەباسیش تواناى سەرکەووتنی نە بەسەر هەڵۆخان دەبوو

نـه بەسـەر خـان ئەحمـەد خـان . لەبـەر ئـەوە خـان ئەحمـەد خـان تـوانی دەسەڵاتەکەی لە کەرکوك و شارەزوور و لە ئامێدیەوە تا کرماشـان و هەمـەدان و هەر لەلۆرستانەوە تا ورمێ بسەپێنێ لە کوردستان .

سەرچاوە :- شەرەفنامە -لاپەرە /٢١٥ – ٢١٦ – ٢١٧ .

## ١٦١٦

١٦١٦/٤/٢٣ کۆچـی دوایـی نووسـەرو ئـەدیبو روونـاکبیرو هونەرمەنـدی بـەناوبانگی جیهانی – شکسپیر– بووە .

١٦١٦/٩/١٨ نووسەرو روونـاکبیرو گـەڕۆکی بـەناووبانگی ئیتـاڵیو جیهـانی – دیلافانیە – ئـەم نووسـەرو گەریـدە بـە ناوبانگـە سـەردانی وولاتـی نێـووان دووزێـی– میزۆبۆتامیا – ی کردووە ، کە گەشتەکەی بە نـاو خـاکی کوردستان بووە ، کـە لـە باکووری کوردسـتان بـەرەو باشـووری کوردسـتان گەشـتەکەی کۆتـایی پێ هێناوە.

## ١٦١٧

١٦١٧/١١/٢٢ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان ئەحمەدی چوارەم ، لە تەمەنی ٢٨ساڵیدا کۆچی دایی کردووە ، کە ماوەی دەسەڵاتەکەی چوار ساڵ بووە ... بـەڵام بـە هـۆی بـچووکی تەمـەنی عوسمـانی یەکـەمی کـوڕیو لادانـی لـە ڕێنماییـەکانی دەسەڵاتی سوڵتانەکانی دیکەی عوسمانی مستەفای کوڕی ئەحمەدی یەکەم بووە سوڵتانی عوسمانی، بەڵام بۆ ماوەی سێ مانگ ، ئەویش بە نـەتوانینی ، دوای ئـەو عوسمـان خـانی دووەم بـووە سـوڵتانی عوسمـانی لـە سـەر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکەدا .

## ١٦٢٠

١٦٢٠/١٠/٦ لە ناوەندی هێرشەکانی سووپای عوسمانی بۆ سەر وولاتی پۆلۆنیا و سەرنەکەوتنی هێزەکانی سووپای عوسمانی لەو هێرشەدا و کاردانەوەی ناهەمواری کردە سەر دەسەلاتی عوسمانی ، کە بووە هۆی مۆرکردنی رێکەووتننامەی ئاشتی لە نێوان پۆلۆنیاو دەسەلاتی عوسمانی . بەرێکەووتنامەی هاوکاریو دۆستایەتی و بە دەست تێووەر نەدان لە کاروباری ناوچەو هەرێمە جیاجیاکانو هەر یەك لە وولاتەکانیان .

١٦٢٠/١١/٨ ئیمپراتۆر – فردینانـدی دووەمـی – ئەسپانیا لە هێرشێکی بەرفراوانی تووانی سەرکەووێت بەسەر مەزهەبی پرۆتستانتی لە شاری –بۆهیمیای– مەسیحی .
بەیارمەتی هێزە چەکردارانی مەزهەبی کاسۆلیکی مەسیحی ئەسپانی لەشەڕی چیای سپی– جبل الابیض– کە بووە هۆی دەرکردنی – فردریکی پێنجەم – لە خاکی ئەو ئیمپراتۆریەتەو هەموو سامانەکەی بلۆك کرا .

## ١٦٢١

١٦٢١/٦/٢١ لە ئاکامی کێشە دژوارەکانی نێوان بەر هەڵستکارانی دەسەلاتی شایەتی لە ئەنجام بریار درا بە لە سێدارەدانی ٢٧ ئەندامی لۆرداتی بەریتانیا ؛ ئەویش بەهۆی شەڕو پێکدادان بوو لە چیای سپی – الجبل الابیض – لە وولاتەکەدا .

## ١٦٢٢

١٦٢٢/٥/٢ بەهۆی کێشەی نێوان دەسەلاتدارانی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە گەرانەوەی کەسایەتی دەسەلاتی عوسمانی، ئەوە ش بووە هۆی کاردانەوەی دژوار لە ئەنجام سوڵتان عوسمانی دووەمیان تیرۆرکرد ، بە گەرانەوەی دەسەلاتی سوڵتان مستەفا بۆ سەر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا .

١٦٢٢/١١/٥ نووسەرەو شاعیری کورد – ئیبراهیم مەلا – ناسراو بووە بە – کوری مونلا لە – حەسەن کێف – لە پارێزگای دیاربەکر لە باکووری کوردستان چاوی بە

جیهان هەڵهێناوە .
جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ئیبراهیم مەلا لە ساڵی ١٥٨٦ توانی مۆڵەتی ووتار ووتنەوە بەدەست بێنێ لەلایەن قازی – موحیەدین – لە شاری دیمەشق لەشام – دوای ئەوە لەساڵی ١٥٩١ بەرەو شاری حجازی وولاتی سعوودیەی ئێستا بەرێکەووت بۆ ئەنجامدانی کارەکانی حەج کردن ... دوای ئەوە گەراوە شاری حەلەب و دەستی کرد بە خووێندن و نووسین ... ئیبراهیم مەلا باوکی سەرۆکی قازیەکان بووە لەشاری تەورێز لە رۆژهەڵاتی کوردستان . چەندین دانراوو نووسینی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووەو لەشاری حەلەب کۆچی دوایی کردوە .
سەرچاوە:- الاعلام /١/٣٠- خلاصة الاثر/١/١١ – الازهریە /٥/٦٠٦ .

## ١٦٢٣

١٦٢٣/٩/١١ بە هۆی لاوازیو بێ توانایی سوڵتان مستەفا ، ئەویش بە سەرهەڵدانی تەنگژەی دەسەڵاتو ئابووریو پەیووەندی ، کە لە دەسەڵات لادراو مووردای چوارەم جێگەی گرتەوە بە دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی ، لە پێناو بەرەو باشبردنی باری دەسەڵاتی عوسمانی لە هەموو بووارە جیاجیاکاندا .

١٦٢٣/١١/٢٨ شا عەباسی فارسی بەهێزێکی سووپای زۆرەوە گەیشتە شاری بەغداو داگیری کرد ، ئەویش بە پەلاماردانی هێزەکانی سووپاو دامو دەزگاکانی دەسەڵاتی عوسمانی ، لەهەمان کات دەستی کرد بە رەشبگیری گەلانی شاری بەغدا بە پێی ویستی خۆی مامەڵەی لەگەڵ ئەنجام دەدان لە شارەکەدا.

## ١٦٢٤

١٦٢٤/٧/١٤ لە دوای داگیرکردنی شاری بەغدا لەلایەن هێزەکانی سووپای فارس بەسەرکردایەتی شا عەباس ، دوای ئەوە بەرەو داگیر کردنی دەووەرووبەری شاری بەغدا هەنگاوینا لە سەقامگیر کردنی بەرگریو ئارام کردنەوەی بارو دۆخی شارەکەو دەست کردن بە ئەنجامدان لە جێبەجێ کردنی کاروباری دانیشتووانەکان .

## ١٦٢٥

١٦٢٥/١٠/٣ لـە دوای وەرگرتنـی دەسـەڵاتی فارسـی سـەفەوی مەزهـەب شیعەی ئیسلام لەلایـەن شـاعەباس ، سـەرانی خێلـی ئەفشار لـەوە دەترسـان کـە شـا عـەباس تۆڵەی کووشتنی دایکی و باوکییانی لێ بکاتەوە ، لەبەر ئـەوە خێلـی ئەفشار لـە گۆشـەو کەناری ئێرانـدا پـەروازە ببوونو نـەیان دەتـووانی وەکـوو جـاران مامەڵە بکەن و خۆیان لەدەسەڵاتی شاعەباس نزیك کەنەوە لە وولاتەکەدا .

شـایانی باسـە ئـەو حـەوت خێلـە ، کـە خێلـی ئەفـشاریان پـێ دەگـووتنو سەرچـاوەی دامەزرانـدنی ئیمپراتۆریـەتی فارسـی بـوون لـە وولاتـی فـارس بەسەرکردایەتی شا ئیسماعیل ، لەهـەمان کـات ئـەو خێلانـە بەرپرسـیار بـوون لە پەلاماردانو هێرش کردنە سەر کوردو خاکی کوردستان لـە هـەموو بـووارە جیاجیاکاندا .

## ١٦٢٦

١٦٢٦/٩/٢٢ شاهە یەك لـە دوای یەکەکانی دەسـەڵاتی فارسـی سـەفەوی مەزهـەب شـیعەی ئیـسلام لـە ئێـران ، بـە گـووێرەی توانـای خۆیـان درێخیـان نـەکردووەو درێـژەیان بـە هـەمان رامیاریـەتی شـا ئیـسماعیلی یەکـەم دەدا بەرامبـەر بـە کوردو خـاکی کوردسـتان ، کـە ئـەم رامیاریەتـەش لـە سـەردەمی شـا عەباسـدا چووە قۆناخێکی نووێی جێبەجێکردن کە خـۆی لـە چـوار بنـەمای سـەرەکی دامەزرا بوو ئەویش:-

١- گـۆرینی بنـەڕەتی لـە هـەڵ و مـەرجی دیمـووگرافی سـەرووی رۆژهـەڵاتی کوردستانو راگوێزانی دانیشتووانەکەی بۆ ناوچە دوورەکانی سـەرووی رۆژ هـەڵاتی دەوڵـەتی فارسـی ، بەتایبـەتی بـەرەو خـۆراسـان- ئـەحوازی ئێـستا – و هێنـانی دانیـشتووانە ئەزەریـەکان بـۆ هـەرێمی کوردسـتانی لکێنراو بە دەووڵەتی فارس لە دوای شەری جالیدێران لە نێوان هـەردوو ئیمپراتۆریەتی فارسی عوسمانی لە هەرێمە جیا جیاکانی کوردستان .

٢- هەوڵـدان بـەگۆرینی مەزهـەبی دانیـشتووانی کوردسـتان لـە مەزهـەبی سـووننە بـۆ مەزهـەبی شـیعە ، کـە ئەمـەش مالووێرانیـەکی دیکـە بـوو بـۆ نەگەیاندنی کورد بە ئامانجەکان لە کوردستان .

٣- سەركووتكردنی بێ بەزەیی و تووندوتیژی هەموو سەركێشیەكی كورد ، واتە راپەرین و شۆرشەكانی كوردو بەفارسكردن ، كە بە ئاگرو ئاسن وەلآمی دەدرایەوە ، كە ئەو كاتە ئەوەی عەرەب و فارس بە كوردی دەكرد ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئەوەی نەدەكرد .

٤- لە بەر ئەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەبرووای من توركایەتی نەدەكرد ، بەڵكوو دەسەلآتداریەتی بنەماڵە بوو ، لە یەكەم جارو بلاو كردنەوەی ئاینی ئیسلام بوو دووەم جار لە هەرێم و ئەو ناوچانەی كە كەوتبووە ژێر دەسەلآتەكەیان .

## ١٦٢٩

١٦٢٩/٣/٦ بە هاندانی ناوەندەكانی دەسەلآتی پاپا- فردیناڵد - كە قووراوێكی دیكەی گرتەوە ، كە لەو كاتە مەرسوومی پیلانگێری بە گەرانەوەی دووبارە دەسەلآتی ئەمیرەكانی راگەیاند لە ئەنجوومەنی یاسادانان و وەرگرتنی بریارەكان ، لەهەمان كات دەسەلآتەكانی دەستووری پێ نەدرابوو بە گەرانەوەی ئەو سامانانەی كە لە لایەن كەنیسەی كاسۆلیك داگیر كرابوو لە ساڵی ١٥٥٢ تاكوو راگەیاندنی ئەو بریارە لە لایەن فاتیكاندا .

١٦٢٩/٨/٢١ پاش مردنی شا عەباسی سەفەوی فارس - خەسرەو پاشای عوسمانی هێزێكی گەورەی بەرەو شاری بەغدا ناردو لە هەمان كات گەیشتە شاری كەركوك و بەرەو شارەزوور هەنگاوینا و لە ئاكامدا سەید خانی حاكمی ئامێدی و میرە بەگی سۆران و چەندین میری مەزنی دیكەی كورد سەریان بۆ خەسرەو پاشا شۆركردو بوون بە هاوكاری . خان ئەحمەد خانیش لەهەمەدانەوە بەخۆیی و ٤٠٠٠٠ هەزار چەكدار رووبەروویان بووەوەو لەئاكامدا سەركەووتنی بەدەست هێناو شارەزووری لەژێر دەستیان رزگاركرد ، كە مستەفا پاشای ئەرنائۆتیش كە كێخوای و پاسەوانی شارەزوور بوو لەو شەرەدا زامداركرا .

دوای ئەو هەموو كێشەو ململانێیەی نێوان خان ئەحمەد خان و دەسەلآتی عوسمانی و فارس ، كە لەو ناوەندە كورد دۆراندی بەهۆی زیاتر هاوكاری

کردنی دووژمنانی کوردو خیانەتکاری کورد لەگەڵ کورد ، لە پێناو . بەرژەوەندی کورد بەردەوام بووە لەسەر خاکی کوردستان ... دوای ئەوە بەهۆی شکانی هێزەکانی خان ئەحمەد خان بەرەو موسل رۆیشت لەئاکامدا لە ١٦٣٦/٦/٥ لەشاری موسل کۆچی دوایی کردو لەگۆرستانی یونس پێغەمبەردا بەخاك سپێردراوە لە شارەکەدا .

## ١٦٣٢



١٦٣٢/١/٢٤ لە لەدایك بوونی رووناکبیر وفەیلەسوفی ناوداری هۆڵەندی و جیهان – سپینۆزا – لە شاری ئەمستردام . کە هەڵگری بیروبروای ئایینی جوولەکە بووە . لەخێزانێکی جوولەکەی ئەسپانی بووەو بەهۆی ئێش وئازاردانی خێزانەکەی بەبوونیان بەجوولەکە بەرەو هۆڵەندا کۆچیان کرد . ئەم فەیلەسوفە لەلایەن خێزانی و هاورێکانی پەروەردەی بێ وێنەکراوە . لەکەنیسەی جوولەکان لەشاری ئەمستردام خوێندنی – تلموودی –ی تەواوکردووە لە بوارە جیاجیاکانی خوودی ئاینی جوولەکە ، کەزیاتر لە ٢٠ بەرگ بووە .

شایانی باسە کە ئاینی جوولەکە دابەش بە دووبەش دەکرێت ، ئەوانیش:– ئەلمشنا – ئەلچمارا – لەهەمان کات دوو تلموداشی هەیە ئەویش:– یەکەم:– تلمودی ئۆرشەلیم و دووەم:– تلمودی بابلی .

کە لەشاری بەغدا هاتە کایەوە ... ئەلمشنا ناوەرۆکیەتی و جمارا شی کردنەوەیەتی ... بۆ نموونە :– وەك قورئان وتەفسیرەکەی کەچۆن لەدەورووبەری ئایەتەکە دەنووسرێتەوە . سپینۆزا هەندێ لەدانراوەکانی موسای کوری مەیمونی خوێندووە . زانیاری لەسەر رەوەندەکان وەرگرتووە کە ئەویش کتابی سۆفی و جادووکەری جوولەکەکان بووە ... سپینۆزا زمانی لاتینی بەباشی فێربووە .

هــەروا ســپینۆزا پزیــشكێكی زانــستەكانی سرووشــت بــووە . زمانــەكانی ئەســپانی و پرتووگــالی وعــبری و فەرەنــسی و ئیتــالی زانیــووە . ســپینۆز فەیلەســوف و زانایــەكی نــاوداری جیهانیــەو دانــراوە جۆراوجۆرەكــانی لەبوارەكانی زانستی تاكوو جیهانیش ماوە ... دانراوەكانی رۆڵ و كاریگەری و كاردانەوەی خۆی هەیە ، بە تایبەتی لەلایەن نووسەرو دكتۆرو پرۆفیسۆرو زاناكانی سرووشت وفیزیاو كیمیاو ئاژەڵناس وچەندین لایەنی دیكە .

ئەم مرۆڤە لەماوەی ژیانیدا درێخی نەكردووە چ لـە داهێنـان وشـێ كردنـەوەو دانراوی بەنرخ و بەبەهای تاكوو لە ١٦٧٧/٢/٢١ كۆچی دوایـی لەتەمـەنی ٤٥ساڵیدا دەكات لە وولاتەكەیدا .

سەرچاوە:— مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دكتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /١ .



١٦٣٢/٨/٢٩ لە دایك بوونی فەیلەسوف ناوداری ئینگلیـزی – ژۆلم لـوك – لـە شـاری رنگتــۆن لەهــەرێمی سمرســت . دەســت پێكردنــی خووێنــدنی لــە قوتابخانــەی ستمنــستر بــووەو ، دوای ئــەوە لەكۆلێــژی كەنیــسەی مەسیح لەئۆكسفۆرد بەهۆی زیرەكی و لێهــــاتووی هەڵبــــــژێردرا بەقووتابیەكی هەتاهەتایە .

بەڵام لەساڵی ١٦٨٤ ئەو نازناوەی بەفــەرمانی شانــشین لێــوەرگیرا وە . بــەردەوام بــوو لەخووێنــدن لــەبواری پزیشكی وزانست تاوەكوو ناوداربوو بەدكتۆر لوك لە وولاتەكەدا .

لە ساڵی ١٦٦٧ بووە پزیشكی تایبەتی بنەماڵەی ئەنتۆنی ئاشلی كوبر . كە دوای ئەوە بووە ئەبرلی یەكەم لەساڵی ١٦٢١ – ١٦٨٣ . وەزیـری دادو رۆڵـی باڵای بینی لەرووداوە رامیاریە مەزانەكانی كە لە ئینگلتـەرە بەرپابوو لەنێوان ســاڵەكانی ١٦٦٠ – ١٦٨٠ ولــە ســاڵی ١٦٧٥ بروانامــەی ماجــستێری لەپزیشكی بەدەست هێنا .

ئەویش بەهۆی ڕووداوە ڕامیاریەکانی ئینگلتەرە بەرەو پاریس ڕۆیشت و دوای ئارام بوونەوەی بارودۆخەکە لەساڵی ١٦٨٨ گەڕاوە ئینگلتەرەو بەردەوام بوو لەکارە هەمە لایەنەکانی تاکوو لە ١٧٠٤/١٠/٢٨ کۆچی دوایی دەکات لەووڵاتەکەیدا .

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢ .

## ١٦٢٣

١٦٢٣/٦/١٩ لە دایك بوونی فەیلەسوف ماتماتیك و فیزیایی فەرەنسی – بلیز بسكال – لە شاری كلبر مۆن فران لە هەرێمی – ئەفران – لەناوەڕاستی فەرنسا . باوكی سەرۆكی دادگای باجەكان بوو ... بۆ یەكەم جار باسكال لەلایەن باوكیەوە فێری زانست بوو ... دوای ئەوە لەساڵی ١٦٣١ چووەتە شاری پاریس ئەم فەیلەسوفە لەبواری ئەندازیاری توانای بێ وێنەی هەبووە.

هەردوو زمانی یۆنانی و لاتینی بەباشی زانیووە . لەساڵی ١٦٣٩ نامەیەكی داناو لەساڵی ١٦٤٠ بڵاوكرایەوە لەبارەی ژمێریاری . لەبواری ژمێرایاری و هەژمارو تیئۆری هاوسەنگی شلە چەندین داهێنانی بە ئەنجام گەیاندووە . ئەم فەیلەسوفە لەكارە هەمە لایەنەكانی ئاینی و زانستە هەمەجۆرەكان بەردەوام بووە تاكوو لە ١٦٦٢/٨/١٩ كۆچی دوایی دەكات .

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /١ .

١٦٢٣/٧/٨ كۆچی دوایی یەكەم دەسەڵاتداری فارسی سەفەوی لە شاری ورمێی ڕۆژهەڵاتی كوردستانی ژێر دەسەڵاتی فارس– كلب عەلی خان ئەفشار– ، كوردە لێدراوەكان ئەوەیان بەهەڵ زانی و بەووتەی میرزا ڕەشید وەكوو– حشرات الارض – هاتنە جۆش و خرۆش و تەلاقیان بۆ یەكتر خوارد ، كە بە یەك دڵ و بە یەك زمان لە پێناو لە ناووبردنی ئەفشارەكان تێ بكۆشن و هەموو خێڵەكانی سۆماو برادۆست و ڕەشت و تەرگەووەڕو مەرگەووەڕو بەردەسور ڕاپەڕن ، لە ئەنجام هێرشیان كردە سەر ورمێ و بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕێكی دژوار لە نێوان چەكدارەكانی كوردو لایەنی ئەفشارەكانی فارسی لەڕۆژهەڵاتی كوردستاندا .

## ١٦٣٤

١٦٣٤/٧/٢٧ بەرپابوونی شەڕی مەزهەبەکانی شیعەو سوونںەی نێوان هێزەکانی سووپا
عوسمانی بەسەرکردایەتی سوڵتانی عوسمانی سوڵتان موورادی چوارەم
هێزەکانی سووپای فارسی بەسەرکردایەتی شا عەباسی فارسی کە مەزهە
شیعەن ، هێزەکانی سووپای عوسمانی بەرەو شاری بەغدا هەنگاوینا .
کە لەو کات شاری بەغدا لە ژێردەستی شاعەباسی فارسی بوو، ئەمەش ب
هۆی کووشتنی والی بەغدا ، کە مەزهەب سوونںە بوو بە ئارەزوی خۆ
مامەلەی لەگەڵ مەزهەب سوونںە دەکرد ، لە ئەنجام هێزەکانی سووپا
عوسمانی بۆردوومانی شاری بەغدایان کرد ، کە بووە هۆی وێرانکردن
رۆخەکاندنی شاری بەغدا .
کە ئەمەش بووە هۆی داگیر کردنەوەی شاری بەغدا لە لایەن هێزەکان
سووپای عوسمانی و بە دەرپەراندنی هێزەکانی سووپای فارس ... کە ل
ئاکامی ئەو شەڕە زیاتر لە ٢٠ بیست هەزار چەکدارو هاووڵاتی شیع
کووژران . جگە لە کووژرانی چەکدارانی عوسمانی و هاووڵاتیانی مەزهە
سوونںەی ئیسلامدا .

## ١٦٣٥

١٦٣٥/١/٢٩ لە دوای هەوڵێکی زۆر لە لایەن رووناکبیرو پرۆفیسۆرو نووسەر
مێژوونووسی هەمەجۆر لە بووارە جیاجیاکانی مێژوو زمان کەلتوورو داب
نەریتی گەلانی فەرەنسا ، ئەنجامی ئەو هەولانەش بووە هۆی دامەزراند
دەزگای کۆری زانیاری فەرەنسا لە پاریسی پایتەخت فەرەنسا دا .

## ١٦٣٦

١٦٣٦/٧/٥ لەکۆچی دوایی ئەمیری ئەردەلان – خان ئەحمەد خانی کوری هەڵۆخان .
شایانی باسە کە خان ئەحمەد خان لە ١٦٠٥/٥/١٩ دەسەلاتی ئیمارە
ئەردەلانی گرتە دەست لەو کاتەی کە یەکێك بوو لە حکوومرانەکانی س
بەدەووڵەتی فارس ... هەوڵە سەرەکیەکانی ئەوە بوو کە سەرزەنشتی هەرد

– هۆزی – موکری و بلباسی – کردووه . دوای ئەوە ناوچەکانی رواندز و عەمادیەو کۆیسنجەق و هەریری خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی . لە ماوەی دەسەڵاتی خان ئەحمەد خان لەسەر ئەردەلان بە سەردەمی سەربەستی و ئاسوودەیی ناوزەند کرابوو .

هەوڵەکانی خان ئەحمەدخان لە پێناو پاراستنی حووکمەکانی نیمچە سەربەخۆی کورد بوو ، دژی پەلاماردان و هێرشەکانی سووپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، بەتایبەتی بۆسەر هەردوو شارەکانی کەرکوك و مووسڵ و دەووروبەریاندا . لە هەمان کات پەیوەندی باشی لەگەڵ شا عەباسی سەفەوی فارس هەبوو ، کە شاعەباس رێزی باشی ئەم کەسایەتیە کوردیەی دەکرد بەهۆی راستگۆیی و ئازایەتی و چاونەترسی و پەیوەندیە باشەکان و بەئەنجامەکانی لەناوچەو هەرێمەکاندا .

<u>سەرچاوە :</u>– مشاهیر الکرد /١/١٩٥–١٩٦ .

## ١٦٣٩

١٦٣٩/١/١٤ دارشتنی یەکەم دەستوور لە کیشووەری ئەمەریکای نووێ بە ناوی – الاحکام الاساسیە– و – لهارتفورد ، کنایتکت– کە یەکەم بەڵگەنامەی کۆمەلایەتی بووە ... کە بنەماکانی دەسەلات دەگەڕێنێتەوە بۆ هەڵوویستی ئارەزوومەندانەی گەل لە هەموو بووارە جیا جیاکاندا .

١٦٣٩/٥/١١ دابەشکردنی کوردو خاکی کوردستان لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەووڵەتی سەفەوی فارسی ، ئەم کارەش بەر لە راگەیاندنی پەیمانی زەهاو بەپێی نەخشەی دابەشکردن بە شێووەیەکی فەرمی لە نێوان خۆیاندا .

١٦٣٩/٥/٢ جەنگی درێژ خایەن لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی مەزهەب سوونەو ئیمپراتۆریەتی سەفەوی فارسی مەزهەب شیعە بە نەخشەیەکی تایبەتمەندی بەرژەوەند کارانە ، لە سەر خاکی کوردستان .

ئەویش بە مۆرکردنی پەیمانی زەهاو– قەسرشیرین– بەدابەشکردنی کوردستان کۆتاییان پی هێناو ئەوسنوورەی کە هەردوو دەووڵەت لە سەری پێك هاتن ، کە لە ئاخسقەوە لە قەفقاس بە ناو مەڵبەندەکانی فارس و وان و

شارەزوورو بەغداو بەسرا تا سەر ئاوی کەنداوو ، بەناوجەرگەی خاکی
کوردستان تێپەری ، بە گوویرەی ئەم رێکەوتنە ئەبوو قەلاَکانی قووتوور
ماکۆو مەغازیرد کاوڵ بکرێن و بەچۆڵ بهێلرێنەوە .

کە پێکهاتنی هاوبەش نەیتووانی ناکۆکیەکانی نێوان فارس و عوسمانی بـ
تەواوی چارەسەر بکات بەڵکوو دابەشکردنی نارەوای نەتەوەیی کورد
ئەرمەن و گوورجی و عەرەب و دابەشکردنی ئاین ، بە پێی مەزهەبـ
جیاجیاکان بوون ... بگرە لەخێڵ و هۆزە جیاجیاکانی پێکهاتەی نەتەوەکانی
ناوچە سنووریەکان بە سەر ئەو دوو دەوڵەتەدا.

کە بووە هۆی دروست بوونی ناکۆکیەکان زیاترو ململانێی سەخت و دژوار
، لە بەر ئەوەی هەلکەوتەی جووگرافی شووێنی ژیانی کوردیش ، کە لە
نێوان هەردوو دەسەڵاتی عوسمانی و فارس دابوو ، کە کوردی خستە نێوان
دوو بەرداشی نێوان هێزەکانی عوسمانی و فارسدا .

نووسەرو رووناکبیرو کەسایەتی ناوداری کورد – ئەحمەدی خانی– خۆی
شایەتی رووداوەکانی ئەو سەردەمە بوو ، کە چەندین ووتەی بەنرخی لە
دانراوەکانی ئەو سەردەمە بووەو چەندین ووتەی بە نرخی لە دانراوەکانی
تۆمار کردووەو بۆتە مایەی توویژینەووەو جێ بەجێکردن و هێنانە کایەوەو
بە ئەنجام گەیاندنی لە داهاتوی کوردو خاکی کوردستان .

١٦٣٩/١٠/٢٧ یەڵدا شابۆی فەڵە لە بەرەبابی ئۆسلان لە فەڵە کلدانیەکانی گووندی
هەرمۆرتەی سەر بە شارۆچکەی کۆیسنجەق بووە ، لە بەر خۆشەوویستی
خووشکی مستەفا حەیدەری ، لە ئایینی عیسایی هەلگەراووەو بووە ئیسلام
. دوای ئەوە لە گوندی هەرمۆتە دەچێتە گوندی ماوەران لە بەر ئەوەی
ماڵەخەزورانی لەو گوندە بوون . هەر لەو گوندەش کۆچی دوایی کردووە و
گۆڕەکەی لەو گوندەیە .

شایانی باسە عەشیرەتی بندیان هەمووی دەگەڕێتەوە سەر ئەم مرۆڤە...
دوای ئەوەی کە بوو بە ئیسلام ، ناوی خۆی لە یەڵدا شابۆ گۆری بۆ ناوی –
ئاودەل– کە چوار کوری هەبوو ، لە بەر ئەوە عەشیرەتی بندیان بەچوار تیرە
دابەش بووە . کە هەر تیرەیەك لە کورێك لەکوڕەکانی یەڵدا شابۆن لە
پارێزگای هەولێر لە هەرێمی باشووری کوردستان .

## ١٦٤٠

١٦٤٠/٥/٣٠ کۆچی دوایی هونەرمەندی شێووەکارو تابلۆکێش – پیتەر پۆڵ رۆبنز – کە باشترین هونەرمەندی سەدەی هەڤدەهەم بووەو تابلۆ بەناوبانگەکەی – ژنەکەو کوڕەکەو مۆمەکەی – بوو ، کە بە ٠٠٠ر٤٠٠ر١٢ ملیۆن دۆلار فرۆشراوە .

## ١٦٤٢

١٦٤٢/١/٤ لە دوای رەتکردنەوەی پەرلەمانتارانی بەریتانیا ، بە دەنگ نەدان لە سەر خەرجکردنی ئەو برە پارەیەی کە سووپای شانشینی بەریتانیا پێویستی پێ هەبوو . بۆ خەرجی پێداویستیەکانی و کارە هەمە جۆراو جۆرەکانی سووپا ، بە هۆی جەنگ کردن لە گەڵ سکۆتلەندا ... ئەمەش بووە هۆی کە لایەنگرانی شانشین هەڵسان بە رفاندنی پێنج پەرلەمانتاری دژ بە خۆیان .
کە ئەمەش بووە هۆی بەرپابوونی شەڕ لە نێوان پەرلەمانتاران و لایەنگرانی لەگەڵ لایەنگرانی شانشین – شارلی یەکەم – ، کە هەردوو لا وەك یەك هێزی سووپایان هەبوو ١٣٠٠٠ سیانزە هەزار سەرباز بە رامبەر ١٣٠٠٠ سیانزە هەزار سەرباز ، لەئاکام هێزەکانی سووپای پەرلەمانی بەریتانیا توانیان دەسەلاتی خۆیان لەسەر لندەن بچەسپێنن.

١٦٤٢/١/١٠ شانشین – شارلی یەکەم – شانشینی بەریتانیا ، شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیای جێ هێشت بەرەو شاری ئۆکسفۆرد رۆیشت و هێزەکانی لایەنگری خۆی لە بەر پرسان و سووپای بەریتانیا لە شارەکەدا کۆبوونەوە ، کە ١٣٠٠٠ سیانزە هەزار سەرباز بوو ، لە دوای دەست بەسەرا گرتنی هێزەکانی سووپای لایەنگرانی پەرلەمانتارانی گشتی بەریتانیا لە سەر شاری لەندەندا .

١٦٤٢/٤/١٩ سولتانی عوسمانی سولتان خانی دووەم ، کە کوڕی سولتان ئیبراهیمی یەکەم بوو چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ، دوای لابردنی سولتان محەمەدی چوارەم دەسەلاتی سولتانی عوسمانی گرتە دەست بەسولتانی عوسمانی لە سنووری ئیمپراتۆریەتەکەدا .

## ١٦٤٣

١٦٤٣/٦/١٤ لـه سـەردەمی شانـشینی بـەریتانیا شانـشین – ئـەلیزابیت – مـاوەی بـەکاری رۆژنامەوچاپەمەنیدا ، ئـەویش بـەرێنمایی چاپەمەنیو رەزامەنـدی لـە سـەر کرد ، کە لە لایەن ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا دانراو پێشنیار کرابوو لـە هـەموو بووارەکـانی رۆژنامــەو چـاپەمەنی بــە هــەموو شـێووازەکانیەوە لــە وولآتەکەدا .

## ١٦٤٥

١٦٤٥/٦/١٤ هێزەکانی سوو پای سەر بە پەرلـەمانی گـشتی بـەریتانیا توانیـان بۆ یەکـەم جـار ، لـە مـاوەی کێـشەو ململانێیەکـە سـەرکەووتنی تـەوواو بەدەسـت بێـنن بەسەر شانشینی بەریتانیا شانشین – شارلی دووەم– لە شاری نازبی.
بەلآم ئەو کێشەو ململانێیە بەردەوام بوو تاکوو مانگی/٩/ ١٦٥١ بە هـەلاتنی شانــشین – شــارلی دووەم – بــۆ دەرەوی وولآت ... ئەمــەش بــووە هــۆی کۆتاێی هاتن بە شەڕی ناوو خۆ لە بەریتانیا .

## ١٦٤٦

١٦٤٦/٦/١ فەیلەسوف و زانای ناوداری ئەلمانی و جیهان – گوتفرید فیلهیلم لایبنز – لـە شـاری ، لیبتـسکی ، ئـەلمانیا چـاوی بـە جیهـان هـەڵهێناوە . بـەهۆی بـوونی باوکی بەدادوەرێکی رۆشنبیر زۆر بایـەخی بە پـەروەردە کردنـی لایبنز داوە ، بۆیە هەر لەسەرەتای ژیانی فێری زمانەکانی یۆنانی و لاتینی دەبێت .
دوای ئـەوە دەسـت دەکـات بەخووێنـدنی ئـەدەبی یۆنـانی و رۆمـانی ... پـاشر ئەوەی لەزانکۆی لیبتسك فەلسەفە تـەواو دەکـات بـەرەو زانکـۆی شاری پـەنیا دەچێت و لـەو زانکۆیـەش زانستی ماتماتیك دەخـووێنێ تـا لەسـاڵی ١٦٦٧ بروانامەی دکتۆرا لەیاسا بەدەست دێنێ .
دوای ئـەوە بـۆ ماوەیـەك لـە کۆشـکی – دۆکـی هانۆڤـەر – کـاری دبلۆماسـی ئـەنجام دەدات و مێـژووش دەنووسـێتەوە ... بـەهۆی زیرەکـی و لێهـاتوویی زۆربــەی کاتــەکانی ژیــانی بەخووێندنــەوەو نووسـین و تووێژینــەوە بەســەر دەبـرد. هـەر لەسـەرەتای ژیـانی لایبنـز نیشانەکانی دارێژتنی تیئـۆری هـزری

دەبینرا.

چونکە مرۆڤێك بوو حەزی لەفێربوون و رەخنە لەخۆگرتنی پێووە دیاربووە ، هەر بۆیەش روانین و بۆچوونی فەیلەسوفەکانی پێش خۆی دەربری و پشت ئەستوورانەش رەخنەی لە تیئۆرەکانیان دەگرت . هەر وەك لە پەرتووکی چەند ووتارێك بۆ – عەقلی مرۆڤ – بەدیار دەکەوێت ، کە تیایدا رەخنە لە بابەتە سەرەکیەکانی ناو پەرتووکەکەی وتارێك بۆ عەقلی مرۆڤی – جۆن لۆکی – فەیلەسوفی ئینگلیزی گرتووە .

بەهەمان شێووەش لەپەرتووکی – ووتارێك بۆ میتا فیزیکیا – نارەزایی خۆی بۆ چۆنیەتی روانینی دیکارت لە میتوودی مینا فیزیکیا دەربرییووە ... ئەمە لە ئاست و بۆچوونی شپینۆزاش بەرامبەر بەیەك ناوەرۆکی هاتۆتە وەلام و دەلێت :-

ئەگەر ناوەرۆك بەم جۆرە بێت سپینۆزا باسی لێووە دەکات ئەوە بە دلنیاییەوە هەموو شتەکان نێگەتیف و پەککەوتوو دەبوون ، بۆیە ناوەرۆکەکان بەشێووەیەکی وەهایە کە لە ژمارە نایەن ... دیارترین بەشی زانستی لەلای لایبنز بریتی بوون لە مۆنا دۆلۆژیا – زانستی گەردیلە رووحیەکان – کە وای بۆ دەچوو ، کە گەردوون لە گەردیلەی رووحیەکان پێك هاتووە ... ئەم گەردیلە رووحیانەش ناونابوو بە – مۆنادەکان – لە پەرتووکی تیوودیسا دادوەری خوداوەندیش دەیسەلمێنێ ، کە جیهانەکەی ئێمە بەهەموو شەڕو ناخۆشیەکانیەوە باشترین جیهانە .

لە رووی زانستی – لایبنز – زانستی ماتماتیکیشەوە شووێنی دیارەو لەتەك ئیسحاق نیووتنی زانای ئینگلیزی بە دامەزراندنی زانستی – تەواوکاری و جیاکاری – دەدەنرێت . لەهەموو هاوچەرخەکانیشی زیاتر درکی بە گرنگی لۆژێکی ماتکاتیکی کردبوو .

کە ئامێرێك بۆ پێوانەی ژمارەشی داهێنا ، کە چەندان کرداری گەورەی پێ ئەنجامداو بەو هۆیەشەوە توانی رەگ بدۆزێتەوە ، جگە لەمەش چەندان ئامێری دیکەی بۆ هەلکێشانی ئاوو بەگەرخستنی ئاستی ئاوی داهێنا . لە تەك ئەو کارانەش بایەخی بەکێشە کۆمەلایەتی و رامیاری و ئابووری و رۆشنبیریش دەدا .

هەروا بەردەوام بوو لە پێناو خزمەتکردنی مرۆڤ و مرۆڤایەتی لە داهاتوو؛
پەرەسەندن و پێشکەووتن و پەرەپێدان لە جیهان ، تاکوو لە رۆژ؛
١٧١٦/١١/١٤ ماڵئاوایی لە وولات و جیهان کردو بەرهەمەکانی تاکو
ئێستاش جێگەی گرنگی پێدانە لەهەموو بوارەکاندا .

سەرچاوە:— مەوسوعەی فەلسەفە — دانانی — دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی — بەرگی ٢/

## ١٦٤٨

٢٤/١٠/١٦٤٨ مۆرکردنی رێکەووتننامەی — ڤێستڤالیا—— لە شاری ڤێستڤالیای رۆژئاوی ئەڵمانیا ، کە هەموو وولاتانی ئەوروپا بەشداریان تێدا کرد بە ئامادە بوونی ١٣٥ نووێنەر لە کەسایەتی لاهوت و فەیلەسوفەکان .

ئەویش لە پێناو کۆتایی هێنان بەکێشەو ململانێی شەڕی ٣٠ ساڵەی رابردووی نێوان هەردوو مەزهەبی مەسیحی لێك جیاوازی کاسۆلیك و پرۆتستانت ، لە ئەورووپاو جیهانی مەسیحی، کە بەریتانیا و فەرەنسا و ئەسپانیاو نەمساو رووسیاو ئیتالیا رۆڵی سەرەکیان هەبوو لەو ململانێ و شەڕو پێکدادانە . ئەویش بەووێرانکردن و لەناووبردنی بەهەزاران مرۆڤ و خانوو بالەخانەو کێڵگەی کشتووکاڵی و کارگەو پرۆژەی پیشەسازی و ژێرخانی ئابووریدا .

ئەم نەخشەیە شۆڕشی پیشەسازی دیاردەکات بەر لەو ڕێکەوتنەدا

شایانی باسە ئەو کۆنگرەیە بووە هۆی دورست بوونی بنەماڵەی دەسـەڵات و

دەوڵەتو نەتەوە لە ئەوروپادا ، بە جیاکردنەوەی دەسەلاتی – دەووڵەت ا
دەسـەلاتی کەنیـسەکان لـە ئـەوروپای رۆژئـاواو ئـەوروپای رۆژهـەلات ، ک
کەنیسە بەرپرسـار بـوو لـە کاروباری ئاینیومەزهـەبو هـەتا لـە دەسـەلات
دەوڵـەتیش بەرپرسـیار بـوو ، لـە بـەرێوە بردنـی کاروبـاری دەوڵـەت ل
هەموو بوارە جیاجیاکاندا .
جێگـەی باسـکردنە کـە مـۆرکردنی ئـەم رێکەووتننامەیـە هـەموو ووڵاتـاذ
ئەوروپا بەشداریان تێدا کرد ، تـەنیا بەریتانیاو پۆڵەنـدا نـەبێت . کە گرنگ
ئـەو رێکەوتننامەیـە ، کـە لـە شـاری ڤێـستڤالی مـۆر کـرا لـە پەیووەندی
نێوودەووڵەتیەکاندا ئەویش:-

١- ئەم رێکەووتننامەو کۆنفرانسی رێکەووتننامەکە بوون بە بنـەما بۆ پێ
هێنـانی کۆنفرانـسی دیکـە ورێنمـایی کردنـی ووڵاتـان لـە پەیووەندی
نێوودەووڵەتیەکاندا .

٢- ئـەم رێکەووتننامەیـە دان بـە سـەر بـەخۆیی کۆنفدراسـیۆنی سویـسرا
ووڵاتانی هۆڵەندا دانا .

٣- نزیکەی ٣٥٠ یەکەی رامیاری ئەڵمانیا بە هۆی ئـەم ریکەووتننامە سە
بەخۆییان بە دەست هێنا .

٤- پێدا گـری لـە سـەر سـەربەخۆیی فەرەنـسا ، ئەسـپانیا ، پرتووگـال ،
قەدەخەکردنی بە فەرمی دەستێووەردانی لە کاروباری پاپا نێووخۆی
و دەرەوەی ووڵاتانی ئەوروپا .

٥- ووڵاتـانی ئـەوروپا ، مـافی گرێـدانی رێکەوتننامـە . و لـە ئەسـتۆ گرتن
بەرپرسـیاریەتی نێوودەووڵـەتی و ریکخـستنی کاروبـاری نێووخۆیـا
پێدرا . بە بیٚ دەستێووردانی دەووڵـتی دەرەکی و بەبیٚ سەرنجدان ب
داواکاریەکانی ئیمپراتۆریەتی رۆما و پاپا.

٦- بنەمای سەربەخۆیی ووڵاتان ، چ سەربەخۆی رامیـاری و چ سـەربەخۆ
ئـاینی و هــەروا یەکــسان بوونیــان لــە گۆرەپــانی نێوودەووڵــەتی
پەیووەندیـەکانی دەرەوە بـۆ یەکـەمجار و بـە شـێووەیفـەرمی لـە
رێکەوتننامە پەسند کرا .

٧- ووڵاتـان لـە هەڵبـژاردنی ئایینیـدا سەربەسـت بـوون و لـە هـەمان کـا
بەلێنیـشیان دا ، کـە گرووپـە ئایینیکـانی کاسـۆلیکی لۆسـەری

پرۆتستانت ئازادیەکی تەواویان هەبێ.

٨- سیستەمی هاوسەنگی هێز ، هەم لە ئیمپراتۆری رۆماو هەم لە ئەوروپادا پێك هات . ئامانجی سیستەمی هاوسەنگی هێز پێشگرتنە لە سەر هەڵدانی دەوڵەتێکی - زاڵتر - لە ناو یەك رامیاریەکانی ئەوروپادا بوو .

٩- ئەو دەوڵەتانەی کە رێکەوتننامەی ڤیستڤالیان مۆر کردبوو ، بە لێنیان بە یەکتر دا ، کە لە بەرامبەر هەر هێرشێکدا بێ گوێدانە ئایین هاوکاری یەکتر بکەن .

## ١٦٤٩



١٦٤٩/٧/٣ لە دوای شەڕیکی خوێناوی ناووخۆیی لە ئینگلتەرا کە کۆتایی ئەو شەڕە بەکووشتنی شانشین - شارلی یەکەم - هات لە لایەن رێکخراوی بیووریتانیەکان ، ئەویش بەراگەیاندنی حکوومەتی نووێ ، بە گەڕاندنەوەی ئارامی و ئاسایش بۆ گەلانی ئینگلتەرا ، کە خۆیان ژمارەیان ٥٦ ئەندامی پەرلەمانی گشتی بوو، لەدوای پاککردنەوەی جوولانەوەی براید بە هەڵووەشاندنەوەی ئەنجوومەنی لۆردات و شانشین لە ٢/٦ هەمان ساڵ بە دامەزراندنی دەزگای جێبەجێکردن بەناوی ئەنجوومەنی دەوڵەت ، کە پێك هاتبوو لە ٣٩ ئەندام ، کە هەموویان سەربەخۆ بوون .

واتە بەریتانیە کۆماریەکان لە ٥/١٩ ی هەمان ساڵ ئەنجوومەنی گشتیان دامەزراند بە شێووەیەکی فەرمی بە ناوی کۆماری ئینگلیزی ، یاخوود دەوڵەتی ئازاد ، کە دەسەڵاتی باڵای بەگەڵ دابوو لە سەرنووێنەرانی گەڵ ، لە پەرلەمان بە دامەزراندنی نەك کۆمارێکی دیموکراتی لە سەر بنەماکانی دیموکراتی و بەڵکوو دەستیان کرد بە دەرکردنی ئەندامانی پەرلەمان و

ئەنجوومــەنی لــۆرداتی لایــەنگیری شانــشین – شــارلی یەکــەم – لــە کـاتی شەڕەکەو دوای شەڕەکەدا ، چونکە پەرلەمان ببووە دووبەشی دژ بە یەکتر لە دەسـەڵاتو لـە هێـزی سـووپاو لـە دارایی ولـە بـەڕێوەبردنـی کاروبار ولاتەکە لە هەموو بووارە جیا جیکاندا .



١٦٤٩/١١/٢١ لـــەدایك بـــوونی نووســـەرو فەیلەســـوفی بـــە ناوبـــەرگری ئـــازادی– فرنـــسوا مـــاری ئارۆیـــەمی– نـــاوودار بـــە – ڤۆلتێر – لە گوندتك لە رۆخی شـــاری پاریـــسی پایـــەختی فەڕەنـــسا. هـــەر لـــە منداڵیـــەوە لەلایـەن کۆمۆنـستەکان فێـری خووێندن بووەو هـەروا لەگـەڵ خووێنــدن بنــچینەکانی ئــایین فێر بووە.

ئـەم فیلەسـوفە لـە تەمـەنی ٢٣ ساڵیەوە بەهۆی سووکایەتی کردنی بەکۆشکی شاهانە لە قەڵای – باستیل بەنـدکراووەو لەبەندیخانـە داسـتانێکی بـەناوی – هتێنریـاد – دانـاوە ، ک باسـی ئەشـکەنجەکانی پرۆسـتەنتیەکان دەکاتو ئیتر بـەو شێووەیە لـە ژیا بەردەوام دەبێت.

## ١٦٥٠



١٦٥٠/١٢/٢٥ زانای ئایینی و تەسەوف و فەیلەسوف و نووسەرو ئەدیب و شاعیری ناوداری کورد – ئەحمەد ئەلیاس رۆستم – ناسراو بە – ئەحمەدی خانی – لەشاری بایەزید لە باکووری کوردستان چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ، لە هۆزی – خانیەکان – بووە . کە لە بنچینەدا باو باپیرانی لە شاری یۆنان ژیاون و لە گوندی خانیْ سەریان هەڵداوە ، کە لە ناوچەی جۆڵە مێرگ بوونە ، کە گەورەترین شار بووە لە ناوچەی هەکاری .

جێگەی ئامارە پێکردنە کە ئەحمەدی خانی لەلایەن زاناو رووناکبیرانی ئەوکاتە خوێندنی تەواوکردووە ، هەر لە تەمەنی بچووکیدا پێنووسەکەی بە دارشتنی شعر دەستی پێکردووە ، کە بەناوبانگترین شعرەکانی – مەم و زین – بووە ، کە چیرۆکێکی خۆشەویستی بووە لە شێووازی چیرۆکی – لەیلا و مەجنون – بووە .

لەساڵی ١٦٦٥ دەستی پێکردووەو لەماوەی تەمەنی کە ٤٤ ساڵ ئەم چیرۆکە شیعریەی تەواوکردووە ... هەروا چەندین شیعری دیکەی هەیە بە زمانەکانی کوردی ، عەرەبی ، فارسی و تورکی ... هەروا – فەرهەنگی کوردی – عەرەبی – نووسیووە بەناوی – نۆ بەهاری بچووکانی – کە بۆ قوتابیانی ئامادەکردبوو ... هەروا – عەقیدەو ئیمان – هەروا چەندین چیرۆکی غەزەلی هەیە .

شایانی باسە کە مەم و زینی ئەحمەدی خانی بۆ چەندین زمان وەرگێردراون ، وەك :– عەرەبی ، تورکی ، ئەرمەنی ، فارسی ، ڕووسی – و چەندین زمانی

دیکە ، هەروا بۆ زمانی فەرەنسی ... مەم و زین لە ٢٦٦١ هۆنراوە پێکهاتوو
... کە بە یەکەم قووتابخانەی نەتەوەی کورد دادەنرێت . کە یەکەم شاعیر
بووە کە هێمای نەتەوەیی و نیشتیمانی بەرزکردۆتەوە لە مێژووی نەتەوەی
کورد ... ئەم کەسایەتیە ناوادارە و شاعیر و نووسەرو رووناکبیرە لە ژیانی
درێخی نەکردووە تا لەسالّی ١٧٠٦ مالّئاا وایی لە گەل و نیشتیمانەکەی
دەکات .

سەرچاوە :- اعلام الکرد ٥٤٠ - ٢٤١ - کورتە مێژووی ئەدەبی کوردی سەردەم ٢/٢٦.

## ١٦٥٣

١٦٥٣/١٠/١٠ بلاّو کردنەوەی یەکەم رۆژنامە ، ئەویش لە شاری رۆمای پایتەختی ئێستای ئیتالیا بووە . کە ئەو رۆژە بە رۆژی رۆژنامەگەری ئیتایا دادەنرێت لە وولاّتەکەدا .

شایانی باسە کە ئیتالیا وولاّتێکو نیشتمانێکی پڕ لە شارستانیەتو شووێنەوارە لە هەموو بووارەکان وگرنگی بەکەلتوورو داب و نەریتو زمانو مێژووی خۆی داووەو بەردەوام بووە تاکوو ئێستاش .

ئیتالیا مەڵبەندی ئاینی مەسیحیە ، کە ئەویش دەووڵەتی فاتیکانەو رێنمایی هەموو مەسیحی جیهانو سەرپەرشتیو سەرکردایەتی ئاینی مەسیحی دەکات ، بە هەردوو مەزهەبی کاسۆلیکو پرۆتستانتو چەندین لابالو بیروو بۆچوونی دیکەی ئاینی ، لەهەمان کات چ لە بوواری ئاینو چ لە بوواری دەووڵەتو دەسەلاّت ، ئیتالیا رۆڵی سەرەکیو بنەڕەتیو گرنگی هەیە لە پەیووەندی نێوودەڵەتیو ناوخۆییدا .

## ١٦٥٥

١٦٥٥/١٠/٣١ مەلیك ئەحمەد پاشای والی هەرێمی وان لە باکووری کوردستان چەند بیانووی هەمەلایەنەی دۆزیەوە ، لە پێناو پەلاماردانی ئیماراتی بەدلیسو لە ئەنجام بە هێزێکی سووپای زۆرەوە چووە سەر عەبدالّ خانی میری بەدلیس ، کە زۆربەی هێزەکەی لە کورد پێك هاتبوون و دانیشتووانی دەووروبەری ئیماراتی بەدلیس بوون کە بەپارەو سامان کڕابوون .

ئەویش لە پێناو بەرەنگار کردنەوەی کورد دژی کورد ، لە ئاکام بە هۆی کۆچ

پێکردنی دانیشتووانی زۆربەی زۆری ئیماراتەکە دەستیان کرد بە تالآنکردنی ئەو سامان و ئەو گەنجینەی کە دەمێك بوو تورکەکان چاویان تێبڕیبوو ، لە ئەنجام هەر هەموویان تالانکردو میرنشینەکەیان لەناو برد لە هەرێمەکەدا .

شایانی باسە – ئەولیا چەلەبی– لەگەل لیژنەی تالآن نووسەکەدا بووەو دەڵێ :– حەوت باری حووشتر کتێب بوون و بەتایبەتی کتێبخانەی میر زیاتر لە چواردە هەزار دەستنووسی زۆر نایاب و بە هاداری تێدا بوو ، لە گەڵ چەندین کاری دیکەی شووێنەوارو کەلتووری کۆنی کوردی هەمە جۆری تیابووەو هەمووی دزراو لەناو براوە لەلایەن دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەر خاکی کوردستان .

## ١٦٥٦

١٦٥٦/٧/٢١ لەو رۆژەدا – مۆریترا – حاخامی جوولەکە لەبەردەم جەماوەرێکی زۆری نوێژکەری ئاینی جوولەکە ئەو دەقەی خووێندەوە ، کە – بێ بەرێکردنی سپینۆزای – گرتبووە خۆ . کە ئەمەش قورسترین سزابوو بەسەر ئەو کەسانەی کە گوایە لەئایین دەردەچوون لەناویدا هاتبوو ... ئەو کەسەی کە دژی خوا وەستاوە لەئاسمان وزەوی بەر لەعنەت کەوتووە . بەمەش فەرمانی کۆمەڵ بەسەر کووشتنی سپینۆزدا درا. دواتر لەدرێژەی دەقەکەی داوای لەهەموو کەسێکی سەر بەجالیەی جوولەکەی ئەمستردام کراوە ، کە ئەو سپینۆزا لەو شارەدا لەخانوویکی بچووك لەباشووری ئەمستردام نیشتەجێ بوو... ئەویش بەنزیك نەکەووتن و قسە لەگەڵ نەکردنی . بەناوی ئەوەی کە سپینۆزا دژی خواو نووێژکردن و دوا رۆژە بە پێچەوانەی هەست وبیروو بۆچوونەکانە لە وولاتەکەدا.


## ١٦٦٧

١٦٦٧/١١/٣٠ نووسەرو چیرۆك نووسی بەناوبانگی جیهان – جۆناتان سویفت – لەشاری دبلن لەخێزانێكی ئاین چاوی بە جیهان هەلهێناوە وپەروەردە كراوە .



جێگەی ئاماژە پێكردنە كە جۆناتان بەر لە دایكبوونی باوكی سویفت كۆچی دوایی كردووە . و دایكی بەهەتیووی بەخێوی كردووە . ئەم مرۆڤە لە تەمەنەكانی پێگەیشتنی بەهرەی نووسینی هەبووە و لەدارشتنی چیرۆك رەمزی پالی پێوەناوە وچیرۆكی سەیرو سەمەرەی نووسیووە ویەكێك لەو چیرۆكانە چیرۆكی – گۆلیڤەر – بووە .

چیرۆكەكانی جۆناتان لەچوار گەشتی پر لە سەرسوورهێنەرو مەترسی ورووداوی سەیرو سەمەرە دەدوێ وبەخەیالی چووەتە نێوو جیهان بۆ ئەوەی بچكۆلەو بوونەوەی گەورەو ناو وولاتی زاناو تێگەیشتوو ... چیرۆكەكانی رووناكی خستۆتە سەر رەوشت و هەلسووكەوتی مرۆڤی دەسەلاتداری مشەخۆر و مرۆڤی بێ هێزو بێ دەسەلات لەشێووازێكی پر لە تەنزو وتوانج ورەخنەی لەژیانی ئەو سەردەمەی خۆی گرتووە.

مەبەستی جۆناتان لەناوەرۆكی چیرۆكەكانی ئەوە بووە ، كە باسی لە رژێمی وولاتانی ئەوروپا و دەستووری ئینگلیزی بووە ، ئەو وولاتە زانایانە باس دەكرد و لەوكەسە دەسەلاتدارانەی وولاتەكەی خۆی دەدا ، كە هیچ راستیان لا نیە تەنیا مەبەستی هەرە گەورەیان بەدەستهێنانی دەسەلات

وکۆکردنەوەی مال وسامان بووە ... ئەم کەسایەتیە لە نووسینەکانی بەردەوام بووە تاکوو لە تەمەنی ٧٧ سالیدا واتە لە ١٧٤٥/١٠/١٩ کۆچی دوایی دەکات لە وولاتەکەیدا کە بەریتانیایە .

سەرچاوە :- گۆڤاری مجلە ١٤٥٥ لە ٢٠٠٨/١/٥ .

## ١٦٧٢

١٦٧٢/٩/١٨ لە ناوەندی شەڕی نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی و هێزەکانی سووپای پۆلۆنیا و بەردەوام بوون لە کۆتایی هێنان بە کێشەکان ئەویش بە مۆرکردنی پەیمانی – بۆزاکس– کە شەڕشەکە بەرەو کۆتایی هاتن هەنگاوینا .

لە دوای ئەوە پۆلۆنیەکان بە ناوەرۆکی ریکەووتنەکە رازی نەبوون و شەڕەکە بەردەوام بوو تاکوو هەموو خاکی وولاتەکەیان لە ژێر دەستی هێزەکانی سووپای عوسمانی رزگار کردو زیانێکی مادیو گیانی زۆر لە هێزەکانی سووپای عوسمانی و پۆلۆنی کەوت ، لە گۆرەپانەکانی شەرەکەدا ... کە بە دلخۆشکەری گەلانی پۆلۆنیا بوو بە سەرکەووتنی هێزەکانی سووپاو سەرکردەو گەلەکەیان لە وولاتەکەدا .

## ١٦٧٣

١٦٧٣/١٢/٢٢ سولتانی عوسمانی سولتان ئەحمەدخانی سێیەم لە دایك بووە ، کە کوڕی سولتان محەمەدی چوارەمەو لەکاتی دامەزراندنی سەرو سامانێکی زۆری بەسەرداو دەستەکەی دا دابەشکرد بە تایبەتی هێزی سەربازی ، بۆئەوەی بتووانێ لەکارە سەربازیەکانی سەرکەووتوو بێتلە شەڕەکانیدا.

لە هەمان کات مووفتی ئاینی – فەیزوللا ئەفەندی– لە سێدارە داو دوای ئەوە ژمارەیەکی زۆری لە سەربازەکانی لە سێدارە دا... شایانی باسە هێزەکانی سووپای عوسمانی ، واتە هێزی سەربازی ناووزەندو ناسرابوو بە – ئینکشاریە– چ لە ناو ئیمپراتۆریەتەکە و چ لە دەرەوەی ئیمپراتۆریەتەکەدا .

## ١٦٧٧

١٦٧٧/١٢/ بەرپابوونی ئاژاوە لە نێوان هەردوو مەزهەب شیعەو سوونەی ئیسلام لە

شاری مەککە لە وولاتی حیجازدا ... ئەمەش هۆی ئەوە بوو کە لە شەوی پێنج شەممەی رۆژی ٨/ شەوال/ ١٠٨٨ کۆچی بەردی رەش و دەرگای کەعبەو جێگەی نوێژی هەینی شێوەێندرابوو بەشێوەیەکی ناشیرین – ماناکە دیارە– ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە نابێ شیعەکان سەفەری مەزارەگەکانی مەراسمی حەج بکەن ، گەر هاتوو مەزهەب شیعەکان گەیشتنە جێگە پیرۆزەکان لە شاری مەککەدا .

دەبێ ئەو جێگایانەی کە پێیدا دەڕۆن خاوێن بکرێتەوە – واتە بسمیل بکرێت– ئا لەم رۆژەوە زیاتر پەیوەندی نێوان هەردوو مەزهەب شیعەو سوونەی ئیسلام بەرەو دژووارتر هەنگاوی دەنا بە تایبەتی لەلایەنی هەڵگری بیری وەهابیەکان ، کە سعوودیە هەرهەموو وەهابیەو ژمارەیەکی کەمیان نەبێت لە وولاتەکەدا .

## ١٦٧٩

١٦٧٩/١/٢٤ لە لەدایك بوونی نووێنەری گەورەی فەلسەفەی ئەلمانی – ولف ڤۆلڤ – لەشاری برسلاد لە لەئەلمانیا . بۆ یەکەم کە دەستی کرد بەخووێندنی لاهووتی ... بەڵام دوای ئەوە رووی کردە خووێندنی ماتماتیك و فیزیا تا ئەوکاتەی توانای باشی پەیداکردو هەوڵی چارەسەری کێشەکانی نێوان لۆسەریەکان وکاسۆلیکیەکانی دەدا .

لە ساڵەکانی ١٦٩٩ –١٧٠٢ خووێندنی لە سەر دانراوەکانی دیکارت دەست پێکرد . لەساڵی ١٧٠٣ بروانامەی دکتۆرای لەزانکۆی لیبستك بەدەست هێنا ... ئەم فەیلەسوفە لەکارە هەمە لایەنەکانی بەردەوام بوو تاکوو لە ١٧٥٤/٤/٤ لە هلەی ئەلمانیا کۆچی دوایی دەکات.

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٣ .

## ١٦٨٣

١٦٨٣/٩/١٢ هێزەکانی سووپای هاوبەشی نەمساو مەژەرو پۆلۆنیا بەسەرکردایەتی- سوبیسکی- و بە ئامۆژگاری پاپای کاسۆلیك پەلاماری هێزەکانی سووپای عوسمانیدا .

ئەویش بە سەرکردایەتی سەرکردەی عوسمانی- قرەمستەفا ئاغا - لە ئاکامی شەڕی نێوان هەردوو لایەن هێزەکانی سووپای مەسیحی سەرکەووتن بەسەر هێزەکانی سووپای عوسمانی لەهەرێمەکانی - ساکس و باقیرا - دوای ئەوە هێزەکانی سووپای عوسمانی لەسەر زێی دانووب کۆکرانەوەو بەرەو شاری بوود بەرێکەووتن، لە هەمان کات هێزەکانی سووپای هاوبەش - سوبیسکی- هەر بە دوایاندا بوون ، کە ئەم رۆژە بووە رۆژێکی مێژوویی لە بەزاندنی هێزەکانی سووپای عوسمانی و بەرەو پاشەکشەکردن هەنگاویان دەنا لە ناوچەکەدا .

## ١٦٨٥

١٦٨٥/٢/٢٣ لە دایك بوونی دامەزرێنەری مۆزیکای ئینگلیزی و مۆزیکا ژەنی جیهان - گیوریخ فریدریك هاندل - لەشاری هانۆڤەری ئەلمانیا ... کە بە پێچەوانەی ناودارانی بواری مۆزیکا بووە ، خێزانەکەیان نەك هەر لەم بوارە ناسراو نەبوون بەڵکوو رێزیشیان لێدەگیرا . هەر بۆیە لەترس باوکی ئامێرە بچووکەکەی لە دەرەوەی ماڵ دەژەنی و کاتێك کە بەهرەی مۆزیکاشی لێبەدیار دەکەووێت یەك لەمیرەکان ، داوا لەباوکی دەکات رێگای پێبدات و تیئۆریەکانی مۆزیکا لەگەڵ خووێندنی ئاسایی بخووێنێ ، کە ئەوسا هاندل حەزی لەهیچ جۆرە خووێندنێك نەدەکرد .

شایانی باسە کە ئەم هونەرمەندە چەند وولاتی دیکەی لەجیهان کردووە لە پێناو سەرکەووتنی کاروبەهرەکەی کە لە ساڵی ١٧٢٤ ئۆپرایەکی دیکەی بەناوبانگ بەناوی - یۆلیۆس قەیسەر - دەنووسێ ... کە ئەویش وەك زۆر لەنووسەرو هونەرمەندەکانی دیکەی شارەکەی یۆلیۆس قەیسەری شکسپیر دەکات ... هەروا لەساڵی ١٧٢٨ ئەو شانۆیەی کە کارەکانی تێدا پێشکەش دەکرد دوچاری دەبێت .

هەروا لەساڵی ١٧٣٧ جارێکی دیکە دەگەرێتەوە لەندەن ، کە ئەمجارەیان

گۆرانیبێژه ناودارەکانی ئۆپرا لەدەوورەی خۆی کۆ دەکاتەوە .. لەدە ساڵەی دوایی ئەو هونەرمەندە هەوڵی گۆرینی لەکارەکانی خۆی دەکرد لە ئۆپراو سیمفۆنیاو چەندین کاری دیکە ... کەزۆر پێووەی ماندوو دەبوو وەك خەیاڵێکی نەپساو تاکوو لە ١٧٥٩/٤/١٤ کۆچی دوایی دەکات بە ماڵئاوایی لە جیهانی مۆزیکا لە وولاتەکەیدا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢.

١٦٨٥/٣/٢١ مۆزیکـــژەنی کلاســـیکی ئەلمانی وجیهانی – یۆهـان ساسـتیان بـاخ – لەشاری – ئیزنـاخ – چـاوی بـە جیهـان هـەلهێناوە . هـەر لەشارەکەی خـۆی دەسـتی کـردووە بـە قۆناخـەکانی خووێنـدن و لـە هـەمان کـات وانـەی مـۆزیکی لەلایـەن یۆهـان ئـەمپرۆزس – بەخووێنـدنی کەمانجـە ژەنـی بـاوکی ، لـەدوای مردنـی بـاوکی لەگـەل یۆهـان کریستۆفی بـرا گـەوورەی دوا وانەی ژەنین لەسەر کلاڤان وئۆرگۆن خووێندوە .



لە ساڵی ١٧٠٣ بۆ ماوەیەکە کە وەکوو ژەنیاری کەمانجە لە ئۆکسترای دۆگ خایمار کاری کردووە ، دوای ئەوە لە ساڵی ١٧٠٧ بەهۆی لێهاتوویی لە ژەنیاری ئۆرگۆن گوواستراوەتەوە بۆ کەنیسەی شاری مولهاوزن . دوای گەرانەوەی بۆ خایمار یەکەم کاری ئۆرگۆنی بەناوبانگی نووسیووە ، وەك تۆکات کە ئۆپێرا بووە لە وولاتەکەدا .

لەساڵی ١٧١٦ خایماری جێ هێشتووە وبووە بە سەرۆکی تیپی مۆزیکی دیوەخان لەلای لیۆبۆلدی فەرمانرەوای شاری – ئافهالت ، کۆنت – کە ئەوکات خوودی فەرمانرەوایی لەسەر فیولا دەبژەن ، کە یۆهان خۆی

سەرۆکایەتی ئەو تیپەی دەکرد ... دوای ئەوەی کە خۆی لە خزمەت کەنیسە رزگار دەکا وبۆ ئەوەی سەرپەرشتیار ودانەری میوزیکی بێت بۆ ئامێرەکان ، زۆربەی کارە بایەخدارەکانی خۆی دەنووسێتەوە لەوانە :- ٦ پەری بواندنیزەگیە لەسالی ١٧٢١.

دوای ئەوە لە سالی ١٧٢٣ لە شاری لایبزیك لە ئەلمانیا بۆ ماوەی زیاتر لە ٢٥ سال جیٚ نشین دەبێت...لەسالی ١٧٤٧ سەردانی پاشای گەوورە - فریدریکی - کردووە و پارچەیەك مۆزیکی پێشکەش کردووە . کە دانانی ئەو بابەتەش لەلایەن خۆی وئەو پاشایەوە بوو ... یۆهان سباستیان باخ لەهەموو جۆرەکانی شێووە مۆزیکیەوە ناسراوەکانی لە سەردەمی خۆی داناوە ، لەسەر ئاینی پرۆتستانتسی لە ئەلمانیا .

کە ئەمەش لەبنەرەتدا بۆ زۆربەی کارە مۆزیکیەکانی بووە ، بە پاش کەووتوویەکی بەرهەمی هونەری سەدان پارچە مۆزیکی بە شێووە دارشتنی جۆراوجۆر ، هەروا نزیکەی ٥٠ گۆرانی نووسیووە ... یۆهان گرنگی تایبەتی بە بواری مۆزیکی ئۆرگۆن داوە ، کە زۆر پارچە مۆزیکی لەسەر ئەم ئامێرە داناوە لەجۆری مانتازیا وبرلبوودو وڤۆگە وسۆناتا .

هەروا گرنگی زۆری بە ئامێرەکانی هاوشێووە داوە بەتایبەتی گلاڤان . ئەم کەسایەتیە ناودارە هونەرمەندە بەردەوام دەبیٚ لەکارە هەمە جۆرەکانی مۆزیکا تاکوو لە ١٧٥٠/٧/٢٨ لەشاری لایزبێك مالئاوایی دوایی لەهونەر دۆستان لە وولاتەکەی دەکات...دوای مردنی لە ئەلمانیا وەك وەفایەك وریٚزلێنان لە سالی ١٨٩٤ پاشماوەی تەرمەکەی دەگووازرێتەوە بۆ کەنیسەی سان تۆماس ولەویٚ بە یەکجاری بەخاك دەسپێردرێت.

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی ٢/.

## ١٦٨٦ 

١٦٨٦/٩/٢ لە دوای گەمارۆدانی هێزەکانی سووپای عوسمانی لە لایەن هێزەکانی سووپای نەمسا بەسەرکردایەتی - دۆك دی لۆرین - لە دەووروبەری زێی دانووب و شاری بوود ، لەو کاتەدا سولتانی عوسمانی بریاری لە دەسەلات لادانی - ئیبراهیم پاشا - سەرەك وەزیرانی عوسمانی - سەدر ئەعزەم -

له دەسەڵاتدا ... به جێگـه گرتنـەوەی لەلایە سلێمان پاشا ، بەلام لـه ئەنجام هێزەکانی سووپای عوسمانی شکان به کووشتنی دادووەرەکەیان- عەبدی پاشا .

که لەو کاتە زیاتر له ٤٠٠٠ چوار هـەزار سـەرباز بەزین لـه گۆرەپـانی شـەڕ هـەلاتنیان و بەسـەرکەووتنی هێزەکـانی هاوبـەش بەسـەرکرایەتی- دۆك دێ لـۆرین - کـه ئـیتر هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی چـیدیکه نـەیانتووانی رووبەرووی هێزەکانی سووپای مەسیحی ببنەوە لەهەرێمەکەدا .

 ١٦٨٩



١٦٨٩/١/١٨ لـه دایـك بـوونی روونـاکبیرو کەسـایەتی بـەناوبانگی وولاتـی نەمـساو جیهـانی - سارڵ لوی دی-مونتسکیۆ - له کۆشکی- دیلابریر- له نزیك شاری بۆرۆدی له نەمسا.

 ١٦٩٠

١٦٩٠/٧/١٢ لـه دوای شـەڕیکی درێژخایـەن لـه نێـوان هێـزە چـەکدارەکانی ئێرلەنـدی بەیارمـەتی و پشتیووانی ئیسکۆتلەندیەکان ، هێزەکـانی سووپای بـەریتانیا هێرشیان کردە سەر هێزەکانی سووپای ئێرلەندا له ناوچەی - لایۆین - ، لە ئـەنجام هێزەکـانی سـووپای بـەریتانیا سـەرکەووتنیان بەدەسـت هێنالـه ناوچەکەدا .

 ١٦٩١

١٦٩١/٦/٢٣ سولتانی عوسمانی سولتان سلێمانی دووەم له دوای سێ ساڵ لـه دەسـەلات له تەمەنی ٥٠ سـالیدا کۆچ دوایـی کـرد...شایانی باسه سولتان سلێمان لـه مـاوەی دەسـەلاتی لـەو سـێ سـالەدا تـووانی ناوچـه لـه دەسـت دراوەکـانی بگەرێنێتەوە ژێر دەسەلاتی عوسمانی ، وەك - سەلمان پاك- مـەدائن ونس و ویـن و سمندەریـەو بـەلگراد -، دوای مردنـی براکـەی ئەحمـەد خـانی دووەم

جێگەی گرتەوە بە وەرگرتنی دەسەڵات لە سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا .

## ١٦٩٢

١٢/١٧/ لە دوای ٤٥ ساڵ لە هێنانە خووارەوەی سوڵتانی عوسمانی سوڵتان
١٦٩٢ مستەفای چوارەم لە دەسەڵات بەهۆی دەبەنگی و سەرنەکەوتنی لە جەنگە یەك لە دوای یەکەکان لە داگیرکردنی خاکی گەلان لە هەموو لایەك لە ماوەی دەسەڵاتی و لە تەمەنی ٥٣ساڵی کۆچی دوایی کرد ، کە ماوەی دەسەڵاتی ئەو سوڵتانە لە ٤٠ ساڵ زیاتر بوولە سەر ئیمپراتۆریەتەکەدا .

## ١٦٩٧

١٦٩٧/٩/٢٠ لە دوای وەرگرتنی دەسەڵاتی عوسمانی لە لایەن مستەفاخانی دووەمی کوڕی سوڵتان مەجیدی چوارەم... دوای سەرکەووتنی لە چەندین لایەنە جۆراو جۆرەکانی شەڕی بە دەست هێنا بەسەر هێزی سووپاکانی نەمساو دەرکەووتنی سووپای رووسیای قەیسەری و هاوپەیمانیان.
ئەویش لە دوای گفتووگۆی بەردەوام ، لە ئەنجام پەیمانی- ریسویك - مۆرکرا ، لەلایەن نەمساو لەلایەکی دیکە ئەڵمانیاو ئەسپانیاو ئنگلتەراو هۆڵەندا لە لایەکی دیکەدا . لە پێناو بەرەنگار بوونەوەی هێزەکانی سووپای عوسمانی و فراوانکردنی دەسەڵاتی خۆیان لەسەر هەرێمەکان و دابەشکردنی خاکی گەلآن لە نێوان خۆیاندا .

## ١٦٩٩

١٦٩٩/١/٢٦ مۆرکردنی پەیمانی- کارلۆفتس- لەنێوان دەسەڵاتی عوسمانی لەگەڵ وولاتانی نەمساو رووسیای قەیسەری و بووندەقیەو پۆلۆنیا کە وولاتی مەژەر بە تەواوی و ، لە هەمان کات هەرێمی ترنسلفانیا بۆ نەمسا بە وازهێنان لە شاری ئازاق بۆ رووسیای قەیسەری ، کە بووە هۆی ئەوەی . کە دەسەڵاتیان بە تەواوی بەسەر دەریای رەشدا بشکێ و سنوورێك بۆ دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ناوچەو هەرێمەکان لەجیهان دابنێن.

## ١٧٠٣

١٧٠٣/٥/١٧ لە دایك بوونی دامەزرێنەری مەزهەبی وەهابی- محەمەد عەبولوەهاب - لە شارۆچکەی عەینە لە باکووری شاری ریازی سعودیە ، بە دووری ٤٠ کیلۆمەتر، ناووبراو لە کەش و هەوایەکی گوونجاو پێگەیشتووەو لە بنەماڵەیەکی زانای ئیسلامی بووەو باوکی زانایەکی ئاینی ئیسلام بووە ... هەروا باپیری موفتی ئاینی شاری نەجد بووەو پێشەوای فیقە بووە .

هەروا ماڵەکەی ببووە ماڵێکی زانستی و ئاینی و گرنگی بە دانراوەکانی کوڕی- تەمیمی- دەدا ، چەندین جار سەردانی چەندین شاری وەك :- حیجازو ئەحساو بەسرەی کردووە لە سەردانەکانی چاوی بە زانایانی ئاینی ئیسلام و مەسیحی کەووتوە ، لە دوای چەندین کێشەو ململانێی بیروو بۆچوون و هەلوویست بە بەرەتکردنەوەی دەیا بیروو بۆچوون ، کە برووای پێ نەبووە ، لە دوای گەرانەوەی بۆ شاری عەینە - عوسمان موعەمەر- یارمەتی دا لە پێناو بلاوو کردنەوەی داواکەی و دەستی کرد بە ئەنجامدانی مەزهەبی وەهابی و بلاوو کردنەووە لە بەرگری لێکردنیدا ، هەر بەم هۆکارە ئەو دارەی کە خەلکی بە پیرۆزیان دەزانی و ئەو گوومەتەی کە لە سەر گۆری زەیدی کوڕی خەتاب بوو هێنایە خووارەوە لەگەڵ چەندین کاری دیکە لە پێناو چەسپاندنی بیری وەهابی ، کە ئەو بیرە بیرێکی توندڕەوە لە ناو ئاینی ئیسلام و سەرچاوەی دورستکردنی کێشەو گرفت و دووبەرەکییە .

ئەمەش کە بووە هۆکاری سەرهەڵدانی پارت و گروپە ئیسلامیەکان ، لە هەمان کات ئەو بیرە وەهابیە نەگوونجاوە لەگەڵ مەزهەبەکانی دیکەی شیعەو سوونەی ئیسلام و دژ بە زۆر لە کارو کردارەجۆراو جۆرەکانی ئاینی ئیسلامە .

١٧٠٣/٨/١٥ لە دوای دورست بوونی باری ناهەمواری ناووخۆو دەرەکی لە ناو دەسەڵاتی عوسمانی بە سەرکردایەتی سوڵتان مستەفای دووەم لە ماوەی ٨ ساڵ لە دەسەڵاتەکەی ... لە ئەنجام بووە هۆی ئەوەی کە لە سەر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لابرێ... دوای ئەوە لە ١٢/٣١ ی هەمان ساڵ سوڵتان مستەفای دووەم لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

## ١٧٠٧

١٧٠٧/٥/١ هەردوو پەرلەمانی ئۆسکۆتلەندی و ئینگلیزی هەڵوەشێندرایەوە و لە جیاتی ئەو دوو پەرلەمانە پەرلەمانی نوێی هاوبەش پێك هێندرا .
شایانی باسە رێکەوتنی یەکبوون و مانای کۆتایی هاتن بەئینگلتەرەو ئۆسکۆتلەندا بوو وەکوو دوو وولاتی سەربەخۆو لە دایك بوونی بەریتانیای مەزن بوو , کە بریتی بوو لە هاوسەرگیری بەرژەوەندی ... هەرچەندە هەردوو وولات بۆ ماوەی ١٠ ساڵ بە شا یان شاژنێك بەشداریان کردبوو لە ساتی یەکبوونی هەردوو تاج لەساڵی ١٦٠٣ ، کە ئەو کاتەی شاری ئوسکوتلەندا – جیمسی شەشەم – لەجێگای شاژن ئەلیزابیتی یەکەم تەختی پادشایەتی وەرگرت ، کە هەردوو وولاتی وەکوو دوو وولاتی بەرچاو مانەوە ... کە ئەوکاتەی ئینگلتەرا .
لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەم لەگەڵ فەرەنسا تووشی جەنگ هاتوو شا لویسی چوارەمیش دەستی کرد بەهاندانی شای کلۆلیك جیمسی هەشتەم لەئینگلتەراو ئۆسکۆتلەندا ، پێویستی بەوەکرد میراتی پرۆتستانتی شاژن – ئان – بپارێزێت و لەترسی ئەگەری ئەوەی کە لایەنگیرانی شا جیمس ئۆسکۆتلەندا لە دژی ئینگلتەرا دەرگای پشتەوە بشکێنن لە شارەکەدا .

## ١٧١١

١٧١١/٧/٢ مۆرکردنی پەیمانی – فکزنی – لە نێوان دەسەڵاتی قەیسەری رووسیاو دەسەڵاتی عوسمانی ، کە بووە هۆی جێ هێشتنی چەندین ناوچە وەك :- هەرێمەکانی قەوقاس و دەریای سپی ناوەراست بۆ دەسەڵاتی عوسمانی ، کە زۆربەی لە سەر خاکی باکووری کوردستان بوو لە کێشووەرەکەدا ، ئەویش لە پێناو بەرز کردنەوەی بەرژەووەندی خاك و ئابووری و دەسەڵاتەکانیان

## ١٧١٢



١٧١٢/٦/٢٨ لــه دایــك بــوونی نووســەرو رووناکبیری جیهانی -جان جاك رۆسۆ- له شاری ژنێف لـــه خێزانێکـــی بـــه ڕەگـــەز فەرەنـــسی بـــاوکی رۆســـۆ سەعاتـچی و لـه هـەمان کـات ماموٚسـتای - بالیـه - بـووه ، هـەروا دوای ٨ دایکی مردووه ، هـەروەکوو خـۆی دەڵـێ - بـه لاوازی و نەخۆشـی لـه دایـك بـووم و دایکم ژیانی خـۆی بـه له دایك بوونم بەخشی ئەو له دایك بوونـەم کارەساتی یەکەمم بوو - هـەرو دوای مردنـی دایکـی ، بـاوکی نـەیتوانیووه رۆسـۆ بـه خێـو بکـات و لـه لا؛ ماموٚژنی به خێوکراوه .

شایانی باسه ئەو کەسایەتیه له شاری سانفرانسیسکۆی بەریتانیا له دایـ بووەو له تەمەنی ٤٠ سالیدا کۆچی دوایی کردووه.واته له ١٧٧٨/٧/٢ ، ﻟ دوای بی ئـەنجام گەیانـدنی داخوازیـەکانی لـه زانـست و ئـەدەب و هونـەره دەیا کاری دیکه له ماوەی ژیانیدا .

## ١٧١٣

١٧١٣/٦/١٨ مـۆرکردنی پـەیمانی- ئەدەنـه - لـه نێـوان وولاتـانی هۆڵەنـداو بـەریتانیا رووسیاو دەسەڵاتی عوسمانی ، ئەویش بە هـۆی دەست تێووەردان لـەکار بـاری نـاووخۆو دەرەوەو پەیووەندیـه تایبـەتی و گـشتیەکانی نێوانیـان بەتایبەتی پەیووەندی بازرگانی لەسەر بەندەرو کەنارەکانی دەریاو زەریـا زێکاندا ، که له ئاکام ماوه به دەسەڵاتی عوسمانی درا کاره بازرگانیو راو ماسی له سەر کەنارەکانی دەریای رەش ئەنجام بدات .

## ١٧١٧

١٧١٧/٦/٢٤ ئەم رۆژە بە رۆژێكی گرنگ لە قەڵەم دەدرێت لەلایەن مێژووی ماسۆنییەكان ، ئەویش بەپەرپینەوەی بیری ماسۆنیەت لە سەردەمی كۆن بۆ سەردەمی نویێ ، لە بەر ئەوەی لەم رۆژەدا لە لەندنی پایتەختی بەریتانیا ماسۆنیە دێرینەكان بڕیاریاندا بە دامەزراندنی كۆمەڵەیەكی نوێی جیاواز لە ئامانجەكانیان و چۆنیەتی ئەندامان لە سەندیگا كۆنەكان ، كە لەریزی ماسۆنیەكان بوون ، دوای ئەوە ئەو كۆمەڵەیە نەك هەر لە لەندەن پەرەی سەند بەڵكوو بەرەو ئەورووپاو هەموو ولاتانی دیكەی جیهان هەنگاوینا .

شایانی باسە بیری ماسۆنیەت پەرەسەندن و گەشەكردنی بەخۆیەوە بینی بەهۆی جیاوازی بڕووای ئایینی لە سەر زەوی و كێشەی نێوان ئایینیەكان و كۆك بوون لەگەڵ هەمووئایینەكان . كە ئەمەش بووە هۆی دامەزراندنی یەكەم رێكخراوی ماسۆنی لە شاری لە ندەنی پایتەختی بەریتانیا ، لە لایەن دەوڵەمەندە یەهودیەكان ، ئەویش لە پێناو خزمەتكردنی ئیستیعماری بەریتانیا و هاوپەیمانانی لە جیهان بەتایبەتی لە ئەورووپای رۆژئاوا.

## ١٧١٨

١٧١٨/٧/٢١ مۆركردنی پەیمانی بەناوبانگی- بساروفتس- لە دوای سەركەووتنیان بەسەر سەرەك وەزیرانی دەووڵەتی عوسمانی - خەلیل پاشا- كە لە پێناو یارمەتی دانی شارەكە هاتبوو بۆ مۆركردنی پەیمان .

كە نەمساو وولایەتی تمسووارو شاری بەلگرادو بەشێكی مەزن لە وولاتی سرب بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی لە هەمان كات كۆماری بووندەقیەش هەر وەك خۆی بمێنێتەوە لە ناوچەكەدا .

## ١٧٢١

١٧٢١/١٠/٢ سەركردەی فارسی سەفەوی- خوداد بەگی ئەفشار- بەخۆی و هێزێكی گەوورە لە دوای چەندین جار هێرش و پەلاماردانی هۆزو تیرەكانی كوردو بەردەوام بوونی لە هێرشەكان ... دوای ئەوە بەرەو لاجان هەنگاوینا لە

بناری شاخی قەندیل لە رۆژهەلاتی کوردستان .
کە مەڵبەندی هۆزی بلباس بوو، لە کاتی گەرانەوەی دا بەدیل و تالانەکەیەوە شەرکەرەکانی بلباس لە ناکاو هەلیان کووتایە سەری و پاسەوانەکانیان کووشت و دیل و تالانەکانیان لێ سەندەوە . لەئاکام هێزەکانی ئەفشار هەلاتن بە هۆی بەسەرنەکەووتنیان خووداد بەگ ، لە داخا خۆی کووشت و هۆزی بلباس سەرکەووتنیان بەدەست هێنا لەشەرەکەدا بەهەلاتنی هێزەکانی سووپای فارس لە ناوچەکەدا .

## ١٧٢٣



١٧٢٣/١٢/١١ دەرکەووتنی کەریم خانی زەند لە ناو سووپای نادرخان ، کە کەسایەتیەکی کوردی بەجەرگ و لێهاتوو بوو ، کە لە گەڵ عەلی مووراد ی سەرکردەی بەختیار رێکەووتن ، بەلام بە هۆی جیاوازی بیروو بۆچوونیان ، عەلی مووراد ی لەناووبرد ، دوای ئەوە بووە سەرکردەی ناوچەکانی ژێردەسەلاتی عەلی مووراد .
دوای ئەوە سەرکەووتنی بەسەر قەجەریەکانی ئەفگان هێناو بەرەو فراوانکردنی دەسەلاتەکەی هەنگاوینا تاکوو گەیشتە دوا پلەی سەرکەووتن و ماوەی ٣٠ ساڵ دەسەلاتدار بوو ، لە ماوەی دەسەلاتی رێکەووتنی لەگەڵ بەریتانیا مۆر کردو سوودی لەکەشتیە بازرگانیەکان وەردەگرت ، دوای وەوە هەولی بووژانەوەی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتەکەیدا..
ئەو بنەماڵەیە یەك لە دوای یەك بەردەوام بوون لە دەسەلات تاکوو مانگی/ ١٧٤٩/٧ ، ئەویش بەهاتنی محمد ئاغا لە ئەنجامی شەرێکی خووێناوی ، کە بووە هۆی بەرەو تووانەوەی بنەماڵەی کەریم خانی زەند . لە نێوان دوو دەسەلاتی دژ بەیەکتردا ، لەهەمان کات دژ بەکوردو خاکی کوردستان ، کە

ئەویش ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسی سەفەوی بوون لە هەرێم و ناوچەکەدا .

## ١٧٢٤

١٧٢٤/١/٢٨ دروستکردنی باڵەخانەی ئەکادیمیای زانستەکان لە شاری پترسبۆرگی پایتەختی رووسیای قەیسەری ، لە لایەن قەیسەر... کە ئەو باڵەخانەیە بوو بە کۆگایەکی سەرەکی بەلگەنامە جۆراو جۆرەکانی نەتەوەیی و نیشتمانی و ئاینی گەلان لە هەموو بووارەکاندا ، بە تایبەتی گەلی کورد .
کە زۆربەی زۆری بەڵگەنامە بە نرخەکانی لە سەر باری کوردی تیایە لە بووارەکانی نەتەوەیی و نیشتمان و زمان و مێژوو و داب و نەریت و کەلتووروشارستانیەت و شووێنەواری کوردو خاکی کوردستان .

١٧٢٤/٤/٢٢ لەدایک بوونی مەزنترین فەیلەسوفی سەردەمی نوێ - لامانایل کانت — لە شاری کینگسبرگ لە پرووسیای رۆژهەلات ... کە باوکی پینەدۆزێکی راستگۆبووە لە کارەکەیداو دایکیشی دینداریەکەی زۆرتووند بووە . هەر لەبەر ئەوەش کانت پەیوەندی بە بەرێوەبەری پەیمانگای - فریدیک فرانس شۆلتس — کردووە و بەردەوام بووە لە خووێندن ، لە ساڵی ١٧٣٢ تا ١٧٤٠ .
دوای ئەوە چۆتە زانکۆی کینگسبرگ لە مانگی/٩/ ١٧٤٠. لەدوای دەرچوونی لەزانکۆ بەهۆی باری نا لە باری ئابووری رووی لەکارکردن کردووەو دوای ئەوە چۆتە خووێندنی باڵا لەزانکۆو بروانامەی ماجستەری بەدەست هێناوە لە ١٧٥٥/٦/١٢ .

هەروا بە مامۆستا لەزانکۆ دامەزراوە و وانەکانی فیزیاو ماتماتیک ویاسای سرووشتی و زانستی ئەخلاقی و لاهووتی گووتۆتەوە بۆماوەی ١٠ ساڵ .
دوای ئەوە بەشێووەیەکی فەرمی لە ١٧٧٠/٣/٣١ بە مامۆستا دامەزراوە ...
لەساڵی ١٧٨٠ بۆتە ئەندامی ئەنجوومەنی پیرانی ئەکادیمی و لە ١٨٨٧/١٢/٧ بووە ئەندام لەئەکادیمیەی شانشین ، بۆ زانستەکان لە شاری بەرلینی پایتەختی ئەلمانیاو بەردەوام بوونی تاکوو لە ١٨٠٤/٢/١٢ کۆچی دوایی دەکات لە وولاتەکەدا .

سەرچاوە:— مەوسوعەی فەلسەفە — داناتی — دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی — بەرگی /٢.



## ١٧٢٧



١٧٢٧/٧/٢٠ لە دوای هەوڵە بێ وێنەکانی ئـەویش بـە کۆچـی دووایـی زانـای مـەزنی و بـەناوبانگی ئینگلیــزی و جیهـــان و فیزیانـــاس و داهێنـــەری بیرۆکـەی تێئـووری بیرکـاری -ئیــسحاق نیــوتن - ئــەم مرۆڤـە لـە ١٦٤٢/١٢/٢٥ لـە هــەرێمی - لینکـۆلن - لــە ئینگلتـەرە چاوی بە جیهان هـــەڵهێناوە ، دوای تـــەواو کردنی قۆناخەکانی خوێندن لە لایەن دوو مامی پسپۆڕی سەرپەرشتی کراوە ، کە ئەوان ناوکیان بڕیووەو گوتوویانە ئەم منداڵە دوو ڕۆژ ناژی .

کەچی قەدەر وای کرد کە گەوورە بێت و ٨٥ ساڵی پڕ لە پێشکەشکردنی بەخـشیش بـژی و ببێتـە گـەورەترین زانـای فیزیـاو بیرکـاری و خـاوەنی گـەورەترین و بـاڵاترین هـۆش و هەسـت و بیرکـەرەوە بێـت و هۆشـێکی زانشتیانە هەڵگرێ .

١٧٢٧/١٠/١٢ لـە دوای دابەشـکردنی ناوچـەو هەرێمـەکانی ژێردەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی و رووسـیای قەیـسەری ، کـە زۆر لـەو ناوچـەو هەرێمانـە خـاکی کوردستـانیـانی دەگرتـە خۆ ... لـەو کاتـەش دەسـەڵاتەکانی ئەمساو فارسـی سـەفەوی بـەو دابەشـکردنە رازی نـەبوون بەتایبـەتی لـە سـەر ناوچـەکانی - سـەلمان پـاك ، مـەدائن- کـە ئێـستا دەکەووێتـە باشـووری رۆژهـەڵاتی شـاری بەغدا ، هەروا ناوچـەی مـەریوان لـە رۆژهـەڵاتی کوردسـتانی ژێردەسـەڵاتی فارسی ئێران، تەبریزدا .

کە ئەمەش بووە هۆی لێك ترازانـی پەیوەنـدی نـاوخۆیی دەسـەڵاتی فارس و

کێشەی نێوان شائەشرەف ... بەر لەوەش میر محەمەدی ئەفگانستانی کوشتبوو لەگەڵ شا تەهماسبی ساسانی، کە ئەنجامەکەی بووە هۆی مۆرکردنی پەیمانی نوێی نێوان ئەو لایەنانە لە سەر خاکی گەلان بە تایبەتی خاکی کوردستان .

## ١٧٣٣



١٧٣٣/٢/١١ لە دایك بوونی شۆرشگێرێکی ئەمەریکی و دامەزرێنەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو یەکەم سەرۆکی ویلایەتەکگرتووەکانی ئەمەریکا – جۆرج واشنتن– لە شاری واشنتۆنی پایەختی ئەمەریکا... شایانی باسە ئەم مرۆڤە توانی سەربەخۆیی ئەمەریکا بەدەست بێنی بەجیابوونەوەی لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیای مەزنی ئەو کاتدا هەروا بەردەوام بووە لەپێناو یەکخستن و بەهێزکردنی وولاتەکەی لەهەموو بوواره جیاجیاکان ، بەتایبەتی لەبوواری ئابووری وبازرگانی سەربازی تائەو کاتەی لەتەمەنی – ٦٧– ساڵیدا ماڵئاوایی لە ئەمەریکاو گەلانی ئەمەریکا کرد لە ١٧٩٩/١/١٤ لە شاری مۆنت فیرنۆن و هەر لەوێ لەگەڵ مارتاوی خێزانی نێژراون لە گۆرستانی شارەکەدا .

١٧٣٣/١٠/٢٤ بەرپابوونی شەرو پێکدادان لە نێوان هێزەکانی سوپای عوسمانی و هێزەکانی سووپای فارسی سەفەوی ، لە ناوچەی لەیلانی رۆژهەڵاتی شاری کەرکوك لە باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێستای ئێراق ، لە ئەنجام هێزەکانی سووپای عوسمانی شکان و پاشەکشەیان کردو هێزە چەکدارەکانی کوردیش بەشداریان لەو شەرِدا کرد ، بە یارمەتیدانی هێزەکانی سووپای فارس ، لە هەمان کات بەرگری کردن بوو لە ناوچەکەدا .

## ١٧٣٤

١٧٣٤/١١/٢٧ یەکەم گەرۆکی فەرەنسی کە سەردانی شاری کەرکوکی کردبێت – ژانی ئۆتێ – بــووە ، کــە گەشــتەکەی خــۆی دەســت پێکــردووە و لــە ســاڵی ٧٨٤ سەفەرنامەکەی خۆی بەناوی – گەشت بۆ تورکیا و ئێران – بە پێوەند لەگەڵ لەشکر کێشەکانی – تەهماسب قوولی خان – لە پاریس لە دوو بەرگدا بە چاپگەیاندراوە و بڵاوکراوەتەوە .

جێگەی باسکردنە کە ئۆتێ لەسەفەرنامەکەی دەنووسێ و دەڵێ :–
بەیانیــەکی زوو بــوو گەیــشتمە شــاری کــەرکوك ، کــە کــەرکوك پایتــەختی حکوومەتی شارەزوورە کە بەشێکی کوردستانە ، ئەم حکوومەتەش بۆ سێ دوو هەرێمی لاوەکی دابەش دەبێت و کەوتۆتە نێوان ئازربایجان ، ئێراق فارس ، وویلایەتەکانی بەغدا ، موسل ، ئامێدی و هـەکاری ، کوردەکانی گۆران – Kiourans – کە گەورەترین بەشیان لە ژێر دەستدایە و شووێنی سەرەکیان نــاوی – پلنگانەیــە وشــارێکی گەورەیــە لــە ناوچــەی – قزلجە –
هەروا لە بارەی پاشای کەرکوکەوە دەنووسێ:–
پاشــای کــەرکوك ووریــای دووژمنایــەتی ئێرانــە و بریــاری داوە قەڵاکــە ئامادە بکات و بە پەلە کاری تێدا بکەن بۆ چاککردنەوەی ئەو پەرژینەی کە لە زۆر شووێنەوە بۆتە کەلاوە .

هەروا گەرۆکێکی دیکەی فەرەنسی – رۆسۆ – دیبلۆمات و گەرۆکی ناودار، سەر بە بنەماڵەی – ژان ژاك رۆسۆ – لە ساڵی ١٨٠١ سەردانی کوردستانی کــردووە و لــە کتێبەکــەی خۆیــدا – وەســپی پاســالێکی بەغــدا – کــە لــە ساڵی ١٨٠٩ لە پاریس چاپکراوە و دەنووسێ :–
کــەرکوك شــارێکە خــراپ بوونیــاتنراوە , بــە نزیکــەیی شــارێکە بــێ بــەرگری دەتــوانین بەرزایەکــەی لــە رووی دەریــاوە بــە ٣٦ پلــە بخــەملێنین ، هێڵی درێژیەکەشی بە ٤٣ پلەو چەندین چرکەیەك بخەملێنین ، کەرکوك کەتۆتە سە بەرزیــەکی ٥٥ فەرســەخ Lieu لــە بەغــداوە دوورە ، لەلایــەن موتەســەلیمێکەو حــووکمرانی دەکــرێ ، کــە فــەرمانی بــۆ دێ بــۆ چاکردنــەوەی ئــەوەی پێویست بیکات ، بۆ پاراستنی شارەکە لە هەموو دەست درێژیەك لەلایەن کوردەکانەو ، خەڵکەکــەی چــالاکن ، پیــشەسازیکارن ، لــە حاڵــەتی ئامادەباشــیدا دەتــوانن شەش سەد چەکدار بخەنە بەر دەست پاشا کە لە زۆر هێرشی هەمە چەشنە

ئازایی بوون .

هەروا گەرۆکێکی دیکە بەناوی – ئۆلیڤیێ – olivier – کە بە فەرمانی حکوومەتی فەرەنسا گەشتێك بۆ ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەکات و دواتر سەفەرنامەکەی خۆی لە پاریس لەساڵی ١٨٠١ – ١٨٠٧ بەناوی – گەشتێك بۆ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، میسر ، ئێران – لە سێ بەرگی گەورەدا بڵاودەکاتەوە و ئۆلیڤەر لەو کتێبانەیدا دەنووسێ و دەڵێ :-

هێشتا دووکاتژمێری دیکە رۆیشتین گەیشتینە بەردەم شاری کەرکوك ، مەسیحیەکان ئێمەیان جێهێشت و بۆ دیدەنی چەند خالیدییەك چوون ، تەتەرەکەمان پێشمان کەووت تا نامەیەکی پاشای موسل بداتە مووتەسەلیم و داوای لێبکات شارەزایەکمان بۆ پەیدا بکات تا بەغدا .

هێشتا کە فەرسەخێکمان مابوو گەیشتینە گوندێك بەناوی – تسیین – Tissin – لە ناوچەکەدا . هەروا ئۆلیڤەر دەڵێ :-

ئەم وولاتە زەوی و زارێکی پر خێرو بەرەکەتی هەیە ، کەرکوك وەك هەولێر کەووتۆتە سەر گردێکی دەستکرد و لەناوەراستی پێدەشتێکی گەورەدایە و وەك قەڵای هەولێر بۆ پاراستنی بە پەرژینێك دەووردراوە ، کە زۆربەی هەرە زۆری دانیشتووانەکەی لە کورد پێکهاتوون و بە شێکە لە کوردستان .



The Ottoman Empire, 1481—1683.

## ١٧٣٥

١٧٣٥/٤/١٥ سەردانی یەكەم جاری گەشتیاری فەرەنسی – ئۆتیر– بۆ شاری كەركوك ل
باشووری كوردستــان ، كــە لەوكاتــەی كــەركوك دەســەلاتی ئیمــاراتی بابـا
وئەردەلان گەشـەی بـەخۆ دەدیـت ، لـە هـەموو بوارەكـان بەتایبـەتی لـەبوار
ئابووری و بازرگانی و ئاوەدان كردنەوە .
دوای ئەوە لە سالّی ١٧٣٩ دووبارە گەراوەتەوە شاری كەركوك و لە نیووە
یەكەمی سەدەی هەژدەم ، كە شاری كەركوك قەبارەی گەوورە بوونی لە ما
ناوەندیـدا بـوو ، لـەو كاتـەش كـەركوك دابـەش دوو بـەش دەبـوو ... ك
یەكەمیان :– قەلاكەی و بەشی دووەمیان دانیشتووانی دەووروبەری قەلاك
بوو ، كە كەركوك پایتەختی – لیاسالیت – یاشوبە – واتە شارەزوور بوو
لە باشووری كوردستان ، كە حكوومەتی شارەزوور لـە ٣٢ كـەرت پێكهاتبوو
كـە باشـالیت شـارەزوور لـەئازربایجان و بابـان و وولاتـی بەغـداو موسـل
عمادیەو هەكاری پێكهاتبوو لە هەرێم وناوچەكەدا.
دوای ئەوە ئەندازیاری رووسی – یوسیب تشیرنیك – كە لە سالّی ١٨٧٢ -
١٨٧٣ سەردانی شاری كەركوكی كردو لێكۆلینەوەیەكی لەسەر نووسی ..
كـە لـەو كاتـە ژمـارەی كـورد لـەنێوان ٢٠– ٢٥ هـەزار كـەس دەبـوو ، جگ
لەسەربازەكانی دەسەلاتی عوسمانی و٤٠ مالّ لەمەسیحیەكان ، كە ئەوانیش
ئەرمـەنی بـوون ...هـەروا دانـەری عوسمـانی – شەمـسەدین سـامی – كـە ل
رەچـەلّەك ئـەلبانی بـوو لـەدانراوەكانی ژمـارەی دانیـشتووانی كـەركوك
بە٣٠٠٠٠ هەزار دیاری كردووەو سێ یەكی كورد بوونە لە شارەكەدا .

١٧٣٥/٥/٢٤ دامەزرانـدنی دەوولـەتی ئەفشار لەلایـەن نادرخـانی كـوری ئیمـام قلـی.. ئە
دەوولّەتە ٢٥سالّ بەردەوام بوو، كە چوار سەركردە ئەو دەوولّەتـەیان بـەرێوو
بـردووە تـا مـانگی /١٧٩٥/٧. ئەویش یەكـەم دەسـەلاتداریەتی لـە سـەر ئە
دەوولّەتـە بـە سـەركردایەتی نادرخـان بـوو... وەك رێگرێـكو پـارەو سـاما
كۆكەرەوەو بەرەلّلای لە دەسەلات ، كە هەموو شتێكی لە پێناو دەسـەلاتەكە
بوو، بە ناوی شای سەفەوی تەهماسبی دووەم .

هەروا دواى خۆى ، برازاکەى عەلى ئيبراهيم بوو ، کە لە مانگى /١٧٤٧/١دەسەلاتى گرتە دەست تاکوو سەرەتاى مانگى /١٧٤٨/١، دواى ئەويش ئيبراهيم دەسەلاتى گرتە دەست، بەلام ماوەى دەسەلاتەکەى ئەو زۆر کوورت بوو .. دواى ئەوانيش- شارەخ رەزا قلى نادر- کە لە ١/٢/ ١٧٤٨دەسەلاتى گرتە دەست تاکوو ١٧٩٥/٧/١٨ لە دەسەلات بەردەوام بوو، دواى ئەو دەسەلاتە هەلوەشێنرايەوەو دەوولەتى زەنديەکان سەرى هەلدا ئەويش لەلايەن سەرکردەى لێهاتوو کەريم خانى زەندى کوردى بوو لە هەرێمى رۆژهەلاتى کوردستان.

## ١٧٣٦

١٧٣٦/٥/١٢ هێزەکانى سووپاى فارسى سەفەوى هێرشيان کردە سەر هۆزى - عەشيرەتى- بلباس لە هەرێمى رۆژ هەلاتى کوردستان ، کە نزيکەى ٢٠٠٠ دوو هەزار سەرباز دەبوون ، لە ئەنجامى شەرێکى سەخت بە دەيان چەکدار شەهيد کران و بەدەيا چەکداريش بەديل گيران ، ئەوانى ديکەش پەرت و بلاوەيان لێکرد.

کە ئەمەش لەلايەن هێزەکانى محەمەد عيساخانى بەلگەرى ئەفشار ئەنجامدرا بوو... کە داواى لە نادر کرد يارمەتى بدات . لە پێناو سەرکووت کردنى هێزە چەکدارەکانى هۆزى بلباس يارمەتى نەدانى هۆزى بلباس لە ناوچەکەدا .

## ١٧٣٨

١٧٣٨/٧/٢لە دواى ٢١ سال لە دامەزراندنى کۆمەلەى ماسۆنى -باب کلمنت- شانشينى بەريتانيا راگەياندنێکى بلاوکردەوە بە قەدەخەکردنى کارى ماسۆنييەکان و بيرى ماسۆنيەکان بە ناوى ئەوەى کە دژى هەمووئايينێکى سەرزەوين لە جيهاندا .

## ١٧٤٠

/١٠/٢٠ ئيمپراتۆرى نەمسا شارلى شەشەم کۆچى دووايى کردو کچەکەى جێگەى

١٧٤٠ گرتەوە کە ناوی – ماریە تریزە – بوو ، کە یەکەم هەنگاوی ئەم خاتونە ئەو
بـوو کـە فەرەنـسای لەگـەل هەنـدێ دەوولـەتی دیکـە یەکخـست ، لـە پێنـا
بەربەرەکانی کردنو دابەشکردنی سامانەکان ، کە بووە هۆی هەڵگیرسانی
شەڕی نێوان هێزەکانی سووپای فەرەنساو هێزەکانی سووپای نەمسا .
ئەم شەڕە لە مێژوودا بەبەربەرەکانی– کیروز– دا دادەنرێت ، کە لەو کات
بنەماڵـەی ماریـە لـە ئـەنجام سـەرکەوتنی بەدەست هێنا لەسەر فەرەنساو
ناوچەو هەرێمە جیاجیاکانی ژێر دەسەڵاتەکەیاندا .

## ١٧٤٢

١٧٤٢/٣/٨ لـە دایـك بـوونی دامەزرێنـەری بنەماڵـەی خەجەریـەکان ئاغـا محەمـەد ..
شایانی باسە محەمەد زاواو خەزووری یەکتر بوون لە گەڵ کەریم خانی زەند
لە دوای مردنی کەریم خانی زەند لە ١٧٤٧/١/١٣ئاغا محەمەد بەرەو باکوو
گەراوەو خۆی کردە شاهەنشاو ئیماراتی پایتەختی فارسی کردە بارەگای
سەرەکی کارگێری دەسەلاتی خۆی کە دووبەش بوو، لە هەمان کات کێشەو
ململانێ سەری هەڵدا تا ئەو کاتەی کە بنەماڵەی زەندیەکان کۆتایی هات .
شایانی باسە ئەو بنەماڵەیە لە دانراوە بەنرخەکانی– ویل دیورانت– قصة
الحضارات) باسی لێووە دەکات.

## ١٧٤٣



١٧٤٣/٩/١٣ هێزەکانی سـووپای رژێمی فارس بە
سەرکرایەتی – نادر شای ئەفشاری–
گەیشتە ناو شاری هەولێرلە باشووری
کوردســـتان و دەســـتی کـــرد بـــە
کووشتنو وێـران کـردن لەشـارەکەدا ،
دوای جێبەجێکردنی مەرامەکـەی لـە
شـاری هـەولێر بـەرەو شـاری موسـڵ
بەرێکەوت .
لـــە ئـــەنجام رووبـــەڕووی هێـــزە

چەکدارەکانی – جەلیلیەکان – بوونەوەو نەیانتووانی شاری مووسڵ و دەووروبەری داگیر بکەن .

شایانی باسە کە ئەو جێگەی شەڕ لە نێوان هێزەکانی نادر شای ئەفشاری فارس و جەلیلیەکان لە ڕۆژهەلاتی مووسڵ ڕوویدا لە نزیك شاری موسڵە ، کە پێی دەڵێن ( ئەلبوسیف).

## ١٧٤٥

١٧٤٥/٢/٣ لە پێناو چاو شکاندنی دانیشتووانی وویلایەتی مووسڵ ، نادر شا خۆی داوای ئەوەی کرد ، کە دەستی لەسەر ئابلوقەدانی وویلایەتی مووسڵ هەڵگرێ و لە ساینەوە بەرەو سەردانی سۆمای برادۆست و قەلاکانی بانیەو بەردەرەشی کرد لە باشوورو ڕۆژهەلاتی کوردستان.

## ١٧٤٦



١٧٤٦/٤/١٢ لەدایك بوونی سێیەم سەرەك کۆماری وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا – تۆماس جیفرسۆن – لە شاری کۆلۆنیا لە نزیك –شارلۆتزفیك- ی ئۆستانی وویلایەتی – فیرجینیا– لە خانەوادەیەکی گەوورە ، کە باوکی ناوی پیتەر بووە خاوەنی زەوی و زارێکی زۆر بووەو دایکی ناوی (خنن) بووە .

ناووبراو لە تەمەنی ٣١ ساڵیدا دەستی کرد بە نووسین لەبارەی مافەکانی ئەمەریکاو گرنگترین مانفێستی دەرکردو پێشکەشی بە کۆبونەوەی – ولیام میزۆرك – لە ساڵی ١٧٧٤ ، کردو دەنگی دایەوە ... لە ساڵی ١٧٩٦ پارتی دیموکراتی کۆماری لە دژی فیدراڵەکان دامەزراند... تۆماس جیفرسۆن

بۆماوەی هەشت ساڵ حوکمڕانی ئەمەریکای کرد ، لە ساڵی ١٨٠١ تا ٨٠٩
. لە تەمەنی ٨٣ ساڵیدا لە ساڵی ١٨٢٦ کۆچی دوایی کردوو لە وولاتەکەدا.

## ١٧٤٧


مرقد الشیخ أدي

١٧٤٧/١/١٣ لـــە دوای کۆچـــی دووایی رابەری ئاینی ئێزیدیـــەکان عـــودەی موســـافر ، کـــە گۆڕەکـــەی لـــە مەزارگـــەی لالـــشی پارێزگـای دهۆکـە لـە باشـووری کوردسـتان ، ئـەو مرۆڤـە ئاینیـە رۆڵێ ســـەرەکی لـــە کوردستان هـەبووە لە سەدەی شەشەمی کۆچی، لە پێناو رێکخستنی بیروو بڕووای ئایینی لە چوا چـێووەی ئـاینی ئیـسلام ، لـەناو خـەلکی کـورد. کـە بـە پیرۆزتـرین زمـا دادەنرێت لە جیهان .

ئەویش بە ناوی ئەوەی کە زمانی خوا پیرۆزە کە – الجلوە ومصحفی رەش ی پـێ نووسـراوەتەوە ، دوای ئـەویش کـوڕی بـرای ئـەبوو بـەرەکاتی کـوڕ سەفەر جێگەی گرتۆتـەوە... دوای ئـەویش کوڕەکـەی ئـەبوو مـەخامر جێگـە گرتۆتەوە ، کە ناو زەند بوو بە عودەی کوردی تاکوو کۆچی دوایی کردوو لە لالش .

١٧٤٧/٦/١٩ کـووژرانی نادرشـای ئەفـشار لــەکاتی هێرشــکردنە ســەر دانیــشتووا کوردیەکانی خۆراسان لە رۆژهەلاتی کوردستانی ژێردەسەلاتی فارسدا .

## ١٧٥١



١٧٥١/٥/١٩ چوارەم سەرۆکی ئەمەریکا – مادیسۆن – لە بنەمالەیەکی بەنژاد بەریتانی لە فیرژینیا چاوی بە جیهان هەلێناوە ... کە شاعیرێکی گالتەوگەپ بووە . لە دوای خۆی ١٩ هۆنراوەی جێ هێشتووە ، کە زۆربەی ئەو هۆنراوانەشی ئاراستەکردن بووە بۆ بەرپرسانی ئیدارەی ئەمەریکا . بۆ ماوەی دوو خوولی هەلبژاردن سەرکەووتنی بەدەست هێناوە بۆ پۆستی سەرۆکایەتی کردنی ئەمەریکا .

لە ١٨٣٦/٦/٢٨ کۆچی دوایی کردووە . ئەم سەرۆکە ژیانێکی زۆر بەختەوەری بردۆتە سەر لەگەل کارە میریەکانیدا لە هەلسووراندنی کاروباری ئەمەریکاو پەیوەندیە ناوەخۆی ونێوو دەوولەتیەکان لە جیهاندا.

سەرچاوە :– ئیسکلۆپیدیای کوردستان و جیهان دانانی – عەلی کەندی – چاپی دووەم/٢٠٠٨ .

## ١٧٥٤

١٧٥٤/١٢/١٣ سولتانی عوسمانی سولتان محەمەدی یەکەم لە تەمەنی ٦٠ سالیدا کۆچی دوایی کردووەو ماوەی دەسەلاتداریەتی ٢٥ سال بووە لە سەر ئیمپراتۆریەتەکەدا ... شایانی باسە سەرەرای نیمچە دادووەری لە دەسەلاتەکەی ، بەلام هەروەك دەسەلاتدارانی دیکەی عوسمانی بەردەوام بوو لە فراوانکردنی سنووری جووگرافی دەسەلاتی لە ئەورووپاو ئاسیاو چەندین هەرێمی دیکە لە دەووروبەری دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا .

## ١٧٦٠

١٧٦٠/١٠/١١ لەدایك بوونی دامەزرێنەری مەزهەبی سان سیمونیە لە ئابووری ورامیاریدا

... – سان سیمون – له پاریسی پایتەختی فەرەنسا له بنەماڵەیەکی ناودا
دەووڵەمەنــدەکانی فەرەنــسا ، لەگــەڵ هەڵگیرســانی جــەنگی ســەربەخۆ
ئەمــەریکا لــە ســاڵی ١٧٧٩ ســان ســیمون بــووە ســەربازی جــەنگاوەر دژ
هێزەکـانی سـووپای بـەریتانیا ... کـه ئـەم شـەڕەش کاردانـەوەی خـۆی نوا
لەئـەورووپا و ، سـان سـیمون داوای لـەجێگیری شانـشینی ئەسـپانیا کـرد
پـرۆژەی کـەرتکردنی کـەناڵێك ، کـه هـەردوو زەریـای ئەتلەسـی وهـێمن بەیـ
ببەستێتەوە .
دوای ئەوە گەڕاوە فەرەنسا ... پلەی قائمقامی – عقید – ی هەب
، کـه تەمـەنی لـەوکات ٢٣ سـاڵ بـوو ... وازی لەپیشەی جـەنگ هێنـا دەسـ
کرد بەخوێندنی ئەندازە ... لەو کاتەش کە شۆڕشی فەرەنسا لەساڵی ٧٨٩
هەڵگیرسا ئەو خۆی لەو شۆڕشە دوورخستەوە سەرەڕای ئەوەی کە ئـەو هـە
و خەباتـەی لـەپێناو ئازادی و یەکسانی وژیانێکی پـڕ لەئارامی وئاسودە
هەبوو ، بۆ گەلانی جیهان .
بەتایبـەتی گـەلی فەرەنـساو بـەداواکردنی بـەخۆماڵی کردنـی سـامانەکا
دەرەبەگـه دەووڵەمەنـدو خـاوەن کارگـەو پـرۆژەو زەوی ، هەرچـەند خۆیـش
لەبنەماڵەیەکی دەووڵەمەند بوو .
هــەر بــەو هۆیــەش لەســاڵی ١٧٩٣خرایــه بەندیخانــەو دوایــی ئـازادکرا . ا
تەمەنی ٣٧ ساڵیدا هەستی بەوەکرد کە چارە سەری کێشەکان لەرێگـەی کا
زانـستیەکان دەبێت . ئـەوەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـە یەکـەم دانـراوی لەسا
١٨٠٢ بـەناوی – رسـائل سـاکن فی جنیـف – ی بڵاوکـردەوە لەگـەڵ چـەند
بابەت و دانراو لـەبوارەکانی زانست و یاساو مافەکان و بەردەوام بوونی لـ
کـارە هەمەلایەنانـە تـاکوو لـە ١٨٢٥/٥/١٩ کۆچـی دوایـی دەکـات لەپاریـس
پایتەختی فەرەنسا.
سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢

## ١٧٦٦

١٧٦٦/٤/٢٢ لە دایك بوونی رۆمـاننووس وسیاسـەتمەداری فەرەنـسی خـاتوو – مـارام د

ستال – لە شاری ژنێفی وولاتی سویسرە ... ئەم نووسەرە بەهرەدارە کچی جان تێگەر ١٧٣٢ – ١٨٠٤ ی وەزیری دارایی بەناوبانگی – لویس شازدەهەمی – شای فەرەنسا بووە . ئەم کچە خوێندنی لەشاری پاریس تەواوکردووەو هەر لەمنداڵیەوە توانای نووسینی هەبووە ، لەساڵی ١٨٧٥ دەستی بەنووسینەکان کردووە .

لە ساڵی ١٨٧٦ رۆمانێکی سەرکەووتووی بەناوی سۆفا بڵاوکردرتەوە . لەساڵی ١٧٨٨دا شووی بەپیاوێکی سوویدی کردو لەوساوە نازناوی مادام دی ستالی لەنووسیەکانی بەکارهێناوە ... لەساڵی ١٧٩٠ تراژیدیایەکی بەناوی – جان گرای – داناوە کە رەخنەگران پەسەندیان کرد .

هەر لەو ساڵەشدا چەند نامەیەکی جوان وبەنرخی لەبارەی جان جاك رۆسۆوە نووسی و ، ناوی چەند نامەیەك لە بارەی رۆمانی گرنگی بەناونیشانی – دلفین و گۆرین – بڵاوکردەوەو بووە هۆی دەرکردنی کەسایەتیەکی بەهێز ... هەڵوێستی بوێرانەی هەبوو لەشۆرشی فەرەنسا لەساڵی ١٧٨٩ تاکوو رووخانی ناپلیۆن لەساڵی ١٨١٥ ... ئەم ئافرەتە لەنووسینەکانی بەردەوام بوو لەگەڵ داگرتن وریزگرتنی لەنووسین ونووسەران تاکوو لە ١٨١٧/٧/١٤ کۆچی دوایی دەکات لە وولاتەکەدا .

## ١٧٦٨

١٧٦٨/٩/٤ نووسەرو ئەدیبی فەرەنسی – فرنسوا شاتوبریان – لە شاری – سان مالۆری – لە رۆژئاوای فەرەنسا چاوی بەجیهان هەڵێناوە .

جێگەی ئامارە پێکردنە کە شاتوبریان لەبنەماڵەیەکی ئۆرستوکرات بووە ، باوکی – رینی ئۆگستی – خەریکی کاری بازرگانی بووەو رووی لەئەمەریکا کردووەو سوودێکی باشی لەم کارەی بەدەست هێنا ، و رێنمایەکانی باوکی کاریگەری لەسەر شاتوبریان هەبووە .

بەلام شاتوبریان لە تەمەنی هەرزەکاری تێکەڵاوی چالاکیە رامیاریەکان دەبێت وزۆریش بە جان جاك ورۆسۆ کاریگەر دەبێت ، بەتایبەتی لەروانینەکانی بۆ سرووش وکۆمەڵگادا ... کاتێك شۆڕشی مەزنی فەرەنسا

دەست پێ دەکات لەساڵی ١٧٨٩ ، لە چەخماخەدەدات وشاتوبریان لە سووپای پادشایەتی فەرەنسا دەبێتە ئەفسەر .

بەم راپەرینە سەرتاسەریە دلخۆش نابێت وهەر لەوماوەیەشدا یەکە، بەرهەمی ئەدەبی خۆی بەناوی – خۆشەویستی لە لادێ – وبەناوی خوواستراوی – شفالیتی – بلاودەکاتەوە . هەروا لەساڵی ١٧٩١ گەشتێکی شیعری و زانستی بۆ ئەمەریکا دەست پێ دەکات ، مەبەستەکەشی ئەوە بوو تاکوو بتوانێ لەلای باکووری رۆژهەلات رێگایەك لە نێوان هەردوو زەریای ئەتلەسی وئارام بدۆزێتەوە .

شیعرەکانیشی دوورکەوتنەوە بوو لە هات وهاواری شارو روانینی بوو لە ژیانی ساکارانەی هیندیە سوورەکان لە ئەمەریکا ، وەك پێکهێنەرێك زۆر جێگا گەرا . رێزی زۆری لێدەگیرا ، تەنانەت سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا جۆرج واشنتۆن پێشوازی لێدەکات ، کە بۆ ساڵی دوایی دەگەرێتەوە فەرەنسا ولایەنگیری خۆی بۆ پادشاو بنەماڵەی فەرەنسا دەربری وشۆرشگێرانە راوەدویان نا ، بەو هۆیەوە بەرەو وولاتی بەلژیکا دەروات لەو کاتەی شۆرشی فەرەنسا لە بارێکی زۆر سەخت دەبێت لە نێوان ساڵەکانی ١٧٩٢ – ١٧٩٤ شاتوبریان بەناچاری بەرەو بەریتانیا رادەکات و لەوێدا ماوەی ٧ ساڵ بەنەخۆشی وبرسیەتی وهەژاری بەسەر دەبات .

لەگەل ئەوەشدا فەرمانی لە سێدارەدانی لەلایەن دەسەلاتدارانی فەرەنسا بۆ دەردەچێ ...لەو ماوەیەشدا گوێ بیستی نەك هەر مل پەراندنی لویسی شانزەهەمی پادشاو خاتوو ماری ئەنتوانێتی هاوسەری دەبێ ، بەلکوو لەسێدارەدانی برا گەوورەکەشی دەزانێ . بۆ ئەم مەبەستە دەست بە نووسین دەکات .

لەساڵی ١٧٩٨ لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا پەرتووکی ووتاری مێژووی وکاری ورامیاری لەبارەی شۆرشەکان بلاودەکاتەوە ...کە تێیدا بەهرەی شیعروفەلسەفەو ئەدەبی خۆی دیار دەخات ... لەو کاتەی ناپلیۆن دەسەلاتی فەرەنسای لەساڵی ١٨٠٠ دەگرێتە دەست شاتوبریان دەگەرێتەوە فەرەنسا بەناوی – دەسەلات – لەو کاتەدا چەندین بەرهەمی ئەدەبی وشیعری وفەلسەفی دەنووسێت ، لەوانەی یاداشتەکانی خۆی لەساڵی ١٨٠٨ و دوای

ئەوە لە ساڵی ١٨١١ لە گرنگترین ساڵی ژیانی شاتوبریان دادەنرێت کە بەرهەمەکانی بەگەشتێك لەپاریسەوە بەرەو قدس ویادگاریەکانی دوای گۆڕ دەنووسێت ولە ئەکادیمیایی فەرەنسی دەبێت بە ئەندام .

ئەم نوسەرو شاعیروفەیلەسوفە لەماوەی ژیان بەردەوام پێنووسەکەی لە نووسین بەردەوام بوو تا لە رۆژی ١٨٤٧/٧/٤ مالئاوایی لەووڵات و جیهان دەکات.

پەیمانتای – توبنجین

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – ئانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢ .

## ١٧٦٩



١٧٦٩/٨/١٥ لە دایك بوونی –ناپلیۆن پۆنابارت– لە دورگەی کۆرسیکا لە شاری –ئەجاکسیۆ– لە فەرەنسا ، لە دوای تەواو کردنی خوێندنی جەنگی بە پلەی ملازمی دووی سەربازی لە بەشی تۆپچی وەرگرتووە.

## ١٧٧٠

١٧٧٠/٨/٢٧لــە دایــك بــوونی روونــاکبیر و فەیلەســوف جیهــانی – هیگــل – لــە شاری ئینستنجرت و هەر لەو شارە خووێنــدی ســەرەتای وناوەنــدی لــەنێوان ســاڵەکانی ١٧٧٧ تــاکوو ١٧٨٧ تـــەواودەکات ... لەســـاڵی ١٧٨٨ چووە پەیمانگای ستوبنجن – ی ئـایینی ، کـە ئـەو پەیمانگایـە پەیمانگایــەکی پروتــستانتی بــوو ئــەویش ، لــە پێنــاو دەرچــوونی قەشــەکانی ئــەنجیلی بــوو . هــەر لەوشارەدا دایکی کۆچی دوایی دەکات ، کە ئەو فەیلەسوفە قوتابیەکی زیرەك ولێهاتووبوو لەهەموو بوارەکان لە زانستەکان .



لـە دوای سـاڵی ١٧٨٥ دۆزنکـرانتس کتـابێکی بەناونیـشانی ژیـانی هیگـل بڵاوکـردەوە ... دانراوەکـانی هیگـل جێگـەی گرنگـی پێـدان بـوون لەلایـەن فەیلەسوفە جیهانیەکان ، بەتایبەتی مارکس ، سەرەرای رەخنە لێگرتنی هـەتا لەلایەن لینین و فویرباخ ... دوای ئەوە لـە ١٨١٨/١٠/٢٨ بووەتە مامۆستا لـە زانکۆی بەرلین لە ئەلمانیا .

بیرووبۆچوونی هیگل لەسێ مانا خۆی دەگرت ئەویش – بیر ، سروشت ، رووح – ئەو سێ مانایەش دەگەراوە سەر – بیر– ... ئـەم فەیلەسـوفە لەژیانیـدا لـەکارە فەلـسەفەیەکانی بـەردەوام دەبـێ لـە جیهـان تـاکوو لـە ١٨٣١/١١/١٤ کۆچی دوایی دەکات لە وولاتەکەدا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٣ .

١٧٧٠/١٢/١٦لە دایك بوونی خاوەنی مۆزیکاو سەمفۆنیای ناوداری جیهانی – بتهۆڤن – لە شـاری بـۆنی ئـەلمانیا ... کـوری دووەمـی بـەناوبانگترین عـازف ژەنـەکان و گۆرانیبێژی ئەلمانی بووە ... لەهەمان کات مرۆڤێکـی توونـد بـووە لەهـەڵس و کـەووت وحـەزی بـەوەکردووە کەهـەردەم منداڵـەکانی فێـری باشـترین مۆزیکـا



ژەنی بکات ولەوانەش بتهۆڤن .
کە بتهۆڤن بەهرەو توانای بەرزی هەبووە بۆفێربوونی مۆزیکا بە کەمانجە و گەشەکردنەکانی بە پەلە بووەو جێگەی سەرسوورمانی بینەران و هەڤالانی پێشووەوە بوو لەتەمەنی ۷ ساڵیدا بۆ یەکەم جار لەبەردەم جەماوەر دەرکەووت لەیەکێ لەئاهەنگەکانی مۆزیکاو ، دوای ساڵێك دانەری مۆزیکی - کریستیان گوتلوب ئیف - ئەرکی سەرپەرشتی کردنی و مەشق دانی بتهۆڤنی گرتە ئەستۆو زۆر بەخێرایی تواناکانی لەم بوارەدا دەرکەووت .
دوای ئەوە ئەو گۆرینانەی خستە نێوو بەڵگەنامەکانی لایبزك ، وەك کارێك بۆ مۆزیکای لویس ڤان بتهۆڤن ، کە تەمەنی ۱۰ ساڵان بوو ، لە ساڵی ۱۷۸۷ بتهۆڤن گەشتی شاری ڤییەنای کرد ، کە ئەوکات ناوەندێکی موزیکی بوو .
لەو گەشتەیدا چاوی بەکۆنت والدشتاین کەووت کە مامۆستای پیانۆ بوو . لە دوای مردنی دایکی لەهاوینی ساڵی ۱۷۸۷ تووشی چەندین گرفت بوو .
بەڵام کارەکانی بەشێووەیەکی رێك ئەنجام دەدا لەبواری مۆزیکاو لە ساڵی ۱۷۹۲ شاری ڤییەنای کردە بارەگای نوێی خۆی بۆ وەرگرتنی وانە لەهەر یەك لە هالدین و برێتشبنینر و شیك و سالیری .
ئەم مرۆڤە بەتواناو بەهرەدارە تاکوو کۆچی دوایی لە ۱۸۲۷/۳/۱٦ دەکات و لەکاتی ناشتنی تەرمەکەی زیاتر لە ۳۰۰۰۰ هەزار کەس بەشداری ناشتنی تەرمەکەی بوون و یەکێکی دیکەی وەك بتهۆڤن بوونی لەجیهان ئاسان نیە لەم بوارەدا.

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی ۲/ .

## ۱۷۷۲

۱۷۷۲/۲/۱ دابەشکردنی پۆلۆنیا لە نێوان رووسیای قەیسەری و شانشینی نەمساو بررووسیا بەرەشکردنەوەی ئەو ووڵاتە لە سەر نەخشەی رامیاری هەرێمەکەو جیهان ، بەلابردنی شانشین بەپێی پەیمانی نێوان رووسیای قەیسەری و

بڕووسیا، ئەویش لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی نێوانیان بەسەرکردایەتی
قەیسەری ڕووسیا.

## ١٧٧٣

١٧٧٣/٣/٢٥ بـە هـۆی نـا لـە بـاری بـاری ناوچـەکەو هەرێمـەکان ، هێزەکـانی سـووپای
ڕووسیای قەیسەری هێرشیان کردە سەر هێزەکانی سووپای ئیمپراتۆریەتی
عوسمانی ، لە ناوچەی ڤارنا لە باکووری ئێستای ڕۆمانیا ، کە کە پێشتر
شارێکی بوولگاری بوو لەسەر دەریای رەش، لە ئەنجام هێزەکانی سووپای
ڕووسـیا سـەرکەوتنیان بەدەسـت هێنـا بەسـەر هێزەکـانی سـووپای
عوسمانیدا.

کـە لـەو کـات سـەرەك وەزیرانـی دەسـەڵاتی عوسمـانی- سـەدر ئـەعزەم-
سەرکردایەتی هێزەکانی لە ڕۆژئاوای شاری ڤارنا دەکرد، دوای ئەوە سەدر
ئـەعزەم داوای گفتـوو گـۆی لـە دەسـەڵاتی ڕووسـیای قەیـسەری کـرد،
گفتووگۆکەش لەشاری – میناجەی- بوولگاری ئەنجام درا ، کە دەسەڵاتی
عوسمـانی دانـی بەسـەربەخۆیی تەتـەرەکانی قـرم نـا لـە گـەڵ هـەرێمی -
بـساربیا- کـە هـەرێمێکی رۆمـانی بـوو، هـەروا ناوچـەی- قۆیـان- کـ
هەرێمێکەو دەکەوێتە رۆژئاوای قەفقاس ، لە کێشووەرەکەدا .

## ١٧٧٤

١٧٧٤/٧/٢١ مـۆرکردنی ڕێکەوتننامـەی هاوکـاریو دۆسـتایەتی لـە نێـوان نووێنـەری
دەسەڵاتی عوسمانیو باڵوێزی ڕووسیای قەیسەری ، کە ئەو ریکەوتنە لـ
٢٨ مادە پێك هاتبوو ، لەوانە دان نان بەسەربەخۆیی تەتار لە هەرێمی قرم
بساربیا . کە دەکەوێتە رۆژئاوای شاری کۆنستنزای وولاتی رۆمانیا لەسەر
دەریـای رەش، ئـەویش بـە پاراسـتنی سـەربەخۆیی دەوڵـەتی عوسمـانی لـ
بوواری ئاینیو ڕێنمایەکانیدا .

## ١٧٧٥

١٧٧٥/٣/٤ لە دایك بوونی میر محەمەد-



پاشـای کـۆرە لـە باشـووری کوردسـتان- لـە شارۆچـکەی روانـدزی سـەربە پارێزگـای هـەولێر... پاشـای کـۆرە لـە گونـــدی - دێلـــزی - لـــە ناوچەی باڵەك لەلای مامۆستا مەلامحەمـــەدی - نینـــۆ - ئامادەی خووێندووە ، هەروا لـــە تەمـــەنی لاوویـــەتی - خەجیجی- کچی بایز بەگی مامی خواستووەو دوای ئەوە بەرپرسـیاریەتی جۆلـەمێرگ‌و دۆلی گـەورەوان‌و دۆلی هـەرووتیان‌و سەرچـیاو سرێشمەو باوویانی گرتۆتە ئەستۆ .

دوای ئەوەی کە دەسەڵاتی گرتۆتە دەست زۆر توونـدڕەو خۆویستی‌و گیانی خۆسـەپاندنی بەسـەر هـەموو کارێـك هـەبووەو پـاوانی سـامانەکانی بـەر دەسـتەیی کـردووە ، کـەس نـەیتووانیوە لـەهاوکارانی لـە کەسـایەتیەکانی ناوچەکە بەرامبەری بووەستێ لەهەڵسووکەوت‌و رەفتارەکانیدا .

١٧٧٥/٥/٥ گرێدانی کۆنگرەی دووەم لە شاری فیلادلفیای ئەمەریکا ، ئـەویش بە پێك هێنـانی هێزەکـانی سـووپای ئەمـەریکا لـە ژێـر سـەرکردایەتی سـەرۆکی ئەمەریکا جۆرج واشنتۆن ، کە دوایی ئەوە بووە یەکەم سەرۆکی ئەمەریکا .




ئەم نەخشەیە شۆڕشی سەربەخۆیی ئەمەریکا دیاری دەکا بە دەرچوونی لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیای مەزن لەوکاتدا .

١٧٧٥/٧/٤ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکا بە جیابوونەوەی لە شانشینی بەریتانیاو – جۆرج واشنتۆن – پۆستی یەکەم سەرۆکایەتی کردنی حکومەتی ئەمریکای گرتە دەست ، لە هەمان کات بووە هۆی سەرهەڵدانی شەڕی ناوە ناوە لە ملاو لەولا لە هەرێمە جیاجیاکانی باکوورو باشوور لە پێکهاتەی ئەمەریکا .

١٧٧٥/١١/٢ هونەرمەندو ئەکتەری بەناوبانگی بەریتانیاو جیهان – ریتشرد– لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا دەستی بە نووسینی شانۆگەری کرد ، لە هەمان کات هەوڵی کۆکردنەوەی پارەی دەدا ، تا ئەو کاتەی کە خۆی بووە ئەکتەرێکی شانۆگەری بەناوبانگ ,

کە یەکەم شانۆگەری لە ١/١٧ی هەمان ساڵ پێشکەش بە جەماوەر کردو سەرکەووتنی تیا بەدەست نەهێنا ، بەڵام لە ١١/٢ ی هەمان ساڵ لە شانۆگەری – قەهرەمانە – توانی باشترین سەرکەووتن بەدەست بێنێ ، کە بۆ یەکەم جار بوو لە سەر شانۆی – کۆخنت جاردن – هەڵوواسرێت و بەردەوام بێت لە کاری شانۆگەری رامیاری و کۆمەڵایەتی بەرەو بە جیهانکردنیدا .

## ١٧٧٦

١٧٧٦/٢/٢ کاربەدەستانی دەسەڵاتی فارسی سەفەوی لە پاڵ بەکارهێنانی زەبرو زەنگ‌و ئەشکەنجەدان دژی کـوردو خـاکی رۆژهـەڵاتی کوردستان . سـەرەڕای ئـەوەی کە کورد بوونـەو ئەروەبیلـەوە هـاتوون و بەر لـەوەش لـە شـەنگاڵەوە چوونەتە ئەردەبیل و پەیرەوەی ڕێبازی شێخەکانیان کردووە ...؟...!.

ئـەویش لـە پێنـاو دەسـتەمۆ کـردن‌و سـەرپێ دانەوانـدنیان کەوتنـە بـەکار هێنـانی هەنـدێ ڕێگـەی دیکـە ، وەك پێـك هێنـان دروسـتکردنی خزمایـەتی‌و پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی لـە نێـوان فـارس‌و کـورد بـە هـۆی ژن‌و ژن خواستن لەگەڵ هەندێکیان‌و دورست کردنی ناکۆکی‌و دوژمنکاری لەلایەکی دیکە لـە نێوانیان‌و بەگژا کردنی یەکتری لە هەرێمەکەدا .

هـەروا هەوڵیانـدا لـەو ملمـلانـێ‌و کێشە کۆمەڵایەتیانـە سـوود مەنـد بـن. لـە هەموو بووارەکان بەتایبەتی لـە بوواری نەتەوەیی‌و نیشتمان و دەسەڵات لە هەرێمەکەدا .

١٧٧٦/٢/٧ لـە دوای دەسـەڵاتێکی بـەرزو خـۆراگری ئیمپراتۆریـەتی رۆمـانی‌و لـە دوای سەدا شەڕی تووندو دژوواری خووێناوی ، یەکەم :- لە گەڵ ئیمپراتۆریـەتی بێزەنتی‌و دووەم :- لەگـەڵ ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی ئیسلامی ، بە هـۆی دەیا هەڵەی پیلان‌و پلانی نەخشەی داریژراوی شەڕو ئابووری وبازرگانی و سەربازی‌و رامیاری، لە ئاکامدا بەرەو تووانەوەو کەوتن کەووت لـە ماوەیـەکی کورتدا لە ناوچەو هەرێمەکەدا .

١٧٧٦/٦ لـە ئـەنجامی شـەڕیکی سـێ رۆژەی دژووار لەلایـەن هێـزە چـەکدارەکان لـە پێکهاتەی سووپای وویلایەتەکانی باشوورو باکوور ، کە لە ئەنجامدا بووە هۆی ئەوەی کە لەو داستاندا هێزەکانی سووپای ئەمەریکا هـەرەس بێنـێ لـە بوواری شەڕدا .

١٧٧٦/٧ وویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لـە دوای شەڕو کێشەو ململانێی تووندو دژوواری بەردەوام لەگەڵ بەریتانیا لەو بارو دۆخـەدا ئەمـەریکا سـەربەخۆیی

خۆی بە شێووەیەکی فەرمی راگەیاند ، بە دەرچوونی لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا ، کە فەرەنساو ئەسپانیا پشتگیریان لێکرد دژی بەریتانیا .
هەروا ئەم راگەیاندنەش بە ناوی – وویلایەتەکانی یەکگرتووەکانی ئەمەریکا




– بوو . ناوی پایتەختەکەی شاری – واشنتۆن – ە و ئێستا ژمارەی دانیشتووانی ٤,٨٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . و لە ٥٠ وویلایەت پێك هاتووە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی ئەمەریکا ٢٧٥,٨٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکە ٩,٣٧٢,٦١٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانی ٧٦ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، نزیکەی سێچارەگی دانیشتووانی ئەمەریکا لە بنەرەتا ئەورووپین . بەریتانی و ئیرلەندی ٢٩٪ . ئەڵمانی ٨٪ . ئیتاڵی ٥٪ . ئسکەتدە ناڤی ٣٪ . ئەفریکیە ئەمەریکیەکان ١٢٪ . ئەمەریکی و ئەسپانی و پرتووگالی ٨٪ . ئاسیاییەکانی دوورگەی زەریای هادی ٣٪ . ئەباماو جۆرجی و لۆزیانا و هی دیکە ٣٢٪ . لە وولاتەکەدا .

١٧٧٦/١٢/٣ یەکـەم زانکـۆی ئەمـەریکی لـە رۆژهـەڵاتی ناوەراسـت لـە شـاری بـەیروتی پایتەختی ئێستای لوبنان دامەزراو تاکوو ئێستاش ئەو زانکۆیە لەکارەکانی خوویێـندنی هەمەلایەنـەی زانکـۆیی بەردەوامـە لـە بووارەکـانی رامیـاریو ئابووریو یاساییو زمانو مێژوو کۆمەڵایـەتیو پیشەسازیو تەکنـەلۆژیا و ئەلکترۆنیو چەندین بوواری دیکەی خوویێندن لە وولاتەکەدا .

## ١٧٧٧

١٧٧٧/٥/٨ لـە شانۆگەری – قوتابخانـەی گێرەشێوێنەکان ، مدرسة الفضائح– شریدان تـووانی بـالاترین سـەرکەووتن بەدەسـت بێنـێ و ببێتـە یەکـەم شـانۆگەری لەسەدەی هەژدەهەمدا لە جیهان .

## ١٧٧٨

١٧٧٨/٥/٣ دوای گەرانـەوەی نووسـەرو فەیلەسـوفی فەرەنسی بـە ناسـراو بـە بـەرگری ئـازادی – فرەنـسوا مـاری نارۆیـەمی – نـاودار بـە– ڤـۆلتێر– بـە تەمـەن گەوورەی گەراوە بۆ فەرەنسا ، لـەم رۆژەدا کۆچی دوایی کـرد... دوای ئـەوە کـە بـەردی بناخـەی شۆرشـی مـەزنی فەرەنسای دانا ئـەویش دوای – ١١– . ساڵو کە لە ١٤/٧ /١٧٨٩ دا هەڵگیرسا.

## ١٧٨١

١٧٨١/٣/١ دۆزینەوەی ئەستێرەی ئۆرانووس... لە دوای هەوڵو تەقەلایەکی بێ وێنـە... کە ئەستێرەی حەوتەمە لە کۆمەڵەی خۆردا.

١٧٨١/٩/ بەریتانیای مەزن دانیننا بە سەربەخۆیی تەواوی وویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەشێووەیەکی فـەرمی ، ئـەویش لـە دوای کێشە و ململانێ وشەرو پێکداکان لە ناوچەو هەرێمە جیا جیاکاندا .لەم وولاتە نوویێیەدا .

١٧٨١/١٠/ لە دوای شەرو پێکـدانێکی بـەردەوام و دژووار لـە نێوان هێزەکـانی سووپای بەریتانیاو هێزەکانی سووپای ئەمەریکا لـە هـەرێمی – بۆرکتـاون ڤیرجینیا – کـە هێزەکـانی سـووپای بـەریتانیا خۆیـان دا بـە دەسـت هێزەکـانی سـووپای ئەمەریکاو بووە هۆی ئەوەی دەست بکـەن بە گفتووگۆ لـە پێنـاو مـۆرکردنی

پەیمانی پاریس لەنێوان بەریتانیاو ئەمەریکادا.

## ✍ ١٧٨٢

١٧٨٢/١١/٣٠ مـۆرکردنی پـەیمانی پـاریس لـە نێـوان ئەمـەریکاو فەرەنـساو ئەسـپانیا
بەریتانیا ، بە بۆنەی سەرکەووتنی شۆرشی ئەمەریکاو سەربەخۆیی لـە پێنا
هاوکاریو هاوپەیمانیەتیو دۆستایەتی لە نێوانیـان ، لـە هـەموو بووارەکان
رامیاری و ئابووری و بازرگانی و سەربازی لە جیهاندا .

## ✍ ١٧٨٣

١٧٨٣/٢/٩ لە دایك بوونی شاعیرو وەرگێری بە ناووبانگی رووسیا ، ئەو شاعیرەی ک
پەپوولـەی خۆشەویستی لەسـەر گوولەکـەی نەنیشت ڤاسیلی ئەندرییۆڤی
ژوکۆف لەگووندی میشێکەری هەرێمی ئۆراڵ رووسیای قەیسەری ، لە ساڵ
١٨٥٢ و لە تەمەنی ٧١ ساڵیدا کۆچی دوایـی کردووە ، بە ماڵئاوایی کردن
لە گەلانی ژێر دەستەی دەسەڵاتی رووسیای قەیسەری کرد لە وولاتەکەدا.

١٧٨٣/٩/٣ لـە ئاکامی کێشەو شەری دژووار لـە نێوان ئەمـەریکاو بـەریتانیا ، کە بو
هـۆی مـۆرکردنی پەیماننامـەی – پـاریس – ی پایتـەختی فەرەنـسا ، کـە ب
هۆیـە بەریتانیا دانـی بەسـەربەخۆیی ئەمـەریکانا بـە رووبـەری کەنـەدا
وویلایەتی فلۆریدا لە کێشووەرەکەدا .

1784




١٧٨٤/١١/١٤بنیاتنـــــان و دورســـتکردنی شـاری سلێمانی لـە لایـەن مـیر بـرایم پاشـای کـوڕی ئەحمـەد پاشـا ، لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ، لـە هـەمان کـات پایتـەختی دەسـەڵاتی بابـانی لـە قەلاچـۆلان گوواسـترایەوە بـۆ شـاری سـلێمانی دورسـتکراوی نـوێ ، دوای ئـەویش عوسمان پاشای کوڕی مەحمود پاشا دەسەڵاتی میری بابانی گرتە دەست لە هەرێمەکەدا .

1785

١٧٨٥/٧/٢٠سـوڵتانی عوسمـانی سـوڵتان مـەحمودخانی دووەم ، کـە کـوڕی سـوڵتان عەبدولحەمیدی یەکەمە ، لە شاری ئەستەمبوڵ لە دایك بووە.

1786

١٧٨٦/٢/١٣ لە دوای هـەوڵ و توانایـەکی زۆرو بە هـۆی زۆر بوونی نەخۆشـی و گیان لە دەستدانی بە سەدا کەس ، ئەویش بە گەران بە دوای ئەم هۆکارە لە ئاکام بووە هۆی دەرکەووتنی ڤایرۆسی ئەفلەوەنزە بۆ یەکەم جار لە جیهان .



١٧٨٦/١٠/١٨لە دایك بوونی ڕابەری مۆزیكای ڕۆمانتیكی - كارل ماریا ڤێردرێك ڤۆن ڤیبیەر - لە شارۆچكەی ئیونتی - لە نزیك لۆبیكی ئەلمانیا ، باوكی دەرهێنەری شانۆو دایكی گۆرانی بێژ بووە ...شایەنی باسە ڤۆن ڤیبیەر یەكەم كەس بووە ، كە پیانۆ لە شووێنی ئامێری ئۆرگن لە كۆنسێرتەكانی بەكاربێنێ . ئەم كەسایەتیە لە كارەكانی بەردەوام بووە تا لە ١٨٢٦/٦/٥ لە شاری لەندەن كۆچی دوایی دەكات ، دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٤٤ تەرمەكەی دەگوازرێتەوە ئەڵمانیاو لە و وولاتەدا بە خاك دەسپێردرێت .

## ١٧٨٧ 



١٧٨٧/٣/٢٨لە دایك بوونی زانای بەناووبانگی فەرەنسی وگەشتەوەر- كلۆدیۆس جیمس ریج- لە نزیك - دیگۆن - ی سەر بە یووركەندی لە فەرنسا، ناووبراو گەشتێكی بەرفراونی بەناو خاكی كوردستاندا ئەنجام داوەو هەوڵی كۆكۆدنەوەی زانیاری داوە لەسەر هەموو بووارە جیاجیاكانی نەتەوەیی و نیشتمانی و زمان و داب و نەریت و كەلتوورو شووێنەوارو شارستانیەتی كورد لە كوردستان . هەروا ئەم كەسایەتیە لە كارو كردەوەكانی بەردەوام دەبێت تا لە ١٨٢١/١٠/٥ كۆچی دوایی دەكات و لە باخچەی پاشایەتی - جیهان نۆما - بە خاك دەسپێردرێت لە فەرەنسا.

١٧٨٧/٥/٢٥ كۆنگرەی دەستووری لە شاری فیلادفیا كۆبوونەوەیەكی ئەنجامدا بە هەموار كردنی بەندەكانی بەند بوو بە یەكیەتی كۆنفدرالی ، كە ئەمەش

پەیماننامەیەك بوو لە نێوان خوودی وویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا بە واژۆ كردنی ، كە تیایدا بڕیاریان لە سەر دەستووری نوێدا بە رژێمی فیدراڵی لە ئەمەریكا .

## ١٧٨٨



١٧٨٨/٣/١٠ شاعیرو نووسەری دیارو بەناوبانگی دوا قۆناخی ڕێبازی ڕۆمانسی ئەڵمانیا – جۆزێف فریهیزفۆن ئایشندۆرۆڤ ... ناسراو بە ئایشندۆرۆڤ لیریكنووس – لە كۆشكی لۆیۆویتزی نین ، نوێی هەرێمی باكووری سیلیزیای بڕووسیای پێشوو ئەڵمانیای ئێستا ، چاوی بەجیهان هەڵهێناوە لە وولاتەكەیدا .

ئەم شاعیرو نووسەرە تواناداره وەك رابەرێك هۆكاری كاردانەوەو كاریگەری زۆری هەبووە لەسەر بووژانەوەی گۆرانی و چامەی لیریكی نەتەوەكەی . هەر وەك تۆماس مان باسی دەكات و دەڵێ :-

دیمەنە جوان وبەرجەستەكراوەكانی ناو چاخەكانی ئایشندۆرۆڤ كە تا ئێستا كاریگەری زۆریان لەسەر شیعرو ڕۆنەكاندا هەیە ... جێگەی ئاماژە پێكردنە كە ئەم شوێنەی لێی لەدایك بووە كەووتۆتە ناو وولاتی پۆلۆنیا. دوای ئەوەی خوێندنی دواناوەندی تەواودەكات لەساڵی ١٨٠٨ بەرەو شاری هایدلبێرگ دەچێت و لەو شارە دەچێتە زانكۆی – هال یاسا – و لەخوێندن بەردەوام دەبێت و ، دوای ئەوە دەچێتە شاری بەرلینی پایتەختی ئەلمانیا و تاكوو لەساڵی ١٨١٠ لەبواری فەلسەفە دەست دەكا بەخوێندن .

دوای ئەوە لەشاری – ڤیەناش – تاساڵی ١٨١٢ لەخوێندنی فەلسەفەو یاسا بەردەوام دەبێت . دوای ئەوە چەندین هاوڕێ وهاوشانی خۆی دەدۆزێتەوە و ئاشناییان لەگەڵ پەیدادەكات .

دوای ئــەوە بەپلــەی ئەفــسەر بەشــداری لەشــەڕەکانی ئــازادکردنی ناوچــە داگیرکراوەکانی وولأتەکەی دەکا ، کە ناپلیۆن پۆناپەرتی سەرکردەی فەرەنسا دەستی بەسەردا گرتبوون ، بەتایبەتی بەشداری لەشەڕەکانی سالّی ١٨١٣-١٨١٥ دەکات کە رویاندا .

لە ئەنجام ناپلیۆن بەرەو هەلأتن هەنگاو دەنیّ و بروسیاش مافەکانی خۆی بەدەســت دێنێتــەوە . لــە ســالّی ١٨١٥ رۆمانێــك بــەناوی – شــاردنەوە – بلأودەکاتەوە کە بەیەکێك لەکارە دیارو سەرنج راکێشەکان دادەنرێت . هەروا لەســالّی ١٩١٦ – بەرەوســریش – بلأودەکاتــەوە . لــەو ماوەیەشــدا چــەندین کــاری هەمەلایــەنی حکوومــەت بەدەســت دێــنێ تاسـالّی ١٨٤٤ خانەنــشین دەکرێت .

ئەم کەسایەتیە لەکارە هەمە جۆراوجۆرو لایەنەکانی فەلسەفەو یاساو رۆمان بەردەوام تا لە ١٨٥٧/١١/٢٦ مالّئاوایی لەجیهان دەکات.

سەرچاوە :- www.jmdb.com

١٧٨٨/١٠/٢ حوکمرانەکانی ئازربایجان ماوەیەکی زۆر لە ژێر دەسەلأتی عەباس میرزای فارسی سەفەوی بوون ، کە لە سەردەمی ئەو رووداوی گرنگ بەرپا دەبوو، ئەویش بەجەنگی نێوان رووسیای قەیسەری و فارسی سەفەوی ناوزەند بوو ، کە چەندین سالّی خایاندو قۆناخی یەکەمی بە سپاندن و پێك هێنانی گولّستان بوو لە ١٨١٣/١/٤.

هەروا قۆناخی دووەمی چەسپاندن و پێك هێنانی تورکمان جای بوو، لە ئەنجام بەرێکەووتنی پارێزگای ئەرزەرۆم لە باکووری کوردستان کۆتایی هات ، شایانی باسە رۆژی ئەو رووداوانە لە ناوەرۆکی مێژوونامەکە هەیە بەشێوەیەکی گشتی لە هەموو بووارەکاندا .

## ١٧٨٩

١٧٨٩/١/٧ یەکــەم هەلّبــژاردنی ســەرۆکایەتی لــە ئەمــەریکا ئەنجامــدرا ، ئــەویش بەهەلّبژاردنی یەکەم سەرۆکی ئەمەریکا کە- جۆرج واشنتۆن – بوو.

هەر ئەم مرۆڤەش بوو ، کە تووانی ئەمەریکا دابمەزرێنێت و سەر بەخۆیی بــە رژێمــی فیــدرالّی وویلایەتــە یــەکگرتووەکانی ئەمــەریکا راگەیــەنیّ لــە کێشووەرەکەدا .

١٧٨٩/٤/٣ یەکەم حکوومەت دەستی بەکارەکانی کرد بەپێی دەستووری ئەمەریکاوی فیدراڵی دەست پێکردنی یەکەم دانیشتنی کۆنگرێسی ئەمەریکی لەشاری نیۆرۆك ، کە لەوکات شاری واشنتۆن دەست بە بیناکردنی نەکرابوو لە ناوچەکەدا .

١٧٨٩/٤/٨ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان عەبدولحەمیدی یەکەم ، لە تەمەنی ٦٦ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو ماوەی دەسەڵاتەکەی زیاتر لە ١٥ ساڵ بووە ، لە دوای خۆی سوڵتان سەلیمی سێیەم جێگەی گرتەوە لەسەر هەڵسووڕاندنی کاروو باری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. لە سەر هەمان ڕێنمایەکاندا .

١٧٨٩/٤/٣ یەکەم ئاهەنگێرانی سەرۆکایەتی لە مێژووی ئەمەریکا ئەنجام بدرێت ، لە دوای سوێند خواردنی جۆرج واشنتۆن بەوەرگرتنی پۆستی یەکەم سەرۆکی ئەمەریکا لە جیهاندا .

١٧٨٩/٦/١ بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسی لە بواری رامیاری ... کە لەوکاتە ئەنجوومەنی چینەکانی پێك هاتەی دەوڵەتی فەرەنسی بریاری کۆمەڵەی نیشتیمانیان مۆرکرد ، ئەویش لەدوای شەوورۆژێك لەگفتووگۆو کێشە بەرەزامەندی ٤٩٠ دەنگ بەرامبەر ٩٠٠ دەنگ ، کە بەرهەڵستکاربوون و نوێنەران رەزامەندی خۆیان بەدەستگیربوون بەدەستوور راگەیاند . بەپێی یاسای دەسەڵاتی شانشین لەفەرەنسا ... ئەمەش لەدوای کێشەو ململانێی نێوان دەسەڵات وجەماوەری گەلی فەرەنسا هات ، بە هۆی بەرزبوونەوەی باجی دەرامەت ونا لەباری باری ژیان و پاوانکردنی سامانی گەلانی فەرەنسا لە وڵاتەکەدا .



١٧٨٩/٧/١٤ شۆڕشــــــگێره فەرەنــــــسیەکان پــەلاماری قــەڵای – باسـتێل – یان دا لە پاریـسی پایتـەختی فەرەنسا و دەستیان بەســەراگرت و دوای ئــــەوە قەڵاکـــەیان رووخاند ... ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە – لویسی شانزەهەم – بڕوای ئەوەی بۆ دروست بێت و هێزی سەربازی لەنا شاری پاریس بکشێتەوە دەوروبەری شارەکە .

جێگەی ئاماژە پێکردنـە کـە تـاکوو ئێـستاش گـەلی فەرەنـسا ئـەم رۆژەیا کردۆتـە رۆژێکـی پـیرۆزو هـەموو ساڵێك یادی ئـەم رۆژە دەکەنـەوە ... هـەر ووشەی باستێل بە واتای ، باڵەخانەیەکی بەهێزو سـەخت دروستکراو ، دێـ . ئـەم قەڵایـەش لەلایـەن پاشـا چارلـسی پێنجـەم لەسـاڵی ١٣٧٠ ی زایـین دروستکراوە ... بۆ ئەوەی ببێتە یەکێك لەو قەڵا سـەختانەی کە بۆ کاروبار دەووڵەت سوودیان دەبێت .

دوای ئەوە کرا بەبەندیخانە بۆ هەموو ئەو کەسانەی بەرهەڵستی پاشا دەکـ ... رووخانـدنی ئـەم قەڵایـەش بـەهۆی تێـدابوونی بەنـدکراوەکان بـوو لەلایـ پاشـا چارلـسی پێنجـەم ... ئـستاش ئـەم قەڵایـە وەك جێگـەی شـووێنەوارێک شارستانیە لە فەرەنساو باس لێکردنـی بە شێووەیەکی مێژوویی بۆ گـەلا فەرەنـساو گـەلانی دیکـەی جیهـان و بـە روونکردنـەوەی چۆنیەتی دەسـەڵا تووندرەو و چەوسێنەرو داگیرکەران و دەسەڵاتدارانی شۆڤینی لە جیهان .

هەروا ئەم رۆژە بە رەمزی هەڵووەشاندنەوەی سەرەرۆیی پاشایەتی – رژێمـ پێشووی – فەرەنسا دادەنرێ ، کە لە راستیدا سەرەتای دەستپێکی شۆڕش مەزنی ئەو وولاتە بوو .

لـەم رۆژەدا کرێکـارە شۆڕشـگێرەکانی ناوچـەی – فۆبـۆرگ سـێن ئـانتوان

هێرشیان کردە سەر بەندیخانەی باستیل ، لەگەڵ خاکدا تەختیان کرد ، بۆ ڕێزگرتن لە ١٤/تەمووز ، هەموو ساڵێك ڕێورەسمی تایبەتی سان و ڕێژەی هێزە چەکدارەکانی سووپای فەرەنسا بە ئامادە بوونی سەرەك کۆمارو کەسایەتیە گرنگە رامیاری و سەربازیەکانی ئەو وڵاتە لە گۆرەپانی شارل دیگۆل تاکوو گۆرەپانی کۆنکۆرد بە ڕێووە دەچێت لە فەرەنسا لە لایەن گەلانی ئەم وولاتەدا

سەرچاوە:- گۆڤاری عەرەبی کوویتی – ٥٧٨ . مانگی/١/٢٠٠٧ .

١٧٨٩/٨/٢٦ شۆرشی فەرەنسی کاردانەوەی کاریگەری کردە سەر باری گەلانی فەرەنساو وولاتانی دیکەی ئەورووپا ، کە بووە هۆی ئەوەی کە راگەیاندنی ماڤی مرۆڤ و هاوولاتی بوون بە نیشتیمانەکەی جێگیربکرێت بەمەبدەئەکانی یەکسانی لە نێوان هاوولاتیان .

لەو کاتەوە کە هاوولاتیان دەستبگرن بەسەرچاوەی یەکەمی دەسەلاتی رامیاری لە هەڵبژاردن و دەنگدان و مافە رەواکانی چ لەبواری نەتەوەیی و نیشتیمانی و کۆمەڵایەتی و رامیاری و رۆشنبیری و نەبوونی جیاوازی لە رەگەز و بە ئەنجام گەیاندنی دادپەروەری لە وولاتەکەدا.

چونکە پێشێل کردنی مافەکانی مرۆڤ و داگیرکردن و پاوانکردنی سامانی گەل لە چوارچێووەی وولات ودەسەلاتەکەیدا هۆکاری سەرەکین لە دروست بوونی گەندەڵی لەهەموو بوارەکان و لێك ترازاندنی پەیوەندی لە نێوان دەسەلات وگەل ، بە کاردانەوەی لەسەر باری ناوخۆو دەرەوەی وولاتەکەو دروست بوونی کێشەی کۆمەلایەتی ونەتەوەیی و نیشتیمانی مافەرەواکانی لە وولاتەکەدا .

هەروا لە نێوان ١٧٨٩/٨/٢٧ راگەیاندنی ماڤ مرۆڤ و هاوولاتی لەفەرەنسا .لەدوای هەوڵ و کۆشش و خەباتی بێ وچان لە لایەن کەسایەتی ناوداری فەرەنسا – لافاییت – کە ئەم بەڵگەنامەیە لە ١٧ ماددە پێکهاتبوو لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ژیانی مرۆڤ لەوولاتەکەو لەجیهاندا .

١٧٨٩/٩/٢٢ لە دوای کۆچی دوایی سوڵتان عەبدولحەمیدی یەکەمی ، سوڵتانی عوسمانی و بە هەڵکەووتەی بارودۆخی گوونجاو لە بار لەپێش ڕووسەکان

کە توانیان شاری بەندر حەسینە داگیر بکەن لەگەڵ زۆربەی ناوچەکانی کەلام و بغدان و بساربیا .
لە هەمان کات هێزکانی سووپای نەمسا چوونە ناو شاری بەلگرادو وولاتی سربیا ، بەلام دوای ئەوە بەپێی پەیمانی مۆرکراوی نێوانیان ، ناوچە داگیرکراوەکان گەرێندرانەوە ژێر دەسەلاتی عوسمانیەکان .

١٧٨٩/٩/٢٤ بۆ یەکەم جار لە مێژوودا ، دادگای بالای فیدرالی لە ئەمەریکا دامەزرێندرا ، بەپێی دەستووری ئەمەریکا ، کەپێك هاتبوو لە سەرۆك و چەند ئەندامێکی دیاریکراو لەلایەن کۆنگرێسی ئەمریکا، دوای ئەوە دادگاکە لە ٨ ئەندام پێك هات لە سالی ١٩٤٨و تاکوو ئێستا دامەزراندنیان بەندە بەدەسەلاتی سەرۆك کۆماری ئەمریکا، ئەویش بەوەرگرتنی رەزامەندی ئەنجوومەنی پیران .
هەروا لە دوای بە سەرا چوونی تەمەن بۆ خانەنشین کە دەبێ ، کە تەمەنی خانەنشین کردنی ئەندامانی دادگای بالا لە تەمەنی ٧٠ سالاندایە لە وولاتەکەدا .

## ١٧٩٠

١٧٩٠/٩/١٠ والی بەغدا سلێمان پاشا هەڵسا بەدروستکردنی پەرژینێك لەچواردەووری شارۆچکەی مەندەلی .... یا بەنوێ کردنەوەی ئەو پەرژینە . لە بەر ئەوەی والی بەغدا عومەر پاشا بەدرەو جەسان و خانەقین و چەند جێگەی دیکەی دا بە ئەحمەد پاشای بابان ، لەگەڵ خورماتوو کە ئەمانە هەر هەمووی گوندو شارۆچکەی کوردی بوونە و کەووتوونەتە ناو سنووری جووگرافی هەرێمی باشووری کوردستان .
سەرچاوە :-مێژووی ئێراق – عەباس عەزاوی .ل/٦ – ج – ٤٦ .

## ١٧٩١

١٧٩١/١/٩ لە دوای کێشەو ململانێی زۆر لە نێوان وولاتانی ئەورووپا و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، لە پێناو بەرەو گۆرینی بارو دۆخە نێوودەوڵەتیەکان ، کە ئەنجامەکەی بووە هۆی مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی ، لە شاری یاس لە نێوان رووسیای قەیسەری و دەسەلاتی عوسمانیەکان .

١٧٩١/٤/٢٧ زانای ناوداری جیهانی و داهێنەری تەلەفۆن – سموئێل مۆری– چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .

١٧٩١/٥/٣ راگەیاندنی دەستووری هەمیشەیی وولاتی پۆلەندا ، هەر ئەو رۆژەش بووە رۆژی جەژنی نیشتمانی و تاكوو ئێستاش بەو بۆنە ئاهەنگ گێرانیان لەم رۆژەدا بەردەوامە لە وولاتەكەدا .

١٧٩١/٨/٤ سەركەووتنی وولاتانی ئەورووپا بەسەر هەڵەكان ، كە بووە هۆی مۆركردنی پەیمانی بەناوباگ – زشتووی– كە ئەمەش لە ئەنجامی بەرپابوونی شۆرشی فەرەنساو لاواز بوونی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوو، كە پەیمانەكە لەگەڵ دەووڵەتی عوسمانی مۆركرا .



١٧٩١/٨/٢٣ سەركەووتنی شۆڕشی – سان دۆمینكۆ –ی كۆیلەكان لە وولاتی هایتی دژی دەسەڵاتداران و بازرگانیكردن بە مرۆڤ لەهەموو تەمەنەكان بەتایبەتی ئافرەت و منداڵ لە جیهان .

كە ئەم هەرێمە بەبنكەو ناوەندی بازرگانی كلردن بە مرۆڤ دادەنرێت لەكێشووەری ئەفریكیا... جێگەی ئاماژە پێكردنە كە دوای ئەو شۆڕشەو چەندین كاریدیكەی مرۆڤایەتی ، ئەویش لە پێناو ژیانێكی ئازادی و سەربەستی و مسۆگەری ژیان ، بە تایبەتی لەلایەن مرۆڤی كەم دەرامەت و ژێر دەستەكان . لەلایەن وولاتانی سەرمایەدارو ئیمپریالیزم و دەسەڵاتە شۆڤینیەكان و خاوەن سامانە گەوورەكان و رژێمە دەرەبەگەكان ، و شاكان كە سەرچاوەی ئێش و ئازاردانی گەلان و مرۆڤایەتی بوونەو بەردەوامن تاكوو ئێستاش لە جیهاندا .

بەڵام بەشێووەو شێووازێكی دیكەی جیا ، بەپێی پەرەسەندن و پێشكەووتن

و گەشەکردنی قۆناخەکان ... هەر بەم هۆیەش کۆمەڵەی گشتی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان بریاریدا بەزیندووکردنەوەی ئەم یادەو ململانێ دژی کوێلایەتی و چەوسانەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە ... ئەویش لەئەنجامی پاڵەپەستۆی زۆری رێکخراوەکانی ماف مرۆڤ و مەدەنی و دەسەلاتە دیموکراتە خوازەکان بوو لە جیهان .

بریاردرا کە رۆژی ٢٠٠٤/٨/٢٣ بکرێتە رۆژێکی جیهانی دژی بە کۆیلایەتی و گێرانی ئەم ئاهەنگەش لەبارەگای رێکخراوی – یۆنسکۆی – سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان ، کە بارەگاکەی لە پاریسی پایتەختی فەرەنسایە ، ئەنجام بدرێت ... کە هەموو جیهان بەتایبەتی وولاتانی دژ بەبازرگانی کردن بە مرۆڤ و چەوسانەوە لەهەموو کێشوەرەکان ، ئەویش بە بنبرکردنی کۆیلایەتی و چەوسانەوە لە جیهاندا .

هەروا بەم بۆنە گەورەیەی جیهان مۆزەخانەیەکی مێژوویی کۆیلایەتی دەکرێتەوە لە وویلایەتی – ئۆهایۆ –ی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەروا وولاتانی سەنگافورا ئەم یادە پیرۆزە دەکات لەدوورگەی – گوری – کە رۆژێک لەرۆژان مەڵبەندی بە کۆیلەکردن و بازرگانی کردن بەمرۆڤ بووە لە پێناو فرۆشتنی مرۆڤ و کرینی بەنرخێکی کەم و کارپێکردنیان بەئارەزووی کریار ، بەتایبەت بەرامبەر بەئافرەت و منداڵ لە کارگەو کێڵگە کشتووکاڵیەکان و کار سکسی و کاری ناهەموارتریش ... لە بەر ئەوەی دوورگەی گوری مەڵبەندی کۆکردنەوەی کۆیلەکان بووە بۆ گوواستنەویان بۆ ئەمەریکاو وولاتانی دیکەی سەرمایەداری لە جیهان .

سەرچاوە :- WWW. BBC,ARABEC.NET .

١٧٩١/١٢/١٥ بەڵگەنامەی مافەکان – Billoppighis – ی ئەمەریکا کە بەشێکە لەیاسای ئەمەریکا ، لە هەمان کلت ئەوگۆرانکاریەی کە لە دەستووری ئەمەریکا هاتووە مافە بنەرەتیەکانی هەموو هاوولاتیان دابین دەکا ، لە گەڵ مافی ئازادی و رۆژنامەنووس و ئازادی رادەربڕین بۆ گەلانی ئەمەریکا بێ جیاوازی لە هەموو بووارە جیاجیاکاندا لە وولاتەکەدا .

## ١٧٩٢

١٧٩٢/١/١٠ بەریتانیاو بڕووسیا هەڵسان بە بژیووانی کردن لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ڕووسیای قەیسەری ، بە کۆتایی پێ هێنانی کێشەی داگیرکردنی نێوانیان ، لە سەر هەرێمی قرمی نێوان ڕووسیاو فارس . کە ناوچەکانی قرم و بەشێك لەوولاتی فویان و بساربیا ، کە ئەو هەرێمەی دەکەوێتە نێوان زێی بوج و دینستر ، کە ئەو زێیە هێلی کۆتایی نێوان هەردوو دەوڵەت بێت و بەو هۆیە پەیمانی یاس لە شاری یاس مۆرکرا .

١٧٩٢/٩/٢١ هێزەکانی سوویا لە سەرەتای دەسەلاتی کۆماری فەرەنسا سەرەکەووتنە یەك لە دوای یەکەکانی بەدەست هێنا ، لە دوای چەند هەفتەیەك - سافۆی وینس- وویلایەتەکانی دین و زەویە نەویایەکانی بەلژیکای نەمسای خستە ژێر دەسەلاتی فەرەنسا... کە - کەجیت- کە لەو کاتە شەڕی ڤالمی بەرپا بوو لە هەمان کات خۆی ئامادە کرد ,

کە بووە هۆی کشانەوەی هێزەکانی سووپای بڕووسیا بە سەرکردایەتی - بۆك برنزویك- ئەمە لەلایەك و ، لەلایەکی دیکە - فاندیمر- یەکەم مانگی ساڵی نوویێی شۆرشی فەرەنسای پێشنیار کرد بوو، کە لە ٩/٢٢/ دەست پێدەکا تاکوو ١٠/٢١ و ڕۆژی ١٣ی بەناوبانگی مێژووی فەرەنسا ناوبرا بەسەرکەووتنی ناپلیۆن بەسەرگروپەکەی کە بووە سەرکەووتنی بە سەر کۆنفشسیۆن ، کە ئەنجوومەنی شۆڕش بوو .

دوای خۆی ئەنجوومەنی یاسا دانانی لێکەووتەوەو دەسەلاتی فەرەنسای تاکوو ١٧٩٥/١٠/٢٦ ، بە دەستەوە بوو ، کە ئەویش کۆماری بە یەکجارەکی فەرەنسای ڕاگەیاندو دادگای شانشین - لویسی شازدەهەمی بە لەسێدارەدان کرد - لە وولاتەکەدا .

١٧٩٢/٩/٢٢ ڕاگەیاندنی کۆماری فەرەنسای یەکەم لەلایەن کۆنگرەی نیشتیمانی ، کە ٧٥٠ ئەندام بەشداری تێداکرد لە ٩/٢١... لەهەمان ڕۆژ کۆنگرەی نیشتیمانی مەرسوومێکی




ڕاگەیاند لە دوای سالێك لەلێکۆڵینەوە بەرێکخستن و هەموارکردن و هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژنامەی مەسیحی – زاینی – لەفەرەنسا بە جێگرتنەوەی لە ڕۆژنامەی شۆڕشگێری کە دەست پێدەکات بە ساڵی یەکەمی لە ١٧٩٢/٩/٢٢ تاکوو ١٩٧٣/٩/٢١ .

جێگەی ڕوونکردنەوەیە کە فەرنسا بە چەندین قۆناخی شۆڕش تێپەڕیووە ، ئەم وولاتە پایتەختی شاری پاریسە و ژمارەی دانیشتووانەکەی ٢,٨٧٥,٠٠٠ بە پێی ئاماری ساڵی ٢٠٠٣ . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە ٦٠,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ڕووبەری خاکی وولاتەکە ٥٥١,٥٠٠ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ٢٨٢ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی , سەڵتی و لاتینی ٩١٪ . لە گەڵ دانیشتتووی نەتەوەی دیکە لە وولاتەکەدا .

١٧٩٢/١١/٦ بەرپابوونی شەڕی – جیماپ – لە نێوان هێزەکانی سووپای فەرەنساو هێزەکانی سووپای نەمسا ، سەرکردەی هێزەکانی سووپای نەمسا – دۆق ساکس تیشین – بوو، سەرکردەی هێزەکانی سووپای فەرەنسا ژەنەراڵ – دۆموریە – بوو .

شایانی باسە کە ناوچەی جیماپ دەکەوێتە ناو وولاتی بەلژیکا، کە هێزەکانی سووپای فەرەنسا بە دوای سووپای نەمسا دەگەرا ، بە هۆی

کێشەو ململانێی دووژمنکاریان و داگیرکردنی خاکی یەکتری لەهەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی هەر یەك لەو دوو وولاتەدا .




ئەم نەخشەیە کارە هەمە لایەنەکانی شۆڕشی فەرەنسی دیاری دەکا

<u>تێبینی</u> :– داوای لێبوردن دەکەم کە نەخـــشەکانم وەرنەگێڕدۆتە سەر زمانی کوردی بە هۆی نەبوونی ماوەو زەحمەتی لە کارەکەدا .

١٧٩٢/١١/٢٠ بڕیـاری ئەنجوومـەنی جێبـەجێکردنـی فەرەنـسا ، بـە بـەڵێن دان بەسـەرکردەی سووپای فەرنسا لە بەلژیکا ، ئەویش بە دابینکردنـی ئازادیەکانی دەریاوانی گوواسـتنەوە بەدرێـژی زێــی – مـۆزو ئەلیـسکۆ – بـەڵام ئەمـەش بـە پێــی رەزامەندی وولاتانی پەیووەمدیدارو رێکەووتن بوو لـە سـەرکاری دەریاوانیدا لە ناوچەو هەرێمە جیا جیاکان لە جیهاندا .

١٧٩٣ 

١٧٩٣/١/٢١ لـە دوای سـەرکەووتنی شۆڕشـی فەرەنـساو بـە دامەزرانـدنی دامو دەزگـا

حکـــوومیو ســـەربازیو دادگـــاییو ئـــابووریو بازرگـــانی و کۆمەلایـــەتی ، ئەویش بە دەرچوونی بریاری لە سێدارەدانی شانشینی فەرنسا شانشین – لویسی شانزەهەمو ماری ئەنتوانێت– کە لە سێدارە دران .

لە دوای راگەیاندنی رژێمی کۆماری لە فەرنسا ، دوای ئەو کارانە فەرەنسا کەووتە قۆناخێکی نوێی هەرێمیو جیهان بە کاردانەوەی لەسەر جیهان لە هەموو بوارە جیا جیاکان ، بە تایبەتی لە سەر باری رووسیای قەیسەری ئەوکاتدا .

## ١٧٩٤

١٧٩٤/١١/١٩مۆرکردنی پەیمانی – جی-jay– لە نێوان ئەمەریکاو بەریتانیا، لە پێناو چارەسەر کردنی کێشە جیاوازیەکانی نێوانیان، کە هەلوواسراو بوون بەو هۆیە سێ لیژنەی جیاواز پێك هێنرا لە ساڵەکانی-١٧٩٨- ١٨٤٠ – کە ئەو لیژنانە توانیان بە دەیا کێشەو گرفت لە نێوان ئەو دوو وولاتە چارەسەر بکات لە دوای جەنگی سەربەخۆیی ئەمەریکا.

## ١٧٩٥

١٧٩٥/١٠/١٠لە دوای دابەشکردنی پۆلەندا لە نێوان هەردوو رژێمی نەمساو بڕووسیاو فەرەنسا ، بەڵام دابەشی سێیەمی پۆلەندا بەپێی پەیمانی – کۆشیۆسیکۆ-ی نیشتمانی گێرەشێوێنی بوو تاکوو رەشکردنەوەی پۆلەندا لە سەر نەخشەی ئەوروپا دا .

١٧٩٥/١٠/٢٨کۆمەڵەی رێکخستنی یاسای جیهانی سێیەم بریاردرا بە هەڵوەشاندنەوەی دوورەپەرێزی فەرەنسا لەگەڵ جیهان ، هەروا بە دامەزراندنی پێنج لە هاوکاری ئەنجومەنی نوێنەرانیو ٥٠٠ نوێنەر کە دەسەڵاتی ئەو یاسا دانانەیان پێدرا لەو کارگێریە بە پاڵەوانیەتی سەربازی – کۆرسیکی– کە کەسایەتی ناپلیۆن دەرکەوت لە سەر گۆرەپانی رامیاری لە جیهان .

١٧٩٥/١٢/٤ لە دایك بوونی ئەدیبو نووسەرو مێژوو نووسی بەریتانی–کارالایك– لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ، کە ناووبراو لە خێزانێکی هەژارو رۆشنبیر چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە وولاتەکەدا .

## ١٧٩٦

١٧٩٦/١٢/١٧ کۆچی دوایی ئەدیب و رووناکبیرو شاعری ناوداری جیهانی – ماری ئەنوین-.

## ١٧٩٧

١٧٩٧/١/١٤ بەرپابوونی شەڕیکی توندو دژوار لە نێوان هێزەکانی سووپای فەرەنساو هێزەکانی سووپای نەمسا ، لە هێرشێکی سووپای فەرەنسا بۆ سەر هێزەکانی سووپای نەمسا بەسەرکردایەتی ژەنەراڵی فەرەنسی- ناپلیۆن پۆناپارت – دژی هێزەکانی سووپای نەمسا بەسەرکردایەتی ژەنەرال – فینکزی – لە دەشتاییەکانی شاری – ریڤۆلی – لە باکووری رۆژئاوای شاری – ڤیرۆنای ئیتالی- هەر چەندە هێزەکانی سووپای نەمسا ژمارەیان زیاتر بوون ، بەڵام هێزەکانی سووپای فەرەنسا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا.

١٧٩٧/٤/١٦ لە دایک بوونی – میسیۆ – لە شاری مرسیلیای فەرنسا، ناوبراو سیاسەتمەدارێکی بەناوبانگ بووەو خوێندنی ئاینی لە مرسیلیاو ماکس تەواو کردووەو بەڵگەنامەی پارێزەری بە دەست هێناوە ، رۆڵ گرنگی هەبووە لە رۆژنامەوگۆڤارەکانی فەرنسا ، هەروا شارەزایی باشی هەبووە لە سەر شۆڕشی فەرەنسا.

١٧٩٧/٦/١٧ کووشتنی ئاغا محەمەد شا ، لە هێرشکەی سەر رووباری ئاراس لە ناو خێمەکەی خۆی لەلایەن سادق خانی سەرەك خێلی شکاك ، لە رۆژهەلاتی کوردستان .

١٧٩٧/٧/٢٥ گەرۆکی بەناوبانگی بەریتانیا – جاکسۆن – سەردانی شاری مووسل و دەورووبەری کرد ، کە دانیشتووانە چرەکەی شاری مووسل لە چەندین نەتەوەو ئایین پێك هاتوون ، کە زۆربەی دانیشتووانەکەی لە کورد بوون و لە هەمان کات لسترنگ لە کتێبەکەیدا بەناوی – بلدان الخلاف الشرقیه – لاپەرە/١٦ دەڵێ :- کە دانیشتووانی رەسەنی شاری مووسل لە کورد پێکهاتوون لە ناوچەکەدا .




## ١٧٩٨

١٧٩٨/٢/١٧ له دایك بوونی فەیلەسوف و زانای دەروونـی ئەلمانی - فریادریك فدووارد- ناسراو به فەیلەسوف بینکه له شاری بەرلینی ئەلمانیا ... یەکەم خووێندنی لــه قوتابخانــەی ئیمپراتــۆر فریدریــشی دووەم دەســتی پێکـرد . دوای ئــەوە بەشــداری لــە راپەرینــەکانی دژ بــەناپلیۆن کــرد لەســاڵی ١٨١٥ . دوای گەرانــەوەی لــەگۆرەپانی جــەنگ بــەهۆی بــەزینی نــاپلیۆن بەســەرکردایەتی سەرکردەی ئەلمانیا بلوشەر چووە زانکۆی هله و دوای ئەوە چووە زانکۆی بەرلین و خووێندنی لاهووتی و فەلسەفەی تەواوکرد.

دوای ئــەوە بروانامــەی دکتــۆرای لەســاڵی ١٨٢٠ بەدەســت هێنــا ... لــەو کاتەشــدا فەیلەسوفی نــاوداری جیهــانی هیگــل دژی ئــەو بروانامەیــەی بینکــه وەستا...دوای ئەوە فۆن ئەنشتاین لەهــەرێمی ساکسن بەمامۆستا دایمەزراند لــەزانکۆی جتنجسن بۆمــاوەی ســێ ســاڵ لــه ١٨٢٤ تــا ١٨٢٧ ، دوای ئــەوە گــەراوە شــاری بــەرلین و بــووە مامۆســتای زانکـۆ لەزانکۆکه تـا سـاڵی ١٨٢٧ . دوای مردنــی هیگــل لەســاڵی ١٨٣١ بــووە مامۆســتای یــاردەدەرو لــەو پلەیــە مایەوە تاکوو له ١٨٥٤/٣/١ له شاری بەرلین کۆچی دوایی دەکات وولاتەکەدا.

ئەم فەیلەسوفە هەژدە دانراوی بەرهەم هێناوە و، یەکەم بەرهەمی لەساڵی ١٨٢٠ بەچاپگەیاندووە بەناوی – نظریە المعرفە بحسب الوعی – و دوا بەرهەمیش لەساڵی ١٨٥٣ بووە بەناوی – مخگوگات علم النفس العملی – لە سێ بەرگداو دانراوەکانی دیکەشی لەناوەندا بە ئەنجام گەیاندووەو بۆتە سەرچاوە سەرەکیەکان لەبوارەکانی هەمەلایەنەی پەیمانگاو زانکۆکان لە لە وولاتەکەیدا و لە جیهاندا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢ .

١٧٩٨/٧/١ هێزەکانی سووپای فەرنسا بە سەرکردایەتی ناپلیۆن پۆناپارت ، کە پێکهاتبوو لە ٣٦,٠٠٠ هەزار سەربازو ٣٠ کەشتی جەنگی و ٤٠٠ ئۆتومبێلی هەمە جۆری سەربازی ، پەلاماری شاری ئەسکەندەریەی وولاتی میسری داو داگیری کرد ، دوای ئەوە  وردە وردە شارەکانی دیکەی میسری داگیر کرد .

لە رۆژی ٧/٢ی هەمان ساڵ شاری قاهرەی پایتەختی میسری داگیر کردو– کلیبر– ی کردە دادوەری گشتی لە سەر وولاتی میسر، لە هەمان کات کۆبوونەوەی لەگەڵ زانایانی ئاینی زانکۆی ئەزهەر ئەنجامدا بەراگرتنی شەڕلە وولاتەکەدا .

بەلام دوای ئەوە  ناپلیۆن وولاتی میسری بە تەوواوی داگیر کرد بە سەرکەووتنی بە سەر بنکە سەربازیەکانی بەریتانیا لە ئاسیاو ئەفریکیاو بەردەوام بوونی شەڕ لە نێوان هێزەکانی سووپای فەرەنسا بەسەرکردایەتی ناپلیۆن‌و هێزەکانی سووپای بەریتانیا بە یارمەتی دانی هێزەکانی سووپای میسر تاکوو رۆژانی ٧/٢١ و ٧/٢٧ی هەمان ساڵ ، کە هێزەکانی سووپای فەرەنسا بە تەواوی کۆنترۆلی وولاتی میسریان کردو بەیەکجاری کەووتە ژێر دەستی خۆیان .

١٧٩٨/٨/١ بەرپابوونی شەڕی دەریایی لە نێوان هێزەکانی سووپای دەریایی فەرەنسا بە سەرکردایەتی ناپلیۆن‌و هێزەکانی سووپای بەریتانیا بەسەرکردایەتی ژەنەراڵی بەریتانیا– نیلسۆن – کە هێزەکانی سووپای فەرەنسا بەرەو بەنداوی – ئەبوقیر– بەرێکەووتن ، کە لەو کاتەی کەشتیە جەنگیەکانی بەریتانیا لەوکارە جەنگیەی فەرنسا سەریان سورمابوو لە ناوچەکەدا .

هـەر ئـەو هۆكـارە وایكـرد كـە ژەنـەراڵ نیلـسۆن راسـتەوخۆ دەنگـی دا بـ
هێرشـكردنە سـەر هێزەكـانی دەریـایی فەڕەنـسا لـە چۆنیەتی دابەشـكردنی
ئامانجە سەربازیەكان ، هێزەكـانی سووپای دەریایی بەریتانیا ، لە ئاكامد
سەركەووتنی گەوورەیان بەدەست هێنا بە سەر هێزەكـانی سووپای فەرەنسـ
، ئەو شەڕەش ناوزەند بوو بە شەڕی – ئەبوقیر– لە وڵاتی میسرو ناوچەو
هەرێمەكان.

١٧٩٨/٩/٢ هێزەكانی سووپای دەریایی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، یەكەم شەڕی دژ بـ
فەرەنسای راگەیاند ... ئەویش بە كۆكردنـەوەی هێزەكـانی سووپا لە شاری
دیمەشقی شامو دوورگەی رۆدێسو رەوانە كردنی بەرەووڵاتی میسر.
دوای ئـەوە هێزەكـانی دەریـایی ڕووسـیا لـە دەریـای رەش بـەرەو بوگـازیو
ئەستانە ، بەرێكەوتن ، دوای ئەوە هەنگاویانا بەرەو دەریای سپی ناوەراست
لە گەڵ هێزی دەریـایی عوسمانی بەیـەك گەیشتن ، ئەویش بـەپێی پـەیمانی
بەرگری نێوانیـان بـۆ جاری سێیەم كـە ئەویش بەیارمـەتی یـەكتری كـە بۆ
یەكەمجار بوو لە كاری جەنگی هاوبەشبوون لە ناوچەكەدا .

١٧٩٨/١٠/١٢ مۆركردنی رێكەووتنامەی نێوان كۆمپانیای نـەوتی هنـدی رۆژهـەڵات لە گەڵ
ئیمــامی هـــەرێمی مەســـقەت لـــە كەنـــداو ، لـــە پێنـــاو دوورخـــستنەوەی
فەرەنسیەكان لە خاكی خۆیـانو هەرێمەكە، كە ئێستا پێـی دەڵێن وڵاتـانی
كەنداو لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا .

١٧٩٨/١٠/٢١ هێزەكـانی سووپای فەرنـسا بـەردەوام بوون لـە داگیر كرنـی وڵاتـی میـسرو،
ئـەویش ناچـار بـوونی شـێخ و زانـا ئاینیـەكانی زانكـۆی ئەزهـەرو چـەندین
لایـەنی دیكـە ، كـە سـەردانی سـەركردەی فەرەنـسی ناپلیۆنیـان كـرد لـە
شارەكەدا.
لە پێناو كشانەوەی هێزەكانی سووپای فەرەنسا لەجێگا پیرۆزەكانو دەست
هـەڵگرتن لـە ئـازاردانی ئیـسلام... بـەڵام فەرەنـسیەكان بـەردەوام بـوون لـە
ئـازاردانی ئیـسلامەكان بـە هـۆی كـردارە رابردوویـەكانیان بەرامبـەر بـە
مەسـیحیەكان لـە ژێـر دەسـەڵاتی فتووحـاتی ئیـسلامو عوسمـانی ، ئـەویش
گرتنەبـەری رامیاریـەت لـە دوو لایـەن , یەكـەم بـە ئیـسلام كـردن ، دووەم
بەعەرەبكردنی گەلانی میسرو چەندین كاری دیكەدا .

١٧٩٨/١٠/٢١ بەرپابوونی یەکەم شۆڕش لە میسر ، دژی هێزەکانی سووپای فەرەنساو دەسەلأتداران لە دوای سێ مانگ بەهاتنەناو شاری قاهرە کە یەکەم هاندەری شۆرشەکە شێخی ئەزهەر بوو ، کە لە ناو بازاڕ داوای لە پێکهاتە ئیسلامیەکان لە میسر کرد ، شۆڕش بکەن دژی کافرەکان و بووە هۆی ئەنجامدانی کۆبوونەوەی جەماوەری چەکداری و داخستنی بازاڕەکان .

لەوکاتەش دادوەری سەربازی فەرەنسا ژەنەراڵ دیپۆ بە سواری ئەسپەکەی لە ناوبازاڕ دەسوورایەوە ، بۆ هێور کردنەوەی باری شارەکە ، بەلأم لەئاکام بووە هۆی بەر پا بوونی شەڕ لە نێوان هێزەکانی سووپای فەرەنساو چەکدارە ئیسلامیەکانی میسر، لە ئەنجام ژەنەراڵ دیپۆ کووژرا ، کە بەم هۆکارە هێزەکانی سووپای و شەڕ لەقاهیرەو دەووروبەری و ناوەچەکانی دیکەی میسر دەستی پێکرد دژی هێزەکانی داگیرکەری فەرەنسا .

## ١٧٩٩

١٧٩٩/١/٥ مۆرکردنی پەیمانی هاوکاری‌و دۆستایەتی لە نێوان حکوومەتی بەریتانیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا ، لە پێناو چارە سەر کردنی کێشە هەڵوواسراوەکان لە نێوانیاندا .

١٧٩٩/٥/٢٦ لە دایك بوونی روونـاکبیرو ئەدیب‌و شاعیری ناوداری جیهان‌و ڕووسیا- ئەلکسەندەر پۆشکین – لە شاری پترسبۆرگی پایتەختی ئەوسای ڕووسیای قەیسەریدا .




جێگەی ئامـاژە پێکردنـە کـە – ئەلسکەندەر پۆشکین – تەنیا ٣٦ ساڵ ژیاوە ، بەلأم لە گەڵ ئەوشدا چەندین شاکاری مەزنی لە دوای خۆی بە جێهێشت ، لە سەرەتا لە ژێر کاریگەری ئەدەبی فەرەنسیدابوو ... بەلأم دوای ئەوە بەهرەکانی زیتر تێکەڵبوون بە کۆمەڵگای ڕووسیا .

دوای ئەوە رووی بەرەو ئەدەبی ئینگلیزی وەرگێراو کەووتە ژێر کاریگەری –

بایرۆن – و – شکسپیر – دوای ئەوەی کە سەردانی شاری قرم و قەفقاسی کرد ...نووسینەکانی بەکاریگەری ژینگەی ئیسلامی ئەوێ مووتربە کرد لەدەقەکانیدا – بەخسیری قەفقاسی و قەفقاس و شەوانی میسریدا – رەنگیان دایەوە ... باوکی پۆشین شاعیرێکی دیاری ئەو سەردەم بوولە وولآتەکەیدا .

هەر ئەو هۆکارە بووە بەهرەیەکی سەرکەووتنی ئەم شاعیرە . دایکی پۆشکین کە ناوی – نادیشید ئوسیڤانا بووەو کچی – ئیبراهیم جانیبال – بووە ، کە گەوورە ئەفسەرێکی نێزیك بوو لە دەریای – پەتروسی یەکەم – ی قەیسەرو لە رەچە لەکێکی حەبەشیەوە هاتبوو ... بۆیە پۆشکین هەندێ سیمای ئەفریکیایی پێووە دیار بوو ... پۆشکین لە سلی ١٨٣١ – ناتالیا نیکۆلا لایڤنا – ی خواست کە ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ بوو . لەو ئافرەتە پۆشکین چوار منداڵی هەبوو ... بەلآم دوای ئەوە بە هۆکاری ناوونا تۆرە بلآوبوونەوەکە ناتالیا عەشقی کوڕە پایەدارێکی فەرنسیە ...کەناوی ئەو کڕە – دانتس – بوو ،.

هەربەو هۆکارە پۆشکین بۆ کرینەوەی ئابروو داوای لێکردوو لە ئەنجامی شمشێر بازیدا پۆشکین زامدار دە بیێ و دوای ئەوە گیان لە دەست دەدات ، سەرەرای ئەوەش پۆشکین بە هۆی هەلوویستی بووێرانەیدا لە لایەن قەیسەری رووسیا و دارو دەستەکەی ئازارو ئەشکەنجە دەدرا لە وولآتەکەدا .

١٧٩٩/٦/٥ هۆزی بلباس سوودیان لە ئالۆزی هەلومەرجی باری ئازربایجان وەرگرت ، بە دەرهێنای ناوچەکانی خۆیان لە ژێر دەسەلآتی کار بە دەستانی فارسی سەفەوەی لە رۆژهەلآتی کوردستان تانزیك قەلآی ورمێ پێشرەویان کرد ، هەر چەند هێزەکانی سووپای فارسی چەندین جار چوونە سەریان ، بەلآم نەیان تووانی کاریان لێ بکەن.

١٧٩٩/٩/١٧ بە هۆی کاردانەوەی هەلووێستو رەفتارەکانی فەرەنسا لە سەر عەلی کلبیر ، لە هەمان کات عەلی کلیبر . هەلسا بە دەست پێشخەریکردن بە ئاراستە کردنی نامەیەك ، بۆ سەرەك وەزیرانی عوسمانی بە رەتکردنەوەی کێشەی

نێوان میسرو عوسمانی ، کە فەرەنسا ئەوەی بە دور دەخستەوە لەم بوارەدا .

١٧٩٩/١٢/١٥ بە هۆی کێشەی نێوان هێزەکانی سووپای فەرەنساو هێزەکانی سووپای بەریتانیا ، کە بووە هۆی ئەوەی کە فەرمان دەر بکەن بۆ لۆرد کیت سەرکردەی گشتی بەریتانیا ، لە دەریای سپی ناوەراست بە رەتکردنەوەی هەر رێکەووتنێك ، لەپێناو چۆڵ کردنی گۆرەپانی وولاتی میسر بە خۆ بەدەستەوە دانی هێزەکانی سووپای فەرەنسا بە ناوی دیلی جەنگ لە ناوچەکەدا .

## ١٨٠٠

١٨٠٠/١/٢٤ هێزەکانی سووپای بەریتانیاو هێزەکانی سووپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لە رێگەی سالجمەی میسری گەمارۆی هێزەکانی سووپای فەرەنسیاندا بەسەرکردایەتی – بلبار– ، دوای ئەوە داوای لە هەردوو سەرکردەی عوسمانی و بریتانیا کرد . بۆ خۆبەدەستەوەدان ، ئەویش بە چۆڵکردنی ناوچەی زێی نیل بە مەرجەکانی پێشووی رێکەووتن ، کە ئەنجامەکەی بووە هۆی جێ بەجێکردنی داواکانی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا.

١٨٠٠/١/١٧ سەرکردەی فەرنسا ناپلیۆن فەرمانیدا بە راگرتنی شەست رۆژنامەی هەمە جۆر لە فەرەنسا ، لە کۆی ژمارەی ٧٣ رۆژنامە ئەویش بە هۆی دژایەتی کردنی دەسەلاتی ناپلیۆن لە سەر فەرەنسا ، تەنیا ئەو رۆژنامانە نەبێت کە بەرگریان لە دەسەلاتی ناپلیۆن و دام و دەزگاکانی لە فەرەنسا دەکرد لە هەموو بوارە جیاجیاکان .

١٨٠٠/٤/٢٤ دامەزراندنی یەکەم پەرتووکخانەی کۆنگرەێس لە شاری واشنتۆنی پایتەختی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

١٨٠٠/٦/١٤ هێزەکانی سووپای فەرنسا بە هۆی بەهێزی توونددو تیژی هێزەکانی سووپای عوسمانی و ناچارکردنی هێزەکانی سووپای فەرەنسا بە کشانەوەی لە ناوچەو هەرێمەکانی ژێر دەسەلاتی لە میسر ، لە هەمان کاتدا هێزەکانی سووپای بەریتانیا یارمەتی هێزەکانی سووپای عوسمانیدا دژی هێزەکانی سووپای فەرەنسا .

بەلام لە ئەنجام سەرکردەی هێزەکانی سووپای فەرەنسا – کلیپر– کوژراو لە ناو باخی سەرای ئەلفی لە شاری بالازیکیە بە خاك سپێردرا .

١٨٠٠/٧/٢٤ تیرۆرکردنـی سـەرکردەی هێزەکـانی سـووپای فەرەنـسا –کلیبـر– لەلایـە
قوتابییەکی زانکۆی ئەزهەر ، کە ناوی سلێمان بوو بە پشتیووانی بەرپرسانی
عوسمانی لە قاهیرەی پایەختی میسردا .

## ١٨٠١

١٨٠١/٥/١٤ مۆرکردنی ڕێکەووتنامـەی نێوان بەریتانیاو ئیمپڕاتۆڕیـەتی فارسی لـە پێنا
بـەرەنگار بوونـەوەی هـەر هێرشـێکی هێزەکـانی سـووپای ئـەفگانی بۆسـە
هیندو کە هیچ ڕێکەووتنێکیان لەگەڵ ئەفگان مۆرنەکرد بـوو تـاکوو بەتـەواوی
لـەخاکی هینـد کـشانەوە ، کـە بـەریتانیا یارمـەتی بـە چـەککردنی هێزەکـانی
سووپای فارسـی دەکـرد لـەپێناو بـەرەنگار بوونـەوەی هێرشـەکانی سووپای
فەڕەنساو ئەفگانستان .
بەلآم بەریتانیا ئەم ڕێکەووتنامەی بەتەواوی مۆر نەکردبوو بە هۆی هەلأتنی
لـە یارمـەتی نـەدانی تـەواوی هێزەکـانی سـووپای فارسـی دژی ڕووسـیای
قەیسەری ، ئەویش بە ترسانی لە پەیووەندی زۆری نێوان ڕووسیاو فەرەنسا
. لە هێزی بە هێزی فارسی ئیسلامی دژی ڕووسیای قەیسەری مەسیحیو بە
هۆی دووژمنکاری ئیسلام لەلایەن مەسیحیەکان .

## ١٨٠٢



١٨٠٢/٢/٢٧ نووســەرو ئـەدیبو ڕوونـاکبیری
ناوداری جیهانی– ڤیکتۆر هۆگۆ– لە
شـاری – بیزاسـۆنی– لـە فەرەنـسا
چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .
هـەر لـە سـەرەتای دەسـت کـردن بـە
نووسـین و بـەر هـەمی خـۆی بـە
شـێوازو ڕێـچکەی ڕۆمـانتیکی
فەرەنـسی گرتەبـەر بـە شـێوەیەکی
چـڕو پـڕ و بـە شـێوازێکی
دەووڵەمەنـدی ئـەدەبی دەدوا ، هـەروا پاڵـە پەسـتۆی ڕامیـاریش زیـاتر وای

لێکرد کە دەوڵەمەنتر بێت و هەنگاوی دیارترر لە مەیدانەدا بهاوێژێت .
هەروا خۆشەویستی کۆمەڵگاش بەم هەنگاوە بۆ خۆی بچڕی و ناوی ریالیست نووسەری راست و دروستی لێنرا .
ئەو گرنگی بە لایەنی مرۆڤایەتی دەدا لە کۆمەڵگای مۆدێرندا و زۆر بایەخی بەو لایەنە دەدا و لە بابەتەکانی باسی لایەنی راستی دیاریدەکان دەکرد .

١٨٠٢/٤/٢٢ بەرپابوونی شەڕی نێوان مەزهەب شیعەو وەهابیەکان لە شارەدێی کەربەلا، لە باشووری ئێستای ئێراق ، لە دوای هێرشی وەهابیەکان بۆ سەر کەربەلاو لە ئاکامی ئەوشەڕە زیاتر لە -٥٠٠٠- هەزار شیعە کوژران لەگەڵ ١٠,٠٠٠ هەزار بریندار ، لە دوای ئەوشەڕەدا وەهابیەکان سەرکەووتنیان بەدەست و گەرانەوە بەرەو بیابانی دوورگەی عەرەبی بۆ شاری مەککەی سعوودیەدا.

١٨٠٢/٥/١٩ سەرکردەو ئیمپراتۆری فەڕەنسا ناپیلۆن کاتی دەسەلاتی خۆی ووسامێکی بەناوی - لجیون دونور- دروستکردبوو ، کە لەو کاتە سەرۆکی قوونسولی فەڕەنسا بووەو پێش ئەوەی ببێتە ئیمپراتۆر، دوای ئەوە وردە وردە ئەو ووسامە گۆڕانکاری تیاکراو تاکوو ئێستاش هەرماوەو دەبەخشرێ بەو کەسایەتی و پیاوە لێهاتوو سەرکەووتووەکان لە فەڕەنسادا .

١٨٠٢/٥/٢٢ لەدایک بوونی زاناو رووناکبیری ئەلمانی و جیهان - هینرش گۆستاف هۆتۆ - لە شاری بەرلینی ئەلمانیا . لە دوای تەواوکردنی خووێندنی یاساو فەلسەفە مۆڵەتی وانە گووتنەوەی بە دەست هێنا لە زانکۆ لە ساڵی ١٨٢٧ لەزانکۆی بەرلین .
دوای دووساڵ دامەزرا بە یاریدەدەری مامۆستا لەگووتنەوەی وانەکان لەمێژووی هونەری لە هەمان زانکۆداو بەردەوام بوو لەو بوارەداو لە هەمان کات کەلایەنگیری هیگل بوو ... لە ماوەی ژیانیدا چەندین بەرهەمی بڵاوکردەوە کە ئەویش :-
١- دراسة تمهيدية من الحياة الفني ، لە ساڵی ١٨٣٥ .
٢- تأريخ التصوير من المانيا و هولنده ، لە ساڵی ١٨٤٢ - ١٨٤٣.
٣- مدرسة التصوير المتأثرة بهوبرت فان إيك .لەگەڵ چەندین دانراوی دیکە

تا له ۱۸۷۳/۱۲/۲۱ لەشاری بەرلین کۆچی دوایی دەکات .

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /۳

## ۱۸۰۳

۱۸۰۳/٤/۲۲ لە یەکەم هێرشی هێزکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری بۆسەر هێزەکانی سووپای ئێران لە هەرێمی قەوقاز ، کە ئەوکاتە عەباس میرزا تەمەنی ۱٦ساڵ بوو . لەلایەن شا ی فارس کرایە سەرکردەی هێزەکانی سووپای ئێران ، لە هەموو خوولی شەڕەکان لە نێوان ئیمپراتۆریەتی فارسی لە ئێران و ڕووسیای قەیسەریدا ، عەباس میرزا سەرکردایەتی هێزەکانی سووپای فارسی لە ئەستۆدا بوو لە وڵاتەکەدا .

۱۸۰۳/٤/۳۰ ئەمیر سعوود چووە ناو شاری مەککە بەخۆی و ۱۰۰ حووشتر، بۆ ڕۆژی دوایی داوای لە دانیشتووانەکە کرد ، ئەویش بە ئەنجامدانی کۆبوونەوە نوێژ کردن ، کە هەموو پیاوانی ئایینی ئامادەی بوون لەگەڵ جەماوەرێکی زۆر لە شارەکەدا .

ئەویش ووتارێکی ئایینی خووێندەوە بەدوورو درێژی بە بیری وەهابی دوای تەواوکردنی ووتارەکەی هەموو ئامادە بووانی کۆڕەکە پشتگیریان لێکرد دوای ئەوە ئەمیر سعوودیش فەرمانیدا بەتێکدانی هەموو قوبەکانی گۆڕەکان ،.

بۆ ئەوەی کەس نەتووانی مرۆڤ بپەرستێ تەنیا خوا نەبێت ، واتە لە۲/٥ی هەمان ساڵ وەهابیەکان دەست پێشخەریان کرد لەگەڵ زۆر لە دانیشتووانی شـاری مەککـه ، بەتێکـدانی قووبــەی نووێــژکردن و قووبــەی ســەرگۆڕی پێغەمبەرو ئەبووبکرو ئیمامی عەلی و قووبەی خاتوو خەدیجە لە شارەکەدا .

تاکوو گەیشتنە ئەوەی کە هیچ قوبەیەك نەما ، لە هەمان کات ئەمیر سعوود دەنگی دا بەسووتاندنی نەرگەیلەو ئامێری خواپەرستی لەگەڵ قەدەخە کردنی جگەرە کێشان و تەنباك – تەنباك جۆرە توتنێکە- ئەمەش بە بەردەوابوونی شەڕی نێوان وەهابیەکان و شەریف حسین لە ناوچە هەرێمەکانی بیابانی دوورگەی عەرەبی و بەردەوام بوونیان لە سە ناکۆکیەکان .

## ١٨٠٤

١٨٠٤/١/١ جوولانەوەی رزگاری سەربەخۆیی هەرێمی هایتی لە هەوڵو خەباتێکی زۆر دژوواردا دەخوولایەوە ، دژی سەرکردەی داگیرکەری فەرەنسا – ناپیلۆن– ، کە لە ئەنجام تووانی ئەم جوولانەوەیە سەرکەووتن بە دەست بێنێ بە سەرۆکایەتی – جاك دیسالین– بەرامبەر بە داگیرکەری فەرەنسا ، کە ناوی وولاتەکەی گەراندەوە سەر ناوی دەسەلاتی پێشووی کە ئەویش هایتی بوو لە کێشووەرەکەدا .

١٨٠٤/٥/١٨ سەرکردەی فەرەنسی ناپیلۆن پۆناپارت کرا بە ئیمپراتۆر لە سەر فەرەنسا ، بە ناوی ناپلیۆنی یەکەمو لە ١٢/٢ هەمان ساڵ لە ئاهەنگێکیدا پاپا بیووس دەستی لەسەر شانی نایلیۆن داناو داوای لێکرد ، کە دەسەلاتی فراوانکات . دوای دەست لە پشتدانی پاپا و کاردانەوەی کاریگەریەکەشی بووە



هۆکارو لە ئەنجام رووبەرووی هەموو هێزەکانی ئەوروپا بووەوە هەلاتنیان بەرامبەر هێزکانی سووپای ناپلیۆن بەخۆوە دەدیت .

شایانی باسە مەسیحیەکانی ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن مەزهەب پرۆستانت بوون ، کە کێشەی هەمیشەییان لەگەڵ مەزهەب کاسۆلیك بەردەوامە تاکوو ئێستاش ، بەلام وەك رابردوو رۆلی نەماوە لە نێوانیاندا لە جیهان .

١٨٠٤/٧/٢٤ سەرکردەی هێزەکانی سووپای رووسیای قەیسەری– مینسیانۆڤ – لە گورجستان بە نامە داوای کۆمەكو هاوکاری لە هێزی کورد کرد بە

سەرکردایەتی حوسێن ئاغای سەرۆکی کۆچبەرەکانی کورد لە شاری یەریڤان ، بەلاّم حوسێن ئاغا داواکەی مینسیانوڤی بەیارمەتی نەدانی رووسەکان رەتکردەوە لە ناوچەکەدا .

١٨٠٤/٧/٢٨ لە دایك بوونی فەیلەسوفی بەناوبانگی جیهان و فەیلەسوفی رەخنەگرلە مەسیحیەت و چەپەکانی هیگل – لۆدویگ فویرباخ – لە شاری لندسهوت لەهەرێمی باڤاریا لەباشووری ئەلمانیا ... باوکی پۆل یوهان زانایەکی ناودارو مامۆستای یاسا بووە ... خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی فویرباخ لەشاری لندسهوت بووە لە وولاّتەکەدا .



دوای ئەوە بریاریدا کە خوێندنی تایبەتمەندی لە لاهووتی پرۆتستەنتی بێ و چەندین ساڵ لەو لایەنە بەردەوام بوو تاکوو تەمەنی گەیشتە ١٦ ساڵان . لە ساڵی ١٨٢٣ چووە زانکۆی هیدلبرگ و بەشداری کردنی لەکۆرە ئایینی و فەلسەفەییەکان ... دوای ئەوە چووە زانکۆی بەرلین لە ساڵی ١٨٢٤ کەلەوکاتەهیگل وانەی دەگووتەوە . جێگەی ئاماژەیە کە فویرباخ زاناو فەیلەسوفێکی ئەلمانی و جیهانی بووە ، لە هەموو بوارەکانی فەلسەفەو زانست و بەردەوام بوونی لە کارە هەمە جۆرەکانی تاکوو لە ١٨٧٢/٩/١٥ کۆچی دوایی دەکات لەئەلمانیا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢ .

١٨٠٤/٩/٣ شازادە –تسی تسیانۆف– ی بەرپرسی ڕووسیای قەیسەری پەیووەندی بە حوسێن ئاغا کرد ، کە ئەو کات ژمارەی خێزانە کوردەکان ٨٠٠٠ هەشت هەزار خێزان دەبوون.

کە داوای یارمەتی لێدەکرد، کە یارمەتی هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری بدات دژی هێزەکانی سووپای فارس لە سەر خاکی کوردستان .

بەلاّم کوردەکانی سەر بەبنەماڵەی خانی بوون لە یەریڤان دانیان بە

دەسـەڵاتی ڕووسـیای قەیـسەری نـە دەهێنـاو زۆرجـار پـەلاماری هێزکـانی ڕووسیان دەدا لە ناوچەکەدا .

١٨٠٤/٩/٢ بە هۆی باری ناهەمواری نێوان دەسەڵاتەکانی ڕووسیای قەیسەریو فارسی لـە ئێـران ، شـازادە – تـسی تـسیانۆڤ – نامەیـەکی ئاراسـتەی حوسـێن ئاغـا کردو داوای لێکرد کە ببنە هاوولاتی ڕووسیای قەیسەری لە کێشووەرەکەدا. لـە بەرامبـەر بـەوەی کـە حوسـێن ئاغا دەسـەڵاتی تـەواوی هـەبێت لـە سـەر ناوچەی یەریڤانو پارێزگاری لێبکات ، لـە بـەر ئـەو داوایـە نیـازی ئـەوە بـوو کوردەکانی خـانی ناوچـەی یـەریڤان بە هەموو شـارو شارۆچکەکان بەشـێکی کوردسـتانەو زیـاتر لـە١٧٠٠٠هـەزار کیلۆمـەتر چـوار گۆشـەی خـاکی کوردستانی پێ لکێندراوە . بەپێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ لکێنراوە بە کۆماری ئەرمینیای ئـەوکاتی سۆڤیەتو تـاکوو ئێـستاش وەك خـۆی مـاوە کـە خاکی کوردستانە لە کێشووەرەکەدا .



١٨٠٤/١٠/ کۆچـی دوایـی داهێنـەری ئۆتۆمبیلی ئامێر هـەڵمی – نیکـۆلای جـۆزێـف کـاگنۆت – لـە پاریـسی پایتـەختی فەرەنـسا . جێگـەی ئامـاژە پێکردنە کـە ئۆتۆمبیل ئـەو ئامرازە سەرسوورهێنەرەیە کـە داهێنـان و دۆزینـەوەی بـەهۆی پێـشکەووتن و گەشەسـەندنی ڕەوتـی ژیـانی مرۆڤایـەتی بـوو لـەو وولاتانـەی کـە هـەنگاوی پیـشەسازی بەرچـاویان هـەبوو لـە جیهـان ... ئـەم ئامێرەش بووە هۆی سووك کردنی باری سەرشـانی ئادەمیزادەکـانی جیهـان و تام و چێژێکی دیکەی نایابی بەڕوو جوانەکانی ژیاندا .

لەبـەر ئـەوەی داهێنانـەکانی سـەرەتایی لە ئـەنجامی مانـدوو بـوون و هـەوڵ و کۆشش و شەونخوونی مرۆڤ بووە ... چ بە تاکە کەسـی ، یـاخوود بە کۆمەڵـە کەسـێك لـە بیروبۆچـوونی جیـاواز و گەیـشتن بـە ئـەنجامی گەیانـدنی ئـەو

داهێنانـه و لـه ئـه‌نجام سـه‌رکه‌ووتنی به‌ده‌ست هێنا ، لـه پێناو خزمـه‌تکردنی مرۆڤایه‌تی له جیهاندا .

جا بۆ ئه‌وه‌ی به درێژی نه‌چینه ناو باسه‌که‌مان و نووسینی به کوورتی که جێگه‌ی لێروونکردن بێت ، که ده‌توانین ئه‌و ده‌ست پێشخه‌ریانه بخه‌ینه ڕوو که له‌و بواره‌دا پێشه‌نگ بوون ... سه‌ره‌تای بیرۆکه‌ی ئۆتۆمبیل به ده‌ستێکی ئـه‌و پلانـه تیئۆریانـه ده‌ست پێده‌کات کـه له‌لایـه‌ن هـه‌ردوو زانـا – لیۆناردۆ دافنشی – و – ئیسحاق نیوتن – وه ، نه‌خشه‌یان بۆ دارێژرابوو ، به‌م جۆره ده‌تونین سه‌ره‌تای داهێنانی ئۆتۆمبیل بۆ چه‌ند جۆرێك و قۆناخێك بگه‌رێته‌وه ئه‌ویش :–

یه‌کـه‌م :– یه‌کـه‌م ئۆتـۆمبیلی خـۆ بزوێنـه‌ر ئـامێر – بزوێنـه‌ر – ی هـه‌ڵمی سه‌ربازی له شێووه‌ی تراکتۆر له‌لایه‌ن ئه‌ندازیاری سه‌ربازی – نیکۆلا جۆزێف کاگنۆت – له ساڵی ١٧٦٩ له فه‌ره‌نسا داهێنرا ، که تیایدا بزوێنه‌ری هه‌ڵمی بۆ لێخوورینی گالیسکه‌ی – ئۆتۆمبیله‌که‌ی – به‌کاری دێنا ، که راسته‌وخۆ له ژێـر چـاودێری خـۆیـدا و بـه یاریـده‌ی – برێـزن – ی میکـانیکی لـه – پـاریس ئه‌رسێنال – دا دیزاینه‌که‌یان ئاماده‌کرد .

لـه سـه‌رتادا سـووپای فه‌ره‌نـسا ئـه‌م ئـامێره شـێووه ئۆتۆمبیلـه‌ی بـۆ گوواسـتنه‌وه‌ی تۆپـه گـه‌وره‌کان بـه‌کاردێنا ... ئـه‌م ئۆتۆمبیلـه‌ش سـێ ڕه‌ووڕه‌ووه‌ی – تایـه – ی هـه‌بوو ... کـه مه‌نجـه‌ڵێکی گـه‌وره لـه به‌شـی پێـشه‌وه‌ی ئۆتۆمبیله‌کـه جێگیرکرابـوو ... ئـه‌م ئـامێره‌ش لـه یـه‌ك کاتـژمێردا ده‌یتـوانی ٧,٨٠٠ حـه‌وت کیلۆمـه‌تر و هه‌شـت سـه‌د مـه‌تر بـڕوات ... کـه ده‌یتـوانی چـوار تـه‌ن لـه دوای خـۆی رابکێشێ ، سـه‌ره‌ڕای ئـه‌وه‌ی کـه کێشی خۆی ٢,٥ دوو ته‌ن و نیوو ده‌بووله دوای دروستکردنیدا .

ئه‌م ئۆتۆمبیله نه‌یده‌توانی به شووێنه به‌رزو نزمه‌کاندا بڕوات ته‌نیا له رێگـه‌ی راسـت و تـه‌ختایی نـه‌بێت ... هـه‌روا لـه مـاوه‌ی ١٠ تـا ١٥ خوولـه‌ك ده‌بووایـه بووه‌ستێ بـۆ ئـه‌وه‌ی دووباره پاڵه‌په‌ستۆی هـه‌ڵمی بـۆ دروست بکرێتـه‌وه ... دوای ئـه‌وه – کـاگنۆت – تـوانی لـه سـاڵی ١٧٧١ دووه‌مـین ئۆتـۆمبیلی ئـامێر هه‌ڵمی دروست بکات ، که بریتی بوو له سێ چه‌رخه‌یه‌کی خۆ بزوێن و توانای

فەرەنسی تیا خەرجکرا .

بەڵام ئەم ئۆتۆمبێلە نەیدەتوانی کۆنترۆڵی خۆی بکات و لە ئەنجام خۆی لە پەرژینێکی بەردینی داو یەك لە سەر نشینەکانی بەو هۆیە گیانی لە دەستدا . بەم جۆرە یەکەم کارەساتی ئۆتۆمبیل لە لاپەرەی تۆمارەکانی مێژوو تۆمارکرد ... کە ئەمەش بووە هۆی دڵگرانی داهێنەر – کاگنۆت – و لە دوای ئەم کارەساتە بوودژەی خەرجی ئۆتۆمبیلەکەی بۆ خەرج نەکرا . دوای ئەوە – لویسی پانزەهەم – پاشای فەرەنسا لەساڵی ١٧٧٢ ، ٦٠٠ لیڤرسی وەك مووچەی ساڵانە بۆ کاگنۆت تەرخان کرد .

بەڵام لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆرشی فەرەنسا لەساڵی ١٧٨٩ دا مووچەکەی کاگنۆتیان بڕی و ئەو خێزانە بۆ شاری بروکسل دوور خرایەوە ... دوای چەندین هەوڵ و کۆششی دیکە و سەرەتای پەیدابوونی گالیسکەی خۆ بزوێندا شەمەندەفەری هێڵی ئاسن و ئۆتۆمبیلی ئامێر هەڵمی پەرەیان پێدرا ... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارەکانی داهێنانی ئۆتۆمبیل وەك ئەوە نەبوو کە لە شەمەندەفەر ئاسانتربوو .

بە هەر حاڵ کاگنۆت یەکەم کەسە کە بیرۆکەو بە ئەنجام گەیاندنی دروستکردنی ئۆتۆمبیلی لە مێژوودا تۆمارکردبێ ... دوای کاگنۆت پەرە بەم بووارە درا لە فەرەنسا و ئەمەریکا و بەریتانیا و ئەلمانیا .

دووەم :– ئامێری هەڵمی تاکە ئامێر نەبووە کە بەکارهاتبێت لە دروستکردنی ئۆتۆمبێل ... بەڵکوو زۆر ئوتومبێلی ئامێر کارەبایش داهێنراوە ... دوای ئەوە – رۆبێرن ئەندرسۆن – لە ساڵەکانی ١٨٣٢ – ١٨٣٩ تووانی لە سکۆتلەندە یەکەم ئوتومبێلی ئامێر کارەبایی دروست بکات . دوای ئەوە ئۆتۆمبێلی بچووك لەلایەن پرۆفیسۆر – ستراتینگ – ی هۆڵەندی لە ساڵی ١٨٣٥ ، هەروا لە لایەن – کریستۆڤەر بێکەر –ی یاریدەدەری دروستکرا

بەم جۆرە ساڵ بە ساڵ و دەیە بە دەیە لە نێوان سەرەتا و کۆتاییەکانی سەدەدا ئوتومبێل بە هەموو جۆرەکانی پەرەی سەندوو گەشەی کرد لە بواری ڕامیاری و ئابووری و بازرگانی و دوایی فرۆکەو کەشتی و دوایی جۆرەکانی دیکەی سەربازی و مەدەنی ، تا ئەمرۆی کە لەبەر چاومانە لە جیهاندا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢ .

## ١٨٠٥

١٨٠٥/٤/٢ لە دایك بوونی نووسەرو ڕووناکبیری ناوداری دانیمارکی و جیهانی – هانز ئەندرسۆن– لە شاری ئۆدنسەی دانیمارك ، کە ئەو کەسایەتیە لە خێزانێکی هەژاری ڕۆشنبیر بەم پایە بەرزە گەیشتووە . لە بواری نووسین و پەیووندیە کۆمەڵایەتیەکان .

١٨٠٥/٦/١٣ لەدایك بوونی موئەرخی فەلسەفەی نوێ – یۆهانس ئەدوارد – ئەردمن لە ناوچەی ویردمار لەکەرتی لتۆنیا لە هەرێمی بەلتیق . خووێندنی لەشارەکانی دۆریان و بەرلین تەواوکردووە و لەسەر فەلسەفەی هیگل و دوای ئەوە بووە لایەنگیری هیگل و گرنگیدان بەبیروو بۆچوونەکانیدا ...هەروا خووێندنی لاهووتی تەواوکردووە و بۆتە کاهن لەگوندەکەی خۆی لەساڵی ١٨٢٦ . دوای ئەوە لەساڵی ١٨٣٢ گەراوەتەوە شاری بەرلین و کتابێکی بەناونیشانی – محاولة لعرض علمي لتأريخ الفلسفة الحديثة– ی لە سێ بەرگ بڵاوکردەوە .
دوای ئەوە بروانامەی دکتۆرای لەساڵی ١٨٣٤ بەدەست هێناو بووەتە مامۆستای یاریدەدەر لەزانکۆی هلە لە ساڵی ١٨٣٦ لەئەلمانیا ... دوای ئەوە لەساڵی ١٨٣٩ بووە مامۆستا... لە کۆتاییەکانی ژیانیدا گرنگی بەفەلسەفەی دەروونی دا تاکوو لە ١٨٩٢/٦/١٢ کۆچی دوایی دەکات ، بە ماڵئاوایی کردنی لە گەلانی وولاتە هەمەلایەنەکانیدا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /١ .

١٨٠٥/٦/١٨ دامەزرێنەری وولاتی میسر محەمەد عەلی پاشای بەنژاد کوردو لە بنەماڵەی خدێووی بە زیرەکی و لێهاتوویی خۆی توانی ببێتە والی وولاتی میسر ، ئەو بنەماڵەیە تاکوو شۆڕشی میسر لە ساڵی ١٩٥٢ لە سەر میسر دەسەڵاتدار بوونەو ڕۆڵی گرنگیان هەبووە لەخزمەتی عەرەب و خواستەکانیاندا .

١٨٠٥/٨/١٠ بە هۆی هەڵوێستی بوێرانەی دانیشتووانی کورد لە بەشە خاکە کوردستانی لکێنراو بەئەرمینیا لە پارێزگای یەریڤان ، بەرگری لە بوونی نەتەوەیی ژەنەڕاڵ – ماگۆر نیسفینانی– سەرکردەی هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری لە هەرێمەکە بە هێزێکی ٥٠٠ سەربازی و پێنج تۆپ و

گیچیلك- ، لە ئەنجام مەڕومالأتیان تالأنکردن و مالەکانیان سووتاندن ، کە لە ئەنجام بووە هۆی دەستگیرکردن و دەربەدەربوونی بەسەددا خێزان لە هەرێمی پارێزگای یەریڤان و دەوروبەریدا .

١٨٠٥/٩/٢٨ بەرپرسی ڕووسیای قەیسەری - کنیاز تسی تسیانۆڤ - سەرقالی پێووەلکاندن ، یا یەکخستنی خانەکانی قەرەباخ و شاکین بوو بە ڕووسیاو ، هەروا خەریکی چالاکی دەبێ دژی دەست درێژی هێزەکانی بابافان لە قەرەباخ .

ئەویش بۆ پاراستنی سنوورەکان لەلایەن شاری یەرڤان وبامباکاخ لەومشت و مرەو ململانێیە ، ژەنەراڵ مایور نیسزینایف داوای لێکرابوو کە پەیووەندی لەگەڵ کوردەکانی یەرڤان بەهێز بکات ، بەلأم لەرامیاریەتی دەسەلأتی ڕووسیای قەیسەرییە کە بەدەیا نیازی نهێنی هەبووە بەرامبەر بە کورد لەوهەرێمەدا .



١٨٠٥/١٠/١٣لە دایك بوونی نووسەرو شاعیرو مێژوونووسی بە ناوبانگی کورد خاتوو - ماهشەرف ئەردەلانی- ناسراو بە مەستوورەی کوردستان ، شایانی باسە ئەو ئافرەتە ناودارە بەڕێزە لە بواری نووسین ڕۆڵی گرنگی هەبووە لە نووسینەوەی مێژووی ڕووداوە سەرکەوت و ژێرکەوتووەکانی دەسەلأتی میرەکانی ئەردەلان و باری ناوچەی کوردو کوردستان و پەیووەندیە جیاجیاکانی کورد ، بەتایبەتی لەباشوورو لە ڕۆژهەلأتی کوردستان.

## ١٨٠٦

١٨٠٦/٢/٨ سەرکردەی ڕووسیای قەیسەری ، کنیا زتسی تسیانوڤ ، لە دەروازەی قەڵای شاری باکۆ پەیمان دەشکێنی و لە شەڕ دەکووژرێ لەلایەن کوردەکان ، کە لەوکاتە کێشە و میملانێ لە نێوان فارس و تورک بەردەوام بووە لەلایەک و کێشەی نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ڕووسیای قەیسەری لەلایەکی دیکە لەسەر خاکی کوردستاندا بەردەوام بوو لە هەرێمەکەدا .

١٨٠٦/٢/١٥ شارۆچکەی تەلەعفەرو حەزەر سەر بە شاری سنجار بووینە ، کە لەوکات بەسترابوونەوە بە پارێزگای دیاربەکر لە باکووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، ئەویش لە دوای ساڵی ١٨٧٠ لکێندران بە پارێزگای مووسڵ ، کە لەوکات لە٩٥٪ دانیشتووانەکەی کورد بوینە لە هەرێمەکەدا .

مەولەوی

١٨٠٦/٥/٢١ نووسەرو شاعیری ناوداری کورد مامۆستا – سەعید عەبدولکەریم مەلا سەعید – ناسراو بە – مەولەوی – لە گوندی – سەرشانە – لە ناوچەی تاوەگۆزی – لە باشووری کوردستان چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ... کە لە خێزانێکی ئاینی پەروەردە بووە ... هەر لە منداڵیەوە باوکی ڕووی لە گووندی – بێژاوە – ی نزیک شارۆچکەی هەڵەبجە کردووەو لەوێ نیشتەجێ بوونە .

لەلایەن باوکی فێری قورئان خووێندن و خووێندەواری دەبێ ... هەر لەتەمەنی منداڵیەوە وردە کتێبەکانی سەرەتایی فارسی سەرف و نەحوی خووێندووە ... لەپێناو خووێندن چەندین گوندی کردووە وەك فەقێ لەلایەن مامۆستاکانی ئاینی خووێندنی تەواوکردووە... دوای ئەوە لەمزگەووتی

شاری سنه لـه رۆژهـەڵاتی کوردستان بە وەزیـر دامـەزراوەو دوای ئـەوە چۆتە شـاری – بانـە – و دوای ئـەوە گەراوەتـەوە باشووری کوردستان چۆتە شـاری سلێمانی و لە مزگەووتی گەووره لـە سلێمانی دامـەزراوەو مامۆسـتا مـەعروف نۆدێیی لەو مزگەووتە مامۆستا بووه.

دوای ماوەیـەك دەچـێتە شارۆچـکەی هەلەبجـەو لەمزگـەووتی جامعیـە دادەمەزرێ ... دوای ئەو هەموو گەرانە خووێندن تەواودەکات و دەست بەوانە گووتنـەوە دەکـات ... ئـەم کەسـایەتیە کـوردە شـاعیرو ئەدیبـە و نووسـەرە لـەژیانی خـۆی لـەو کارانـە بـەردەوام دەبێـت ، کـە ئاواتـەکانی تیـا بهێنایـەدی تـاکوو لـە ١٨٨٢/١١/١٢ کۆچی دوایی دەکـات ، بـەهۆی کەووتنـە خـوارەوەی لەسەر وولاخەکەی لەرێگادا.

بەرهەمـەکانی مامۆسـتا مەولـەوی وەك کـەلتوورێك جێگـەی خـۆی گرتـووەو جێگەی دڵخۆشکەری نووسەرو دانەرو رووناکبیرانی کورد و فارس و عەرەبە بەبەردەوامی لەم هەرێمانەدا بەتایبەتی لە کوردستان .

١٨٠٦/١٠/٩ رووسـیای قەیـسەری شـەری دژ بـە ئیمپراتۆریـەتی فەرەنـسا رگەیانـدو هێزەکانی سووپای هەردوو وولات دەستیانکرد بەپەلامارو دگیرکردنی خاکی یەکتری بەهێزی سوپای ئەوکات .

١٨٠٦/١٠/٢ لە دایك بوونی فەیلەسوف ناوداری ئەلمانی وجیهان – یۆهان کسبار ئەشمیت – لـە شـاری بابرۆیـت لەهـەرێمی بافاریـا لـە ئـەلمانیا لـەخێزانێکی هـەژار ... ناسراو بەنازناوی – ئیتبنگەر – ماوەی خووێندنی ئەو فەیلەسوفە لە ١٨٢٦ تـاکوو ١٨٢٨ بـووە ... ئـەویش بەخووێنـدنی فەلـسەفە لـە زانکـۆی بـەرلین لـەدوای تـەواوکردنی قۆناخـەکانی بـەر لـەقۆناخی زانکـۆ . ئـەو بەخووێنـدنی فەلـسەفەی هیگـل و کـارلێکردنی بـەبیروو هەسـتی ئـەم فەیلەسـوفە لـە وولاتەکەیدا .

دوای ئـەوە لـەزانکۆکانی ئـەرلنجن و کینجزبـرگ و دوای ئـەوە لەسـاڵی ١٨٣٢ گەراوە شاری بەرلین و بروانامەی وانە گووتنەوەی بەدەست هێنـا لـە برووسـیا ... بـەهۆی هـەژاری و کـەم دەرامـەتی بـووە مامۆسـتای قوتابخانـەی کـچان

لەشـاری بـەرلین و لەهـەمان کـات لەرۆژنامـەکان کـاری دەکـرد ، بەتایبـەتی
لەبواری فەلسەفەدا .

دوای ئـەوە چـووە نـاو کۆمەڵـەی ئـشترنری هێگلیـە ئازادەکـان ، لەگـەڵ
کەسـایەتی و روونـاکبیرو فەیلەسـوف ، لەوانـە چـاوپێکەووتنی بـە مـارکس
وئینگلش ... ئەم فەلیەسـوفە چەندین دانـراوی بەرهـەم هێنـاو بەردەوام بوو
لـەکارەکانی تـاکوو لـە ١٨٥٦/٦/٢٦ لەشاری بەرلین کۆچـی دوایـی دەکات لـە
وولاتەکەیدا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٣

١٨٠٦/١١/٦ بە هـۆی شارەزایی و لێهاتوویی محەمـەد عـەلی پاشای والی میسر لـە هـەموو
لایەنێك ، لـە پێنـاو بەرەو فراوانکردنـی دەسـەڵاتەکەی هـەنگاوینا بـە تایبـەتی
بـەرەو شـامو هەرێمـەکانی وویلایـەتی دیاربـەکر لـە باکووری کوردستان بـە
سەرکردایەتی ئیبراهیم پاشای کوڕی ...ئەنجامی ئەو هە وڵ و کۆششەی ئەو
بنەماڵەیە و بـووە هـۆی ئـەوەی کـە بریـاری دوورخستنەوەیان لـە دەسـەڵات
بدرێت .

بـەلام بـە هـۆی پاڵـە پەسـتۆی پیـاوان و کەسـایەتی ئـایینی میسر توانیان
محەمـەد عـەلی پاشـا بگەڕێننـەوە بۆسـەر کارەکـەی بـەوالی میسر لـە سـەر
وولاتەکەدا .

## ١٨٠٧

١٨٠٧/٣/٢ کۆنگرێـسی ئەمـەریکا بارزگـانی کردنـی بەکۆیلـەی مرۆڤـی ئەفـەریکیای
هەڵووەشـاندەوە – عبیـد– کـە لـەو کـات زیـاتر لـە ٤,٠٠٠,٠٠٠ ملیـۆن
لەکۆیلـەکان لـە ناوچەکانی باشووری ئەمـەریکا مابوونـەوە . ئـەویش بە کار
پێکردنیان بە کاری هەمە جۆرو دوور لە وویژدانی مۆڤایەتی لە وولاتەکەدا .




١٨٠٧/٣/١ لە دوای سەرهەڵدانی کێشە لە نێوان ڕووسیای قەیسەری و بەریتانیا لە لایەك و دەسەڵاتی فارس لە لایەکی دیکەدا ... ڕێکەوتنی هەڵکەوتەی فەڕنسا وردە وردە لە دەسەڵاتی فارس لە ئێران نزیك بووەوە لە نێوانیاندا .
کە بووە هۆی ڕێکەوتنیان لە سەر چەندین لایەنی پەیووەندی نێووانیان...بەڵام دوای دوومانگ ڕێکەوتن لە نێوان ڕووسیاو فەرەنسا مۆرکرا ، بە ناوی پەیمانی – تلیست– ، کە فەڕنسا ماوەی بەڕووسیادا ، کە ڕامیایەتی بەرفراوان لە دەسەڵاتەکەی بەکار بهێنێ و بەرەو بە هێز ی هەنگاوبنێ ، لە سەر بەرژەوەندی هەردوو دەسەڵاتەکانی ئیمپراتۆریەتی فارسی و عوسمانی ...، ئەویش لەسەر خاکی کوردستان.

١٨٠٧/٣/١ دەستەیەکی نیزامی لە زاناکانی سووپای فەڕەنسا بە سەرۆکایەتی – کاردان – لە و کاتەی کە سەردانی ئێرانی کرد ، کە هێشتا شەڕ لە نێوان ئێران و ڕووسیا کۆتایی پێنە هاتبوو، ئەودەستەیە خزمەتی گەورەی هێزەکانی سووپای فارسی لە ئێران کرد ، ئەویش بە دامەزراندنی سێ مەڵبەندی

مەشق پێکردن لە شارەکانی وەك تاران و تەورێزو ئەسفەهان .
کە زیاتر لە ١٤ مانگ خەریکی مەشق پێکردنی چەند هەزار سەربازی فارس بوون لە ئێران . کە ئەوانەی ووشەی سەربازیان داهێناو ئۆنیفۆرمیان کردە باوو، هەر ئەودەستەیەش هەوڵیدا سووپای فارسی لە ئێران لە سەر شێووازی سووپاکانی ئەوروپا مەشق پێبکات ، بۆ ئەوەی ڕێکی بخات و تاکتیکە جەنگیە کۆنەکانی فارس بگۆڕێ بەنوێترین تاکتیك لە وولاتەکەدا .

١٨٠٧/٣/١٧لە ماوەی هاوپەیمانیەتی چوارەمی ئەوروپا دژی فەڕەنسا ، کە بووە هۆی مۆرکردنی هاوپەیمانی لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی وسەرکردەی فەرەنسا ناپیلۆن ، کە ئەو ڕێکەووتنە بووە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕ لە نێوان بەریتانیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا .
لە هەمان کات ئیستوولی جەنگی بەریتانیا چووە ناو دەریای مەرمەڕە ، لە پێناو چوونەناو شاری قووستەنتینیە – پارێزگای ئەستەمبوڵی ئێستا – بەڵام هەوڵەکانی بەریتانیا هەرەسی هێناو داگیرکەرە بەریتانیەکان بڕیاریاند هێرش بکەنە سەر میسر بە ٥٠٠٠ هەزار سەرباز ، کە ئەم روو وەرگێران بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان هێزەکانی بەریتانیاو هێزەکانی سووپای محەمەد عەلی پاشا ، کەجووتیارو بەدووەکان پشتگیری لێدەکرد لە دژی هێزەکانیسووپای بەریتانیا.
ئەم شەڕەش بۆ ماوەی پێنج مانگ بەردەوام بوو لەناوچەکانی شاری رشدو ئەسکەندەریە – تامانگی/٩ ی هەمان ساڵ ، کە هێزەکانی بەریتانی کشانەوە بەهۆی بەرگری کردن لەلایەن هێزەکانی سووپای محەمەد عەلی پاشا لە وولاتی میسر. لە ناوچەو شارەکاندا .
١٨٠٧/٦/٢٨سوڵتانی عوسمانی – سوڵتان سەلیمی سێیەم – لە دەسەلات دوورخرایەوە لە دوای ١٩ ساڵ لە دەسەلات تاکوو کۆچی دووایی کرد لە سەر دەسەڵاتدا .
١٨٠٧/٧/٧ بە هۆی سەرکەووتنی هێزەکانی سووپای ناپلیۆن بەسەر هێزەکانی ڕووسیای قەیسەری ، کە ئەنجامەکەی بووە هۆی مۆرکردنی پەیمانی ناسیت)– لە نێوانیاندا .
شایانی باسە کە ، نلسیت ، گووندێکە لە ڕۆژهەلای بڕووسیا لە سەر زێ

ینچن ... ئەم زێیە جیاکەرەوەی سنووریە له نێوان ڕووسیاو بڕووسیا ، که ناپلیۆنی یەکەم لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ڕووسیای قەیسەری ئەسکەندەری یەکەم لەو کات کۆبوونەوەو ڕێکەووتن لە سەر دابەشکردنی ئەورپپا لەنێوانیاندا .

١٨٠٧/١٠/١٦ئەو ڕاپۆرتەی کە سەرکردەی شالاوەکە – فریزەر– لەگەڵ نووێنەری محەمەد عەلی پاشا ، کە ژەنەڕاڵ مۆریوو ناردبووی ، لەلایەنە گرنگەکانی ئەو ڕاپۆرتە گفتووگۆی نێوانیانی له سەر کرا .

ئەویش بەهێورکردنەوەی بارودۆخەکە له ناوچەو هەرێمەکانی وولاتی میسر ، لەگەڵ پاشای میسرو ژەنەڕاڵ میجەر – شویروك– و کاپتن – فلیوز– له پێناو هێوکردنەوەو سەرکەووتنی کارەکان .

## ١٨٠٨

١٨٠٨/١/١ قەدەخەکردنی بازرگانی پێکردن و هێنانی کۆیلە – عبید– له ئەفریکیا بۆ ئەمەریکا له پێناو کارپێکردنیان له کارگەو پرۆژەو کێلگە کشتووکاڵیەکان ، بە بەدەست هێنانی سەرمایەی زۆرو بێ ئەوی خەرجیەکان بەرەو بەرزی برۆن، له ئەنجامی کار پێکردنیان لەو وولاتەدا .

١٨٠٨/٢/٢٨دەستەی سووپای فەڕنسا له کاتی سەردانەکەی بۆ ئێران ، بە سەرکردایەتی کاردان ، ئەویش له دوای دامەزراندی مەڵبەندی مەشق پێکردن له شارەکانی تاران و تەوریز و ئەسفەهان ، لە هەمانکاتدا دوو کارگەی داڕشتنی تۆپخانەیان لەتاران و تەوریز دامەزراند ، دوای ئەوە ئەو دەستە زانا سەربازیە کەووتنە داڕشتنی کارگەی دروستکردنی تۆپی گران ، کەپێشتر ئێران ئەو جۆرە کارگانەی نەبوو له وولاتەکەدا .

١٨٠٨/٢/٢٨بە هۆی بە هێزبوونی پەیووەندی لە نێوان هەردوو دەسەڵاتی فارس و فەرەنسا ، هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری پەلاماری شاری یەریڤانی پایتەختی ئەرمینیای ژێر دەسەڵاتی فارسی ئەوکاتیدا ، کە هەرێمێکی کوردستانە.

له هەمان کات بۆ دەسەڵاتی فارس دەرکەووت کە نیازەکانی فەڕنسا بەرامبەر بە دەسەڵاتی فارس لەناوچەکە چۆن بەڕێوەدەچێت...لەلایەکی دیکەوە

بەریتانیا شاندێکی بەرەو ئێران ڕەوانەکرد بۆ گفتووگۆ کردن لە ئاکام گفتووگۆکە سەرکەووتنی بەدەست هێنا لەگەڵ شای فارس بەمۆرکردنی ڕێکەوتن دژی فەڕنسا،.

ئەمە لەلایەك و لەلایەکی دیکە بەریتانیا شاندێکیشی بەرەو ئەفگانستان ڕەوانەکرد ، لە پێناو گفتووگۆکردن لەگەڵ – شوجاع شاو– لە پێناو مۆرکردنی ڕێکەووتنامە دژی هێرشەکانی فەڕنساو فارس ، بەڵێنی بەشوجاع شای ئەفگانستاندا ، کە دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکات بە تایبەتی لە بوواری سەربازیدا .

کە بووە هۆکاری ئەوەی ، کە هێزەکانی سووپای فارس دووجار بەرامبەر بە هێزەکانی سووپای ڕووسیا ی قەیسەری شکست بە دەست بێنن بە هۆی نەبوونی هەڵوویستی ڕاستو ڕانە گرتنی هاوسەنگ و هاوکێشەکان و یاریکردن لەیاری کەرەکان لەگۆڕپانی یاریگای ڕامیاری لە هەرێمەکاندا .

١٨٠٨/٦/٢٨سوڵتان سەلیمی سێیەمی سوڵتانی عوسمانی لە تەمەنی٤٨ ساڵیدا کۆچی دووایکردووە ، دوای ئەو سوڵتان موستەفای چوارەم دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی گرتە دەست ، کە کوڕی سوڵتان عەبدولحەمیدی یەکەم بووە .

شایانی باسە کە پیلانی لابردنی سوڵتان سەلیمی سێیەم لە سەر دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی ، کە مرۆڤێکی توندڕەو و شۆڤێنی بەرچاو جەنگ بووەو هەردەم حەزی بە ئاژاوەو داگیرکردنی خاکی گەلانو وێرانکردن دەکرد . با تایبەتی خاکی کوردستانو کورد لەهەموو بوارەکان ، بە تایبەتی لە بواری نەتەویی و نیشتیمانیدا لە سەر خاکی کوردستان .

١٨٠٨/٧/٢٨سوڵتان مەحمودی دووەم دەسەڵاتی ئیمراپتۆریەتی عوسمانی گرتە دەست و لە هەمان کات مستەفا پاشا بریقەداری کرد بە وەزیری مەزنی خۆی ... ک مستەفا پاشا بە هەموو تووانایەك هەوڵیدا بە چاکسازی کردن لە ریزەکانی سووپاو کارگێری ، لە پێناو زاڵ بوون بەسەر بەرهەڵستکاران ، کە لە سەرەت پیاوانی ئایینی و ئینکشاریەکان بێ دەنگ بوون .

بەڵام دوای ئەوە بووە هۆی دروست بوونی کێشە تاکوو گەیشتە شەڕ

چەکداری لە نێوان هێزەکانی ئینکشاریەو چەکدارانی حکومەت ، لەئەنجام وەزیری مەزن مستەفا سووتێندراو ئاژاوەو پێکدادان لە هەموو شاری ئەستەمبوڵ و دەورووبەری بڵاو بووەوەو بووە هۆی سووتاندن و تەقاندنەوەی گۆگاکانی چەك و تەقەمەنی و دام و دەزگاکانی ئیمپراتۆریەتەکەدا .

١٨٠٨/١٢/٢٢دوای ماوەیەکی کەم - کلۆدیووس جێمس ریچ - لە ژن هێنانی . گەڕایەوە نووسینگەکەی کە شاری بەغداو بەسرەشی گرتۆتەوەو لە ئەنجام لە شاری بەغدا سەقامگیربووە ، کە بارەگای والی دەوڵەتی عوسمانی لێبووە چونکە بەو هۆیەوە کە شوێنەکەی لە ناوەراستدا بووە ... توانیوویەتی کاروباری رامیاری خۆی لەگەڵ دام و دەزگاکانی والی بەغدا بەڕێوەبەرێ و ئەو دەنگوباسانەش ببیستێ کە لەوسەردەمەدا لە ئەورووپاوە دەهاتن و پڕ بوون لەو هەواڵانەی کە چاوەروانکرابوو ، کە - ناپلیۆن - ئینگلتەرەو هیند داگیربکات ... بەهۆی هەست بەرزی و دوور بینی ئەم مرۆڤە لەکاروباری رامیاری و ئاگاداربوونی لە رەوشت و خووی خەلکی و بەخشندەیی خۆیشییەوە زۆر خێرا توانیوویەتی رێزی خۆی لەلایەن میری ولای دانیشتووانەکان پەیدا بکات و ببێتە جێگەی بڕوا پێکردن لەوکاتدا لە وویلایەتەکان .

سەرچاوە:- کەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان - چاپخانە - ئاراس - هەولێر - باشووری کوردستان

## ١٨٠٩

١٨٠٩/١/١٩ لەدایك بوونی داهێنەری بەناوبانگی ئەمەرکی - ئێدگارتالان پوو- لەشاری بۆستنی ئەمەریکا لەدایك وباوکێکی ئەکتەر ... ئەم داهێنەرە لەماوەی ژیانی بەدەیا کاری هەمەجۆری ئەنجام داوە تاکوو لە ١٨٩٤/١٠/٧ کۆچی دوایی دەکات لە وولاتەکەیدا .

٣ / ٢ / ١٨٠٩لەدایك بوونی مۆزیکازانی ناوداری ئەلمانی – مەندلسۆن – لەشاری هامبۆرگ ، لەوکاتــەی کــه ئــەلمانیا لەلایــەن فەرەنــسا لەســاڵی ١٨١١ داگیرکــرا ... بنەماڵەکەی بەرەو شاری بەرلینی پایتەخت رۆیشتن و لێی نیشتەجێ بوون ، کە مەندلسۆن هەر لەو شارەدا خووێندنی هونەری مۆزیکای دەست پێکرد لەسەر ئامێری پیانۆ .

لــه هــەمان کاتــدا ئــەدەب وهونــەری وێنەکێــشانی تەلارســازیش فێربــوو کــه ئەمانــەش کاریــان کــردە ســەر بــەهرەی هونــەری و بــەلاوێکی زانــاو هۆشــیاری خاوەن هەستێکی فراوان ، یەکەم گەشتی مەندلسۆن بۆ ئینگلتــەرە لــه بەهاری ســاڵی ١٨٢٩ بــووەو ســەرکردایەتی ســیمفۆنی کۆمەڵــەیکی هونــەری شــاری لەندەن و بۆ هاوین رووی کردە ئۆسکۆتلەندە .

له ساڵی ١٨٣٠ گەراوەتەوە ئەلمانیاو دوای ئەوە سەردانی نەمساو ئیتالیاو سوویدی کردووەو چالاکیه مۆزیکیەکانی لەو وولاتانە پێشکەش کردووە ، کە لە هەموو ئەوروپا ناسرا ، لە ساڵی ١٨٣٢ دا گەراوەتــەوە شاری لەندەن و بــووە ســەرۆکی تیپێکــی تایبــەتی مۆزیکــا ... دوای ئــەوە یەکــەمین کتــێبی هونــەری بەناوی – گۆرانی بێ ووشــە –ی بــەزمانی ئــەلمانی بڵاوکردۆتــەوە ، ئەم هونەرمەندە ناوداره بەردەوام بووە لەبەرهــەمی هونەری و نووسینەکانی هونــەری تــاکوو لەســالی ١٨٤٧ کۆچــی دوایــی دەکــات و ماڵئــاوایی لــەبواری هونەری و هونەر دۆستان دەکات لە جیهان .



١٨٠٩/٢/١٢ له دایك بــوونی پرۆفیسۆرو زانــای نـــاوداری جیهـــانی... چـــالز داروێـــن... شـــایانی باســـه کـــه مامۆستا مەزن و بەهرەدار داروین خاوەنی کتێبی – الاصل الانواع– ە ، کـــه بۆتـــه سەرچـــاوەی بیروبۆچوونو مشتوومری نێوان زانایـــان لـــه جیهـــان و . لـــه بووارەکـانی فەلسەفەو ئـابووریو سرووشـتو ئاژەڵناسـی و مـرۆڤ و

راکێشەر – جازبیە – و چەندین لایەنی دیکەی زانستە هەمەجۆرەکان لە جیهاندا .

١٨٠٩/٧/٨ سولتان مەحمودی دووەمی سولتانی عوسمانی ڕێکەووتنی لەگەڵ ڕژێمەکانی بەریتانیاو ڕووسیا مۆرکرد ، هەرچەندە بە دامەزراندنی تەواو نەبوو... بەڵام بە هۆی کێشەو ململانێی کاروباری ناووخۆی دەسەڵاتەکەیدا و هەوڵی بەرەو باشکردنیدا بە پتەووکردنی دەسەڵاتە هەمەلایەنەکان بە تایبەتی لەلایەنی سەربازی و ئابووریدا ، لە پێناو پەلاماردانی خاکی گەلان و داگیرکردنی بە تایبەت خاکی کوردستان .

## ١٨١٠

١٨١٠/٢/٦ لە دوای هاتنی دەستەی نووێنەرایەتی فەڕەنسا بە سەرۆکایەتی کاردان ، بۆ ئێران لەپێناو جێبەجێکردن و پێك هێنانی ڕێکەووتنەکانی فەڕەنسی ـ ئێرانی – فێکن شناین– کردنەوەی هێزە چەکدارەکانی فارس لە ئێران .

کە عەسکەرخانی ئەوسا یەکێ بوو لە پیاوە ناسراوەکانی ئەو کاتی ئێران ، جگە لەوەی کە بەشداری دروستکردنی فەوجەکانی پیادەی نیزامی ئازربایجان کرد بوو ، دوای ئەوە لەلایەن – فتحعلی شاهی– قاجارەوە کرایەوە بە دووەمین باڵوێزی قاجار ، و لەلایەن ناپلیۆنی ئیمپراتۆری فەڕەنسا ، عەسکەرخان لەگەڵ خۆیدا بایی ٥٠٠٠ پێنج سەد هەزار تومەن دیاری بۆ پاریس بردوو ... بە پێشکەش کردنی بە بڕپرسان .

پاش ئەوەی چوارساڵ لە پاریسی پایتەختی فەڕەنسا مایەوە بێ ئەوەی بە هیچ ئەنجامێك بگات ... بە١٠٠٠ تومەن قەرزاری گەڕایەوە ئێران ، ئەو قەرزەی کە لەسەری کۆببووەوە دەیوویست بەتاڵانکردن لەخەڵکی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان پڕی بکاتەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا لە پاش گەڕانەوەی عەباس میرزا ، عەسکەرخانی کرد بە کردیە دادوەری پارێزگای ورمێی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.




١٨١٠/٧/٢٠ وولاتـــی کۆلۆمبیـــا ســـەربەخۆیی خـــۆی ڕاگەیاند بە دەرچوونی لـــە ژێـــر داگیرکـــەری ئیمپراتۆریـــــــەتی ئیـــسپانیا .بـــەناوی کۆماری کۆلۆمبیا ، و پایتەختەکـــــەی – بۆگاتـــا – ژمـــارەی دانیـــــــشتووانی پایتـــەخت ٦٣٥,٠٠٠٠ ملیـــۆن کەســـە . ژمـــارەی دانیـــشتووانی وولاتەکـــە ٤٠,٦٦٥,٠٠٠ ملیـۆن کەسە ، هـەوا ڕووبـەری وولاتەکە ١,١٣٨,٩١٠ کیلـۆ مەتر چوارگۆشـەیە . هەروا نژادەکان – مستبزۆ/ ٥٠٪ ،سپی پێست ٢١٪ ، مۆلتۆ ١٥٪ ، ڕەش پێست٤٪ . هـەروا چڕی دانیشتووانی ٩١ کەس لـە یەك میل چوار گۆشەدا .




١٨١٠/٩/١٦ گـــەلانی مەکـــسیك لـــە پێنـاو تۆڵە سەندنەوەدا ، ڕووبـــــــــەڕووی داگیرکـــەری ئیـــسپانیا بوونـــەوە . لـــە پێنـــاو بـــــەرگری کـــــردن و ڕزگاربوونیـــان کـــە لـــە ئاکامـــدا ئاواتـــەکانیان هاتـەدی بە ڕاگەیانـدنی سـەربەخۆیی مەکـسیك ... دوای ئـەوە ئـەو ڕۆژەیـان بـەڕۆژی سـەرکەووتن و سەربەخۆیی مەکسیك دادەنێن و تـاکوو ئێـستاش یـادی ئـەو ڕۆژە دەکەنـەوە , بەسـەرکردایەتی – کۆسـتێلا– کـە ڕۆڵـی سـەرەکی هـەبوو لـە ڕزگـار کردنـی گەلانی مەکسیك لە چێر داگیر کەری ئیسپانیا لە کێشووەرەکەدا .

هەروا ئەم راگەیاندنەش بە ناوی – وویلایەتەکانی مەکسیکی یەکگرتوو – بوو . پایتەختی ، شاری مکسیکۆ سیتی – یە و ژمارەی دانیشتووانی ۱۸,٦۸٥,۰۰۰ ملیۆن کەسە ... هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە ۱۰۱,۸٥۰,۰۰۰ ملیۆن کەسە ...هەروا رووبەری وولاتەکە ۱,۹٥۸,۳۰۰ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە ... هەروا چری دانیشتووانی ۱۳٥ کەسە لە یەك میل چوارگۆشەدا ... هەروا نژادەکانی ، مستیزۆ ٦۰٪ کە تێکەڵاون لە دایك و باوکی ئەورووپی و هندی ئەمەریکی ، هندی ئەمەریکی ۳۰٪ . قەوقازیەکان ۱۰٪ لە وولاتەکەدا .

## ۱۸۱۱




۱۸۱۱/٥/۱٤ لە دوای خەبات و قوربانیدانێکی زۆر هەرێمی پاراگوای توانیان سەربەخۆیی وولاتەکەیان بە دەست بێنن لە دوای تۆڵە وەرگرتنەوە ئەویش بەجیا بوونەوەیان لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیادا .

ئەم راگەیاندنەش بە ناوی کۆماری پاراگوای ، بوو لە کێشووەرەکەدا . ناوی پایتەختەکەی – ئاسۆنسیۆن – و ژمارەی دانیشتووانی ۱,۱٤٥,۰۰۰ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە ٥,٦۸۹,۰۰۰ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکە ٤۰٦,۷٥۲ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە . چری دانیشتووانی ۳٦ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی مستیزۆ ۷٥٪ سپی پێستەکان و هندی و ئەمەریکیشی تیایە .




١٨١١/٧/٥ گـەلانی وولاتـی فـەنزوێلا لـــە دوای هـــەول و خـەباتێکی زۆر تووانیـان ســــــەربەخۆیی خۆیووڵاتەکـــــەیان ڕابگەیـــەنن . بـــە دەر چـــوونیان لـــە ژێـــر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ئیـسپانیادا . بـە نـاوی کۆمـــاری فنـــزویلا لـــە کێشووەرەکەدا .

ئەم وولاتە پایتەختەکەی – کاراکاس – ە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٨٩,٥٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە ٢٤,٧٦٥,٠٠٠ . هەروا رووبـەری وولاتەکـە ٩١٢,٠٥٠ کیلـۆ مـەتر چوارگۆشـەیە . هـەروا چـڕی دانیشتووانی ٧٠ کەس لە یەك میل چوارگۆشەدا . نژادەکانی مستیزۆ ٦٨٪ . ئـسپانی و پرتووگـالی و ئیتـالی ٢٠٪ . پێـست سـپیەکان ١٠٪ . هندیـە ئەمەریکیەکان٢٪ . لە وولاتەکەدا .




١٨١١/٧/٥ گەلانی وولاتی نیوزلەندە لـە دوای هـەل و مانـدوو بـــوونێکی زۆر تـــووانی ســـەربەخۆیی خۆیـــان ڕابگەیـــەنن . بـــە دەر چونیان لە ژێر دەسـەلاتی ئیمپراتۆریـەتی ئیـسپانیا . بـە نـاوی شانـشینی نیوزیلەندەلـــــــــە کێشووەرەکەدا .

ئـەم وولاتـە پایتەختەکـەی نـاوی –ولینگتـۆن – کـە ژمـارەی دانیـشتووانی

٤٢٥,٠٠٠ هەزار کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە ٣,٩٩٥,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکە ٢٧٠,٥٣٤ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هـەروا چـڕی دانیـشتووانی ٣٦ کـەس لـە یـەك میـل چـوار گۆشـەدا . هـەروا نژادەکانی ئەوروپی ٨٠٪ . ماوری ١٧٪ . لە وولاتەکەدا .




١٨١١/٨/٢٥ هـەرێمی ئۆروگـوای تـوانی سـەربەخۆیی ڕابگەیـەنێ بـە جیابوونـــەوەی لـــە ژێـــر دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی ئیسپانیا. بە ناوی کۆماری ئۆروگـــــوای لـــــــە کێشووەرەکەدا .
نـاوی پایتـەختی وولاتەکـە – مۆنتڤیـــدیۆ – ژمـــارەی دانیشتووانی ١,٧٩٥,٠٠٠ . هەروا ژمارەی دانیـشتووانی ٤,٣٨٠,٠٠٠ ملیـۆن کەسـە . هـەروا رووبـەری وولاتەکـە ١٧٦,٢٢٤ کیلۆمـەتر چوارگۆشـەیە . چـڕی دانیـشتووانی ٦٤ کـەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی،سپی پێست – لە بنەڕەتا ئیبری و ئیتالیـە – ٨٨٪ . مـستیزۆ – کەتێکـەڵاون لـە ئـەوروپی و دانیـشتووانی دوورگەی هیندی ڕۆژئاوا – ٨٪ . ڕەش پێت ٤٪ . لە وولاتەکەدا

١٨١١/١٠/٢لە دایك بوونی – فرانز لیست – لە شاری ریدینگی وولاتی هەنگاریا ، هەر لە منداڵیـەوە بـەهرەو ئـارەزووی میوزیکی لێ بـەدیار دەکـەوێت و لەتەمـەنی نـۆ سـاڵیدا بۆیەکـەم جـار لەبـەردەم جـەماوەر ئاهـەنگێکی میـوزیکی دەگێڕێـت ، دواتر بەردەوام دەبێت لە کارەکەی و کەسایەتی بەرچاو پەیدا دەکات .
لـەدوای کۆچـی دوایـی بـاوکی ناچـاردەبێت ڕوو لـەکارکردن بکـات لـە پێنـاو بژێووی ژیـان ، لەهـەمان کـات لـە کـاری هونـەریش بـەردەوام دەبێـت ، لەسـاڵی ١٨٣٢ جـارێکی دیکـە دەگەڕێتـەوە سەرشـانۆ بەمەبەسـتی پێـشکەش کردنـی کۆنـسێرتی میوزیـك لـە شـارەکانی وەك میـونخ و پـاریس و لەنـدەن دێـت و

دەچێ .
لە پاش دانان و ژەنین بەرهەمێکی زۆری مۆزیك لەشاری ڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیا دەچێتە نێوو ڕێچکەی کەهنووت و وانەی لاهوت دەخوێنێت تا لە دوا کۆنسێرتی ، کە تایبەت دەبێ بە شاژنە ڤیکتۆریا ، ئەم مۆزیك ژەنە ناودارە لە ڕۆژی ١٨٨٦/٧/٣١ کۆچی دوایی دەکات لە وولاتەکە و جیهان .

## ١٨١٢

١٨١٢/١/١٦ بەدرخان پاشا لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا فەرمانرەوایی ئیماراتی جەزیرەی گرتە دەست و هەر لە سەرتاوە هەوڵی ئەوەیدا کە تورکەکان لەو هەرێمەدا بنبڕ بکات و دەووڵەتێکی سەربەخۆ لەکوردستاندا دابمەزرێنێ لە هەموو کوردستان وتوورکەکان لە سەر خاکی کوردستان دووربخاتەوە . هەر بەم هۆکارە دەستی کرد بە یەککخستنەوەی میرە مەزنەکانی کوردستان بۆ ئەو مەبەستەش کاربەدەستە کوردەکانی لە ... شارەکانی وان و هەکاری و خێزان و مۆش لە هەرێمەکەدا .
هەروا هەندێك لەشێخە بەناوبانگەکان هاوکاریان لە گەڵدا کرد . میر بەدرخان کارخانەی چەك و تەقەمەنی ئەو سەردەمەی لە شاری جەزیر دامەزراند و خەریك بوو لەهەموو بوارێك خۆی بۆ ئەو پرۆژەیە ئامادە بکات ، لەو کاتەشدا مەسیحیەکانی بۆتان لێی هەڵگەرانەوەو باجی ساڵانەی ئەوکاتیان نەدا ... لە بەر ئەو هۆیەو چەندین هۆکاری دیکە میر بەدرخان هێزێکی چەکداری لە ١٠٠٠٠ هەزار کەس ڕەوانەی سەریان کرد ، بۆ ئەوەی بیانخاتەوە ژێر ئیماراتەکە .
لەو کاتە میربەدرخان ترسی زۆری لە تورکەکانی عوسمانی پەیداکرد . لە بەر ئەو هۆکارە کە عوسمانیەکان نووێنەریان رەوانەی لای بەدرخان کرد بۆ ئەوەی هەوڵی یەکخستنەوەی کورد نەداو یەکێتی نەتەوایەتیان وەبەر نەخاو بارودۆخی ناوچەو هەرێمەکە بەرەو گۆران هەنگاوی دەنا .
لەلایەکی دیکە وولاتانی ئەورووپا پشتگیریان لە ئەرمەنەکان دەکردو لەهەمان کات هۆشداری دا دەووڵەتی عوسمانی بۆ ئەوەی پشتگیری ئەرمەنەکان بکات دژی کورد لەباکووری کوردستان .

لە و کاتەشدا سولتانی عوسمانی ئەو هەلەی بە دەرفەتێکی باش زانی و خۆی ئامادەکرد ، لە پێناو لەناوبردنی میرنشینی جەزیرە ... ئەویش بە ئاگادارکردنەوەی حافز پاشای موشیری ئەنادۆل ، کە بەهەر شێوەیەك بێ میربەرخانی بێنێتە شاری ئەستانە ، بەلام حافیز پاشا لەهەولەکانی سەرنەکەووت ... دوای ئەوە دەسەلاتی عوسمانی هێزێکی زۆری ناردە سەر بەدرخان ، بەلام ئەو هێرشە هەرەسی هێنا بەهۆی بەرگری هێزەکانی میرنشینی جەزیرو لە ئەنجام بۆ دواوە گەرایەوە .

دوای ئەوە میر بەدرخان دراوی بەناوی خۆی لێدا ... ئەویش بەئاگادارکردنەوەی . شارەکانی وان و سابلاخ و رواندزو موسل ... دوای ئەوە قەلاکانی سنجارو وێرانشارو سێووەرکێشی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی لەگەل دەووروبەری قەلای دیاربەکر – ئامەد – . هەروا شارەکانی شنۆو وورمێشی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی .

لەو کاتەدا دەسەلاتدارانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هێزێکی زۆریان بەسەرکردایەتی ... عوسمان پاشا ... ناردە سەر هێزەکانی میر بەدرخان و هەردوو هێز لە نزیك شاری ورمێ گەیشتنە یەك و شەڕ لەنێوانیان بەرپابوو ... لەئەنجام میر عزەدینی شێر ، کە سەرکردەی هێزەکانی بەدرخان و خزمی خۆشی بوو بە هەموو چەك و تەقەمەنی و چەکدارەکان لە بۆتان خۆیان خستە ژێر ئالای دەسەلاتی عوسمانی و لە میر بەدرخان هەلگەرانەوە و یارمەتی تۆرانیەکانیان دا دژی هێزەکانی میر بەدرخان لە سەر خاکی کوردستاندا .

لەئەنجام جەزیر داگیرکراو دوای ئەوە میربەدرخان هێزێکی بەرگری ئامادەکرد ، بەلام هێزەکە توانای سەرکەووتنی نەمابوو ، بەهۆی خیانەتی عزەدین شێر ....؟.

ئالێرەدا خیانەتی کورد یەك لەوانە عزەدین شێر ، بووە هۆی ئەوەی کە دەسەلاتی میر بەدرخان لە بارببات لە پێناو بەرژەوەندی دووژمن کە هێزەکانی عوسمانی دووبارە توانیان جەزیر داگیربکەنەوەو میر بەدرخان بەرەو قەلای – ئاروخ – رۆیشت و لەوێ خۆی جێگیرکرد ... کە تورك و عزەدین شێر دەووریان گرت و ماوەی هەشت مانگ شەڕی لەگەل هێزەکانی عوسمانی و عزەدین کرد و شەڕەکە بەردەوام بوو ، لە ئاکامدا دوو کوڕی میر بەدرخان بەدیل گیران ... کە دەسەلاتی عوسمانی بەهۆی سەرکەووتنی بەسەر

میرنشینی بەدرخان و بەدرخان .
بەم بۆنەیەوە میدالیایەکی لە ١٩٤٦/١٢/٢٠ بەناوی – میدالیای جەنگ کوردستان – دارژت ئەمەیە کورد ... گەر عزەدین شێر خیانەتی لەخۆیی میربەدرخان نەکردایە ، هێزەکانی عوسمانی توانای سەرکەوتنیان نەبو بەسەر میربەدرخان .
ئەمەش بەرژەوەندی تایبەت و دەسەلات و پارەو پلەوپایە ، بۆیە کورد ب ئامانجەکانی خۆی نەگەیشتووە بەدرێژایی مێژوو ... بۆ نموونە خۆژی کورد کوژی لە نێوان هەردوو پارتی دەسەلاتدار لەهەرێمی باشوور کوردستان لە دوای راپەرینی /١٩٩١ لەکوردستان ....؟...!...! .
سەرچاوە – شەرەفخان – لاپەرە /٣١٥-٣١٦ .

١٨١٢/٨/٨ لە پێناو رووبەرووبوونەوەی مەزهەبی وەهابی لە دوورگەی بیابانی عەرەبی ولاتی سعوودیەی ئێستا ، محەمەد عەلی پاشا هێزێکی گەورە بەسەرکردایەتی نووسن پاشا رەوانەی ولاتی عەرەبی سعودی کرد.
لە ئەنجام محەمەد عەلی پاشا خۆی چووە شاری حیجازو شەریف عەلی غالب شەریفی دەست گیرکرد ، لە دوای ئەو کارە رەوانەی میسری کرد تاکوو کۆچی دوایی کردنیان لەمیسردا.

١٨١٢/٨/٢٧ لەدایك بوونی خێزانی شاعیری گەورەو بەناو بانگی ولاتی رووسیا - تاتالیا گەنچارۆڤە – لە شاری کارین تەمبۆڤسکی چاوی بە جیهان هەلهێناو .. شایانی باسە ئەم ئافرەتە بێ وێنەبووە لە جوانی و شۆخ و شەنگی، هە بەهۆی خواستنی ئەم ئافرەتە پۆشکین لە شەرە شێرێك زامدار دەبێ و دوای دوو رۆژ لە زامداریەکەی گیانی لە دەست دەدات، لەسەر وەسیەتی پۆ شکین ، دوای سێ سال لە مردنی پۆشکین مێرد دەکاتەوە.

١٨١٢/١٠/١٢ مۆرکردنی پەیمانی – گلستان– لە نێوان ئیمپراتۆریەتی فارس و رووسیا قەیسەری ، کە جێگری شا عەباس سەرۆکی هێزەکانی سووپای فارس بوو لەو کات وازی لە هەموو داواکاریەکانی خۆی هێناو بەوویلایەتەکانی - قەفقاس و جۆرجیا و داغستان و شێروان و قەرەباخ و تالش – دانی بـ

دەسەلاتی عوسمانی ، کە زۆربەی زۆری خاکی رۆژهەلات و باکووی کوردستان بوون...شایانی باسە کە شاری – شێروان – پارێزگای یەریڤانەو چەندین ناوچەی دیکەی کوردستان ، کە ناوی جیاجیایان هەیە لە کوردستان .

## ١٨١٣

١٨١٣/٥/١ لە دایك بوونی گەڕیدەی بە ناوبانگ و جووگرافیناسی بەریتانی – ریڤید لیفتگستۆن – کە ئەو مرۆڤە کانیاوەکانی زێی نیلی دۆزیەوە لە کێشووەری ئەفەریکیا .

١٨١٣/٥/٥ لە دایك بوونی – سۆرین کیرگەگۆر- لە شاری گۆبنهاگنی پایتەختی دانیمارك ، کە تەواوی ژیانی گەنجیەتی ئەو نووسەرە پڕبووە لە عیشق و رێژین و ئێش و ئازار بە هۆی هەژاری و نالەباری باری ژیان و باوکیشی هەردەم خەریکی شووانکارەیی و کاسبی بووە لە پێناو بژێوی ژیان لە وولاتەکەدا .

١٨١٣/٨/٢٢ کۆچی دوایی کەسایەتی ناوداری کورد – ئەوڕەحمان پاشای بابان- لە شاری سلێمانی لە هەرێمی باشووری کوردستان .

## ١٨١٤

١٨١٤/١/١٤ مۆرکردنی ڕێکەووتنامەی لەندەن ، لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا، لە لایەن وولاتانی ئەورووپا ، ئەویش بەڕاگەیاندنی خاوەنداریەتی ئەو زەویە نەویانەی کە هۆڵەندای دەگرتەوە کە بە دەوولەتێکی سەربەخۆ دانرا ، بە مۆرکردنی ئەو رێکەووتنە لەلایەن بەریتانیاو نەمساو فەرەنساو پرووسیاو بڕووسیا، لە هەمان کات ئەوەش ڕاگەیەندرا کەبەلژیکا وولاتێکی سەربەخۆیە.

١٨١٤/١/٢٢ لە دایك بوونی فەیلەسوف بەناوبانگی یۆنان و جیهان – ئیدوارد تسلر – لە پەیمانگا خووێندنی لاهووتی فێربووەو دوای ئەوە خووێندنی بالای لەزانکۆی توبنگن و زانکۆی بەرلین تەواوکردووە ، دوای ئەوە لە سالی ١٨٤٠ بۆتە مامۆستا لەزانکۆی توبنگن ، هەروا لەزانکۆی برن لەسویسرا لەسالی ١٨٤٧ . لەماربۆرگ لەسالی ١٨٤٦ و هیدلبرگ لەسالی ١٨٦٢ و بەرلین

لەساڵی ١٨٧٢ . دوای ئەوە لەزانکۆی ئشتوتگرت لە ساڵی ١٨٩٥دا .
ئـەم فەیلەسـوفە هیگلـی بـووە ... لەسـاڵی ١٨٤٢ گۆڤـارێکی بەناونیـشانی
حولیات لاهوتیـه – ی دەکـرد . بـەڵام ئـەو کتابـەی کـە ناوبـانگی پـێ دەرکر
کتابی – تأریخ الفلسفة الیونانیة – بوو ، کە چاپی یەکەمی لەساڵی ١٨٤٤ ت
١٨٥٢بلاۆکرایەوە ، هەروا چاپی دووەمیش لە – ٥– بەرگدا بلاۆکردەوە , ئە
فەیلەسوفە لـە کـارە هەمەلایەنـەکانی بـەردەوام بـوو تـاکوو لـە ١٩٠٨/٣/١٢ لـ
شاری ئشتوتگرت کۆچی دوایی دەکات لە ~~ۆڵاتەکەدا~~ .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – داناتی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /١

١٨١٤/٥/٣٠ مۆرکردنی پەیمانی پاریس ، لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا لە نێووان هەر
سـێ وولاتـی فەرەنـساو نەمـساو بـەریتانیا ، لـە دوای چـەندین کێـشەو
ململانـێو تەنگورچـەڵەمە . لەچـەندین لایـەن بـە تایبـەتی لەلایـەنی
پەیووەندیەکان.

١٨١٤/١٠/٥ لە سێدارەدانی عەبدوڵلاّ ئاغای ئـەمین سندقی ، لەلایـەن دەسـەڵاتی پاشـای
کۆرە لە شاری رواندز لە باشووری کوردستان . ئـەویش بە هـۆی پەیووەندی
سەردانی بوو بۆلای تەمەرخانی مامی پاشای کۆرە لە هەرێمەکەدا .
شـایانی باسـە پاشـای کـۆرە لـە دەسـەڵات زۆر توونـدرەو خۆپەرسـت بـووەو
مـاوەی بـە هـیچ کەسـایەتیو کەسـێك نـەداووەو پـاوانی هـەموو لایـەنێکی
کـردووەو نەیوویـستیە کـەس لـە خـۆیو بنەماڵەکـەی خـۆی بـەرزتربێت لـە
هەرێمەکەدا .....؟...!...

١٨١٤/١٠/٩ بەشـێووەیەکی راسـتەوخۆ رووداوەکـانی سێگۆشـەی پـەرمۆدا دەسـتی
پێکردووە ، کە کەشتی – واسب – بە ١٤٠ دەریاوانەوە نقوم بوون لە گێژاوی
ئاوی بەرمۆدادا .
جێگـەی ئامـاژە پێکردنـە کـە سێگۆشـەی پـەرمۆدا وەك چیرۆك و ئەفسانە
ئەگریکیەکانـە . تـەنیا جیاوازیەکـەیان ئەوەیـە کـە ئـەو سێگۆشـەیە راسـتە
هـەموو لایـەن دان بـەو راستیە دادەنێن ... کـە سەدان چیرۆك و رووداوی پـ
لەکارەساتی لەو بارەیەوە دەگێرنەوە ، کە سێگۆشـەکە خـۆی لـە ٣٠٠ دوورگ

پێـك هــاتووە . کــە ۱۰۰ دوورگــە لــەو دوورگانــە ، تــا ئێــستا مرۆڤــی نەگەیشتووەتیّ . چونکە دەریاوان و راوچیەکان لە بەر هەر هۆیەك و ترسێك بیّ نزیکەی ٥٠٠ ساڵ دەبیّ لیّی نزیك نەکەوتوونەتەوە ، کە بە دوورگەی – شەیتان – ناوزەندیان کردووە .

هەروا رووبەری سێگۆشەی پەرمۆدا –٧٧٠– هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە ولە رۆژئاوای ئۆقیانوسی ئەتلەسیەوە لە بەرامبەر کەنارەکانی باشووری رۆژهەلاّتی وولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەست پیّدەکات و کۆتایەکەی




باکووری دوورگەی – پەرمۆدا – یە کە کۆلۆنیالیەکی بەریتانیاو– پایتەختی – هاملتۆنــە – بــەلاّم کۆتاییەکــەی لــە باشــووری رۆژهــەلاّت دەکەوێتــە – بۆرتۆریکــۆ – و کۆتاییەکــەی دیکــەی لەباشــووری رۆژئــاوای دەکەوێتــە – مەیامی – لە وویلایەتی فلۆریدای ئەمەریکا.

دوای ئەوە بۆ کووبا و هایتی و بۆرتۆریکۆ و دووبارە بۆ بەرمۆدا . بۆ یەکەم جـار لــە ســاڵی ١٩٤٥ بــەناوی سێگۆشــەی بــەرمۆدا ناوزەنـدکرا ... ئـەم سێگۆشـەیە بە دەیـا جار رووداوی نقـوم بـوونی تیـدا هاتۆتـەدی لـە ئاکـامی تێپەربوونی کەشتیەکانی باڵ هەڵگرو سەربازی و ماسی گرەکان .

سەرچاوە :– گۆڤاری – الاسبوع – ژمارە /٣.

١٨١٤/١٢/١٤هێـزه چـهكدارهكانی پاشـای كـۆرهی ڕوانـدز ، بـه٢٠٠٠ دوو هـهزار چـهكدا
چووه سهر تهمهرخانی مامی لـه ناوچهی هاودیان لـه باشووری كوردستان
ئـهویش بـه ناچاركردنی تهمـهرخانو ئـهویش بـه خـۆ خزاندنـه نـاو قـهلأی
شێتنهوه له دهڤهرهكهدا .

## ١٨١٥

١٨١٥/١/١٠ هێزه چهكدارهكانی پاشای كۆرهی ڕواندز ، له ههرێمی باشووری كوردستا
. پهلاماری قهلأی شێتنهی داو داگیریكرد ... كه له ئهنجام تهمهرخانی مامی
محهمهد ئاغای كوری ، كه دهكاته ئامۆزای پاشای كۆره . بهدیلی گرتنو ل
دوای گرتنیان ، میری سۆران محمد ئاغای كرده سهرۆكی ناوچهی شێتنه.

١٨١٥/٢/١٢ له سێدارهدانی میری ناوچهی ڕوستێ یهحیا بهگ لهلایهن پاشای كۆره ، ب
هـۆی بهربـهرهكانی كردنـی پاشـای كـۆره ، ئـهویش بـه هـۆی ههڵوویـست
خۆپهرستو تاكرهوهكانی پاشای كۆره له دهسهلأتهكهیدا .

١٨١٥/٢/٢٠ تهمـهرخانو محهمـهدی كـوری لهلایـهن پاشای كـۆره لـه سێدارهدران كـهمام
ئامۆزای خـۆی بوون ، لهگـهڵ گـهلێك لـه ئهنجامدانی كرداری نـارێكی دیكه
لهپێناو بهرژهوهندی تایبهتی دهسهلأتو توانای خۆی لهسهر ناوچهكه دا.

١٨١٥/٤/٢٥ لهدایك بوونی – میرزا محهمهد حهسهن – شیرازی له شاری شیرازی فارس
لـه ئیرانـی ئێـستا ... خوێنـدنی سـهرهتایی هـهر لهوشـاره تـهواوكرد ، دوا
ئـهوه لـه تهمـهنی ١٨ سـاڵی چـووهته شـاری ئهسـفههان بـۆ تـهواوكرد
خووێندن ، دوای ئهوه له ساڵی ١٨٤٣ بهرهو شاری نهجهف ، له باشوور
ئێستای ئێراق ، كۆچی كرد بۆ خووێندنی ئیجتهادو تاوهركردنی پلهی ب
نشاندن.
دوای ئـهوه بـووه مهرجهعیـهتی ئـاینی ئیـسلامی مهزهـهی شیعه ، ئهوی
بـههۆی پهیووهنـدی لهگـهڵ شـێخ مورتـهزای ئهسـاری بـههێز بـوو. هـهر ا
سـهرهتای گهیـشتنی بۆ نهجهفـهوه یـهكێك بـوو لهقوتابیـهكان. كۆچـی دوای
شیرازی له١٨٩٥/٢/٢٠ بووه له شارهكهدا .

١٨١٥/٩/٧ لە ئەنجامی شەڕ لە نێوان هێزەکانی پاشای کوێرەو دانیشتووانی قەڵای کاکلاوە ، لە دەڤەری قەزای رواندز لە هەرێمی باشووری کوردستان ، لە ئاکام ئەحمەد بەدیر سەرۆکی چەکدارانی پاشای کوێرە کوژرا .
ئەویش لە دوای داگیرکردنی قەڵاکە ، کە هەشت ڕۆژی خایاند تاکوو قەڵاکەی داگیرکردو دوای داگیر کردنی سووتاند ئەم کردەوەش بووە هۆی دەربەدەربوونی دانیشتووانەکە لە قەڵاکەدا .

١٨١٥/٩/٢٦ پێك هێنانی یەکیەتی بە هێزەکانی سووپا لە نێوان وولاتانی ئەوڕوپا — ئۆنۆفراتی — رووسیاو بڕووسیاو نەمسا.
شایانی باسە کە ڕامیاریەتەکەیان بەربەرەکانی مەبدەئەکانی ئازادیو تاوانەکانی شۆرش بوو، دوای ئەوە وولاتانی ئەوروپای مەسیحی ، کە داوای چوونە ناو ئەو یەکیەتیەیان کرد ، کە ئەو یەکیەتیە ناوزەند کرا بە — هاوپەیمانی پیرۆز — لە جیهاندا .



١٨١٥/١٢/٣ میری سۆران محەمەد پاشا — پاشای کوێرەی — میری رواندز لە هەرێمی باشووری کوردستان — بریاریدا بەدامەزراندنی کارگەی دروستکردنی چەك ، لە پێناو بەرگری کردن لەدەسەڵاتەکەی بەدروستکردنی — شیرو خەنجەر و — تفەنگ و — دەمانجەو — تۆپ و — گوللە تۆپ و تەقەمەنیەکانی دیکە .
جا بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم بڕیارە پاشای کوێرە — وەستای بەناوبانگی کورد وەستا — رەجەب — لە شاری ئورمێی رۆژهەڵاتی کوردستان — وەستا رەجەب — ی هێنا بۆ رواندز . دوای ئەوە رەوانەی شاری — باکۆی —

پایتـــەختی ئازربایجــانی کــرد ... ئــەوەیش لــەپێناو فێربــوونی چــۆنیەتی
دروستکردنی چەك و تەقەمەنی ئەو سەردەمە .
دوای ئــەوە گەرایــەوە رواندزو بــە پــشتیووانی پاشــای کــۆرە تــوانی کارگــەی
دروستکردنی چەك و تەقەمەنی لەگەرەکی – کالۆکان – لە شارۆچکەی رواند
دابمــەزرێنێ . لەگــەڵ ئەوەشــدا تــوانی – سەرچــاوەی ئاســن و مــز و ئاســتی
زەویـــش لەناوچـــەی – خواکـــورك – بدۆزێتـــەوەو ئـــەو پێداویـــستیانەی
ئامادەکردو کردیە ئامرازەکانی دروستکردنی چەك و تەقەمەنی لەکارگەکەد
... و توانی لولەی تۆپ و تفەنگ و دەمانجە ئامادەبکات . لە دوای ئەو حەول
و تەقەلایــە تــوانی لــە ١٨١٧/١١/١١ ئــەم کارگەیــە بخاتــە کــارو هــەموو جــۆر
چــەکێکی گــەورەو بچووکی لــە تــۆپ و دەمانجــەو تفــەنگ دروســت بکات
بەرهەمی ئەم کارگەیەش ٢٢٢ تۆپی قەبارە /عـەیار/٢ دروست بکات ، لەگەل
/٣ کینتار دکنگارو ، لەگەڵ /٤ کینتار – کینگار . ئامادەکردن بۆ بەکارهێنان
جێگەی ئامارژە پێکردنە کە تاکوو ئێستا لەشاری رواندز ئەم تۆپە ماوە و وەا
هێمایــەکی چــەکی کــورد لەناوچــەکەدا . لەهــەمان کــات دوو لــەم تۆپانــە لەبە
دەرگای وەزارەتی بەرگری ئێراقن لە بەغداد دانراوە .
سەرچاوە:- – میری سۆران – لاپەرە /٥٠

## ١٨١٦




١٨١٦/٨/٩ وولاتـــی ئـــەرژەنتین ســـەربەخۆیی خـــۆی ڕاگەیانــد ، دوای ئــەو بریـــارە لـــە هـــەردوو جـــەنگی یەکـــەمو دووەمـــی جیهـــانی بێلایـــەنی خـــۆی ڕاگەیانـــــــد ، بەدوورکەووتنـــەوەی گەل و نیشتمانەکەی لەومەرگەساتانە ی جەنگەکان لە جیهاندا .
هــەروا راگەیانــدنی ئــەم کۆمــارە بــە نــاوی – کۆمــاری ئــەرژەنتین – بــوو لـ

کێشووەرەکەدا ، کە پایتەختەکەی – بیوونس ئایرس – ە و ژمارەی دانیشتووانی ١١,٩٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ٣٦,٩٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکەی ٢,٧٦٦,٨٩٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانی ٣٥ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی سپی پێست ٨٥٪ ، کە زۆربەیان ئەسپانی و ئیتالین – هەروا هندی رەنگاو رەنگ و مستیزۆی تیایە ، کە تێکەلاون لە گەلْ باوکی ئسپان و ئەویدیکە ی ئەمەریکی .

١٨١٦/١٠/٤ لە دایك بوونی هونەرمەندو گۆرانی بێژی چینی کرێکاران و جووتیاران و هەژاران فەرەنسا و جیهان – ئۆژین بۆتیە– لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، کە یەکەم دانراوەی خۆی کردە گۆرانی بە ناوی – بژی ئازادی– ئەم کەسایەتیە ناوودارە ، کە لەخێزانێکی هەژاری نااوداری فەرەنسا بووە تاکوو مالئاوایی کردن لە گەلْ و وولاتەکەیدا .

## ١٨١٧

١٨١٧/٥/١ یاسای دەسەلاتی دونیایی پاپا هەلووەشێنرایەوە لە سەر ئەو دەوولەتە ، لە لایەن ئیمپراتۆریەتی ڕۆما ، کە پاپا بووە یەکەم کردنەوەی سەربەخۆیی پاپا لە سەر کۆشکی فاتیکان ، تیران ، لە ڕۆمای پایتەختی ئیتالیا و ڤیلای کاستك ماندۆالفۆلە سەر جیهانی مەسیحیدا .

شایانی باسە کە ئەو یاسایە قەرەبووی پاپای بە٦٢٠,٠٠٠هەزار دۆلار کردەوە . بەلام دەسەلاتی ڤاتیکان ئەوقەرەبوو کردنەوەی ڕتکردەوە ... لە هەمان کاتدا دانیان بەو یاسایە نەنا ، تاکوو سالی ١٩٢٩دا . کە لەجێگەی دیکە نووسراوە لەم مێژوونامەیەدا .

١٨١٧/٩/٢ والی کوردستان – ئەمانۆلاخان – بەخۆیی و سێ هەزار سوواری کورد بەشداری لە مۆرکردنی پەیمانی گولستان کرد ، کە کاردانەوەی کاریگەری نوواند لە سەرباری ئەوکاتی کورد لە کوردستان .

## ١٨١٨



٥ / ٥ / ١٨١٨ لـــە دایـــك بـــوونی روونـــاکبیرو فەیلەســـوف بـــەناوبانگی جیهـــان و ئابووری ناس و رامیاری و رامیاریناسی ئـەلمانی – کـــارل مـــارکس – لەشاری، ترێر – لەسـەر زێـی مـوزل ، کـە لەسـەر ســـنووری ئـــەلمانیای رۆژئاوایـــە لەگـــەڵ شارۆچـــــــــکەی لکسمبۆرگ... باوکی پارێزەرێکی لە ئاین جوولەکە بووە . مارکس کۆلێژی یاسای لەشارەکانی بۆن و بەرلین تـەواوکردەوە . لـە هـەمان کـات گرنگـی بەخووێندنی فەلسەفەی هیگل داوە ، لـە گـەڵ دانراوەکـانی فویرباخ ... لـە ساڵی ١٨٤٢ بۆتە سەرنووسەری رۆژنامـەی – ئـەلراین – کە هێرشـی دەکردە سەر حکوومەتی ئەلمانیا .

کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی رۆژنامەکە لە دەرچوون بووەستێت لەلایەن حکوومەتی ئەلمانیا ، لە ساڵی ١٨٤٣ ژنی هێناو چووە پاریسی پایتەختی فەرەنسا . لـە یەکـەم نووسـینەکانی بەناونیـشانی – الحولیـات الالمانیـة الفرنسیة – لە ساڵی ١٨٤٣ . دوای ئەوە سەرپەرشتی رۆژنامـەی – الی الامام – ی دەکرد لەساڵی ١٨٤٤ لە شاری پاریس .

بـەڵام دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٨٤٥ لـە پـاریس دەرکـراو لەشـاری برۆکـسل نیـشتەجێ بـوو ... هـەر لەوکاتـە پەیوەنـدی کـرد بـە فریـدریك ئیـنگلش و دۆسـتایەتیەکەیان گەیـشتە هاورێیـەتی و هاوخـەبات لـە هـەموو بوارەکـانی بیروبۆچـوونەکان ، لـەو کاتـەوە دەسـتیان کـرد بـەکارە هاوبەشـەکانیان بەژیاندنەوەی کۆمەڵەی کۆمۆنست .

کـە لەسـاڵی ١٨٤٧ لەسـەری کۆبوونـەوە . یەکـەم رەشـنووس – بـەیان کۆمۆنیست – ی نووسیەوەو مارکس دووبارە پێیدا چووەوەو لە ساڵی ١٨٤٨ بڵاوکرایـەوە ، لـە نامیلکەیـەکی قـەبارە بـچووك ، بـەڵام لـەناوەڕۆك لەگـەوورەو مەزنیدا بێ بەهایە تاکوو ئێستاش ... هەر لە بەر ئەو بەیانە لەبرۆکسلیش دەرکرا و گەڕاوە ئەلمانیا . بە هۆی باری نالەباری رامیاری ئەلمانیا لەساڵی ١٨٤٩ چووە لەندەنی پایتـەختی بـەریتانیا و لەگـەرەکێکی هـەژار نیشتەجێ بوو ... بەهۆی هەژاری هەر بەهـەژاری ژیـانی بردۆتەسەر و گەر یارمەتیـەکانی ئینگلش نەبوایە خۆی و خێزانەکەی لەبرسان دەمردن .

بەهۆی هەژاری توانای سەردانی پزیشکیان نـەبوو ، بەتایبـەتی لەوکاتـەی کە کـچەکەی – فرێـسکا – مـرد ، نـەیتوانی خـەرجی لـەگۆرنانی پەیـدا بکـات . سەرەرای ئـەوەش زۆربـەی کاتەکانی لەمۆزەخانـەی بـەریتانیا دەبـردە سـەر بۆ کـارو سـوودی زۆری لـە کتابـە مێـژوویی و ئـابووری و رامیـاری وەردەگـرت . مـارکس یـەکێ بـووە لەدامەزرێنـەری – الدولیـە – کـە ئـەویش کۆکردنـەوەی کرێکاران بوو لەهەموو جیهان .

لەسـاڵی ١٨٣٧ لـە بـاکۆنین جیـابووەوە ، ئـەویش بـە هـۆی هەڵوویـستە بەرەڵایـەکانی باکۆنین ، ئـەم مرۆڤـە لـەکارە فەلـسەفەیی و ئـابووری و رامیـاری بـەردەوام دەبێـت لەگـەڵ هـاورێ دڵـسۆزەکەی ئینـگلش تـاکوو لـە ١٨٨٣/٣/١٤ کۆچـی دوایـی دەکـات لەشـاری لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا و لەگۆرسـتانی هایگیت دەنێژرێت.

دانراوەکـانی مـارکس ئـەویش ... بۆس الفلسفە – فلـسفە البـۆس – مـن نقـد الاقتصاد السیاسی – رأس المـال ، لـە دووبەشـدا ، کـە ئینـگلش دوای مردنـی مـارکس بەچـاپیگەیاندو بەسـەردا بابـەتی بڵاوکـراوەی جگـە لـەدانراوە هاوبەشـەکانی نێـوان ئینـگلش و مـارکس ، کـە ئـەویش چـەندین دانـراون و وەرگەراونەتە سەر زمانەکانی جیهان .

جێگەی ئامارە پێکردنە کە ناتوانرێ مارکس و ئینگلش لێك جیابکرێتەوە لـە هـەموو بـوارە جیاجیاکـان . لـە بیروبۆچوون و هەڵوویـست و چ لـەبوارەکانی نووسـین و لـە دانـراوە هەمـە جۆرەکانیـان لـە هـەموو بـوارە جیاجیاکـان ، کـە ئینگلیش لە ١٨٢٠/١١/٢٨ لەدایك بووەو لە ١٨٩٥/٨/٥ کۆچی دوایی کردووە لە بەریتانیا .

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی /٢ .

١٨١٨/٩/٩ لـە دوای هـەوڵێکی زۆر ، کۆتـایی بـەخۆ بـە دەسـتەوەدانی ئـەمیر عەبـدوڵا سعوودی حیجاز هات ... ئیبراهیم درعیە چووە ناو کارەکان... هەر لەو کات ئەمیر عەبدوڵا سعوودی بە دەست بەسەریەتی توونت ڕەوانەی میسر کرد ، دوای ئەوە لە قاهیرەی پایتەختی میسر خرا بەندیخانە ، دوای ئەوە ئەمیر عەبدوڵا ڕەوانـەی شـاری ئەستەمبوڵ کراو لەوێش خرایە بەندیخانـە . دوای ماوەیەك فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرکرا.

١٨١٨/٩/١٨ خەبات گێڕەکانی وولاتـی شیلی توانیان سەربەخۆیی خۆیـان ڕابگەیەنن بە دەرچوونیان لە ژێر دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیا، بەسـەرکردایەتی - هیـژینز- لە وولاتەکەدا .

هەروا ڕاگەیاندنی سەر بەخۆیی شیلی بە نـاوی -کۆمـاری شـیلی - بووە و پایتەختەکـەی -سـانتیاگۆ - یـە . ئێـستاکە کـە ژمـارەی دانیـشتووانی ٤,٨٠٠,٠٠٠ ملیـۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیـــــــشتووانی وولاتەکـــــــــە ١٥,٥٥٠,٠٠٠ ملیـۆن کەســـــە . هـــەروا ڕووبـــەری وولاتەکـــە ٧٥٦,٦٢٢ کیلۆمـــەتر چوارگۆشـەیە . هـەروا چـڕی دانیـشتووانی ٥٣ کـەس لـە یـەك میـل چوارگۆشـەدا . هـەروا نـژادەکانی ، سـپی پێـست ،تێکەڵاوی سپییەکان وهندیەکان وئەمەریکیەکان ٩٥٪ . نژادەکانی دیکە ٣٪ لە وولاتەکەدا .




١٨١٨/١٠/١٧ فەرماندەی گشتی هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری لە قەفقاز ژەنـەراڵ - یـەرمولۆڤ - هەوڵیـدا زانیـاری لـە سـەر ئـەم ڕاپەرینـەی کـورد بزانـێ و

ئاگاداربێت ، بۆیە بڕیاریدا کە گرنگی بەفەرمانبەرێکی کورد بدات بە ناوی عەلی خان و دوای ئەوە دەینێرێتە تارانی پایتەختی وولاتی فارس ، تا بە ووردی لەسەر ئەم ڕاپەڕینە زانیاری بۆ کۆبکاتەوە .

بەپێی ئەو زانیارانەی کە عەلی خان لەمبارەیەوە کۆی دەکاتەوە دەردەکەوێت ، کە هێزەکانی شازادە عەباس میرزا رادەسپێرێ و دژی کوردەکانی بلباس لە رۆژهەلاتی کوردستان بۆ شەڕ دەنێرن و زۆر بەتووندی شەڕدەکەن لە ناوچەکەدا .

١٨١٨/١١/١٩ ڕاگەیاندنی بانگەوازی – ئێکس لاشایل – کە ئەرکی سەرۆکی وولاتانی جیهانە ... لە پاراستنی پەیووەندیەکانیان بە ڕفتارو کارو کردەوەو بەردەوام بوونی پاراستنی هاوکێشەکان بە شێووەیەکی ڕێك و پێك لە جیهاندا .



١٨١٨/١١/٣ دوای فراوانکردنی دەسەلاتی سۆران لە لایەن پاشای کۆرە و بە ئەنجام گەیاندنی خواست و ئاواتەکانی خۆیی و ئیمارەتەکەی بە وێنەی حکوومەتێکی نوێی تەواوکردو دەستووری بۆ دەسەلاتەکەی داناو بانگی سەربەخۆیی دەسەلاتی سۆرانی کرد ، ئەویش بە دەرچوونی تەواوی لە ژێر پالەپەستۆی دەوولەتی عوسمانی و ناوی خۆی نا – میر مەنسوور – میری سۆران لە هەرێمی باشووری کوردستان .

سەرچاوە :– میری سۆران – لاپەرە /٥٥ .

## ١٨١٩



١٨١٩/٩/١٣ گـەورە هونەرمەنـدی ئـافرەت خـاتوو – کـلارا شـۆمان – لـە بنەماڵەیەکی هونەری چاوی بە جیهان هـەڵهێناوە ... فریـدیش فیکـی بـاوکی زانایـەکی ئاییـنی بووە ... میوزیکژەن و ژەنیاری پیانۆ بـووە ... بـەڵام دایکـی – ماریان ترومیلتز – گۆرانی بێژ بووە . دوای ئەوەی کە دایك و باوکی لە یەکتری جیا دەبنەوە . بـــاوکی پـــەروەردەکردنی شۆمان دەگرێتە ئەستۆ . جیگەی ئاماژە پێکردنە کە کلارا شۆمان دوای چوار ساڵ لەتەمەنی فێری قسەکردن بووەو لەتەمەنی پێنج ساڵان دەستی کردووە بەگەشتێکی دوورو درێژ لەگەڵ پیانۆدا .

کە بۆتە هۆی هۆکارێکی راستەقینە بۆ دەربرینی هەست و ناخی خۆی . لە ئاکامدا ئەم خاتوونە سەرکەوتن بەدەست دێنێ لەم بوارەدا ... لەتەمەنی ١٠ ساڵیدا یەکەم ئاهەنگی پێشکەش کردووە لەگەڵ کچێکی دیکەی هاورێی قوتابی ، کە ئەم ئاهەنگەیان بەیەکەوە بەژەنینی پیانوو پێشکەش کرد . ئەم هۆکارەش وای لەو کچە تەمەن بچووکە کرد ، کە چەند شار بگەرێ لە دەرەوەو ناوەوەی وڵاتەکەیدا .

دوای ئەوە شۆمان لەتەمەنی ١٨ ساڵیدا لەلایەن فەرمانرەوایی نەمسا نازناوی – میوزیکژەنی بلیمەتی دیوەخان – ی پێ بەخشراوە ... لە ماوەی ١٠ ساڵی یەکەم کاری دانانی هونەری بەناوی – چوار پۆلەندیکە – بووە . دوای ئەوە چەندین کاری دیکەی ئەنجام داوە لەوانەکاری – خانمە مایە بووچەرۆمانسیەکان – و لە ئاهەنگی شەوانی میۆزیك .

کلارا شۆمان هەر لەمنداڵیەوە ئاشنایی لەگەڵ رۆبەرت شۆمان دروست دەکات

کە ئەوکاتەی لەسەر دەستی باوکی پیانۆی خوویندووەو رۆبەرت تەمەنی ٢٠ ساڵ بووەو کلاراش تەمەنی ١١ ساڵ بووە ... کە رۆبەرت شۆمان پەیوەندی لەگەڵیدا بەستووە . لەو کاتەش کلارا تەمەنی دەگاتە ١٦ ساڵ و چیرۆکی خۆشەویستی درێژخایەن لە نێوانیان دەست پێدەکات و باوکی بەم پیوەندیە رازی نەبووەو بە هەموو توانایەکی هەوڵی لێك دوورکەوتنەوەیان دەدات . بەلام خۆشەویستی ئەم دوو دڵدارە وایکرد کە بگەنە ئەو ئاکامەی لە ١٨٤٠/٩/١٢ گرێبەستی هاوسەریەتی مۆربکەن و دوایی لەگەل باوکی ئاشت دەبنەوە .

ئەم دوو خۆشەویست و هاوسەرە شان بەشانی یەکتری کارە هونەریەکانیان بەسەرکەوتووانە ئەنجام دەدەن ...تا ئەوکاتەی لە ١٨٩٦/٣/٢٦ تووشی نەخۆشی ئیفلیجی دەبێت و دوای چەند مانگێك ماڵئاوایی لەهونەرو دۆستان دەکات و لە دوای خۆی تەرمەکەی لەتەك رۆبەرت شۆمانی هاوسەری لەشاری بۆن بەخاك دەسپێردرێت لە وولاتەکەدا .

سەرچاوە:- www.&w.world.de\dw

١٨١٩/١١/١ کردنەوەی دەرگای مۆزەخانەی – براذۆ – لە شاری مەدریدی پایتەختی ئیسپانیا ، لە سەردەمی فەرمانرەوایەتی فەرماندەی حەوتەم ، وەك مۆزەخانەکەی ماریا ئیزابیلی خێزانی... کە رۆلی لەم کارەدا هەبووە .
کە لەمۆزەخانە هەرە دێرینەکانی جیهانە، کە٣٠٠٠ سێ هەزار تابلۆو٤٠٠ چوارسەد پەیکەرو دررو و گەوهەر لە خۆدەگرێ ، لە رۆژانی جەنگی ناوخۆی ئیسپانیا بابلۆ بیکاسۆی هونەرمەند گەوورە ئەمینداری ئەو مۆزەخانەیە بووە لە ولاتەکەدا .

## ١٨٢٠

١٨٢٠/١/٨ مۆرکردنی رێکەووتنامە لە نێوان بەریتانیاو هۆزە عەرەبەکانی سەرکەنداو لە رۆژهەلاتی ، لە پێناو قەدەخەکردنی بازرگانی کردن بە کۆیلە – عبید – لە نێوان عەرەبەکان خۆیان و بە تایبەتی گەلانی هەرێمە جیاجیاکانی ئەفریکیادا .

١٨٢٠/٤/ دەستپێکردنی گەشتەکەی گەریدە – کلۆدیۆس جیمس ریچ – ی بەریتانی بەرەو رۆژهەلات باکووری کوردستان ، کە سەردانی شارەکانی سنەو

سلێمانی و هەولێرو چەندین شارۆچکەو ناحیەو گووندی کوردستانی کرد ، ئەویش لە پێناو کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی باری هەمە لایەنەی کورد لە کوردستان .

١٨٢٠/٤/٢٧ لە دایك بوونی فەیلەسوف و زانای ئینگلیزی ودانەری تیئۆری پەرەسەندن لەزانستەکانی مرۆڤایەتی و زانستەکانی ئەحیا – ئەسپنسەر ، هربرت – لە شاری دربی لەبنەماڵەیەکی جێگیر . لەماوەی چەند سەدەیەك لەناوچەی دربی ژیان بەسەر دەبەن .

شایانی باسە هەر چوار بنەماڵەی باپیرەکانی کەلایەنگیری لاهووتی ئەنجیلی جۆن وسلی بوون لەنێوان ساڵەکانی ١٧٠٣ – ١٧٩١ سەرکردەی جوولانەوەی ئاینی چاکسازی دیاربوون بەناوی – ئەلمیسۆدیە –. لەساڵی ١٨٣٧ بروانامەی ئەندازیاری شارستانی بەدەست هێنا .

کارەکانی لەدامەزراندنی هێڵی ئاسنی شەمەندەفەر بوو رۆژلەدوای رۆژ پلەی بەرز دەبووەوە بەهۆی زیرەکی و لێهاتویی تاکوو ساڵی ١٨٤١ کەلەکارەکەی دەستی هەڵگرت ... لەساڵی ١٨٤٣ یەکەم بەرهەمی بەناوی – المجال الصحیح للحکومە – ی بڵاوکردەوە ... لەنێوان ساڵەکانی ١٨٤٦-١٨٤٧ داهێنەری ئامێرەکان بوو... لە ساڵی ١٨٤٨ بە جێگری سەرنووسەری رۆژنامەی – الایکونۆمست – دەمەزرا ... ئەم مرۆڤە بەردەوام بوو لەکارەکانی و لە چەندین بواری دیکە تاکوو لە ١٩٠٣/١٢/٨ لە سان برایتۆن و لە تەمەنی ٨٣ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات لە وڵاتەکەیدا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٣ .

١٨٢٠/٤/٢٩ سەرۆکی میوانخانەی میری بابان – محەمەد ئاغا – لە جیاتی محەمەد پاشا ، بە ناوی میر پێشوازی لە ئەمیری دانیشتووی بەریتانیا – کلۆدیۆس جیمس ریچ – کرد ، لە شاری خوورماتوو لەباشووری کوردستان . کە بەرەو بارەگای سەرەکی میری بابان لە سلێمانی بەڕێکەوت لە هەرێمەکەدا .

١٨٢٠/٥/١٠ گەریدەی بەریتانی مستەر – کلۆدیۆس جیمس ریچی – لەگەڵ مەحمود پاشای بابان کۆبۆوە لە شاری سلێمانی لە هەرێمی باشووری کوردستان . کە گفتووگۆکەیان لەسەر باری نا هەمواری شارو ناوچەو هەرێمەکەدا بوو ، لە چەندین لایەنی ژیانو پەیوەندیو باری کورد لە گەڵ دەسەڵاتدارانی داگیرکەری ئەوکاتی هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارس لە ناوچەکەدا

١٨٢٠/١١/٤ سەرۆك هۆزو تیرەکانی سوودان بە باشیان زانی ، کە کات لە بارە بۆ هێرشکردنە سەر هێزەکانی سووپای میسر ، بەڵام ئیسماعیل پاشا توانی دەست پێشخەری بکات ، لە دوو ویلایەتی ڕاستو چەپ بۆ هێرشکردنە سەر هێزەکانی سووپای سودان ، کە لە ئەنجام تووانی سەرکەوێت بەسەر سووپای پیادەی مەغاریبەکان لە هەرێم و ناوچەکاندا .

 ١٨٢١

١٨٢١/١/١٥ هێزەکانی سووپای بەریتانیا پەلاماری وولاتی یەمەنی عەرەبیداوداگیری کرد ، دوای داگیرکردنی هەڵسا بەدابەشکردنی و ناچارکردنی ئیمامی یەمەن بە مۆرکردنی پەیمانی نێوان یەمەن و بەریتانیا ، بە پێدانی دانیشتووانە بەریتانیەکان لە یەمەن بەچەندین دەستکەووت لە سەر بەنداوی باشووری عەرەبی لە هەرێمی یەمەن بە تایبەتی لە شاری سەنعای پایتەختی ئێستای یەمەندا .

١٨٢١/٤/٨ هێزەکانی سووپای میسر بەسەرکردایەتی والی میسر محەمەد عەلی پاشاو بەرپا بوونی شەڕ لەسوودان و لە شاری بارە بە سەرکردایەتی محەمەد بەگ دەفتەردار ، هەروا هێزەکانی سووپای سوودان بە سەرکردایەتی محەمەد فەزل .

کە لە ئەنجام هێزەکانی سووپای میسر سەرکەووتنیان بە دەست هێنا لە شاری بارە ، کە ئەو شەڕە ناوزەد بوو بە شەڕی بارە لە سوودان ، دەسەڵاتدارانی هۆزو تیرە عەرەبەکانی دوورگەی بیابانی عەرەبی و دەسەڵاتدارانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. لە سوودان کە دەکەوێتە کێشووەری ئەفەریکیا .

١٨٢١/٥/٥ ئیمپراتۆری فەرەنسا – ناپیلۆن پۆناپارت – لە یەکێك لە دوورگەکانی ئەفریکیای ژێر دەستی بەریتانیا لە پەنابەری کۆچی دوایی کرد ، دوای ماوەیەکی زۆرو لە ساڵی ١٨٤٠ تەرمەکەی گەڕاندرایەوە بۆ پاریسی پایتەختی فەرەنسا.


CLAUDIUS JAMES RICH

١٨٢١/٥/١١ نووێنـەری بـەریتانیا لـە شـاری بەغــدا – مـــستەر ریـــج – بـــە یەختەكی تایبەت لە شاری بەغدا گەیـشتە شـاری بەسـرا ، كەئـەم گەشـتـەش مـاوەی هەشـت رۆژی خایاند ، دوای ئەوە بەكەشـتیەكی بەریتانیا بەرەو شاری بووشەهری وولاتـــی فـــارس بەرێكـــەووت و دواییی بەرەو شاری شیرازو لەوێ سـەردانی شـووێنەواری – تـخت جمشید – ی كرد ، زۆر بەو شووێنەوارو ناوچەیە دلگیربوو ، لە هەمان كات تووشی نەخۆشی بوو . كە لەناوچەكە ئەو نەخۆشیە بلاّ بووەوەو هەر بەو هۆیە گیانی لە دەستدا .

دوای ئەو حكوومـەتی بەریتانیا كابتن – تیلـر – ی لەجێگـەی ریج دانا بە بەرپرسـیاری قوونـسلیەی بـەریتانیل لـە شـاری بەغـدا ، كـە پێـشتر تیلـر جێگری قوونسلیە بوو لە شاری بەسراو پەیووەندیەكی لە هاوكاری لەگەڵ داود پاشا گرتە بەر دوور لە هەڵوویستی مستەر ریج لە وویلایەتی بەغدا .




١٨٢١/٧/٢٨ لــە دوای هــەوڵێكی زۆر گــەلانی وولاتـــی پـــیرۆ توانیان سەربەخۆیی بە دەســـت هێنــا لـــە دوای رزگـــار بـــوونی لـــە ژێـــر دەسـەلاتی ئیـسپانیا بـە یارمـــەتی هێزەكـــانی سووپای ئەمەریكا .

هــەروا راگەیانـدنی پـیرۆ بەناوی – كۆماری پیرۆ –

بوو لە کێشوورەکەدا . کە ناوی پایتەختەکەی – لیما – یە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٩٦,٠٠٠ هەزار کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە ٢٥,٧٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکەی ١,٢٨٥,٢٢٠ کیلۆ مەتر چوارگۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانی ٥١٦ کەس لە یەك میل چوارگۆشەدا . هەروا نژادەکانی , هندی ئەمەریکی باشوور ٤٥٪ . مستیزۆ ٣٧٪ . ئەورووپی ١٥٪ . نژادەکانی دیکە ٣٪ . لە وولاتەکەدا .

١٨٢١/٩/١٥ لە دوای هەوڵ و خەباتێکی بێ ووچانی گەلان لەم ڕۆژەدا ، ئەم وولاتو هەرێمانە سەربەخۆییان بەدەست هێنا لەژێر دەسەلاتی ئیمپرا تۆریەتی ئەسپانیا ، هەر یەك بە پێی بارو دۆخی ناو وولاتەکەیدا . ئەویش بەم شێووەی خارەوە :-

١ – نیکاراگوا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند بە دەرچوونی لە ژێر دەسەلاتی ئیسپانیا بۆماوەیەکی کوورت ، دوایی لەگەڵ مەکسیك یەکیان گرتو دوایی لە گەڵ ئەمەریکای ناوەندی ، تا سەربەخۆیی تەواوی لە ساڵی ١٨٣٨ ، بە دەست هێنا وەك وولاتێکی سەربەخۆ ، بە ناوی – کۆماری نیکاراگوا – کە پایتەختەکەی ناوی – ماناگوا – یە و ژمارەی دانیشتووانی ١,٢٨٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە .




هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە ٤,٩٤٧,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکە ١٣٠,٠٠٠ هەزار کیلۆ مەتر ژوار گۆشەیە . هەروا ژڕی دانیشتووانی ٩٧ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی , مستیزۆ ٧٠٪ . سپی پێستەکان ١٥٪ . رەش پێستەکان ٩٪ . هندی ٥٪ . لە وولاتەکەدا .




٢- ڕاگەیاندنی سەر بە خۆیی وولاتـی سلڤادۆر بـە نـاوی - کۆمـــاری ســـلڤادۆر - کـــە پایەختەکەی - سـان سلڤادۆر - ە و ژمـــارەی دانیـــشتووانی ١,٨١٥,٠٠٠ ملیـــۆن کەســـە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی

وولاتەکەی ٦,١٦٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ڕووبەری وولاتەکەی ٢١,٠٤٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانی ٧٥٨ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، مستیزۆ ٩٤٪ . هندی ٥٪ . سپی پێست ١٪ . لە وولاتەکەدا .




٣- ڕاگەیاندنی سەر بە خۆیی وولاتـی کۆستاریکا ، بـە ناوی کۆمـاری - کۆسـتاریکا - کـە پایەختەکـەی نـاوی - سـان جۆز- یە و ژمارەی دانیشتوانی ٩٨٧,٠٠٠ ، هـــەزار کەســـە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی

وولاتەکە ، ٤,٥٦٨,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ڕووبەری وولاتەکە ، ٥١,١٠٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانی ٢٣٢ کەس لە یەك میل چـــوار گۆشـــەدا . هـــەروا نـژادەکانی ، پێست سپیەکان ٩٥٪ . پێـست ڕەشـەکان ٣٪ . لە وولاتەکەدا .






٤- وولاتـــــی هنـــــــدۆراس سـەربەخۆیی خـۆی ڕاگەیانـد بـە جیابوونـــەوەی لـــە دەســـەڵاتی ئیمپراتۆریـــەتی ئیـسپانیا . بـــە ناوی کۆماری – هندۆراس – کە پایتەختەکـەی نـاوی – تێگـوس گلب- ە و ژمارەی دانیـشتووانی ، ١,٠٣٥,٠٠٠ هـــەزار کەســـە . هـــەروا ژمـــارەی دانیـــشتووانی وولأنەکـــە ، ٦,٧٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکە ، ١١٢,٤٩٢ کیلۆ مـەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانی وولاتەکە ، ١٤٩ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، مستیزۆ ٩٠٪ . هندی ئەمەریکی ٧٪ . لە وولاتەکەدا .

٥- وولاتـــی گواتیمـــالا ســـەربەخۆیی خـــۆی ڕاگەیانـــد بـــە نـــاوی- کۆمـــاری گواتیمالا – کە پایتەختەکەی ناوی – گواتیمالا – یەو ژمارەی دانیشتووانی ، ٢,٣٢٥,٠٠٠ ملیـــۆن کەســـە . هـــەروا ژمـــارەی دانیـــشتووانی وولاتەکـــە ، ١٢,٥٦٨,٠٠٠ملیـــۆن کەســـە . هـــەروا رووبـــەری وولاتەکـــە ، ١٠٨,٨٩٠ کیلـــۆ مـەتر چـوار گۆشـەیە . هـەروا چڕی دانیشتووانی ، ٢٩٩ کـەس لـە یـەك میـل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، مستیزۆ ٥٦٪ . هندی ئەمەریکی ٤٤٪ . لە وولاتەکەدا .

١٨٢١/٩/١ شانشینی ئیتالیا چەندین پرۆژەی خستە ژێر چاودێری پاپای فاتیکان پێش داگیرکردنی ڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیا ، یەك لەوانە پرۆژەی کافوور کە پاپا و حکوومەتی فەرەنسا ، ئەویش ماوەدان بە دەسەڵاتی تەواوی پاپا لە بواری ئایینی و برینەوەی موچە لە هەموو وولاتانی کاسۆلیك لە جیهان.
بـەلأم ئـەویش بەمـەرجێك دەسـتکاری کـاتی بکێـشیتەوە . بـەلأم پاپـا ئـەو پێـشنیارەی ڕەتکـردەوە لەگـەڵ چـەندین پـرۆژەی دیکـە بـە هـۆی کێـشەی مەزهـەبی لـە نێـوان هـەردوو مەزهـەبی پرۆسـتانت و کاسـۆلیکی مەسـیحی لەجیهان .

١٨٢١/١٠ کۆچی دوایی گەریدەی ناو داری بەریتانی-کلۆدیۆس جیمس ڕیچ- بە هۆی

نەخۆشی ڕشانەوە لە شاری شیران و هەر لەو شارە لە گۆڕستانی – جیهان نوما – بە خاک سپێردرا .

١٨٢١/١٠/٣٠ لە دایک بوونی – فیودور ڕۆستۆ یفسک – ی گەوورە ئەدیب و ڕووناکبیری ڕووسی لە نەخۆشخانەی مارێنسکی ، کە تایبەت بوو بە کرێکارە هەژارەکان لە شاری مۆسکۆی پایتەختی ئێستای ڕووسیا .

 ١٨٢٢




١٨٢٢/٥/٢٦ وولاتـــی ئیکـــوادۆر سەربەخۆیی خۆی بە تەواوی بە دەست هێنا لە دوای دەرچـــوونی لـــە چـــوونە نـــاو یەکیـــەتی کۆنفیـــدراڵی ، کـــە ڤنـــزوێلاو کۆلۆمبیـــای دەگرتـــەخۆ ، کـــە ناونرابوو بە کۆلۆمبیای مەزن. بەڵام ئەو یەکیەتیە کۆنفیدڕالیە لە ماوەیەکی کەم بە هۆی کێشە هەم لایەنەکان ڕوخێندرا .

ئـەم وولاتـە نـاوی پایتەختەکـەی – کیتـۆ – یـەو ژمـارەی دانیـشتووانی ١,٥٣٤,٠٠٠ ملیـۆن کەسـە . هـەروا ژمـارەی دانیـشتووانی وولاتەکـە ١١,٥٧٥,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ڕووبەری وولاتەکەی ، ٢٨٣,٥٦٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ١٠٥ کەسە لە یەک میل چوار گۆشـەدا . هـەروا نـژادەکانی ، مستیزۆ ٥٥٪ . کـە دەگەڕێتـەوە سەرەسـەنی ئەسـپانی و ئەمـەریکی و هنـدی . هنـدی ٢٥٪ . ئەسـپان ١٠٪ ئەفەریکی ١٠٪ . لە وولاتەکەدا .

١٨٢٢/٦/١٧ بـەهۆی نـا لـەباری بـاری هێزەکـانی سـووپای ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی بە سـەرکردایەتی خورشـید پاشـا ، دەریاوانـە یۆنانیـەکان توانیـان هێزەکـان دەریـاوانی عوسمـانی بـە نـاوی – دوغاغـە – تێـک بـشکێنن لـە بەنـدەر

سامۆس و سەقز لە رۆژهەلات و باکووری کوردستانی داگیر کراو لە لایەن هەردوو دەسەلاتی فارس و عوسمانیدا ، کە بووە هۆی کووژرانی زیاتر لە ۳۰۰۰ سێ هەزار سەربازی عوسمانی و دەست بەسەراگرتنی پێداویستییەکانی جەنگی ئیمپریاتۆریەتی عوسمانی لە هەرێمەکەدا .

١٨٢٢/٩/٧ وولاتی بەڕازیل سەربەخۆیی خۆی ڕگەیاند ، ئەویش لە دوای لێکترازانی باروودۆخی ناوچەکەو گەڕانەوەی شانشینی پرتوگالٚ بۆ وولاتەکەی خۆی و بەڕازیل بەجێ بهێلێ ، کە ئەمەش بووە هۆی ئەم ڕاگەیاندنە لە وولاتەکەدا .




ئەم وولاتە ناوی پایتەختەکەی — بەرازیلیا — یە و ژمارەی دانیشتووانەکەی ، ۱,۷۷۸,۰۰۰ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ، ۱۷۲,۸۵۰,۰۰۰ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکەی ، ۸,۵۱۱,۹۵۷ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دامیشتووانی ، ۵۳ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، سپی پێست — پرتووگالی و ئەلمانی و ئیتالی و ئەسپانی و پۆلەندیە — کە ۵۵٪ پێك دێنن ، ئەفەریکیەکان و ئەوروپیەکان تێکەلاون ۳۸٪ ، ئەفەریکیەکان ٦٪ . لە وولاتەکەدا .

##  ۱۸۲۳

١٨٢٣/١٢/ ڕێبازی ڕامیاری — جیمزمۆنرۆ — بە ڕێبازی سەرەك كۆماری ئەمەریکا دەگووترێ ، کە بۆ یەکەم جار لە پەیامێکیدا بۆ کۆنگرەی ئەمەریکا راگەیەنرا ... ڕامیاریەتی مۆنرۆ لە چوار بەش پێك دەهات کە ئامانجی دوو بەشی یەکەم ، پەیوەندی بە کەم کردنەوەی چالاکیەکانی هێزە ئەوروپیەکان و ، دوو بەشی دووەمیش پەیوەندی بە چالاکیەکانی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەبوو ، دوو بەشی یەکەمی رامیاریەتی ناوبراو بریتی بوو لە :—

١- نـابیٚ لەمـەولا کێـشووەری ئەمـەریکا ببێتـە پاشـکۆی هـیچ وولاتێکـی ئەوروپا.
٢- وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەر جۆرە هەوڵێکی بۆ پەرەپێدانی سیستەمی ڕامیاریەتەکانی ئەوروپا لەهەر بەشێکی لە نێووگۆی ئەمەریکادا بە دژی ئاشتی و ئاسایشی خۆی دەزانیٚ .
هـەروا دوو بەشـەکەی دیکـە کـە تـا ڕادەیـەکی زۆر هـەتاکوو تێووەگـەلانی ئەمـەریکا لـە شەڕی یەکـەمی جیهانی ، جیٚ بەجیٚ نـەکران . کە بریتی بوون لە:-
١- خـۆ تێوەرنـەدانی وویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا لـە کۆلۆنیـەکانی ئەوروپا ، جگە لە خوودی کێشووەری ئەمەریکا نەبیٚ .
٢- خۆ تێوەرنەدانی ئەمەریکا لەشەڕی نێوان هێزە ئەوروپییەکان لەسەر کێشەی نێوو خۆییەکان .
ڕامیاریـەتی مـۆنرۆ لەسـەرەتای سـەدەی بیستەمدا وای لێهات کـە ئەمـەریکا خـۆی بـە ژەندرمـەی ئەمـەریکای باکوور و باشوور دەزانـی و ، ئـەم کارە بوو بەهۆی سەرهەڵدانی ئاڵۆزیەك لە پەیوەندیەکانی نێوان ئـەو وولاتـەو وولاتـانی ئەمەریکای لاتینی . بە بڕوای کاربەدەستانی ئەمـەریکا ، ڕامیاریـەتی مۆنرۆ هـەروا بـە یـەکێك لـە پرەنـسیپە سـەرەکیەکانی رامیاریـەتی ئەمـەریکا دەژمێردرێت ، واتـە رامیاریـەتی جیهانگـەری لـە هـەموو وبوارە جیاجیاکاندا لەسەر جیهان .

## ١٨٢٤

١٨٢٤/٣/٦ دامەزرێنـەری وولاتـی میـسرو والی محەمـەد عـەلی پاشـا لەلایـەن سـوڵتانی عوسمـانی کـرا بـەوالی میسڕ ، کـە لـەو کاتـە دوورگـەی کریـدو هـەرێمی مۆرە هـــەردووکیان سەرچـــاوەی شـــۆڕش و ڕاپـــەڕین بـــوون، دژی دەســـەڵاتی عوسمانیەکان .
١٨٢٤/٣/١٢ هێـزە چـەکدارەکانی پاشـای کـۆرەی ڕوانـدز ، لـە هێرشـێکیدا پـەلاماری شارۆچکەی - ئاڵتون کۆپری- پردیٚ - ی داو خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆی ئەویش لەپێناو بەهێزکردنی دەسەڵاتی تایبەتی خۆی ، نەك شارۆچکەکە

لەپێناو بەرژەوەندی کوردلە باشووری کوردستان ، لە بەر ئەوەی شارۆچکەکە دانیشتووانەکەی ٩٩٪ی کوردبوون و پێوویست بوو هاوپەیمانی و هاوکاری بکردایەلە هەموو بوارەکاندا ...؟.

١٨٢٤/٤/١٩ کۆچی دوایی شاعیرو ڕووناکبیری ناوداری بەریتانی- بێرون- لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا.



١٨٢٤/٧/١٦ هۆکارەکانی باری ناوچەو هەرێمەکان وای کرد ، کە کەشتی جەنگی میسری لە بەندەری ئەسکەندەریە بەرەو یۆنان بکەوێتەڕێ بەسەرکرایەتی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد علی پاشا ، کە کەشتیەکانی ١٥ هەزار سەربازی هەڵگرتبوو بەهاوکاری هێزەکانی سوپای عوسمانی ، شۆڕشی شۆڕشگێرانی یۆنانی دامرکاندەوەو لەمانگی /١٨٢٧/٦ هەردوو هێزی ئیراهیم پاشاو هێزی سووپای عوسمانی گەیشتنە شاری ئەسیناى پایتەختی ئێستای یۆنان، ئەویش لە دوای گەمارۆدانی دوورو درێژی شارەکە ، بە گرتنی قەلا بە ناوبانگەکەی – ئەکربۆل- لەووڵاتەکەدا .

١٨٢٤/٨/٢٦ هاوسەرو خۆشەویستی خاتوو – مەستوورەی ئەردەلان – خەسرەو خان – ناکام – کۆچیی دوایی کردووە ... بە کۆچی دوایی خەسرەو خانی ئەمیری ئیمارەتی ئەردەلان ، هۆکاری دڵتەزاندنی مەستوورەی ئەردەلان بووە ، دوای ئەو کاروباری ئیمارەتەکەی گرتۆتە دەست لە هەموو بوارە جیاجیاکان .

ئەم خاتوونە شاعیرە لەدوای مردنی لە بیست هەزار رستەی شیعرەکانی تەنیا سیٚ هەزار رستەی مابووەوە ... ئەویش کە بەزمانی فارسی و زمانی

کــوردی و بــه هــەردوو زاراوەکــەی ســۆرانی و گۆرانیەکــەی ... دوای مردنــی هاوســەرەکەی مەســتووره ســیانزه ســاڵ بــه بێــووەژنی مایــەوەو دوای ئــەوه رووی لەشاری سلێمانی له باشووری کوردستان کردو لەساڵی ١٨٤٧ کۆچی دوایـی کـردو گۆرەکـەی لەگۆرسـتانی – گـردی سـەیوانه – لەشـاری سلێمانی لەهەرێمی باشووری کوردستان .

## ١٨٢٥




١٨٢٥/٨/٦ لــــــه دوای هەوڵـــــــه بەردەوامـــەکان وولاتـــی پۆلیڤیا سەربەخۆیی خۆی ڕگەیانــد بــه – کۆمــاری پۆلیڤیا – به دەرچوونی له ژێر دەسەڵاتی ئەسپانیا به سەرکردایەتی تێکۆشـەری ڤـــەنزوێلی – ســـیمۆن پۆلیڤـــار– کـــه نـــاوی وولاتەکەی بەناوی ئەو تێکۆشەره کرا لەگەڵ – ئەنتۆنیۆ جۆزیێ –، له دوایی بووه یەکەم سەرەك کۆماری پۆلیڤیا.

شـایانی باسـه کـه پۆلیڤیـا خـاوەنی شارسـتانیەتی – الانکـا – بـووه کـه بەگەوورە تـرین و مـەزنترین شارسـتانیەت لـه جیهانـدا دادەنرێت و دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی ئەسـپانیا ، لـه سـاڵی ١٥٣٠ پۆلیڤیـای داگیرکـرد تـاکوو بـه دەست هێنانی سەربەخۆیی وولاتەکەله کێشووەرەکەدا .

کـه پایتــەختی ئـەم وولاتـه نـاوی – لابـاز – ه و ژمـارەی دانیـشتووانی ، ١,٢٧٥,٠٠٠ ملیــۆن کەســه . هــەروا ١مــارەی دانیــشتووانی وولاتەکــه ، ٨,٣٤٠,٠٠٠ملیـۆن کەسـه . هـەروا رووبـەری وولاتەکـه ، ١,٠٩٨,٥٨٠ کیلـۆ مەتر چوار گۆشەیه . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٢٠ کـەس لـه میل چوار گۆشـەدا . هـەروا نژادەکانی ، کووشـوا ٣٥٪ . مـستیزۆ ٢٨٪ . هنـدی ئایمـارا ٢٥٪ . ئەوروپی ١٥٪. له وولاتەکەدا .

١٨٢٥/١٢/١ لە بارودۆخێکی ناهەمواری نێوو دەووڵەتی و هەرێمەکە قەیسەری ڕووسیا ئەسکەندەری یەکەم کۆچی دوایکردو نیقوڵای یەکەم جێگەی گرتەوە بە قەیسەری ڕووسیا ، کە لەو کاتە شەڕە یەك لە دوای یەکەکانی لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو فارسی بەردەوام بوولە ناوچەو هەرێمەکاندا .
کە زۆربەی شەڕەکان لە سەر تەواوی رۆژهەلاتو باکووری کوردستان بوو ، جگە لە کێشەی بەردەوامی ئایینی لە نێوان مەسیحیو ئیسلام لە جیهاندا .

## ١٨٢٦

١٨٢٦/١/٢٢ لە دایك بوونی موئەریخ و پرۆفیسۆری ئەلمانی - فریدرك ئیبرفگ - لە لێشلنگن لەنزیك شاری زولنگن لەناوەراستی رۆژ ئاوای ئەلمانیا . لەدوای تەواوکردنی قۆناخەکانی خوویندن لەساڵی ١٨٤٥ چۆتە زانکۆی جتنگن ... دوای ئەوە چۆتە زانکۆی بەرلین و خووێندنی لەو زانکۆیە تەواو دەکات ... دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٥٠ پەیوەندی بە زانکۆی هلە دەکات وبروانامەی دکتۆرا بەدەست دێنێ .
دوای ئەوە بەمامۆستای فەلسەفە لەزانکۆی بۆنی ئەلمانی دامەزراوە لەساڵی ١٨٥٢ ... لەگەڵ وانە گووتنەوەی بەردەوام دەبێت لە نووسین ... کاردانەوەی بیری هیگل و ئەرستۆ بۆتە سەرچاوەی نووسینەکانی ، کە توانی نووسینەکانی لەسێ بەرگ بلاوبکاتەوە لەساڵەکانی ١٨٦٢ - ١٨٦٤ - ١٨٦٦ کە نووسینەکانی تاکوو ئەمرۆش کاریگەری خۆیان هەیە ، ئەم فەیلەسوفەش لەکارەکانی بەردەوام بووە تاکوو لە ١٨٧١/٦/٩ کۆچی دوایی کردوە .
سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی /٣ .

١٨٢٦/٤/١٤ ڕابەری ئایینیو تەریقەی نەقشەبەندی مەولانا خالید نەقشەبەندی لە شاری - دیمەشق - ی شامی ئەوکات کۆچی دوایی کردووە.

## ١٨٢٧

١٨٢٧/٧/٦ مۆرکردنی ڕێکەووتنامە لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەگەڵ فەڕەنساو بەریتانیاو ڕووسیا ، کە دەسەلاتی عوسمانی دەستگیر بێت بەپێدانی سەربەخۆیی بە ئیدارەی یۆنان ، بە مەرجێ باج بدات کە ئەویش لە سەر بڕە

باجەکـە ڕێکـەووتن مۆربکـەن ، لـە هــەمان کـات بـەرەو دامەزرانـدنی مـافی ئۆتۆنۆمی لە ژێر سایەی سوڵتانی عوسمانی بێت هەرێمەکەدا .

ئـەو پەیمانــە لــە شــاری لەنــدەنی پایتــەختی بــەریتانیا مــۆرکرا ، کــە بەسـەربەخۆیی راستەوخۆی یۆنـان دادەنرێـت ، لـە دوای ئـەوە –کـانـنج– لـە ٨/٨ هەمان ساڵدا کۆچی دوایکرد لە وولاتەکەدا .

١٨٢٧/٧/٢٤ مامۆسـتایانی زانکـۆو شووێنەوارناسـی – شـۆلتز – لـە پێنـاو گەیـشتنی بۆ کوردسـتان بـە نـاوی ئـەوەی تووێژینـەوە لـە سـەر شـووێنەواری – خەلـدین - بکات لە هەرێمەکەدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە مامۆستا شۆلتز مامۆستا بوو لە زانکۆی گیسیز ... ئـەوە بـوو گەیـشتە شـاری وان لـە باکووری کوردسـتان ... لـەدوای گـەراز گەیشتە ئەنجامی ئەوەی کە توانی ٤٢ پارچە لە شووێنەوارە قورەکانی مەلیك – ئۆرارتـۆ – بدۆزێتـەوە ، دوای ئـەوە ڕەوانـەی پاریسی پایتـەختی فەرەنسا کرد... دوای ئەوە بەدووساڵ لە گەران و تالانکردن و دزینی شـووێنەوارەکانی کوردستان ، کە لەلایەن کرێکارەکانی کورد کووژرا لەناوچـەی – گـولێمێرك – لە هەرێمەکەدا .

ئـەو پارچـە شـووێنەوارانە لەسـاڵی ١٨٤٠ دوای یـەك سـاڵ لـەمردنی گەیـشتە پاریس لە فەرەنسا ... ئەوەش لـە ئاکـامی راپۆرتـەکانی مـارکۆبۆلۆ هـات ، کـە لـە سـاڵی ١٢٥٤ ، لەگـەڵ مـام و بـاوکی لەچـین بـەرەو ئیتالیـا دەگەرایـەوەو ناوزەندی دانیشتووانی رۆژهەلاتی بە شێووەیەکی شێواو لەقەڵەمدا ... بـەلام دوای ئەوەی کـە – کلاودیۆس گیمس ریچ – کـە پیـاوی بازرگـانی فەرەنـسی بـەریتانیا بـوو گەیـشتە شـاری بەغـدا ، دوای ئـەوەش سـوورانەوەیەکی بـە باشـووری کوردسـتاندا کـردو میوانـداری ئـەمیری بابـانی لـە شـاری سـلێمانی کـرد بـە پێـچەوانەی راپـۆرت و وتـەکانی مـارکۆبۆلۆ بـوون ، لـە گـەڵ چـەندین راپۆرتی دیکە لەسەر باری کوردو کۆمەڵگای کوردستان لەوکاتدا.

١٨٢٧/١٠/٢٠ بەرپابوونی شەڕی – ناڤارین – لە هەرێمی یۆنان لە نێوان کەشتیە جەنگیـە دەریایـەکانی میسر ، کـە ئیبراهیم پاشـای کـوڕی محەمـەد عـەلی پاشـای والی

میسر سەرکردایەتی دەکرد ، هەروا ئەمیر تاهر پاشاش سەرکردایەتی هێزەکانی کەشتیەوانی عوسمانی دەکرد لە گەڵ کەشتیەکانی بەریتانیا ، کە ئەمیراڵ – رینی– سەرکردایەتی دەکردو کەشتیە جەنگیەکانی رووسیای قەیسەریش لەلایەکی دیکەوە لەناوچەو هەرێمەکان بەردەوام بوون لەکارە هەلایەنەکانی جەنگی لە هەرێمەکەدا.

١٨٢٧/١٢/١٥ ئامارژە بە هەندێ بەڵگە دەکەین ، کە دەسەڵاتدارانی رووسیای قەیسەری کاروبارو بەرێووەبەرایەتی کوردەکانی هەرێمی پشت قەفقازان هەر لە دەستی خوودی کورداندا هێشتۆتەوە ، گرنگ ئەوەیە ، کە بڕیارو فەرمانەکانی دەسەڵاتدارانی رووسیا .
واتە لە سان پترۆسبۆرگ دەرکراون لە گەلالەی مەدەنی بەرێووەبردنی خانەنشینەکانی یەریڤان و ناو نەخجەوان ، هەروا ناوچەی ئۆردو ئابادا . کە لە پترۆسبۆرگەوە بۆ شازادە – پاسکە ڤیچ – دادوەری قەفاز نێردراوەو دەڵێ :– کاروباری کۆچەرەکان با هەر لەدەست سەرۆك هۆزو خێلەکانیاندا بێ... واتە کورد لە ناوچەو هەرێمەکەدا .

## ١٨٢٨

١٨٢٨/٤/٢ رژێمی رووسیای قەیسەری لە راگەیاندنی بڕیارێکی کارگێریدا لەپێناو نانەوەی دژایەتی و ناکۆکی لە نێوان ئەرمەن و کورد بە هاندانی ئەرمەنەکان بە چاودێری کردنی کوردەکان لەپارێزگای یەریڤانی کوردستان ، ئەویش هەڵسان بەکاری سیخووری بۆ رژێمی رووسیای قەیسەری دژ بە کورد لە هەموو بوارەکاندا .

١٨٢٨/٤/١٠ مۆرکردنی رێکەوتنامەی بەناو – ئاشتی تورکمان جای– لە نێوان رووسیای قەیسەری و رژێمی فارسی سەفەوی لە ئێران ، کە ئەرمەنستانی ژێر دەسەڵاتی فارسی پارچەیەك بێت لە رژێمی قەیسەری رووسیا .
کەبەو هۆکارەش زۆرناوچە لەخاکی رۆژهەڵات و باکووری کوردستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی رووسیای قەیسەری ، کە دەکەووتنە سەر سنووری قریاخ و نەخجەوان ، بەتایبەتیش پارێزگای یەریڤان و دەووروبەری ، کە ئێستا شاری یەریڤان پایتەختی کۆماری ئەرمینیایە لە ناوچەکەدا .

١٨٢٨/١٠/١ دامەزراندنی زانكۆی لەندەن لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ، كە ئەو زانكۆیە نەك هەركاریگەری زانستی و فێربوونی بۆ گەلانی بەریتانیا هەبووە لە هەموو بوارەكانی خوێندن . بەڵكوو سوودی بۆ كۆمەڵگاكانی دیكەی وولاتانی جیهان .

## ١٨٢٩

١٨٢٩/٩/٣ باشووری كوردستان ، كە لە پاشا لیكەكانی دیاربەكرو مووسڵ پێك دێت ، كە دەسەڵاتدارانی عوسمانی هیچ دەسەڵاتێكیان لەسەر ئەو ناوچەو هەرێمەدا نەبوو ، لەو كاتیشدا بەگە كوردەكانی ناوچەكە كەم یا زۆر لەیەكتر سەربەخۆبوون ، هەندێك جار سەربە دەسالاتداریەتی سلێمانیە لە- پاشالیكی مووسڵ - بوون ... هەر لە كۆنەوە لەلایەن فارسەوە پشتیووانی لێ دەكرا ، كە بەم چەشنە توانی دەسەلاتی خۆی بەسەر زۆربەی باشووری كوردستان بلاوبكاتەوەو خوودسەرانە ناوی پاشایەتی كوردستانی بەخۆوەنابوو پەیووەندی دۆستانەی لەگەڵ فارس داهەبوو ، ئیماراتە گەورەكانی باشووری كوردستان ، كە لەڕواندزو باگدان و بادینان پێك هاتبوو .

جگە لەوناوچانەی كوردستان ، كە ناوبراوان هۆزی كوردی دیكەش تیای دا دەژیان . لە چوارچێووەی پاشالیكەكانی فارس و ئاخالنسیخ وەك كۆمەڵەی بچووك لە ٢٠ تا ٣٠ بنەماڵە دەبوون ، ئەمانە بەستراببوونەوە بە پاشالیكەكانی ئەم ناوچانەی سەربە دەسەڵاتی عوسمانی بوون ، هەروا لە خانەنشینی پارێزگای یەریڤان كوردێكی زۆری لێ دەژیان ، كە ئەوكات ژمارەیان دەگەیشتە ٨٠٠٠ بنەماڵە . واتە خێزان ، و لەژێر كاریگەریەتی و دەسەڵاتی سەرداری یەریڤان بوون لە ناوچەكەدا .

سەرچاوە:- لە زنجیرە بەڵگەنامەكانی سۆڤیەت لە كۆمۆسیۆنی شاوخیگرافی بەرگی /٧ - ل٧٨٥-، ژ/١٧٨ .

١٨٢٩/٩/١٩ هێزە چەكدارەكانی كورد بە هاوكاری و پشتگیری هێزەكانی سووپای ڕووسیای قەیسەری ، هێرشیان كردە سەر ناوچەی پارێزگای قارس لە باكووری كوردستان و لە ژێر دەسەڵاتی هێزەكانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی

ڕزگاریان کرد.

بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا چەکدارانی کورد وەك جاش یارمەتی تورکەکانیانداو بووە هۆی داگیرکردنی شاری ئەرزەڕۆم لە باکووری کوردستان .

١٨٢٩/١٢/١٤لە سەردەمی – نێس– دا – زانا دگۆڕ– سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بووە لە پاش ئاڵوگۆڕ کردنی نامە لەگەڵ یەکترا ، دوای ئەوە بریار دەدەن ئالاّو کۆپی زانیاری بکەن لەگەڵ یەکتردا ، هەر بۆ ئەو مەبەستەش بڕیاری نامەیەك مۆر دەکەن و هاوکات لەگەڵ دگۆڕو نێس دا ، کە زانای بەریتانی ویلیام هێنری تالیووت خەریکی لێکۆڵینەوە بوون لە پێناو دەستکەوتی وێنە ی دیکە نوێ لە داهاتوودا .

## ١٨٣٠

١٨٣٠/١/١٠ بۆ یەکەم جار لە مێژووی جیهان کار بە پوولی نامە ئاڵوگۆڕکردن ئەنجامدرا لە بوواری پۆستەدا لە جیهاندا .

١٨٣٠/٢/٤ گەلانی بەلژیکا لە پێناو تۆڵە وەرگرتنەوە سەربەخۆیی وولاتەکەیان ڕاگەیاندو سەرکردەی وولات – لیۆپولد– بووە یەکەم شانشینی بەلژیکا بەناوی – شانشینی بەلژیکا – لە کێشووەرەکەدا ، و لە پەیمانی لەندەن داننرا بە سەربەخۆیی شانشینی بەلژیکا.




کە ناوی پایتەختەکەی – برۆکسل – ە و ژمارەی دانیشتووانەکەی ، ١,٠٠٠,٠٠٠ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکی ، ١٠,٦٠٠,٠٠٠ ١٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکەی ؛ ٣٠,٥١٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە ، هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٨٩٩ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . لە وولاتەکەدا .

١٨٣٠/٥/٧ مـۆرکردنی یەکـەم پـەیمان لـە نێـوان ئەمـەریکاو ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی ، ئـەویش بـە ئامـادەکردنی بـاری بازرگـانی و دبلۆماسـی ، کـە ئەمـەریکا رۆڵـی سـەرەکی هـەبوو لـە دروسـتکردنی کێـشە لـە ناوچـە عەرەبیـەکانی سـەربە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، لە هەرێمە جیا جیاکان لە کێشوەری ئاسیادا .

١٨٣٠/٧/١٥ هێزەکـانی سـوپای فەرەنـسا لـە هێرشـێکی بەرفراوانیـدا تـوانی جـەزائیرو پایتەختی جەزائیر داگیر بکات ، کە ئەو داگیرکردنە ماوەی ١٣٢ ساڵی خایاند ، تـاکوو رزگـاربوونی بـە رێگەیانـدنی سـەربەخۆیی جـەزائیر بـە کشاندنەوەی دام‌ودەزگا و هێزەکانی سوپای فەرەنسا لـە جـەزائیر ، لـە دوای زیـاتر لـە ١,٥ ملیۆن قووربانی و وێرانکاری ژێرخانی ئابووری‌و چەندین لایەنی دیکـە لـەو وولاتەدا.

١٨٣٠/٧/٣١ لـە دوای هـەولێکی سـەرکردەکانی تـووانرا – لـوویس فلیـپ – هەڵبـژێردرا بەشانشینی فەرەنسا ، لـە دوای لابردنـی شارڵی دەیـەم ، کـە جێگـەی براکـەی گرتبـووەوە بـە لوویـسی دوانزەهـەم لـە سـەر ئیمپراتۆریـەتی فەرەنـسای ئەوکاتدا .



١٨٣٠/١١/٢٨ لـە دایـك بـوونی خـاوەنی پــەیامی – بــەیانی کۆمۆنیـست– و ئـابووری رامیــاری – فردریــك ئینگلش– لە ئینگلترا بە هاوکـاری کـارل مـارکس کـە بۆتـە بنـەماکانی کـارو هەڵوویــستو بــیروو بۆچـوونی ژیـانی بـەملیار رۆشــنبیرو رووناکبیرو زاناکان لە جیهاندا .

## ١٨٣١

١٨٣١/٦/١٢ دامەزرێنەری وولاّتی میسر- محەمەد عەلی - پاشا بە نەژاد کوردو لە بنەماڵەی - خدێوی- ە سووپایەکی لە پیادەی دەشتایی و دەریایی ئامادەکرد ، بە سەرکردایەتی ئیبراهیم پاشای کوڕی ، کە بەرەو هەرێمەکانی وولاّتی شام هەنگاوویاننا ، کە یەکەم جار لە ڕێگەی دەریاو لە هەمان کات هێزەکانی سووپای پیادە لە دەشتایەکان ، پێشیان کەووتن و شاری غەزەیان داگیرکرد ، دوای ئەوە شارەکانی یافاو قوودس و نابلس . کە لەو کاتەدا هەردوو هێزی دەریایی و دەشتایی بەیەکگەیشتن .

هەروا شاری عەککەشیان گەمارۆداو ، دوای ئەوە کەووتە بەردەستیان... دوای ئەوە هێزەکانی سووپای محەمەد عەلی پاشا بە سەرکردایەتی ئیبراهیمی کوڕی سەرکەووتنەکانی مسۆگەرکردو بەرەو شاری حەلەب بەڕێکەوتن .



محمد علي في ديوانه بالقلعة يستقبل وفد بعض الدول الأجنبية
ويرى عن يمينه ولداه طوسون وإبراهيم

لە ئەنجام هێزەکانی سووپای عوسمانی بە سەرکردایەتی حوسێن پاشا پاشەکشەیان کردو ناوچەکەیان جێهێشت بەرەو هەرێمی ئەنادۆڵ گەڕانەوە ، کە لەوکاتەش هێزەکانی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشا بەرەو شارەکانی باکووری کوردستان هەنگاویاننا ، بە تایبەتی بەرەو شاری ئەستەمبۆڵ .

کە بووە هۆی دورستکردنی ترس نانەوە لەسەر دەسەڵاتەکانی وولاتانی ئەورووپا ، لەوکاتەی کە هێزەکانی سووپای ئیبراهیم پاشا گەیشتە چیاکانی تۆڕۆس و شاری ئەدەنە- دیاربەکر- کە بووە هۆی ئەوەی کە چوونە ناو شاری ئەستەمبۆڵ ئاسان بکرێت ، کە لەو کاتە ٥٠ کیلۆ مەتر مابوو بگەنە ناو شاری ئەستەمبۆڵی پایتەختی ئەوکاتی عوسمانی .

بە تایبەتی رووسیای قەیسەری ترسی زۆری گەیشتبووێ . کە داوای لە سوڵتانی عوسمانی کرد بەیارمەتی دانی دەسەڵاتەکەی بۆ لێدانی هێزەکانی سووپای ئیبراهیم پاشا ، کە لەو کات و بە پەلە زیاتر لە ١٠٠٠ دە هەزار سەربازی یارمەتی بۆ دەسەڵاتی عوسمانی رەوانەی ئەستەمبۆڵ کرد بۆ بەرگری کردن لە دەسەڵاتی عوسمانی ، هەروا فەرەنساو بەریتانیا ترسان لەوەی ، کە دەست تێووەردانی رووسیا کاریگەری هەبێ لە سەر بەرژەوەندیەکانیان ، داوایان لە سوڵتانی عوسمانی کرد رێکەووتن لەگەڵ محەمەد عەلی پاشا ئەنجام بدات ، لە بەر ئەوەی ئەوان باشیان دەزانی کە محەمەد عەلی پاشا لە رچەڵەك و بنەماڵە دەگەڕێتەوە کام هەرێم لە کوردستان و کام نژاد ، لە هەمان کات پەیووەندی لە نێوان محەمەد عەلی پاشا لەگەڵ میرەکانی ئیمارەتی کوردی بە تایبەتی ئیمارەتی رەواندزو سۆران ئەویش بەنامە گۆڕینەوە .

بەلاّم بە داخەوە تاکوو ئێستا ئەو نامانە ئاسەواریان نیە ، بەلاّم بەدڵنیاییەوە پەیووەندیەکی بە هێز هەبووە لە نێوان محەمەد عەلی پاشاو سەرکردە کوردەکان لە کوردستان .

١٨٣١/١٠/٢٤ مۆرکردنی پەیمانی - بووخارست - لە بووخارستی پایتەختی ئێستای ڕۆمانیا ، لە نێوان هێزەکانی شەڕکەری ڕووسیای قەیسەری و ئیمپڕاتۆڕیەتی عوسمانیدا ... شایانی باسە لەوکاتەی کە هێزەکانی سووپای محەمەد عەلی پاشا ، بە سەرکردایەتی ئیبراهیم پاشای کوڕی ، بەرەو شاری ئەستەمبۆڵو سەرکەوتنەکانی بووە هۆی ئەوەی کە ڕووسیای قەیسەری بە هەموو توانا یارمەتی هێزەکانی سووپای عوسمانیبدا دژی هێزەکانی ئیبراهیم پاشا .
کە ڕامیاریەتیەکی نهێنی لە پەیووەندیەکانیان هەبووە بەرامبەر بە دەسەڵاتی محەمەد عەلی پاشاو پەیووەندی لەگەڵ ئیمارەتە کوردەکان لە کوردستان...؟...!.

١٨٣١/١١/١١ یەکەم ڕۆژنامەی تورکیا بەناوی - تقویم الوقائع - بڵاوکرایەوە کە تێیدا یاساکانی دەووڵەتی عوسمانی بڵاوودەکردەوە . دوای ئەوە ڕۆژنامەی - ترجمان الاحوال- لە ساڵی ١٨٦٧ بڵاووکرایەوە ، دوای ئەویش ڕۆژنامەی - تصویر الافکار- لە ساڵی ١٨٦٧ بڵاووکرایەوە بە پشتگیری کردن لە ڕامیاریەتی دەسەڵاتەکەیاندا .

## ١٨٣٢

١٨٣٢/٣/١٥ هێزە چەکدارەکانی پاشای کۆرە ، هێرشیان کردە سەر کوردە ئێزیدیەکان ، لە ناوچەی دهۆك لە باشووری کوردستان ، دوای ئەوە بەرەو شارۆچکەی - ئەلقووش- ی نزیك شاری مووسڵ ، کەووتنەڕێ کە ئەلقووش و دەووروو بەری کوردە ئێزدیو مەسیحیو ئیسلامەکان بوون ، لە هەرێمی باشووری کوردستان .

١٨٣٢/٣/٢٢ کۆچی دوایی فەیلەسوف بەناوبانگی ئەلمانی و جیهانی - چان ولفگنگ جینتە - . ئەم فەیلەسوفە لەساڵی ١٧٤٦ لە فرانکفۆرتی میرلیمن لە ئەلمانیا لەدایك بووە ... دەرچووی کۆلێژی یاسا بووە . لەساڵی ١٧٧١ بروانامەی دکتۆرای بەدەست هێناوە ... لە ساڵی ١٧٧٢ ڕۆمانی - چۆتز یرلینگنی - بڵاوکردەوە لەسەر شێووازی شکسپیر . هەروا - ئ‌ۆلام فرتر - ی لە ساڵی ١٧٧٤ بڵاوکردەوە ... چیرۆکی کۆنت دیکمۆنتی لەساڵس ١٧٧٥ بڵاوکردەوە ... ولیم مستر لە ساڵی ١٧٧٧ . بەشی یەکەم لەڕۆمانی - مۆست - لەساڵی ١٧٩٨ بڵاوکردەوە ... سەردانی ناپلیۆنی کردووەو وسامی -صلیب جۆقەی

شەرتی – له سالّی ١٨٠٨ پیّ بەخشراوه .
دوای ئەوه بۆته وەزیر لە حكوومەتی دۆق ساكس ویمر لە سالّی ١٨١٥...
دوای ئەوه بەردەوام بووه لەنووسینەكانی تاكوو كۆچی دوایی كردووه .

١٨٣٢/٥/١١ هەلّگیرسانی شەڕ لە نێوان هێزه چەكدارەكانی میری سۆران و هێزەكانی سووپای فارسی سەفەوی ، دوای ئەوه هێزەكانی میری سۆران هێرشیان كرده سەر ناوچەكانی لاهیجان و مەهابادو دەوورووبەری لە رۆژهەلاّتی كوردستانی داگیر كراوی ژێر دەسەلاّتی فارس لە ئێراندا .

١٨٣٢/٥/٢١ لە دوای كردنەوەی شاری بەغدا ، لە لایەن عەلی رەزا پاشا ، كە لەمانگی موحرەرەمی سالّی دوایی بوو، یەكێك لەبنەمالّەكانی مەزهەب شیعه ، دانیشتنی ماته مینی ، واته تەعزیەیان ، لە مالّەكەی خۆی دانا ، بەم بۆنەش والیٔ بەغدا بەشداری لەو تەعزیەیه كرد ، كە بووه هۆی هاندانی كەسانی دیكەو بەم جۆره كاری تەعزیه بووه باو بەردەوام بوو تاكوو ئێستاش ، ئەو ریّو ڕەسمه بەردەوامه وەك كارێكی راگەیاندن و بەهێزی بنەمالّەكه بەپێی توانایان.

١٨٣٢/٥/٣١ مۆركردنی ڕێكەتنامەی – كۆتاهیه– لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و محەمەد عەلی پاشای والی میسر ، لە سەر داوای وولاّتانی ئەوڕوپا ، بە تایبەتی هەردوو وولاّتی فەرەنساو بەریتانیا ئەویش بەهۆی:–
یەكەم:– سەرهەلّدانی ترسی دوا ڕۆژی دەسەلاّتەكەیان بەرامبەر بە ڕووسیای قیسەری و محەمەد عەلی پاشا...؟.
دووەم:– دروست بوونی ترسیان بەرامبەر بەگەڕانەوەی دەسەلاّتەكانی پێشووی وەك ، بێزنتیەكان ، و زانینیان بەوەی كە محەمەد عەلی پاشا نیازی دامەزراندنی دەوولّەتێكی كوردی فراوانه لە كێشووەری ئاسیا ، بەم هۆكارەش لە سەر چەندین خالّ ڕێكەووتن ئەویش:–
١– گەڕانەوەی هێزەكانی سووپای محەمەد عەلی پاشا بۆ دوواوەی چیای تۆڕۆس .
٢– بوونی محەمەد عەلی پاشا بە والی لە سەر وولاّتی میسر و ناوچەكانی ژێر

دەسەڵاتیدا ، هەتا هەتایە .

٣- دانانی والی لە شارەکانی عەکاو تراپلس و دیمەشق و حەلەب و دوورگەی کریت ، لەلایەن محەمەد عەلی پاشا.

٤- دانانی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشا ، بە والی ئەدەنە - دیاربەکر- کە ئەوکات هەرێمێکی نزیك ئەنازۆڵ بوو لە باکووری کوردستان.

شایانی باسە لە چەندین سەرچاوە وای نیشاندەدەن ، کە محەمەد عەلی پاشا پەیووەندی نهێنی هەبووە لە گەڵ میری ڕواندز لە باشووری کوردستان . لە پێناو دامەزراندنی دەووڵەتێکی کوردی بەهێز بە تایبەتی لە کوردستان و چەندین ناوچەی دیکەی وەك شام و ناوچەکانی دیکەی ئەستەمبوڵ و قەوقازدا .

بەڵام هەر وەك ئێستا سوڵتانی عوسمانی بە ناچاری ئەو ڕێکەووتنامەی مۆرکرد ، ئەویش بەپاڵە پەستۆی وولاتانی ئەوروپا بەپێی قۆناخەکان و خۆئامادەکردن لە پێناو شەڕکردن .

لە هەمان کات محەمەد عەلی پاشاش نیازی مۆرکردنی ڕێکەووتنامەکە بوو . بە جیابوونەوەی تەواو لە ژێر هەرەشەکانی دەسەلأتی عوسمانی و وولأتانی ئەورووپادا ، بەڵام هەوڵەکان دڵخۆشکەر نەبوون بە هۆی گەمارۆدانی محەمەد عەلی لەلایەن فەڕەنساو بەریتانیاو ڕووسیای قەیسەری لەو کاتدا لە کێشووەرەکەدا .



١٨٣٢/١٢/١١ ئەندازیاری بەناویانگی فەڕەنسی - گۆستاف ئیڤل- لە پاریسی پایتەختی فەڕەنسا لە دایك بووە ، ئەو مرۆڤە زاناو بلیمەتە ناودارە جیهانیەو ئەو ئەندازیارە توانی پەیکەری ئازادی و تاوەری ئیڤل دروست بکات بە هەستی زانیاری خۆی کە ئەمڕۆ بۆتە هێمایەك لە هێمایەکانی جیهان.

## ١٨٣٣

١٨٣٣/٣/٢١ وەزیـری دەرەوەی بەریتانیا – لـورد مرستۆن – نامەیـەکی لەسـەر محەمـەد عـەلی پاشا نووسـیووەو دەڵـێ:– ئامـانجی محەمـەد عـەلی پاشا دامەزرانـدنی دەووڵـەتێکی راسـتەقینەی مـەزنی گـەوورەو فـراوان بـووە لـە سە ناوچـەکەو خـاکی کوردسـتاندا . لـە هـەمان کـات دژی تـورك بـووەو هـەوڵی بنبرکردنـی دەسەڵاتی عوسمانی داوە لەو ناوچە و هەرێمانەی کە لە ئامانجیدا بووە .

شـایانی باسـە وەزیـری بەریتانی دژی دەسـەڵات و هەڵوویستەکانی محەمـەد علی پاشا بووەوجێگەی مەترسی حکوومـەتی بەریتانیا بووە ... هەر لە بەر ئەوەش – ریشارد ووی – لـە بالوێزخانـەی بەریتانیا لـە شاری ئەسقەهۆل رەوانـەی بـەیروتی پایـەختی لوبنـان کـراوە لـە سـاڵی ١٨٣٥ ، لـە پێنـاو دروستکردنی ئاژاوە لـە نێوان دەسـەڵاتی محەمەد عەلی پاشاو دورزیەکان لـە ناوچەکدا ، هەر بەوەش دەردەکەوێت کە محەمەد عەلی پاشا کورد بووە . نەك بە پێچەوانەی ، کە عەلی وەردی لەنووسینەکانی دەیاری کردووە لە سـەر ئـە بنەماڵەیەدا ...؟.

١٨٣٣/٥/٤ بە هـۆی دەسـت تێـووەردانی وولاّتـانی ئـەوروپا لـەکاروبارو پەیووەنـدی لـە نێـوان دەسـەڵاتی عوسمـانی و دەسـەڵاتی محەمـەد عـەلی پاشـا ، لـە ناوچـە هەرێمـە جیاجیاکـانی میسرو شـامو چـەندین جێگـەی دیکـە . کـە بووە هـۆی ناچـارکردنی دەسـەڵاتی عوسمـانی بـەمۆرکردنی ڕێکەووتنامـەی ئاشـتی لـە نێـوان ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی و محەمـەد عـەلی پاشـا ، کـە دەسـەڵاتی عوسمـانی دانینـا بـەمافی محەمـەد عـەلی پاشا لەسـەر میسرو نیمچە بیابانی عەرەبی و سودان لە کێشووەرەکەدا .

دوای کردنـی بـەوالی لەسـەر فەڵەستین و شامو قیلیقیـای سـەر بـە دەسـەڵاتی عوسمـانی دامەزرانـد . کـە بـووە هـۆی ئـەوەی کـە محەمـەد عـەلی پاشـا دا بەسـەربەخۆیی دەسـەڵاتی بـاڵای سـوڵتان دابنـێ لـە ناوچـەو هەرێـەکان ، کە ئەوکارانەشی بەهۆی توانای محەمەد عەلی پاشاو فراوانکردنی دەسەڵاتی بوو ، هەتا لەسەر وویلایەتی دیاربەکر لە باکووری کوردستان بە دروست بوونی مەترسـی وولاّتـانی ئـەوروپا . لـە دوا ڕۆژی دەسـەڵاتی محەمـەد عـەلی پاشـا

چەندین بیروبۆچوون و هەڵوێستی نەتەوەیی ونیشتمانی دیکە لە هەریم و ناوچە جیاجیاکاندا .

١٨٣٣/٥/١٥ لە یاداشتەکانی دکتۆر – رۆس و فریزەر – ی گەرۆکدا هاتووە :– لەگەڵ دەستەیەك لە پیاوانی محەمەد پاشا بە سەرۆکایەتی میسر بایەزید بەگ مامی ، کە بۆ ئەم کارە ناردرابوونە شاری بەغدا بەجێهێشت و بەرەو میرنشینی سۆران بەرێکەوتن و دەڵێ:–

ئەو ناوچانانەی لە ژێر دەستی والی عوسمانی بوون هەموویان وێران و چۆڵ بوون ، چونکە خەڵکەکە لە کاتی جەنگ ، بە هۆی ئەو باجە زۆرەی کە لە سەریان دانرابوو ڕایان کردوو ئەوەی دەمانەوەش لە ژیانێکی یەکجار سەخت دەژیان و هەر کاربەدەستێکی بەو ناوچە تێپەر بوایە داوای بەخشیشیان لە دانیشتووانەکە دەکرد ، بە پێچەوانەی ژێر دەسەڵاتەکانی محەمەد علی پاشاو میری سۆران لە هەرێمەکەدا .

١٨٣٣/٥/١٩ گەرۆکی ناوداری جیهانی و نووسەری مێژوویی – فریزەر – دەڵێ :– دکتۆر رۆسی کە گەیشتە هەولێر لە باشووری کوردستان و پێشوازی گەورەی لێکرا لەلایەن دانیشتووانەکەو لەم رۆژەدا هەولێر بەجێ دێڵێ و بەرەو رواندزی پایتەختی میری سۆران بەرێگا شاخاویەکانی هەڵدەکشێ تاکوو گەیشتە قەلای میر مستەفا بەگی باوکی محەمەد پاشا ، کە پێی دەگوترا – دم دم – و بەسەر دۆڵی رواندزیدا دەروانی و کەوتۆتە لەتکەی شاخێکی بەرز لە ناوچەکەدا.

١٨٣٣/٥/١٩ دکتۆری ناوداری بەریتانی – ڕۆس – سەردانی هەرێمی باشووری کوردستانی کردو چاوی کەوت بە میرنشینی سۆران ، ئەویش بە مەبەستی چارەسەرکردنی نەخۆشی مستەفا بەگی باوکی پاشای کوێرە بوو لە هەرێمەکەدا ، لە پاش ئەوکارە ڕۆس ڕاپۆرتێکی تێروو تەسەلی لە سەر باری ناوچەی میرنشینی سۆران دەنووسێت و لە چەندین لایەنی دیکەی باری کورد لە باشووری کوردستان.

١٨٣٣/٥/٢١ سەرەك وەزیرانی پێشووی دەوڵەتی عوسمانی کرا بە والی پارێزگای سیواس ، و لە هەمان کات وویلایەتی دیاربەکریش خرایە ژێر دەسەڵاتەکەی

لە باکووری کوردستان ، کە ئەمەش لە پێناو کۆکردنەوەی هێزو دەسەڵاتی تەواوی بوو بە سەر باکووری کوردستان و بە یەکلاکردنەوەی کێشەی شۆڕشی میر محەمەدی ڕەواندزی لە عەرێمەکەدا .

لە بەر ئەوەی ببووە یەکێ لە گەوورترین کۆسپ لە پێش دەسەڵاتی عوسمانی لەسەر خاکی کوردستان ، کە لەو کاتە میری سۆران لەوپەڕی بەهێزیو تواناو یەکگرتووی بوو، هەرچەندە کێشەی ناوخۆش مەترسیدار بوو لەسەر دەسەڵاتەکەیاندا .

١٨٣٣/٦/٧ بە هۆی هەڵوویستەکان و توانای هێزەکانی سووپای میسر بە سەرکردایەتی محەمەد عەلی پاشا ، پەیمانی نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو قەیسەری ڕووسی لە – خۆنکار ئەسکەسی– مۆرکرا. وەك پەیمانی بەرگری هاوبەشی سەربازی لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەت . لە پێناو، یەکەم:– گەمارۆ دانی هەر جمووجۆڵیەکی زیادەڕۆیی لە لایەن هێزەکانی سووپای محەمەد عەلی پاشاو دووەم :– جووڵانەوەی کورد لە هەر لایەنێکی کورد لە باکوورو لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو باشووری کوردستاندا .

١٨٣٣/٧/٣ دوای چەند ڕۆژێك لە مانەوەی دکتۆر – ڕۆس – لە شاری هەولێر لە باشووری کوردستان ، محەمەد پاشا بە دوایدا دەنێری ئەویش



الإمارات الكردية، ومنها بابان وسوران، في سنة ١٨٣٥

بەرەو ئاکرێ دەکەوێتە رێ و بەکەلەك لە زێی بادینان دەپەڕێتەوە تاکوو دەگاتە دەشتی ئاکرێ ... لە ناو ئۆردووگای محەمەد پاشا و لە ناوچەند رێز لە پاسەوانی تایبەتیدا دەگاتە بارەگای محەمەد پاشای کۆرە ... کە لەوکات محەمەد پاشا تەمەنی لە ٤٥ ساڵیدا بووەو دوای گفتووگۆکردنی لەنێوانیان ... لە هەمان کات دکتۆر وا مەزەندە دەکات ، کە ژمارەی چەکدارانی محەمەد پاشا نزیکەی ٥٠ هەزار چەکدار بوو لە ناوچەکەدا .

١٨٣٣/٧/٨ لە دوای تەواو بوونی گفتووگۆ لە نێوان دکتۆر رۆس و پاشای کۆرە ... دکتۆر رۆسی لە رێگەی شاری مووسڵ بەرەو شاری بەغدا کەوتە رێ ... لەناوچەو ناو شاری موسل دانیشتووانەکە داوای یارمەتی لە دکتۆر دەکەن بەهۆی برسیەتی و هەژاری ، کە ئەو کاتە لەژێر دەسەڵاتی والی بەغدا بوون . ئەمەش لەو کاتەی لەناوچەی ژێر دەسەڵاتی پاشای کۆرە دەردەچێ لە هەرێمەکەدا .

١٨٣٣/١٠/٢ لە دایك بوونی - ئەلفرید نۆبڵ ، داهێنەر- لە شاری ستۆکهۆڵمی پایتەختی سووید ، لە شاری پترۆسبۆرگی رووسیا گەوورە بووە ... ئمانۆیلی باوکی لەوێ وەکوو داهێنەرێك کاری کردووەو خاوەنی کارگە بووە . هەروا ئەلفرید نۆبڵ



لەپاش خووێندێکی زۆر لەکارگەکەی باوکیدا وەکوو داهێنەرێك کار دەکات . لە ماوەی خووێندنی گەشتی بۆ فەرەنساو ئەمەریکا کردووە، دوای ئەوە دەگەڕێتەوە ، ئەویش بەهۆی نالەباری باری کارگەکەی باوکی و هەوڵی چاکردن و پەرەوپێش بردنی دەدا.

دوای ئەوەی کە برا گەورەکەی کارگەکە بەرێوەو دەبرد، ئەویش حەز لە

داهێنـان دەكـات و لـەدوای هـەوڵ مانـدبوونێكی زۆر لـەماوەی دوو سـاڵ لـە
تاقیكردنـەوە تـوانی مـاددەی دینامیـت بدۆزێتـەوە ، كـە بـۆ تەقینـەوەی
ئەشكەووت و ڕێگا چاككردن بەكار دەهێنرا .
دوای ئەوە لەساڵی ١٨٦٧ كارگەیەكی دینامیت لە سووید دروست دەكا..
دینامیت دژی مرۆڤایەتی لەكارە جەنگیەكان بەكارهێنرا ، كە ئەمەش دژی
ئاواتەكانی نۆبل بوو .
شـایانی باسـە كـە نۆبـل لـە ١٨٩٥/١١/٢٧ ، واتـە سـاڵێك بـەر لـەمردنی
بڕیارێكی گرنگ و مێژوویی دەدا ، كە ئەویش هەموو سامانەكانی تەرخان
بكرێت بۆ خەڵات لەبوارەكانی ئەدەب فیزیاو كیمیاو ئاشتی و پاش مشتو
مڕێكـی زۆر لەسـاڵی ١٩٠١ دەسـت كـرا ، بەداشـكردنی خەڵاتـەكان لـە
١٨٩٦/١٢/١٠ ، كە دەكاتە ڕۆژی مردنـی ئەو داهێنەرە بەناوبانگە جیهانیە
- ئەلفرید نۆبل - .... گەرچی نۆبڵ بەتەنیا ژیاو كەسی لە پاش بەجێ نەما
تەنیا ئەو كارە پیرۆزەو بە بەهایە نبێت لە جیهاندا .

١٨٢٣/١١/١٩ ڕابـەری دیاری زانستی مرۆڤایـەتی بـەناوبانگ - میلهام كریستیان لۆدویگ
دیلتی - لـە گونـدی - بـەی برنگـی - لەدەوروبەری شاری - فیزیادن - لە
ئـەلمانیا چـاوی بـە جیهـان هـەڵهێناوە - بنەماڵـەی ئـەو زانایـە لەكۆنـەوە
پەیوەندی بە دۆخـەكانی ئاسار باش بووە . دیلتی سەرەتا لـە قوتابخانـە
نـاوخۆیی دەخـوێنێ . دوای ئـەوە لەبـەر باری نـەریتی بنەماڵەكەی دەچێتە
زانكـۆی - هایـدلبرگ - و زانـستی لاهـووتی تیـادا تـەواودەكات و تـا سـاڵی
١٨٥٦ تـاقی كردنـەوەی لاهـووتی بـە ئـەنجام دەگەیـەنێ . دوای ئـەوە بـە
دڵخۆشـكەری بنەماڵەكـەی یەكـەم ئامۆژگـاری خـۆی لەكلێـسا پێـشكەش
دەكات... بەڵام ئەو نیازەی ناگەیەنێتە چارەنووس ... هەر بۆیە وانە وتنەوە
بەلاوە گرنگتر دەبێ و دوای دووساڵ كاری مامۆستایەتی باری تەندروستی
ئاڵۆز دەبێت .
دوای ئـەوە دەچێتە زانكـۆی بـەرلین لەسـەر دەسـتی - فردریش تریندلن
زانـستی مێـژوو فێردەبێـت لـە ئـەنجامی خوێنـدن . لەسـاڵی ١٨٥٠ بـەرە
تیئۆریەكەی خۆی سەبارەت بەزانستی مرۆڤایەتی دادەڕێژێت و بەردەوامیشی
بە بەرەو پێشبردنی دەدا تـا سـاڵی ١٨٦٤ كە تووێژینەوەیـەكی ئـەكادیمیا

لەسەر زانستی ئاکار لای فریدریش ئامادە دەکات .

دوای ئەوە وەك مامۆستا دەچێتە ناو زانکۆو وانە دەڵێتەوە . لە ساڵی ١٨٦٦ لەزانکۆی بازل بانگ هێشت دەکرێت و تا ساڵی ١٨٨٢ لەو زانکۆیە کارەکانی ئەنجام دەدات . دوای گەرانەوەی بۆ ئەلمانیا وەك پرۆفیسۆر تا ساڵی ١٩٠٥ لەزانکۆی – کیل پرسیلا و بەرلین بەسەردەبات تا لەرۆژی ١٩١١/١٠/٣ لەشاری سیرماڵئاوایی دەکات .

ئەم زانایە لەماوەی ژیانیدا ژمارەیەکی کەم بەرهەمە هزریەکانی مێژوویی بەچاپگەیاندووە... بەڵام دوای ماڵئاوایی کۆی بەرهەمەکانی خۆی لە ١٤ بەرگی نایاب دەدا ، لە دوای کۆکردنەوەیان . واتە ئەم مرۆڤە لە ماوەی ژیانی شتێکی وای چاند کە وچاخ کوڵ نەبێت و مێژوو رێزی لێبگرێ و نەوەکانی دوای خۆشی پێ سوودمەند بکات لە وولاتەکەو جیهاندا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٣ .

 ١٨٣٤

١٨٣٤/١/١ گەرۆکی سکوتلاندی– بیلی فریزرجیمس– لە رێگەی شاری ورمێ و رەزائیەو سەردەشت گەیشتە شاری سلێمانی لە رۆژهەلات و باشووری کوردستان – فریزەر – زۆر لە سەر شارەکانی ورمێ و سەردەشت و ناوچەکانی دیکەی نووسیووە ، بە تایبەتی لەبارەی باری کۆمەلایەتی و ژێرخانی ئابووری و پەیوەندی و کۆمەلایەتی لە سەر شاری شاری سلێمانی و دەوورووبەری نووسیووە لەباشوورو رۆژهەلاتی کوردستان.

١٨٣٤/٣/١ نیگار کێشی بەناوبانگی جیهانی– گیرۆم – لە شاری ڤیسۆلی هاوسنووری وولاتی سویسرا چاوی بە جیهان هەڵیهێناوەو هەر لەمنداڵیەوە بە هۆی سەرنجی قووڵی و بیر تیژی دەستی رەنگینی بەهرەی وێنە کێشان دەبێتە مایەی سەرسامی دەوورووبەر، هەروا لە دوا ساڵی خوێندنی خەلاتی یەکەم لە وانەی نیگارکێشی وەردەگرێت لە وولاتەکەدا .

١٨٣٤/٥/١ هاوسەری مەستوورەی ئەردەلان – خەسرەوخان – کە کاتی خۆی بەردەوام بووە بە بەرابواردن لە گەڵ ئافرەتانی جوان و خواردنەوەی زۆر، ئەنجامی

ئەمەش تووشی نەخۆشی دەبێت ، کە مەستوورەخان خۆی لە نووسینەکانی
باسی کردووە کە دەڵێ:-
هاوسەرەکەم تووشی نەخۆشی جەرگ هاتبوو ، کە ئەویش بووە هۆی
مردنی هاوسەری مەستورەی کوردستان .
ئەویش بە بێوەژنی مایەوە , کە سێ کوڕو سێ کچی هەبووەو لەپێناو لێك
نەترازانی شیرازەی خێزانی مەستورەخان لەگەڵ منداڵەکانی ماوەتەوەو
ژیانی بەسەربردوە تاکوو مردنی لەساری سلێمانی لە هەرێمی باشووری
کوردستاندا .



١٨٣٤/١١/١٢ بەهۆی هێنانی هۆزو تیرە عەرەبەکان لە لایەن دەسەڵاتدارانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ ئێراقی ئێستاو بە عەرەبکردنی وولاتی نێوان دوو زێ - خاکی میزۆبۆتامیا - کە ئەمەش بووە هۆی بەرپابوونی شەڕی دژووا
لە نێوان هۆزی شەمەرو عنزە لەنزیك باشووری شاری بەغدا ، ک
ئەنجامەکەی بووە هۆی سەرکەووتنی هۆزی عنزە بە پاڵپشتی هێزەکانی
سووپای عوسمانی، کە بووە هۆی گەمارۆدانی دەووروبەری شاری بەغدا
دروست بوونی باری ئاڵۆزو نالەباری .
هەروا جگە لە بەرپابوونی شەڕ لە نێوان هۆزەکان وەك هۆزی عەقیل لەگەڵ
هێزەکانی سووپای عوسمانی لە١٢/٤ ی هەمان ساڵ ، ئەم هۆکارە ، ک
دەسەڵاتی عوسمانی رەخساندی بەهاتنی عەرەب بەلێشاو بۆ دەووروبەری
شاری بەغداو ناوچەکانی دیکەدا . بە تایبەتی بۆ باکووری شاری بەغدا
بەرەو ناوچەکانی باکووری کوردستان .

١٨٣٤/١٢/٢١ ڕێگەدان بە کەشتی هەمە جۆری هەڵمیەکانی جەنگی بەیتانیا ب
سووڕانەوەیان لەزێی فوڕات ، بە پێی فەرمانی سوڵتانی ئیمپڕاتۆڕیەتی

عوسمان لە هەرێم و ناوچەکەدا .

شـایانی باسـە کـە هـەردوو زێـی دیجلـەو فـوڕت لەچیای ئـەڕاڕاتی خـاکی بـاکووری کوردسـتان هەڵـدەقوڵێ‌و دەسـووڕێتەوە بـە نـاو خـاکی کوردسـتان بەرەو ڕۆژئـاوای کوردسـتان‌و دوایـی بـەرەو باشووری کوردسـتان ، بە بـەرەو خـوارووی ئێـستای خـاکی دامەزرانـدووی ئێـڕاق ، تـا لـە کەنـداوی بـە نـاو عەرەبی دەکاتەوە .

بـەڵام لەڕاسـتیداو بـەپێی مێـژوو کەنـداوی عـەرەب نیـەو گـەر ئـەو کەنـداوە کەنداوی هەر دەسەڵاتێك بێت کەنداوی فارس‌و کوردیە لە ناوچەکەدا .

تێبینی :- نەخشەی هەدوو زێی دیجلەو فورات لە جێگەیدیکە هەیە دەتوانی سەیری بکەیت .

## ١٨٣٥

١٨٣٥/٧/٣ سـوڵتانی ئیمپڕاتۆریـەتی عوسمـانی – سـوڵتان عبدولحەمید- فەرمانیدا بە عـەلی عەشـقەر ، کـە بـچێتە شـاری بەغـدا ، لـە پێنـاو سەرپەرشتی کردنـی هێزەکانی سەربازی بە چوونە سەر محەمەد پاشای ڕواندز بە لە ناووبردنی شۆڕشـەکەی بـەهۆی دژایـەتی کردنـی دەسـەڵاتی عوسمـانی‌و گـەمارۆدانی شۆڕشەکانی کورد بە تایبەتی لەباشووری کوردستان.

## ١٨٣٦




١٨٣٦/٤/١٨ بـــەهۆی لاوازبـــوونی دەســـەڵاتی ئیمـــارەتی ســـۆران ، ئـــەویش لـــە ئـــەنجامی چـــەندین هەڵـــەو ســـەرە ڕۆیـــی لەدەســـەڵات و خـــۆ زاڵکردن و گـوێ نەدانە ئـاوات و ئامانجـەکانی دانیشتووانی ئیمارەتی سۆران و بە پاراستنی بەرژەوەنـدی گـشتی و تایبـەتی مـیری سـۆران – پاشـای کـوێرە – نـەك

بەرژەوەندی گەل و نیشتیمان و بەتایبەتی لە دوای مردنی محەمەد پاشای کۆرە لە هەرێمی باشووری کوردستان .

لەم رۆژەداو رەخسانی باری گوونجاو بۆ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە هێزەکانی سووپای عوسمانی بەفەرمانی سوڵتانی عوسمانی توانیان ناوچەی ئیمارەتی سۆران بە تەواوی بخەنە ژێر دەسەلاتی خۆیان ، کە پارێزگای هەولێر و چەندین شارۆچکەو گوندی سەر بەدهۆك و ئامێدی و جەزیرە بخەنە ژێر دەسەلاتی خۆیان لەباشووری کوردستان.

## ١٨٣٧

١٨٣٧/١/٢٩ کۆچی دوایی رووناکبیرو شاعیری گەورەی بەناو بانگی ڕووسیاو جیهان – پۆشکین – بە هۆی برینە تەشەنەدارەکەی ، کە لە ئەنجامی شەرەشیرێکی دژووار لە ١/٢٧ی هەمان ساڵ زامدار دەبێ و پاش دوو رۆژ ، لە کاتژمێر دوو و چل و پێنج دەقیقەی پاش نیوەڕۆ دواهەناسەی پۆشکین دەبێ و ماڵئاوای لەگەلانی ڕووسیا و جیهان دەکاتلە وولاتەکەیدا ، کە ئەم رووداوە بووە هۆی دڵتەزاندنی هەمووگەلانی ڕووسیا بە تایبەتی و بە گشتی جیهان .

١٨٣٧/٤/٧ دەسەلاتدارانی ئیمپڕاتۆڕیەتی عوسمانی بە سەرکردایەتی– حافز پاشا– چەندین هاوولاتی ئێزیدی لە باشووری کوردستان شەهیدکرد ؛ دوای ئەوە بووە هۆی تالانکردنی ماڵ و ئەنفالکردنی منداڵ و ژنەکانیان لە باشووری کوردستان ، دوای ئەوە بەهەزاران هاوولاتی گوواستەوە بۆناوچەی – نەسیبین– دا .

ئەو بەلگەش پارێزراوە لەبەڵگەنامەکانی دەسەلاتی عوسمانیدا لەشاری ئەستەمبوڵ لە ژێر ژمارە /HH/٥٢٤٨٧.

١٨٣٧/٨/٨ هێزەکانی سووپای ئیمپڕاتۆڕیەتی عوسمانی هێرشی کردە سەر ناوچەی بۆتان لە رۆژهەلاتی کوردستان ، لە ئەنجامدا هێزە چەکدارە کوردەکان توانیان بەرگری لە خۆیان و بوونیان و ناوچەکەیان بکەن و نزیکەی ١٥٠٠ سەربازی تورکی عوسمانی بکووژن و برینداربکەن و هێرشەکەیان تێك بشکێنن و پاشەکشە بەهێزەکانی سووپای عوسمانی بکەن لە هەرێمەکەدا .

## ١٨٣٨

١٨٣٨/٥/١٣ لە دوای بەرگریەکی زۆرو خۆڕاگریەکی بەردەوام بەرامبەر بە هێرشە یەك لە دوای یەکەکانی هێزەکانی سووپای ئیمپراتۆڕیەتی عوسمانی لە سەر خاکی کوردستان . کە لە ئەنجام بووە هۆی سووتاندنی قەڵای سەید بەگ لەلایەن هێزەکانی سووپای عوسمانی لە هەرێمەکەدا .

١٨٣٨/٦/١٤ بەریتانیەکان بەتایبەتی حکوومەتی شانشینی بەریتانیا و لەو ناوەندەش – شافتسیری –بلمرستۆن– و سێ خاڵی گرنگیان ڕاگەیاندا ، لە پێناو بەهێز کردنی جێپێگەی خۆیان لە رۆژ هەڵاتی ناویندا...ئەویش:–

١– دەرکردنی دامەزرێنەری وڵاتی میسر لە نژاد کورد محەمەد عەلی پاشا لە هەرێمی شام ، ئەویش لەپێناو کردنەوەی چوار گۆشەی نێوان وڵاتی میسرو شام .

٢– گەمارۆدانی محەمەد عەلی پاشا لەناووەوەی سنووری وڵاتی میسر لە دوواوەی بیابانی سیناوگۆڕینی بیابانی سینا بۆ – جۆرێك لەدەرخۆنەی فلینە– . بەپێووەدانی تەنگەبەری شوشەی میسریدا کە بەندە بە – کەندی نیل– کە ئەمەش لە ووتاری – رۆتشیلد– هاتبوو... کە ئاراستەی – بلمرستۆن– کراوە لە٢١ /١٨٣٩/٥ دا .

٣– کردنەوەی دەرگاکانی هەرێمی فەلەستین بە کۆچپێکردنی یهودییەکان – جوولەکەکان – بۆ هەرێمی فەلەستینو هاندانیان بەدروست کردنی تۆرێك لەژێر دەستەیی نیشتەجێکردن . کە ئەمەش لە ئامانجی – بلمرستۆن– دا بوو ، بەپشتگیری لێکردن لەلایەن – لۆرد ولینجتۆن– سەرکردەی سووپای بەریتانیا لەقاهیرەو ناپلیۆن لە – واترلو– ... کە زۆر لەراپۆرتەکانو لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیا ، ئەوە دووپات دەکاتەوە ، کە – ولینجتۆن– خاوەنی تیئۆری رووبەڕووبوونەوەی محەمەد عەلی پاشا بووە بە سێ قۆناغ ئەویش:– یەکەم :– دەرکردنی لە شام . دووەم:– گەمارۆدانی لەمیسر. سێیەم :– دروستکردنی پەرژینی دوورە پەرێزی لەنێوان هەردوو وڵاتەکەدا .

١٨٣٨/١١/٢١ لە دایك بوونی – یونس بێجان – عازری لە شاری خووسراوای وڵاتی ئیران ، ئەم مرۆڤە خاوەنی بە دەیان کتێبی بەنرخو چابخانە بووە لە پێناو پەرە

پێدان و ڕۆشنبیرکردنی گەلانی ئێران .

## ١٨٣٩

١٨٣٩/١/١٧ زانای ناوداری فەرەنسا – دگۆر– لە کۆبوونەوەیەکدا لە گەڵ ئەکادیمیەکان ، لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، باسی لەداهێنانەکانی بواری وێنەگرتن دەکات ، لەپێناو پەرەپێدان و بەرەوپێش بردنی لە هەموو بواری وێنەی هەمەجۆر لە جیهاندا .

١٨٣٩/١/٢٥ زانای بە ناوبانگی بەریتانی– ویلیام هندر تالیوت – پیشانگایەکی فۆتۆگرافی خۆی لە کتێبخانەی شانشین لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا کردەووەو بووە جێگەی سەرسوورمانی بینەران لە وڵاتەکەدا .

١٨٣٩/٢/٢ زاناو ڕووناکبیر ناوداری جیهانی لە سویسرا – فریدریك هێیەر– توانی لە سەر پەڕ وێنەی دەست کەوێ بە هۆی کامێرای ئەیسکۆپ کە خۆی بیرۆکەی کارەکەی ئەنجامدا .

١٨٣٩/٣/١٧ سەرکردەی دەسەڵاتی عوسمانی حافز پاشا سەرکردایەتی سووپایەکی بە هێزی کرد ، لە ناوچەکانی ئەرمینیاو سیواس لە باکووری کوردستان ، بەرەو ناوچەکانی شام هەنگاوێناو لەگەڵ ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشای مسر چاویان بەیەك کەوت لە شاری – نزیب– ی ڕۆژ ئاوای زێی فوڕات ، کە ٢٥ کیلۆمەتر لە سنووری سووریای ئێستا دووره ، کە ئەویش بووە هۆی کشانەوەی هێزەکانی حافز پاشا لە دوای شەڕێکی دژووارو لە ئاکام هێزەکانی سووپای عوسمانی شکستیان هێناو پاشەکشەیان کرد لە ناوچەکەدا ، ئەویش بەجێهێشتنی چەك و تەقەمەنی لە گۆڕەپانی شەڕدا .
هەروا هێزەکانی سووپای ئیبراهیم پاشا توانیان ١٦٦ تۆپ و ٢٠هەزار چەك دەست بەسەردابگرن ، کە لەو کات لەناو سووپای عوسمانی سەرکردیەکی ئەڵمانی بەناوی – فۆن مولتکە– سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکرد بەیارمەتی دانی هێزەکانی سووپای عوسمانی لەناوچەکەدا .

١٨٣٩/٣/١٧ لە ئەنجامی شەڕی نێوان هێزەکانی سووپای ئەفگانستانی ئیسلامی و هێزەکانی سووپای بەریتانیا ، لە ئاکامدا هێزەکانی سووپای ئەفگانستان سەرکەووتنیان بە دەست هێنا ، کە شەڕەکە لە بنەڕەتدا لە نێوان ئاینەکانی

ئیسلام‌و مەسیحیەکاندا بوو لە وولاتەکە ، کە ئەم شەڕەش چوار ساڵی خایاند بەیارمەتی دانی هێزەکانی سووپای عوسمانی لەو هەرێمەدا.

١٨٣٩/٣/٢٠ زانای بەناوبانگی فەرەنسی – ئیپۆلین بریاد– لە دوای هەوڵە بەردەوامەکانی توانی وێنەی نێگەتیڤی دەستکەوێ ، کە خزمەتێکی زۆری بەپەرە پێدانی وێنەگرتندا بدات لەفەرنساو دوایی هەنگاوینا بەرەو وولاتانی جیهان .

١٨٣٩/٤/٢١ هێزەکانی سووپای عوسمانی لە زێی دیجلە و فوڕات لە باکووری کوردستان پەڕینەووەو خاکی ژێر دەسەلاتی هێزەکانی سووپاو دەسەلاتی محەمەد علی پاشای والی میسریان داگیرکرد ، . کە ئەنجامی بووە شەڕیکی دژوواری خووێناوی ، کە ناسرابوو بە شەڕی دووەم لە نێوان دەسەلاتی محەمەد عەلی پاشاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لە ئەنجام هێزەکانی سووپای میسر بەسەرکردایەتی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشا سەرکەووتنیان بە دەست هێنا لە هەرێمەکەدا .



١٨٣٩/٦/٢٤ هەڵگرسانی شەڕی نەسیبین لە نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانی و هێزەکانی سووپای میسر ، بە سەرکردایەتی ئیبراهیم پاشا ، لە ئەنجام هێزەکانی سووپای عوسمانی تێکشکێنران‌و بووە هۆی کشانەوەی پاپۆرە جەنگیەکانی عوسمانی بۆکەنارەکانی میسر، لە و کاتەشدا محەمەد عەلی پاشا ماوەی بەهێزەکانی نەدا لە چیای تۆرۆس بپەڕنەووە .

هەر لەو کات دەسەلاتی عوسمانی داوای مۆرکردنی ڕێکەووتنامەی ئاشتی لەگەڵ محەمەد عەلی پاشا کرد ، بەمەرجێ دان بە دەسەلاتی بنەماڵەی محەمەد

عەلی پاشا بنێ لەسەر میسرو فەڵەستین و سووریای ئێستا .
ئــەویش بــە ناچــار بــوونی ســوڵتان عەبدولحەمیــدو وەزیرەکــان بــەجێ بەجێکردنی داوا کــە ... ئــەویش بەهۆی هــەڵاتنی سووپایەکەیان ولە هــەمان کــات بــەهۆی مردنــی ســوڵتان و هــاتنی مــەحمودی دووەم لــە ناکــاوی و ناچاربوونیان بەمۆرکردنی ڕێکەوتنامەکە لە نێوان هەردوو لایاندا .

١٨٣٩/٧/١ کۆچــی دوایــی ســوڵتان عوسمــان مــەحمودی دووەم ، بــە هــۆی چــەندین نەخۆشی، دوای خۆی کوڕەکەی عەبدولمەجید جێگەی گرتــەوە بەسوڵتانی عوسمانی ، کە حەزی لە گۆڕانکاری سەردەمی دەکردو داوای لە ڕەشید پاشا کرد بگەڕێتەوە ئەستەمبوڵ ، کە ئەوکات بالوێزی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بــوو ، لــە شــاری لەنــدەنی پایتــەختی بەریتانیا و کردیــە ســەرەك وەزیرانــی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیکان .

١٨٣٩/٧/٢ لە دوای سوڵتانی عوسمانی سوڵتان مەحمودخانی دووەم ، کە لە تەمەنی ٥٤ ســاڵیدا کۆچــی دوایــی کــردوو ماوەی ٣١ ســاڵ دەســەڵاتداربووە ، لــە دوای خۆی کوڕەکەی عەبدولمەجید خان جێگەی گرتەوە.
شایانی باسە کە دەسەڵاتە یەك لە دوای یەکەکانی دەسەڵاتی ئیمراتۆریــەتی عوسمــانی لــە ســەرەتای دامەزرانــدنیان تــاکوو کۆتــایی هاتنیــان لەجــەنگی یەکەمی جیهان ، لە ناو چەند بنەماڵەیەکی براو برازاو کوڕو باوك خوولایتەوە ، وەك بنە ماڵە لە دەسەڵاتەکانیاندا .

١٨٣٩/١٠/١٩ لەدایك بوونی ڕووناکبیرو پێشەنگی نوێ خوازی – پۆل سیزار– لە گووندی – ئیکس ئاوبرۆفانس– لە فەڕەنسا.

١٨٣٩/١١/٣ دەرچــوونی – یاســای خــەتی شــەریفی... گوڵخانــە– لەلایــەن دەســەڵاتی ئیمپڕاتۆڕیــەتی عوسمــانی ، لــە پێنــاو چارەســەرکردنی کێــشەی زەوی کــشتووکاڵی و چاکــسازی کــردن . کــە بەشــێکی زۆر لــە زەوی خــاکی کوردستانی لــە خــۆدەگرت ، ئــەویش لــەپێناو بــەتورك کــردن و داگیر کردنــی خاکی کوردستان .

١٨٣٩/١١/٢١یەکەم شاند لە ژێر دەسەڵاتی محەمەد عەلی پاشا لە میسر ، کە پێك هاتبوون لەحــەوت کەســایەتی ئایینی لــە پێنــاو چوونیان بــۆ شــاری ئەســتەمبوڵ بــە مەبەســتی یارمــەتی دان لــە بــواری فێرکــردن ، ئــەویش لــە پێنــاو کردنــەوەی

خانووی هەتیوان و پۆلەکانی خووێندن ... واتە کردنەوەی قوتابخانە لە سەر خەرجی دەسەڵاتی میسر ، کە لەو کات ژمارەی قوتابییان دەگەیشتە ٢٥٠ قوتابی لەشارەکەدا .

## ١٨٤٠

١٨٤٠/٣/٥ لە دوای هەرەس هێنان و سەرنەکەووتنی چاوپێکەووتن لەگفتووگۆی نێوان لایەنەکانی عوسمانی لە گەڵ فەرەنساو بەریتانیاو لەلایەکی دیکە لە گەڵ دەسەلاتی محەمەد عەلی پاشا ، کە لە ئەنجام بووە هۆی گرێدانی کۆنگرەی بە سەرکەووتن ، لە کشانەوەی فەرەنساو هەوڵی ڕیکەووتنی ڕاستەوخۆی لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و محەمەد عەلی پاشا ، لە هەمان کات هاندانی دان بەرەتکردنەوەی داواکانی بەریتانیا.

کە ڕێکەووتنەکە لە سەر چوار خاڵ مۆرکرا بوو، ئەویش:- لە بەرژەووەندی دەسەلاتی عوسمانی و بەریتانیاو فەرەنسا بوو، نەك لە بەرژەووەندی محەمەد عەلی پاشا ، کە ئەویش بەپێی بەرژەووەندی هەریەکەیان بەرامبەر گەمارۆدانی هەوڵەکانی محەمەد عەلی پاشاو نیازەکانی لە کیشووەری ئاسیادا .

١٨٤٠/٥/٧ لە دایك بوونی زاناو ڕووناکبیرو هونەرمەندی ڕووسی و جیهانی پیتەرئیلیش - مایکۆفسکی- لە شاری ڤودکنسکی سەر بەشاری پترۆسبۆرگی پایتەختی ئەو سای ڕووسیای قەیسەری ، کە خاوەنی سیمفۆنیای مێژوویی و بۆتە کەلتوورێکی نەتەوەیی و نیشتمانی گەلانی ڕووسیا و جیهان .

١٨٤٠/٦/٨ لە دوای تێپەڕ بوونی ساڵێك بەسەر شەڕی - تزیب- لەنێوان پێك هاتە ئایینی ونەتەوەیەکان لە لوبنان ، ژمارەیەکی زۆر لە شێخەکانی



دروزومەسیحی و مەزهەب شیعەو سوونته لە گوندی – ئەنتلیاس – کە دەکەوێتە سەر کەناری دەریای باکووری شاری بەیروت ، بە ئەنجامدانی کۆبوونەوە لە گۆڕستانی – قەدیس – کە تەنیا گۆڕێکی پیرۆزو هەموو پێك هاتەکانی لوبنان سەردانیان دەکەن.. لەوکۆبونەوە هەموویان پەیمانیاندا ، لەپێناو هاوکاری و هەماهەنگی ویەکگرتن لەپێناو راپەڕینی گشتی دژی دەسەلاتی میسر بە پەیمانی بەردەوامی تێکۆشانیان ، تا بەدەست هێنانی سەر بەخویی لوبنان یان مردن لە وولاتەکەدا .

هەروا لە کۆتایی کۆبوونەوەکە – فرنسیس ئەلخازن – یان بە سەرۆکی خۆیان هەڵبژارد... شایانی باسە کە ئەو شەڕەش لەبەیانی رۆژی ١٨٩٣/٦/٢٤ بەرپابوو لە نێوان پێك هاتە نەتەوەیی و ئاینیەکان لە گەل هێزەکانی سووپای میسر ، بەفیتی بەریتانیاو فەرەنسا لەپێناو سود وەرگرتن و خۆ زاڵکردن بە سەر وولاتەکەدا لە هەموو بوارە جیا جیاکاندا .

١٨٤٠/٦/١٥ مۆرکردنی پەیمانی لەندەن لە نێوان بەریتانیاو نەمساو بڕووسیاوئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی ، بە داننان بە دەسەڵاتی محەمەد عەلی پاشا ، لەسەر میسرِ وەك شانشین . هەروا لەسەر فەلەستین و شام هەتا هەتایە ، بە مەرجیٚ محەمەد عەلی پاشا دان بە دەسەڵاتی باڵای عوسمانی بنیٚ لەسەر ناوچەکەدا .

شایانی باسە کە چەندین جار پەیمان و رێکەوتنامەی لەو جۆرە لە نێوانیاندا مۆرکرابوون ، بەلاّم بە هۆی دەست تێووەردان هەڵدەوەشایەوە بەپێی بەرژەووەندی هەمەلایەنەی وولاتانی ئەوروپا ، لە بوونی ترسی دوا ڕۆژیان لە لێهاتوویی بنەماڵەی محەمەد عەلی پاشا ، ناسراو بە – بنەماڵەی خدێوی – کە لە نژادا کوردبوون.

١٨٤٠/٧/١٥ مۆرکردنی محەمەد عەلی پاشا ، لە سەر پەیمانی لەندەن بە هۆی باری بارودۆخەکەو کەم کردنەوەی هێزەکانی سووپا بوو. لە شام و فەلەستین ، ئەویش بەکشاندنەوەی هێزەکانی سووپا بۆمیسرِ، کە لەو کاتەدا ئیبراهیم پاشای کوڕی سەرکردایەتی و دەسەڵاتی ناوچەکەی هەڵدەسوڕاند لە هەرێمەکەدا .

١٨٤٠/٩/١٧ مۆرکردنی ڕێکەووتنامە لە نێوان بەریتاناو بڕووسیاو ڕووسیا لەلایەك لە گەڵ ئیمپڕاتۆڕیەتی عوسمانی ، لە پێناو هێورکردنەوەی بارودۆخی- لیفانت - و لە هەمان کات ماوەدان بە محەمەد عەلی پاشا لەلایەن سوڵتانی عوسمانی ، لەبەڕێووەبردنی کاروو باری دەسەلاتی میسر ، و ناوزەند بوونی تا مردن بە پاشای عەکای هەرێمی شام ، کە شام ئەوکات بریتی بوو لە سووریاو فەلەستین و ئوردنی ئێستا لە ناوچەکەدا .

١٨٤٠/٩/٢١ لە دایك بوونی سوڵتان موڕادخانی پێنجەمی کوڕی سوڵتان عەبدولمەجیدی سوڵتانی عوسمانی لە شاری ئەستەمبوڵ .

١٨٤٠/١١/١ لەدایك بوونی پەیکەرتاش ونیگار کێشی ناووداری فەڕەنسا - ئۆگێست جان رۆدانی- لە شاری پاریسی پایتەختی فەڕەنسا.

١٨٤٠/١٢/ نامەی دووەمی - بلمرستۆن- بۆ باڵێوزی بەریتانیا لەئەستەمبوڵی تورکیا کە دەنوسێ:- ئەویش بە رازی کردنی سوڵتانی عوسمانی و لایەنگیرانی و سوڵتان بەخۆی ، کە محەمەد عەلی پاشا دووبارە هەوڵدەدات ، گەر ماوەی هەبێ بگەڕێتەوە هەرێمی شام ، بە دامەزراندنی خەلافەتی نوێ رادەگەیەنێ ، ئەویش بەلاسایی کردنەوەی خەلافەتی ئەمەویەکان.

هەروا داوا لە عەرەب دەکات بەدامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی گەوورە لەپێناو کۆکردنەوەیان بە هاوسەنگی لە رۆژهەلاتی خواروی دەریای سپی . کە ئەمەش دەبێتە هۆی لەناووبردنی دەسەلاتی عوسمانی و رەش کردنەوەی ئاسەواری تورك وەك ئیمپراتۆریەت و دەوڵەتدا .

ئەمەش لەسەر سوڵتان ئەرکە ، کە گەمارۆی محەمەد عەلی پاسا بدات و دووری بخاتەوە لە هەرێمەکە . لە بەرئەوەی محەمەد عەلی پاسا ئاواتی بەرەو دەریای سوورو هەرێمی عەدەن بوو بۆ بەهێزکردنی دەسەلاتەکە بە هاوکاری لایەنگرەکانی لە ناوچەو هەرێمەکانا ... هەروەها لەناو نامەکە دەڵێ:-

ئینگلیز ئامادەیە دەستی یارمەتی بۆ سوڵتانی عوسمانی و لایەنگرانی درێژ بکات ، بەتایبەتی بە جێ بەجێکردنی پرۆژەی دروست کردنی ژێر دەستەی جێنشین کردنی یهودیەکان لە فەلەستین و یارمەتیدانیان ، کە ئەم کارەش

دەبێتە هۆکاری دوور خستنەوەی محەمەد عەلی پاشا لە هەڕەشە کردن لە دەوولەتی عوسمانی لەناوچەو هەرێمەکاندا .

## ١٨٤١

١٨٤١/٢/٢٣ هەڵوەشاندەوەی پەیمانی بەرگری سەربازی -خوونکار ئیسکلەسی- لە نێوان ڕووسیای قەیسەری و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، لە ئەویش ڕێگەی داکۆکی کردنی بەردەوامی دبلۆماسیەتی بەریتانیاو فەرەنسا.
کە بەند بووە بە تێپەڕ بوونی کەشتیەکانی ڕووسیای قەیسەری لە تەنگە بەرەکانی ژێر دەسەلاتی عوسمانی ، لەوکاتەش بەبێ چاودێری بوون ، کە فەرەنساو بەریتانیا توانیان ڕێکەووتن لەگەڵ وولاتانی دیکە ئەنجام بدەن ، هەتا لەگەڵ ڕووسیاش بەمانەوەی داخستنی ، تەنگە بەرەکان - مزیق- بەرامبەر بەهەموو وولاتان بەبێ جیاوازی بەمۆرکردنی پەیمانی ناوزەندکراو بەناوی پەیمانی -تەنگە بەرەکان- لە ناوچەو هەرێمەکان لە جیهاندا .

١٨٤١/٢/٢٥ لە دایك بوونی وێنە کێشی فەرەنسی بەناوبانگ - ئۆگست ڕینوار- لە شاری لیموکی باشووری فەرەنسا.

١٨٤١/٦/١ لە فەرمانێکی سوڵتانی عوسمانی ، کە ماوەی ١٠دە ڕۆژی بە پاشای میسر محەمەد عەلی پاشا دا ، بۆ ڕەزامەندیکردن لە سەر فەرمانی سوڵتان . لەبارەی مەرجەکانی دەسەلات پێدراوی محەمەد عەلی پاشا لەسەر میسر بەخۆیی بنەماڵەکەی بەبێ سنووری دیاریکراوی مێژوویی لە لایەن سوڵتانی عوسملنیەکان .

## ١٨٤٢



١٨٤٢/٣/١٨ نووسەر و شاعیری فەرەنسی – ستیڤان تۆمافلۆران مالارمیٚ – لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە . لە تەمەنی پێنج ساڵیدا دایکی کۆچی دوایی دەکات .

بەڵام بەر لەوەی تووشی نا لە باری ژیان بێت ، باوکی بەرگری لێدەکات و بەشێوەیەکی رێك وپێك لەقوتابخانەوماڵەوە چاودێری باشی دەکات و هەوڵی فێرکردنی دەدا . جێگەی ئاماژە پێکردنە کە تاکوو ئێستا لە فەرەنسا چەندین رێچکەی شیعری سەریان هەڵداوە ..

بەڵام رێچکەی ستیڤان زۆر کاریگەرە ، کە رووخسارێکی بەرچاوی شاعیرانی فەرەنساو ئەوروپادا ، هەر دیارەو وونبوونی بۆ نیە. لە بەر پەیوەندی باشی لەگەڵ بنەماڵەی دبوای بەناوبانگ هەبوو ... کە ئەم بنەماڵەیە دوای هاتنە سەر دەسەڵاتی – لویس پۆناپارت – و دروستبوونی کۆماری دووەمی فەرەنسا لە ساڵی ١٨٤٨ .

لە فەرنسا پلەو پایەیان بەرزدەبێتەوە بەمەش کارەکانی باوکی مالارمیٚ مەیسەر دەبێت لەهەموو بوارەکاندا ، بەڵام دوای ئەوەی کە تەمەنی مالارمیٚ دەگاتە ٩ ساڵان باوکیشی کۆچی دوایی دەکات و لەلایەن باپیری ژیان بەسەر دەبات لەگەڵ هەموو نالەباریەك ... گەرچی هەر لە تەمەنی منالیەوە بلیمەتی لێبەدەر دەکەوێت و لە ساڵی ١٨٥٤ دارێژتنێکی جوان دەونووسێت . لە ساڵی ١٨٥٨ وەك لاسایی کردنەوە – فریشتەی پاسەوان – ی شیللەر بابەتێك بەناوی ئەوەی کە سیٚ لەق لەقەکە گوویتان – دەنووسێت .

دوای ئـەوە دەسـت دەکا بـە نووسینی شیعر کـە دوای مردنـی بـاوکی خـۆی بەناوی – لە نێوان چوار دیواردا – بۆی بڵاودەکرێتەوە ... دوای ئەوە لەساڵی ١٨٦٠ پەیوەنـدی بەدیسمۆلین دەکـات ، کـە پیـاوێکی توانـادار بـوو وبایـەخی پێـــدەدات لـــەنزیك قرســـاش نیـــشتەجێ دەکـــات ... لەســـاڵی ١٨٧١ توویژینەوەیـەکی کاریگـەر بـۆ یـادی بـودلێر دەنووسێت ، لەساڵی ١٨٧٣ شیعری دیوانی – ئیگیتۆر – بڵاودەکاتەوە .

ئەم نووسەرەو شاعیرە لەماوەی ژیانیدا بەردەوام دەبێت لە نووسین سـەرەرای نا لـە باری بـاری ژیـان و کردنـی ئـەم لاو ئـەو لا تـاکوو لـە ١٨٩٨/٩/٨ کۆچی دوایی بە ماڵئاوایی لە وولات و شیعردۆستان دەکات لەوولاتەکەیدا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بە دەوی – بەرگی /٢ .

١٨٤٢/٨/٢٨ هێـزە دەریایـەکانی سـووپای بـەریتانیا ، لـە هێرشـێکی بـەرفراوان توانیـان شـاری – کـانتۆنی – چینـی داگیر بکـەن ،، واتـە چینـی مللـی ئێـستا ،، لـە هەمان کاتدا سووپای پیادەی توانی شاری – شـەنگهای – داگیر بکـات ، کـە بەندەری شەنگەهای بەندەرێکی گرنگ بوو لە بەندەرەکانی چیندا .

بەڵام بەریتانیا گەمارۆی لەسـەر کـانتۆن هەڵنـەگرت و هێزەکـانی لـە شـەنگهای نەکـــشاندەوە ، تـــا دوای مـــۆرکردنی ڕێکەووتنامـــە، کـــە ناســـراوبوو بەڕێکەووتنامـەی – نـانکین– کـە مـاوەی چینـی دەدا بـە هێنـانی مـادەی بێهۆشـکەر لـە بەنـدەرەکانی کـانتۆن و ئـامۆی و فوزهـۆو شـەنگهای و لینگیـا لەهەرێمەکەدا .

١٨٤٢/٩/٢٢ لە دایك بوونی سوڵتانی عوسمانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم کە ڕۆڵی گرنگـی هـەبوو لـە ئـازاردان و ئەشـکەنجەدان و دەربـەدەرکردنی گـەلانی ژێـر دەسـەلاتەکەی بەتایبـەتی گـەلی کـورد لەسـەر خـاکی کوردسـتان لـە هـەموو بوارەکاندا .

ئەویش لە پێناو بەتورك کردن ، بەڕاگوێزانی کورد لەسەر خاکی کوردستان بەگشتی و باکووری کوردستان بە تایبەتی ، لەلایەك بە ناوی ئایینی ئیسلام لەلایـەکی دیکـە بـەناوی نەتـەوەیی و لەلایـەنی سـێیەم بـەهۆی دڕنـدەیی دەسەڵاتەکەیان .

١٨٤٢/١١/١٧ لەدوای دەست بەسەراگرتنی ئیمارەتی سۆران و خۆ بە دەستەوەدانی ئەمیر محەمەد پاشای رواندز ، کە لەوکاتە ناوچەی عەمادیە لە ژێر دەستیدا بووە ، لەو کاتەش هەردوو والی بەغدا عەلی رەزاو والی موسل محەمەد ئینجە داوای سنجەقی عەمادیەیان دەکرد ، بە پێی بەڵگەنامەی عوسمانی بەژمارە ٢٢٣٠٥/ HH/ لە ساڵی ١٨٣٧ ، وفەرمانی سوڵتان مەحمودی پێچراوکراو بوو ، ئەویش بەدەستگیرکردنی محەمەد پاشا لە دەریای رەش لە نزیك بەندەری سامسۆن ونگرۆیون .

هەروا لە برگەی یەکەمی داواکاری والی بەغدا بەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەڵاتی محەمەد پاشای رواندزی بوون بەرامبەر رەوانەکردنی یەك ملیۆن قرس بۆ ئەستەمبوڵ ئەویش بەپێی بەڵگەنامەی (M78.1N\A SIRE\DVN.A) کە ئەو بەڵگەنامەیە ئەوە دەسەلمێنێ کە سنجەقەکانی عەمادیە لە باشووری کوردستان و ماردین لە باکووری کوردستان ناحیەکانی جەزیرەی عمرو بۆتانی بەوویلایەتی موسل لکێنرا.

١٨٤٢/١٢/٩ لە دایك بوونی ئەمیری رووسیاو یەکێك لەسەرکردەکانی فەوزەوی - کروبۆتکین - لە شاری مۆسکۆی رووسای یەکگرتوو ... کاری لەگەڵ دەسەڵاتدارانی رووسیای قەیسەری کردووە ... خوێندنی بەزانست دەست پێکردووە ... دوای بوونی بەئەفسەر لەهەرێمی سیبریا دامەزرا . رێکخراوە نیمچە کۆمۆنیستەکان کاردانەوەی لەسەر بیروبۆچوونی کرد .. دوای ماوەیەك وازی لەخزمەتی سەربازی هێناو دەستی بەخوێندنی ماتماتیك کرد ، لە زانکۆی پترسیورگ و هەروا خوێندنی جووگرافیاشی دەست پێکرد . ئەم زانایە هەڵسا بەراستکردنەوەی نەخشەکانی باکووری ئاسیا لە تووێژینەوەیکی جیۆلۆجی لەفنلەندا و سوید .

لە ساڵی ١٨٧٢ پەیوەندی بەجوولانەوەی کرێکاران لەسویسرا کرد . دوای گەرانەوەی بۆ رووسیا چووە رێزی جوولانەوەی - عدمیین - کەلەو کاتە - ن.ن-تشایکۆفسکی - و کە - سرجیۆس - سەرکردایەتیان دەکرد ... کە لە نێوان دوولابالی لیبرالیەکان و سۆشیالیستەکان کاریان دەکرد ، لەساڵی

١٨٧٤ دەستگیرکرا و دوایی لەبەندیخانە هەڵات و لەساڵی ١٨٧٦ روویکرد
لەندەنی پایتەختی بەریتانیا .
ئەم زانایە دژی بیروبۆچوونەکانی باکۆنین وەستا لەبارەی کشتووکاڵ
ودابەشی سامان . کە ئەو هەڵگری بیری – لكل إنسان بحسب حاجاته – بوو
ئەویش بەهۆی بوونی بەرهەمی زیاد و بە هۆی پەرەسەندن و پێشکەوتنی
زانستی و تەکنەلۆژیا ... دوای ئەوە لەشاری ژنێف گۆڤاریکی بەناوی –
یاخیبووەکان – دەرکرد لەساڵی ١٨٧٩ ، و بەڵام دوایی لەساڵی ١٨٨١
لەژنێف دەرکرا .
دوای ئەوە لەساڵی ١٨٨٦ بەشێوەیەکی یەکجاری لە شاری لەندەن
پایتەختی بەریتانیا جێنشین بوو . گۆڤاریکی دیکەی بەناوی – ئازادی –
بڵاوکردەوە... دوای ئەوە لەساڵی ١٨٩٥ چووە ئەمەریکاو پەیوەندی لەگەڵ
فەوزەویە ئەمەریکیەکان کرد . لە ساڵی ١٩١٧ گەراوە رووسیا و بەژداری لە
هیچ حکوومەتێك نەکرد لە دوای رووخاندنی رژێمی قەیسەری لە ١٩١٧/٣/١٥
. ئەم مرۆڤە لەکارەکانی بەردەوام بووە تاکوو لە ١٩٢١/٢/٢٨ لەناوچەی
دیمترۆف لەنزیك شاری مۆسکۆ کۆچی دوایی دەکات .
دوای مردنی مۆزەخانەیەك بەناوی – کربۆپکن – دەکرێتەوە ، بەڵام
دەسەڵاتی ستالین لە ساڵی ١٩٣٨ ئەو مۆزەخانەیە دادەخات لە شاری
مۆسکۆی سۆڤیەتی جاران لە وڵاتەکەدا .

١٨٤٢/١٢/١٣ هێزەکانی سووپای عوسمانی لە رۆژی دووەمی جەژنی قوربان توانیان
گەمارۆی شاری کەربەلای مەڵبەندی مەزهەب شیعەی ئیسلام لە باشووری
ئێستای شاری بەغدا ، بدەن و لە دوای شەڕێکی توند توانیان شارەکە داگیر
بکەن ، دوای ئەوە بووە هۆی تاڵان کردن و سووتاندن و وێرانکردن لە
شارەکەدا .

## ١٨٤٣

١٨٤٣/٥/١٥ گرێـــدانی کـــۆنگرەی ئـــەرزەڕۆم لـــە بـــاکووری کوردســـتان لـــە پێنـــاو چارەسـەرکردنی گرفتـەکان ، کـە نووێنـەری چوار دەوڵـەت بەشداریان تێدا کرد ئەوانیش :-

١- میرزا تەقی خان نووێنەری ئێران . ٢- نووێنـەری دەسەڵاتی عوسمانی ئەنور ئەفەندی . ٣- نووێنەری حکوومەتی بەریتانیا کۆلۆنێل فارانت . ٤- نووێنەری ڕووسیای قەیسەری کۆلۆنیل دانیزدا ... کە کۆنگرە بۆ مـاوەی چـوار کاتـژمێر. بـەردەوام بـوو، کـە بـووە هـۆی ئـەوەی ، کـە کێشەکان زیـاتر بەرەو ئـالۆزی تەشـەنەدارتر هـەنگاو بنـێ لـە نێوان بەشــداربووانی کۆنگرەکــە . بــە تایبــەتی لــە بوارەکــانی رامیــاری و ئابووری و سەربازی و بازرگانی لە جیهاندا .

١٨٤٣/١١/١٩ لـە دایك بـوونی دامەزرێنـەری - النزعة النقدیة التجریبیة - ئەڤناریس ، لە شاری براگی پایتـەختی تشیکۆسلۆڤاکیای پێشوو ... لە دوای تـەواوکردنی قۆناخەکانی خوێندن چووە زانکۆی لیبتسك ، دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٧٦ بەمامۆستا دامـەزراو لەسـاڵی ١٨٧٧ بەشـێووەیەکی فـەرمی بووە مامۆستای زانکۆ لە زانکۆی زیورخ .

گـرنگترین دانراوەکـانی - نقـد التجربـة المحـضة - لـەدوو بەرگـدا لـەنێوان ســاڵەکانی ١٨٨٨-١٨٩٠ ... لــەم دانراوەیــدا دژی بیروبۆچــوونەکانی دامەزرێنەری یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو - لینین - وەستا . ئەم فەیلەسوفە لە ١٨٩٦/٨/١٨ کۆچی دوایی کردوە .

## ١٨٤٤

١٨٤٤/١/٢٢ پێکهێنـانی مەزهـەبی بەهائیـەکان ، لـە ژێـر چاوودێری ڕووسـیای قەیـسەریو جوولەکەکانی لە جیهانو بەریتانیا ، لە پێنـاو بۆ گـەنکردنی بـڕووای ئـاینی ئیسلامو لێکترازانـدنی ئـەو یەکیەتیـەی کـە لـە ئەنجامـدانی ڕێوورەسـمەکانی ئایینی ئەنجامیاندەدا ، بە دوورخستنەوەیان لە بڕووا بنەڕەتیەکان بە بیروو

بۆ چوونی هەڵوویستی ، بە بەهائیەکان کە لەلایەن بەهامەهدیە پێکهاتبوو ، کە داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد لە جیهانی ئیسلام دا .




١٨٤٤/٢/٢٧ وولاتـی دۆمـەنیکان لـە دوای چـەندین جـار لـە داگیرکـردن لەلایـەن هێزەکـانی سـووپای ئیسپانیاو هایتیـەکان ، کە دواجار وولاتەکەیان ڕزگـارکرد، بەدامەزرانـدنی کۆمـاری دۆمـەنیکان بەسـەرکردایەتی – بدرۆسـانتانا– کـە بـووە یەکـەم سـەرۆکی وڵاتـەکـە لـە کێشووەرەکەدا .

هـەروا ئێـستا نـاوی پایەختەکـەی –رۆزۆ– یـە و ژمـارەی دانیـشتووانەکەی ١٧,٦٥٠ هـەزار کەسـە . هـەروا ژمـارەی دانیـشتووانی وولاتەکـەی ٦٥,٨٦٥ هـەزار کەسە . هـەروا رووبـەری وولاتەکـەی ،٨٥١ کیلـۆ مـەتر چـوار گۆشـەیە . هـەروا چـڕی دانیشتوانی ، ٢٢٧ کـەس لـە یـەك میـل چـوار گۆشـەدا . هـەروا نـژادەکانی ، زۆربـەی دانیـشتوانەکەی لـە ئەفەریکیەکانـەو لـە هـەمان کـات هاوولاتی کاریبیشی تیایە . لە وولاتەکەدا .

١٨٤٤/٧/٢٧ کۆچـی دوایـی زانـای گەردیلـە – الـذرة – ی بـەریتانی–جـۆن هـالتۆن– لـە شاری لەندەنی پایەختی بەریتانیا.

## ١٨٤٦

١٨٤٦/١/٥ لـە دایـك بـوونی فەیلەسـوفی ئـەلمانی – رودلـف ئـویکن – لـە ئـۆرش – لـە – فریزلنـدی رۆژهـەڵات – خووێنـدنی لـەزانکۆی گیتـنگن تـەواوکردووە لەسـەر دەستی تیشملر . بروانامەی دکتۆرای یەکەمی لە فیلۆلوجیاو مێژووی کۆن بەدەسـت هێنـاوە ... وانـەی لەقوتابخانـە ناوەندیـەکان گووتۆتـەوەو لـە سـاڵی ١٨٦٧ تا ١٨٧١ لە هۆسۆم و شاری بەرلین و فرانکفۆرت ... لەساڵی ١٨٧٦

بووەتە مامۆستای فەلسەفە لەشاری بازلی سویسرا .

دوای ئـەوە گوواسـتراوەتەوە بـۆ زانکـۆی بیتـا لـە سـالّی ١٨٧٤ ... دوای خانەنـشین کردنـی لـە سالّی ١٩٢٠ دەسـتی بەوانـە وتنـەوە کردیـە ... لەسالّی ١٩٠٨ پاداشـتی نـۆبلّی لـەئاداب بەدەسـت هێنـاوە ، ئـەم فەیلەسـوفە چـەندین دانراوی بەپێزی بەرهەم هێناوە وەك : -

مێـــژووی زاراوەی فەلـــسەفە و نـــاوەرۆکی راســـتەقینەی ئـــاین و کێـــشە سـەرەکیەکانی فەلـسەفەی ئاینی، لـە گـەڵ چـەندین بەرهـەمی دیکـەو بـەردەوام بووە تاکوو لە ١٩٢٩/٩/١٦ کۆچی دوایی کردووە لەبیتای ئەلمانیا.

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی /٣ .

١٨٤٦/٦/١٢ لە پێناو بە دەسـت هێنـانی زانیـاری . دوو میـسیۆنێری ئەمـەریکی بەنـاوی - رایس ، و، پرێس- سـەردانی میر بەدرخانیان کرد کە نزیکـەی ٢٣ ڕۆژ لـە باکووری کوردستان مانـەوە ، لـە ناوچـەی- دێرگـولّ- لـە بـارەی بـاری کـوردو خـاکی کوردسـتان و کێـشە ڕووبەڕووبوونـەوەکانیان ، لـە نێـوان ڕامیاریـەتی ئیمپراتۆرپەتی عوسمانی و گـەلی کوردسـتان ، بـە لـە کارلێکردنی ڕامیاریـەتی وولاّتـانی فەڕەنساو بەریتانیاو ڕووسیای قەیسەری و ئیمپراتۆرپەتی فارسـی لە کوردستان.



١٨٤٦/١٠/٦ لــە دایــك بـــوونی یەکـــەمین داهێنـەری پیـشەسازی کارەبـا لـە شـــاری - ســـێنتول بـــریج - ی شـــاری نیـــورۆکی ئەمـــەریکی - جـــۆرج وویـــستینگهاوس - بیزنیـــسمان ، کـــە ئەنـــدازیارێکی ئەمەریکیـــەو بـــە داهێنـــەری ئێربرێکەری هێڵی شەمەندەفەر و ڕۆتـــۆری ئـــامێری هـــەڵمی و پیـــــشەسازی کارەبـــــا و دامەزرێنـەری سیـستەمی ووزەی

کارەبا دادەنرێت .
جێگەی ڕوونکردنەوەیە کە جۆرج لە تەمەنی منداڵیدا لە کارگەکەی باوکیدا خەریکی دروستکردنی ئامێرەکانی کشتووکاڵ بوو و لە هەمان کات کاری دەکرد ... ئەمەش بووە هۆی ڕاکێشانی تەواوی سەرنجی جۆرج بەلای ماکینەو ئامێرەکاندا ، هەروا لە کاتی جەنگی ناوخۆی ئەمەریکادا لە تەمەنی شانزە ساڵی جۆرج پەیووەندی بەهێزی دەریاوانی سەربازی کرد ، لەکاتی جەنگەکەدا لە هەردوو بەشی سووپا و دەریاوانیدا کاری دەکرد ، دوای ۳ ساڵ لە خزمەتی سووپا ، کاتێك جەنگ کۆتایی هات لە ساڵی ١٨٦٥ دا، و لە تەمەنی ١٩ ساڵیدا یەکەمین داهێنانی خۆی ، کە رۆتۆری ئامێری هەڵمی بوو ، لەساڵی ١٨٦٧ دا لەگەڵ مارگرینائیرسکین والتەر – خێزانی پێکهێنا .
دوای ئەوە لە داهێنانە هەرە گرنگەکانی کە لە ساڵی ١٨٦٩ دا هێنایە ئاراوە ؛ دانانی ئیربرێکەر بوو بۆ شەمەندەفەر و فارگۆنەکان ... ئەمەش وایکرد کە بتوانرێت شەمەندەفەرەکان بە خێرایی بووەستێنرێن و بە ڕادەیەکی بەرچاویش سەلامەتی دەستەبەربکەن ، لە ساڵی ١٨٨١ سیگناڵی ئۆتۆماتیکی کارەبایی Automatic electric block signa
وا پەرەپێدا کە تووانی سەلامەتیەکی بەرچاو لە بوواری سیستەمی هێڵی شەمەندەفەردا جێگیربکات ، هەروا ئەم ئامێرەش بە جۆرێکی گەوورە چووستی هێڵی گوواستنەوەی زیاد کردوو ڕووداوی تێکشکانی شەمەندەفەری کەمکردەوە .
هەروا جۆرج ڕێگەیەکی گرنگتری بۆ ئاسانکاری گوواستنەوەی گازی سرووشتی بۆماڵەکان و هەروا بەکارهێنانی بۆ مەبەستی گەرمکردنەوە و ڕووناکردنەوە دۆزیەوە ... هەروا جۆرج تووانی سامانی داهێنانەکانی لە بوواری بازرگانی و وەبەرهێناندا بەکاربردوو لەماوەی چەند ساڵێك تووانی سامانێکی باش پێکەوەنێت و لە ساڵی ١٨٨٦ دا کۆمپانیایەکی ویستینگهاوسی کارەبایی بۆ پەرەپێدانی ووزەو ئامێری کارەبایی دامەزراند .
دوای ئەوە ویستینگهاوس مافی داهێنانەکانی ماتۆری AC و داینەمۆی لەنیکولاتێسلا کڕی و لەویشدا تێسلای وەك شارەزایەك بۆ پەرەپێدانی ئەو ئامێرانەی کە لە سیستەمی تۆری ووزەی کارەبادا بەکاردێن لە کۆمپانیاکەیدا

بەکرێ گرت .

هەر لەوکاتەدا گەورەترین کێبرکێی ویستینگهاوس ، تۆماس ئەدیسۆن و کۆمپانیاکەی Generalelectric بوو ، کە سەر قاڵی کارەبایی Dc بوو ، جۆرج توانی لە ساڵی ١٨٩٣ دا سیستەمی کارەبایی ڕووناکی بۆ پێشانگای شیکاگۆ دامەزرێنێت و لەهەمان ساڵدا بەڵێندەرایەتیەك بۆ بەرهەم هێنانی وزەی کارەبا لە تاڤگەکانی نیگارا بەدەست بهێنێت .

هەروا لەساڵی ١٨٩٥ مووەلیدەکانی نیگارا توانی وزەی کارەبا بۆ دووری ٢٠ میل بۆ ناوچەی باڤالۆ بنێرێت ، تا لە ساڵی ١٩٠٧ یش ویستینگهاوس وەك کاپتنی پیشەسازی ئەمەریکی بوو .

بەڵام دوای ئەو هەموو کارانە تووشی شکستی دارایی هات و لە ئەنجام ناچار بوو واز لە کۆمپانیاکەی بێنێ و لەساڵی ١٩١١ بەدواوە نەخۆشی تەنگی پێهەڵچنی ، تاکوو لە ساڵی ١٩١٤/٣/١٢ لە شاری نیورۆك ماڵئاوایی لە وڵاتەکەی دەکا لە ئەمەریکادا .

١٨٤٦/١٠/٢٧ دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، داوای لە نووێنەری باڵوێزی بەریتانیا لە ئەستەمبوڵ کرد ، کە حکوومەتی عوسمانی نیازی تەواوی هەیە ، کە دەسەڵاتی ئەمیر بەدرخانی کوردی لە باکووری کوردستان لەناو ببات بەهێزی سووپا.

بەڵام سرووشتیەتی خاك و هەلکەوتەی کوردستان ، لە باری کەش و هەواو کەسی و بوونی ٦٠,٠٠٠ شەست هەزار چەکداری کورد لە ژێر سەرکردایەتی ئەمیر بەدرخان وایکرد ، کە دەسەڵاتی عوسمانی ناچار بکات . لە دوواخستنی هێرشەکەی بۆسەر کوردستان.

لە هەمان کات سەرەك وەزیرانی دەسەڵاتی عوسمانی ئاگاداری نووێنەری بەریتانیای کرد ، کە نازم ئەفەندی ئەحمەدی ناردووە بۆلای ئەمیر بەدرخان بەراگرتنی شەڕەکە لە ناوچە جیاجیاکانی باکووری کوردستان.

## ١٨٤٧

١٨٤٧/٢/٢٨ لە دەستووری ڕووسیای قەیسەریدا هاتووە ، کە کاووربـاری بەڕێووەبەرایەتی تەواوی هۆزو خێلە کوردەکانی ئازربایجان – جگە لە کوردە

ئێزیـدەکان- خراوەتـە ئەسـتۆی سـەرۆکی هـۆزی - رازێکـی ،رادیکـی- کـە جەعفەر ئاغا لە نازناوی عێل بەگ بووە.

شـایانی باسـە گـەر بگەڕێینـەوە بۆ سـەر ژمێری سـاڵی ١٨٩٧ دانیـشتووی کوردو نەتـەوەکانی دیکە بەم شێووەیە بووە... ژمارەی کـورد - ٩٩,٩٠٠ - هـەزار کـەس بـووە ... ژمـارەی ئازەربایجانـەکان - ٧٣ر٤٠٠- هـەزار کـەس بووە... چەرکەسـەکان - ٨٣ ر٦٠٠- هـەزار کـەس بووە... ئینگلۆشـیەکان - ٤٧ر٤٠٠ - هـەزار کـەس بـووە، کۆمیـەکان- ٨٣ر٦٠٠- هـەزار کـەس بـووە ، قەرەچـایڤیەکان - ٣٧ر٣٠٠ - هـەزار کـەس بـووە ، کـە هـەموویان خـاوەنی قەوارەو دەسەلاتی خۆیان بوونە ، بەڵام کورد .!...!...؟.

ئـەویش کـە هۆکـاری سـەرەکی دەگەڕێتـەوە بۆ سـەرکردە هـۆزو تیرەو میرو دەسـەلاتدارەکان و سـەرۆکی پـارت و بنەماڵـە کـانی کـورد . بـە پاراسـتنی دەسـەلات و پـارەو پـاوانکردنی سـامانی گـەل ، بـە ئاسـانکاری کـردن بـۆ دووژمنانی گەل و نیشتمان .

١٨٤٧/٥/١٩ مـۆرکردنی ڕێکەوتنامـەی ئـەرزەڕۆم لـە نێـوان دەسـەلاتی ئیمپراتۆریـەتی عوسمانی و دەووڵەتی سەفەوی فارس ، کە لە ئەنجامدا بووە هـۆی ئـەوەی کـە چـەندین ناوچـەی کوردسـتان لـە باکووی کوردسـتان بخرێتـە ژێـر دەسـەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەپێی بەرژەووەندی هەردوو دەسەلاتی عوسمانی و فارسی داگیرکەری باکوورو رۆژهەلاتی کوردستان .

١٨٤٧/٥/٣١ مـۆرکردنی پـەیمان لـە نێـوان بەرپرسـانی داگیرکـەر لـە ئـەرزەڕۆم بـە گەڕاندنـەوەی عەبـدال بـەگ باجـەلان ، لـە دوای سـەرنەکەووتنی لـە شـەڕو ململانێی لەگەڵ محەمەد عەلی میرزا لە هەرێمەکەدا .

١٨٤٧/٦/٢ هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی هێرشـی کـردە سـەر مـیر بـەدرخان بـە سەرکردایەتی عوسمان پاشای دووەم ، لە ئـەنجام سـەرکەووتنیان بە دەست نەهێنا بە هۆی خۆڕاگری و بەرگری کردن لە بـوونی کـوردو خـاکی کوردسـتان لە باکووری کوردستان .

١٨٤٧/٧/١٨ لـە دوای شـەڕیکی خووێنـاوی لـە نێـوان هێزەکـانی سـووپای فەڕەنـساو شۆڕشگێڕانی جەزائیر ، بە سـەرکردایەتی عەبدولقادر جـەزائیری لـە دوای ١٧ سـاڵ شـەڕ . لـە نێـوان هـەردوو وولات ، جـەزائیر لەلایـەن ئیمپراتۆریـەتی

فەرەنسا داگیرکرا ، لە ئەنجامی خۆ بە دەستەوەدانی عەبدولقادر جەزائیری ، ئەم وولاتە بەداگیرکردن مایەوە تاکوو بدەست هێنانی سەربەخۆیی جەزائیر لە کێشووەرەکەدا .




١٨٤٧/٧/٢٦ گەلانی وولاتی لیبیریا پێشوازی لە سەربەخۆیی خۆی کرد ، ئەویش بەکۆماری لیبیریای ئازاد ، بەدامەزراندنی حکوومەت لەسەر شێوازی ئەمەریکی، کە – جۆزیف رۆبرتسە – بە یەکەم سەرەك کۆماری ئەو وولاتە تازیەدا هەڵبژێردرا ، کە کەسایەتیەکی ئەمەریکی بوو لە وولاتەکەدا .

هەروا پایتەختەکەی ناوی – مۆنرۆڤیا – یە و ، ژمارەی دانشتوانی ١,٠٣٦,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ، ٣,٧٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکەی ،١١١,٣٧٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هە روا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٨٥ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، هۆزەکانی ناوخۆیی ٩٣٪ . هندی ، ئەمەریکی ، لیبیری ٥٪ . لە وولاتەکەدا .



١٨٤٧/١٢/٩ ئافرەتـــــه مێـــــژوونووس و رووناکبیری نەتـــەوەیی کـــورد خـاتوو مەستوورەی کوردستان ، مـاوەی ١٤ سـاڵ بـەبێوەوە ژنـی مایـەوەو ژیـانی بەسـەربرد ، لـەو مـاوە مێـژووی ئـەردەڵانی بـە دەستەکانی خۆی نووسیتەوە بە ناوی – مێـژووی ئـەردەڵان –، لـە گـەڵ ئەوەشـدا نـاکۆکی و دژایـەتی وملمـلانێی نـاووخۆیی ئەمیرەکانی ئەردەلانـدا لـە بیروو ژیان و سامان تێیدا نەمابوو ، هەتا کێشەکە کەوتبووە نێوان خێزان و بنەماڵەکانی ئەردەڵان ، دوای ماوەیەك ڕویان لە باشووری کوردسـتان کـرد ، دوای ٤٤ سـاڵ لەتەمـەنی پـڕ لـەئێش و ئـازارو خـۆڕاگری مەستوورەی ئەردەڵان بە ماڵئاوایی کرد لە گەل و نیشتیمانەکەی ، کە جێگەی شانازی گەلی کوردستانە .

جێگـەی باسـکردنە کـە ئـەم خاتوونـە ناودارە لـە ١٢/٤/ ١٨٠٤ ، لـە شـاری – سەننەدژ – لە رۆژهەڵاتی کوردستان چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ، کە ئەو کات ئـەو شـارە پایتـەختی ئیمـارەتی ئـەردەڵان بـووە ، هـەروا لـە کـاتی دەسـەڵاتداریەتی ئـەمیر – ئامانـەڵلا خـان – بـاوکی خەسـرەو خـان بـووە ، لـە هەرێمەکەدا .

## ١٨٤٨

١٨٤٨/١/٢٤ دۆزینـەوەی زێـڕ لـە ویلایـەتی کالیفۆرنیـای ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، لە دوای هەوڵ و توانا لە توێژینەوەیەکی زانستیانەی بەردەوام لە ناوچەکەدا .

## ١٨٤٩

١٨٤٩/١/١ رووناکبیرو فەیلەسوفی ناوداری جیهانی و خـاوەن تێئـوری سۆسیالیستی



زانستی ، کارڵ مارکس- بابەتێکی لە سەر بەرپابوونی شۆڕشی چینی کرێکاران بڵاووکردەوە ، بە تایبەت لە سەر داهاتووی فەڕەنساو جەنگی جیهانیدا .

ئەویش بە هەڵسەنگاندن و تووێژینەوەیەکی زانستیانە بەپێی کێشەو ململانێیەکانی ئەوکات لە لێکترزانی پەیووەندیەکانی کۆمەڵایەتی و چینایەتی . بە هۆی چەوسانەوەی چینی کرێکاران و کاسبکاران لەلایەن سەرمایەداران و دەسەڵاتدارانی سەرمایەداری لە وولاتانی ئەوروپادا .

لە ئەنجام پێشبینیەکانی ئەم زانایە هاتەجێ ، بە بەرپابوونی شۆڕشی فەڕنسی و کۆمۆنەی پاریس و شۆڕشی رووسی و جەنگی یەکەمی جیهان.

١٨٤٩/١/١ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی هەفتەنامەی- زهریرا دبهرا - لە شاری ورمێێ لە رۆژهەڵاتی کوردستان ، کە ئەو ڕۆژە کرا بە ڕۆژی ڕۆژنامەگەری ئاشووری لە نێوان وولاتانی دووزێێ و بە تایبەتی لە کوردستان .



۱۸٤۹/٤/۲۳ دوای دەســـــــــــــــتگیرکردنی دۆستۆیفـــــسکی و لــــــه دوای لێکۆڵینـــەوە لەگەڵیـــداو لەگـــەڵ ۲۰ روونـــاکبیری دیکـــە لەکۆمەڵـــەی بتراشفـــسکی لـــە ۱۲/۲۲ی هـــەمان ســـاڵ ، لەلایـــەن رژێمـــی قەیـــسەری رووسیا دەستگیرکران .

دوای ئەوە چاویان دەبەسترێتەوەو رووت دەکرێنـــەوە تـــەنیا شـــۆرتیان لەبـــەر دەمێنـــی و لـــە گۆڕپانێکـــدا لەناو کۆمەڵە سەربازێك فرێیان دەدەنە سەر زەویـەکی بەسـتەڵەکی ، کە پلەی ساردی لەخوارووی ۲۰ پلەی ژێر سفر دەبێ لە شارەکەدا .

۱۸٤۹/۸/۲ کۆچی دوایی دامەزرێنەری وولاتی میسرو بە نژاد کورد محەمەد عەلی پاشا ، کە لە بنەماڵەی خدێووی بووەو لە کاتە زووەکان لە وویلایـەتی دیاربەکر لە بـاکووری کوردسـتان رووی لـە هـەرێمی میـسر کـرد بـوو... لـە بنەماڵـەی خدێوویەو تەرمەکەی لـە مزگـەووتی دروسـتکراو لەلایـەن خۆیـەوە بەناوی- القلعه - نێژراوە لەمیسردا .

۱۸٤۹/۱۰/۱۷ کۆچـی دوایـی مۆزیکـاری نـاوداری فەڕەنـسی - تۆبـان - لـە پاریـسی پایتەختی فەڕەنسا .

۱۸٤۹/۱۰/۲۵ فەیلەسـوفی جیهـانی کـارڵ مـارکس داوای کۆنگرەیـەکی گـشتی لـە هـەموو رێکخـراوە دیموکراتیـە جیهانیـەکان کـرد لـەو ڕۆژەدا ، بـەڵام بـەرپابوونی شۆڕشـی فەڕەنسا ، بـەر لـە گرێـدانی ئەوکۆنگرەیە بەرپابوو . کە بووە هـۆی سەرچـاوەکانی تێـۆری و بـیری مارکـسی لـە شۆڕشـی چـینی کرێکـاران لـە جیهاندا .

تێبینی:- تێئۆریەکانی مارکسیەت بۆتە سەرچاوەی هـــــــەموو پەرەسەندنێکی بیروو بۆ چوونەکانی زانـــــــاکان و نووسەرو رووناکبیران لـــــە هەموو بوارە جیا جیاکاندا بـــــــە تایبەتی لە بوارەکانی چینایەتی و ئابووری و

کۆمەلأیەتیدا .

## ١٨٥٠

١٨٥٠/٨/٥ لـە دایـك بـوونی نووسـەرو ئەدەبی بەناوبانگی فەرەنسی و جیهان – گی دی مۆپاسان – ناسـراو بـە مۆپاسـان لـە خێزانێکـی ئارسـتۆکراتی کۆشـکی – میرۆڤیـل – ی لـە هـەرێمی نۆرمەنـدی فەرەنـسا ... هەروا لە ژینگەیەکی ئارام و هـێمنی خێزانـی گەشـەی نـەکرد ... لەبـەر ئـەوە بـەردەوام دایـك و بـاوکی لەبەریـەك دابـوون ... ئـەم



بارودۆخەش کاردانەوەی خراپی لەسەر دەروونی مۆپاسان هەبوو ، کە دواتر لـە زۆر چـیرۆکدا هەڵوویـستی دووژمنداریـەتی خـۆی دژی خـەڵکی و هاوسۆزیشی بۆ هەژاران و کۆمەڵگا دەربڕی ... هەروا بە ووردی چاودێری ژیانی جووتیارانی دەکردو نزیکی دابوونەریتەکانیان دەبووەوە ، هەروا بەرەو دەریـا دەچـوو لـە ماسـی گـران ڕادەمـا ... هـەر بۆیـە دواتـر گـوتی:– لەسـەر کەناری ساردو خۆڵەمێشی دەریای باکوور پێگەیشتم.

هـەروا مۆپاسـان زیـاتر لەسەر دەستی دایکی پەروەردە بوو ، کە دایکی زۆر شەیدای ئەدەب بووە ، کە دایکـی دەیوویـست مۆپاسـان وەك ئەلفریـدی بـرای بێت بە ئەدیبێکی بەرز ، کە ئەویش زۆر حەزی لـە ئەدەب و فەلسەفە دەکـرد ... بـەڵام مـەرگ مـەودای گـەیشتنی بـە هیواکـانی نـەدا ... هـەروا مۆپاسـان لـە تەمـەنی ١٣ سـاڵیدا چـووە پەیمانگایـەکی ئـایینی و دواتـر دەچـێتە قوتابخانەیـەك لـە – روان – و بەکـەلۆریای لـیٚ بەدەسـت دیـنیٚ ... دوای ئـەوە چوو بۆ خوویٚندنی یاسا ، بەڵام بەر لە تەواوکردنی خوویٚندنی یاسا دەچێتە ریٚزی سووپای فەرەنسا .

لەوکاتـەش شـەڕ لـە نێوان فەرەنسا و ئـەلمانیا هەڵگیرسـابوو هـەر لـەو کاتـ
مۆپاسـان کەوتـە سـەر خوێندنـەوەو چامەی غەزەلیانـەی دەنووسـی و دوای
وەستانی شـەڕ ، دەچێتە شاری پاریسی پایتـەخت ... لـە شـاری پـاریس لـ
وەزارەتی دارایی و داگیرگەکان کاری دەسـت دەکـەوێ ، دوای ئـەوە دەچێتـ
وەزارەتی فێرکردنی گشتی و هونەرەجوانەکان دادەمەزێت .
ئـەم ئـەدیب و نووسـەرە لـە مـاوەی ژیانیـدا زیـاتر لـە ٢٥٠ کورتـە چیرۆك و ٦
شەش رۆمانی نووسیووە لەگەڵ دیوانێکی شیعریدا ، و لەماوەی ژیانیدا لـە
هەڵس و کەوتەکانی جێگەی سەرسوورمانی دانیشتووان و هاورێ و دۆستان
و جەماوەرەکـە بـووەو بـەردەوام بـووە لـەکارو هەڵوێـستەکانی تـا لـە رۆژی
١٨٩٣/٧/٦ماڵئاوایی لە گەل و وولاتەکەی دەکا لە فەرەنسا .

١٨٥٠/٩/١٣ کۆچی دوایی زانای فیزایی فەڕەنسی – جۆزیف لـوی چـای لوسـاك– رابـەری
لێکۆڵینەوەی کارەکانی غازی بۆ کەلوپەلەکان .

١٨٥٠/١١/٦ میرنشینی بابان هەڵووەشێنرایەوە ، کە دوا میری بابان عەبدولاّ پاشا بووە
لە دوای هەڵوەشانەوەی ئیماڕاتی بابان ، کراوەتە قایمقامی شاری سلێمانی و
ئیتر پەردە بە سەر ئەو میرنشینانە دادراوەتەوە لـە سـەر خـاکی کوردسـتان تـ
مانگی/ ١٩٢٢/٨ ، کە شێخ مـەحمودی حەفیـد بانگـەوازی بـەرەو دامەزرانـدنی
پاشایەتی کرد لە باشووری کوردستان .
دوای ئــەوە ســەربەخۆی کوردســتانی ڕاگەیانــد... شــایانی باســە دوای
رووداوەکـان لـە نـاوەڕۆکی مێژوونامەکـە بەمێـژوو هـەمووی باسـکراوە بـەپێی
ڕۆژومانگو ساڵ ، لە هەموو بوارەکاندا .

## ١٨٥١

١٨٥١/٥/١٦ لە دایك بوونی رووناکبیرو توێژینەرو موئـەرخی فەلسـەفەی ئـەلمانی – ینـ
ئەردمن – لە ئـەلمانیا ... خوێنـدنی لـە شـاری بـەرلین دەسـت پێکـرد لەلایـە
هلمهولتس و بۆنتس و تسلر ، کە لە ئاکام توانی بروانامەی دکتـۆرا بەدەسـ
بێنێ لەشاری بەرلین لە ساڵی ١٨٧٦ .
دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٧٨ لەزانکۆی کیل دەسـتی کـرد بەوانـە گووتنـەوەو
دوای ئەویش لەزانکۆی براسرلافیا لەساڵی ١٨٨٤ وهلە لەساڵی ١٨٩٠ و بۆ
لەسـاڵی ١٨٩٨ و بـەرلین لەسـاڵی ١٩٠٩ . ینـۆ ئـەردمن بەشداری لـە مێـژوو
فەلسەفە بەچەند دانراوێك کردووە ... لە بـواری فەلسـەفەی زانسـت بـەدانان

کتابێـك بەناونیـشانی –بـدیهیات الهندسـه – و چـەندین دانـراو بابـەت لـەم بوارەو بوارەکـانی دیکـەی فەلـسەفەو بـەردەوام بـوونی لـەکارەکانی تـاکوو لـە ١٩٢١/١/٧ لە شاری بەرلینی ئەلمانیا کۆچی دوایـی دەکات بەماڵئاوایی لـە گەلانی وولاتەکەیدا .

١٨٥١/١٠/٢٧دامەزرانـدنی ئاژانـسی – رۆیتـەر – لـە شاری لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا ، ئەم ئاژانسە لە سەرەتا تەنیا هەواڵە تایبەتیەکانی بە ، دارایـی ، کۆدەکردەوە و پێشکەشی بیستەرانی دەکرد .

جیگـەی ئامـاژە پێکردنـە کـە ئـەم ئاژانـسە یـەکێك بـووە لـە ئاژانـسە بـە ناوبانگـەکانی کۆکردنـەوەی زانیـاری و هـەواڵ لـە سـەر ئاسـتی جیهـان ، کـە تاکوو ئێستا نزیکەی ٧٥ نووسینگەی لە وولاتە جیا جیاکانی جیهاندا هەیـە . کە هەواڵـە جیاجیاکـان دەگەیەنێتـە جیهـان ، جگـە لـە زانیـاری راگەیانـدن ، زانیاریەکانی دارایی دەگەیەنێتە ئاژانسەکانی دالینایيکردن و دامەزراندراوە دارایەکان و نانکەکان .

بەڵام دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٨٥٨ فراوانکرا و کەووتـە کۆکردنـەوەو گەیاندنی تەواوی هەواڵەکان . هەروا ئەو ئاژانسە بە درێژایی تەمـەنی لـە خزمـەتکردنی پێدانی زانیـاری لـە قۆنـاخ و گۆرانکاریـە رامیـاری و سـەربازی و ئـابووری و بازرگـانی و رێکەووتننامـەو شـەڕو ئاشـتیدا هەواڵـەکانی بـۆ دام و دەزگـا راگەیاندن و میدیا و دەسەلاتەکان بلاوکردۆتەوە .

دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٨٦١ تـا ١٨٦٥ دامەزرێنـەری ئـەم ئاژانـسە رۆژنامـە نووسێکی ئەڵمانی بوو کە ناوی – پۆڵ بۆلیۆس رۆیتەر – بوو ، کە بە بارۆن فۆن رۆیتەر – ناسراو بوو . کە لە ساڵی ١٨١٦ لە شاری – کاسلی لـە وولاتـی ئەڵمانیا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ، لـە بەر ئـەوە ئـەو ئاژانسە بە نـاوی ئـەو کرا و ناوزەند بووە . لە بەر ئەوەی کە لـە سـاڵی ١٨٥١ لـە شاری لەندەن ئـەو ئاژانـسەی دامەزرانـد بـە خـۆی سەرپەرشـتی تـەواوی کارەکـانی دەکـرد تـا ماڵئاوایی کۆتایی کرد لە وولاتەکەدا .

## ١٨٥٢

١ / ٤ /١٨٥٢بەرپرسـی رووسـی لـە ناوچـەکانی بـاکووری کوردسـتانی ژێـر دەسـەلاتی

ڕووسـیای قەیـسەری – کینـاز بـەبیونۆفی– ٤٥٠ خێزانـی کـوردی ، کـە دانیشتووانی ٢٠ گوند بوون ، لەلای چەپی بۆلای ڕاستی ڕۆخەکانی ناوچەی ڕووبـاری ئـاراس گووسـتەوە ، بـە نـاوی ئـەوەی کـە لـە ژێـر دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دوریان بخاتەوە .

بـەڵام ئەنجامـدانی ئـەم کـارە بەپێـچەوانەو بـە ڕێکـەووتنی نێـوان هـەردوو دەسـەڵاتی عوسمـانی و ڕووسـی بـوو، لـە پێنـاو پـەرتو بڵاوەپێکردنـی خێزانەکانی کوردو شێواندنی باری دیمۆگرافیای نیشتمانی کورد لە سەر خاکی کوردستان .



وێنەیەکی ٠شاڵ لەمەوبەری شاری بۆکان



قەڵای سەردار عەزیزخان

١٥/١٠/١٨٥٢ یەکـەم سـەرژمێری کە لە شای بۆکان لە ڕۆژهـــەڵاتی کوردستان کرابێت ، کـــە ژمـــارەی دانیـــشتووانی ئـەوکات ١٠٠ کـەس دەگەڕێتـەوە ، بـەڵام لـــە ســـەردەمی – ناســرەدین شـــای قاچار – کە سەردار عـەزیزخانی مـوکری خـاوەنی بۆکـان بـوو خـــۆی لـــە ١٠٠ بنەماڵـە دەدا ، کـە لەو شارۆچکە نیشتەجێ بوون ... جێگەی باسکردنە کە شاری بۆکـان لـە ٣ خوولـەك و ٤٦ پلـەی درێـژی خۆرهـەڵات و ٣٢ خوولـەك و ٣٦°پلـەی پانـای باکوورە .

بەپێی دوایین دابەشکردنەکانی ئێران بەریتانی ڕووبەری بۆکان ٢٠٦,٤١ کیلۆمـەتر چـوار گۆشـەیە ... بۆکـان لەباشـووری خۆرهـەڵاتی پارێزگـا

ئازربایجانی خۆرئاوا هەڵکەوتووە ... شاری بۆکان ١٣٤٠ مەتر لەسەر ئاستی دەریا بەرزە ... شاری بۆکان لەباکوورەوە لەگەل میاندواو ... لەخۆرهەڵاتەوە لەگەل ساین قەلا ... لەباشوورەوە لەگەڵ سەقزو لەخۆرئاوا لەگەل شاری مەهاباد هاوسنوورە لە هەرێمەکەدا .

شاری بۆکان لەسەرژمێری ساڵی ٢٠٠٥ کە لەلایەن فەرمانگەی باری شارستانی پارێزگای ئازربایجانی خۆرئاواوە بڵاوبۆتەوە کە دانیشتووانی بۆکان ژمارەی گەیشتۆتە ٢٣٠,٠٠٠ هەزار کەس و لە ناو شارە کوردیەکان دوای شارەکانی کرماشان و ورمێ و سنەیە . گەورەترین شارە لە خۆرهەڵاتی کوردستان . بۆکان لەدوو قەزا پێکهاتووە ... قەزای – سمینە – کە روبەری ١٠٩٣ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە و لەسێ ناحیە پێك هاتووە ... قەزای ناوەندی شاری بۆکان کە لە چوار ناحیە پێکهاتووە ...دانیشتووانی بۆکان بەزمانی کوردی زاراوەی موکری ئاخاوتن دەکەن ... دانیشتووانی شاری بۆکان ١٠٠٪ کوردن و بەئاین موسمانن و لەهەردوو مەزهەبی شیعەو سووننەی ئیسلام پێکهاتوون .

دانیشتووانی کۆنی بۆکان و نەتەوەکانی دیکە لەناوچەکەدا ئەو شووێنەوارانەی لەگەران و پشکنین شووێنەوارەکان دۆزیوویانەوە لە هەڵکەناندنی بەرد دەگەرێتەوە بۆ ٨٠٠ ساڵ بەر لەزایین و بەدەیا قەلاو خانووی کۆنی تیا بەدی دەکرێت ، کە خاوەندارێتی بۆ پەنجە ماندوبوونەکانی کورد دەگەرێتەوە . بۆکان لەساڵی ١٩٣٦ یەکەم قائمقامی بۆ دامەزراوە ، کە ناوی عەزیزخانی حەیدەری بووە ... یەکەم قوتابخانە لەساڵی ١٩٢٨ کراوەتەوە ... ئەمە کورتەیەك لەسەر باسی بۆکانی رۆژهەڵاتی کوردستان.

سەرچاوە:– گۆڤاری – خاك – ژمارە/١٣٠.

## ١٨٥٣

١٨٥٣/٧/١ کۆماندۆزی ئەمەریکی – پەیری– بە توونـدی ئاگاداری سەرکردەکانی ژاپۆنی کردو داوای لێیانکرد ،کە بە پەلە دەرگا لە بەردەم هاتووچۆی کەشتیەکانی دەریاوانی بکەنەوە جا بەخۆشی بێت یان بەزەبری هێزبێت لە

هەرێمەکەدا بەرەو جیهان .

١٨٥٣/٨/٢١ لەدایك بوونی زاناو کیمیاناس و فەیلەسوف ئەلمانی – ئۆستڤلد – ماوەی خوێندنی ناوەندی لە رێگا – ئەلتڤیا – بردۆتە سەر . لە ساڵی ١٨٧٢ چووەتە زانکۆی دوریات – ئەلان ، تاراتوو – کە خوێندنی کیمای لەلای کارل ئەشمدن و یوهان لمیرگ تەواوکردووە . هەروا فیزیای لەلای بروانامەی ماستەری بەدەست هێناوە ... دوای تەواوکردنی خوێندن بۆتە مامۆستای یاریدەدەر لەزانکۆی دووریات .

دوای ئەوە بۆتە مامۆستای – تخصص فی نظريه التفاعل في الكيميا – . لە ساڵی ١٨٧٨ بروانامەی دکتۆرای بەدەست هێناوە لەکیمیا . لەساڵی ١٨٨٠ دامەزراوە بەمامۆستای کیمیا لە پەیمانگای ئەندازیاری – پۆلیتکتیك – لە ریگا لە ئەلمانیا . لە ساڵەکانی ١٨٨٥ – ١٨٨٧ دانراوەیەکی دانا بەناوی- متن من الكيميا العامه – لە ساڵی ١٨٩٨ پەیمانگای کیمیای فیزیائی لەزانکۆی لیبستك كردەوە ... لە ساڵی ١٩٠٦ خانەنشین کرا ، لە پێناو تووێژینەوەو لە ساڵی ١٩٠٩ پاداشتی نۆبلی پێ بەخشرا .

ئەم فەیلەسوفە لەکارەکانی بەردەوام بوو تاکوو لە ١٩٣٢/٤/٤ کۆچی دوایی دەکات ... شایانی باسە ئۆستڤلد دامەزرێنەری وزە بووە ... کە یەکێك بووە لەجۆری مەزهەبی یەکایەتی monisrnus کە ئەو تیئۆریەش لەسەر بنەمای خەسلەتی وزە بووە ، کە جۆرەکانی وزە جیاوازن لەچەندین بواردا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی– بەرگی /٢ .

## ١٨٥٤

١٨٥٤/٢/٢٨ دامەزراندنی پارتی دیموکراتی لە ئەمەریکا ، لە پاڵ پارتی کۆماری کە ئەو دووپارتە تاکوو ئێستا بەپێی دەنگی دەنگدەران لە هەڵبژاردنی کۆنگرێس و ئەنجوومەنی پیران و سەرۆکایەتی ئەمەریکا دەسەڵات دەگرنە دەست ، کە هیچ سەرۆکێکی ئەمەریکا لەماوەی دووخوولی سەرۆکایەتی زیاتر ناتوانێ خۆی هەڵبژێرێ ، جا بە هەر جۆرێك بێت . لە نێوان ئەو دووپارتەو بە دەرنەچوونیان لە دەستوورو یاسای هەڵبژاردنەکان لە ئەمەریکادا .

١٨٥٤/٣/٣١ لە دوای ناچارکردنی ژاپۆن ، کە هەڵسێ بەمۆر کردنی کۆمەڵێك رێکەووتنامە ، لەوانە رێکەووتنامەی – کاناجان– ی دۆستایەتی بوو لەگەڵ وڵاتانی

پەیووەندار لە جیهان .

١٨٥٤/٧/١٢ هونەرمەندی شێووەکاری ناوداری ئیتاڵیا- ئەمادۆمۆ دلیانی- لە شاری ئۆسکانای ئیتالیا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە وولاتەکەدا .

١٨٥٤/٧/١٤ وازهێنانی سوڵتانی مەسقەت لە دوورگەکانی کەنداو، بە ناوی مۆریاو کۆریا بۆ چوونە ژێر دەسەلاتی تاجی بەریتانیا .

١٨٥٤/٨/١٦ هێزەکانی سووپای فەرەنساو بەریتانیا هێرشیان کردە سەر سووپای قەیسەری رووسیا ، لە ئەنجام هێزەکانی سووپای فەرەنساو بەریتانیا توانیان لە دورگەی – ئالند- لە دەریای بەلتیق بە وێرانکردنی شاری بۆرمارسووندی رووسیا سەرکەووتن بەدەست بێنن لە ناوچەکەدا .

١٨٥٤/٩/١٨ سەرکردەی کورد یەزدانشێر سوودی لە رۆیشتنی هێزەکانی سووپای تورك وەرگرت و ئاڵای راپەرینی بەرزکردەوە ، لە هەمان کات سەرۆك هۆزەکانی هەکاری و مۆکاتسەکان و بۆتان بەچەك دێنە ریزی ئەو راپەرینە لە باکووری کوردستان .

لەگەڵ ئەوەشدا هێزەکانی سووپای عوسمانی لە کوردستان ژمارەیان کەم دەبێت و راپەرینەکەش بەردەوام دەبێت ، کە بەرەو هەرێمەکانی بەتلیس و موسل هەنگاو دەنێ و هێزەکانی سووپای تورك لەو ناوچانە دەردەکەن و کەلوپەلە جەنگیەکانیان لێ داگیردەکەن ، لەهەمان کات کوردە ئێزیدیەکانیش بەشداری لەو راپەرینە دەکەن لەپێناو سەرکەوتن لە باشووری کوردستان .

١٨٥٤/٩/٢٠ بە هۆی لاوازی هێزەکانی سووپای قەیسەری رووسیاو ووردبینی لەرێکخستنی هێزەکانی سووپای بەریتانیاو فەرەنسا توانیان هێرش بکەنە سەر هێزەکانی سووپای قەیسەری رووسیا لە شەری ئەلما و بەبەرێکردنی کەشتیە جەنگیەکانی رووسیا لە بەندەری سیپاسنۆیۆل لە ناوچەکەدا .

١٨٥٤/١٠/١ لەدایك بوونی رووناکبیری رامیاری و سوشیالستی ناوداری تشیکی – کارل کاوتسکی – . باوکی وێنە گرێکی تشیکی و دایکی ئەلمانی بووە . فێربوون و هەڵگری بیری سوشیالستی لەرێگەی چیرۆکی چیرۆکەکانی فەرەنسی بەناوبانگ – جۆرج ساند – بووە لە گەڵ دانراوەکانی لوی بلان و دانراوەکانی لاسالی سوشیالستی .

لە ساڵی ١٨٧٤ دەستی بەخوێندنی فەلسەفەو مێژوو کردووە لەزانکۆی ڤیینا . دوای ئەوە دەستی کردووە بەخوێندنی ئابووری و زانستەکانی سرووشت و دڵخۆشکەر بووە بە تیئۆری داروین لە پەرەسەندنی مێژووی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی . لە ساڵی ١٨٧٥ چووەتە ریزی پارتی دیموکراتی سوشیالستی لەشاری ڤیینا . دوای ئەوە بەشداری لەدەرکردنی گۆڤارێکی هەفتانەی – دیموکراتی سۆشیالستی – کرد .

لە ساڵەکانی ١٨٨٥ تا ساڵی ١٨٩٠ لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا یاریدەدەری فریدریش ئینگلش بووە ... دوای ئەوە چووە شاری بەرلینی ئەلمانیا . لە ساڵی ١٨٩١ بەشێکی لەتیئۆری – پرۆگرامتەرفۆرت– نووسی . دوای ئەوە لەساڵی ١٩١٧ چووە ریزی دیموکراتی ئیشتراکی بێ لایەنەکان . ئەم فەیلەسوفەی زانایە لەکارە هەمەلایەنەکانی رامیاری و ئابووری و زانستی بەردەوام بووە تاکوو لە ١٩٣٨/١٠/١٧ لە ئەمستردامماڵئاوایی لە گەلانی و وولاتەکەی و جیهان دەکات .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٣ .

١٨٥٤/١١/٢ بەرەی قەفقاز لە گەڵ قاسم خان و چەند سەرەك هۆزی دیکەی کورد لە سەرووی رۆژهەڵات و باکووری کورستان ، لە گوندی – کیزل– کۆبوونەوە ، لە پێناو یارمەتی دانی ئەو کوردانەی کە کەووتبوونە ژێر دەسەڵاتی رووسیای قەیسەری لەجەنگدا ، دژی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە کوردستان .

١٨٥٤/١١/٣٠ لە دوای مردنی دامەزرێنەری وولاتی میسر محەمەد عەلی پاشاو لە هەمان کات کووژرانی عەباس پاشا ، سەعید پاشای دۆستی فەرەنساو لایەنگیری محەمەد عەلی پاشا ، ماوەی بەدبلۆماسی فەرەنسی گەوورەو بازرگانی گەوورە – فردیناند لبیس – دا بە بە کار هێنانی لایەکی کەناڵی سوێس .

سەرەرای نارەزایی حکوومەتی بەریتانیا .

. لە پێناو دروستکردنی کەناڵی سوێس لە میسردا . کە ئەم کەناڵە کاریگەری و کاردانەوەی باشی هەیە لە سەر باری ئابووری و بازرگانی وولاتی میسر و وولاتانی دیکەی جیهان .

## ١٨٥٥



١٨٥٥/٧/١ لـە دایـك بـوونی کەسـایەتی نـاوداری کـوردی و عـەرەبی و جیهـان ، مامۆسـتا عەبدولرەحمان شێخ ئەحمـەدی بـەهائی محەمـەد مەسـعوودی ، ناسـراو بـە عەبـدولرەحمان کـەواکبی ، لـە شـاری حەلـەبی ئێستای سووریا .
کە لە بنەماڵەیەکی رووناکبیری نـاوداربووە ، خووێندنـەکانی بەخووێندنی ئایینی ئیسلام , دوای ئەوە قوتابخانەی تەواوکردووە ، کە دوا پلەی خووێندنی لەکۆلێژی یاسابووە بە دەرچوونی بە پارێزەر لە شارەکەدا.

١٨٥٥ / ٩ / لەدایك بوونی فەیلەسوف و تایبەتمەند لە زانستی رەگـەزەکانی شمیرلن لـە پۆرتـسمارت لـە – ئینگلتـەرە . شـایانی باسـە ئـەم فەیلەسـوفە لـە بنـەرەت ئسکتلەندی بووەو دوایـی بۆتـە ئـەلمانی ... بـاوکی سـەردکردەیەکی ئـەلمانی بووە لە هێزەکانی سووپای دەریایی ئینگلیزی و دوای ئەوە بۆتە ئـەمیرال ... لــەدایك و باوکێـك بـووە ، کـە بنەماڵەکـەیان دەگەرێتـەوە بـۆ یـەکێك لـە دەووڵەمەندەکانی ئیسکتلەندە .
لە دوای مردنی دایکی شمیرلن داپیری بەخێووی دەکات لە شاری فرسای لـە فەرەنسا . لەگەرەکێك لەگەرەکەکانی پاریس لەساڵی ١٨٦٦ چووە قوتابخانـە ئینگلیزیەکان ... بەهۆی نەخۆشی گەشتی کـردووە بۆ سویـسراو دوای ئـەوە لـە سـاڵەکانی ١٨٧٠ – ١٨٧٣ دەسـتی بەخووێنـدن کـردووە لـەلای لاهـووتی ئـەلمانی – ئۆتـۆ کۆنتـسە – و دوایـی گەراوەتـەوە ئینگلتـەرە . دوای ئـەوە گەراوەتەوە فەرەنساو زانستەکانی کشتووکاڵی و جیۆلۆجیان خووێندووە ... دوای ئەوە لەساڵی ١٨٧٦ چووەتە ئەسپانیا .

لەساڵی ١٨٧٩ زانستی پزیشكی لەژنێف خوێندووە ... دوای ئەوە بەرەو بۆسنە رۆیشتووەو لەهەرێمی بەلكان زانستی رەگەزەكانی خوێندووە .لە ساڵی ١٩١٦ ناسنامەی ئەلمانی وەرگرتووە... یەكەم دانانەكانی بەناونیشانی – اسس القرن التاسع عشر – لە دوو بەرگدا بڵاوی كردۆتەوە لە نێوان ساڵەكانی ١٨٩٩ – ١٩٠٤ ، كە بۆ دەجار ئەم دانراوەی بەچاپگەیاندووە . دووەم بەرهەمی – النقريه الّريه من العالم – لە ساڵی ١٩٠٥ ت/٣ – منشن – ١٩١٦ بڵاوكردۆتەوە ... لەگەڵ چەندین بەرهەمی دیكەی و بەردەوام بووە تاكوو لە ١٩٢٧/١/٩ لە ئەلمانیا كۆچی دوایی دەكات .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دكتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢ .

١٨٥٥/١١/٢١ شانشینی سووید بڕیاری دا بەچوونە ناوچەنگ لە هەرێمەكان لە تەك هاوپەیمانان ، كە بووە هۆی دروست بوونی ترس لەلایەن قەیسەری رووسیا – ئەسكەندەری دووەم – و هێرشی كردە سەر هێزەكانی سووپای هاوپەیمانان لە بەندەرەكانی سان بترۆسبۆرگو سەركەوتنی بەدەست هێنا. لەهەمان كات سەركەووتنی هێزەكانی سووپای رووسیای قەیسەری لە هەرێمی قەوقازو سەركەووتنی لە باكووری كوردستان بەتایبەتی لە شاری قارس ، بە سەر هێزەكانی سووپای عوسمانی. ئەمەش لە دوای گەمارۆدانێكی دوورو درێژ . لەلایەن هێزەكانی سووپای هاوپەیمانانو هێزەكانی سووپای عوسمانی بەتایبەتی لەسەر خاكی كوردستان.

## ١٨٥٦

١٨٥٦/٢/١٨ راگەیاندنی بە ناو بڵاووكراوە بەناوی – هێلی هەمایۆن– لە پێناو چاكسازی خێرخوازییە مەمبدەئەكانی یەكسانی ، لە نێوان هەموو دانیشتووانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و دوور لەجیاوازی بیروو بۆچوونی ئاینی و نەتەوەیی ، كە ئەمەش رووەو بڵاوكراوە بوو بە هەوڵی رەشید پاشای سەرەك وەزیرانی عوسمانی .

١٨٥٦/٣/٣٠ مۆركردنی پەیمانی پاریس لە نێوان دەسەڵاتی فەرەنساو بەریتانیا لەپێناو هاوكاریو دۆستایەتی لەبوارەكانی پەیووەندیو بەرگریو رامیاری و

ئابووری و بازرگانی له جیهاندا .

١٨٥٦/٦/١٢ گـەرۆکی بـەناوبانگی فەرەنـسی – ئـا.کلیمـان – A.clemene – لـە رێگـەی دۆستایەتی لەگەڵ پاشایەکی بابانـەوە گەشـتێکی بـۆ باشـووری کوردسـتان دەسـت پێکـردووەو گەشـتنامەکەی خـۆی بـە زمـانی فەرەنـسی بـەناوی – گەرانێك بەناو کوردستانی خواروی عوسمانی :-

له کەرکوکەوە تا رواندز – نووسیووە هـەر ئەم ساڵە لـە وولاتـی سویسره لـە گۆڤاری – Msgg – بلاوکردۆتەوە .

جێگەی باسکردنه که له درێژەی باسەکەیدا – ئا.کلیمان – دەنووسێ و دەڵێ :- ژمارەی دانیشتووانی شاری کەرکوك :- سەرووی شار ، ناوجەرگەی شار و کەناری شارەکە ، بێجگه له سەربازەکانی ئوردوخانه ، که نزیکەی ٢٥٠٠٠ هەزار کەسێك دەبن که سێ چارەگی کوردن .

ئەمـەش لـە هـەموو سـەرنج راکێـشتر ئـەو ستاتـستکەیه کـە – ئـا.کلیمـان – لـەبارەی دانیشتووانی شـارەکە بـە دەسـتی دەدات ، کـە دەکـرێ وەك بەڵگـە نامەیـەکی مێـژوویی سـەلمێنراو بێلایـەن بیخەینـە بەرچـاو لەسـەر بـاری شارەکەدا .

هـەروا گـەرۆکێکی دیکـەی فەرەنسی بـەناوی – کیـونێ ڤیتـال – ئامارنـاس و جووگرافینـاس ، خاوەن چوار بـەرگی گـەورەی کتێبێك بـەناوی – تورکیـای ئاسیەوی – که له سـاڵەکانی ١٨٩٠ – ١٨٩٤ لـە پاریسی پایتـەختی فەرەنسا بلاویکردۆتەوە ... که ئاماری هەموو وویلایـەت و قەزاکانی کوردستانی ژێـر دەسەلاتی عوسمانی ... ڤیتال دەنووسێ :-

کەرکوك قەزای سنجاقی شارەزووره ، بریتیە لـە پێنج ناحیـەو ٣١٠ گوونـد ، کەرکوك هەر لە کۆرکۆرای کۆنەو ناوەندی ئیدارەی سنجاق و مەڵبەندی قەزای شـارەزووره ، مەسـیحیەکانی کـەرکوك ئارشـیڤێکی خالـدیان هەیـە کـە پێنج قەشه هاوکاری تێدا دەکـەن ... کـەرکوك شـووێنی حـاکمی سـەربازی سـنجاقی شارەزووره .

Cuinet vital , La turquie dtsie , Ed , Le Roux , paris 1891

سەرنجێك :-

دانیشتووانەکانی شـاری کـەرکوك سـێ چارەگی کـورد بوونـه ، بـەلام هـەڵگری برِوا

ئاینەکان لە موسڵمان و مەسیحی و کوردیان تیا نەبووە ... ئەم مەحالە کە نژادیان چـی بـووە ، عـەرەب بـە ژمـارەی پەنجـەی دەسـتان و تورکمانـەکانیش پیاوەکـانی دەسـەڵاتی عـەوسمانی بوون ، واتـە تـەواوی دانیشتووانی رەسـەنی کـەرکوك کـورد بوونە لە هەموو بوارەکاندا .




ئەم نەخشەیە لە ساڵی ١٨٥٦ دروستکراوە لە لایەن دەووڵەتی عوسمانی
کە کوردستانی بە تەواوی تیا دیار کراوە .

١٨٥٦/٦/٢٤ مـۆرکردنی رێکـەووتنامـەی نێوودەوڵـەتی بـە هـۆی شـەڕ لـە نێـوان هێزەکـانی سـووپای ئیتاڵیـاو نـەمسا ، کـە لـە ئـەنجام ٤٠ چـل هـەزارکـەس کـوژرا ن لـە- سـۆڵفرینۆ - لـە بـەر ئـەوەی لـەنیووەی دووەمـی سـەدەی بیـستەمدا ، ١٧٠ شەڕ روویداوەو لە ٩٠٪ . خـەڵکی بێتاوان گیانی لەدەسـت داوە لـەم شـەڕانەدا لـە بـەر ئـەوەی بەدرێـژایی ٥٠٠٠ هـەزار ساڵ ، کـە ١٤هـەزار شـەڕ لـەجیهان بەرپابووە ، کە زیاتر لە ٠٠٠ ر٠٠٠ ر٠٠٠ ر٥ ملیار مرۆڤ کووژراون لـەپێناو بەرژەووەنـدی تایبـەتو دەسـەڵات لـە لایـەن دەسـەڵاتدارە جیـا جیاکـان لـە جیهاندا .

١٨٥٦/٧/٢٨ کۆچی دوایی مۆزیکاری ناوداری جیهانیو ئەڵمانی رۆبەرت ئەکلسەندەر شومان ، لە تەمەنی ٤٦ ساڵیداو کۆمەڵێك لە بەرهەمە بە هادارەکانی لەدوای خۆی جێ هێشت وەك کەلتورێك بۆ وولاتەکەیی و جیهان .



١٨٥٦/٩/١ لە دایك بوونی سەرەك وەزیرانی میسر سەعد زەغلول لە گوندی - ئیبانە- ی رۆژئاوای میسر بووە ، دەرچووی زانکۆی ئەزهەر بووە لە ساڵی ١٨٧٣و لەرۆژنامەی- وەقائعی میسری- سەر نووسەر بووە ، لەگەڵ شێخ محەمەد عەبدە بە شداری لە شۆرشی عەرابیەکانی کردووە ، دوای ئەوە کاری پارێزگاری دەکرد ، دوایی بووە بە وەزیری معاریفو دادو چەندین کاری دیکەو سەرکردایەتی میسری کردووە ، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیدا .
دوای ئەوە بووە بە سەرەك وەزیرانی میسرو هەروا سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی نوێنەرانی کردیە ، کە رۆڵی سەرەکی هەبووە لە گۆرەپانی رامیاری میسرو کەسایەتیەکی ناوودار بووە تاکوو کۆچی دوایی کردووە لە وولاتەکەیدا .



١٨٥٦/١٢/٢ بڕیاری جێبەجێکردن لە دیاری کردنی سنوور لە نێوان وولاٌتان بە پێی پەیمانی – بایۆن – لە نێوان فەرەنساو ئیسپانیاو بە تایبەتی سنووری نێوان دەسەلاٌتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئیمپراتۆریەتی فارسی سەفەوی لە سەرخاکی کوردستان ، کە لە ئەنجام بووە هۆی دیاری کردنی سنووری نێوان ئێران و ئێراق و تورکیاو سووریاو بەپێچەوانە لە سەر خاکی کوردستان.

## ١٨٥٧

١٨٥٧/٦/٢ بۆ یەکەم جار لە مێژووی جیهان ، ئامێری تەلەفۆن لە لایەن زانای ناوداری جیهانی – ئەلسکەندەر بیل– داهێنرا ، کە ئەم ئامێرە ساڵ بەساڵ بەرەو پەرپێدان و پەرەسەندن و گەشەپێدانی بەردەوام بووە تاکوو گەیشتە ئامێری ئەلیکترۆنی لە دوا پەرەسەندنیدا .

ئەویش بە مۆبایل لە ڕێگەی مانگی دەستکردی دروستکراوی پیشەسازیدا ، کە ڕۆلی گرنگ و سەرەکی و بنەڕەتی هەیە و دەبێ لە ڕاپەڕاندنی هەموو جۆرە کارێکی ڕامیاری و ئابووری وبازرگانی و سەربازی و نەتەوەیی

ونیشتمانی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و کەلتوورو دابوو نەریت و زمان و مێژوو.

کە بۆتە ئامێرێکی شارستانی بە هەموو مانای پەرەسەندن و پێشکەووتن لەجیهانـدا ، لەپەیووەندیە هەمەلایەنەکان وەك لەسەرەوە باسکراوە لە جیهاندا .

١٨٥٧/١٢/٣ لەدایك بوونی رۆماننووس و نووسەرو رووناکبیر ناوداری جیهانی – جۆزێف تیۆدۆر کورزینیۆ – ناسراو بە جۆزێف کونراد ، .لە شاری بیردیشیفی لە وڵاتی ئۆکرانیا لە دایك و باوکێکی پۆلۆنی ... ئەپۆلۆ کورزینیۆمی باوکی وەرگێڕێکی کارامەو بەتوانا بووە ... کە شاکارەکانی ڤیکتۆرهۆگۆو ولیەم شکسپیری بۆسەر زمانی خۆی وەرگێراوە ... بەو هۆیەوە جۆزێفیش حەزی دەچێتە سەر فێربوونی زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەلمانی , لەلایەکی دیکەوە ئەپۆلۆی باوکی یەکێك بووە لەو رابەرانەی کە لە پێناو سەربەخۆیی پۆلۆنیا لەژێر باڵی ئیمپراتۆریەتی ڕووسیای قەیسەری ئەوسا تێدەکۆشا.

لەبەر ئەو هۆیە دەستگیر دەکرێت تا لە ساڵی ١٨٦٨ بە نەخۆشی سل کۆچی دوایی دەکات... دوای ئەوە جۆزێفی تەمەن ١١ ساڵ بۆلای مامی دەچێتە سویسرا و شەش ساڵ لەلای ئەودا دەژیت... لەو کاتەش فێری هەردوو زمانی ئەلمانی و فەرەنسی دەبێت ... دوای خووێندنەوەی نووسینەکانی چەندین نووسەرو رۆماننووس کە بەشێووەیەکی رۆنسیانە خەونی بە دەریاو ژیانی دەریاوانان دەبینێ .

کە تەمەنی ١٧ ساڵان دەبێ واتە لەساڵی ١٨٧٤ بەرەو مارسیلیای فەرەنسی رەودەکات بەو بروایەی کەجارێکی دیکە نەگەرێتەوە پۆلۆنیای دوور لەئازادی و شادیدا ، لەو کاتانەدا چەندین کاری هەمەلایەنە دەکا لە پێناو بژێووی ژیان و تاکوو لەساڵی ١٨٧٨ لەکۆمپانیای – ماڤیس – ی کەشتیەوانی بەریتانی کاری دەست دەکەوی و بەرەو ئەو وڵاتە هەنگاو دەنێ و لە بەریتانیا رەگەزنامە بەدەست دێنێ و چەندین گەشتی بازرگانیش بۆ وڵاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیاو ئەفریکیا دەکات ... دوای ئەوە بەهۆی نەخۆشی و مەلاریا لەساڵی ١٨٩٤ دەگەرێتەوە بەریتانیا .

لەدوای ئەو هەموو هەوڵانە یەكەم رۆمانی بەناوی - گێلایەتی مابەر - لە ساڵی ١٨٩٥ بڵاودەكاتەوە ... دوای ئەوە چەندین بەرهەمی دیكە لە ساڵەكانی ١٩٨٩ ، ١٩٠٠ ، ١٩٠٣ ، ١٩٠٤ ، ١٩٠٧ بڵاودەكاتەوە وەك - زنجی ئاسیا - ئەلوردەجیم - تیفۆن - نوسترمۆ - نۆكەری نهێنی - لە ساڵی ١٩١٣ رۆمانی - بەخت - بڵاودەكاتەوەو قازانجی باشی لێدەكات .

ئیتر ئەم نووسەرە لەنووسینی رۆمانەكانی بەردەوام دەبێت تاكوو لە ١٩٢٤/٨/٣ بەهۆی نەخۆشی دڵ لەگوندی پێشویسپۆری هەرێمی گشتی رۆژهەڵاتی ئینگلتەرا كۆچی دوایی دەكات .

## ١٨٥٨

١٨٥٨/٣/١٨ داهێنەری ماكینەی دیزل - رۆدۆلف كریستیان كارل - ناسراو بە - رۆدۆلف دیزل ... لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسیا لەدایك بووە ... كە دایك و باوكی كۆچبەری باڤاری بوونە ... ئەم كەسایەتیە هەر لە تەمەنی منداڵیەوە بەهرەكەی شەیداو ئارەزووی بوراەكانی زانستی بووە بەتایبەتی زانستی میكانیكی ... ئەم هۆكارەش وای لە دیزل كرد بوو كە هانی دا لە تەمەنی چواردە ساڵی بریاربدات و ئاواتی لەم بوارەدا بە دەست هێنانی بروانامەی ئەندازیاری بێت .

ئەمەش وایكرد لەلایەن یەكێك لەدامەزراوە فەرەنسیەكانەوە وەك رێزلێنان لەبەرامبەر سەركەووتنی لە خووێندندا خەڵات بكرێت ... دایك و باوكی دیزل زۆر هەژار بوونە و بەو هۆكارە لە منداڵیەوە ئەركی یارمەتی دانی ئەوانی كەوتە ئەستۆ ... ئەمە لەلایەك و لەلایەكی دیكەش خۆشەویستی باوكی بۆ دیزل بە هرەمەندی دیزل باوكی رەوانەی ئەلمانیای كردو لەلایەن خزمێكی باوكی مایەوە لەشاری - ئۆرگسبۆرگ - و چووە قوتابخانەی پیشەسازی و تا تەواوكردنی خووێندنی لەم قوتابخانەیەدا .

بۆ تەواوكردنی خووێندنی باڵاتر چووە قوتابخانەی زانستی لەشاری میونخ و دەستی كرد بەبەدی هێنانی خەونەكانی ، كە ئەویش تووێژینەوە بوو لە بواری میكانیك و دوای دەرچوونی لەزانكۆ گەرایەوە فەرەنسا ... لەشاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، بوو بە بەرێوەبەری یەكێك لە لقەكانی

کۆمپانیای – لیند – ئامێرێکی بەستەنی – تجمید – و لەپاریس چەند داهێنانێکی تۆمارکرد ... کە گرنگترین ئامێری بەستەنی بوو کە لەوکات بەزۆری لە پیشەسازی بەکاردەهێنرا ...

رۆدۆلف دیزل لەساڵی ١٨٩٠ دا بیرۆکەی داهێنانی ئەو ئامێرەی کە لەخوولیای مێشکیەوە بوو هەموو داهێنانێك دەرهاویشتەی دوو تووخمی سەرەکیە . کە ئەویش بیرۆکەی جێ بەجێکردنە ... بەم جۆرە لە ساڵی ١٨٩٣ لە کارگەی – man – واتە – مان – ی ئامێری دروستکردندا لەشاری ئۆکسبۆرگ لە ئەلمانیا . دیزل بەیارمەتی بەڕێوەبەری کارگەکە دەستی کرد بەتوویژینەوەو تاقیکردنەوە ، ئەویش لە پێناو دروستکردنی ئەو ئامێرە . ئەم کارەش ماندوو بوون و هەوڵ و کۆششکێکی بێ ووچانی دەویست و تا ساڵی ١٨٧٩ دا دیزل توانی ئامێرەکەی کە – بیست هۆرس پاوەر – واتە – هێزی بیست ئەسپ – بوو بەو شێووەیەی خۆی دەیویست کاری پێبکات . بەمەش دیزل شۆڕشێکی گەوورەی لە جیهانی میکانیکدا بەرپاکرد ... دوای ئەوە دیزل پەرەی بەو ئامێرەدا کە بەناوی دیزل بوو .

لە ساڵی ١٩٠٣ ئەم ئامێرە بۆ کەشتیەك بەکاریهێندلرا کە لە دەریای قەزویندا کاری دەکرد و لەساڵی ١٩٠٥ کۆمپانیای – مان ، بۆ بەرهەمهێنانی ووزەی کارەبا لە شاری – کیفی – پایتەختی ئۆکرانیا بەکاری هێنا ... هەروا بۆ یەکەمجار لەشەمەندەفەر لە ساڵی ١٩١٢ بەکارهێندرا .

ئەم مرۆڤە لەکارەکانی بەردەوام بوو تاکوو لە ١٩١٣/٩/٢٩ دیزل لە گەشتێکی لە دەریای بەلژیکا کە بەرەو بەریتانیا بەرێکەووت بە مەبەستی دارشتنی بناخەی کارگەیەکی تازەی ئامێری دیزل ... بەڵام بەم ئامانجە نەگەیشت و بۆ رۆژی ١٩١٣/٩/٣٠ ئەم کەسایەتیە وون دەبێ و واش پێ دەچێ کە خۆی فرێدابێتە ناو دەریاو گیانی لەدەست دابێ ... کە ئەمەش بووە زیانێکی گەوورە لە بواری زانستی میکانیك لەجیهاندا .

سەرچاوە :– گۆڤاری مێرگ – ل/٣٠ . وەرگێرانی ئەندازیار محەمەد سالح فەرەج .

١٨٥٨/١٢/٢٢ لە دیك بوونی هونەرمەندی مۆزیکاژەنی ناووداری ئیتالی – یوتشین – لە شاری ڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیا.

## ١٨٥٩

١٨٥٩/٥/٢ لەدایك بوونی ئەدیبی رۆماننووسی بەریتانی - جیرۆم کلایکا - لە ستادفور شابەری بەریتانیا ... لەتەمەنی چوار ساڵی بێ دایك و باوك ماوەتەوە . چەندین کاری جیاوازی کردووە لەوانە رۆژنامەوانی و وانەگووتنەوە ...چەندین چیرۆکی لە رۆژنامە بڵاوکردۆتەوە ... یەکەم رۆمانی لەساڵی ١٨٨٥ بەناوی - لەسەر نەخشەی دەروەیدا - بڵاوکردەوە. لەمانگی/١٨٨٨/٦ جۆرجینا ئیلزابیتی مارەکرد و لەسەر نووسینە گاڵتە جاریەکان بەردەوام بوو ... لە ساڵی ١٨٨٩ لە رۆمانی - سێ پیاو لەبەلەمێکدا - خۆی نواند ... بیرۆکەی چیرۆکەکانی لە مانگی هەنگوینی و خۆی و گەشتێکی لەگەڵ هەردوو برادەرەکەی لە ژیانی راستەقینەدا وەرگرت . لەساڵی ١٨٩٣ چاپکراوێکی دامەزراند کە دووهەفتە جارێك دەردەچوو . دوای بە ئەنجام گەیاندنی لە گەڵ بە دەیا بەرهەم .

لە ساڵی ١٩٠٢ ژیاننامەی خۆی لە پەرتوکێکدا بڵاوکردەوە بەناونیشانی - پۆل کیلڤەر - ئەم نووسەرە لەسەر کارە هەمەلایەنەکانی بەردەوام بووە تاکوو لە ١٩٢٩/٦/١٤ لەنەخۆشخانەی حکوومی کۆچی دوایی دەکا .

شایانی باسە کە ئەم نووسەرە بە رۆمانی - سێ پیاو لەبەلەمێکدا - ناوبانگی دەرکرد ، کە بەیەکێ لە شاکارەکانی ئەدەبی گاڵتەجاری جیهانی دەژمێردرێت و تاکوو ئێستاش بەهای بوونی خۆی لەلای خوێنەران بەرز راگرتووە لەجیهاندا .

١٨٥٩/٧/٣١ لەوکاتەی کە دەسەڵاتی عوسمانی لە هەرێمی لوبنانی ئێستا بەرەولاوازی هەنگاوینا ، لە هەمان کات ئەوروپییەکان دەست تێووەردانیان لە باری مەزهەبە مەسیحیەکان دەکرد ، وەك ئۆرسوزکسی . کە سەر بە رووسیای قەیسەری بوون و کاسۆلیکەکانیش کە سەربە فەرەنسا بوون و پرۆستانتەکانیش سەربە بەریتانیا بوون لە وولاتەکەدا.

لەوکاتەش لایەنە ئیسلامیەکانیش لەو ململانێیە دوور نەبوون بەتایبەتیش لە دوا رۆژی رووداوەکانی لوبنان ، لەوکاتەش دەست تێووەردانی لایەنی

دورزەکـان لـە گۆڕەپـانی ململانێیـەکان سـەری هەڵـداو بـەریتانیاش یارمـەتی دەدان دژی کاسۆلیکەکانی سەر بەفەڕەنساو لایەنگیری و پیشبڕکێ کردنی لـە نێوان فەڕەنساو بەریتانیا ئاشکرابوو لە وولاتەکەدا .

١٨٥٩/١٠/٧ شاعیرو رەخنەگرو چیرۆکنووسی بەناوبانگی ئەمەریکی – ئەدگار ئەلان بۆ – کۆچی دوایی کردووە ، ئەویش بە هۆی تووش بوونی بەنەخۆشی مێشك ، ئەویش بەخووێن لەبەر چوون – نزیف الدم – دوای خۆشی پەرە کاخەزێکی جێهێشتبوو یەك دێری لەسەر نووسیبوو ئەویش :– خودایە روحمم پێبکەی بێ هۆیەکی دیار ئازارێکی زۆرم کێشاوە .
ئـەم شـاعیرە لـەنێوان سـاڵەکانی ١٨٠٩ – ١٨٤٩ بناخـەی چیرۆکی تـرس و تۆقاندنی داناوە ... لەساڵی ١٨٤١ کاتێ رۆمانی– تاوانبارانی شەقامی جۆرج – ی نووسـی رەشـبین و هەسـتیری بـوو ... هـەروا لەلایـەن سکسی خـوورت نەبووە .
تێبینی :– بەدرێـژایی قۆناخـەکانی مێـژوو زانـاو رووناکبیران و زاناکـان لـەباری هەژاری و مەینەتدا ژیاون تاکوو کۆچی دوایی دەکەن ، کە تەنیا نووسینەکانیان دەبێتە سەرمایەی زیندوو لەجیهاندا .

سەرچاوە :– علی رقاب العیاد – ئەنیس مەنسوور میسر /٢٠٠٤ .

١٨٥٩/١٠/٢٠ فەیلەسوف پەروەردگاری پێشکەوتووی جیهان – جۆن ئارشیبالد سبریفۆرد ، ناسراو بە – جۆن دیـویـنی – لـە شاری بیرلینفتـۆن فێرمـۆنتی ، لـە وویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمـەریکا چـاوی بـە جیهـان هـەڵهێناوە ... قۆناخـەکانی خووێنـدنی تـاکوو قۆنـاخی زانکـۆش هـەر لـەم شـارەدا لەسـاڵی ١٨٧٩ تەواودەکات ، بە تایبەتی لەبەشی تیئۆری گەشەکردن . دوای ئـەوە بۆ مـاوەی دوو ساڵی خووێندنی باڵا تەواودەکات .
لـە هـەمان کـات بیرۆکـەی درێـژەدان بەخووێنـدنی فەلـسەفە لەهەسـتی دەخوولێتەوە ، ئەویش بە هـۆی بڵاوکردنـەوەی بابـەتێك لـەم بوارەداو هەسـت بەسـەرکەوتن دەکـات . دوای ئـەوە دریـژە بەخووێنـدن دەدا لـە زانکـۆی – هـۆبکنز – بـە خووێنـدن ، کـە لـە ژێـر دەسـتی هزرمەنـدانی بـەتوانا و

سەرنجراکێش دەبێت وەك ، جۆرج سیلفستەر مۆریس و ، گی ستانلی هال ئاسۆی زانستی روونـاكتر دەبێت .

دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٨٤ بروانامەی دکتۆرا بەدەست دێنێ و ، دوای ئەوە بۆماوەی ١٠ ساڵ لە زانکۆی مەشیگان وانەی فەلسەفەو پەروەردە دەڵێتەوە هەر لەو ماوەیەشد چەندین کتێب بەرهەم دێنێ لەوانە ، دەروونزانی لە ساڵی ١٨٨٨ . وتارە نوێیەکان لەساڵی ١٨٨٨ . کە ناوەرۆکی ئەم کتێبانە تایبەت بوون بە تێگەیشتنی مرۆڤ لە ژیانیدا .

سەرکەووتنی لەم دوو کتێبەدا بووە هۆی زیاتر گرنگیدان بەرەو ئایدیالیستی هیگل هەنگاوبنێ . دوای ئەوە بەهاوکاری زانای بەناوبانگ جیمس هایدن تـالمیس لـە هـەمان زانکـۆ یـەکتریان ناسـی و لەسـاڵی ١٩١٨ کتێبێکـی هاوبەشیان بەناوی – ئاکار – بڵاودەکەنەوە .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ئەم زاناو فەیلەسوفە جۆدوین کاریگەری دیارو بەرچاویان دەبێ بەسەر بیرکردنەوەی هاوچەرخ و پەروەردەو فێرکرندا ، کە زیـاتر لـە ١٥ بەرهـەمی نووسـینی هـەبووە... دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٩٣٠ لـە زانکـۆ خانەنـشین دەکرێت ، دوای ئـەوەش ٦ بەرهـەمی دیکـە لەنووسـینەکان بەرهەم دێنێ لە نێوان ساڵەکانی ١٩٣١ -١٩٥١ تاکوو لە ١٩٥٢/٦/٢٠ کۆچی دوایی دەکات .

سەرچاوەکان :- www.auabpsychology.com
www.azzaman.com

١٨٥٩/١١/٢٤ بڵاوکردنـەوەی دانـراوە بەناوبانگەکـەی زانـای سروشـتی بـەریتانیا – سـارلز داروایـن- – فی اصل الانـواع – کـە تێئۆریەکـەی روون دەکاتـەوە ، لـە بـارەی پەرەسەندنەکاندا ، کـە تـاکوو ئێـستا ئـەم دانـراوەش جێگـەی مشتوومرە لـە نێوان زانا بە ناوبانگەکانی جیهان ، کە بەتـەواوی نەتوانراوە بەرامبەرەکـەی راستی ئەو ناونیشانە ببەزێنی لە جیهان لە هەموو بوارە جیا جیاکان .

## ١٨٦٠

١٨٦٠/٣/٢٤ بڕیـاری جێبـەجێکردنی سـنووری دەریـایی لـە نێـوان فەڕەنـساو ئیتاڵیـا

دیاریکرا ، بە پێی پەیمانی – تۆرینۆ– ، هەروا دیاریکردنی سنووری سەر زەوی و شاخ و زەویەکان لە نێوان وولاتانی سەرکەنارەکانی دەریاو زەریاکانیش دیایکرا ، لە پێناو ئازاد بوونی پەیوەندیەکان لە جیهاندا.

١٨٦٠/٦/٢٠ ئیبراهیم شێخانی لەدایك بووی شاری دیمەشقی پایتەختی ئێستای سووریا بووە . جێگەی باسکردنە کە ئەم مرۆڤە کوردە دڵسۆزە بۆ عەرەب و ئایینی ئیسلام لەماوەی ژیانی خۆی لە پێناو ئەو دوو ئامانجە تێکۆشاوە . ئیبراهیم شێخانی بەشداری لەشۆڕشی سووریا کردووە تا کۆتایی لە ساڵی ١٩٣٨ ، چووە ریزی شۆڕشگێرانی فەلەستین دژی ئیسرائیل کە لە تەمەنی ٧٠ ساڵیدا بووە .

ئەم مرۆڤە کوردە لەدونیا هیچی نەویستووە تەنیا جیهاد لە پێناو خواو نەتەوەی عەرەب ، تاکوو لە جەنگی رۆژهەلاتی وولاتی ئوردن لە ١٩٣٩/٢/٢١ دەکووژرێ و دانیشتووانی شارۆچکەی – عەجلون – هەر لەوێ بەخاکی دەسپێرن .

تێبینی :– ئەم مرۆڤە کوردە هەرچەند ناوی ئیبراهیم شێخانی لە خۆناوەو هەوڵکانی لەدژی کوردو خاکی داگیرکراوی بووە ، نەك خۆبەختکردن لە پێناو کوردو کوردستان .....؟.

١٨٦٠/٧/١٥ لەدایك بوونی یاسا ناس و دبلۆماتکارو رامیارو رۆژهەلاتناس وشووێنەوارناس و پلاندانەری ئەلمانی – ماکس فۆن ئۆینهالم – لە شاری کۆلن لەئەلمانیا ، لەخێزانێکی بانکدارکە خێزانەکەی خاوەنداریەتی بانکیان هەبووە ، کە لە سەدەی هەژدەم ئەو بانکەی دایمەزراندبوو لەلایەن باپیرە گەورەی کە لەو کات بانکەکانی وەبەرهێنان لە ئەلمانیا ، کە تاکوو ئێستاش لە بووندا هەیە لە وولاتەکەدا .

هەروا ماکس فۆن خووێندنی یاسای لەزانکۆی ستراسبوگ لە ساڵی ١٨٧٩ تەواوکردیە کە ئەو کاتە بەشێك بوو لە ئەلمانیا ... هەروا لە ساڵەکانی ١٨٨١ –١٨٨٣ لەزانکۆی بەرلینی پایتەختی ئەلمانیای خووێندووەو لە مانگی /١٨٨٣/٢ لە تاقیکردنەوەی نێوو دەووڵەتی سەرکەووتنی بەدەست هێنا . لەمانگی /١٨٨٣/٣ بروانامەی دکتۆرای لەیاسا بەدەست هێناوە لە زانکۆی – کوتنجن – دوای ئەوە زمانی عەرەبی زۆر بەباشی فێربووە بەهۆی خووێندنی

لەلای مامۆستای پسپۆری زمانەوانی لە تەمەنی لاویەتیدا .
بۆ یەکەم جار هەڵسا بەگەشتێك بۆ ڕۆژهەڵاتی تورکیاو میسر لەساڵەکانی ١٨٨٣ – ١٨٨٤ و لەساڵی ١٨٨٦ گەشتی بەرەو وولاتی مەغریب ئەنجامدا .
بەر لەوەش بەسەردانێکی زانستیانەی گەوورە لە نێوان ساڵەکانی ١٨٨٢ – ١٨٨٣ سەردانی هەرێمی شامی کردووە و هەر لەو سەردانەیدا بەرەو بەسرە کۆچی کردووە ، کە بە ناو خاکی باکوورو باشووری کوردستان تێپەڕیووە و دوایی بەرەو هیندستان و دوایی بەرەو ژێر دەستەکانی ئەراشیای نویٚ لە ڕۆژهەلاتی ئەفەریکیا . لە گەرانەوەیدا کتێبێکی بەناوی – لەدەریای سپی بۆ کەنداوی فارسی – داناو بڵاویکردەوە کە لە دووبەش پێکهاتبووئەویش:-
یەکەمیان:- لەساڵی ١٨٩٩ بەچاپی گەیاندو بەشی دووەمی لە ساڵی ١٩٠٠ بەچاپی گەیاندووە ، لەساڵی ١٨٩٥ گەشتێکی بۆ شاری ئەستەمبوڵ کرد و لەو گەشتەیدا چاوی بەسوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم کەوت . لە ساڵەکانی ١٨٩١ – ١٩٠٦ کوونسل بووە لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر . لەو ماوەیەدا زیاتر لە ٥٠٠ یاداشتی هەمەجۆری بۆ وولاتەکەی نووسیووە لەهەموو بوارەکانی کارمەندایەتیدا .
لەو ماوەیەشدا پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ تورك و عەرەب ئەنجامدا . لە ساڵی ١٨٩٩ شووێنەواری لە ڕۆژهەلاتی سووریا لە گردی حلف دۆزیووەتەوە کە دەکاتە ڕۆژئاوای کوردستانی ئێستای بەسووریا لکێنراوە ... لە ساڵی ١٩٠٢ بووە بەرپرسی دامەزراندنی هێڵی شەمەندەفەر لە نێوان شاری بەغداو شاری بەرلین ، بە نووێنەری ئەلمانیا بەشداری لەکۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسی چوارەم کردووە لەجەزائیر .
لە ساڵی ١٩٠٨ بەشداری لەکۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسی کردووە لە شاری کۆبینهاگنی پایتەختی دانیمارك . لە ساڵی ١٩٠٩ دەستی لەکارەکانی کێشاوە ، لەماوەی ژیانیدا ماکس فۆن زیاتر لە ٢٧ بەرهەمی هەمەلایەنەی دانراوەکانی هەبوو ، لە هەموو بوارەکانی ڕامیاری و یاسایی و شووێنەوارو ڕۆژهەڵاتناسی و چەندین بابەتی دیکەدا .
لە گەڵ ئەوەشدا بەژداری تەواوی کردووە لە لێژنەکانی دیاریکردنی سنووری نێوان سووریاو ئێراق و ئێران و تورکیا لە دوای دابەشکردنی کوردستان لە نێوان ئەو وولاتانە بەپێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ . ئەم

مرۆڤـە بـەردەوام بـوو لـەکارە هەمـەجۆرەکانی تـاکوو کۆچـی دوایـی لـە ١٩٤٦/١١/١٥ لەشاری لانشتن لە ئەڵمانیا کرد هەر لەو شارەش نێژرا .

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی /٣

## ١٨٦١

١٨٦١/٢/١٩ سەرەتای دەست پێکردنی شۆڕشی بورژوازی لە ڕووسیای قەیسەری ، بە لە ناو بردنی وردە وردەی ڕژێمی دەرەبەگایەتی لە ڕووسیا ... لە هەمان کاتدا بە سەرهەڵدان و دروست بوونی پارتو ڕێکخراوو گرووپی ڕامیاریو نەتەوایەتیو نیشتمانیو چینایەتی لەم وولاتەدا ، دژی چەوسانەوەو بازرگانی کردن بە مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە لە ولاتەکەو هەنگاوونانی بەرەو وولاتانی جیهان .

١٨٦١/٤/١٢ بەرپابوونی شەڕی ناووخۆیی ئەمەریکا لە نێوان وویلایەتەکانی باشوورو وویلایەتەکانی باکوور ، کە ئەم شەڕە ناووخۆییە بۆ ماوەی چوارساڵ بەردەوام بوو لە وولاتەکەدا .

ئەویش وویلایەتەکانی باشوور ، کە لە ١٥پانزە وویلایەت پێکهاتبوون و داوای سەربەخۆیی ناوخۆیان دەکرد، لە سەر ئەوبنەمایەی کە مافی خۆی بوو ، کە دان بەیاسای قەدەخەکردنی دیلایەتی - عبید- نەکات . کە وویلایەتەکانی باکوور بەردەوام بوون لە هەڵگرتنی رژێمی دیلایەتی لە ژێر دەسەڵاتی سەرۆکی ئەمەریکا - ئیبراهام لینکۆڵن- ، لەو کاتەی کە وویلایەتەکانی باشوور ناووزەندبوون بە وویلایەتەکانی هاوپەیمان ، یاخوود جیاکەرەوەیی . کە حکوومەتێکی پێکهێنا بە سەرۆکایەتی جیفرسۆن دافیزو داوای کرد بە مافی جیابوونەوە لەو یەکیەتیەی کە لە نێوان باکوورو باری ئەمەریکادا هەبوو لە وولاتەکەدا .

١٨٦١/٦/٦ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان عەبدولمەجید خانی دووەم لە تەمەنی/ ٤٠ چل ساڵیدا کۆچی کردو ماوەی دەسەڵاتدارێتی لە سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ٢٢ ساڵو نیوو بوو ، کە ئەو نیشانی مەجیدی لەسەر دراوی عوسمانی داناو لەدوای خۆی براکەی بووە سوڵتانی عوسمانی لە سنووری ئیمپراتۆریەتەکەدا .

١٨٦١/ ٧ / ٩گەر بگەڕێینەوە بەر لە مێژووی زایینی و داگیرکەرانی مەگۆل و عوسمانی و ئیسلامی ... زەویەکانی کە کەوتوونەتە نێوان شاری کووتی رۆژهەڵاتی

بەغداو قەزای بەدرەی باکووری شاری کووت ، دانیشتووانی کەم بووە بەهۆی کەمی ئاو لە ناوچەکەدا .
بەڵام دانیشتووانی کورد تاکوو دامەزراندنی دەوڵەتی ئێراق لە ساڵی ۱۹۲۰ و بەر لەسەردەمی رژێمی بەعسی لە ئێراق دانیشتووانی کورد لەو شارە بە ۷۰٪ مەزەندە دەکرا بە پێی ئامارەکانی کە کوردی لوڕ دانیشتووانی رەسەنی ئەم شارەو دەوررووبەری بوونە . کە ئەمەش نووسەری بەناوبانگ یەعقوبی لە جووگرافیای عەرەبی پێشوو بە – العجم – و لە سەدەی نۆی زاینی لە – کتابی وولاتان – ل/۷۹ کە دەڵێ :–
واست – واتە شاری کووت – دووشارە لە سەر هەردوو بەری زێی دیجلەی رۆژهەڵاتی کۆن و شاری رۆژئاوا ، کە پردێك لەنێوانیان هەیەو دانیشتووانی ئەم دووشارە چۆڵ بوونە لەعەرەب و عەجەم – واتە عەرەب و فارسی تیا نەبووە تەنیا کورد نەبێت .
هەروا عەبدورەزاق حوسنی دووپاتی ئەوە دەکاتەوە لە نووسینەکانیدا . لە ئێراقی کۆن و نویێ لە ل/۱۹۵ . مەبەستیش لەعەجەم لەدوای بەکوردی ئێرانی هاتووە . هەروا لەشارۆچکەی عەزیزیە و سووێسرەو چەندین جێگەی دیکە . کە سووێسرە – لە سورایەتی هاتووە و ناوێکی کوردیە لە بەر ئەوە سوێسرە ووشەیەکی عەرەبی نیە . هەروا عەباسی عەزاویش لە کتێبی عەشیرەتەکانی ئێراق کوردی لاپەرە /۱۸۷ دووپاتی ئەو راستیانە دەکاتەوە . لە بەر ئەوەی دانیشتووانی شاری عەلی غەربی ۹۵٪ و عەلی شەرقی ۷۰٪ کوردن و لەزمان و نژاد و ژیانی کۆمەڵایەتی و هەستی نەتەوایەتیان ، کە دەکەونە رۆژئاوای زێی دیجلە .
هەروا شاری عمارە ۳۰٪ دانیشتووانەکەی کوردبوونە , عەباس عەزاوی لەمێژووی ئێراق ج/۸ ل/۱۳ دەڵێ :–
لە ساڵی ۱۲۷۸ شاری کووت دروستکراو دانیشتووانەکەی لە عەشیرەتی – دووزاوە – بووە ، لە للوڕە فەیللیەکان و چەندین عەشیرەتی دیکە و حکوومەتێکیان لە شارەکە دامەزراندووە ... هەروا شارۆچکەی شێخ سەعد کە سەر بەقەزای عەلی غەربیە ولە سەر سنووری قەزای بەدریە ، کە رێژەی دانیشتووانی ناحیەی شێخ سەعد ۷۵٪ کوردبوونە .
هەروا دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە ئەم گەرەکانەی شاری عمارە بەم شێووە

بووه ، گەرەکی حوسین ۳۰٪ و گەرەکی مەحمودیە ٦۰٪ و گەرەکی فاو ۷۰٪ و سەرای ۲۰٪ و ماجدیە ٤۰٪ و جەدیدە ۱۰٪ ، و ، هەروا ریژەی کورد لە ناحیەی کەملا ۲۰٪ و ، هەروا ناحیەکانی میسان و مەجەر هەن ، کە سەر بەقەزای قەلای سالحن .

هەروا لە پاریزگای دیوانیە دانیشتووانی کورد زۆرن کە لە عەشیرەتەکانی شیخ بزینی و هەماوەند و دزەیی پیك هاتوون .. هەروەك عەباس عەزاوی لەکتابی عەشیرەتەکانی کوردی لە ئیراق لە لاپەرە /۱۷۸ – ۱۸۸ دووپاتی ئەو راستیانە دەکاتەوە کە عەشیرەتەکانی .

۱- ال عمران – العرجان – البوودریعی – البوومـوونس – البوتـالوو – کە دەلێ ئەمانە لەعەشیرەتەکانی شیخ بزینین .

۲- البوعنگرد – البووصـفر – البـووهنردل – ال بـشیر – البووهجـوول – البووموس – ئەمانەش لەعەشیرەتی هەماوەندن.

۳- البووعبید – البووعوودە – البووحاجی هادی – البوو عباردە – البوو عەبدوالـسید – البـوو حـاجی حـسین – البـوو مهیـدی – ئەمانـەش لەعەشیرەتی دزەیین .

ئەم عەشیرەتانە هەمووی تەعریب کراون لەلایەن رژیمە یەك لەدوای یەکەکانی ئیراق ، بەرلەوانیش لە ریگەی فتووحاتی ئیسلامی و مەگۆلی و عوسمانیدا . واتە لە هەموو پاریزگاکانی ناوەندو باشووری ئیستای ئیراقی بە زۆر دروستکراو ، کورد دانیشتووانی بووە لە گەڵ فارسی و ئارامی و نەتەوەکانی دیکە ، بەر لە هاتنی و دوای هاتنی مەگۆل و ئیسلام و عوسمانی و تاکوو ئیستاش کورد پەرت و بلاون لە ئیراق .

بە هۆی بە عەرەب کردن و داگیرکردنی نژاد و زمان و داب و نەریتی کورد بەرەو نەمانی هەنگاوی پینراوە لەهەموو بوارەکان ، لە لایەکی دیکە دەسەلاتدارانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەهەریمی باشووری کوردستان بەردەوام هەولی لەناوبردنی کوردیان داوە ئەویش بەدەربەدەرکردنی عەشیرەتی هەماوەند ، لە سالی ۱۸۸٦ لەپاریزگای کەرکوك بەرەو شاری تەرابلسی وولاتی لیبیای ئیستا .

۱۸٦۱/۱۲/۱۲بەپیی ریکەووتنامەی هاوپەیمانی لە نیوان بەریتانیاو ئیسپانیا، هیزەکانی سووپای ئیسپانیا هیرشیان کردە سەر شاری – ڤیراکروز– ی مەکسیکی ،

دوای ئەویش هێزەکانی سووپای فەرەنساو بەریتانیا هێرشیان کردە سەر وولاتی مەکسیك ، دوای چەند مانگێك ، واتە لە مانگی/١٨٦٢/٤ بەریتانیاو ئیسپانیا لە پەیمانەکەی نێوانیان دەرچوون بە هۆی سەرهەڵدانی کێشە لە نێوانیاندا .

## ١٨٦٢

١٨٦٢/١/٢٤ لەدایك بوونی نووسەرو رۆمانووس و نەخشەسازی بە ناوبانگی ئەدەب خاتوو – ئێدیس وارتۆن – لەخانەوادەیەکی دەوڵەمەندی شاری نیۆرکی ئەمەریکا ... ئەم شاعرە هەر لەسەرەتاوە پێنووسەکەی بەهێمنی و ووردی دەستی بەکارەکانی خۆی کردووە . لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا چەندین کۆمەڵە هەڵبەست و چیرۆکی لە ژمارەیەك بڵاوکردۆتەوە لەرۆژنامەکانی شاری نیورۆك.

لە ساڵی ١٨٨٥ شوو بەئێدوارد وارتۆنی دەوڵەمەند دەکات ، کە پانزە ساڵ لەخۆی گەورەتر دەبێ ، کە ئەمەش بووە هۆکاری رووخاندنی نووسینەکانی و دەست کردن بە گەشتیاری ... لە ساڵی ١٨٧٩ یەکەم پەرتووکی بە سەرکەووتوویی بەیارمەتی –بیر – ی هاورێ وئەندازیارێکی پیشەسازی بەناوی ... دکتۆری ماڵەکان ... بڵاودەکاتەوە ، لەساڵی ١٩١٠ چیرۆکی – پیاووخێوەکانی – بڵاودەکاتەوەو لەگەڵ ئێدوارد وارتۆنی هاوسەریشی دەچێتەوە فەرەنسا .

لەوێ پەیوەندیان تێك دەچێ و لە یەك جیادەبنەوە . لە ساڵی ١٩١١ کورتە چیرۆکە بەناوبانگەکەی بەناونیشانی – نیسان مرۆم – بڵاودەکاتەوە... ئەم نووسەرە لەکارەکانی بەردەوام دەبێت تاکوو لە ١٩٣٧/٨/١١ کۆچی دوایی دەکات و لەتەك والتەر بێری ئاشقی دەنێژرێت لە وولاتەکەدا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /١ .



١٨٦٢/٣/٩ شـەڕی کەشـتی زرێپـۆش بـە نـاوی Lrenclads لـە نزیـك وویلایـەتی ڤرژینیـا ، کـە یەکـەم بـە بـەکارهێنانی کەشـتی جـەنگی بـوو لـە شـەڕی نـاوخۆی ئەمـەریکا لە نێوان هێزەکانی سووپای کونفردرالی و سووپای یەکگرتووەکان بەکاربێت لە وولاتەکەدا .

١٨٦٢/٥/٤ یەکەمین دەنگووباسی بەرکەووتووانی مینرێژکراو بلاوبووەوە . شایانی باسە مێژوونووسێکی سەربازی ئەلمانی مێژووی دروستکردنی مین دەگەڕێتەوە بۆ سـەدەی هـەژدەم و بـە مـینی فریـووی ناوزەنـد کـردووە . لـە کاتێکـدا ئەندازیارێکی ڕووسیای قەیسەری لە سالی ١٨٥٥ توانی دیزاینی مینی دژە کەسی ساچمدار بکات .

هەرلەو کاتەدا شووێنەوارناسی چینی لە باکووری ئەم وولاتە لە سالی ٢٠٠١ – ٢٠ مـینی دۆزیـەوە ، کـە مێژوویان دەگەرایـەوە بـەر لـە ٦٠٠ سـال ... ئـەم هۆکارانـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ شـەڕە ناوخۆییـەکان وشـەڕەکان لـە نێـوان وولاتـانی دراوسـێی یـەکتری و ناوچـەیی و هـەرێمی و ، هـەروا شـەڕەکانی ئیمپراتۆریەکان و ، جەنگەکان لەجیهاندا .

بە تایبەتی لە هـەردوو جـەنگی یەکـەم و دووەمـی جیهانیدا ... کە بووە هـۆی چاندنی مینی کەسە کووژی و تانك و ئۆتۆمبیلە سەربازیەکان و مەدەنیەکان چ دژی ڕژێمە داپلۆسێنەرەکان و چ دژی جوولانەوەی رزگاریخوازی میللەتان لە وولاتە جیاجیاکانی جیهان .

کـە ئەمـەش بووەتـە هـۆی چـاندنی بـە هـەزاران ملیـۆن مـین و گیـان پـێ لـە دەستدانی بەهەزار کەسی بێ تاوان لە جیهان .

کــه کوردســتانیش یــەکێك بــووه لــەو نیــشتیمان و ناوچــه داگیرکرانــەو
گــەمارۆدانی جوولانەوه نیـشتیمانیەکەو یەك لەوانـه ، چـاندنی مـینی دژ بـ
هێزه چەکدارەکانی ئەو جوولانەوه رزگاریەو گیان پێ لـه دەسـتدانی بەهـەزار
هـاوولاتی کـوردو شەهیدبوونی لەلایـەن رژێمـه یـەك لـه دوای یەکـەکانی ئـەو
وولاتانەی که کورد و نیشتیمانی کوردیان به سەردابەش کراوه داگیر کراو
و وولاتەکانیان لیّ پێکهێنراوه وەك .
ئێـران و ، تورکیـاو ، ئێـراق و ، سـووریاو ، رووسـیای یـەکگرتوو ، تـاکوو
ئێستاش ئەم کاره نەبراوەتەوەو ئاسەواری هەر ماوه لەسـەرخاکی کوردستا
له کێشووەرەکەدا .

١٨٦٢/٨/٢٩ لـه سەرەتای نەخشەکێشان و چاپکردنی دراوی دۆلاری ئەمەریکی کە رۆڵـ
بنەرِتی و سەرەکی هەبووه وهەیه له هەموو بواره جیاجیاکاندا ، به تایبـەتی
له بواری ئابووری له به هێز کردنـی ژێـر خـانی ئابووری ئەمـەریکاو وولاتـان
دیکەی جیهاندا .
که ئێستا هەموو وولاتانی جیهان بیّ جیاوازی مامەڵە لەگەڵ دراوی دۆلار
ئەمــەریکی دەکــەن ، کــه هێمــای دراوی جیهــانی بــەخۆوه گرتــووه لەمامەڵـ
پێکردنی بەتایبەتی له بواری بازرگانی لەجیهاندا .

## ١٨٦٣

١٨٦٣/١/١ شـازدەمین سـەرۆك کۆمـاری وولاتـه یکگرتووەکـانی ئەمـەریکا لـه بریـارێکی
مێژوویی و چارەنووس سازیدا به ئازادی رەش پێستەکان ... که ئەم بریار
بـووه هـۆی هەڵوەشـاندنەوەی هـەموو جوازیـەك لـه نێـوان رەش پێـستەکان و
سپی پێستەکان و رەگەزه جۆراو جۆرەکانی دیکه لەژێر یاسایەکی یەکسا
لەو وولاتەدا.



١٨٦٣/١١/٢٦ دامەزراندنی ئەو کەرنەڤالە وەرزشیە گەوورە جیهانیەی کە هەموو چوار ساڵ جارێك ئەنجام دەدرێت ... یەکیەتی تۆپی پێی ئینگلیزی .

شایانی باسە یەکەم یاری فەرمیش لە ١٨٧٢/١١/٣٠ لە نێوان هەڵبژاردەی ئینگلتەراو ئیسکۆتلەندە ئەنجامدرا ، کە یاریەکە بێ گۆڵ کردن کۆتایی هات لە یاریگای وەرزشی وولاتەکەدا .

## ١٨٦٤

١٨٦٤/٨/٢٢ مۆرکردنی رێکەووتنامەی نێوودەوڵەتی لە شاری ژنێف تایبەت بە باری تەندروستی سەربازە برینداره‌کانی جەنگی نێوان وولاتانی شەڕکەر لە ناوچەو هەرێمەکانی جیهان ، بە تایبەتی لە شەڕە گەورەکاندا .

١٨٦٤/٨/٢٢ مۆرکردنی رێکەووتنامەی شاری ژنێف ، کە بەندە بە باشکردنی باری زامدارو نەخۆشیەکانو تووشبووەکانی گۆڕەپانی جەنگ ، کە لە دوای مێژووی ئەو رێکەوتنەش چەندین هەموارکردن لە سەر ئەورێکەووتنامەیە کراوە ، لە پێناو بەرەوپێش بردنی باری دەروونی و تەشەنەداری نەخۆشیە هەمە جۆرەکان ، کە دواگۆڕینیش لەو رێکەووتنامەیە کە لە ١٩٤٩/٨/١٢ بووە لە جیهان .

١٨٦٤/٩/٢٨ دامەزراندنی یەکەم رێکخراوی ئومەمیەت ، واتە نیوونەتەوەیی، لە نێوان بیروبۆچوونەکانی سۆشیالیستی و تێکدەرو بەرەلایی و لیبرالیەکان لە نووێنەری ١٣ وولاتی ئەوروپا و ئەمەریکاو ئەڵمانیای یەکگرتوو بە سەرکردایەتی - ئۆگست بیبڵ - فیلهیلم لیبکنیشت- کە کارڵ مارکس پرۆگرامی ئەورێکخراوە ئومەمیە یەکەمەی داڕشتبوو ، بەپێی بارودۆخی

ئەوکاتو ئەو سەردەم ، کە لە دوای ساڵی ١٨٧٠ ، فریدریك ئینگلش خۆی بووە سکرتێری گشتی ئەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتیە لە جیهاندا .

## ١٨٦٥

١٨٦٥/١/٢٨ لە دوای دامەزراندنی تۆڕی تەلەگراف ، واتە ئامێری پەیوەندی ، لە ویلایەتی بەغدا ، کە یەکەم ئاخاوتن بەتەلەگراف کرا ، لە نێوان شاری بەغداو بەسرە بوو، دوای ئەوە لەگەڵ شاری خانەقینی باشووری کوردستانو دوایی بەرەو ئێران ، ئەویش بە هۆی بوونی کۆمپانیای دامزراندن بە هێلی ئاسنی شەمەندەفەرو کۆمپانیای نەوت لە ڕۆژهەلاتو کێشووەری ئاسیادا .



١٨٦٥/٤/١٤ تیرۆرکردنی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا – لینکۆڵن – ئەویش بە هۆی شەڕی بەردەوامی ناوخۆیی لە نێوان دانیشتووانە جیا جیاکانی ویلایەتەکانی باشوورو باکووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا .
کە ئەم کارە ش بە هۆی شەڕی ناوخۆی ئەنجامدراو بوو لە ئەمەریکا ، کە ماوەی چوار ساڵی خایاند .

١٨٦٥/٥/٢٧ کەسایەتی ڕووناکبیرو نووسەرو ئەدیبی کورد – ئیبراهیم عاسم ئیبراهیم حەیدەری لە پارێزگای هەولێر لە باشووری کوردستان چاوی بە جیهان هەلهێناوە.



جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ئەم کەسایەتیە لە بنەماڵەیەکی ناسراوی خاوەن زانست و ئەدەب بوونەو شاعیرو نووسەر بووە ... شێخی ئیسلام بووە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و وەزیری ئەوقاف بووە لەحکوومەتی شایەتی لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئێراق ... ئەم کەسایەتیە دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی حەیدەریەکان لە پارێزگای هەولێر لە هەرێمی باشووری کوردستان .

لە دوای تەواوکردنی خوێندن لەو کات بڕوانامەی وانە گووتنەوەی بەدەست هێناوەو بۆتە قازی لە شارۆچکەی زاخۆ بۆ ماوەی دوو ساڵ . دوای ئەوە چۆتە شاری ئەستەمبوڵی تورکیا ... دەستی کردووە بە خوێندنی ماف و بڕوانامەی پارێزەری لەماف بەدەست هێناوە ... ئەم کەسایەتیە لە چەندین پلەو پایە کاری کردووە بەهۆی لێهاتوویی و توانای زانستی و ئەدەبی لەوانە:-

هەروا سەرۆکی دادگای بازرگانی لە شاری جدە ... داواکاری گشتیی لەمووسڵ - سەرۆکی لێژنەی خێرخوازی باڵا لە ساڵی ١٨٩٨... ئەندامی ئەنجوومەنی مەعاریف لەشاری ئەستەمبوڵ ... بوونی بەقازی لەشاری دیاربەکر لەباکووری کوردستان لە ساڵی ١٩٠٦ .

دوای ئەوە بووەتە شێخی ئیسلام لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٨ . هەروا چەندین پلەوپایەی دیکەی پێ سپێردراوە . لە دوای گەڕانەوەی بۆ ئێراق ، هەڵبژێردرا بە ئەندامی ئەنجوومەنی دامەزرێنەر لە لیوای هەولێر لە ساڵی ١٩٢٤... دوای ئەوە بۆتە وەزیری ئەوقاف لە رژێمی شانشینی لە ساڵی ١٩٢٤ - ١٩٢٥ ، لە ساڵی ١٩٢٥ بەئەندامی ئەنجوومەنی ئەعیان دامەزراوە تاکوو لە شاری بەغدا لە ١٩٣١/١٢/١ کۆچی دوایی دەکات ... ئەم کەسایەتیە

چەندین دانراوی لەدوای خۆی جێ هێشتووە لەوانە :- تأريخ التصوف لدي الفرق الاسلاميه .

سەرچاوە :- اعلام الكرد ١٦٣/١٦٤ . معجم المؤلفين ٣٧/١. الاعلام الشرقيه ٤٩/١



١٨٦٥/٥/٢٧لــە دوای تیرۆرکردنــی ســـەرۆکی ئەمــەریکا- لینکـۆڵن- ، - ئەنـدرۆ جۆنـسۆن - بـە سـەرۆکی ئەمـەریکا هەڵبژێردرا .

کە لە بنچەدا دانیشتووی باشوورو لە پارتی دیموکراتی بوو ، لە هەمان کات لێبووردنی گشتی ڕایگەیاند ، کــە هــەموو ئەفــسەرە کۆنــەکانی گرتـــەوە کـــە لـــە ســـوپای جیابوونەوەی باشوور خزمەتیان کردبوو دژی باکوورییەکان لە وولاتەکەدا .

١٨٦٥/٥/٢٧دامەزرانـدنی ڕێکخـراوی لاوانـی عوسمـانی لـە شـاری ئەسـتەمبۆڵ ، کـە ئـەو ڕێکخراوەیە بە نهێنیو خواستی بە ڕۆژئاوا کردنی دەسەڵاتی عوسمانی بوو، کە لـەو کاتـە ژمارەی ئەندامانی ڕێکخراوەکە شەش ئەندام بوو تاکوو ساڵی ١٨٦٧ ، بەڵام دوای ئەوە ژمارەی ئەندامانی گەیشتە ٢٤٥ ئەندامو ، لـە دوای ئـەوە بـە هـۆی پاڵەپەسـتۆی وەزیـری عـالی پاشـا لـە سـەریان ، مەڵبەنـدی ڕێکخـراوی لاوان لـە ئەسـتەمبۆل گووسـتراوە بـۆ شـاری پاریـسی پایتـەختی فەڕەنسا .

بــەڵام لــە دوای مردنــی عــالی پاشــا لێبــوودردنی گــشتیان بــۆ دەرچــوو بەگەڕانـەوەیان بـۆ ئەسـتەمبۆل ، دوای ئـەو چـوونە نـاو کۆمەڵـەی ئیتحـادو تەرەقی لە پێناو گەیشتنیان بە ئامانجەکانیان.

١٨٦٥/١٢/٣٠ لـە دایك بـوونی وێنەکێشی فەڕەنسی - هنـری ماتیـسی- کـە بـە مـەزنترین هونەرمەنـدی وێنـە کێش لـە جیهـان دادەنرێن لـە پـال بیکاسـۆو ڤان گۆف لـە جیهاندا .

## ١٨٦٦

١٨٦٦/١٢/٣زانکـۆی ئەمـەریکا لـە بـەیروتی پایتـەختی لوبنـان دەرگاکـانی کرایـەوە بـۆ

خووێنـدکاران بـە خووێنـدنی هەمەلایەنـەی جیاجیـا لـە هـەموو بوارەکـان لـە زانکۆگاکەدا.

## ١٨٦٧

١٨٦٧/٢/١٥ رووناکبیرو زانای ناوداری پرووسی و جیهانی – دۆستویفسکی– بە دوای کە سێدا دەگەڕا ، کە ڕۆمانەکانی بۆ بەچاپگەیاندن بگەیەنێ، ئەوە بوو لەگەڵ ئافرەتێکی تەمەن ١٩ ساڵ بەیەکگەیشتن ، کە ناوی – ئانا ستیستکین – بوو ، لەدوای ماوەیەکدا بەرلە وەرگرتنی رۆمانە دەستنووسەکەی ، هەردووکیان بەیەکـەوە کاریـان دەکـرد ، کـە ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی پەیووەنـدیان بەهێزبێتو لە ئەنجام بوونە هاوسەری یەکتری... ئەم کارە خێری تیابوو لە ماوەی دۆستایەتیە کەیان .

١٨٦٧/٣/٣٠ وویلایەتـە یـەککرتووەکانی ئەمـەریکا هـەرێمی ئەلاسـکای لـە رووسـیای قەیسری بـە پارەیـەکی خـەیاڵی کـڕی و خستیە سـەر وولاّتەکـەی بـە نـاوی وویلایەتی ئەلاسکا لە ئەمەریکادا .

١٨٦٧/٥/٥ نووسەرو شاعیری کورد – ئیبراهیم رەمزی – لە شاری فیومی وولاّتـی میسر چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .

جێگـەی باسـکردنە کـە بـاوکی رەوانـەی وولاّتـی میـسری کـردووە لـەکاتی دەسەڵاتی محەمەد عەلی پاشا ... دوای ئەوە هەڵسا بەدەرکردنی گۆڤارێك بە ناوی – فیووم – ی هەفتانەو لە هەمان کات مێژووی – فیوونی – لـەکتابێك دانـا ... دوای ئـەوە بـەرەو پاریـسی پایتـەختی فەرەنسا بەرێکـەووت ، دوای ساڵێك زیاتر گەرایەوە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر .

لـەدوای گەرانـەوەی گۆڤـارێکی دەرکـرد بـەناوی – ئـافرەت لـە ئیـسلام – داو هەروا رۆژنامەی – ئەلتەمەدن – ی دەرکرد ... هەروا دەزگایەکی بۆ پەرەپێدان و دروستکردنی پیتـەکانی عـەرەبی لـە سـاڵی ١٨٩٩ دامەزرانـد . ئەم نووسـەرە کوردە لەکارەکانی بەردەوام بوو تاکوو لە ١٩٢٤/٨/٢ کۆچی دوایی دەکات ، چەندین دانـراوی لـە دوای خـۆی جـێ دێڵـێ وەك:– اصـول الاخـلاق . مبـادئ التعاون ، هەروا شعرەکانی . زمانەکانی عەرەبی و فەرەنسی و تـورکی بەباشـی زانیووە ، جگە لە زمانی کوردی لەوکاتدا .

سەرچاوە:- رۆژنامەی دەستووری میسری ٣٥٧/٥/١٤ - مێژووی فیوون ١١٢/١١٧.

١٨٦٧/٥/٢٧لە دایك بوونی نووسەرو رۆژنامەنووسی ناوداری جیهان – ئارنۆلد بێنێت لەشاری هانلی . کە کەوتۆتە ناوچەی – ستارفۆرد – لە ئینگلتەرە ... لەدوا; تەواوکردنی پلەکانی خوێندنی دەستی کرد بە نووسنی ووتارو چیرۆ بڵاوکردنەوە ... لە ساڵی ١٨٩٣ لە شاری لەندەن بووە سەرنووسەری گۆڤار; ئافرەتان .

لە ساڵی ١٨٩٦ بوو بە بەرێوەبەری تەواوی گۆڤارەکە ... لە ساڵی ٨٩٨ رۆمانی – کابرایەکی باکووری – بڵاوکردەوە ... لە ساڵی ١٩٠٠ وازی لـ بەرێوەبەرایەتی گۆڤاری ئافرەتان هێناو دەستی بەنووسینی بە نرخی کرد ئەم مرۆڤە بەردەوام بووە لە بەرهەم و نووسین ، وەك ئوتێلە مەزنەکەی ناپلۆ و راستی لەبارەی نووسەرەوە و چیرۆکی ژنە سەر سپییەکان و جەستە; ئەدەبی و شمشێری تۆزاوی و چەندین بەرهەمی دیکە تاکوو لە ٩٣١/٣/٢٧ کۆچی دوایی دەکات لە وڵاتەکەیدا .

١٨٦٧/٦/١٩لە دوای ماوەیەکی کەمدا بە لابردنی سەرۆکی مەکسیك – خواریس– لـ دەسەڵات ، بەڵام لە دوای گەڕانەوەی بۆ دەسەڵات بە ئارەزووی خۆی سەرۆکم مەکسیك – ماکسیمیلیان– ی لە دەسەڵات لاداو لە ئەنجام لە سێدارەیدا ، ك بارودۆخی مەکسیکی بەرەو زیندووکردنەوەی رژێمی کۆماری مەکسیکی بر بەرێووە لەووڵاتەکە.

١٨٦٧/٦/٢١شاندێکی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی سەردانی فەرەنساو بەریتانیا بەلـژیکاو نەمساو مەژەری کرد ، لە ماوەی شانزە رۆژدا ئەویش لە ئاکام دەرچوونی والی خدێوی ئیسماعیل پاشابوو لە هەوڵەکانی بۆ کردنی میسر ب پارچەیەك لە ئەوروپای بەرەو سەرمایەدری لە وڵاتەکەدا .

١٨٦٧/٦/٢٢سوڵتانی عوسمانی سوڵتان عەبدولعەزیز لەگەڵ شاندێك گەیشتە پاریس پایتەختی فەرەنسا ، لە سەر داوای ئیمپراتۆر ناپیلۆنی سێیەم ، ئەویش لـ پێناو بەشداری کردنی لە پێشانگای جیهانی، کە هەموو شانشین ئەمیرەکانی وولاتانی جیهان ئامادەی ئەو پیشانگایە بوون ، یەك لەوا ئیسماعیل پاشای والی میسر ، کە لە نژاد ئەو بنەماڵەیە کوردن خەڵك

باکووری کوردستانن .

١٨٦٧/٧/١ بەپێی پەیمانی پاریس دانی تەواو نرا بەیەکگرتنەوەی هەردوو کەنداوی لێك جیاکەرەوە ، ئەویش کە کەنداوی بالآو کەنداوی خواروبوون . بە پێدانی مافی سەربەخۆییان ، کە دوای ئەوە نۆفاسکۆشیاو ، نیوبرۆنزدیك ، چوونە ناو دۆمینیۆن لە دوورگەی برنیس ئەردوار لە ساڵی ١٨٧٣دا .

## ١٨٦٨

١٨٦٨/٥/١٤کۆمەڵێك هەنگاوی گرنگ لە ژاپۆن ئەنجامدراو گرنگترینیان ڕاگەیاندنی ئەو پێنج بنەمایە چاکسازیە بوو لە بارەی بەرژەووەندی باڵای ژاپۆن بە نەهێشتنی هیچ جیاوازیەكو بەیەکسانی بوونی مافی هاوڵاتیانو... بە پاراستنی مافی هەموو توویژەکانی گەلی ژاپۆنو ... بەرژەووەندی باڵای نەتەوە پێویستیەکانو ... پاراستنی دابو نەریتو بایەخدان بە زانستی سەردەمی تەکنۆلۆژیا لە هەموو بوارە جیاجیاکان بەتایبەتی لە بواری پیشەسازیدا.

١٨٦٨/٩/٢٦بۆ یەکەم جار لە مێژووی شاری بەغدای ئەوکات ، کە ناووزەند بوو بە وویلایەتی بەغدا ، بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی دامەزرا ، لەپێناو ڕێکخستنی نەخشەی بنەڕەتی شاری بەغداو ڕێك بوونی لە بوارەکانی ئاوەدنکردنەوەو پەرەپێدانو گەشەپێدان .

دوای ئەوە بوو بە پارێزگا ، لەدوای دامەزراندنی دەووڵەتی ئێراق لەلایەن بەریتانیا ، بووە پایتەختی دەووڵەتی ئێراق لەگەڵ دامەزراندنی لەسەر خاکی گەلانی وولآتی نێوان دووزێ – میزوبۆتامیا – بە تایبەتی لە سەر خاکی کوردستان .

لە بەر ئەوەی ئەوکات ناوی دەووڵەتی ئێراق نەبوو ، کە لەژێر دەستی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوو تاکوو دامەزراندنی دەووڵەتی ئێراق لە ساڵی ١٩٢٠ لە ناوچەکەدا .

## ١٨٦٩

١٨٦٩/٣/٨ کۆچی دوایی هونەرمەندو مۆزیکاری بە ناوبانگی جیهانی – بێرلیۆز – لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا ... شایانی باسە ئەم هونەرمەندە مەزنە لە

١٨٠٣/١/١١ لە شاری سانت شاندی فەرەنسا چاوی بە جیهان هەڵێناوە ... لە سەر داوای باوکی درێژە بەخوێندن دەدات تا دەگاتە قۆناخی دووی کۆلێژی پزیشکی و دوایی واز لەخوێندن دێنێ و ڕوو لەکاری هونەری و مۆزیکا دەکات .

دوای ئەوە بەناو وولاتانی ئەورووپادا دەخولێتەوە و لە ساڵی ١٨٢٩ سمفۆنیای نامۆ یان – چەندین وێستگەیەك لەژیانی هونەرمەند –دا دەرژێت و پێشکەشی بەخاتوو – هاییت سیمسون – ی دەکات ، کە زۆر شەیدای دەبێ و دوایی دەبێتە هاوسەری ... لە ساڵی ١٨٣١ خەڵاتی ڕۆمای تایبەت بە ئاواز دانانی پێدەدرێت ، کە هاوسەرەکەی پشتگیری لێدەکات و هونەرەکانی شکسپیر دەبێتە ڕێگەی بەهرەکانی لە ژیانیدا .

لە ساڵی ١٨٥٣ دەست بەدارشتنی ئۆپرای – تەروادیەکان – دەکات و ماوەی ١٠ ساڵی تەواو سەرقاڵی ئەو هونەرە دەبێت ، لە مانگی/٨/١٨٦٢ داواکاری مەزنی خۆی پێشکەش دەکات کە ئۆپرای – پیاتریس ویندکیت – ی ناوەو لە شانۆگەری – گوێم لەگرەکردو کەچی نایبینم – ی شکسپیر وەرگێراوەو لەگەل دەیا کاری دیکەی هونەری مۆزیکاو بەردەوام دەبێت تاکوو کۆچی دوایی دەکات لە وولاتەکەیدا .

١٨٦٩/٤/١٣ سەرکردەی نیشتیمانی شام – ئیبراهیم سلێمان ئاغا هانوو – ناسراو بە – ئەبوو تارق – لە ناوچەی – کفر مارم – لە ڕۆژئاوای شاری حەلەب چاوی بە جیهان هەڵهێناوەلە شارەکەدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ئەم کەسایەتیە کوردیە لە پیناوە گەورەکانی شۆڕشی سەربەخۆیی سووریا بووە ... لە قوتابخانەی شانشینی شاهانی شاری ئەستانەی خوێندووەو بروانامەی ماف لە زانکۆ بەدەست هێناوە . چەندین پلەو پایەی لەسەردەمی ڕژێمی عوسمانی گرتۆتە دەست ... بووەتە قائمقامی یەکێ لە قەزاکانی سەر بە پارێزگای دیاربەکر لە باکووری کوردستان . دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٠٨ گەراوەتەوە شام و هەڵبژێردراوە بە ئەندامی ئەنجوومەنی گشتی لەشاری حەلەب .

دوای هەڵووەشاندنەوەی ئەو ئەنجوومەنە گەراوەتەوە کفرمارم و دەستی بەکاری کشتووکاڵی خۆی کردووە ، لەو کاتەی کە سووپای عەرەب گەیشتۆتە شاری حەلەب لە ساڵی ١٩١٨ گەراوەتەوە شاری حەلەب و هەڵبژێردرا بە

ئەندامی – کۆنگرەی شام – لە شاری دیمەشقی پایتەختی ئێستای سووریا لەساڵی ١٩١٩ .

هەروا ئەندامی کۆمەڵەی عەرەبی بووە بەشێوەی نهێنی . لەو کاتەش هێزەکانی سووپای فەرەنسا شاری ئەنتاکیەکان داگیرکرد ، ئەویش هەڵسا بەدامەزراندنی سووپایەکی نهێنی بۆ دروستکردنی ئاژاوەو سەر لێ شێوواندنی سووپای فەرەنسا کە بارەگای لەشاری حەلەب بوو .

دوای ئەوە سووپای فەرەنسا شارەکانی دیمەشق و حەلەب و دەوورووبەرەکانی داگیرکرد . ئەویش بەوهێزەی کە دایمەزراندبوو ڕووبەرووی هێزەکانی سووپای فەرەنسا بووەوەو سەرکەووتنی بەدەست هێنا بەنازناوی – متەوەکل بلای – پێ بەخشراو گەلانی ئێستای سووریای لەدەووری کۆبوونەوە و ٢٧ شەڕی ئەنجامدا و لەهیچ شەڕێك لەو شەڕانەش نەی دۆڕاند کە ماوەی یەك ساڵی خایاند ، لەو کاتەش گوێی لەراگەیاندنەکەی شەریف عەبدوڵلا حوسین لە عومان بوو ... کە دەیگووت ئێمە هاتووین بۆ ڕزگارکردنی وولاتی ئێستای سووریا .

ئیبراهیم سلێمان ئاغاهانتۆش داوای ڕێکەووتنی لەگەڵدا کرد ، دوای چەندین کاری دیکەو سەرکەووتنی فەرەنسیەکان ... لە ساڵی ١٩٢٨ بووە ئەندامی کۆمەڵەی دامەزرێنەرو دانانی دەستووری سووریا ... ئیبراهیم سلێمان ئاغا هیانوو ، بووە سەرۆکی لیژنەی دەستووری لەکۆمەڵەی دامەزرێنەرو ئەو دەستوورەش لە ساڵی ١٩٣٠ بلاوکرایەوە ... دوای ئەوە چەندین جار لە کاری تیرۆرستی ڕزگاری دەبێ و لە ئەنجام تیرۆرستێك بە ناوی – نیازی کۆسا – لە ساڵی ١٩٣٢ زامداری دەکا و دوای سێ ساڵ واتە لە ١٩٣٥/٤/٥ بەو هۆیە کۆچی دوایی دەکات .

شایانی باسە ڕابەرو دامەزرێنەری دەووڵەتی سۆڤیەت – لینین – لە ساڵی ١٩١٩ چوار نامەی بۆ ئیبراهیم سلێمان ئاغا هانوو نووسیووە ، لە پێناو هاوکاری کردن و بەردەوام بوونی لەگەڵ جووڵانەوەی ڕزگاری نیشتیمانی لەناوچەو هەرێمەکەدا دژی داگیرکەران بەیارمەتی یەکیەتی سۆڤیەت .

نووسەر :– بەداخەوە ئەم کەسایەتیە کوردە لەماوەی ژیانی باسی لە ڕزگاری گەلی کوردستان نەکردووەو ، هەروا لەدارشتنی دەستووری

سووریاش باسی لە ماڤی نەتەوەی کوردی لە سووریا نەکردووە ، لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی سووریاو لکاندنی رۆژئاوای کوردستان بە سووریا و هەتا لە بوارە بچووکەکانی ، کە بەندن بەزمانی دایك و داب و نەریت و کەلتوور ... کە ئەم مرۆڤە لەبنەماڵەیەکی دیاری کورد بوونە لەناوچەی شاری ماردین و ناوچەکانی دیکەی کوردستان.

سەرچاوەکان :– الاعلام الشرقیه ١٣٤/١ – موسوعه اعلام سووریه ٣٩٢/٤ – اعلام الکرد ١٠٠/١٠٢.

١٨٦٩/٩/٢٠ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی یەکەم یاسای ڕاگەیاند بە ناوی – معارف عمومیه – ، –نزامنادسی– کە قۆناخەکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی خوێندنی دەگرتەوە لە ژێر دەسەڵاتەکەدا .

١٨٦٩/١٠/٢ لە دایك بوونی سەرکردەو ڕابەری شۆڕشی هیندستان – مۆهانداس کارامامد گاندی – لە شاری بۆر منداری هیندستان... شایانی باسە کە ئەو بنەماڵەیە ڕۆڵی بنەڕەتی و سەرەکیان هەبووە لە دامەزراندنی دەوڵەتی هیندستان ، کە دووەم وڵاتە لە ژمارەی دانیشتووان و ڕووبەری زەوی ، کە ناسراوە بەکیشووەری هیندی ، بەسەدا نەتەوەو ئایینی جیاجیای لێدەژیێ ، بینەماڵەی گاندی دامەزرێنەری پارتی کۆنگرەی هیندی بوونەو بەدیا ساڵ دەسەڵاتداریێتی ئەو وڵاتەیانکردووە لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .



١٨٦٩/١١/١٧ بە بۆنەی تەواو کردنی کەناڵی سوێس ؛ لە وڵاتی میسردا ئاهەنگێکی دڵخۆشکەری گەورە بەڕێوەچوو بەسەرپەرشتی ئیسماعیل پاشا ، کە لەو کات بری ١٠٠ سەد ملیۆن فرنگ خەرجی ئەو ئاهەنگە بوو ، ئەویش بە پێشکەشکردنی لەلایەن بانکە ڕۆژئاوایەکانی سەرمایەداری لە شێوەی قەرزوو بە قازانجی

بەرزی بێ وێنە ، بەڵام ئەو کەناڵە کاریگەری بێ وێنەی هەبووەو هەیە لە بەهێزبوونی ژێرخانی ئابووری میسرو بوارەکانی دیکە لە هەرێمو ناوچە جیاجیاکان لە جیهان.

١٨٦٩/١١/٢٢ لە دایک بوونی پێشەنگی نووسەرانی فەرەنسی – ئەندرێ گید – لە بنەماڵەیەکی بۆرژوای پرۆتستانتی لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا . لە تەمەنی ١١ ساڵیدا باوکی کۆچی دوایی دەکات و کاردانەوەی لەسەر دەروون و کارەکانی ئەندرێ دەبێ ، سەرەرای ئەوەی کە سامانێکی زۆر لە دوای باوکی بۆ بەجێ دەمێنێ .

لە ساڵی ١٨٨٣ لەگەڵ ئەلبێردلاورانی شێووەکار گەشتێك بەرەو ئەوروپا دەکەن و بۆ جاری دووەمیش لە ساڵی ١٨٨٥ دەچێتەوە ئەم ناوچانە . لە ساڵی ١٨٩١ کتابێك بەناوی – دەفتەرەکانی ئەندرێ ڤالێز – بڵاودەکاتەوەو لەگەڵ چەندین کتێب و پەرتووکی دیکە لە ساڵەکانی ١٩٠٢ –١٩٠٩ –١٩١٨ . دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٢٥ گەشتێك بەووڵاتانی ئەفریکیادا دەکات .

ئەم فەیلەسوف و رووناکبیرە لەکارەکانی بەردەوام بووە تاکوو لە ١٩٥١/٢/١٩ کۆچی دوایی دەکات ... کە نووسینەکانی لە بواری جووڵانەوەی نەتەوەیی و نیشتیمانی و رامیاری و کۆمەڵایەتی و چەوسانەوەو داگیرکردن بووە . لە هەمان کات سەرکەووتووانە کارەکانی بە ئەنجام گەیاندووە لەووڵاتەکەی و لەووڵاتانی دیکەی جیهاندا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی ١/ .

١٨٦٩/١٢/١ لە بڕیارێکی گەریدەو زاناو پرۆفیسۆر – مستردرایك– ئەویش بە رێکخستنی سووڕانەوەی بێتەرجومان – وەرگێڕ– دوور لە کارە کەرو دوور لە بیرنەکردنەوەی لە دووژمنەکانی لە دانیشتووانی هۆزە مەرلەوەڕێنە عەرەبەکان کە بەناویاندا تێدەپەڕی ، لەهەمان ڕۆژ کاروانەکەی بە گەشتێك دەست پێکرد بە دۆڵەکانی– گرندڵ – و دوایی بە دۆڵی – عەربیش– و دوای بۆ سەرچاوەی – قادلی یان قەدیس– دا.

کە ئەمەش لە کتابی ئینجیل ناوی هاتووە ، دوایی ئەوە بەرەو ناوچەی – نەقەب– و دوای بەرەو ناوچەی– جنین– و دۆڵی – جەنائن – ، بۆئەوەی

بگەنــە شــاری قــوودس . ئەمــەش بــە ووردبینیــەتی ڕێكــی لــە مزگــەووتی سەخرەتووللا لەشاری قوودس لە هەرێمی شامدا .

١٨٦٩/١٢/٣١ لە دایك بوونی ڕابەری فۆفیزم و مامۆستای ڕەنگ – هنری ئیمل بێنوامـاتس– لــە شــاری كانۆكــامبرێزی بــاكووری فەرەنــسا . شــایەنی باســە كــە مــاتیس هەڵگری بڕوانامەی یاسا بووە ، لە ساڵی ١٨٩٠ تووشی نەخۆشیەك دەبیَ و لەئاكامی نەشتەرگەری زیاتر لە ساڵێك لەناو جێگا دەكەویَ .

دوای ئەو بار نا لە بارەی لەساڵی ١٩٠١ كارە هونەریە بەراییەكانی خۆی لە سالۆنی پاریس دەخاتە ڕوو ، هەروا ئەم مرۆڤە لەكارە هونەریەكان بەردەوام دەبێت و تا لە ڕۆژی ١٩٥٤/١٢/٣ ، مالئاوایی لە هونەرو هونەر دۆستان دەكا لە جیهاندا .

## ١٨٧٠

١٨٧٠/٢/٧ لە دایك بوونی زانای دەروونناسی و پزیشكی و دانەری زانستی دەروونی تــاك – ئــەلفراد ئــەدلر – لەگەڕەكــەكانی ڤێینــا لــە بنەماڵەیــەكی هــەنگاری جوولەكــە ... خووێنــدنی پزیــشكی لــەزانكۆی ڤێینــا تــەواوكردووەو مۆڵــەتی پزیشكی لە ساڵی ١٨٩٦ بەدەست هێناوە ...كاری پزیشكی كردووە . دوای ئـەوە بۆتـە مەسـحی ، ئـەویش بە وازهێنـانی لـەئاینی جوولەكە . دوای ئـەوە ڕووی لەزانستی دەروونی كردووە لەگەڵ فرویدو هاورێكانی ... دوای ئەوە لـە فرویدو هاورێكانی جیابۆتەوە .

لە دانراوەكەی – دراسە عن دونیە الاعچاو – بۆ یەكەم جار دەركەووتووە : كە لە ساڵی ١٩٠٧ بڵاوی كردۆتـەوەو لـە ڤێینـا و بـەرلین ئـەویش بـە دژایـەتی كردنـی بیری فرویـد . لـە سـاڵی ١٩١٠ مەڵبەنـدی تاقیگـەی دامەزرانـدووە لـە ڤێینـا بـۆ نەخۆشـیەكانی دەروونـی ... لـە سـاڵی ١٩١٢ كتـابی – فی الخلـق المـصابی – بڵاوكردۆتـەوە ... لـە سـاڵی ١٩١٤ گۆڤارێكـی نیـوو دەووڵـەتی لـە سـەر زانـستی دەروونـی دەركـردووە تـاكوو لـە سـاڵی ١٩٣٥ لەگـەڵ چـەندین بابـەت لە ڕۆژنامـەو گۆڤارەكـان و چـەندین دانراوی هـەبووە ... ئـەم زانایـە لـە كارەكـانی بـەردەوام بـووە تـاكوو لـە ١٩٣٧/٥/٢٨ كۆچـی دوایـی كـردووە لـە شاری ئەبردین لە ئسكتلەندا – لە بەریتانیا .

سەرچاوە :- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی /١ .



١٨٧٠/٤/٢٢ لە دایك بوونی رووناکبیرو فەیلەسوف و رامیارینـاس و دامەزرێنـــەری یەکیـــەتی ســـۆفیەت لـــە ڕووســـیا - فلادیمیر ئیلیتش - لینین ، لـــە سمیرسـك لەســەر زێـــی فۆلگـا - کـە نـاوی البـوون بـــــوو ... بـــــاوکی سەرپەرشـتیاری قوتابخانـە باڵاکـــان بـــووە . لــــە بنەماڵەیــــەکی دیــــاری شۆڕشـــگێر بوونــــە . بــرا گەورەکەی لینین - نارودنایی ڤولیا - لەلایەن ڕژێمی قەیسەری ڕووسیا لە سێدارەدراو کاردانەوەی نواند لەسەر دەروونی فلادمیر ... لینین .هەروا لینین لـە سـاڵی ١٨٨٧ چووە کۆلێـژی یاسـا لـە زانکـۆی قـازان ... بـەڵام بەهۆی خۆپێـشاندانی قوتابیـان لەکۆلێـژی یاسـا دەرکـرا لـەمانگی /١٨٨٧/١٢ و بۆ گوندێکی دوور لەشارەکە دوورخرایەوە .

دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٨٨٨ گـەڕاوە قـازان و ماوەیـان پێنـەدا بگەڕێتـەوە کۆلێژەکە . بەهۆی خۆپێشاندان و نارەزایی قوتابیان دژی دەسەڵاتی قەیسەر. لینین لەشۆڕشگێڕێکی میللی بووە شۆڕشـگێڕێکی مارکسی . لـە دوای ئـەو ڕووداوانە خێزانەکەی گوواستیانەوە شاری سمارا لە ساڵی ١٨٨٩... دوای ئەوە لینین چووە کۆلێـژی یاسـا لەزانکۆی پترۆسبۆرگی پایتـەختی ئەوسای ڕژێمـی قەیـسەری لـە ڕووسـیا ... ئـەویش بەدانـەوەی تاقیکردنـەوەکان لەدەرەوەی کۆلێژەکەدا .

لە ساڵی ١٨٩٥ رابەری تێکۆشانی بۆ رزگاری چینی کرێکـارانی دامەزراند . دوای ئەوە هـەموو سـەرکردەکانی ئـەو رابـەرە لـە گـەڵ لینین بەنـدکران . دوای ئازادبوونیان لـە بەندیخانە لینین لە سـاڵی ١٨٩٥ بەرەو ئەوروپا هـەنگاوینا .

له پێناو فراوانکردنی تێکۆشانەکەی و پەیوەندی کرد بەئەندامانی – کۆمەڵی رزگاری کار– لە پێناو گفتوگۆکردن ، بەتایبەت دامەزرێنەری ئەو کۆمەڵەو بووە هۆی بەهێزبوونی پەیوەندی لینین لەگەڵیان لەماوەی دەسەلاتی یەکەمی لە تێکۆشانی ئاشکرای .

لەو کاتەش فریدریك ئینگلش بەهۆی نەخۆشی لەناو جێگاکەی کەوتبوو لەوکاتەش لینین سەردانی ئەوروپای کرد ... ناوزەند بوونی ڤلادمیر ئیلیتش بەلینین لەسالی ١٩٠١ بوو ، بەر لەوەش ناوی – لیزین – تالین – بوو ، کە لەوکاتەی دوورخرابووەوە بۆ ناوچەی سیبیریا ... دوای ئەوە لینین یەکەم نامەی بەناونیشانی – نارەزایی مارکیسە دورخراوەکانی دژ بەبروای ئابوریەکان – بلاوکردەوە لە رۆژنامەی شەرارە ، کەلایەنگرانی لینین دایان مەزراندبوو . لە دوای ئەوە بووە زمانحالی پارتی شۆرشگێری سۆشیالستی لە سالی ١٩٠٠ لە وولاتەکەدا .

دوای گەرانەوەی لە سیبیریا لینین هەلسا بەسوورانەوە لە رووسیا لە پێناو پەیداکردنی لایەنگیری لە رووسیاو ، دوای ئەوە دیسان چووە دەرەوەی رووسیاو بەشداری لەگەل بلاخنۆف کردو بووە لایەنگری لینین لە دەرکردنی رۆژنامەی شەرارەو دامەزراندنی – پارتی کرێکاری سۆشیالستی دیموکراتی رووسی – . کۆنگرەی یەکەم ئەو پارتە لە سالی ١٨٩٨ گرێدراو کۆنگرەی دووەمیشی لە سالی ١٩٠٣ گرێدرا .

بەلام دوای ئەوە ئەو پارتە کەرت بوو بۆ دووبەش کە ، یەکەمیان بەلاشیفە بوو بەسەرکردایەتی لینین و ، دووەمیان مەنشەفیك بوو بەسەرکردایەتی بلاخنۆف . لە ئاکامدا لابالی بەلاشفە بەرەو بەرزبوونەوەو بەهێزبوون هەنگاوینا بەتایبەتی لە دوای رووداوەکانی سالی ١٩١٧ . لە دوای هەولێکی زۆر لە پێناو یەکگرتنەوەی ئەو دوولابالە .

بەلام بێ ئاکام بوو کە لینین لە سالی ١٩١٢ لەکۆنگرەی براگ بە رەسمی رایگەیاند ، کە لابالی بەلشەفیك رێکخستنێکی ناوەندی شۆرشگێرە لە پارتی سۆشیالستی دیموکراتی رووسیدا ... لەو رۆژەی گۆڤاری شەرارە دامەزرا تاکوو کۆچی دوایی لینین ، کە خۆی سەرکردایەتی سۆشیالستی چەپرەوی رووسی لەرۆژی دامەزراندنی پارتەکەی بەشەفیك تاکوو هەلگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهان .

لینین لە نزیك سنووری نێوان نەمسا و ڕووسیا بوو کە نەیدەتووانی بگەڕێتەوە ، کە لە ساڵی ١٩٠٧ لەڕووسیا دوورخرابووەوە تاکوو مانگی ١٩١٧/٣/ ، کە لایەنگرانی لینین توانیان مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامەیەك بدەن بە ناوی – پراڤدا – کە تاکوو هەڵوەشاندنەوەی یەکیەتی سۆفیەتی لە دەرچوون بەردەوام بوو.

/١٠/١٨٧٠ حکوومەتی شانشینی ئیتاڵیا مەرسوومێکی شانشینی ڕاگەیاند ، کە شاری ڕۆمای خستە ژێر دەسەڵاتی ئیتاڵیای نوێ و لە٢٠/١٠ ، ی هەمان ساڵ ڕاپرسیەك بە زۆرینەی دەنگ بڕیاردرا . کە شاری ڕۆمای کردە پایتەختی ئیتاڵیا لە دوای خستنە ژێر دەسەڵاتی خۆی ، کە ئەمەش بووە هۆی ڕشکردنەوەی دەسەڵاتی پاپا ، کە لەو کاتە ڕووبەڕووی دەسەڵاتی پاپا ببووەوە لە ڕۆما ، کە ڕووبەری شاری ڕۆمای ئەوکات ١٨٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشە بوو لەگەڵ زیاتر لە ٠٠٠ ر٠٠٠ر٢ ملیۆن کەس لە دانیشتوانی شارەکەیدا .



١/١٠/١٨٧٠ ئەمیری شاعیران – ئەحمەد شەوقی – لە چاوی بە جیهان هەلهێناوە لە گەڕەکی – حەنەفی – لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر، کە باوکی کوردەو لە تیرەی – شەرکەسیە– و لە بنەماڵەی خدێوویە ، دایکی یۆنانیە ، لە بنەڕەتا بەر لە کۆچرەوی بنەماڵەی محەمەد عەلی پاشا بۆ ناوچەی میسر ، لە پارێزگای دیاربکر – ئامەد– بوونە لە باکووری کوردستان ، کە ئەوکات دیاربەکر ویلایەتێك بووە لە ویلایەتەکانی پێکهاتەی دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی وەك ، ویلایەتی ئەنازۆل و ولایەتی مووسڵ لە باشووری کوردستان .

سەرچاوە :– گۆڤاری عەرەبی ژمارە ٥٦٧ لە مانگی/ ٢/ ٢٠٠٦



/١١/٢٣ شای ئێران شانەسرەدین سەردانی
١٨٧٠ شــاری بەغــدای کــردو لەلایــەن مەدحەت پاشای والی بەغدا پێشوازی لێکرا ، کە لەرێگەی شاری خانەقین بەرەو بەغدا بەرێکەووت ، کە لەوکات – ١٥– هەزار پاسەوان لەگەلێدا بوون ، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە باری ئابووری مەدحەت پاشا گران بکات لەخواردن و ئالیك ، بۆ ئەو هەموو پاسەوان و ئاژلانە . کە ماوەی سێ مانگ لە بەغداو شارەکانی کەربەلاو نەجەف مایەوەو خەرجیەکانی گەیشتە – ٣٠٠٠٠– سی هەزار لیرەی تورکی ئەو کات ، لە ماوەی مانەوەی لە شارانەدا .

## ١٨٧١



١٨٧١/١/١٨ گرێدانی کۆنگرەی – فرسای – لە نێوان وولاتانی هاوپەیمان لەلایەك و وولاتانی شەرکەر لەلایەکی دیکە ، لە هەمان کات بە ڕاگەیاندنی بوونی دەسەلاتی ئیمپڕاتۆریەتی بڕووسیا لە سەر رایخ لە ئەلمانیا .

لە هەمان کات شانشین– ویلیام – ی یەکەم بووە ئیمپڕاتۆڕ لەسەر ئەلمانیاو لە هۆلی مرایا لە فرسای ، کە ئەو کارەش بووە هۆی هەلووەشاندنەوەی

یەکیەتی باکووری ئەڵمانیا، کە ئەویەکیەتیە لە ساڵی ١٨٦٧ دامەزرا بوو لەدوای هێنانە خوارەوەی ویلیامی دووەم لە سەر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتەکەدا.

١٨٧١/٣/١٥ شۆڕشی برژوازی لە ڕووسیا بەرپابوو بە رووخاندنی رژێمی قەیسەری و دامەزراندنی حکوومەتی کاتی ، لینین ئەو هەولانەی لە رۆژنامەکانی سویسرا زانی و گەراوە ڕووسیا بەشەمەندەفەرێك بەناوخاکی ئەلمانیا و فنلندەو سووید ، ئەویش بە یارمەتی برادەرەکانی لە سویسرا ، کە ١٩١٧/٤/١٦ گەیشتەوە شاری پترسیۆرگ و توانی لە ١٩١٧/١١/٧ دەسەلات بگرێتە دەست بەکەتاندنی حکوومەتی کاتی .

بەلام دوای ئەوە لەمانگی /١٩٢٢/٥ تووشی نەخۆشی جەڵتە بوو ... دوای چاکبوونەوەی گەڕاوە سەرکارەکانی لە سەرکردایەتی کردنی دەووڵەت ، بەلام دوای ئەوە لە ئاکامی خووێندنەوەی وتار لە بەرامبەر جەماوەر لە ١٩٢٢/١٢/١٥ بەگووللەیەکی ژەهراوی زامدارکراو دووبارە تووشی نەخۆشی هات تاکوو لە ١٩٢٤/١/٢١ کۆچی دوایی کرد .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە لینین مرۆڤێکی لێهاتوو و زانایەکی توانا داربووە ، لە هەموو بوارەکانی رامیاری و چینایەتی و نەتەوەیی و نیشتیمانی و ئابووری و سەربازی و بازرگانی و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و مافی مرۆڤ و دادپەروەری لە کارو بوارەکانی دیکەی پەیوەست بەژیان و مافی مرۆڤدا ... ئەم رابەرە لەماوەی ژیانی لە بەرهەم و دانراوەکانی بێ وێنە بوو کە بەناوی موختارات بلاوکراوەتەوە لە ٤٩ بەرگدا ، جگە لە چەندین کتابی دیکەی بە تایبەت – المادیە والنقدیە التجریبیە – . لە بوارەکانی فەلسەفەو ئابوورو زانستەکانی دیکەی هەمەجۆرەکان .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢ .

١٨٧١/٣/١٨ بەرپابوونی ڕاپەڕینە مەزنەکەی پاریسی پایتەختی فەرەنسا بە ناوی – کۆمۆنەی پاریس– و کە لە ئەنجام سەرکەووتنی بە دەست هێناو بە پێکهێنانی ئەنجوومەنی کۆمۆنە ، لە ٨٥ ئەندام ، کە ٦٤ ئەندام لەکۆی ٨٥ ئەندامەکە لەلا بالی هێلی سوشیالیستی بوون و ٢١ ئەندامیش

بەرهەڵستکاری ئەو بیرەبوون ، کە لابالی سوسیالیستی لە دوو لایەنی بلانکین و پرۆدۆنیەکان پێکهاتبوون ، لە هەمان کات ١٠ دە لیژنەی کۆمۆنا پێکهێنرا بۆ بەدەست هێنانی زانیاری و دانی بە ئەنجوومەنی بالای کۆمۆنەکەدا .

لە بەر ئەوەی کۆمۆنە دوو ئەنجوومەنی یاسادانان و ئەنجوومەنی جێبەجێکردنی هەبوو کە یەکیان کۆدەکردەوە.... شایانی باسە کە دەسەڵاتی ئەو کۆمۆنە ٧٢ ڕۆژ بەر دەوام بوودەسەڵاتدا ، ئەویش دەسەڵاتی کرێکارو ڕۆشنبیرانی دیموکراتیخوازی فەرەنسا بوو.... لە هەمان کات کۆمۆنەی پاریس بووە تاقیگەو تاقیکەرەوەیەکی زانستی مێژوویی بە سەرهەڵدانی شۆڕشە یەك لە دوای یەکەکانی ، نەك هەرلە فەرەنسا بەڵکوو بگرە لە هەموو جیهان .

کە ئەویش بووە سەرچاوەی پێنووسەکانی نووسەرو ڕۆژنامە نووس و پرۆفیسۆرو فەیلەسوفەکان لە جیهاندا . لە نێوان دوو بیرو بۆچوونی دژ بەیەکتری لە نێوان چەوساوەو چەوسێنەر لە هەموو جیهاندا .

١٨٧١/٥/١٨ لە دوای ٧٢ ڕۆژ کۆتایی هاتن بە کۆمۆنەی پاریس لە بوارەکانی سەربازی و ڕامیاری ئەویش بە شەهید کردنی ١٤٧ سەرکردەو لایەنگیرانی کۆمۆنەو لە دوای ئەو کارەساتە تەرمی شەهیدەکانی کۆمۆنە لە گۆڕستانی – الاب لاتیز– بە خاك شێردران لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا.

١٨٧١/٥/٢١ کەسایەتی ناوداری جیهانی – ئەدۆلف تیار– یەکێك بوو لە دژایەتی کردنی کۆمۆنەی پاریس لە شاری فرسای ، ئەویش بە خەرجکردنی سامانەکانی خۆی و دوای ماوەیەکی کەم حکوومەتی هەلا نۆلە لە شاری فرسای بەهاوکاری سووپای برووسیا هێرشیان کردە سەر پاریسی پایتەختی فەرەنسا .

ئەم کارەش بە شێوەیەکی دڕندانە ئەنجام درا کە زیاتر لە مانگێکی خایاندو دوایی چوونە ناوشاری پاریس ، ئەویش بەشەڕیکی خووێناوی کۆتایی هات و بووە هۆی ئەوەی کە دەست بەسەر پاریس دابگیرێت و دەسەڵاتدارانی کۆمۆنە دەستگیر بکەن، ئەوانی دیکەش بەرەو هەندەران هەڵاتن لە ناو وولاتەکەدا .

١٨٧١/٥/٢٨ کۆمۆنەی پاریس لە دوای ٧٢ رۆژ لە دەسەلات لە ناوبرا لەلایەن دەسەلاتی سەرمایەداری و خاوەن سامان و پرۆژەو کارگەکان بە پشتیووانی وولاتانی دراوسێی ئەوروپا لە هەموو بوارەکاندا .

١٨٧١/٩/١٠ نووسەرو رووناکبیرو رۆماننووسی فەرەنسی – مارسێل پرۆست – لە شاری پاریسس پایتەختی فەرەنسا چاوی بە جیهان هەڵێناوە . جێگەی ئاماژە پێکردنە کە باوکی پزیشکێکی کاسۆلیکی بوو ،هەروا دایکی جوولەکە بوو . پرۆست لەرێگاو کارکەی هەوڵەکانی دایکی تێکەڵی ئەندامانی چینی ناوەندی جوولەکە دەبێت .



بەلام بەشێووەیەکی کاسۆلیکی لیبرالی پێدەگات . هەر لە تەمەنی منداڵیەوە هەستی بەهرەیی و ژیری لێدەردەکەوێ ... سەرەرای ئەوەی باری تەندروستی نالەبار دەبێ . بەلام توانای خۆراگری دەبێ و چالاکانە رووبەرووی ژیان دەبێتەوەو سەردانی هاورێکانی لەکۆرو کۆبوونەوە ئەدەبیەکان دەکات و زۆربەی کاتەکانی لەیانە ئەدەبیەکان بەسەردەبرد . هەر لە سەرتای منداڵیەوە توانی گۆڤارێك بەناوی – مێز – دەربکات . دوای ئەوە دەچێتە قوتابخانەی – لیسیە – و خوێندن تەواودەکات ... دوای ئەوەش دەچێتە زانکۆی شاری سۆربن و لەوێ دەست بە ووتاربێژی دەکات بەبابەتی بەپێزو گوونجاو لەو سەردەمەدا .

دوای ئەوە – لیسانس – لەماف و فەلسەفە لە ساڵی ١٨٩٣ تەواودەکات و لەهەمان ساڵیش لیسانس لە ئەدەبیات وەردەگیرێت و هەرلە وساڵەشدا دەست دەکات بەنووسینەوەی ژیاننامەی خۆی ... بەلام دوای ئەوەی کە

دایك و باوکی لە ساڵەکانی ١٩٠٣ – ١٩٠٥ کۆچی دوایی دەکەن و پرۆست تووشی گۆشەگیری دەبێت و لەدونیای دەرەوە دادەبرێت و روو لەنووسینی رۆمان دەکا ... رۆمانی مارسێل پرۆست کە لە ١٥ بەش پێك دێت و لە ساڵانی ١٩١٣ – ١٩٢٧ بڵاویاویان دەکاتەوە ، ئەم زانا ناوداره فەرەنسیەو جیهانیه لەماوەی ژیانی لە نووسینە هەمەلایەنەکانی بەردەوام دەبێت تاکوو لە ساڵی ١٩٢٢ ماڵئاوایی لەهەڤاڵانی دەکات لەفەرەنساو جیهاندا .

## ١٨٧٢

١٨٧٢/٨/١٠ لە دوای لێك ترزانی باری پەیووەندی لە بواری پەیوەندی و کۆمەلایەتی لە فەڕەنساو بە تایبەتی لە ناو دەسەلاتی فەڕەنساوبە بەردەوام بوونی شۆڕش و راپەڕین و بە هەلاتنی بنەماڵەی شانشین بەرەو وولاتی نەمساو کەووتنی دەسەلاتی شانشین .

لەو کاتەش کە ئەنجوومەنی – ئووم– بە ناوبانگ بوو بە کۆنفڕانسیۆن لە ٢١ /٩ ، بڕیاری هەڵووەشاندنەوەی ڕژێمی شانشینی دا ، بەڕاگەیاندنی رژێمی کۆماری لە فەڕەنسا ، دوای ئەوە دەستکرا بە داگایکردنی شانشین و بنەماڵەکە لە فەرەنسا .

کە لە ئەنجام بنەماڵەی شانشین بە تەواوی و زۆر لەلایەنگرانی لەسێداره دران و کۆتایی بە ڕژێمی شانشین هات لە فەڕەنسادا .

١٨٧٢/٩/٢ گرێدانی یەکەم کۆنگرەی نێوودەووڵەتی لەشاری لاهای پایتەختی هۆڵەندا ، لە نێوان هەردوو لابالی مارکسیەت و باکۆنین کە لە ئاکامدا باکۆنین و لایەنگرانی دەرکران لە دوای کێشەی توونـدی بیروبۆچوون و هەڵوویست ، لە نێوان مارکسیەکان و باکۆنین ولایەنگرانی هەردولابالْ ، لە ئاکامدا لابالی مارکسیەکان سەرکەووتنیان بەدەست هێنا لەجیهاندا .

ئەویش لەسەر رێکخستنی سۆشیالستی نێوو دەووڵەتی بوو لە جیهاندا ، هەروا دوای ئەوە بە ساڵێك دووبارە کەرت بوون لە نێوان لاباڵەکانی جووڵانەوەی سۆشیالستی لە فەرنسا روویدا لە ساڵی ١٨٨١ . ئەویش لەکۆنگرەی – رانس – لە نێوان – الامکانین – مارکسیەکان – لەو

کۆنگرەشدا مارکسیەکان سەرکەووتنیان بەدەست هێنا لەوکاتدا لەجیهان و بەرەو گەشەکردن هەنگاوینا لە هەموو بوارەکاندا .

١٨٧٢/٩/١٤ لە سەر کێشەی ئەلیاما لە نێوان ئەمەریکاو بەریتانیا ، کەجیا کراوەو درا دادگای نێوودەووڵەتی ، کە لە شاری ژنێف بەسترا، ئەمەریکیەکان ناڕەزاییان بەرامبەر بە بەریتانیا دەربڕی و لە ئەنجام بەریتانیا لە سەر ئەم کێشەیە تاونبارکراو پشتگیری لە ئەمەریکا کرا لە سەر کێشەکەدا .

لە هەمان کات دادگای نێوودەووڵەتی بڕیاریدا بە گەڕاندنەوەی بڕی ٠٠٠ر٢٠٠ر١٥ملیۆن دۆلار بۆ ئەمەریکا بەرامبەر بەو زیانەی کەلێی کەوتبوو ، لە ئەنجامی سەرپێچی بەریتانیا لە دروستکردنی کەشتی هەمەجۆری جەنگی و بازرگانی و گەیان لە هەرێمەکەدا .

١٨٧٢/٩/٢ هەردوو زاناو داهێنانی بوارەکانی فەلەسەفەی زانست و ئابووروو سرووشت و کۆمەڵ – مارکس– و –ئینگلش– زۆر بەتووندی گرنگیان بەتایبەتمەندیەتی نەتەوەیی دەدا ، لە بوارەکانی پەرەسەندن لە پێناو بەرەو سوشیالیستی و کە لە چەندین لێدوانیان ، دووپاتی چەندین بواری ڕێگایەکەیان دەکرد ، لەپێناو گەیشتن بە ڕژێمی سوشیالیستی .

بەڵام هەرلادانێك لە بنەمای یاساکانی – نفي ، نفي ، وحدة وصراح الاضدار ، الكمية الى النوعية ، الشكل والمحتوى ، الصدفة والضرورة – بە پێی پەرەسەندن و پەرینەوەی قۆناخەیەك لە دوای یەکەکانی کۆمەڵ ، لە هەموو بوارەکانی تووشبوونی بە نەهامەتی و هەرەس هێنان دێت لە جیهان .

 ١٨٧٤

١٨٧٤/٣/١ لە دایك بوونی فەیلەسوف ناوداری ئاینی ڕووسیا – نیکۆلای بردیائف – لە شاری کیفی پایتەختی ئۆکرانیا ، لە بنەماڵەیەکی ناسراو . پەرەسەندنی بیروبۆچوونی بەهۆی بیری سۆشیالستی بووە ... هەوڵی داوە کە بیری مارکسیەت و کنت لەگەڵ یەکدا بگوونجێنێ .

بەڵام دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٠١ بە هۆی کاردانەوەی بیری نیتشەوازی لە بیری مارکس هێناوە ... لە ساڵەکانی ١٩٠١ تاکوو ١٩٠٨ لەپترسپۆرگی

پایتەختی ڕووسیای قەیسەری ژیاوەو دوای ئەوە چۆتە شاری مۆسکۆ ...
لەریزی جوولانەوەی نوێکردنەوەی ڕووسی بە شداری کردووە کـ
جوولانەوەیەکی ئاینی بووە لە وولاتەکەدا .
دوای ئەوە لە سالّی ١٩١٧ هەلّبژرێدراوە بۆ ئەنجوومەنی کۆماری لەڕووسیا
. لە سالّی ١٩١٩ و لە سالّی ١٩٢٠ بۆتە مامۆستا لە زانکۆی مۆسکۆ ... دوای
ئەوە چەندین وانەی بابەتی خووێندۆتەوە لەزانکۆی بەرلینی پایتەختی
ئەلمانیا لە سالّی ١٩٢٣ بەناوی – معنى التاريخ – و –روح دۆستۆیڤسکی
– ئەم فەیلەسوفە لەکارە هەمەلایەنەکانی بەردەوام بووە تاکوو لە مانگی
/١٩٤٦/٤ کۆچی دوایی دەکات لە شاری مۆسکۆی پایتەختی ڕووسیای
ئێستا لە وولاتەکەدا .

١٨٧٤/٣/٢٤ لە دایك بوونی هونەرمەندی جادووکەری بە ناوبانگی هەنگاریا – هاری هودینی– لە وولاتی هەنگاریا .. کە یەکەم هونەرمەندە لە مێژووی جیهانی بتوانێ شانۆ جادووکەریەکان بەشێوەیەکی ڕێك و سەرکەووتوانە ئەنجام بدات لە وولاتەکەیدا .

## ١٨٧٥

١٨٧٥/٢/٧ لە دایك بوونی – محەمەد تەلعەت – لە شاری ئەدرنە ، کە باوکی فەرمانبە بووە لە دەزگاکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، خووێندنی پارێزەری لە شاری سلانیك تەواوکردووەو چووەتە ناوکۆمپانیای تەلەفۆن... دوای ئەو چووەتە ناو کۆمەلّەی گەنجانی تورکیاو سەرکردایەتی یەکەم شانە ئیتحادوتەرەقی کردووە لەسلانیك لەگەلّ حەوت لەهاوڕێکانیدا .
بەلاّم بە هۆی زیرەکی و جمووجۆلّی دەستگیرکراوەو دوایی ئازاد کراوە.
دوای ئەوە دامەزراوە بە سەرۆکی ئەمینداری پۆستەو گەیاندن لە سلانیك
دوای ئەوە لە سالّی ١٩٠٨ دامەزراوە بە نووێنەر لە شاری ئەدنە – دیاربەکر – لە باکووری کوردستان ... دوای ئەوە بووە بە وەزیری ناوخۆ... دواید بووە بە وەزیری گەیاندن و لە هەمان کات بووە بە سکرتێری گشت ئیتحادوتەرەقی لە ژێر دەسەلاّتی عوسمانیدا .
هەروا لە جەنگی جیهانی یەکەم لایەنگیری ئەلّمانیای کردووە بە هۆ

کارتێکردنی لەلایەن ئەنوەرپاشا... محەمەد تەلعەت سەرکردایەتی قەسابخانە بە دناوەکـەی کۆمـەڵکوژی ئەرمـەن و کـوردی لـە سـاڵی ١٩١٥، لـە بـاکوری کوردسـتان کردیـە لەگـەڵ پـەرت و بـڵاو پێکـردن و دەربـەدەرکردنی ئەرمـەن و کورد ، بەرەو شام و لوبنان و وولاتـانی دیکـەی دراوسێکان ، لـە١٧/١٠/١٩١٨ دەسـتی لـەکارەکانی کێـشاوەتەوە بـە هـۆی لـە نـاوبردنی ئیمپراتۆرییـەتی عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهان.

دوای ئـەو کارانـەی دوور لـە هەسـتی مرۆڤایـەتی بـەرەو وولاتـی ئـەڵمانیا هـەڵات و لـە ٤ /٩/١٩٢٠ بە دەسـتی دووژمنـەکانی لـە ئەرمـەن و کـورد بـوون کووژراوە لەگەڵ چەندین هاوکاری دیکـەی لەکارەکانیدا دژی کـوردو ئەرمـەن لە باکووری کوردستان .

١٨٧٥/٢/٢٢ کۆچی دوایی زانای ناوداری جیۆلۆژی بەریتانی - یارون سیر چارلس لیل- لـە هـەمان کـات زانـای ئـەدەبی و چـین گـەلی تـوویکی زەوی و چـۆنیەتی دروستکردنی بووە ، چەندین وولات و بیابان و شاخ و دەشت و دۆڵ گەڕاوە ، لـە پێنـاو دەرخستنی پێکهاتـەی زەوی و مرۆڤ و ئـاژەڵ و داروو درەخـت ، لـە هەمان کات دۆزینەوەی دۆستایەتی و دژایەتی لەنێوانیاندا .

١٨٧٥/٨/٤ کۆچی دوایـی نووسـەری نـاوداری جیهانی و دانیمارکی - هـانز ئەندرسـۆن- کە بەدەیا دانراوەی لە ڕۆمـان و پـەرتووکی گەشتیاری و شانۆنامەو گەشتی ژیان و شیعری بڵاوکراوەتـەوەو ناوبانگی ئەو کەسایەتیە لێهاتووە ئەورووپیە بەجیهان بڵاوبۆتەوە.

١٨٧٥/١٠/٣ لە دایک بـوونی شاعیری گـەورەی ئەرمـەنی -ئافتـاك ئاسـکیان - لەگـوندی- گەزابارایـە - کـە دەکەوێتـە دامـێنی چـیا سەرکەشـەکانی ئـەرمینیاو لـە نزیـك شاری - ئەسکەندربۆل .

شـایانی باسـە ئـەم شـاعیرە لـە ئـەرمینیا خـاوەنی ناوبـانگێکی فـراوان بـووە ، فالێری برایوسفی شاعیری ڕووسـی بـە شێووەیەك باسـی دەکـات ، کـە ئافتـاك مامۆستایەکی مەزنە لە نێوو شـاعیرانی ئـەوروپاو شاعیرێکە لەپلـەی یەکـەم و لەوانەیـە ئـەمرۆ بەهرەمەنـدێکی وەکـوو ئافتـاك نـەبێت . کاتێـك کـە ئافتـاك لـە ساڵی ١٨٩٧ کۆچی دوایی دەکات لەتەمەنی ٨٢ ساڵیدا .

شاعیر - لـویس ئـاراگۆن - کارەکـانی ئـەو شـاعیرە ئەرمەنیـەی لـەنێوان کـارە دەگمەنەکانی ئەو کەڵە پیاوانە وەسف دەکرد ، کە کاریگەری بە سـەر شیعری

سەدەی بیستەم دا هەبوو لە نێوان ساڵەکانی ١٨٩٣ – ١٨٩٥ ... ئافتاك لە ئەلمانیا ژیاوە و خووێندنی لەزانکۆی لایبزك و چەندان وانەی لە فەلسەفەو مێژوو و ئەدەبدا وەرگتووەو زۆر بایەخی بەئەدەبی کلاسیکی داوە . لەساڵی ١٨٩٦ ئافتاك گەراوەتەوە ئەرمینیا .

بەڵام لەلایەن دەسەڵاتدارانی قەیسەری ڕووسیا دەستگیرکراوە بەهۆی پەیووەندی کردنی بە بزووتنەوەی ئازادی نیشتیمانی و ١٠ ساڵ لە بەندیخانەی یەریڤان ژیانی بەسەربردووە ، دوای ئەوە گوواستراوەتەوە ئۆدیسیاو لە ساڵ ١٨٩٨ لە وولاتەکە دوورخراوەتەوە . هەروا چەندین وولاتی کردووە وەك ، سویسرا ، کە لە ساڵی ١٩٠٦ گەراوەتەوە وولاتەکەی و دووبارە دەستگیردەکرێت و لە زیندانی تەبلیس بەند دەکرێت و هەر بەردەوام دەبێت لەنووسینی شیعر تاکوو کۆچی دوایی دەکات .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢ .

١٨٧٥/١٢/١٢ لە دوای ڕازی بوونی شانشینی ئیتالیاو نەمسا، لە سەر پەیمانی بەرلین و بە جێبەجێکردنی فەرمان بە دامەزراندنی ئەنجوومەنی نێوودەووڵەتی ، لە پێناو چاودێری و جێبەجێکردنی دەسەلاتەکان.

## ١٨٧٦

١٨٧٦/١/١٢ لە دایك بوونی – جاك لەندەن – لە شاری سانفرانسیسکۆو دوای لە تەمەنی چل ساڵیدا کۆچی دوای کردووە.

١٨٧٦/١/٢٨ لە دایك بوونی – زیاکۆك ئەلەب – لە شاری دیاربەکر لە باکووری کورستان ، کە لە نەژاد کوردە... لە کاری پەروەردە کاریکردووەو لە ئایین جوولەکە بووە ، دوای ئەوە لە١٨٩٧/٦/٢ چووەتە شاری ئەستەمبوڵ و لە شارە چووەتە کۆلێژی پزیشکی ئاژەڵ ، دوای ئەوە پەیووەندیکردووە بە کۆمەڵەی ئیتحادوتەرەقی نهێنی ، دوای ئەوە لە پەروەردە دوورخراوەتەوەو دەستگیرکراوە ، دوای ئەوە لە دیاربەکر دەست بەسەردەبێ... لە دوای ئازادکردنی دوو ڕۆژنامەی لەدیاربەکر بەچاپ گەیاند.

دوای ئەوە بووە بەمامۆستا لە زانکۆی ئەستەمبوڵ... لە ١٩١٧/١٠/٧ لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی هەڵات و دوای سەرکەووتنی کەمال ئەتاتورك ، گەڕاوە تورکیاو بووە نووێنەری دیاربەکر تاکوو کۆچی دوایی کردووە لەم وولاتەدا .

١٨٧٦/١/٢٨دەرچوونێنەری یەكەم رۆژنامەی عەرەبی لە سووریا بەناوی – المقتیس – و دامەزرێنەری یەكەم كۆری زانیاری عەرەبی لە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریای ئێستا – محەمەد عەبدولرەزاق محەمەد كوردی – لە شاری دیمەشق چوی بە جیهان هەڵهێناوە ... ئەم كەسایەتیە كوردە ناسراوە كە موئەریخێكی مێژووی شارستانیەتی عەرەب بووە ... لەهەمان كات ئەدیبێكی ناسراو بووە ... بنەماڵەكەی لە ئەیوبییەكان وخێزانەكەی لە پارێزگای سلێمانی لە باشووری كوردستان روویان لە شام كردووە لە سەرتای سەدەی نۆزدەم بەهۆكاری بازرگانی ... كە دایكی شەركەس بووە لە ناوچەی قەفقاز ... ئەم كەسایەتیە لەكارەكانی بەردەوام بووە تاكوو لە ١٩٥٣/٤/٢ ماڵئاوایی دەكات لە تەمەنی ٧٧ساڵیدا و گۆرەكەی لەگۆرستانی گچكەیە لە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریای ئێستا .

سەرچاوە :– موسوعە اعلام سووریا – ٣٩٥/٤

١٨٧٦/٢/١٩كۆتایی هاتنی شەڕی كارلیە ، كە لە ساڵی ١٨٣٣ هەڵگیرسابوو ئەویش بە سەركردایەتی ژەنەراڵ – پریمۆدی ریفیوا – بە گرتنی شارە لە بەرژەووەندی شانشین – ئەلفۆنسی دوازدەهەم – لە ئەسپانیا.

١٨٧٦/٣/١٠ گوواستنەوەی دەنگی مرۆڤ ، بۆ یەكەم جار بە تەزووی تەلەفۆن ، كە ووشە یەكەمەكان لەلایەن داهێنەرەكەی ئەلكساندەربیل وسید واتسون ، بووە كە ووتەیان گۆریەوە بە – وەرە ئێرە تۆم دەوێ – لەكاتی كۆچی دوایی ئەلكساندەر بیل ١٣ ملیۆن تەلەفۆن بۆ ئاخاووتن لەجیهاندا هەبووە لەكاركردندا .

١٨٧٦/٥/١١ بە هۆی خۆ پیشاندانو تاوانباركردنی شێخی ئیسلام ، بە لایەنگیری كردنی رووسەكان ، كە بووە هۆی لابردنی مەحمود نەدیم پاشاو حوسێن فەهمی حوسێن ، لە كارەكانیان لەلایەن سوڵتانی عوسمانی بە دامەزراندنی محەمەد روشدی پاشا لەجێگەی لابراوەكان .



۱۸۷٦/۸/۱۵ نامـــــــــەی باڵوێزخانـــــەی ئیمپراتۆریـــــەتی عوسمانی لە تارانی پایتــەختی وولاّتــی فـارس لـەژێر ژمـارە /٥٦٧/۱۰ دۆسـیـەی /۲/۱۲ بـۆ وەزارەتـی کاروبـاری دەرەوود هـــاتوو– ئـــەو هەوالاّنــەی کــە لــە ســـــــنووری ئازربایجانـــــەوە گەیشتوون ئاگادارم ، کە مایەی پەژارە بوون بە پەلەش تەلەگرافم بۆ بارەگای گەورەو وویلایـەتی ئەزەرۆم کرد , کە ئەگەر ئەو هەوالاّنە راست بن چارەسەری بکەن .

بـەلاّم ئـەوەش لەبەرچاوی بـەرێزتان شاراوە نـەبێت , کـە ماوەیەکە هێـرش و دەستدرێژی عەشائیری ئەملا بۆسەر خاك و دانیشتووانی وولاّتی عوسمانی , یـەك بـە دوای یەکدا هەیـەو دەبینـرێ و هەمیشە بەهاتنی ئـەو گازاندانـەی لە ئـەرزەرۆم و وان بـاڵوێزی – سـتیە –وە دێـن , بـەرەسمی بەنووسـین عـەرزم کردوون و جەنابیشتان هەمیشە فەرمووتانە چارەسەر دەکرێن و بەم حاڵەتەوە لەو بڕیارانەی فەرمووتانە لەهیچ شووێن ئاگـادار نەکراومەتـەوە لـە ئاکامێکدا هەبوو بێت .

وەك دەڵێن وردە وردە عەشایەری ئـەو وولاّتـە دەست بکەنـەوەو دەسـت بکـەن بەهێرش بۆ ئەملا , جاکەوا کەس چاوی بەسەریانەوە نیە , ئـەو شـتانەش کە دراونەتـە پـاڵ جـەنابی شـێخ عوبێد ولـلاّ ئەفەنـدی ، بەنـدەتان نـاتوانیّ باوەر بکـات , چـونکە شـێخی نـاوبراو بـەو هـەموو زیـان و زولمـەی لـەلای حـاکمی پێشوو , خوالیّخۆش بوو – شوجاع الدولە – وە لیّـی کرابوو , هێشتا لەبەر

نفووس باکی خۆی منەتباری دەوڵەتی ئێران لە بەر ئەو چەند گوندە , هەمیشە بەجۆرێك جووڵاوەتەوە کە نەبێتە مایەی رەنجاندنی هەردوو دەوڵەت ئەم راستیەش لەلایەن کاربەدەستان روونەو ئاشکرایە .

پێدەچێ ئەم تاوانبارکردنە لەلایەن دەستەو تاقمی خوالێخۆشبوو – شوجاع الدولە – وەبێت , کە دیسان لەناوچەی ورمێ کاروباریان کەوتۆتە دەست و رقی شەخسیان لێیەتی .

خوداش هەڵناگرێ پێش ئەوەی لێکۆڵینەوە بگاتە ئەنجام لای لایەنێکەوە زیانی پێ بگەیەنرێ هەڵبەتە ئینسافی ئاشکرای جەنابیشتان ئەوە دەسەلمێنێ کە ناکرێ پێش سەلماندنی تاوان ڕازی بن سزای بۆ دیاری بکرێت ... وەك فەرمووشتانە مەسەلەی لێکۆڵینەوەشی بەندە عەرزی بارەگای گەورەم کردووە لەوە زیاتریش ماندوتان ناکەم .

بەڵگەنامەی ژمارە ٥٦٧/١٠ – کارتۆن /١٥ دۆسیە /٤/١٢ .

کورد لەبەڵگەنامەی قاجاریدا ... شۆرشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری /١٨٨٠ لەئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی کاروباری ئێراندا .



١٨٧٦/٨/٢٠ وەڵامی باڵۆێزخانەی ئێران بۆ دەوڵەتی عوسمانی – نامەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە ، ئامارە/١٩ بەپێی بەڵگەنامەی ٥٦٨/١١/ بەمێژووی ١٢٥٥/٦/٢٦ ی هەتاوی کە لە نامەکەدا هاتبوو :–

ناوەرۆکی نامەی ٢١ رەجەبی ١٢٩٣ی ئەو بەرێزە ، کە سەبارەت

بەو دەستدرێژی و کووشتووبرو تالآنیەی لەلایەن عەشایەری عوسمانیەوە و بەهاندانی شێخ عوبێدوڵلاّ بووەو چوونەتە سەر شنۆو گوندەکانی دیکە ئاگادربووین لە وەشدا کە بەپەلە نووسیبووت هەوڵەکەشت بەبارەگای بەرزگەیاندبوو ، زۆر خۆشحاڵت کردبووین منیش چاوەڕوانی ئاکامی تەلەگرافەکەتانم کە گەیشتەوە زۆر شادمانمان دەکات .

بەلاّم لەو بەشەیدا کە فەرمووبووت ماوەیەکە هێرش و تالآنی عەشایەری ئێران بۆسەر خاك و دانیشتووانی عوسمانی پەیتا پەیتا هەیەو چونکە کەسیش چارەسەری بۆنەدۆزیووەتەوەو بۆتە مایەی هاندانی عەشایەری عوسمانی ... دەبێ بەوپەری رێزەوە بەیادتان بهێنمەوە کە هەر بەتەنیا لەم دوو سێ ساڵەدا سەرچل و کەللە شەقەکانی ئێلی – هەرنووش – نزیکەی ٥٠ – ٦٠ هەزار تومەن سامان و پارەی خەڵکی ئێرانیان بەتالآن بردووەو کووشتووبرو سووتاندنی ماڵی خەڵکیان زۆرکردووە ، کە بریاربوو لە کۆمنیسیۆنەکەی شێخ عوبێدوڵلاّدا بەدوایدا بچن ، کەچی لەلایەن بالوێزخانەی بەرێزەوە هیچ هەنگاوێکی بۆ هەڵنەگیرا لەبەر ئەوە عەشایەری ئەو لایە کاتێ ئەوتاوانەیان لێ روو ئەدات کەس نیە پێیان بڵێ :– لەل . ئەوسا توندو تیژتر دەبن و دیارە ئەم هێرشەی ئەم دوایەشیان بەدنەدانی شێخ عوبێدوڵلاّ کردووەو ئەو هانیداون .

لەملاشەوە عەشایەری ماڵ براوو تالآنکراو هەرچی ویستیان تۆڵەی خۆیان بسێننەوە سنووردارانی ئێران رێگەیان پێنەداون ، ئەمەش بەڵگەیەکی دیکە بوو ، بۆ زیاتر لاسایی و ڕووداربوونی عەشایەری – ئەوبەر – ئەمجارەش کە نزیکەی ٧٠٠٠ هەزار سووارو پیادە سنووریان بەزاندووەو ئەو خەڵکە زۆرە دیارە بێ مۆڵەت و بێ ڕەزامەندی سنووردارانی عوسمانی نەیتوانیووە بپەڕێنەوە ... کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا گەورەترین بەڵگەو نیشانەی پر کێشی عەشایەری بووەو بۆ ئەمر بوو بۆیە ئەگەر لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانیەوە کارئاوا بڕواو ئاوا گوێیان لێ بخەوێنن ئەوانە زیاتر چاو قایم دەبن و ئەوە ئیدی پێویست دەکات ئێمەش بیەڵێن عەشایەری – ئەملا – خۆیان تۆڵە بکەنەوە .

بەلاّم لەبارەی شێخ عوبێدوڵلاّ کە دەفەرموون خوا هەڵناگرێ کەسێك بێ

سەلماندنی تاوان سزاو جەزرەبەیەك بدریّ . ئەوا سەلماندنی هەنگاوەکانی شێخ و دنەدانی عەشایەر . لەلایەن ئەوەوەو ئەم ئاگر هەڵیسانە ... وەك رۆژی روون بۆ ئێمە دیارەو بەهیچ جۆرێك جێی شك و گومان نیە چونکە نزیکەی ۷۰۰۰ هەزار کەسی ناردۆتە سەر شاری شنۆو ئەو تالآن و برۆیەکراوەو گەراونەتەوە ، کەچی هێشتاش کوردەکانی لەخۆ دوورنەخستۆتەوەو هەر رۆژەش هەڵدەکوتێتە سەر ناوچەیەك و بە ئاشکرا ئەم ئابوودەیەی لەگەڵ خۆی خستۆتەوەو رایگرتوون . هێرش بردن ۷۰۰۰ هەزار کەس لەسووار و پیادە شتێك نیە بشاردرێتەوە . یان کەس نەیزانیّ و باوەر پیّ نەکات . لەبەر ئەوە دەووڵەتی ئێران هەرگیز ناتوانیّ کەسێك کە زیان بۆ کاروباری دەووڵەت هەبیّ لەخاکی خۆی دالْدەی بدات . لەوە زیاتریش ماندووتان ناکەم .

سەرچاوە:- کورد لە بەڵگەنامەی قاجاریدا .
شۆرشی شێخ عوبێدوڵلآی نەهری/۱۸۸۰
لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی کاروباری ئێراندا.

۱۸۷٦/۸/۳۰ سولْتان عەبدولحەمید بووە سولْتانی عوسمانی لە ئاهەنگێکی گەورەدا ، دوای ئەوە دەسەلاتی حکومەتەکەیدا بە دەست مەدحەت پاشا بە سەرەك وەزیران و لە۲۳ /۱۲ ی هەمان سالْ دەستووری ئیمراتۆریەتی عوسمانی راگەیاند ... شایانی باسە لە زۆر لایەنی نووسین دەلْێن کە بنەماڵەی سولْتان عبدالحمید کورد بوونە ، بەلآم جێگەی دلْنیایی نیە لەراستیدا.

١٨٧٦/٩/١٦ وەڵامی باڵوێزخانەی ئێران بۆ دەوڵەتی عوسمانی – نامەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە – ژمارە/٢٦ . بەپێی بەڵگەنامەی /١/٥٦٩/١٢ تیایدا دەڵێ :– نامەکەی ئێوەی خاوەن شکۆ لەرێکەوتی ٢٤/شەعبانی/١٢٩٣ دا فەرمووتان کاربەدەستانی ئێران کێشەی – شاری شنۆ – یان کردۆتە بیانوو و سەربازیان بۆ سنوور ناردووەو سنوور پارێزانی عوسمانییەکانی ناچارکردووە تا وەك ئەواز مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن ، هەروا لەو پەڕی خێرخوازیدا بەڵێنیان داوە کە لە داهاتوودا هاتووچۆی عەشایەری عوسمانی لەژێر چاودێریدا دەبێ و کۆنتڕۆڵ دەکرێن وتاکیان کردبوو ... کە سەربازەکانی هەردوولا لە سنوور بگەڕێنەوە شووێنی خۆیان ودیلەکانی هەردوو لاش بەرەڵاّبکرێن ... نامەکەتان رێزی لێگیراو لە وەڵامدا دەڵێین :– یەکەم : هەروەك بە دەمیی وتراوەو بۆ نووسراویش زەحمەتم داون دەوڵەتی گەورەی ئێران بەهیچ جۆرێك لە ناردنی ئەم لەشکرە کەمە بۆ سنوور مەبەستی خراپی نەبووە ، بەڵکوو تەنیا بۆ پاراستنی سنوور بووە لەدەست درێژی و تالاّنی عەشایەری عوسمانی . ئێستاش کە ئێوەی خاوەن شکۆ بەرووی نیاز پاکیەوە لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی دەوڵەتی مەزنی ئێران پێکهاتوون و بەڵێنتان داوە کە چیدی عەشایەری عوسمانی دەست درێژی نەکەن و بڕیارتان داوە لەو دەستدرێژیەو

تالأنە بکۆڵنەوە .

کـە لەناوچـەی شـنۆ کردوویانـە ئـەم لایـەنگرەتان لەگـەڵ دەربـڕینی پێخـۆش بـوونی خـۆم ، لـەم خێرخوازیـەتان و ڕازیبوونتـان بـەپێی تکـاو پاڕانـەوەی باڵوێزەکان ... کە کردوویانە بروسکەیەکەم بۆ کارگێرانی ئازربایجان کرد .

ئـامێزی هـەردوولا وێکـرا بگەڕێنـەوە نـاوەوەی وولاتـی خۆیـان و میوانـە ئێرانیـەکان و سـوواره نیزامیـەکانی عوسمـانیش بەیـەکجار بگەڕێنـەوەو ئالوگۆربکرێن .

ئـەم لایـەنگرەتان هیـوادارە بـەپێی ئـەو نیازپاکیـەی کـە سـەبارەت بەجـەنابتان هەمـە ، ئێـوەش بـەزوویی بروسـکە بـۆ شـووێنی پێوویـست بکـەن کـە سنووردارانی عوسمانی . بەم شێووەیە لەگـەڵ سنووردارانی ئێران پێك بێنن و ئوردووی هەردوولا بگەڕێنەوەو کێشەی هەردوو وولات دوایی بێت .

تـا ئـەو جـۆرەی وتوویـژی لەسـەرکراوە لێکۆلینـەوە لەبارەیـەوە بکـرێ ، لـەو باوەڕەشدام کە ئـەم لایـەنگرەتان لەچۆنێتی هاوکاریتـان ئاگادارەکەنـەوە ئـیتر سەرتان نایەشێنم.

سەرچاوە:- کورد لە بەلگەنامەی قاچاریدا , شۆرشی شێخ عوبێدوللای نەمری / ١٨٨٠ , لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی کاروباری ئێراندا.



١٨٧٦/١٠/٢٤سـولّتان عەبدولحەمیـدی دووەمـی سـولّتانی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی بڕیـاری دامەزرانـدنی ئەنجوومـەنی گشتی دا ، کە ئەنجوومـەنێك گـەلانی ژێـر دەسـەلأتی سـولّتان هـەڵیان دەبـژاردن ، کـە یەکـەمیان نـاوی پەرلـەمان و دووەمیـان ئەنجوومـەنی نووێنـەران بـوو . کـە سـولّتان عەبدولحەمید دایانی دەمەزراندن.

١٨٧٦/١٢/٢ڕاگەیانـدنی دەسـتووری ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی لەلایـەن سـولّتان عەبدولحەمیـدی دووەم ، کـە مەدحـەت پاشـا لـە دوای تـەواو بـوونی

دەستوورەکە بەپێی خواستو ویستی خۆیانو داروودەستەکەی بوو. ک
بەیاسای بنەڕەتیو دەسەڵاتی فراوان دادەنرا ، لە پێناو جیبەجێکردن
بڕیارە تاکرەوەکانی سوڵتان لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .



١٨٧٦/١٢/٢٣مەدحەت پاشا بۆ جاری دووەم کرا بە سەرۆك وەزیرانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، لە پێناو ئامادەکردنی دەستوور لە سەر شێوازی دەستووری فەرەنسا ، بە مەرجێ برگەی/ ١١٣ لە دەستووری فەرەسا بخرێتە ناو دەستوورەکە ، کە ئەمەش دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە دەسەڵاتی عوسمانی بەهێز بکات لە هەموو بوارەکاندا .

کە ئەمەش بەر لەمانگێك ئەو دەستوورە ئامادەکرابوو تاکوو لە ٢/٢٢ ی
هەمان ساڵ ڕاگەیەندرا ، بەدوور لە خواستو مافە رەواکانی گەلانی ژێر
دەستیان . مەدحەت پاشاش چەندین جار لە پۆستەکەی دووردەخرایەوە
دەیانگەڕاندەوە ، تا بە ئامانجی سەرەکی خۆیان گەیشتن لە هەموو
بوارەکاندا .

١٨٧٦/١٢/٢٣گرێدانی کۆنگرەی جیهانی لە نێوان وولاتانی شەرکەرو هاوپەیمانان لە سە
دەریاو زەریاکان ، لە ژێر چاودێری سەفووەت پاشای بەرپرسی کاروباری
دەرەوەی دەسەڵاتی عوسمانی ، کە بووە سەرۆکی کۆنگرەکە لە شاری
ئەستانە ، کە ئەدهەم پاشا باڵوێزی عوسمانی لەشاری بەرلینو نووێنەرانی
فەرەنساو ئیتاڵیاو ئەڵمانیاو مەژەرو نەمساو ڕووسیاو بەریتانیا بەشداریا
تێداکردلەو کۆنگرەیەدا .

بەو بۆنە چەندین گوولـە تۆپ هاوێشتران ، ئەویش بەڕاگەیاندنی یاسای

بنەڕتی . کە یەکسانی لە نێوان وولاَتانی جیهان دابین دەکرد لەوکاتدا لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندیەکانیاندا .

١٨٧٦/١٢/٢٨کونسلی ڕووسیای قەیسەری – کرێبلی– لە تارانی پایتەختی وولاتی فارس نووسیویەتی و دەڵێ :–
شێخ عوبێدولاَی نەهری نیازی وایە کە ڕاپەڕینێك لە دژی دەسەلاَتی عوسمانی ئەنجام بداتو دەوڵەتێکی کوردی لە کوردستان پێکبهێنێ و شاری موسڵ بکاتە پایتەختی ئەو دەوڵەتە – لە کێشوەرکەدا .

## ١٨٧٧

١٨٧٧/١/١٦ لەدایك بوونی ڕووناکبیرو زانای ڕووسی – سیمۆن فرانگ – لە شاری مۆسکۆی پایتەختی ڕووسیای ئێستا ... خوویندنی ئابووری و یاسای لە مۆسکۆ تەواوکردووە . دوای ئەوە بەرەو شاری بەرلینی ئەلمانیا هەنگاوی ناوەو لەوێ گرنگی بەبواری فەلسەفە داوە .
دوای ئەوە گەڕاوەتەوە شاری پترسپۆرگی پایتەختی ڕووسیای قەیسەری لە ساڵی ١٩٠٧ وانەکانی فەلسەفەی لەزانکۆی – ساراتۆف – بەوانەگووتنەوە و بەردەوام بووە تاکوو ساڵی ١٩١٧ . دوای ئەوە بە هۆی بیروبۆچوون و هەڵوێستەکانی لە ساڵی ١٩٢٢ دوور دەخرێتەوە بەرەو بەرلینی ئەلمانیا دەڕوات و هەرلەوێ دەست دەکات بەوانە گووتنەوە تاکوو ساڵی ١٩٣٧ .
دوای ئەوە بەرەو شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا دەڕوات ، دوای جەنگی دووەمی جیهان دەچێتە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیاو لەوێ دەمێنێتەوە تاکوو لە ١٩٥٠/١٢/١٠ کۆچی دوایی دەکات ... ئەم فەیلەسوفە حەوت دانراوی گرنگ و بەبەهای بەرهەم هێناوە لەماوەی ژیانیدا وەك :–

١- الفلسفة والحياة – پترسبۆرگ – لە ساڵی ١٩١٠
٢- موضوع المعرفة – پترسپۆرگ – لە ساڵی ١٩١٥
٣- المعرفة والوجود – پاریس – لە ساڵی ١٩٣٧
٤- مناهج العلوم الاجتماعية – بەرلین – لە ساڵی ١٩٢١
٥- المعرفة والحياة – پاریس – لە ساڵی ١٩٢٣
٦- النظرية الروسية – بەرلین – لە ساڵی ١٩٢٦

٧- اللة معنا – لـەندەن – لــــە ساڵی ١٩٢٦
لە گەڵ چەندین بابەتی بڵاوکراوەیدا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢ .

١٨٧٧/١/١٨ ئەو یاسا بنەڕەتیانەی کە لە کۆنگرەی٢٣ /١٨٧٦/١٢ بڕیاری بۆ درابوو ، خـرا بـەردەم سـەرۆکی ئایینـە جۆراوجۆرەکـان و لەلایـەن هـەموو نوێنـەرانی ئایینەکان ڕەتکرایەوە ، کە مەسیحی و ئیسلام و جوولەکەو هەموو ئەو ئاینانە بەشـداریان تێداکرد ، کـە لەلایـەن دەسـەڵاتی عوسمـانی بڕیاری بۆ درابوو ، لەپێناو پشتگیری کردن لە دەسەڵاتەکەیاندا .



١٨٧٧/٢/٥ لـــە دایــك بـــوونی ڕۆژ هـــەڵاتناس و مێـژوونووس و کوردناسـی ڕووسـی – فلادیمیر مینۆرسکی– لە شارۆچکەی – گورژیڤــا – کــە ئــەو شارۆچــکەیە دەکەوێتـە باکووری ڕۆژئـاوای شاری مۆســکۆ لــە ســەرکەناری ڕووبـاری ڤۆڵگای ناوبراودا .
هــەروا قۆناخــەکانی خوێنــدنی لــە شـاری مۆسـکۆی پایتـەختی ئێـستای ڕوســیا تــــەواوکردووە ، زانیـــاری هەمەلایەنـەی باشـی دەربـارەی کـوردو کوردستانەوە لە هەموو بوارەکان بە پێی زانیاری هەمە لایەن ئەو سـەردەمەدا هــەبووە لەســەرکوردو کوردســتان هــەبووە ، لــە هــەموو بوارەکــان بــەپێی زانیاریەکانی لەو کاتدا .

١٨٧٧/٢/٦ بە بڕیارێکی سوڵتانی عوسمانی – مەدحەت پاشا – ی لە دەسـەڵات لادا ، لـە پۆستی سەرەك وەزیرانی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بە ناوی – سـەدر ئـەعزەم – دوای ئـەوە کـرا بـە والی شام بە هـۆی هەڵوێستی چاکسازی و دژایـەتی کردنی دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی.

١٨٧٧/٣/١٩ یەکـەم پەرلـەمانی ئیمپڕاتۆریـەتی عوسمـانی لـە کـاتی دەســەڵاتی ســوڵتان عەبدولحەجیـدی دووەم کرایـەوەو ووتـاری سـوڵتان خوێنـدرایـەوە ، کـە لـە

سەرای بشکتاش ئەنجامدرا.

١٨٧٧/٣/٢٩لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی عوسمانی ، کە ١٧ ئەندام ئیسلام بوون و ٤٤ ئەندام مەسیحی بوون و ٤ ئەندام جوولەکەبوون ، کە یەکەم کۆبوونەوەی پەرلەمان لەو ڕۆژە گرێدرا ، کە ئەنجوومەنی – ئەعیان و پیران– لە ٢٦ ئەندام پێکهاتبوو بە دامەزراندنی ٢١ ئەندامی ئیسلامی و ئەنجوومەنی نوێنەران لە١٢٠ ئەندام پێکهاتبوو ، لە هەمان کات کورد نوێنەری لەو پەرلەمانە هەبوو بەڵام ژمارەی ئەندامەکان نەزانراوە لەپەرلەمانەکەدا .

١٨٧٧/٣/٣١ئاراستەکردنی یاداشتێکی پرۆتۆکۆڵی لەلایەن شەش دەوڵەتی ئەوروپی بۆ سوڵتانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەگەڵ – کێوە ڕەش– کە ئەوکات لە شۆڕشدا بووە ...کە بە ئاشتی پێك بێ و دەست لەو مەڵبەندە هەڵگرێ بە بیانووی ئەوەی کە زمانیان سلاڤی و دینیان مەسیحیە.
لە هەمان پرۆتۆکۆڵ ڕووسەکان هەڕەشەی ڕاگەیاندنی جەنگیان لەگەڵ ڕژێمی عوسمانی کردبوو ، گەر خواستەکانی قبوول نەکرێ و لە کۆبوونەوەیەکی – ئەنجوومەنی نوێنەران– دا ، بەتایبەتی بۆ لێدوان لەو هەڕەشەیەی کە ئەکرا .
لەکاتێکدا هەندێك لە کاربەدەستانی دەسەڵاتی عوسمانی بەتاڵی خەزینەی دەوڵەت و نەبوونی دراویان ڕادەگەیاندو ئەکردە بیانووی قبووڵکردنی مەرجە گرانەکانی دەوڵەتی ئەوروپا.
لە هەمان کاتدا نوێنەرێکی هەڵبژێردراو بۆ پەرلەمان کە کورد بووو لەو کات ووتی :–
ئێوە ئەڵێن کاروباری دارایی لە تەنگانەیەکی سەختدا بێ بە ئێمە چۆن دەکرێ و دەتوانین بڕوا بەو ووتەیە بکەین کە لە کاتێکدا ئێوە لەم کەش و فشەدان و جل وبەرگی ڕەنگاوڕەنگ و ماڵی ڕازاوەی پڕ لە کەلوپەلی جوان و گالیسکەی ئەسپی قەشەنگتان هەیە– وەرن بۆ لای ئێمە بۆ کوردستان و بەچاوی خۆتان کوێرەوەری و ئێش و ئازارو ناخۆشی ژیانی گەلی کوردستانی ئێمە بەچاوی خۆتان ببینین لە هەرێمەکەدا لە کوردستان .

١٨٧٧/٤/٢٤هەڵگیرسانی جەنگ لە نێوان هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری و

هێزەکانی سووپای ئیمپراتۆریـەتی عوسمانی لە دەوورووبەری هەرێمـەکانی قــەفقازو بــەلکان لــە ئــەنجامی کێــشەو ململانێیــەکی توونــدو دژووار لــە نێوانیاندا.



١٨٧٧/٥/١٦ لــە ژمــارە دووی ڕۆژنامـــەی – شەهبا– دا زانای ناوداری جیهانی لــە نــژاد کــورد – عەبــدولرەحمان کــەواکبی – بــە نــەرمی گلــەیی لــە دواجـــەنگی بــەناوبانگی نێـــوان ڕووســـــیای قەیـــــسەریو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کرد ، لە ڕەفتـــارێکی نابـــەجێی کـــار بـــە دەستانی عوسمانی لــە پارێزگـای عــەنتاب لــە بــاکووری کوردســتان کــردووە ، کــە ئەوسـاکە لــەڕووی کارگێڕی سەر بە شاری حەلەبی – شام ، و ئێستای سووریا بووە ، کە شەش لە ئەرمەنەکانی عەنتاب دەچنە بارەگای لەشکری عوسمانی بۆ ئەوەی خۆیان بەچـەکدارکردن بکـەن دژی ڕووســەکانی هــاو ئــایین نــاوونووس بکــەن لــە شارەکەدا .

کەچــی ئــەوان داوایــان لێکــردن ببنــە ئیسلامو ئــەوانیش ئــەو داوایــەیان ڕەتکردەوە ... دوای ئەوە والی حەلـەب تووڕە دەبێ و ڕۆژنامەکە دادەخات ، کە لەلایەن کەسایەتی ناودار کەواکبی سەرپەرشتیو بەچاپ دەگەیەندرا لە شارەکەدا .

١٨٧٧/١١/٦ داگیرکردنی شارەکانی – قارسو ئەرزەڕۆمو بایەزید– و ناوچەکانی دیکە لـە بـاکووری کوردستان لەلایـەن هێزەکـانی سـووپای ڕووسـیای قەیـسەری ، کـە بـووە هـۆی کـارلێکردن لـە دەروونـی گـەلی کوردو سـەرکردەکانی وەك ، شـێخ عوبێـدولای نـەهری بـەپێی ئامۆژگـاری هێزەکـانی دەسـەڵاتی عوسمـانی لـە کوردستان .

١٨٧٧/١٢/١٢ سوڵتانی عوسمانی لە دانیشتنی کردنەوەی پەرلەمانی ئیمپراتۆریەتەکەیدا ، بەڵێنیدا لە بەرێزگرتن لە مافەکانی نەتەوەیی و یەکسانی بەرفراوان .

بەڵام سولتانی لەووتەکانی پاشگەز بووەوە . ئەوە سیفاتی هەموو سەرکردەو داگیرکەرێکی خاکی گەلانە ، بە تایبەتی داگیر کەرانی خاکی‌گەلی کوردستان ، کە لەوکات داگیرکراوی ژێر دەسەڵاتی فارس‌و عوسمانی بوو . سەرەڕای چەندین کاری دیکەی نامرۆڤانە ئەنجامدراوە لەلایەن ئەو ڕژێمانە بەهەمانگی لەنێونیاندا .

## ١٨٧٨

١٨٧٨/١/٥ بەرپابوونی شەڕ لە نێوان هێزە چەکدارە ئیسلامیەکانی ئەفگانستان‌و هێزەکانی سووپای بەریتانیا ، لە ئاکام هێزەکانی سووپای ئەفگانستان سەرکەووتنیان بە سەر هێزەکانی سووپای بەریتانیادا هێنا .
کە لە ئەنجام بووە هۆی ئەوەی کە ورەی هەمەلایەنی هێزەکانی چەکدارەکانی ئەفگانستان بەرز بێتەوەو توانای باشیان هەبێت لەشەڕو هونەرەکانی شەڕ کردن ، چ لە شەری نێوودەووڵەتی‌و ، چ لە شەڕی ناووخۆیی نێوان پێکهاتەکانی ئەفگانستاندا .

١٨٧٨/١/٥ لە دوای سەرکەووتنی هێزەکانی سووپای ڕووسیا بەسەر هێزەکانی سووپای عوسمانی ، لە شاری سۆفیای پایتەختی بوولگاریا و ئەردنە ، کە بەرەو شاری ئەستەمبوڵ هەنگاوینا وماوەی ٥٠ کیلۆمەتر مابوو بگەنە شاری ئەستەمبۆڵ .
کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە مەسیحیەکان پەلاماری ئیسلامیەکان بدەن ، کە بووە هۆی دروست بوونی بارودۆخێکی توونددو تیژو دژووار بە هەڵاتنی ئیسلامەکان بەرەو ڕووی شاری ئەستەمبوڵ ، لە هەمان کات چەندین کۆمەڵە دروست بوون ، لە پێناو یارمەتی دانیان‌و بووە هۆکاری سەرەکی بە داواکاری سوڵتانی عوسمانی لە ڕووسیا .
ئەویش بەرەوانە کردنی شاندێکی سەربازی عوسمانی بۆلای سەرکردەی هێزەکانی سووپای ڕووسیا ، کە شاندەکە پێك هاتبوون لەنامیق پاشا و سرور پاشا ، لە گەڵ گەیشتنی شاندەکە کە چاویان کەووت بە سەرکردەی ڕووس ، ئەویش لەپێناو ڕاگرتنی شەڕو ڕاگرتنی گەمارۆ لەسەر کەنارەکانی ڕووسیا لە لایەن دەسەڵاتی عوسمانی لەسەر دەریای ڕەشدا .

لەوکاتەشدا چەندین ڕووداو ڕاپەڕین بەرپابوون چ لە ناوەوەو چ لە دەرەو
بە هاندان لەڕێگەی پیاوانی بەریتانیا دژی پەیمانی- سان ئیستیڤانۆس-
کە شارێکی بچوك بوو لە نزیك شاری ئەستەمبوڵ لە سەر دەریای مەرمەڕە
بە ناوی - سان ئیستیڤانۆس- کە لە دوای ئەو شارە گفتووگۆ لە نێوانیا
دەستی پێکردو لە ئەنجام ڕێکەووتننامەکە مۆرکرا ، کە ٩ نۆ خاڵی لەخ
گرتبوو.
شایانی باسە لەخاڵی شەشەمی ئەو ڕێکەووتنامەدا هاتبوو کە دەڵێ :
دەسەلاتی عوسمانی بەڵێن دەدات بەپاراستنی ئەرمەن و کوردو سەرکەسی
مافەکانیان بە تایبەتی لە بواری نەتەوەییدا لەباکووری کوردستان.

١٨٧٨/١/١٣ مـۆرکردنی ڕێکەوتنامـە لـە نێـوان ڕووسـیای قەیـسەری و ئیمپراتۆریـەتی
عوسمانی ، لە شاری بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا ، لە دوای کۆتایی هاتنی
شەڕی نێوانیان بە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕشەکانی گەلی کورد لە باکووری
کوردستان دژی داگیر کەری ڕژێمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەر خاکی
کوردستان .

١٨٧٨/٢/١٣ سولتانی عوسمانی سولتان عبدالحمید فەرمانیدا بە هەڵووەشاندنەوەی
ئەنجوومـــەن و ڕەتکردنـــەوەی دەســـتوورو بـــۆ ڕۆژی دوایـــی فەرمانیـــ
بەدەرکردنی نووێنەرە پایە بەرزەکان لە ئەستەمبوڵ ... بە گەڕانەوەیان بۆ
وویلایەتەکانیان لەو کاتەوە دەسەلاتی سوڵتان لەسەر دەووڵەتی عوسمانی
بووە دەسەلاتێکی تاکڕەوی داپلۆسێنەر لە سەر ناوچەو هەرێمەکاندا .

١٨٧٨/٣/٣ بە هۆی باری شڵەژاوی هێزەکانی سووپای عوسمانی و هەلاتنی لە ئەورووپا
ئاسیا ، کە ئەمەش بووە هۆی ناچاربوونی دەسەلاتی عوسمانی بە مۆرکردنی
سـێبارەی پـەیمانی - سـان سـتیڤانۆس- لەگـەڵ ڕووسـیای قەیـسەر
بەناچـاری ، کـە سـەفوەت پاشـا بەنووێنـەری دەسـەلاتی عوسمـانی
ڕێکەووتنەکەی مۆرکرد . لە کاتی مۆرکردنی ڕێکەووتنامەکە دەگریا.

١٨٧٨/٥/٣ مۆرکردنی پەیمانی چوار جارەی- سان ستیڤانۆس- لە نێوان ڕووسیا

قەیسەری و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، بێ ئەوەی هیچ دەوڵەتێکی ئەوروپی بەشداری تێدا بکات ، لە پێناو بەهێزکردنی دەسەڵاتەکانیان کە بەسوودمەندیەتی ئەرمەن گەڕایەوەو بە زیانی کورد هەڵگەڕایەوە ، لەوکاتەی کە کورد لەبارێکی یەکریزی بەهێزدا دابوون لەباکووری کوردستان .

١٨٧٨/٥/٢٥ دەسەڵاتی ئیمپراۆریەتی عوسمانی لە دوورگەی قووبرسی داگیرکراوی دادەست هێزەکانی سووپای بەریتانیا ، لە بەرامبەردا بەریتانیا بەڵێنیدا بەدەستپۆیی دەسەڵاتی عوسمانی لەسەر دورگەکەدا ، بە فەرمی بناسێنیٚو لە بەرامبەر داگیرکردنی بڕی ٩٢,٨٠٠ پاوەند ساڵانە بداتە دەسەڵاتی عوسمانی لە سەر ناوچەکەدا .

١٨٧٨/٦/٤ بەپێی برگەی/ ٦ لە ڕێکەووتنامەی نێوان بەریتانیاو دەسەڵاتی عوسمانی ، بە مەرجێ بەریتانیا قووبرس چۆڵ بکات لە دوای گەراندنەوەی ناوچەکانی قارس‌و ئەردەهان‌و ئەرتووشی کورد لە باکووری کوردستان ، لەلایەن ڕووسیا بۆ تورکیا ، کە لە شەڕی نێوانیاندا ڕووسیا داگیری کردبوو لە هەرێمەکەدا .

١٨٧٨/٧/١٣ مۆرکردنی پەیمانی بەرلین بە دابەشکردنی بوولگارستان بە سێ بەش‌و بە پشتگیری کردنی پەیمانی ستیڤانۆس ، کە لەبەرژەووەندی ڕووس‌و ئەرمەن بوو ، بەڵام کێشەی کورد پشت گوێ خراوبوو لە باکووری کوردستان .

١٨٧٨/١٠/١ لەدایک بوونی فەیلەسوفی کۆمەڵایەتی وفەیلەسوفی مێژوویی نەمساوی و – ئەشپان ئوتمار – لە شاری ڤیێنا ... خووێندنی لە شارەکانی ڤیێنا و زیورخ و تۆبنجف تەواوکردووە . لە دوای تەواوکردنی خووێندن بۆتە مامۆستا لە زانکۆ لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٩ تا ١٩٤٩ مامۆستا بووە لە زانکۆی ڤیێنا .

لە ساڵی ١٩٢٢ یەکەم کتابی بەناوی –نظریە مقولات – بڵاوکردۆتەوە . هەروا دژی بیری مارکسی بووە لە بارەی تیئۆری کۆمەڵگای بێ چینایەتی . دوای ئەوە لە ساڵی ١٨٧٥ – ١٨٧٨ دانراوەیەکی بڵاوکردۆتەوە لە چوار بەرگ بەناوی – بنا و حیاه الهیئە الاجتماعیە – . ئەم فەیلەسوف و ڕووناکبیرو زانایە لەکارە پیرۆزەکانی خۆی بەردەوام بووە تاکوو لە ١٩٥٠/٧/٨ کۆچی دوایی دەکات لە وڵاتەکەیدا.

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢ .

١٨٧٨/١٠/١٨ له ماوەی گرێدانی کۆنگرەی بەرلین هەوڵەکانی دبلۆماسی بەریتانیا تەنیا لە سەر قووبرس نەبوو ، بەڵکوو زیاتر لە سەر نامەی نهێنیەکەی وەزیری بەریتانیا – سولزبری – بوو ، کە بۆ باڵوێزی بەریتانیا لە شاری قوستەنتنیە – لابارد – رەوانەی کردبوو ، کە وەزیری دەرەوەی بەریتانیاو فەرەنسا – ئەدینگتون – لە بارەی باری ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو داهاتووی ڕاگەیاند . لەپێناو چەسپاندنی دەسەڵاتی بەریتانیا لە سەر ڕۆژئاوای ئاسیاو بە تایبەتی وویلایەتەکانی ، مووسڵو ، بەغداو ، بەسرا ، بە دابەشکردنی ناوچەکە ، لە نێوان فەرەنساو بەریتانیا ، بە تایبەتی خاکی کوردستان کە چاوەڕوانی چاوگەی نەوتی لێدەکرا ، بە تایبەتی لە باشووری کوردستان . کە شارەکانی کەرکوك و دەووروبەری وخانەقین و ناوچەی کەندیناوەوی سەر بە قەزای مەخمور ، لە پارێزگای هەولێر و چەندین جێگەی دیکە لە هەرێمەکەدا .

## ١٨٧٩

١٨٧٩/٣/١٤ لە دایك بوونی فیزیاناس و تیئۆرە فەلسەفەیەکانی ئەلمانی – ئەنشتاین ئەلبرت – لە شاری ئۆلم لە باشووری ئەلمانیا ... لەدایك و باوکێکی ئایین جوولەکە . دوای ساڵێك لەدایك بوونی خێزانەکەی لەشاری منشن نیشتەجێ بوون . هرمن ئەلبرت باوکی و مامەکەی یعقوب کارگەی کارەباو کارەکانی ئەندازیاریان دامەزرند .

هەروا خووێندنی سەرەتایی و ناوەندی ئەلبرت لە شاری منشن بووەو لەخووێندنەکانی سەرکەووتوو نەبوو ، ئەویش بەو هۆیە دایکی هانیدا کە لە خووێندنی مۆزیکا بەردەوام بێت لەسەر ئامێری کەمانچە . دوای ئەوە باوکی رووی کردە ئیتالیا لە نزیك شاری میلانۆ ، ئەویش باری ئابووری و کەم دەرامەتی لە سەر باری ژیانیدا .

بەڵام ئەنشتاین ڕووی کردە سویسرە لە ساڵی ١٨٩٦ و چووە کۆلێژی ئەندازیاری فیدرالی بەناوبانگ – ETH – و ماوەی چوار ساڵ لەخووێندنی فیزیاو ماتماتیك بەردەوام بوو ، بە بەدەست هێنانی بروانامەی دبلۆم و لە بەهاری ساڵی ١٩٠٠ بووە مامۆستای ماتماتیك بۆماوەی دوو مانگ ... یەکەم بلاوکراوەی لەگۆڤاری – حولیات فیزیا – بوو لە ساڵی ١٩٠٥و بڕوانامەی

دکتۆرانی لەزانکۆی زیورخ بەدەست هێنا . ئەم مرۆڤە لە ماوەی ژیانیدا ١١ بەرهەمی بە چاپگەیاندووە لە بارەی فیزیاو ماتماتیك و چەندین بواری دیکەو کەسایەتیەکی ناوداری جیهانیە لە بواری زانستەکان تاکوو لە ١٩٥٥/٤/١٨ کۆچی دوایی لە ئەلمانیا دەکات .

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە - داناتی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی /٣ .

١٨٧٩/٨/٦ قائیمقامی قەزای گەوەرێ لە باکووری کوردستان هێرشی کردە سەر عەشیرەتی - گراکلی- ئەویش لەسەر نەدانی باج لە ئەنجام بووە هۆی شەهید بوونی ١٦ هاوولاتی کوردو دەستگیرکردنی ٤٠ هاوولاتی دیکەی کورد لە ناوچەکەدا ... شایانی باسە ئەم رووداوە بووە هۆکاری سەرەکی و بنەمای سەرهەڵدانی شۆڕشی شێخ عوبێدوللای نەهری لە باکووری کوردستان .

١٨٧٩/٨/٧ دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەڵسا بەکەمکردنەوەی هێزەکانی سووپا لە میسر بۆ ١٨٠٠٠ هەژدە هەزار سەربازی چەکدار ، بەپێی ئەو رێکەووتنامەی کە لەگەڵ فەرەنساو بەریتانیا مۆری کردبوو لە وولاتەکەدا .



١٨٧٩/٨/١٧ ئەندازیاری بەناوبانگی جیهانی - فردینالند دیلیبسبس - کۆمپانیای کەنالی پەنەمای دامەزراند و هەر ئەو زانایە خۆشی خاوەن بیرۆکەی دامەزراندنی کەنالی سوێس بوو لە وولاتی میسر .
شایانی باسە کە وولاتی پەنەما دەکەوێتە نێوان هەردوو کیشوەری ئەمەریکای باشوور و ناوەراستەوە و تاکە دەوڵەتە لە جیهان کە زەریای هێمن و زەریای ئەتلەسی تیادا تەنها پەنجا میل لە یەکەوە دوورن . ئەمە جگە لەوەی کەباشترین ئاوی خواردنەوەی هەیە لەجیهاندا .

یەکێك لە بەناوبانگترین ئەو وڵاتەی کە پێی بناسرێت کەناڵی پەنەمایە . کە ڕێرەوێکی ئاوییەو هەردوو زەریای هێمن و ئەتلەسی بەیەکەوە دەبەستێتەوە ... دروستکردنی ئەو کەناڵە ئاوییە کارێکی ئەندازیاری بێ وێنەیەو درێژیەکەی ٨٠ کیلۆمەترەو ساڵانە ١٢٠ کەشتی هاتووچۆی پێدادەکات ... سەرەتا فەرەنسیەکان پارەیاندا بە ئەمەریکیەکان بۆ دروستکردنی کەناڵەکە .

بەڵام لەپێش دەستکردن بە پرۆژەکە و لە ساڵی ١٩٠٢ ئەمەریکیەکان ماف کەناڵەکەیان لە فەرەنسا کڕیووە و خۆیان لە ساڵی ١٩٠٤ – ١٩١٤ پرۆژەی دروستکردنی کەناڵی پەنەمایان جێ بەجێکرد . کەناڵەکە وڵاتی پەنەما دەکا بەدووبەش بە خۆرهەڵات و خۆرئاوا ... لەپێش دەست پێکردنی جەنگی جیهانی یەکەمدا بەرەسمی کەناڵی پەنەما کرایەوەو لە ١٩١٤/٦/٧ دا یەکەم کەشتی بەکەناڵەکەدا تێپەربوو .

پاش ئەوەی کە ئەمەریکیەکان ٨٥ ساڵ کەناڵەکەیان بەڕێوەبردو هەژموونیان بەسەریدا هەبوو ... لە کۆتایی وڵاتی پەنەما توانی سەروەری خۆی بەسەر کەناڵی پەنەماندا بگێڕێتەوەو بیخاتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە ، کە هۆکارێکی بنەڕەت و کاریگەرە لەبووژاندنەوە ژێرخانی ئابووری و بازرگانی بۆ وڵاتەکە لە کێشوەرەکەو جیهاندا لە هەموو بوارەکانی ئابووری و گەشت و گوزاردا .

١٨٧٩/١٢/١٥لە پێناو دامەزراندنی کوردستانێکی ئازاد ، دووبارە میربەدرخان و نەوەکەیو لایەنگیرانی خۆیان گەیاندەوە جەزیرو سەربەخۆیی میرنشینەکەی لە مێژینەی خۆیان ڕاگەیاندەوە ... لەوکاتەش دەووڵەتی تۆرانی عوسمانی چەند جارێك بەهێزی سووپاکەیان هێرشی بردنە سەرو هەموو جارێکیش لەو هێرشانە دەشکان .

جۆلەمێرك و زاخۆ و ئامێدی ومارکین و مدیان و نەسیبین کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی میرنشینەکەیان و برا گەورە – عوسمان پاشا – تاجی فەرمانرەوایی لەسەرناو لە سەر مینبەر ووتاری بەناو دەخووێنرایەوە . تێك شکانی جارلە دوای جاری هێزەکانی عوسمانی تۆرانی و خۆ قایم کردن و پەرەپێدانی دەسەڵاتی – میر عوسمان پاشا – لە کوردستان ، وایان لە سوڵتان عەبدولحەمید کرد کە بەرامبەر بە کوردو کوردستان ڕامیاریەتیەکەی نەرمتربکات ، بەتایبەتی لەگەڵ بەدرخانیان هەڵس و کەوتی چاکەدانەوە بکات

... هەر بەدرخانیەکی سەر بەو بنەماڵە گیرا بوون ئازادی کردن و پیاوی تایبەتی نارده لای – ئەمیر عوسمان پاشا – و داوای کرد کە بە ئاشتیانە رێککەون و چیدیکە خووێنی موسلمانان نەرژێ .

بەڵام خزمانی بەدرخانیەکان کە لە شاری ئەستەمبوڵ نیشتەجێ بوون داوایان لەمیر عوسمان کرد کە گفتووگۆ لەگەڵ بەرپرسانی باڵای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەست پێبکات .

میر عوسمانیش دەستی کرد بەگفتووگۆ ودەسەڵاتی عوسمانی ماف کوردی بەرەوا دەزانی لە ڕامیاریەتە فرتوفێڵەکانی و تاگەیشتنە مەرامی خۆیان و هەڵیان بۆ رەخسا ، بە هۆی راستگۆیی و دڵ نەرمی میر عوسمان و لایەنگرانی . لەئاکامدا میر عوسمان و حوسێنی برای لەناکاو دەستگیرکران و ڕەوانەی ئەستانەکران و پاش ماوەیەك ئازادکران بەمەرجێك لەشاری ئەستەمبوڵ نەچنەدەرەوەو هەر لەو شارەبن .

## ١٨٨٠

١٨٨٠/٣/ سەر کردەی کورد شێخ عوبیدوڵلای نەهری ، یەکەم کۆمەڵەی ڕامیاری کوردی بە ناوی یەکیەتی کوردان لە باکووری کوردستان پێکهێنا ، بە کارگێڕیەتی بەحری بەگ بەدرخان .

کە ئامانجەکانی بریتی بوو لە چوار بڕگەو سێ خاڵ لە باکووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیکان .

١٨٨٠/٣/٧ لە دوای هەوڵ و ماندوو بوونێکی زۆرو چەندین داهێنان لە ئاکامدا هێزی وزەی کارەبا ، لە لایەن زانای ئیتالی – ئەدیسۆن ڤۆلت – دۆزرایەوە ، کە بووە هۆی کارێکی هەمە جۆری بەرەوپێش بردنی باری مرۆڤایەتی لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ژیاندا ، گەر وزەی کارەبا لەم سەردەمەدا نەبووایە پەرەسەندەن و پێشکەووتن دەکەووتە دووریانی هەرەس هێنان .

١٨٨٠/٤/ دامەزراندنی پەرتووکخانەی کۆنگریسی ئەمەریکی ، کە یەکەم پەرتووکخانەیە لە گەورەیی لەجیهان ، کە زیاتر لە ١٧ ملیۆن کتابی هەمە جۆری تیایەو لەگەڵ ئەوەشدا چەندین نەخشەو دەست نووس و فیلمی سینەماو وێنەو کاسێتی ڤیدۆ لە خۆ دەگرێ لە هەموو بوارە جیا جیاکاندا .



١٨٨٠/٧/١٥ نووێنەرانی هێزەکانی سووپا لە ئــــەوڕوپا هەســــتیان بـــە جوولانــەوەی هــەڵس و کــەووتی ئیـــسلامی کـــرد ، کـــە شـــێخ عوبێـدولا سـەرکردایەتی دەکـرد لـــە ڕۆژهـــەلا!ت و بـــاکووری کوردســـتان ، هـــەر بـەم بۆنـە قوونـسلی بـەریتانیا لـە شـاری ورمیَ – ولیم ئابوت– دەڵێ:– مـن لـەو بڕوایـەم کـە هێزەکـانی پارێزگـارانی تـورك لەپـشتەوەی جوولانەوەی شێخ عوبێدوڵلان، چونکە لـە ماوەیەکی دیاریکراو کاردانەوە؛ دەبێـت، لـە بەر ئەوەی شێخ توونـدڕەویـەکی بەرچاوی ئایینی هەیەو لەد ڕۆژدا بـە زیـانی وولاتـانی ڕۆژئـاواو نەسـرانیەکان هـەل دەگەڕێتـەوە ، لەبـ ئەوەی شێخ عوبێدولاو کوڕەکەی عەبدولقادر چاو نەترسن و جووڵانەوەکەیا جووڵانــەوەی ئیـسلامیەو داوای جیهـاد دەکـەن و لـە چەندین نامـەیان بـاس لەسەرکەووتنی ئیسلام دەکەن و نیاز لە ناوەڕۆکی نامەکان دەردەکەون.

شـایانی باسـە کـە ئەم هەڵوویـستانە لـە دەروونـی وولاتـانی ئـەوڕوپا ببـوو کـارلێکردن لـە داهـاتویَ کـورد ، ئـەویش بـە هـۆی کێـشەی نێـوان ئیـسلام مەسیحی لە ناوچەکەدا .

کە کوردیش هەر بەو ئاگرە سووتاوە تاکوو ئیستا ، بە هـۆی تێکـەلاو کردنـ باری نەتەوەیی و نیشتمانی لەگەڵ بوونی ئاین ، لەبە ئەوەی ئامـانجی ئای بالادەسـت تـر بـووە لـە ئامـانجی نەتـەوەو نیـشتیماندا ، بـە تایبـەتی لـ کوردستان .

١٨٨٠/٨/٢ رابـەرو پێـشەوای کـورد شـێخ عوبێـدولای نـەهری چـەندین جـار ئاگـادار نووێنــەری بـەریتانیای کـرد ، بـەوەی کـە ئێمـە بـیری دژایـەتی کردنـی دژ دۆستانی کوردسـتان هـەڵناگرین ، هەرچـەندە مـن لـە ژێـر سێبەری سـوڵتان عوسمانی ژیان دەبەمە سەر ، بەلام من دەمەویَ جێگەی متمانەی بەریتانیا

، لە بەر ئەوەی پەیووەندیم لەگەڵ ئیسلامەکانی هیند هەیەو بەرەو پێشەوە دەچن لە ژێر سایەی بەریتانیادا .

هەروا ئامادەم هەموو داواکاریەکانی بەریتانیا جێبەجێ بکەم ، گەر کەش و هەوای لەبارم بۆ بگوونجێنێ و توانای دەرکردنی دەسەڵاتی عوسمانی و ئێرانم لەکوردستان هەیە ، منیش ڕێگرنیم لە دامەزراندنی حکوومەتێکی ئەرمەنی . بە مەرجێ بۆکوردیش هەمان مافی حکوومەتایەتی پێبدرێ لە هەرێمەکەدا .

گەر دەووڵەتی کوردی لە کوردستان دامەزرا ، ئەوا من بە هەموو توانا یارمەتیان دەدەم لە هەموو بوارەکان ، بەتایبەتی بەدامەزراندنی پەرستگەو کەنیسەکانیان بە هەموو ئازادیەك... بەڵام شێخ عوبێدوڵا باش دەیزانی کە بەریتانیەکان سوودمەند بوون لە شەڕی نێوان تیرەو هۆزە کوردیەکانی باکوورو رۆژهەڵاتی کوردستان لە سەر سنووری نێوان دەسەڵاتی عوسمانی و فارسدا . کە لەسەر خاکی کوردستان بوو، ئەویش بەدروست بوونی ئاژاوەو نالەباری پەیووەندی لە نێوان بەریتاناو رووسیای قەیسەری لەسەر خاکی کوردستان لە کێشووەرەکەدا .



١٨٨٠/٨/٢٦ شاعیری بەهرەداری فەرەنسی – گیوم ئەبۆلێنێر – لە دایکێکی پۆلۆنی و باوکێکی ئیتالی لە شاری رۆمای پایتەختی ئیتالیا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ... لەشارەکانی مۆناکۆ و نیس دەستی بە خووێندن کردووە . لە ساڵی ١٩١٦ رەگەزنامەی فەرەنسی وەرگرتووە ... هەروا لەرێزەکانی سووپای فەرەنسا لەجەنگی یەکەمی جیهاندا خزمەتی کردووەو لەشەڕدا زامداربووە . لە ساڵی

١٩١٨ له تەمەنی ٣٨ ساڵیدا كۆچی دوایی كردووه ... لەم تەمەنە كورتـەدا خـاوەنی ئـەزموونێكی تایبـەتی بـووه لـه شـیعرداو شـیعرێكی زۆری دانـاوەو تاكوو ئێستاش لاوانی فەرەنسا لایان باشترین و بەرزترین شاعیری نوێكاره له وولاتەكەو له جیهان ، له یەك له شیعرەكانی بەناوی – پردی میرایۆ – بووه كه بەناوبانگترین شیعریەتی لەشیعرەكان .

سەرچاوه :– مجلة الثقافة الاجنبية العدد/١/سنه /١٩٨١.

١٨٨٠/٩/٣٠ بەردەوام بـوونی شۆڕشـی شـێخ عوبێـدوڵلاّ نـەهری به مەبەسـتی پێكهێنـانی حكوومـەتی كـوردی لـه كوردسـتان ، بـه ڕزگـاركردنی زۆربـەی ناوچـەكانی كوردستان . ئەویش به بوونی هێزێكی بەرفراوان ، كه خان باباخان كرا به فەرماندەی هێزەكانی چەكدار له ناوچەی سابلاّغ له رۆژهەلاّتی كوردستان .

١٨٨٠/١٠/٥ لەراپۆرتی كاپتن– كلایتن – دەردەكـەوێت ، كه ڕووداوەكانی ڕاپـەڕینی شێخ عوبێـدولاّی نـەهری‌و دەسـەلاّتی عوسمـانی لـه ناوچـەی هـەكاری ، كـه نەیدەتوانی ڕێگابگرێت له كورد له باكووری كوردستان ، له هاوبەشی كـردن له جووڵانەوەی شێخ عوبێدولاّ له بـەر دوو هۆكارئەویش :– یەكـەم :– بـوونی دەسـەلاّتی تـەواو لەسـەر هـەكاری‌و ، دووەم :– لـه دام‌و دەزگـا سـەربازی‌و كـارگێڕی دەسـەلاّتی عوسمـانی لەخۆپیـشاندان و دەر برینـی نـالرەزایی بەردەوام بوون بەهۆی وەرنەگتنی موچەكانیان.

١٨٨٠/١٠/٥ له دایك بوونی سەركردەی سەهیۆنیزم – ژابووتنسكی– له شاری ئۆدیسا ، تـاكوو مردنـی لـەمانگی/ ١٩٤٠/٧ ، كـه بـه درێـژایی ژیـانی لـه پێنـاو مـافی جوولەكه خەباتی كردووه وەك دەڵـێ:– من كاردەكـەم لـه پێنـاو دامەزرانـدنی ئیسرائیل ، هەتا گەر ناچاربم هاوكاری لەگەڵ شەیتان بكەم– كه بەدەیان جار زیندانی‌و ئەشكەنجه دراوه به هۆی توووند ڕەوەی له بیروبۆچوونەكانیدا . ئـەویش لـه پێنـاو دەوڵـەتی یـەهوودی – جوولەكـه – لـه فەلەسـتین ، ئاواتەكانی له دوای هەشت ساڵ لەمردنی ڕابەری یەهوودی ، له ساڵی ١٩٤٨ هاتەدی بەدامەزراندنی دەوڵەتی یەهوودی له فەلەستین له كێشووەرەكەدا .

١٨٨٠/١٠/١١ شای ڕژێمی فارسی سەفەوی ، داوای له بەریتانیا كرد ، كه زۆر له دەسەلاّتی عوسمانی بكات ، بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی جوولانەوەی كوردو ڕاپەڕینەكانی

ببێتەوە لە سەر خاکی کوردستان ، لەپێناو گەمارۆو لەناو بردنی راپەرینەکانی کورد ، کە ئەمەش لەرێگەی باڵوێزی بەریتاینا – تۆنسون-بوو ، لە تارانی پایتەختی وولاتی فارس ئەنجامدرا .

١٨٨٠/١٠/١ دەسەلاتی رووسیای قەیسەری بەوە سازان ، کە دژی کوردو راپەرینەکانی گەلی کوردستان ، یارمەتی دەسەلاتی فارسی لە ئێران بدەن و ئەوەشیان سەلماند بەو کارە ، کە باڵوێزی رووسیا لە ئەستەمبوڵ هانی دەسەلاتی عوسمانی دەدا لە دژی کورد بەشداری شەربێت لە باکووری کوردستان.

١٨٨٠/١٠/٢ دەسەلاتی ناوەندی شای فارس ، ئاگاداری وەزیری دەرەوەی بەریتانیاو باڵوێزی بەریتانیا تۆمسۆن لە تارانی پایتەختی فارس کرد ، کە کورد یەکیان گرتووە ، لە پێناو وەدی هێنانی مافی سەربەخۆیی لە باکووری کوردستان ، کە ئەمەش مەترسی دەخاتە سەر دەسەلاتی شاو مەترسی دوا رۆژی لە ناوچەکەدا .

١٨٨٠/١١/ پێشەوای کورد شێخ عوبێدولای نەهری نامەیەکی ئاراستەی دکتۆر کۆچرا کرد لە بارەی باری کوردەکانی هەرێمی رۆژهەلاتی کوردستانی ژێر دەسەلاتی فارسی سەفەویدا لە تاران .

١٨٨٠/١١/ حکوومەتی رووسیای قەیسەری و بەریتانیا دەمارگیری مەسیحیگەری توندیان دەنواند لەمەر چارەنووسی ئەرمەنەکانی باکووری کوردستانی ژێر دسەلاتی عوسمانی ، کە بۆماوەیەکی کاتی دەژیان و هەموو کاتێکیش کە ئەم دوو دەوڵەتە کوردیان بە مرۆڤ نە دەزانی لەنیشتمانی داگیراویدا .

١٨٨٠/١١/ رابەرو پێشەوای کورد شێخ عوبێدولای نەهری و کۆمەڵێك لەهێزەکانی بۆ ناوچە شاخاویەکانی کەناری زێی هەکاری کەووتنەرێ ، بە هۆی سەرنەکەووتنیان لە شەرەکان و راپەرینەکان لە باکووری کوردستان .
لە ئاکام بووە هۆی توانەوەی راپەرینەکانی شێخ ، وەك بەفر چۆن لە سەر بەرد دەتاوێتەوە ، هەروەك راپەرینەکەی ئاداری ١٩٩١ لە باشووری کوردستانی لکێندراو بەئێراق .
شایانی باسە کە بەریتانیاو رووسیاو فەرەنسا ئەوەندە یارمەتی کوردیان داوە تا خواست و ویستەکانیان هاتۆتە دی لە ناوچەکەدا ، دوای ئەوە

هاوكاریـان لەگـەڵ دووژمنـەكنی خۆیـانكردووە دژی كـوردو لـەناو بردنـی ڕاپەڕینـەكانیان . دوای ئـەوە بـەریتانیاو ئەمـەریكاش ئێـستا پێویـستیان بـەكوردو ناوچـە جوگرافیەكـە هەیـەو دوا ڕۆژی كـورد خێـری تیـا بێـت لـە ناوچەكەدا ..؟!!.

١٨٨٠/١١/١٩ قەیـسەری ڕووسـیا – ئەلكسەندەری دووەم – پـشتگیری تـەواوی خـۆی دژی ڕاپەڕینەكانی كورد نیشاندا بە ڕابەرایەتی شێخ عوبێدولای نەهری ، بە هـۆی ڕێك و پێكی سەركردایەتی كردنی بزووتنەوەی كورد لە باكووری كوردستان. كە لە نیووەشەو هێزەكانی سووپای ڕووسیای قەیسەری گەیشتنە ناوچەی نەخجەوان و هێزێكی دیكە بە ٥٠٠ سەربازی گەیشتنە– جۆلفا– بۆ یامەتی دانـی سـووپای فارسـی دژی ڕاپەڕینەكـەو گوشـار خرایـە سـەر دەسـەڵاتی عوسمـانی ، لـە پێنـاو هاوكاریكردنیـان دژی كـورد لەسـەر خـاكی داگیركـراوی كوردستان .

١٨٨٠/١١/٢٢ هیزەكـانی سـووپای فـارس بـە هـەموو تونـا كەووتنـە گیـانی كـوردو نیشتمانەكەی لـە ناوچەی ورمـێ و دەووروبـەری لـە ڕۆژهـەڵاتی كوردستان ، ئـەویش بـە سـووتاندن و وێرانكردنـی سـەدان گونـد و دەربـەدەركردنی دانیشتووانەكە لە ڕۆژهەڵاتی كوردستان .

١٨٨٠/١١/٢٨ لە بەڵگەنامەكانی كە بۆ باڵوێزی فارس ڕەوانە كراوەن ، كە زیاتر لە ٢٠٠٠ دوو هـەزار گونـدیان سـووتاندووەو وێرانكـردووە ، كـە زیـاتر لـە ٧٠ هـەزار خێزانـی كـورد ئـاوارە كـراون لـە شـارەكانی سـابلاخ و ورمـێ و هـەكاری لـە ڕۆژهەڵاتی كوردستان .
كە بەرەو ژێـر دەسـەڵاتی عوسمـانی كۆچیانكرد ، كـە ئـەم كـردارە نامرۆڤانـە چـوارمانگی خایانـدووە ، بـەپێی بەڵگەنامـەكان . كـە ئێـستا لـە وەزارەتـی نـاوخۆی تـاران و باڵوێزخانـەكانی دەسـەڵاتی عوسمـانی و فـارس و ڕووسـیا هــەلگیراون وهەریەكــەیان بەرامبــەر ئــەویتریان پــارێزراون لــە ئەرشــیفی باڵوێزخانەكانیان لەسەر باری هەمەلایەنەی گەلی كوردستان.

١٨٨٠/١٢/١٠ لـە یادگـاری ئـەم ڕۆژەدا تـا كـە هـەمزا ئاغـای سـەرەك خێلـی مـەنگووری ناسراوی كورد بە خێلی حەسەن عەلی خانی پارێزگای سنە ، دەست گیر كرا لە گەڵ چەند كەسایەتیەكی دیكەی كوردودوای دەستگیر كردنیان لە كارێكی

نامرۆڤانـه ، بەسـەر بـراوی بـۆ تـاران ڕەوانـەکران ، کـه لـه ڕۆژی جـەژن بـوو چـونکه هـەمزه لـەپاڵ ڕاپەڕینەکـەی شـێخ عوبێـدوڵلا دا بـوو لـه هەرێمـەکانی باشوورو باکووری کوردستان .

١٨٨٠/١٢/١٠ لەڕاپۆرتێکی – شۆلشینفسکی– دا ، که دەنووسێ:– لـه ئەنجامی ڕاپـەڕینی کـورد نزیکـەی چـەند هـەزار کوردێـك دەکـووژرێن و زیـاتر لـه ٢٠٠ دوو سـەد گوندیش تـالانکران و سووتێندران لەلایـەن هێزەکانی سووپای عوسمانی لـه باکووری کوردستان.

١٨٨٠/١٢/١٥ ڕابـەرو پێـشەوای کـورد شـێخ عوبێـدوڵلای نـەهری بـەهێزێکی گـەورەی ئیلاتەوه لـه مەرگەوەر بەرەو شاری ورمێ بەڕێکەوت ... بۆ حەسانەوه و چەند کاتـژمێرێك لـه گونـدی باڕانـدوز لایـدا ، لـه وێـووه ڕاسـتەوخۆ بـەرەو گونـدی سـیری نزیکـی شـاری ورمـێ لـه ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان بەرێکـەووت ، کـه هێزەکانی کورد نزیکەی ١٢٠٠٠ دوانزه هەزار چەکدار دەبوون .

لەوکاتەش هێزێکی وانەبوو لە ورمـێ بیان پارێزێت ، بـەلام بـه هـۆی هەندێ هـەڵس و کـەووت شـێخ ، لـەپێناو یارمـەتی دانیـانی کارەکـان بەپێـچەوانه هەڵگەڕاوەو بووه هۆی بڵاوه پێکردنی هێزەکانی شێخ له ناوچەکەدا .

١٨٨٠/١٢/٣ لـه کۆمـەکی دبلۆماسـی سـەربازیدا ، هێزەکـانی سـووپای فـارس و ڕووسـیاو عوسمـانی ، لـه پێنـاو ئابلۆقـەدانی هێزەکـانی شێخ عوبێدولای نـەهری درا ، ئــەویش بەمەبەســتی گرتنـــی شـــێخ عوبێـــدوللا و دوورخـــستنەوەی لەسـەرکردایەتی ولە گۆڕەپـانی جەنگـدا ، دژی داگیرکـەرانی هەرسـێ وولاتـی هاوپەیمان و داگیرکەری خاکی کوردستان.

١٨٨١

١٨٨١/١/٢٨ زانـــای نـــاوداری کەســـایەتی ڕووســـی و جیهـــان – دۆستۆیفـــسکی– دوای تەمەنێکی پڕ لەخەبات و بەرهەم هێنەرو دانراوی بەپێزو دانسقه ماڵئاوایی لـه سەرجەم نووسەرو ئەدیب و ڕۆماننووس و مێژوونووس و شاعێرانی ڕووسـیا بەتایبەتی و جیهان بەگشتی کرد لە وولاتەکەدا .

١٨٨١/٤/١ زانـاو فەیلەسـوف و کەسـایەتی ئـاینی شـێخ – عەبـدە – ووتـارێکی لـه

وەقائعی میسری بڵاوکردەوە بە ناوی – کلام فی خطا العقلا – و ئەمەش بـ
ڕوونکردنـەوەی هۆکارەکـانی پێشکەووتنی ئەورووپیـەکان دەهـات ، لـەدوای
ئێش و ئازارو تەنگەژەیـەکی پڕلـە مەرگەسات ، کە سەرەتای پێشکەووتنی
ئەورووپیەکان لە ڕاستیدا لە دەروونی دانیشتووانەکان بووە .
ئەویش بە شەڕی سەلیبی لەدەشت و لـەدەریاو بە تێکەڵ بوونیـان لەگەڵ
گـەلانی ڕۆژهــەڵات و نـەوە لـە دوای نـەوە و پێدانی ئازادی و دیموکراتی و
گرنگی دان بە پیشەسازی و بازرگانی و چەندین کاری دیکە دا ، کە بوو
هۆی پێشکەووتنیان لە هەموو بوارە جیا جیاکان بەهۆی زیرەکیان و سوود
وەرگرتن لـە نـەزانی گـەلانی ڕۆژهـەڵات بەتایبـەتی عـەرەب تاکوو ئێستا لە
کێشووەرەکەدا .

١٨٨١/٥/١٢ هێزەکانی سووپای فەڕەنسا لە هێرشێکیدا گەمارۆی کۆشکی – یای– دا لە
شـاری تـوونس ، لـە باڕدۆی شـاری تـوونس و ناچـارکردنی – یـای– بە
مـۆرکردنی پـەیمانی بـاڕدۆ ، کــە – یـای– ڕەزامەنـدی لـە سـەر بکـات
بەمۆرکردن و بەداگیرکردنی توونس ، لە پێناو ڕێکخستنی هاتووچۆدا .
بەڵام دبلۆماسیەتی بەریتانیا ماوەی بەفەڕەنسادا .
کــە ووشــەی پــارێزراو بخاتــە ســەر ئــەو داگیرکردنــە لــە پەیمانەکـەو
فەڕەنــسیەکانیش قەرەبوویــەکی چــەکیان مۆرنــەکرد بــۆ داهــاتووی
پەیووەندیەکانی نێوان فەڕەنساو بەریتانیا .

١٨٨١/٦/٤ ڕابەرو پێشەوای کورد – شێخ عوبێدوڵای نەهری – لە شاری ئەستەمبۆڵ
زیندانی کرا لەلایەن دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

١٨٨١/٧/٢٣ بەپێی مۆرکردنی پەیمانی کاری دەریاوانی لە نێوان هەردوو وولاتی شیلی
و ئـەرژەنتین ، تەنگەبـەری ماجـەلان کە درێژی ٦٠٠ کیلۆمـەترو پـانی ٣٥
کیلۆمــەترەو هــەردوو دەریــای ئەتلەســی بــە یــەك دەبەســتێتەوە لـە
کێشووەرەکەدا.
بەڵام گەرووی – تەنگە بەر – ی چیای تارق کە درێژی ١٤ کیلۆمەترو پانی ١
کیلۆمــەترە دەگاتــە دەریــای سـپی ناوەڕاسـت و بـە دەریـای ئەتلەسـی
دەبەسـتێتەوە ، کـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ڕژێمـەکانی نێـوو دەوڵـەتی . بـەپێی

پەیمانەکانی ۱۹۰٤ و ۱۹۱۲ی کە لە دوای ئەو پەیمانە مۆرکراون .




۱۸۸۱/۱۰/۲۱ رابەرو پێشەوای کورد شێخ عوبێدولاّی نەهری لە دوای دەستگیرکردنی لە رۆژهەلاّتی کوردستان بەخۆیو خێزانەکەیو ۱۰۰ لە لایەنگرانی بڕیاری ڕەوانەکردنی بۆ بەندیخانەی شاری موسلّ لە باشووری کوردستان دەرکرا ، کە ئەو کاتە وویلایەتی موسلّ ، لە ۹۰ ٪ ، دانیشتووانەکەی کوردبوون لە شارەکەدا .

۱۸۸۱/۱۰/۲۵ لەدایک بوونی وێنەکێش و نووسەرو رووناکبیری جیهان و ئەسپانی – بایلۆ رویزوای بیکاسۆ – لە بنەماڵەیەکی دون خۆزە رۆیزبلاسکۆ و دونابیکاسۆ لویز لە ئیسپانیا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .شایانی باسە کە باوکی بیکاسۆ مامۆستای پەیمانگای هونەرەجوانەکان بووە لەشاری مالاگای ئەسپانی ... هەروا لە



ژیـانێکی هەژاریـدا بـوون ... بیکاسـۆ لـە سـاڵی ١٨٩٢ دەسـتی بەخوێنـدن کـردووە و لــە تەمــەنی ١١ ســاڵان وێنــەی دایکــی کێـشاو بــووە هــۆی سەرسـوورمانی کارناسـانی هونـەری ... دوای ئـەوە بـاوکی کـاری هونـەری جێهێـشت بـۆ بیکاسـۆی کـوری ، کـە بـاوکی وێنـە کێشی ئـەو کـات و ئـەو سەردەم بوو لە وولاتەکەیدا .

هەروا بیکاسۆ لە ساڵی ١٨٩٦ یەکەم وێنەی کە بەرەنگی زەیتی کێشابوو کـە لـە پێـشانگای بەرشـلۆنە پێـشاندرا ... لـە سـاڵی ١٨٧٩ خـەڵاتی زێـرینی هونەرمەندە تازە پێگەیشتووی وەرگرت ... بیکاسـۆ لە ساڵی ١٨٧٩ تووشی نەخۆشی بوو هەر بۆیە ناچاربوو لەخوێندن بەرەو ماڵ بگەڕێتـەوە . بیکاسـۆ لـە سـاڵی ١٩٠٠ لەگـەڵ هـاوڕێ دڵـسۆزەکەی کازاگیمـاس بـەرەو پـاریس بەڕێکەوتن . ئەم مرۆڤە مێژووی ژیانی پڕبووە لەهونـەرو رۆشنبیرو کـەلتوور ، نـەك هـەر بـۆ وولاتەکـەی بـەڵکوو بـۆ هـەموو جیهـان و تـا لـە سـاڵی ١٨٧٣ ماڵئـاوایی لەوولاتەکـەو جیهـان و جیهـانی هونـەرکرد و بەرهەمـەکانی وەك کەلتوور و شووێنەوارێکی جیهان ماوەتەوەو جێگەی سەرسـوورمانی هـەموو جیهانە لە بواری هونەردا.

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە – داناتی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی/١ .

١٨٨١/١١/٢٤ گـەورە بـاڵوێزی ئیمپراتۆرییـەتی عوسمـانی – فـەخری بـەگ– لـە ئێرانـی پایتـەختی دەووڵـەتی فـارس ، داوای لـە ڕژێمـی شـای فـارس کـرد ، ئـەو زیانانەی کە لـە شێخ عوبێدوڵای نەهری کـەووتووە لە ساڵەکانی ڕابوردوو ، پێویستە قەرەبووکردن بۆی بگەڕێندرێتـەوە ، چونکە لەوانەیە شێخ بەهێزی لایەنگرانی لە رۆژهـەلاتو باکووری کوردستان پـەلامارەکانی ئەنجامبدات لە داهاتوودا .

## ١٨٨٢

١٨٨٢/١/٢٥ لـەدایك بـوونی نووسـەرو رووناکبیری نـاوداری جیهـان خـاتوو – ئـەدیلاین فرگمینیـا سـتیفنە – ناسـراو بـە – فرگمینیـا وۆلـف – لـە شـاری لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا . کـە بۆتـە هێمـای بزووتنـەوەی ئافرەتـان ئـەویش قەڵـەمێکی پێـشڕەو و شۆڕشـگێر دادەنرێـت لـە نووسـینەکانی و ڕێکخستنی شـەپۆلی هۆشـیاری بەدڵێکی پاکـەوە داوای یەکسانی ئافرەتی لـە گـەڵ پیـاو

کردووه .

بە هۆی بەردەوامی لەکارەکانی ، کە یەکەم رۆمانی لە ساڵی ١٩١٥ بەناوی - الاقلاع - و لە ساڵی ١٩٢٢ رۆمانێکی دیکەی بەناوی - غرفە یعقوب - بڵاودەکاتەوه ... لە ساڵی ١٩٢٥ رۆمانێکی دیکە بەناوی - السیده دالویە - بڵاودەکاتەوه ... ئەم ئافرەتە شۆڕشگێرو خۆراگرە لە پێناو کارە گۆڕانکاییەکانی و لە ئاکامی وێرانکردنی ماڵەکەی لەلایەن ناپاڵمەکانی سووپای ئەلمانیا لە سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانی و دروست بوونی نا ئومێدی هەستا بەخۆبەستنەوەی لەبەردێکی گەورە ، بە جل و بەرگیەوە و لە ١٩٤١/٣/٢٨ خۆی هەڵ دەداتە ناو زێی ئۆس و گیان لەدەست دەدات لە تەمەنی ٥٩ ساڵیدا ... ئەمەیە ژیانی شۆڕشگێران و ڕووناکبیران لەسەر زەویدا ، کە هەموو هەوڵی پێنووسەکانیان لە پێناو خزمەتکردنی مرۆڤایەتیە لە جیهاندا .

١٨٨٢/٣/١ زانا و فەیلەسوف ناوداری پزیشکی جیهانی دکتۆر - ڕۆبرت کۆخ- ڤایرۆسی نەخۆشی سیلی دۆزیەوە ، ئەویش لە پێناو بەرگریکردن و ماوە نەدان بەبڵاوبوونەوەی ئەونەخۆشیە لەجیهان بەتایبەتی لە ناو چینی هەژار ، کە ببووە هۆی گیان لە دەست دانی بەهەزاران هاووڵاتی لە جیهاندا .

١٨٨٢/٤/١٤ لەدایك بوونی دامەزرێنەری کارگێرو دەزگای ڤیێنا و یەکێك لەدامەزرێنەری فەلسەفەی - التحلیلیە المعاصرە - مۆرانتس ئەشلك - لە شاری بەرلینی ئەلمانیا ... شایانی باسە باوکی پیاوێکی پیشەسازی بووە . باپیری ئەرنست مۆرتس ئەرندت مرۆڤێکی نیشتیمان پەروەری ئەلمانی بووە دژی داگیرکەری ناپلیۆن و یەکێك بووە لەسەرکردەکانی ڕزگاری ئەلمانیا . لە دوای تەواوکردنی قۆناخەکانی خوێندن لە ساڵی ١٩٠٠ چووە زانکۆی بەرلین بۆ خوێندنی فیزیا بەخوێندنی دانراوەکانی ماکس و پلانك کە ئەم دوو فەیلەسوفە ناودارە فیزیایی بوونە .

لە ساڵی ١٩٠٤ بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێناوە ... لە ساڵەکانی ١٩١١ - ١٩١٧ مامۆستای یاریدەدەر بووە لە زانکۆی ڕۆستوك لە ئەلمانیا ... لەو ماوەش چەندین دانراوی خستە بەردەست خوێنەران ، ئەویش - النظریە العامە للمعرفە -. لە ساڵی ١٩٢١ بووە مامۆستا لە زانکۆی کیبیل و لە ساڵی

١٩٢٢ بووه مامۆستا لەزانکۆی ڤیێنا , . ئەم فەیلەسوفە لەکارەکانی نووسین و مامۆستایەتی بەردەوام بووە تاکوو لە ١٩٣٦/٦/٢٢ بە گووللە گیان لە دەست دەدات ، لەو کاتەی کە بەرەو زانکۆ دەرۆیشت لەلایەن یەکێك لەقوتابیەکانی لە شارەکەدا .

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢ .

١٨٨٢/٤/١٩ کۆچی دوایی فەیلەسوف و زانای ناوداری جیهان- چارلس داروین – کە خاوەنی بەناوبانگترین کتێبە بەناوی – أصل الانواع – لە سەردەمی خۆی . بەڵام زانای بە ناوبانگی جیهانی- لامارك – هەر لە پێشەوەی داروین بووە لە هەمان بوارەکان لەجیهاندا .

١٨٨٢/٥/٢٢ شاعێرو نووسەری ناوداری فەرەنسی – فیکتۆر هیگۆ – لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، ماڵئاوایی یەکجاری لەگەلانی فەرەنساو جیهان کردووە لە وولاتەکەدا .

١٨٨٢/٦/٢٥ لە دایك بوونی خاتوو – ئادلین فێرژینیا لیسلی – لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ، لە بنەماڵەیەکی ئەروستوکراتی و لە سەر ڕێڕەوە توند ڕەوەکەی کۆمەڵگا فیکتۆریا پێدەگات ، دوای مردنی دایکی لەساڵی ١٨٥٩ دووچاری زنجیرە نەخۆشیەکی دەروونی و هۆش دەبێت و ژیانێکی نامرادانە بەسەر دەبات .

شایەنی باسە کە ئەم خاتوونە یەکەم ڕۆمانی بەناوی – کۆتایی گەشتەکە – بلاودەکاتەوەو دەبێتە یەکێك لە ڕۆمان نووسە دیارەکان ... هەروا بەردەوام دەبێت لە نووسینەکانی تا لە ڕۆژی ١٩٤١/٣/٤ماڵئاوایی لە گەلانی وولاتەکەی دەکات ، کە وولاتانی ئەورووپا لەناو گەرمەی شەڕی جیهانی دابوون، فیرژینیا گیرفانەکانی پڕلە بەرد دەکات و خۆشی بەدەریا دا دەدا ، دوای ئەوەی نامەیەکی زۆر گرنگ بۆ مێردەکەی جێ دەهێڵێ . کە تیایدا پێی ڕادەگەیەنێ کە ئەم کارە بەهۆی تووش بوونی بە نەخۆشیە دەرونیەکان .

١٨٨٢/٧/١١ لە دوای کۆچی دوایی محەمەد عەلی پاشای دامەزرێنەری وولاتی میسر ، محەمەد تۆفیق ئیسماعیل ، لە ساڵی ١٨٧٩ دەسەڵاتی میسری گرتە دەست . کە لە نەوەی محەمەد عەلی پاشا بوو ، بە ناوی بنەماڵەی خدێووی ، کە لەڕەچەڵەکدا کوردن و لە کاتی ئەو شۆڕشی عرابی هەڵگیرساو بەریتانیا ئەو شۆڕشەی کردە هۆکاری پەلاماردانی میسر بە بۆردومانکردنی شاری

ئەسکەندەریە ، کە ماوەی ٧٤ ساڵ لەداگیرکردنی میسر بەردەوام بوو، لە سەر وولاتی میسر لە کێشووەرەکەدا .

١٨٨٢/٧/١ لە دوای هێرشی هێزەکانی سووپای بەریتانیا بە بۆردومانکردنی شاری ئەسکەندەریەی میسر بەشێووەیەکی دڕندانە ، بووە هۆی ڕەشکردنەوەی شارەکە و بووە هۆی ناڕەزایی بیری گشتی پێشکەوتوو لەجیهان و هەتا لەناو پەرلەمانی بەریتانیادا .

١٨٨٢/٨/٢ شارەکانی سوێس و بۆرسەعیدو ئیسماعیلیەی میسری لە لایەن هێزەکانی سووپای بەریتانیا داگیرکران لە وولاتەکەدا .




١٨٨٢/٨/ ڕابەرو پێشەوای کورد شێخ عوبێدولای نەهری لەهەولێکدا توانی بەفێڵ لە بەندیخانەی ئەستەمبۆل ڕابکات و بەرەو بەندەری – بۆنی– سەر کەناری ڕۆژهەلاتی دەریای ڕەش بڕوات و لەوێ بەرەو کوردستان... بەلام دووبارە دەستگیرکراوە لەلایەن ژەندرمەکانی دەسەلاتی عوسمانی ، بە یارمەتی چەند کوردێکی خۆفرۆش و دژ بەگەل و نیشتمانەکەیان .

١٨٨٢/٩/ هێزەکانی سووپای بەریتانیا بە تەواوی وولاتی میسریان داگیرکرد بەهۆی هەلاتنی هێزەکانی سووپای مسیر بەسەرکردیەتی ئەحمەد عەرابی پاشا لە شاری – تل الکبیر –، کە بووە هۆی ئەوەی کە سووپای بەریتانیا بچێتە ناو

شــاری قــاهیرەی پایتــەختی میــسر لــەدوای داگیرکردنــی شــارەکانی دیکــە بەسەرکردایەتی- ونسلی- لە ۹/۱۵ی هەمان ساڵدا .




۱۸۸۲/۱۰/۶ زاناو بیرمەندو نووسەری بــەناوبانگی عــەرەبی و جیهانی – جبران خەلیل جــبران – لــە شــاری بــەیروتی پایتــەختی لوبنـان چاوی بە جیهان هــەڵهێناوە . جێگــەی ئامـاژە پێکردنە کە کارە گــەورەکانی جــبران پاداشــتێك بــووە بــۆ گەلانی سەر رووی زەوی ... رۆشــنبیری جــبران هەمە لایـەن بـووە لـە بەیروت ، بگرە تـاکوو پاریس و لـە شارەکانی لەندەن و بەرلین و واشنتۆن و ساوبا ولۆو مەکسیکۆ .

هــەروا کاریگــەری لەهەسـت و هۆشـی فەیلەسـوف و شـاعیر و رۆمـاننووس و چیرۆك نووس و رووناکبیر هەبوو لە هەموو بوارەکانی کۆمەڵایەتیدا . نوێترین وەرگێردراوەکانی جبران خلیل جبران لەلایەن نووسـەری ئیتـالی – فرانتشیکۆ مدیتشی بووە بە ناونیشانی – بیست وێنە – کە چەندین تـابلۆی بڵاوکراوە جبران بوو بۆیە یەکەمجار لـە سـاڵی ۱۹۱۹ لەشاری نیـورۆکی ئەمـەریکا لەگـەڵ وەرگێران پێشەکیەکەی رەخنەگری ئەمەریکی – ئالیس رفائیل – لە سـەر ئـەو تابلۆیانـە ، هـەروا لەچینی میللی کارەکـانی جـبران وەرگێـردراون لـە سـاڵی ۱۹۳۱دا .

ئەو دانراوانەی جبران لە ئۆلۆمپیاتی پەکین لەساڵی ۲۰۰۸ لەچینی میللی هەڵدەواسـرێن لــە پــاڵ پرۆگرامــی رۆشـنبیری تایبــەت کــە – یەکیــەتی لێکۆڵینــەوەی جـبران لــە جیهــان – ئامـادەی کـردووە ... لەگــەڵ ئــەو کــارە

گرنگانـەی جـبران و بـەدەیا پێشانگاو ئاهـەنگ بەبۆنـەی یادکردنـەوەی ئـەو رووناکبیرە مەزنە لە وولاتە جیاجیاکانی جیهان ئامادەیی بۆکراوەو دەکرێت بـەهۆی بـوونی ئـەدەبێکی ئـەکادیمیای رەسـەن لـە نووسـینەکانی لەلایـەن نووسەرو رووناکبیرە جیهانیەکاندا.

١٨٨٢/١١/١٣ پێشەوای کورد – شێخ عوبێدللاو – کورەکەی شێخ عەبدولقادر لە پاش شـەڕێکی شـەش کاتـژمێری لـە باکووری کوردستان بـەدیل گیران و رەوانـەی بەندیخانـەی شـاری مووسڵ کران ، دوای ئـەوە رەوانـەی ماکۆکران ، کـە ئـەو شـەرەش لـە گونـدی شـەیتان بـوو کـە –٧٠– قەرسـەخ – دوورە لـە شارۆچکەی رواندز لە هەرێمی باشووری کوردستان .

/١٢/٢٣ لە دوای دەستگیرکردنەوەی رابەرو پێشەوای کورد شێخ عوبێدولای نەهری
١٨٨٢ شۆڕشـگێڕ ، لـە بەندیخانـەی شـاری وویلایـەتی مووسـڵ رەوانـەی شـاری مەدینەی منەوەری سعوودی کرا .

تێبینی :– زۆر جێگەی پێکراوە لە کتی دەستگیر کردنەکیدا

## ١٨٨٣

١٨٨٣/٢/١٣ کۆچی دوایی دیارترین دارێژەری تیئوری مۆزیکاو ئۆپرانووسی ئەڵمانی – ڤاگنـەر– ... ئـەم کەسـایەتیە تەرمەکـەی لـە باخـچەی ڤێلاکـەی خـۆی لەشاری بابرۆیـت دەنێـژرێت.... شـایانی باسـە ڤاگنـەر لـە ١٨١٣/٥/٢٢ ، لـە شـاری لایبزکی ئەڵمانیا لە دایك بووە ... پاش تێپەربونی ٦ مانـگ لـە دوای لـە دایـك بـوونی بـاوکی کـۆچـی دوایـی دەکـات ، کـە نـاوی – کـارل فێرێـشی – بـووەو دایکی گـۆرانی بێـژی شانۆ بووە، دوای ئـەوە مێرد بـە هونەرمەند شووبە لودفیك کابری ئەکتەر دەکاتەوە . لە دوای ماوەیـەك ماڵئـاوایی لـەجیهان دەکا لە وولاتەکەیدا .

١٨٨٣/٦/٨ لـە دوای ڕازی بـوونی بـەریتانیا لەسـەر ئـەوەی ، کـە فەرەنـسا پـارێزراوی تـوونس بگرێتـە دەسـت . ئـەویش بـە مـۆرکردنی رێکەوتنامـەی نێـوان فەرەنساو تـوونس لـە– مەرسی–، کە بـووە هـۆی بێبەشـکردنی تـوونس لـە بڕیـاردان لـە سـەربەخۆی لـە نـاوخۆی تـوونس بەهەڵـسووڕاندنی کاروبـاری

نـاووخۆی وولآتەکەیدا . ئابـەم جۆرە وولآتـانی ڕۆژئـاوا دژایـەتی یـەکتریان دەکـرد لەسـەر فڕانـدن و داگیرکردنـی خێروبێـرو سـامانە هەمـە لایەنـەکانی وولآتانی جیهان بە تایبەتی خاکی کوردستان .

١٨٨٣/٧/٢٩ لە دایك بوونی – بروز بێنۆمۆسۆلین – ناسراو بە مۆسۆلین لـە شاری ڕۆمای پایتەختی ئیتالیا ، مۆسۆلین کە باوکی ئاسنگەر بووەو دایکی مامۆستا ، لە دوایی ئەم مرۆڤە لە مرۆڤێك و کەسایەتیەکی دیموکراتیخوازو سوشیالیستی ڕووی بەرەو فاشیەت وەرگێڕاو ئەنجامی دواساتەکانی ژیانی کووشتن بوولە وولآتەکەیدا .

١٨٨٣/١٠/٣ بـە هـۆی گـۆڕینی بـاری نـاووخۆی دەسـەلآتی ئیمپڕاتۆڕیـەتی عوسمـانی و لاوازبـوونی ، لـە ئەنجامـدا بـە تەشـەنەدار کردنـی کێـشەکانی گـەلانی ژێـر دەسەلآتەکەو چارەسەرنەکردنی، بە تایبەتی کێشەی گەلی کوردستان .

هەروا بەرامبەر ڕشەگەزی مێینە ئەویش بە هۆی لـە بارچوونی بـاری ئافرەت بـە مـاوەدانی ئـازادی و لاسایی کردنـەوەی داب ونـەریتی وولآتـانی ڕۆژئـاوای ئەوکات .

ئەوکاتیش بـە یاننامەیەك لـە وولآتـانی ڕۆژئـاوا ڕایگەیانـد بـەڕازی نـەبوونی دەسەلآتی عوسمانی لەو بوارە لـە پەیووەنـدی کۆمەلآیـەتی و ڕێگـەگرتن لێـی و بەرەو گەڕاندنەوەی پەیووەندی کۆمەلآیەتی بۆ باری جاران.

١٨٨٣/١٠/١٢ ماڵئـاوایی کردنـی پێـشەوای گـەل و نیـشتمان ، لـە گـەل و نیـشتمان شـێخ عوبێدوڵای نەهری لە هەندەرانی دوورخراوەی لە سەر خاکی نیشتمانەکەیدا ، کە کوردستانە . لە شاری مەدینەی منەوەرەی وولآتی سعوودیە لە بیابانی دوورگەی عەرەبیدا .

## ١٨٨٤

١٨٨٤/٣/٢٧ یەکەم گفتووگۆ بە تەلـەفۆن بـۆ یەکـەم جار لـە نێوان هەردووشاری پۆستن و نیورۆکی ئەمەریکا ئەنجامدرا .

١٨٨٤/٥/٢٤ لـە دایك بـوونی نووسـەری بەناوبانگی ئەمـەریکی – کلارك لیونـارد هـال– لـە شاری نیۆیۆرکی ئەمەریکا .



١٨٨٤/٦/٤ لە دوای دروستکردنی پەیکەری ئازادی لە فەرەنسا ، حکوومەتی فەرەنسا ئەو پەیکەرەی پێشکەش بەحکوومەتی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کردو دوای ئەو بریارەش بە کەشتی رەوانەی ئەمەریکا کرا . کە لەدەروازەی بەندەری شاری نیوورۆك چەسپاندراوە ، کە لە هەردوو وولاتی ئەمەریکا فەرەنسا ئەو پەیکەرە بە هێمای خۆراگری و بە هێزی و سەرکەووتن و ئازادی دادەنرێت لە جیهاندا .

## ١٨٨٥

١٨٨٥/١/٢٢ لەو بەلگەنامەی کە لە تەکیەی شێخ باقی لە شاری کەرکوك لە باشووری کوردستان دۆزرایەوە ، ناوی شارەزوور بە ناوی – منەسەرقیەی قلفنە– بووە ، کە دەکاتە پارێزگای شارەزوور، بەلام دوای ٣٠٠ سال ئەو ناوە گواستراوە بۆسەر وولایەتی مووسل ، لە لایەن دەسەلاتی عوسمانیەکان لە هەرێمەکەدا .

١٨٨٥/٤/٢٩ کردنەوەی دەرگاکانی زانکۆی ئۆکسفۆرد بۆ یەکەم جار بۆ خوێندکارە کچەکان لە ئەمەریکادا .

١٨٨٥/٦/٢٥ بلاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی – مووسل – لە شاری مووسلی ئێستا .

جێگەی ئامارە پێکردنە کە رۆژهەلاتی موسل کورد لە نەتەوە یەکەمەکانی ئاوەدانکردنەوەی ئەم شارە بوونە بەر لە ٤٢٠ سال پێش زایین و کەسی دیکە

... واته نەتەوەی دیکە لە عەرەب و تورکمان لەو ناوچەیە نەبوونە ، واتە زێی ڕۆژهەڵاتی مووسڵ سنووری دانیشتووانی کورد بوونە وەك ئێستاش کە کورد زۆربەی دانیشتووانی ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژئاوای موسل پێك دێنن لە ناوچەکەدا .

دوای ئەوە ئارامی و جوولەکە ومەسیحی ڕوویان لەوناوچەیە کردووە ، واتە لەڕۆژئاوای ئێستای شاری مووسڵ و ژیانیان بەیەکەوە دەبردە سەر . دوای ئەوە بازرگانە عەرەبەکان ومەڕ لەوەڕێنە عەرەبەکان ووردەووردە بەرەو باشوور و ڕۆژئاوای موسل هاتوون .

جا لێرەدا مەبەستمان چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەریە لەو شارەدا کە بلاوکردنەوەی جوولانەوەی مەسیحیەکان بۆ ساڵی ١٨٥٨ دەگەڕێتەوە کە یەکەم چاپخانە لە ساڵی ١٨٧٥ گەیشتە شاری موسل بەناوی چاپخانەی – ویلایە – لە موسل دامەزراوە ، بەرلەوەش لە ساڵی ١٨٦٩ هیچ ڕۆژنامەیەك نەبوو تەنیا ڕۆژنامەی زەورا نەبێت . ئەو ڕۆژنامەیەش بە یەکەم ڕۆژنامە لە شاری مووسڵ دادەنرێت ، کە ڕۆژنامەیەکی ڕەسمی وویلایەتی مووسڵ بوو کە هەفتەی جارێك دەردەچوولە شارەکەدا . ئەم ڕۆژنامەیە لەدەرچوون بەردەوام بوو بەهەردوو زامانی عەرەبی و تورکی تا سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهان لە شارەکەدا .

دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٠٢ – الابا و الدومینیکان – ژمارەیەکی گۆڤاری دەستەی گولی دەرکرد بەهەرسێ زامانی عەرەبی و فەرەنسی و کلدانی ، کە ئەم گۆڤارەش تاکوو مانگی /١٩٠٩/١٢ بەردەوام بوو ... ڕۆژنامەگەری لە مووسڵ ڕۆلێکی کارایان لەڕاگەیاندنی دەستووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی گێرا لەمانگی / ١٩٠٨/٧دا .

لەو کاتەی کە لە هەموو ئێراق ٢٥ ڕۆژنامەی مۆڵەت پێدراو هەبوو ... دوای ئەوە سێ ڕۆژنامەی دیکە لەشاری موسل مۆڵەتی دەرچوونیان پێدرا :– ڕۆژنامەی نەینەوا لە ١٩٠٩/٧/١٥ و ، دوای ئەوە ڕۆژنامەی ئەلنەجاح لە ١٩٠٩/١١/١٢ و ، هەروا ڕۆژنامەی چنەباز لە ١٩١١/٦/٢٧... بەڵام دوای ئەوە لەمانگی /١٩١٢/٧ هەرسێ ڕۆژنامەکە لە بەر چاوان ونبوون بەهۆی هۆکارەکانی ڕامیاری ودارایی ئەو کات .

دوای ئەوە بەرپرسانی عوسمانی هەر لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهان لەساڵی ١٩١٤ دەستیان بەسەر چاپخانەی نەینەوا داگرت و جۆرێك لە رۆژنامەگەری سەری هەڵدا وەك:- عوسمانلی زانستی ئەفنامەی لری – یان – برقیات اخباریە عوسمانیە – کە بریتی بوون لە پەری چاپکراو لەدەنگ وباسی ناوخۆو دەرەوە ، بە هەردوو زمانی عەرەبی و تورکی ... بەڵام لە دوای ئەوەی کە بەریتانیا لەساڵی ١٩١٨ موسڵی داگیرکرد رۆژنامەو چاپەمەنیەکانی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە .

لە رۆژە نزیکەکانی کودەتا بەناوبانگەکەی عەبدولوەهاب شەواف ، بە ناوی جووڵانەوەی شەواف لەشاری مووسڵ لە ١٩٥٩/٥/٧ رۆژنامەی راستی – الحقیقە – یەکەم ژمارەی بڵاوکرایەوە بە ئیمتیازی مامۆستا – جەرجیس فەتحوڵڵاو سەرنووسەرەکەی ئەنوەر مائی – بەهەردوو زامانی کوردی و عەرەبی دەردەچوو لە شارەکەدا .

بەڵام لە دوای دەرچوونی ٢٤ ژمارە لە ١٩٦٠/٨/٦ لەلایەن وەزارەتی ئیرشادی ئیراقی مۆڵەتەکەی راگیرا ... کە یەکەم رۆژنامەبوو بەزامانی کورد بڵاوبکرێتەوە . ئیتر دوای رووخاندنی رژێمی بەعسی لە ئیراق دووبارە دەستکراوە بەدەرچواندنی رۆژنامەو گۆڤاری کوردی و سەنتەری رۆشنبیری بەتایبەتی لەدوای ٢٠٠٣/٩/٢٥ دا لە شارەکەدا .

٥ /١٨٨٥/١١ لە دایك بوونی نووسەرو رووناکبیرو فەیلەسوف و مێژوناسی ناوداری ئەمەریکاو جیهان – ویڵ دیورانت – لە ویلایەتی ماساشۆستی لە ئەمەریکا ... شایانی باسە ئەم کەسایەتیە ناودارە دانەری کتێبی – قصة الحضارة – تە کە لە ٤٢ بەرگ پێك هاتووە لەگەڵ شۆرشی فەرەنسی و سەردەمی ناپلیۆن و بەدەیا کتێبی بە هاوکاری خێزانە هاو خەباتەکەی ئەریل دیورانت بەرهەم هێناوە .

ئەم نووسەرە ناودارە جیهانیە و ئەمەریکیە بە هاوکاری یەکتری کردن لەگەڵ هاوسەرەکەی بەردەوام بوونە لەخەبات بە پێنووسەکەیان تاکوو کۆچی دوایی خێزانەکەی ئاریل لە ١٩٨١/١٠/٢٥ لە تەمەنی ٨٣ ساڵیدا ، هەروا کۆچی دوایی ویل دیورانت لە ١٩٨١/١١/٧ لە تەمەنی ٩٦ ساڵدا بەماڵئاوایی

کردنیان لەجیهاندا .

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی /١ .

## ١٨٨٦

١٨٨٦/٣/٣ مـۆرکردنی رێکەووتنامــەی ئاشــتبوونەوەی نێـوان بوولگاریــاو سـڕبیا بـا گەڕانـەوەیان بـۆ کـاتو سـاتەکانی پێشوویان بەپەرەپێدانو گەشـەپێکردنی پەیووەندی هەمەلایەنەکانی نێوانیان لەهەموو بوارە جیاجیاکاندا .




١٨٨٦/٥/١ ڕۆژی جــــەژنی کرێکـارانی جیهـان بڕیـاری بـۆدرا ، لـە ئـەنجامی ڕاپـەڕینی کرێکاران لـە شاری - شــــیکاگۆ - ی ویلایەتـــــــە یـــــەکگرتووەکانی ئەمـــــەریکا ، کـــە هـــەموو ســـاڵێك لـــەو ڕۆژەدا یـــادی ئـــەو ڕۆژە دەکرێتـــەوە بـــە ڕۆژی جـەژنی کرێکارانی جیهاندا .

لـە پێنـاو وەدی هێنـانی داخوازیـەکانی ژیـانو بـەردەوامبوون لەخـەبات دژی ڕژێمــەکانی ســەرمایەداری ئـابووریو ڕامیاریــەتی چەوســانەوە ، لــە لایــەن وولاتانی چەوسێنەر لە جیهاندا .

١٨٨٦/٧/٤ دوای گەیـشتنی پەیکـەری ئـازادی بـۆ ئەمــەریکا ئـەویش بـە دامەزرانـدنی پەیکەری ئازادی لە شاری نیویۆرکی ئەمەریکا لە دوای گەیشتنی پەیکەرەکە لە فەرەنساوە بۆ ئەمەریکا. لە دەروازەی بەندەری شاری نیۆرۆك لە ئەمەریکا

١٨٨٦/١١/٣٠کۆمەڵـەی هاوپـەیمانان لــە جیهانــدا ، ئــەو ڕۆژەیــان کــردە ڕۆژی دژ بــە لــە سێدارەدانی مـرۆڤ لـە جیهـانو هـەوڵ و کۆشـش بەردەوامـە ، لـە پێنـاو ئـە

ئامانجەدا .



شایانی باسە ئەو دکتاتۆرو دەسەڵاتدارە خووێن مژوو دڕندانە ناگرێتەوە ، کە دژی مافەکانی گەلانی ژێر دەسەڵاتەکانیان بە تایبەتی مافە نەتەوەیی و نیشتیمانیەکان لە جیهاندا ... بەڵام...؟...!.



## ١٨٨٧

١٨٨٧/٥/٣ بە پێی بەڵگەنامەی ژمارە/ ٢٩ ، ئەویش بەدادگایی کردنی هەندێ کەسایەتی کورد لە عەشیرەتی بەرزنجەو تاڵەبان ، بە سزادانیان لەلایەن دەسەڵاتی عوسمانی لە باشووری کوردستان لەشاری کەرکوك ، بە هۆی بەرگری کردنیان لە کوردو مافەکانیان . دژ بە داموو دەزگاکانی ڕژێمی عوسمانی ، ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوەی کە کورد بوون و دورکەوتنەوەیان و نەدانی باج بە نەچوونە ڕیزی هێزەکانی سووپای عوسمانی لە ناوچەکەدا .

١٨٨٧/٩/١٦ لە دایك بوونی نیگارکێش و پەیکەر تاش و شاعیرە دیارەکانی سەدەی بیستی رابردوو – ژانی ئاریی – ناسراو بە – هانز ئارب – لە هەرێمی ستراسبۆرگی فەرنسا ... دوای ئەوە روو لە شاری پاریسی پایتەخت دەکات و لە ساڵی ١٩٠٦ لە ئەکادیمیای ڤایمار بنەماکانی هونەر وەردەگرێت و هەر لەو ماوەیەشدا ئەزموونی بەهرەی شیعری دەخاتە روو... دوای ئەوە لەساڵی ١٩٠٨ درێژە بەخووێندنەکانی دەدات لە ئەکادیمای جۆلیان .

دوای ئەوە ڕوو لە وولاتی سویسرا دەکات و لە ساڵی ١٩١٢ بەکاندێنێکی شێووەکار دەکات و لەشاری میونیخ هەڵی بۆ دەرەخسێ و بە چەندین تابلۆ بەشداری لە پێشانگایەکی گەورەی کۆمەڵەی شۆڕەسووارانی شین دەکات .

لە ساڵی ١٩١٤ لەگەڵ کۆمەڵە هونەرمەندێکی گەورەی شاری پاریس

کۆدەبێتەوە ، بەر لەوەش چەندین تابلۆ لەگۆڤارە هونەریەکەی بڵاودەکاتەوە.
دووبارە بەهۆی جەنگ روو لە سویسرا دەکاتـەوە و دەچێتە شاری زیورخ و
پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ هونەرمەندان بەهێزدەکات و لەکارەکانی هونەری
بــەردەوام دەبێــت تــاکوو لــە ســاڵی ١٩٥٣ داوای لێــدەکرێت بەدارشــتنی
دیواربەندێکی گەوورە لەبرۆنز بۆ شاری کارکاسی پایتـەختی فنزویللا ، کە
ناوینـا – شـووان و هـەور – تـا لـە ١٩٦٦/٦/٧ لـە شـاری بـارلی لەسویسرا
کۆچــی دوایــی دەکـات ... شـانۆ نـاریی جگـە لـەنیگارو پەیکـەر تــاش و
لەهۆنینەوەی شیعریش شووێن پەنجەکانی دەستی دیاربووە ... هەروا دەیان
دیــوانی بەزمانــەکانی فەرەنــسی و ئــەلمانی و ئینگلیــزی بڵاودەکاتــەوە
هێمایەکی بەرز بۆخۆی بەجیهان بڵاودەکاتەوە .
سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /٢

١٨٨٧/٩/١٩ لە دوای کۆچی دوایی ڕابەرو پێشەوای ئەوکاتی کوردو خاکی کوردستان –
شێخ عوبێدوڵای نەهری – ، بە دروست بوونی بارێکی نا ئارام لە کوردستان
بەگــشتی و رۆژهــەڵاتی کوردســتان بەتایبــەتی بــە بــەرپابوونی ڕاپــەرینی
عەشیرەتی دەشتی کورد ، بە هۆی ڕەفتارەکانی دادووەری پارێزگای ورمێ و
دەووروبەری ، ئەمیر جیهان سۆز میرزا. کە ئەو ڕاپەرینە بەسەرکردایەتی
دووکوڕەکەی – شێخ حەسەن – کە لە زیندان کۆچی دوای کردبوو ، ناویان
– حەسۆو بـەدر – بوو، ئەو ڕاپەڕینـە بەردەوام بـوو تـاکوو شـاری حەلەب
ســووریای ئێــستای گرتــەوەو بــووە هــۆی ئــەوەی کــە حکوومــەتی تــاران
داواکاریەکانی کورد لەبەرچاوبگرێت لە ناوچەکەدا.
دوای ئەو هەلوویێست ئەمیر جیهان سۆز لە شاری ورمێ لادراو ، یەکێک لە
کــوردە ناودارەکــانی شــاری ورمــێ کــرا بــە دادوەری شــاری ورمــێ و
دەووروبەری ، هەروا گۆڕانکاری لە بەرپرسانی شاری سەردەشت و چەندین
شـاری دیکـە کـرا ، بـەدانانی کەسـایەتی کـورد لـە شـارەکانی رۆژهــەڵاتی
کوردستان.

١٨٨٧/١١/٨ کۆچی دوایی گۆرانی بێژو هونەرمەندو شاعێری چینی کرێکارو جووتیاران
ڕۆشـنبیرانی نـاوداری فەرەنـسی – ئۆژین بۆتیـە– لـە پاریـسی پایتـەختی
فەرەنسا ، گۆڕەکـەی لـە گۆڕستـانی بیرلاشئیزە ، ئەو گۆرانی بێـژو شاعێرە
کرێکاریە بە شداری لە راپەرینەکەی کۆمۆنەی پاریس کردووە لە فەرەنسا

دوای ئەوە بەو هۆیە دورخراوەتەوە لە فەرەنسا .
دوای نۆ ساڵ گەڕاوەتەوە شاری پاریس و هەر بە هەژاریو ڕاست گۆیی و خاوەن هەڵوویستو ڕەفتاری لێهاتوانەو خۆشەویستی سەری ناوەتەوە دژ بە رژێمی سەرمایەداریو چەوسانەوەی مرۆڤ لە لای مرۆڤ لە جیهاندا .

## ١٨٨٨

١٨٨٨/٩/٧ نەوەکانی بەدرخانی ، ئەمیرعالی بەدرخان بەگ و مەدحەت بەگ ... کە کورانی بەدرخان بوون دەچوونە شاری ئەستانەو سەردانەکەیان



بەهەڵ زانی و لایاندا – ئەرابژون ... و نامەیەکیان بۆ سەردارانی کوردستان نووسی و بڕیاردرا کە هێزێکی گەورەو زۆری کورد ... بێتە ... جوبزلك ...کە لە نزیك ... تەرابژون ...و لەوێ چاویان بەو دوو میرانە بکەوێ . دوای ئەوە چاویان بەمیر ئەمین عالی بەگ و میر مەدحەت بەگ کەوت ... بەڵام حکوومەت کە بەوەیان زانی ... و دەسەڵاتدارانی عوسمانی تۆرانی هێزێکی زۆریان ڕەوانەکردو ڕێگەوبانیان لێگرتن بۆ ئەوەی نەگەرێنەوە کوردستان ... لەباشووری شاری – بایبورد – لە دۆلاوە لە باکووری کوردستان کە هێزێکی تورك دەووری دانوو شەڕ لە نێوانیان بەرپابوو لە ئاکامدا هێزی چەکدارە کوردەکان شکان و بەناچاری خۆیان دابەدەست هێزەکانی سووپای تورك لە ناوچەکەدا .

<u>سەرچاوە :</u>– پوختەی مێژوی کوردوکوردستان – ئەمین زەکی بەگ –وەرگێرانی محەمەد عەلی عەونی – لاپەرە /٢٣٦ – ٢٣٨ .



١٨٨٨/١٠/٢٩ مـــــــــۆرکردنی پـــــــــەیمانی نێوودەوڵـــەتی لـــە شــــــاری – قووســتەنتینیە– ی ئەســــــتەمبۆڵی ئێــستای تورکیـا ، کە پـەیمانی بنکـەی دەریـاوانی بـوو لـە نێـــوان وولاّتـــانی پەیووەنـدار لـە سـەر کـەناڵی سـوێس لـە وولاّتـی میسر. لـە نێوان فەرەنسا و ئـەڵمانیا و نەمساو ئیسپانیا و ئیتاڵیا و ڕووسیای قەیسەریو هۆڵەندا ، لە گەڵ ئـەو وولاّتانـەی کە نووێنـەری دەسـەلاّتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بە نووێنەری میسر ، ئەو ڕێکەووتننا مەیەی مۆرکرد .

کە لەو کاتـە میسر سەربە ئیمپراتۆرییـەتی عوسمانی بوو...بـەلاّم لـە دوای مـۆرکردنی پــەیمانی لـۆزان لــە ١٩٢٣/٧/٢٤ لەســەر ڕۆشــنایی پــەیمانی دارێـژراوی سـایکس – بیکـۆی ١٩١٦/٥/١٦ ، وولاّتـی میسر سـەر بـەخۆیی بەدەســت هێنــا بەدەرچــوونی لــە ژێــر هــەردوو دەســەلاّتەکان و هێزەکــانی سووپای عوسمانی و سووپای بەریتانیا لە وولاّتەکەدا .

ئـەویش لـە دوای هـەرەس هێنـانی ئیمپراتۆریەتەکەو بـەپێی ڕێکەوتننامەی تورکیـا ، کـە مـافی ئـەوەی پێدرا وەك وولاّتـانی دیکـەی جیهـان ، بـەلاّم کـورد وخاکی کوردستان بەتیری ژەهراوی وولاّتانی هاوپەیمان کرا بەچوار لـەت و نیوو...؟ بەلاّم کورد ...؟...!.

##  ١٨٨٩

١٨٨٩/٢/٥ شانـشینی ئیتاڵیـا بـە مـەر سوومێکی شانـشینی دانینـا بـە سـەر بـەخۆیی وولاّتـی ئەریتیریا لـە سـەر بەشـێك لـە خـاکی خـۆیو نـاوی نابـە نـاوی ڕۆمـانی دەریـای سـوور ، کـە میر – ئیربیریـۆم – دەسـەلاّتی ناوچـەکەی گرتـە دەسـت تاکوو کۆتایی جەنگی دووەمی جیهان .

١٨٨٩/٣/١ خاوەن بابەتی- الیزیدیە أوعبدە ابلیس - لە لاپەڕەکانی ٢٩٣-٢٩٨ لە بەرگی/١٣ ی بەشی شەشەم لەگۆڤاری- المقتطف- دا دەڵێ: -
ئێزیدیەکان گروپێکن لە کوردی خەوارجی و هۆزێکن لە هۆزە بەناوبانگەکانی کورد لە کوردستان ، لە دوای ئەوە ئاینی خۆیان لەناو ئاینی زەردەشتیەکان وەك مەزهەبی سەریان هەڵداوە و بەردەوام بووە لە سەر خاکی کوردستان لە کێووەری ئاسیادا .



١٨٨٩/٣/٣١ کۆتایی هاتنی کارەکانی دەست پێکردنی دروستکردنی تاوەری بە ناوبانگی فەرەنسا ئیڤلّ ، لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، کە بە بەرزی ٣٠٠ مەترو هەرەمەکەشی لە ١٥٠٠٠ هەزار پارچەی هەمە جۆر لەلایەن ئەندازیار- ئەلسکەندەر کۆستاف - دروستکراوەو ساڵانە زیاتر لە ٤ چوارملیۆن هاووڵاتی لە فەرەنساو لەجیهان ڕووی تێدەکەن.
جێکەی ئامارە پێکردنە کە تاوەری ئیڤل لە ٢٦/ ١/ ١٨٨٧ ، دەست بە ئیش و کارەکانی ئەم پرۆژەیە کرا . و لە ماوەی ٢٦ مانگ بەردەوام بوو لە کارکردن ... کە نزیکەی ٥٠ پەنجا ئەندازیارو ٣٠٠ سێسەد کرێکار کاریان لە بە ئەنجامگەیاندنی ئەو تاوەرە دەکرد . هەروا ماوەی کارکردن لە تاوەرەکەدا ٢١ بیست و یەك مانگی خایاند لە شارەکەدا .
دوای ئەوە تاوەری ئیڤل لە ١٨٨٩/٥/٦ بە شێووەیەکی فەرمی کرایەوە ، بۆ گەشتیاران لە فەرەنساو وولاتانی جیهان . هەروا تاوەری ئیڤل یا ئیڤل - بە فەرمانی - - tour effei - کە بریتیە لە بوورژێکی ئاسنین ... کە لە شامپ دی مارس - واتە لە - گۆرەپانی مارس - دایە لە نزیك ڕووباری - سین - لە شاری پاریسدا ، لە فەرەنسا .

که هەڵگری ناوی – گۆستاف ئیڤل – ه که ئەم ئەندازیاره نەخشەسازی ئەو تاوەرەی کێشاوه ، که له هەر شوێن و مەزارێکی دیکەی ئەوروپا به ناوبانگتره .
هەروا خەرجیەکانی تەواوی ئەم تاوەره گەیشته ٧,٨٠٠,٠٠٠ ملیۆن فرەنگی زێرینی فەرەنسی ... ئەم گووژمەیەش له داهاتی فرۆشتنی پلیتەکانی که ئەو پیشانگایەیەدا به دەست هات . هەروا له ساڵی ١٩٦٤ ، ئەو تاوەره چووه ناو لیستی شووێنەواره دیرۆکیەکانی شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا .
هەروا ئەم تاوەره له ١٨٠٣٨ پارچه ئاسنی جۆراو جۆر و ٢,٥٠٠,٠٠٠ملیۆن بزمارو مێخ چێکراوه ، که کێشی تێکرایی دەگاته ١٠١٠٠ تەن ...که له سەر چوار ئەستوون راگیراوه و بنکەکانی له خۆیاندا پێك هێناوه ... که دووریەکانیان ١٢٥×١٢٥م ... که کۆی گشتی رووبەرەکەی دەکاته ١٥٦٢٥ مەتر چوار گۆشه . هەروا بڵندی تاوەرەکه ٣١٢ مەتره ، که دەکاته ١٠٢٤ پێ . له دوای ئلاّ خستنه سەری له شارەکەدا .
هەروا له دوای ساڵەکانی ١٩٠٦ تا ١٩٢٠ هەوڵدرا بۆ پەخشی تەلەفزیۆن و رادیۆ به کار بێت ، که ئەمەش له ساڵی ١٩٢١ به کار هێنرا . هەروا ئەم تاوەره خاوەنداریەتی هی شارەوانی شاری پاریسه ... له فەرەنسادا .

١٨٨٩/٤/١٦ هونەرمەندو ئەکتەری ناوداری جیهانی – چارکس سینەر چاپلی – ناسراو به – شارلی شاپلن – ، له خێزانێکی هەژار تێکۆشەر له شاری له ندەنی پایتەختی بەریتانیا لەدایك بووه ، چارلی چاپلنی باوکی به هۆی هەژاری و نا لەباری ژیانی، له ساڵی ١٨٩٤ کۆچی دوایی کردووه... شایانی باسه چارلی چاپلن نموونەیەکی تاقانەیه لەڕاست گۆیی و خزمەتکردنی هەژاران دژ به چەوسانەوه لەلایەن سەرمایەدارو ئیمپریالیزم لەجیهاندا .

١٨٨٩/٥/٢١ بۆ یەکەم جار بنەماکانی کۆمەڵەی– ئیحادوتەرەقی– پێك هێنرا لەلایەن تالب ئەلبان ، که نازناوی – ئیبراهیم تمۆ – بوو ، له باکووری کوردستان ، دوای ماوەیەك به هەوڵ و کۆشش ئەو کۆمەڵەیه پەرەی سەندو بووه– کۆمەڵەی

یەکگرتن و پێشکەوتن– دژی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سنووری دەسەڵاتەکەیدا .



١٨٨٩/٦/٢١ فەیلەسوف و زاناو رووناکبیرو نووسەرو چیرۆک نووس و رۆمانئووسی ناوداری جیهان – ئەرنست گلارنست ئەدمۆنز – ناسراو بە – هەمەنگوای – لە ئەواک پارگی وویلایەتی ئەلینۆی ئەمەریکاو بە دەووری ١٠ میل لە شاری شیکاگۆ چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .

ئەم کەسایەتیە هەر لەهزرەکاریدا ژیان لەو شارەدا بەسەر دەباو لەقۆناخێکی زۆری تەمەنیدا لە رێگەی باپیریەوە شەیدای رۆمان و چیرۆك و هەقایەتی سەردەمەکەدا دەبێت ... ئارەزووی دەست پێکردنی نووسینەکانی لەقۆناخی خوێندنی ئامادەیی دەبێ ... کە هەمەنگوای شەشەمین منداڵی دکتۆر گلارنیس دەبێ ... هەر لەکاتی خوێندنی لە قوتابخانەی – فۆرست – لەوێ هەوڵەکانی نووسین لەگۆڤاری قوتابخانەکەو ئەو کتێبەساڵانەییەدا بڵاودەکاتەوە ... کە بەناوی تابۆلا دەردەکرا .

لە دوای تەواوکردنی خوێندنی هەمەنگوای لە ساڵی ١٩١٧ دەچێتە شاری کنساس و لەوێ وەکوو پەیامنێرێکی تازە پێگەیشتوو لە رۆژنامەی – ئەلکنساس سیتی ستار – کاردەکات و لەو کاتەش ئەمەریکا دەکەوێتە ناو جەنگی یەکەمی جیهان .

لە یەکێك لەشارەکانی ئیتالیا بەهۆی پێکەووتنی پروشکی بۆمبێك هەمەنگوای زامدار دەبێ و لە ساڵی ١٩١٨ دەکەوێتە نەخۆشخانە بۆ ماوەی ٦ مانگ ، دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٣٨ هەمەنگوای دووچاری قەیرانێکی سەخت دەبێ لە بەر ئەوەی باوکی دوای ناچاربوونی بەنەخۆشیەکی سەخت خۆی

دەکـووژێ ... ئـەویش سەرزەنـشتی دایکـی دەکـات و لێپرسـراویەتی مردنـو
باوکی دەخاتە ئەستۆی دایکی .
دوای چـەند گرفـت و ناخۆشـی و ژیـانی سـەخت هەمـەنگوای لەسـەر پشتو
کەشـتی – بـیلاد – دا کـە بـەو هۆیـەوە لـەکاتی جـەنگی دووەمـی جیهـا
لەدەریاکاندا دەگەڕا ، فێری یەکێك لەزۆرانبازیە نایاساییەکان دەبێت ئەویش
بەدامەزرانـدنی رێکخراوێکـی نهـێنی ...کـە مەبەسـتی بـوو بـچێتە نـاو تـۆڕ
رێکخراوە فاشیە چالاکەکانی ئەوکاتە .
کـە بارەگاکانیـان لەشـاری هاڤانـای پایتـەختی کووبـا بـوو ... هــەرو
هەمـەنگوای بەکەشـتیەکەی لەدەریا نزیکەکانـدا بە دوای ئەلمانەکانـدا دەگـەر
... ئەم کەسایەتیە نەمرە هەموو بەیانیەك کە لەخەو هەڵدەستا زیاتر لە ٥٠٠
ووشەی دەنووسی و لە دوای تـەواوبوونی خـەریکی پشیلەکانی دەبوو کە بـ
شێووەیەکی سەیر لەماڵەکەیدا ژمارەیان زۆر دەبوو .
هەروا لـە سـاڵی ١٩٢٠ هەمـەنگوای روو لەشاری پاریـسی پایتـەختی فەرەنس
دەکات بۆئەوەی ببێتە پەیامنێری رۆژنامـەی – تۆرنیتۆسـتار – لـە دوای ئـەو
خاتوو – هادلی ریتشارد سۆن – دەبێتە هاوسەری و لەو ماوەیەشدا ناوبانگ
دەردەکات ، بەهۆی نووسنی چەند ووتارێك کـە بەرۆژنامـەکانی دەفرۆشتەو
... کـاروانی هەمـەنگوای وەکـوو نووسـەرو رۆژنامەنووسێك لەشـاری پـاریس
دەست پێدەکات .
لـەو شـارە چـاوی بـە کەسـایەتیە بـە ناوبانگـەکانی ئـەدەب و رۆشـنبیر
فەلسەفەی ئەو سەردەمە دەکەووێت و پەیوەندیان لەگەڵ دروست دەکات . ل
سـاڵی ١٩٢٥ هەمـەنگوای کۆمەڵـە چیرۆکێك بـەناوی – لـەکانی ئێمـەدا – لـ
ئەمەریکا بڵاودەکاتـەوە ... دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٩٢٦ رۆمـانی – خـۆریش
بڵاودەکاتـەوە ، بـەو رۆژنامـە نـاوی وەکـوو یـەکێك لـە رۆماننووسە بەتواناکا
دەردەکەوێ .
هـەروا هـەمنگوای بۆ نیـشتەجێ بـوون لـە سـاڵی ١٩٤٠ روو لـەکووبا دەکا
ئەمەش لە دوای ماوەیەکی کەم لە تەواوکردنی رۆمانێك بەناوی – رەنگەکان
بۆ کێ لێدەدرێن ... ئەم مرۆڤە بەتوانایە کە زۆربەی کاتەکانی نووسینی بـ
پێوەراوەدەسـتاو دەسـتی بەنووسـین دەکـرد لـە ٤٥٠ تـا ١٢٥٠ ووشـە

دەنووسی ... هەمەنگوای لە ماوەی ژیانیدا چوار ژنی هێناوە . دوای چەندین گرفت و کێشەی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی خێزانی لە ساڵی ١٩٥٨ کووبا جێ دێڵێ و لە شاری - لیتشۆم - لە وویلایەتی - ئەیداهۆ - لە باکووری ئەمەریکا جێ نشین دەبێ .

دوای ئەوە تووشی نەخۆشی دەبێ و لەلایەکی دیکە شەڕەکانی وڵاتانی ئەفریکیاو پەیوەندی نێوان کووباو ئەمەریکاو ڕووسیا و چەندین کێشەی دیکە ... لەنەخۆشخانە هەوڵی چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی بۆ دەدرێ . بەڵام گرفتی دەروونی و باری ژیان و نەگەیشتن بەئاواتەکانی لە ١٩٦١/٦/٢ لەماڵەکەی خۆیدا ، لە لیتشۆم بە تفەنگی ڕاوکردن تەقە لەخۆی دەکات و کۆتایی بەژیانی خۆی دێنێ و ماڵئاوایی بەدەستی خۆی لە جیهان و هاورێ و یاوەرەکانی لەجیهان دەکا لە شارەکەدا .

١٨٨٩/٦/٢٣ لە دایك بوونی ڕووناکبیرو شاعێری ناوداری ڕووس خاتوو - ئانا ئاخما تۆڤا- لە شاری پترۆسبورگی پایتەختی ڕووسیای قەیسەری ئەوکات ...شایانی باسە ناوی تەواوی خۆی - ئانا ئەندرڤینا بۆرنکۆ- یە.

١٨٨٩/٧/٥ لەدایك بوونی - جان مۆریس بۆژین- ناسراو بەجان کۆکتۆ لەخێزانێکی دەوڵەمەندو سەرمایەداری شارۆچکەی میزۆن لەنزیك پاریسی پایەختی فەڕەنسا... باوکی پارێزەرو نیگارکێش بووە.

شایانی باسە جان کۆکتۆ لەمانگی/١٠/١٩٦٣ کۆچی دوایی دەکات و دوای خۆی شەش فلیمی سینەمایی بەهرەدار بەجێ دێڵێ لەدوای دەرهێنانی بەسەرکەووتووانە لە وڵاتەکەدا .

١٨٨٩/١١/١٤ لە دایك بوونی ڕابەرو پێشەواو خەباتگێری ناوداری هیندستان - جەواهر لال نەهرۆ- بووە ، کە یەکەم سەرەك وەزیرانی هیندستان بووە لە دوای ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی وڵاتەکە.

مێژووی هیندستان لە ناوەڕۆکی ئەم مێژونامەیەدا بەروونی تۆمارکراوە .

## ١٨٩٠

١٨٩٠/١/٢٥ له ئاهەنگێكی بەرچاو بە ئامادە بوونی والی وویلایەنی بەغدا – سری پاشا – وعەبـــدولرەحمان گـــەیلانی و رەفعـــەت ئەفنـــدی چادرچـــی و چـــەندین کەسایەتی دیكەو جەماوەرێكی زۆر بەنداوی یەكەمی دێرینی هندیە كرایەوە ، لەگەڵ ئامادەبوونی نووێنەری شارەكانی حلەو كەربەلادا .

شـــایانی باســـە كـــە ئـــەو بەنـــداوە ، لـــە لایـــەن ئەنـــدازیاری فەڕەنـــسی مسیۆشۆندیرفر نەخشەی بۆ دیزایندكرابوو ، كە لەلایەن سوڵتانی عوسمانی داواكرا بوو لە ساڵی ١٨٩٩، ئەویش لە سەر شێوەی دوو باڵ كە درێژەیەكەی ١٧ مەتر بوو .

ئەمـەش بینینـەوە یـاد ، كـە ئـەو كەرپووچـەی بـە نـاوی ئافرەتی یەكـەمی هیندیە دروستكراوەو، دوای لە دیوارەكانی شووێنەواری بابل دەرهێنراوە بە بـەكار هێنـانی دینامیـت لـە پێنـاو رووخانـدنی لـە دیوارەكـانی كۆشـكی بخونەسـر..؟ . لـە نـاو شـووێنەوارەكاندا لـە شـاری حیلـەی – بابـل – لـە باشووری شاری بەغدا ، بە خەرجكردنی لە بەنداوەكە لە ناوچەكەدا .



١٨٩٠/٢/١٠ لـە دایـك بـوونی نووسـەرو رابـەری شـیعرو شـاعیرانی رووسـیای قەیـسەری – بـۆریس باسترانك – لە شاری مۆسكۆی پایتـەختی ئێـستای رووسـای یـەككگرتوو ، بـاوكی نیگـار كێـشێكی دیـارو مامۆسـتای پـەیمانگای هونـەرە جوانـەكان بـووە ، هـەروا دایكـی– رۆزە كوممـانی– پیـانۆ ژەنێكـی لێهاتووی بەناو بانگ بوو.

شایانی باسە باسترانك ، كە سایەتیەكی لێهاتوو بەهرەدار بووە... لە ساڵی

١٩٥٨ دەست نیشان کراوە بۆ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبل ، بەڵام بە هۆی هەنێ بیروبۆچوون ئەو خەڵاتەی رەتکردۆتەوە ، ئەم کەسایەتیە لە رابەرایەتی شیعر بەردەوام بووە تاکوو مالئاوایی لە گەلانی رووسیا دەکات لە ٣٠/ ٥/١٩٦٠ و ئەویش بەرهەمەکانی بۆتە کەلتوورێکی نەتەوەیی و نیشتمانەکەیی و جیهان .

١٨٩٠/٣/٩ بە پێی بەڵگەنامەی ژمارە/٣٧ ی کارگێڕی دەسەڵاتی شاری کەرکوکی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی ، ئەویش بە بڕیاری دابین کردنی ئازوقەی بۆ عەشیرەتی هەمەوەند دابین کرد ، بۆ ئەوکەسانەی کە گەڕانەوە ڕیزی حکوومەت و ژێر دەسەڵاتی عوسمانی– وەك گەڕانەوەیان بۆ ڕیزی نیشتمانیدا .

کە ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکان لە ئێراق بە تایبەتی ڕژێمی بەعس ئەو جۆرە بڕیارانەی بلاٌودەکردەووەو جێبەجێی دەکرد ، لەپێناو لاواز کردن و تواندنەوەی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ، نەك هەر لە ئێراق بەڵکوو بگرە لە ئێران و توکیا و سووریاش .

ئەم جۆرە رامیاریەتە تاکوو ئێستاش لە پەیرەوکردن بەردەوامە لەو وولاٌتانەدا . لە هەموو بوارەکاندا بە تایبەتی لە هەردوو بوار نەتەوەیی و نیشتیمانیدا .

١٨٩٠/٥/١٩ لە دایك بوونی شۆڕش گێڕ رابەری گەلانی ڤێتنام – هۆشی منە – کە سەرکەووتنی بە دەست هێنا بەرامبەر بەهێزەکانی سووپای ئەمەریکاو هاوپەیمانانی لە شەڕە دژووارەکانی گەلانی ڤێتنام .

تێبینی:– لە بارەی باری ئەم وولاٌتە لە ناوەرۆکی مێژوونامەکە هەیە .

١٨٩٠/٦/٩ دامەزراندنی بە دەیان هاوولاٌتی لە عەشیرەتی هەمەوەند لە ڕیزی هێزەکانی سووپای عوسمانی ، هەروا بە بڕینەوەی مووچەی – ١٠٠٠– قرش بۆ شەش کەسایەتی عەشیرەتەکە بۆ ئەوەی دوورکەونەوە لە یاخی بووەکان بەپێی بیرو بۆچوونی ئەوان...؟...!.

١٨٩٠/٦/٢٨ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان عبدولحەمید ، دوو بڕیاری ڕاگەیاند بۆ دەزگاکانی ئیستخبارات و وەزارەتی ناوخۆو دەرەوە ، ئەویش بەچاودێری کردنی جموجوڵی یەهودیەکان– جوولەکەکان – بەدەر نەکرتنی یەهوودەکان لە مەمالیکی شاهانیەو ڕێگەگرتن لە یەهوودەکان بە دەست

تێووەرنەدان لە كاروباری دەسـەڵاتی عوسمانی ، كە دژی ئايينی ئیسلامن لەهەموو بوارەكاندا .

١٨٩٠/٧/٧ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ، لـە بڕیارێكیدا داوای لـە دانیـشتووانەكانی هـەرێمی فەلەستین كـرد ، كـە بـەهیچ جۆرێك زەوی بـە یەهودیەكان – جوولەكەكان – نەفرۆشن لە ناو خاكی فەڵەستیندا .



١٨٩٠/٧/٢٩ وێنەكێـــشی بـــە ناوبـــانگی هوڵەنـدیو جیهـان– ڤـان كـۆخ– ماڵئـاوایی لـە گـەلانی هۆڵەنـداو جیهـان كـرد ، بـە دەسـتی خـۆی گیانی خۆی لە دەست دا .ئەویش بە هـۆی باری خراپـی دەروونـی و چـەندین هۆكـاری دیكـە كـە بـە تـەواوی هۆكـاری گیـان پـیێ لـە دەستدانی خۆی لە وولاتەكەیدا .

١٨٩٠/٨/١٧ دەرچـوواندنی ژمـارەی یـەكی سـاڵنامە لەوویلایـەتی مووسـڵ و لـە شـاری مووسل ، دوای ئەوەش دەركردنی ژمارە دووی ساڵنامەكە لە ساڵی ١٨٩٢ و هەروا دەركردنـی ژمـارە سێی ساڵنامەكە لەساڵی ١٨٩٤ و ، دەكردنـی ژمـارە چـواری لـە سـاڵی ١٩٠٧ و ، دەركردنـی ژمـارە پێنجـی لـە سـاڵی ١٩١٢ ...سـاڵنامە كتێبێكـە كـە هـەموو زانیاریـەكی تیا كۆدەكرێتـەوە لـەبوارەكانی جووگرافی و ژمارەی دانیشتووان و دام و دەزگاو دەسـەڵاتە جۆراوجۆرەكـان و ڕووداوەكانی بەشێووەیەكی ڕێك بە پێـی ڕۆژ و مـانگ و ساڵ لە زنجیرەیـەكی دیـاریكراو بـوونی بـە بەڵگەنامەیـەكی فـەرمی لەهـەموو كـات و سـاتەكانی رابـردوو و كـارپێكردنی لـە ئێستا و دیـاریكردنی پلان بـۆ داهـاتوو لەهـەموو بوارەكاندا ، لە شێووەی ئینسكلۆپیدیادا .

١٨٩٠/٩/٢١ لە سەر داوای ٤٠ كەسایەتی لە كەسایەتیەكانی نـاوداری كـورد ، هـەوڵی لـە پێنـاو كردنـەوەی قوتابخانەیەكیانـدا ، لـە سـەر خـەرجی خۆیـان ، لـە ئاكـام

قوتابخانەکە کرایەوە ، بەڵام ماوەی بەخوێندنی تیایدا نەدرا و بۆ ماوەی یەك ساڵ خوێندنی تیا دواخرا لەلایەن دەسەڵاتی عوسمانی لە باکووری کوردستان.

١٨٩٠/٩/٢١ ڕووناکبیرو فەیلەسوفی جیهان- فردریك ئینگڵش- نامەیەکی بۆ جۆزیف بلۆخ نووسی و تیایدا دەڵێت:-
ئێمە مێژووی خۆمان بەخۆمان دروست دەکەین... بەڵام لە ژێر بارودۆخی زۆر دیاری کراو لەمانەش کە یەکلا کەرەوە سەرەکیەکان لە هەموو بوارە جیاجیاکان هەروا ڕمیاری و...هەروا...؟ .




١٨٩٠/١١/١٢ ئیمارەتی لاکسمبۆرگ سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند، دوای ئەوە لە هەر دووجەنگی یەکەم و دووەمی جیهان لەلایەن ڕژێمی فاشی ئەڵمانیا دگیرکراو لە لایەن هێزەکانی سووپای هاوپەیمانان ڕزگارکرا .
هەروا ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی بەناوی – ئیمارەتی لۆکسمبۆرگی مەزن – بووە و ناوی پایتەختەکەی – لۆکسمبۆرگ – ە و ژمارەی دانیشتووانەکەی ، ١٣٥,٠٠٠ هەزارکەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە ی ، ٥٢٥,٠٠٠ هەزار کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکەی ، ٢,٥٩٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتوانەکەی ، ٥٢٥ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، لۆکسمبۆرگیەکان ٧١٪ . پرتووگالی و ئتاڵی ٥٪ . فەرەنسی ٣٪ . ئەڵمانی ٢٪ . لە وولاتەکەدا .

## ١٨٩١

١٨٩١/١/١٥ لەدایك بوونی شاعیرو نووسەرو رووناکبیری ڕووسیا – ئوسیپ ئیملیفتشر ماندیلــشتام – لــه شــاری وارشــۆ چــاوی بــەجیهان هــەڵهێناوە ... ئیمــل ڤینیامینۆڤیتشی باوکی جوولەکەیەکی ئیسپانی ڕەسەن بوو ، کە زۆر بەرێکی پەروەردەی منداڵەکانی دەکرد .

لە ساڵی ١٨٩٧ ماڵەکەیان بۆ شاری بافلۆسکی نزیك پترسبۆرگی پایتەختی ڕووســیای قەیــسەری گوواســتەوە لــەو کاتــدا ... لــە ســاڵی ١٩٠٠ لــە قوتابخانەیــەکی تایبــەت دەخــوێنێ و لەوێــدا مامۆســتا – گیــۆس – ی مامۆســتای زمــانی ڕووســی کاریگــەری زۆری لەهەســتی شــعری دەکــاو بەخوێندنــەوە ئاشــنای شــعرەکانی هەریــەك لــەگۆتێ و شــیللەو شکــسپیر دەبێت.

لەو کاتەش شاعر دەیەوێ بچێتە پاڵ جووڵانەوە جەماوەریەکەی وڵات ، کە ئەوسا بارودۆخی ئابووری و ڕامیاری لەو پەری شپرزەیی دەبێ . لە ساڵی ١٩١٠ وانەی فەلسەفەو زانست و زمان لە زانکۆی ( هایدلبیرگ )ی ئەلمانی دەخــوێنێ ... لــە ســاڵی ١٩١٣ یەکــەم دیــوانی شــیعربە نــاوی – بــەرد – بەچاپدەگەیەنێ لەو وڵاتەدا .

لــە ســاڵی ١٩٢٢ دیــوانی دووەمــی بەچــاپدەگەیەنێ . لــە ســاڵی ١٩٢٤ دەستگیردەکرێت و دووردەخرێتــەوە بــۆ گونــدی – شــیردین – ی و ســزای بەســەردا دەچەسـپێندرێت ... ئـەم شـاعیرە رامیاریـە لـەکارەکانی بـەردەوام دەبێت تاکوو لە ١٩٢٨/١٢/٢٧ کۆچی دوایی دەکات لە وڵاتەکەدا .

سەرچاوە:– مەوسوعەی فەلسەفە – دانانی – دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی – بەرگی /١ .

١٨٩١/١/٢٣ رووناکبیرو نووسـەری نـاوداری جیهـانی – ئەنتۆنیۆ گـرامش – لـەخێزانێکی بـوورژوازی بـچووکی شـاری تـالیس لەدوورگـەی سـەردینیا چـاوی بـەجیهان هەڵهێناوە .



جێگەی ئامارژە پێکردنە کە ئەم نووسەرو ڕۆشنبیر ناوزەندبووە بـە ڕۆشـنگەری ناوزینـدان . دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٩١٠ دەست بەخووێندن دەکات و لە دوایـی پلـەکانی خووێنـدن لـە زانکـۆی تۆرینـۆ خووێنـدنی ماف و ئاداب دەخووێنێ ... لە دوای تەواوکردنی خووێندن لە سـاڵی ١٩١٣ دەچـێتە ڕیـزی پـارتی سۆشیالـست . لـە بـەر زیرەکـی و بـوێریش ڕوو لـە نووسنی ووتار دەکات بۆ چەندین ڕۆژنامەو وتاری هـزری دەنووسێت ، کە نووسینەکانیـشنی بـەرگریکردن بـووە لـە مـاف کرێکـارو سـنوور دانـان بـۆ چەوسـێنەرەکان . بـەهۆی هەسـتی رامیـاری لـە سـاڵی ١٩١٧ بەشـداری لـەمانگرتنی کرێکـاران لـە شـاری تـۆرن دەکـات ... هەوڵـەکانی دامەزرانـدنی پارتی کۆمۆنیست بوو لەئیتالیا .

ئەوە بوو لە ١٩٢١/١/٢ ناوی پارتی سۆشیالستی دەگۆری بۆ ناوی پارتی کۆمۆنیست و خۆشی دەبێتە سکرتێری ئەو پارتە نوێیە .

دوای ئـەوە تـاکوو سـاڵی ١٩٤٢ نووێنـەری لابـاڵی ئۆپۆزسـیۆن دەبێـت لەپەرلەمانی ووڵاتەکە ، دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٢٦ دەبێتە نووێنەری شاری تـۆرن و ڕۆژنامـەی – یـەکێتی –دادەمـەزرێنێ ، کـە زمانحـاڵی پـارتی کۆمۆنیـست بـوو... لـە مـانگی /١٩٢٦/١١ فاشیەکان بەتۆمـەتی پیلانگێـری دژ بەئاسایشی نەتەوەیی دەیدەنە دادگا .

دوای ئەوە داواکاری گشتی کە فاشیەکی توونـدرەو بـوو بـە دادوەر دەڵێت :– پێویـستە بـۆ مـاوەی ٢٠ سـاڵ ئـەم مێـشکە لەکاربخـەن . ئـیتر بـەم جـۆرە دەخرێتەزینـدان و مـاوەی ١١ سـاڵ بەزینـدانی بەسـەر دەبـات . بـە هـۆی ئـەم زینـدانی کردنـەش بـاری تەندروسـتی تێـك دەچـێت و لـە سـاڵی ١٩٣٥ بـۆ نەخۆشخانەی تایبەتی ڕۆما دەگووازرێتەوە و لە ساڵی ١٩٣٧ ئازادی دەکەن

. بە هۆی نا لە باری باری تەندروستی کە لە زینـدان فاشیەکان تووشی هـاتبوون لـە ئەنجامی ئەشـکەنجەدانی ، دوای چەند رۆژێـك لەدەرچـوونی لـە نەخۆشـخانە لــە ١٩٣٧/٤/٢٧ ماڵئــاوایی لەگــەل ونیــشتیمان و پــارت و شۆڕشگێرانی وولاتەکەی دەکات لە ئیتاڵیا .

ئەم کەسایەتیە لە ماوەی ژیانی زیاتر لە ١٥ پەرتووکی بە ناوەکانی – دەفتەری یەکەمی بەندیخانە – و – دەفتەری دووەمی بەندیخانە – و دەفتەری – دەنووسێت . کە ئەم دەفتەرانەش بە گرنگترین و بە ناوبانگترین نووسراوی سیاسی گرامش دادەنرێت لەسەدەی بیستەم و کاردانەوەو کاریگەری خۆی هەر ماوە لە سەدەی بیست و یەکەمیش کە لەناویاندا بیرکردنەوەی قووڵی خۆی سەبارەت بەکۆمەڵگاو تیئۆری مارکسی و تیئۆری رەخنەیی و تیئۆری پەروەردەیی تێداچرکردۆتەوە .

ئەم مرۆڤە رۆشنبیرو سیایەتمەدارە ئیتالیە لە ماوەی ژیانی بەلێنەکانی کە بەگەل و نیشتیمانەکەی دابوو گەیاندیەجێگەو بووە جێگەی راستگۆیی و متمانەی گەلەکەی لەوولاتەکەیدا .

١٨٩١/٢/٢٣ بەهۆی کێشە لە سەر رێکەووتننامەی – تنباك – لە نێوان شا نەسرەدین و کۆمپانیای بەریتانیا ، ئەویش بەپێدانی مۆڵەت بەو کۆمپانیایە بە فرۆشتنی تووتن لەهەموو ئێران ، کە ئەمەش بووە هۆی نارەزایی دەربرین لە لایەن گەلانی ئێران بەگشتی و گەیشتە پلەی شۆڕشی گەورەی میللەت دژی ئەو رێکەوتننامەیە ، کە زۆر لەبارزگانەکان چوونە لای شا .

بەڵام هەوڵەکانیان بێ سوود بوو ، لە ئاکام بووە هۆی بەرپابوونی شەڕ لە نێوان پیاوانی ئایینی بەپشتیووانی جەماوەرو هێزەکانی حکوومەتی شای فارس لەشارەکانی ئێراندا .

١٨٩١/٣/٢٠ مۆرکردنی پەیمانی نهێنی لە نێوان بەریتانیاو هەرێمی مەسقەت لە کەنداو ، کە ئەو پەیمانە بووە هۆی ئەوەی . کە مەسقەت بەپێی یاسا ببێتە پارێزراوی بەریتانیا و دادووەری مەسقەت بۆ یەکەمجار بەخۆشیەوە بووە سوڵتانی مەسقەت و عومان و بەردەوام بوو تاکوو ١٩٥٨ ، ئەم رێکووتننامەیە بە هۆی بەرپا بوونی شۆڕشی /١٤ ی تەمووز گۆڕا بەرێکەووتنێکی نوویێ دیکە لە بەرژەووەندی مەسقەت و بەریتانیادا .

١٨٩١/٩/٤ سەرکردەو کەسایەتی سەهیۆنیزم – یودنهابمر– ڕاگەیاندنێکی ڕاگەیاندو بڵاوی کردەوە ، بۆ دۆستەکانی سەهیۆنی لە ژێر ناونیشانی – ئەی سەهیۆنیەکانی جیهان یەکگرن– لە پێناو یەك هەڵوێستو خەباتو ڕێکخستنی ڕیزەکانو دەرچوون لەکارو خەباتی نهێنی بۆ کارکردنی ئاشکرا، ئەویش لە پێناو دامەزراندنی دەوڵەتی سەهیۆنیزم .

## ١٨٩٢

١٨٩٢/١/١٩ دامەزراندنی یەکەم یاری باسکە ، لە تەك یاریەکانی دیکەی جیهان ، لەلایەن مامۆستای وەرزشی – جیمس بسمیت داهێنز– کە ناوینابە یاری تۆپی سەبەتە لە جیهاندا .

١٨٩٢/٣/١١ مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی ناکاوی لە نێوان شێخی بەحرێنو بەریتانیا ، بە هۆی باری ناوچەوهەرێمەکە ، بە تایبەتی کێشەی نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو فارسی سەفەوی لەناوچەکە و بە تایبەتی لەسەر خاکی کوردستانو وڵاتی نێوان دوو زێ واتە– میزۆبۆتامیا... لەلایەکی دیکە سەر هەڵدانی کێشەی لابەلای نێوان هەردوو لایان لەگەڵ ڕووسیای قەیسەریدا جگە لە فەرەنساش.

١٨٩٢/٦/٢ لە دایك بوونی ڕۆمان نووس و دەرهێنەری فلیمی سینەمایی و زانای زمان – فیکۆلۆژیا– جۆن رۆیل رۆنالد تۆلیکنی . شایانی باسە لە جەنگی یەکەمی جیهان بە شداری چەندین شەڕ دەکات و زۆر لە هاوڕێکانی دەکووژرێن . لە تەمەنی شازدەساڵیدا خاتوو – ئیدیس– دەبێتە هاوسەری ، شەیدای زۆر ئەفسانەو داستانە کۆنەکانی میللەتانی ئایسلەندی و ئەسکەندەنافی و گەرمانی بووە ... لە ساڵی ١٩٣٧ چیرۆکی The Hobbit بە چاپ گەیاندووە ، بەرهەمەکانی ئەم نووسەرو زانا بەناوبانگە جێگەی سەر سوڕمان و هەست ڕاکێشەری جەماوەری وڵاتەکەی و جیهان بووە ، تاکوو ماڵئاوایی کردنی لە ١٩٧٣/٩/٢ لە وڵاتەکەیدا.

<u>تێبینی :</u>– مێژوو و ناوی نووسەرو شاعیر و وێنە کێش و هونەر مەند و نووسراوە تەوە ، بەڵام لە دانەنانی وێەی کەسیی یا بە دەست نەکەوتووە یا خوود وێنەکە زۆر کۆن بووە لە بەر ئەوە دانەنراوە ، بەڵام بە پێی توانا هەوڵمان داوە بە شێوەیەکی باش کارو بەرهەمەکانی نهووسەران و ئەدیبان و هونەرمەندان لە ناو ئەم کتێبە تۆمار بکەین .

لە هەمان کات داوای لێبووردن دەکەین گەر نەمان توانیبێ ژیان و وێنەی کەسایەتەکان دابنێن .

## ١٨٩٣

١٨٩٣/١/١ کووشتاره مێژووییەکەی پاریسی پایتەختی فەرەنسا ئەنجامدرا کە بە کووشتنی گشتی ناوزەند بوو ... تاوانەکانی ئەو کۆمەڵ کووژیە لەگەڵ شۆڕشی مەزنی فەرەنسا بوو ، کە زیاتر لە ٣٠٠٠ هەزار کەس لە کەسایەتی رامیاری و زانا و سەرکردەکانی سووپاو کەسایەتی ئایینی و رۆشنبیر کووژران ... ئەم کۆمەڵ کووژیەش لە هەمۆو جیهان هەوڵەکانی زرینگایەوەو نارەزایەکی یەکجار بەهێز و توند ئاراستەی دەسەلاتدارانی ئەو وولاتەکرا .

١٨٩٣/٢/٢ بە ئامۆژگاری و فەرمانی سولتانی عوسمانی- سولتان عەبدولحەمید- لە رێگەی سەرەك وەزیرانەکەی – جەواد پاشا – بە فەرمانی ژمارە / ٢٢٧٠ داوایکرد ، کە ناوی سنجەقی شارەزوور لە باشووری کوردستان بگۆردرێ بۆ سنجەقی کەرکوك ، ئەویش بە هۆی لێك چوونی لەشاری- دێرە زووری- سووریای ئێستادا.

ئەمەش کە کردەوەیەکی شۆڤینیانە بوو لەلایەن دەسەلاتدارانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، بە تایبەتی لەسەر خاکی کوردستان بە هاوبەشی و هەماهەنگی لەگەڵ فارس و عەرەبدا .

١٨٩٣/٣/١٠ دامەزراندنی دوو ژێر دەستەی فەرەنسی ، ئەویش هەردوو هەرێمی گینیا و ساحل حاج بوون لە کێشووەرەکەدا .

١٨٩٣/٣/١٥ بە پێی بەڵگەنامەی ژمارە/٤٦ی سولتانی عوسمانی سولتان عەبدولحەمیدی دووەم ، کە رەزامەندی لەسەر گۆڕینی سەنجەقی شارەزوور لە باشووری کوردستان بۆ وویلایەتی کەرکوك کرد ، کە لەو رۆژەدا لە هیچ نووسراوێکی هاتووەکان و دەرچووەکان لە نێوان دام و دەزگاکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی ، ناوی شارەزوور نەدەهات...ئەمەش بەپێی نووسراوی وەزارەتی ناوخۆی عوسمانی بە ژمارە/٣/١٣/٢٨٨٦ی هەمان ساڵ لە وویلایەتەکەدا .

١٨٩٣/٤/١٥ بەرپابوونی شەڕ لە نێوان هێزە چەکدارە کوردە ئێزیدیەکان و هێزەکان سووپای عوسمانی ، لە ناوچەی شنگاڵ لە باشووری کوردستان و بەردەوام بوونی ئەم شەرە بۆ ماوەی سێ رۆژ لە ناوچەکەدا ، کە زیانەکانی سووپای عوسمانی بە سەرکردایەتی عومەر نەزمی پاشا زۆر بوو ، لەگەڵ ئەوشەدا

زیانـەكانی ئێزدیـەكان كـەمتر بـوو، بـەهۆی پاڵپـشتی بـەهێزەیان ، ئـەویش شاخەكانی سنجار لە باشووری كوردستان.

١٨٩٣/٤/٢٥ گەڕانـەوەی نووێنـەری دەسـەڵاتی عوسمـانی عومـەر نـەزمی لـە وویلایـەتی مووسڵ ، ئـەویش بـە سـەر شـۆڕی بۆ ئەستەمبۆڵ ، لـە دوای بڕیـاری لیژنـەی لێكۆڵینەوەی ئازاردانی كوردە ئێزیدیەكان لە وویلایـەتی مووسڵ لـە هـەرێمی باشووری كوردستان .

١٨٩٣/٧/٥ نووێنـەری دەسەڵاتی عوسمـانی فـەریق عومـەر نـەزمی پاشا گەیـشتە شـاری موسڵ ، لـە پێنـاو گـەمارۆدانی كـوردە ئێزیدیـەكان لـە باشـووری كوردسـتانی ژێر دەسـەڵاتی عوسمـانی و لـەناوبردنیان ، كـە دەسـەڵاتی تـەواوی پێدرابوو لەلایەن سوڵتانی عوسمانی . كە بە پیـاوێكی دڕنـدە ناوزەنـد ببـوو، سـەرەڕای ئەوەی كە لێژنەی لێكۆڵینەوە تاونباری دەزگا سـەربازیەكانی عوسمـانی كـرد بوو لە وویلایەتی موسڵ بەرامبەر بەكوردە ئێزیدیەكان .

١٨٩٣/٨/٢٣ هێزەكـانی سـووپای شـانشینی بـەریتانیا لـە هێرشـێكیدا – هـۆنگ كـۆنگی چینیان داگیر كرد لەكاتی شەڕ لە نێوانیاندا.
بەڵام لە دوای ئەو ماوە دوورو درێـژەدا لـە ١٩٩٧/١/١ دوورگەكـە گـەڕاوە بـۆ باوەشـی چـینی ملـلـی و بـەردەوام بوونیـان لەسـەر هـەمان ڕژێمـی تایبـەتی خۆیاندا .



١٨٩٣/٩/١٢ مێژوونووســـــــس و رۆژنامـــــەنووس و ئـــەدەیب مامۆسـتا – حوسـێن حـوزنی موكریانی – لەگـەڕەكی حـاجی حەسـەن لەشــاری سـابلاخ لەمــــهاباد لەرۆژهــــەڵاتی كوردسـتان چـاوی بـە جیهـان هـەڵهێناوە ... ئـەم كەسـایەتیە نـــاودارەی كــورد هــەر لەمنداڵیـەوە خـاوەن هزرێكـی دەوڵەمەنـــدی لــێ بــەدی

دەکرێت لە شارەکەدا .

خووێندنی لەلای باوك و خاڵەکانی خۆی تەواوکردووە ، دوای ئەوە چەند ساڵێك لەرووسیا و ئەستەمبوڵ خووێندویەتی ... هەر لە سەرەتای ژیانی چۆتە نێوو سەوداي کورد پەروەری و بڵاوکردنەوەی هزری هەستی نەتەوایەتی ... بۆیە هەردەم لە هەوڵی خۆ پێگەیاندن بووە کە شارەزایی لەزۆربەی بوارەکانی ئەدەبی هەبووبێت و بتوانێ کاری تیادا بکات ... ئەو هەوڵانەو بوار بۆ رەخسانی تووانی بچێتە ناو بوارەکانی مێژوو و ئەدەب و رۆژنامەگەری وچیرۆك و مۆرهەڵکەنی و هونەری گۆرین ، بەتایبەتی ئەو گۆرینانەی کە لەگۆڤاری دەنگی گێتی تازەدا بڵاودەکردەوە ، لە خووێندنەوەی مێژوو و چاپ و چاپەمەنی رۆژنامەنووسی کوردی رۆڵێکی ئێجگار باڵای هەبوو لە دامەزراندنی چاپخانەی کوردی و بڵاوکردنەوەی جۆرەها گۆڤارو رۆژنامە .

کە زۆربەی ئەو کاتە بەنهێنی دەردەچوو لە بەر بارودۆخی کوردو گەمارۆدانی لەلایەن داگیرکەرو دووژمنان ... ئەم کەسایەتیە خزمەتێکی پر بەخش و بەسوودی هۆشیاری گەلی کوردو بڵاوکراوەی هەستی نەتەوایەتی پێگەیەنێ ... بڵاوکراوەکانیشی لە شاری حەلەب و رەواندزو هەولێرو موسل و بەغدا بەردەوام بووە .

شایانی باسە کە ئەم کەسایەتیە توانیەیەتی لە ساڵی ۱۹۳۵ یانزە/۱۱ ژمارە لەگۆڤاری رووناکی لە شاری هەولێر دەربکات ... هەروا لە ساڵەکانی ۱۹۳۲ – ۱۹۲٦ دا ۳۲ ژمارە لەچاپکراوی لە سووریاو میسرو لوبنان و ئەستەمبوڵ و ئەوروپا بڵاوکراوەتەوە و ٤٤ بەرگ لەمێژووی کورد بەزمانی کوردی لێی دروست بکات .

بەڵام توانی ۲۱ بەرگی لێ چاپبکات و بە دەیا نووسین و بابەت و بڵاوکراوەی لە ئەدەب و مێژووی کورد بڵاوبکاتەوە ، کە بۆتە کەلتوورێکی بێ وێنەی گەلی کوردستان .

مامۆستا حوسین حوزنی موکریانی لە ساڵی ۱۹۱۲ بریاریدا لەشاری حەلەب نیشتەجێ بێ و ئەو بابەتە مێژوویانەی دەربارەی مێژووی کورد کە کۆی کردبۆوە بەزمانی کوردی بەچاپبگەیەنێ .... ئەوە بوو پارەی نارده ئەلمانیا بۆ کرینی چاپخانە ... بەڵام بەهۆی بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهان لە

ســاڵی ١٩١٤ چـاپخانەکەی دواکـەوتوو ئـیتر بەهـەر ئـەرك و رەنـج و دەردە سەریەکی زۆرەوە لە ١٩١٥/١/١٠ لەرێگای شاری بەیرووتی پایتەختی لوبنان گەیـشتە حەلـەب و تـوانی چـەندین کتـێبی مێـژوویی و عەقیـدەی ئیمـان و مەولوودنامەو گۆڤارێکی چاپکردوە .

دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٢٥ خۆی و خێزانەکەی دەچنە شاری بەغدا و دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٢٦ دەچێتە شارۆچکەی رەواندزی سەر بە پارێزگای هەولێر لـە باشـووری کوردسـتان ... ئـەم کەسایەتیە لـە کـارە پیرۆزەکـانی بـەردەوام دەبێـت تـا ماڵئـاوایی لـە گـەل و نیشتیمانەکەی دەکـات و بەرهەمـەکانی وەك کـەلتوورێك جێگـەی خۆیـان لـە دەروونـی نووسـەرو رووناکبیرانی گـەلی کوردستان کردۆتەوە لە هەموو بوارەکاندا .

١٨٩٣/٩/٢٢ هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان هێزەکانی سووپای عوسمانیو چەکدارانی کوردو ئەرمەن ، کە بە دژوارتـرین شـەڕ دەژمێردرێـت لـە باکووری کوردسـتانی ژێـر دەسەڵاتی عوسمانیدا ، کە چەندین لایەن لە هێزەکانی سووپای عوسمانی لایـەنگیری کـوردی دەکـرد ، لەهـەمان کـات هێزەکـانی سـووپای ڕووسـیای قەیسەری لایەنگیری چەکدارانی ئەرمەنی دەکرد لە هەرێمەکەدا .

واتە شەڕی سێ لایەنە بوو لەیـەك کاتدا ، لـە نێـوان تـوركو کـوردو ئەرمـەن. ئەمـەش بەخواسـتەکانی دەسـەڵاتی عوسمـانی هەڵگـەڕاوە بـۆ لێـدانی کـوردو ئەرمـەن بەیەکـەوە ، وەك دەڵـێن- لێـدانی دوو چـۆلەکە بەیـەك بـەرد- لـە هەرێمەکەدا .

١٨٩٣/١١/٦ کۆچی دوایی هونەرمەندی سمفۆنیای ڕووسیو جیهـان - چایکۆ فسکی- لـە رووسـیای قەسـەری ، کـەسمفۆنیا کـانی بۆتـە مێـژووی نەتـەوەییو کەلتووری وڵاتو گەلەکەو جیهان .

## ١٨٩٤

١٨٩٤/٢/١٨ سـەرهەڵدانی بـیری یەکـسانی لـە ڕۆژهـەڵاتی بیابـانی دوورگـەی عـەرەبی و عوسمانی بەر لە بەرپابوونی شۆڕشی بەلشەفیەکان لە ڕووسیای قەیسەریدا .

شـایانی باسـە کـە زانـای بەرەچـەلەك یۆنـانی - لحـالم مهـور - لـە پێنـاو ڕاکێشانی کرێکـاران بـۆلای خـۆی ، لـە قـاهیرەی پایتـەختی میـسرو بـەبێ

یارمەتی دانی بۆ لای – سۆشیالیستە تێکدەرەکان– لە ڕاگەیاندنێکیدا گوتی :–

ئەمرۆ ڕۆژی یادکردنەوەی ڕاپەڕینی کۆمۆنەی پاریسە لە پاریسی پایتەختی فەرنسا ، لە بەرئەوە پێوویستە هەوڵی یەك ڕیزی بدەین بەو بۆنە بە بەرزکردنەوەی دەنگمان بە مردن بۆ داگیرکەرو چەوسێنەرو بژی سۆشیالیستی و بژی فەوزەویە لە جیهاندا .

١٨٩٤/٧/٥ لە بەرەو کۆتاییەکانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، هەموو پلەو پایەکان ببوونە میراتی بنەماڵەی عوسمانی لە بوارەکانی خوێندن و پلەوپایەو سامان و دەسەڵات، کە هەموو بەسترابووەوە بە دابەشکردنی لە نێوان خۆیان و پاوانکردنی سامانی گەلانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا .

هەتا ئەو کاتەی کە ئەوانەی تورکیش بوون ، کە نووسەرو پرۆفیسۆری مێژووی تورك – ئەحمەد جەودەت – بەشێووەیەکی ڕاشکاوانە باس لەو بۆگەنایەتییەی دەسەڵاتی عوسمانی دەکات لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

شایانی باسە دەسەڵاتی بنەماڵە کە بەرەو کۆتایی هاتن هەنگاو دەنێ و پاوانی دەسەڵات و سامانی گەل دەکات ، بۆخۆی و دارودەستەکەی تەنیا لە پێناو مانەوەو درێژە دان بە دەسەڵات . بەڵام کە سەر بۆگەن بوو لاشەش بۆگەن دەبێت و کۆتایی دێت . جا بە هەرشێوەیەك بێت ، لە هەر ناوچەیەك و وولاتێك بێت لە جیهاندا .

١٨٩٤/٧/٢٧ تێرمیدۆر ، لە ووشەی یۆنانی ، بە واتای گەرما وەرگیراوە .

لەڕۆژ ژمێری شۆڕشگێری فەرەنسادا بە یازدەمین مانگی ساڵ دەگووترا ، کە بە پێی ڕۆژ ژمێری گریگۆری هاوکات بووە لەگەڵ نۆزدەی تەمووز هەتا هەڤدەی مانگی ئاب .

ئەم زاراوەیە لە مێژووی شۆڕشی مەزنی فەرەنسادا بە کودەتای نوێی تیرمیدۆ دەگووترێ ، کە کۆتایی بە سەردەمی زەنگ و سەرکووتی ژاکۆبیتەکان هێناو ، بە دوای ئەودا ، قۆناخی کۆنە پەرستی بە ئاشکرای بۆرژوازی لە بەرامبەر چەمکە شۆڕشگێریەکانی ڕۆبیسپەر و چینی کرێکاری پاریس دەستی پێکرد.

سەرکردەی ڕووسیا ترۆتسکی شۆڕشگێری بەناوبانگ ئەم زاراوەی بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٠٣ دا بەکارهێنا ... هەروا لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە

سەپاندنی کۆنترۆڵێکی ناوەندی توونـد بەسەر پـارتی دیموکراتی ڕووسیا لەلایەن لینینەوە ڕێگا بۆ تێرمیدۆرە هەڵپەرستە سۆسیالیستەکان دەکا ، یەکێك لە بابەتە سەرەکیەکانی هەوڵدان بوو بۆ بەدەست هێنانی پۆست و دەسەڵات لە دەزگای بەڕێوەبەری سۆڤیەتدا .

دوای مردنی لینین – ئەو مەترسیە بوو کە ترۆتسکی و لایەنگرەکانی بە – تێرمیدۆر – ێکی نوێ ناویان دەبرد ... واتە خیانەتی دەوڵەتی نوێ و بیروکراتی پارت بە شۆڕشی ڕووسیا و چینی کرێکارانی ڕووسیا .

١٨٩٤/٨/١٥ دەست پێکردنی قەسابخانەی ئەرمەن‌و کورد لە قەزای – ساسۆنی – سەر بە سنجقی مۆش – پارێزگای مۆش – سەر بە وویلایەتی بەدلیس لە هەرێمی باکووری کوردستان ، کە لە ١١٠ سەدودە گوند پێکهاتبوو و زیاتر لە ٢١ هەزار خێزانی تیایدا دەژی ، کە لە٤٠٪ ئەرمەن بوون ، ئەودیکەش کورد بوون لە باکووری کوردستان ، ئەمەش بەهۆی نەدانی باج بەدەسەڵاتی عوسمانی ، ئەم کارەش بەردەوام بوو تاکوو ٩/١٥ ی هەمان ساڵ لە ناوچەکەدا .

١٨٩٤/٩/٢٥ ئاژانسی تەلەگرافی سوویسری لەم ڕۆژەدا دامەزراوەو مەڵبەندی سەرەکی لەشاری – بڕن – ی پایتەختی سوویسرا بوو ، کە کۆمپانیایەکی هاوبەشەو وێستگەو تەلەفزیۆن‌و ڕۆژنامەکان بەشیان تیایەو سوودی لێوەر دەگیرێ ، وەك سەرچاوەی هەواڵ‌و زانیارییەکان لە هەموو بوارەکان لە جیهاندا.

١٠/١٥/ ١٨٩٤ ئەفسەرێکی بە نەژاد جوولەکەی فەرەنسی – ئالفرید دریفووس – بە ناپاکی کردن لە ناو سووپای فەرەنسا تاوانبار کرا ، دادگا بە دوورخستنەوەی لە سووپاو لە فەرەنسا بڕیاریدا بۆ دوورگەی شەیتان لە ناوچەی گۆیانای فەرەنسا.

شایانی باسە پاشی پێنج ساڵ لە بەڵگەنامەکان دەرکەووتن ، کە ئەو ئەفسەرە تاوانبارنییەو دادگا سەرەڕۆیی کردووە لە دادگایکردنەکە ی لە وولاتەکەدا .

## ١٨٩٥

١٨٩٥/١/٢٨ یەکەم فیلمی سینەمایی هەڵوواسرا لە چایخانەیەك لە شاری پاریسی پایەختی فەرەنسا ، کە زیاتر لە ٣٠ سی کەس تەماشای ئەو فیلمەیان دەکرد . بەڵام سەیر ئەوە بوو زۆر بەیان هەڵاتن بەهۆی دیتنی شەمەندەفەرێك لە سەرشاشەکەدا ، کە رووبەرووی دانیشتووانی سەیرکەرانی فلیمە دەبیووەوە لە ناو هۆڵەکەدا .

١٨٩٥/٣/١١ کۆچی دوایی زاناو رۆژهەڵاتناس و گەڕۆکی ناوداری جیهان- ئەدوارد تۆلدە- ئەم زانایە لە کەرتی لاتڤیا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە ساڵی ١٨٤٩ ، کە ناوبراو گەڕۆکێکی رامیاری بووەو سەردانی ناوچەکانی بیابانی عەرەبی و ئێرانی ئێستاو ئوردن وڕووسیاو رۆژئاوای ئێرانی کردووە ، لە پێناو کۆکردنەوەی زانیاری لە هەموو بوارەکاندا .

١٨٩٥/٣/٢٢ یەکەم فلیمی سینەمایی جووڵێنەر کاریکاتێر لە مێژوودا پەخشکرا بۆ بینەران لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا.

١٨٩٥/٤/٢٤ نامەی ئاڕاستەکراوی پەتریرکی کلدانی - مارکیورکیس ئۆدیشۆی پێنجەم - بە بۆنەی سریانیەکان کرد ، کە داوایان لێدەکات هەوڵەکان یەکخەن ، لە پێناو یەکگرتنی کەنیسە کلدانیەکان و یەکێتی مێژووی ناسنامەی نەتەوەیی هاوبەشی کلدانی و نەسرانی ، کە کۆیان دەکاتەوە بە ناوی سریانی رۆژهەڵات لە جیهاندا .

١٨٩٥/٨/٥ فەیلەسوفی بەناوبانگی جیهانی- فردیك ئینگلش- لە ئینگلترا کۆچی دوایی کردووە . شایانی باسە ئەوفەیلەسوفە هاوڕێ و هاوخوبات و هاوبیروو هاوکاری کارل مارکس بووە ، دانراوی ڕاگەیاندنی بەیاننامەی کۆمۆنستی و ئابووری رامیاری و کۆمۆنستی زانستی و چەندین دانراو بڵاوکراوەی هەمەلایەنی لە بوارەکانی چینی چەوساوە بوونە.




١٨٩٥/٨/٢١ لــــه دایــــك بــــوونی پرۆفیــــسۆری نــاوداری كـورد ، مامۆسـتا كامـەران عــەلی بـەدرخان لـە شـاری ئەستەمبۆڵی توركیا . كــــە لــــە بنەماڵیـــەكی نەتـــەوەیی و شۆرشــگێرو روونـاكبیر لــە بـا كــووری كوردسـتان بوونـەو تـا دوا هەناسەیان بۆگەل‌و نیشتمان ، كە كوردو كوردستانە درێخیان نەكردووە لـە كوردستان .

١٨٩٥/٩/١٨ لەدایك بوونی گەورەترین تەمەن و رووپێوی بەناوبانگ و بیناسازی یابان و جیهان – تۆمۆگی تانابی – لە شارۆچكەی میاكۆنوگۆ لەباشوری رۆژئاوای یابان .

شایانی باسە كە تانابی خۆی و هاوسەرەكەی كاری رووپێویان دەكردوو ئەو مرۆڤە بەشێووەیەكی رێك و بەردەوام شیری دەخواردو جگەرەی نەدەكێشا لە هــەموو كاتــەكانی كــاركردنی یادەوەریــەكانی خــۆی دەنووســی و بــەردەوام رۆژنامەو گۆڤارەكـانی دەخووێندەوە ... نـاوی ئەم مرۆڤە بەوە نازەنـد بـوو – تانابی – كەمەزنترین بیناساز لە جیهان بەنووسینەوەی فەرهەنگی گینیس لە ١/١ ، لە دوای مردنـی ئیمیلیانۆ میركادۆدیل تۆرۆ لە بۆرتۆریكۆ لە تەمـەنی ١١٥ ساڵیدا .

ئـەو كەسـانەی كـە لـە تەمـەن زیـاتر لـە سـەد سـاڵ لـەیابان مەزەنـدە دەكرێـت بـەزیاتر بـە ٣٠ هــەزار كــەس و واش مەزەنـدە دەكرێـت كـە لـە سـاڵی ٢٠٥٠ تەمـەنی درێـژ لـە یابـان لـە یـەك ملیـۆن زیاتربێـت بـەهۆی كـاری بـەردەوام و جمووجۆلی پیاوو ئافرەتە یابانیەكان .

سەرچاوە:– BBc.arabic.com

١٨٩٥/١١/١ بـه پێـی نووسـراوی حکوومـەتی فەرەنـسا لـه سـەرکردارەکانی جەندرمـەی دەسەڵاتی عوسمانی، کە بەردەوامبوونە لە شەهیدکردنی ئەرمەن‌و کورد لـە باکووری کوردستان .

بـه تایبـەتی شـەهیدکردنی مەسـیحیەکان بـه نـاوی ئـەوەی کـه ئەرمـەنین لەوویلایـەتی دیار بەکر، کە لـە یـەك ڕۆژدا زیـاتر لـە٣٠٠ هـەزار مەسـیحی لـە کـوردو ئاشـووری‌و ئەرمـەن شـەهیدکراو زیـاتر لـە١٢٠ گونـدی وێرانکـردو بەسـەدا دووکـان‌و مـاڵ‌و کێڵگـەیان تـاڵان کردوسـووتاندو وێرانکـرد لـە ناوچەکەدا

. کـە جەندرمـەکانی عوسمـانی دەسـتیان لـە کـوردو ئەرمـەن نـە دەپاراسـت بەشەهید کردنیان لەسەر نیشتمان‌و ماڵەکانیان کە کوردستانەدا .

تێبینی:- ئەرمەن و ئاشووریەکانیش ، کە زۆربەی هەرە زۆریان کورد بوونە لە کوردستان .

١٨٩٥/١١/٢٧ کەسـایەتی نـاوداری جیهـان و زانـای بـەناوبانگ و خـاوەنی یاداشـتنامەی نۆبـل - ئەلفریـد نۆبـل - لـە وەسـیەتنامەکەیدا گووتوویـەتی : - خەڵاتەکـە بـەو کەسـە ببەخـشرێت کـە زیـاتر شـایانیەتی ... جـا مـەرج نیـە گـەر



سکەندەناڤ بێت ، یاخوود هی شووێنەکانی دیکـەی جیهـان بێـت ... ئـەویش کە ووشەی زیاتر شایانی زۆرراڤەی بۆکراوە . لە بەر ئەوەی لـەو رووخسارەدا واتاو مەبەستی جۆراوجۆر دەگەیەنێت .

جێگـەی باسـکردنە کـە خـەڵاتی نۆبـل بـۆ ئـەو شـاعیرو نووسـرەو زانـاو فەیلەسوف و سەرکردانەیە کە بەرگری لە ماف و داخوازیەکانی گەلان بکەن لە

هــەموو بوارەكــانی ڕامیــاری و نەتــەوەیی و نیــشتیمانی و ئــابووری و كۆمەڵایـەتی و ڕۆشنبیری و مێـژوو و زمـان و داب و نـەریت و كـەلتوور و هـی دیكه ، نەك بە پێچەوانە .
ئەویش بە سەقامگیری دادپەروەری لەژیان و ئەرك و ماف لە سەر گۆی زەوی لە جیهانێكی خالی لەشەڕو ئاژاوەو ململانیێ و كێشەو گرفتەكان . جیهانێك كە مەرو و گورگ بەیەكەوە ئاو بخۆنەوە ... نەك وەك ئێستای كە بە هەزارا ملیۆن كەس ڕۆژانە لەبرسان و بیێ جێگەو شووێن گیان لە دەست دەدەن لەرێگەی توونـدو تیـژی دەسـەڵاتە هەمـە جۆرەكـان ، كـە هـەموو هەوڵـەكانیان لـەپێناو پاراسـتنی ... كورسـی و سـامان و پارەیـەو جـەماوەریش ڕوو لـە ئاسمـان دەكات و دوعا دەكات بۆ ئـەوەی بارودۆخەكە بـەرەو ئارامی ببات ...؟...!. كـە ئەمـەش كـارێكی نامرۆڤانـەو دوورە لـە هەسـت و هەڵوویـست و خواستەكانی – ئەلفرید نۆبل لەسەر گۆی زەویدا .



١٨٩٥/١٢/١٤ شــاعری شــیعری بــەرگری گــەورەی فەرەنــسی – پــۆل ئیلــوار – چــاوی بــەجیهان هــەڵێناوە ... لەســـەرەتای دەســت پێكردنــی نووســینی شـیعر پەیوەنـدی بـە شـاعیرو هونەرمەنــدە ســریالیەكانەوە كـردووەو لەگەڵیانـدا بـاوەری بەكۆمینیزم هێناوە .
جێگای ئامـاژە پێكردنە كە ئەم شـاعیرە كۆمۆنیزمە لە تەمـەنی ٥٧ ســاڵیدا لــە ســاڵی ١٩٥٢ ماڵئــاوایی لــە شــیعر دۆســتان و گــەل و نیشتیمانەكەی كردووە . بەرهەمەكانی ئەم شاعیرە . ١– مردن لە بەرنـەهاتنی مـردن لـە سـاڵی ١٩٣٤ . ٢– شـیعرو ڕاسـتی لـە سـاڵی ١٩٤٢ . ٣– وادەیـەك لەگەڵ ئەمانەكاندا لە ساڵی ١٩٤٥ . هەروا لـەماوەی شـەڕی دووەمـی جیهانـدا یەكێك بووە لەشاعیرە گەورەكانی بزووتنەوەی بەرهەڵستكارانی ئەلمانیا لە

وولاتەکەیدا .

١٨٩٥/١٢/٢٨ ئەنجامـدانی قەسـابخانە دژی ئەرمەنـەکان لەلایـەن هێزەکـانی سـووپاو جەندرمەکانی عوسمانی بەسەرپەرشتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ، لە ماوەی ٢٨-١٢/٢٩ ، کـە زیاتر لـە ٣٠٠ هـەزار ئەرمـەن بەگوشتن و زینـدە بەچاڵ کردن لەناو بران ، لـە ئەنازۆڵ و تـەرابیزۆن و ئەرزەرۆم و مەرعەش وقیسریە و ئورفـا لـە باکووری کوردسـتان ، لەهـەمان کـات کـوردیش بـەر ئەولێشاوە کەووت . بەڵام بەرێژەی ئەرمەن نەبووە لە هەرێمەکەدا .

١٨٩٥/١٢/٢٩ لـەو کاتـەی کـە – سـیرلیاند جیمـسون- هەڵـسابە سـەرکردایەتی کردنـی هێرشێکی بەرفروان بۆسەر جۆهانسمبۆرگ لە وولاتی بوێر، بەڵام حکوومەتی بەریتانیا ناڕەزایی خۆی دەربڕی بەرامبەر بەوکارەو داوای گەڕانەوەی کرد ، بـۆ بـەریتانیا و دەسـتیانکرد بـەدادگایی کـردن و زینـدانی کردنـی بۆمـاوەی ١٥مانگ.

بەڵام دوای ئازاد کردنی گەڕاوە باشووری ئەفریکیا ، کە لە دوای – سیسیل رۆدس- بووە سەرۆکی پارتی پێشکەووتن لەژێر دەستی کای لە وولاتەکەدا.

## ١٨٩٦

١٨٩٦/٢/١٩ لـەدایك بـوونی رابـەری بزووتنـەوەی سـوودیالی – ئەنـدریا بریتـۆن – لـە بنەماڵەیەکی کراوەی شاری – تانشیربەری – لـە هـەرێمی ئاورنی لـە فەرەنسا لەدایك و باوکێکی بێ بروا چاوی بە جیهان هـەڵهێناوە ... لە ژێر کاریگـەری بۆڵ ڤالیری شاعر لە ساڵی ١٩١٤ ، یەکەم هۆنراوەی لـە گۆڤاری – کۆلێژ – بڵاودەکاتەوە .

دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٩١٣ پەیوەنـدی بەکۆلێـژی پزیـشکی دەکـات . بـەڵام لەکاری شیعری دادەبڕێ و لە ساڵی ١٩١٤ ، کە جان جۆریـسی لـە سـەرکردەی سۆشیالستی فەرەنسی تیرۆردەکرێت ... یەکجار تورە دەبێ و بە هۆیەوە سێ چامە لە گۆڤاری – لافالانگ – بڵاودەکاتەوە کە لە ناویدا ئامـاژە بـەنا لـە باری و ڤێزەوەی رەگەز پەرستی دەکات ... ئیتر ئەم مرۆڤە لـەکارە جۆراوجۆرەکـانی و نووسین و کـاری رامیـاری بـەردەوام دەبـێ تـا لـە ١٩٦٦/٩/٢٨ بەنەخۆشـی

کۆچی دوایی دەکات لە وولاتەکەیدا.

سەرچاوە:- مەوسوعەی فەلسەفە - دانانی - دکتۆر عەبدولرەحمان بەدەوی - بەرگی /١ .

١٨٩٦/٢/٢١ لــه پەیووەندیــەکانی ســەرکردەو ڕابــەرێ ســەهیۆنیزم- هرتــزل- لــە گــەڵ بەرپرسانی ئەڵمانیاو نەمساو رووسیاو ئیتاڵیاو بەریتانیا، کە مەبەستی پەیووەندی کردن بوو لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ، بەو هۆیە کە- لاندو- ئامۆژگاری دۆستی یەهوودی - جوولەکە - هێرتزلی کرد ، کە بەیارمەتی دۆستەکەی- نیولنسکی- سەرنووسەری - برید الشرف- کە هێرتزل دەڵێ:- ئێمە فەلەستینمان دەستکەووت و هەوڵی یارمەتی زۆری تورکیا دەدەین لەپێناو ئامانجەکانماندا .

١٨٩٦/٤/٢٥ گەشتی دامەزرێنەری جوولانەوەی سەهیۆنیزم هێرتزل لە میونخ کەوتە ڕێ بەرەو شاری ڤیێنا ، لە ڕێگا چاوی کەووت بە - هشلر بسیوودور- و لە دوای چاوپێکەووتنەکەدا ، نەخشەی فەلەستینی ئاشکرا کرد بەپێی نەخشەی جووگرافیای فراوانکردنی بیری سەهیۆ نیزم لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەراستدا

تێبینی:- سـەهیۆنیزم ڕێکخراوەیەکی جوولەکەی شۆڤینی توون ڕەوە لە جیهان ، ئەویش لە پێناو فراوانکردنی سنووری جووگرافیای جوولەکەیە، بە پێی - ئەرزی میعاد- لە کێشووەرەکەدا.

١٨٩٦/٦/٤ بـۆ یەکـەم جـار لـە مێـژووی وەرزشـی هەمـەجۆر پێشبڕکێی یارییـەکانی جیهـانی- ئۆڵـەمپیات- ئەنجامـدرا ، لـە ئەسـینای پایتـەختی یۆنـان ، بـە بەردەوام بوونی تاکوو ٧/١٥ ی هەمان ساڵ ، کە١٤ وولات بەشداری تێداکرد ، بە ٢٤١ یاریزانو بە ٢٤ یاری هەمەجۆر لە نێوان وولاتانی جیهاندا.

١٨٩٦/٦/٧ بەرپابوونی شەڕی - فرکە - لە نێوان هێزە چەکدارەکانی سوودان کە ، لە٣٠٠٠ سێ هەزار چەکدار زیاتربوون لە گەڵ هێزەکانی سووپای میسر ، کە لە ١٠٠٠٠ دەهەزار چەکدار زیاتر دەبوون ، لەو شەڕەشدا زیاتر لە٨٠٠ چەکدارو هاوولاتی سوودانی کوژرانو بە دیل گرتنی زیاتر لە٦٠٠چەکدارلە ناوچەکەدا.

دوای ئەوە سووپای میسر بەرەو- دنقلە- گەڕایەوەو لە ئەنجام بووە هۆی

پەیووەنـدی کـردن . لـە نێـوان ئەفـسەرە بەریتانییـەکان و کەسایەتیەکانی ناوچەی کوردڤان و سەرۆکی کیابیش ، لە وولاتی سوودان لە ناوچەکەدا .

شـایانی باسـە ناوچـەی کوردڤـان لـە سـوودان دانیـشتووانەکەی بـە نـاوی خۆیـەتی و کـە کـوردن ، ئەمـەش لـە ئـەنجامی شـەڕە دژووارەکـانی نێـوان ئیمپراتۆریەتەکانی عوسمانی و بێزەنتیەکان و ڕووسیاو فارس بووە لـە دوای ساڵەکانی ١٥٠٠بـەرەو ئەوناوچـانە کۆچیان کـردووەو نیـشتەجێبوونە لـە ناوچەکەدا .

هەروا لە ئەنجامی شەڕەکانی سەلاحەدینی ئەیوبی و محەمەد عەلی پاشای دامەزرێنـەری وولاتـی میسر بـووەو کـە تـاکوو ئێـستا لـە دەنـگ و باسـەکانی میدیای عەرەبی و بیانی بەناوی کوردڤان باسی دەکرێ بە هەرێمی دارفوردا.

تێبینی:- دەتوانی بگرێیتەوە سەر نەخشەی دارفوور لە وولاتی سوودان . کە هەرێمی کوردڤان بە باشی دیاری کراوە .

١٨٩٦/٦/١٥ دامەزرێنـەری جوولانـەوەی سـەهیۆنیزمی جیهـانی - جولەکـە- یـەهودی- هرتـزل نووسـیوویەتی و دەڵـێ:- بـەنیازی کڕینـی هـەرێمی فەلەسـتینە لـە سـوڵتانی عوسمـانی- ، ئـەویش بـەئامادەکردنی - ٢٠- ملیـۆن جوونـەی ئیـستەرلینی و دانـی بـە دەسـەڵاتی عوسمـانی، لـەپێناو چاکسازی کردنـی بـاری دارایـی لێـك تـرازاو لـەناو دەسـەڵاتی عوسمـانی، لەگـەڵ دوومليـۆن لەجیاتی فەلەستین.

هـەروا بڕەکـەی کـە دەکاتـە ١٨ هـەژدە ملیۆنـە ، دەتـوانرێ بـەرزگار کردنـی پارێزراوەکـانی ئـەورووپی لەدەسـەڵاتی عوسمـانی و کـڕین و نـەدانی قـست بەشێووەی قەرز ، ئەمـەو جگـە لـە چـەند کـاری دیکـەی هرتـزل ، بەتایبـەتی لەوکاتەی کە سەردانی شاری ئەستەمۆڵ کردو چاوی بە - جاوید بـەگ- ی کوڕی سەرەك وەزیرانی عوسمانی خەلیل ڕەفعەت پاشا کەووت و ڕێکەووت .

ئـەویش بەرێکخستنی مەرامـەکان و دانـی بـەرتیل بـە جاویـد بـەگ ، ئـەویش ئامـادەی خـۆی بـۆ پـرۆژەی هرتـزل دەربڕی... لەگـەڵ ئەوەشـدا بەرهەڵستی جێگە پیرۆزەکان بوو لەشاری قوودس لە فەلەستیندا .

١٨٩٦/٦/١٥ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی- زەوڕا- لە شاری بەغدا ، کە ئەم ڕۆژە کرا بە ڕۆژی ڕۆژنامەگەری لە ئێراقدا ، دوای دامەزراندنی دەووڵەتی ئێراق ، لە لایەن بەریتانیاو وولاتانی هاوپەیمانیدا .

١٨٩٦/٧/٢٦ والی وویلایەتی بەغدای نوێ ، عەتەللا پاشا کەواکبی ، گەیشتە بەغدا کە کەسایەتیەکی ناسراوی بەئارامو ڕووناکبیر بوو ، کە لەنەوەی کواکبیەو لەنژاد کوردن ، هەر لە گەڵ گەیشتنی بۆ شاری بەغدا شاعیری بەناوبانگی کورد ، شێخ ڕەزای تالەبانی شیعرێکی بەسەردا گرتووە بە هۆی تەمەنی گەورەیی والی کەواکبی .

١٨٩٦/١٠/١١ کۆچی دوایی گەوورە ڕووناکبیرو مۆزیکار ژەنی کلێسەی ناوداری جیهانی- جۆزێف ئەنتوان بروکنێر- ... شایانی باسە ئەو کەسایەتیە ناوداره لە بوواری هونەری مۆزیکا ، لە ١٨٢٤/٩/٤ لە شارۆچکەی نانسفێلرینی لەباکووری وولاتی نەمسا لەدایك بووە ، ڕۆڵی گرنگی هەبووە لەبەرپێدانی مۆزیکاژەنی ، سەرەڕای بێ باوکی و بەپێی توانا هەوڵیداوە لەم کارەدا .
ئەویش بە بڕینی ڕێگا سەختەکانی ژیان تا گەیشتۆتە ئەو پایە بەرزە لەهونەری مۆزیکاو چوونە ڕیزی هونەری مۆزیکا ژەنەکانی دیکە لە جیهاندا.

١٨٩٦/١١/٥ یەکەم فلیمی سینەمایی هەڵوواسێنراو لە قاهیرەی پایتەختی میسر لە بۆرسەی نۆسن بۆ بینەران پەخشکراو دوای ئەوە لە شاری ئەسکەندەیە... پەخشکرا بۆ جەماوەرەکە.

١٨٩٦/١١/١١ لە دوای چەندین قەسابخانەی بە ئەنجام گەیەندراون بەرامبەر بە ئەرمەنەکان کە لە ساڵی ١٨٩٤-١٨٩٥ ، زیاتر لە ١٥٠ هەزار هاووڵاتی ئەرمەنی بەکووشتن وسەبڕین لەناوبراوەن ، لەلایەن هێزەکانی سووپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا .
لەم ڕۆژدا مەرسوومێکی بڵاوکردەوە بە ناوی چاکسازی لەناوچەکانی کە دانیشتووانەکانی ئەرمەنین ، بەڵام تەنیا بەڵێن بوون نەك کردار لە ڕۆژ هەڵاتی هەرێمی ئەنازۆل لە باکووری کوردستان.

١٨٩٦/١١/١٧ کردنەوەی کەناڵی سوێس لە میسر ، کە لەو کاتە وولاتی میسر لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوو بە سەرکردایەتی محەمەد عەلی پاشا ، ئەوەم پرۆژە مەزنە لەلایەن ئەندازیاری فەرەنسی - فیردیناندی لسیس- دروستکرا .

کە درێژی کەناڵەکە ١٦٠ کیلۆمەترە و ، کە دەریایی سپی ناوەڕاست دەبەستێتەوە بەدەریای سوور ، کە هەمووی دەکەوێتە هەرێمی وولاتی میسر . کە رۆڵی سەرەکی و بنەڕەتی لەبووژاندنەوەی ژێرخانی ئابووری و بازرگانی هەیە بۆ ئەم وولاتەدا.

١٨٩٦/١٢/١١ کۆچی دوایی دۆزەرەوەی - بارود- - نۆبل- کە ئێستا ئەوکارە بۆتە خەڵاتی جیهان و ساڵانە چەندین کەسایەتی لە بوارە جیاجیاکان خەڵاتەکەی نۆبل وەردەگرێ لە جیهاندا .

## ١٨٩٧



١٨٩٧/١/٢٤ لە دایك بوونی نووسەرو زانای کورد - عەرەب شامویفیچ شامیلوف- لە گوندی سووسوز ، لە ناوچەی قارس لەباکووری کوردستان... باوکی لەرچەلەك دەگەڕێتەوە سەر شێخە کوردەکانی ئێزیدی . شایانی باسە کە بە هۆی هەژاری ئەم خێزانە باوکی ناچار دەبێت ببێتە شوان لەلایەن دەوڵەمەندەکانی ئەرمەن و بۆتان و تورك ... شامیلۆف بەهۆی هەژاری روو لەگۆرەپانی کارکردن دەکات ، لەپێناو یارمەتی دانی باوکی کە شوان بووە لە گوندەکەدا .

دوای ئەوە چوونە گوندی ئەسکنەدەرۆن و لەوێ دەستی کرد بەکارکردن و خووێندن لە هەمان کات ، دوای ئەوەی بووە کرێکار لە یەکێك لەکارگەکان لەناوچەکەدا ... بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهان و کاردانەوەی

لـەباری کوردلـە بـاکووری کوردسـتان ، هـەر بـەم هۆکـارە شـامیلۆف بـوو
وەرگێر لە یەکێك لە یەکەکانی سەربازی لە بەرەی شەڕدا بەمووچەی مانگان
کە - ٢٥رۆبل- بوو . بەلام دوای دووساڵ لەو کارە دەرکرا.
دوای ئەوە گەڕاوە گوندی ساری قامیش ودەستی بەکرێکاری کردەوە ، ب
یەکەم جار پەیووەندی کرد بەرێکخراویەکی شۆڕشگێری نهێنی لەناوچەکە
... کـە بـووە هـۆی ئـەوەی لـە سـاڵی ١٩١٧ دەسـتگیر بکرێـت . دڵخۆشـ
شـامیلۆف بەرووخانی رژێمـی قەیـسەری رووسـیا ئـەوە بـوو رووی لەشـار
ستافرۆبۆل کردو چووە ریزی سووپای سوورو بەردەوام بوو تاکوو کۆتای
جەنگ.
شامیلۆف بەهۆی توانای رووناکبیریو بەهرەداریو زیرەکیو پلە بەپلە ر
لـەدوای رۆژ تـاکوو کۆتـایی ژیـانی ناوداریـەتی کەسـایەتیو زانینـی بـەر
گەشـە کـردن و پێـشکەووتن هـەنگاو دەنـا بـە تایبـەتی لـە هـەردوو بـوار
نەتەوەیی و نیشتیمانیدا .



١٨٩٧/٣/٩ کۆچـی دوایـی کەسـایەتی ئـایینی مەزهـەب شـیعە ورووناکبیری جیهـانی - جەمالەدین ئەفگانی - لە شاری ئەستەمبۆل ...شایانی باسە کە زۆر لـە نووسـەران ودکتـۆرو پرۆفیـسۆرەکان نەگەیـشتوونەتە ئەوەی کە ، جەمالەدین ئەفغانی لـە چ نژادێکـەو لەرەسـەندا خـەڵکی کـام وولاتـی ئەفگانستانیە ، یاخوود ئێرانیە ، یاخوود کوردە ، یا فارسە یاخوود بەشتۆنیە لە کێشوەری ئاسیادا .
ئەم کەسیایەتیە بەتوانایە بە هـۆی باری نا لەباری زۆر دەربەدەری دەبوو
بـە وولاتـانی جیهـان ، وەك بـەریتانیاو فەرەنـسا وروسـیاو هنـدو میـس
تورکیا و جگە لە ئێران و وولاتـانی دیکـەی عـەرەب ، گەراوەو توانای باش

هەبوو لەبوارەکانی رامیاری و ئایینی و کۆمەڵایەتی و رۆڵی کاریگەری هەبوو لەسەر دەسەڵاتە جیاجیاکان ، بەتایبەتی دەسەڵاتی عوسمانی و محەمەد عەلی پاشا و بەریتانیا، لەهەردوو لایەنی پاش وخراپەکانیدا

دوای چەندین ساڵ ، لە ١٠/١٢/ ١٩٤٢ ، تەرمەکەی لەئەستەمبوڵ گوستراوە شاری بەغدا لە رۆژی ١٢/١٥ ، ی هەمان ساڵ تەرمەکەی گەیشتە مەرقەدی شێخ عبدالقادر گەیلانی لە شارەکەدا . کە چەندین کەسایەتی ناوداری ئێراقی ئامادەی سەر تەرمەکەی بوون ، لەوانە شاعیری گەورەی نیشتمانی محەمەد مەهدی جەواهیری بەم بۆنە پارچەیەك لە شیعری شیعرەکانی لەسەر گۆرکەی خوێندەوە.

دوای ئـەوە تەرمەکـەی گوسـترایەوە وولاتـی ئەفگانـستان و گۆرەکـەی لەگۆرستانێکی بەناوبانگی شاری کابوولی پایتـەختی ئەفگانـستان بە خـاك سپێردرا لە شارەکەدا .

١٨٩٧/٤/٢٦ لە دایك بوونی رووناکبیرو کەسایەتی ناوداری گەل و نیشتمان مامۆستا - جەلادەت بەدرخان - کە تێکۆشەریکی کوردو کوردستان وخاوەن رۆژنامەی رۆناهی و هاوار بووە.

١٨٩٧/٦/٢ هـەر وەك لـە - قاموس الاعلام - ی عوسمـانی دیـاریکراوە ، کە بـەگرنگترین سەرچاوە ، یاخوود فەرهەنگ دادەنرێت ، کە مێژوو و جووگرافی عوسمانی دیار دەکات و باس لەجێگەو شووێنی شاری کەرکوك دەکات بەم شێووەیەی خوارەوە :-

کەرکوك دەکەوێتە ژێر سنووری وویلایەتی مووسلی کوردستان و بەدووری ١٦٠ کیلۆمەتر لە رۆژهـەڵاتی شـاری مووسـڵە ... لەناوەراست دەشـتایی و گردۆلکەو دۆڵی بەرزو نـزم ... و لـە تـەك کەنـدی - ئەدهەم - کە مەڵبەنـدی سنجەقی شارەزوور بووە ... لەو کات ژمارەی دانیشتووانی ٣٠٠٠٠ هەزار کەس بووە ... لەگەڵ قەڵاکەی ... هەروا ٣٦ مزگەووتی تیا بووە ... لە گەڵ / ٧ قوتابخانە ... لەگەڵ /١٥ تەکیەو ١٢ خان و ١٢٨٢ دووکان و حانووت و ٨ گەرماو لە شارەکەدا .

جێگـەی روونکردنەوەیـە ، کـە پارێزگـای کـەرکوك دەکەوێتـە نێوان چیای زاگرۆس و زێی بچووك و رووباری دیجلە و زنجیرە چیای حەمرین و زێی

سـیروان – دیالـه – ئـەو ناوچـەیە بـووە كـە لـە سـەردەمی ساسـانیەكان پێـ
گـووتراوە – گـەرمـەكان – یـاخوود وولاّت یـا نیـشتیمانی – گـەرم – هـەروا ا
سەرچاوە سریانیەكانیش لەژێر ناوی – بیت گرمای – بووە ... سووك بۆتە
بۆ – باگرمی – باجرمی – یاخوود – حرمقان – كەمانای – گـەرمـه – یـاخو
وولاّتی گەرم .

شووێن وجێگـەو هەڵكەووتـەی پارێزگـای كـەركوك جێگـەی سـەرنج راكێش
هـەموو ئیمپراتۆریـەكان بووە ، لـە دوای داگیركردنـی كـە رێگەیـەكی گوونجـ
بووە بۆ گەیاندن و بازرگانی ، كە پێیدا هاتوو چۆكراوەو رێگایـەكی ئاسانك
بووە بۆ گەیاندن ... لەهەمان كات گرنگیان پێداوە لە بوارەكانی سەربازی
ئـاوەدان كردنـەوە ، بەدروسـتكردنی گونـدو شارۆچـكە لەرێگـەی كفـری
خورماتوو و داقووك و چەمچەماڵ و دوایـی بەرەو باكووری لـە پردێ و جێ
لەناو شاری كەركوكیش .

هەروا باسكردنی شاری كەركوك لەلایەن رۆژهەلاّتناسان – كرامرز – لە بەش
پێنجـەم – لەكتابەكەیـدا و هـەروا رۆژهـەلاّتناس – تۆمـابوا – ش چـەند
تێبینی لـە سـەر شاری كـەركوك و جێگـەو شووێن و هەڵكەووتـەی ئـەم شا
نووسیووەو دەڵێ : –

كەركوك لە باشووری رۆژئاوای زێـی بچووكەو لـە باشووری رۆژئـاوای چیا
حەمرینـەو لـە رۆژهـەلاّتی زێـی سیروانە – دیالـە – هـەروا چیای زاگـرۆ
دەكەوێتـە سـەر سـنووری بـاكوری رۆژهـەلاّت ... لەیاداشـتەكانی – گـاد
S.H.Gadd – و – سدنی سمیت – s.smith – داهاتووەو گەیشتوونە
ئـەو بروایـەی كـە شـاری كـەركوك لەهـەمان شـووێنی – ئـەرفا – ی كۆنـ
ساسانیەكانیش ناویان هێناوە بەگەرمەكان .

لـە بـەر ئـەوە لـە سـەردەمی هـەردوو ئیمپراتۆریـەتی بـابلی و ئاشـووریەك
هێرشی سەربازی زۆری بۆ كراوەتـە سەر دانیشتووانی شاخەكان ... كە لـ
كات گۆتیەكان نیشتەجێی ئەو ناوچەیە بوونەو مەڵبەندی كۆمەڵ بوونیان
شـاری – ئارابخـا – بـووە ... كـە گۆتیـەكان بـوون هێرشـیان كردۆتـە سـ
ئاشــووریەكان و بــەرەو باشــوور هــەنگاویان نــاوەو بۆتــە مەڵبەنــد
ئیمپراتۆریەتی ئەكەدیەكان .

زۆر لە نووسەرو رۆژهەلاَتناس و مووئەرخەکان ناوی تەواوی ، یاخوود ناوی رەسەنی کەرکوکیان دیاریکردووە ، بەتایبەتی شوویَنەوارناسانی ئیَراقی ئیَستا – تەها باقرو فوئاد سەفەر – کە دەلیَن:-

ناوی کەرکوک لە ووشەی – گرگر – وە هاتووەو پەرەی سەندووە بەپیَی گۆرانکاریە یەك لەدوای یەکەکانی پەرینەوەی قۆناخەکانی ، یاخوود لە سەرچاوەی ئارامیەکان داهاتووە بە – کرخا – د – بیَت سلوخ – واتە شاری – سلووقین – لە ناوچەکەدا .

بەلاَم زۆربەی نووسەرانی میَژوو وای بۆ دەچن کە ناوی کەرکوك لە –گرگر– وە هاتووە ، لە بەر ئەوەی بابە گورگور بوونی بەرلەو میَژووەو لیَکۆلینەوانە بووە ، کە بابە گورگور جیَگەی بوونی ئاگریَکی نەوتی بەردەوام بووەو دەکەویَتە باکووری شاری کەرکوك وکەمتر لەکیلۆمەتریَکی ئیَستای شاری کەرکوك ، کە مەلبەندی کۆمپانیای دەرهیَنانی بەرهەمی نەوتە لەم شارەو خاکی کوردستانە . بەر لە بوونی عەرەب و تورکمان و بەر لە ئیسلام و ئاینەکانی دیکە لەم ناوچەیەدا .




ئەمەیە کۆچکردنی عەرەب بەرەو خاکی وولاَتان و نەتەوەکان لە ریَگەی داگیرکردن لە هەلمەتەکانی فتووحاتی ئیسلامی لە هەموو بوارە جیاجیاکان ، وەك لە ناوەرۆکی ئەم کتیَبە دیاریکراوە

جیَگەی روونکردنەوەیە کە لە چەندین لیَکۆلینەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە پەیووەندیەکانی نەتەوەی عەرەب و تورکمان ، بە تایبەت عەرەب لە ئیَراقی ئیَستا و بەتایبەتیش لە پاریَزگاکانی کەرکوك و مووسل و دیالەو چەندین پاریَزگای دیکە بەچەند سالیَك دادەنیَن کە لە نیَوان ٢٠٠ – ٣٠٠ سالە عەرەب

ڕووی لـە سـنووری ئێـستای ئێـراق و ، بـە تایبـەتی هـەرێمی باشـووری کوردسـتان کـردووه ، کـە نیشتەجێی ناوچە جیاجیاکان بوونـەو هـەمووی بـە هۆکاری ڕامیاری و نیاز خراپی و داگیرکردن بوونە ئەویش :-

١- هـۆزی شـەمەر :- ئـەم هـۆزە لـە شارو دەوروووبـەری نـەژدەوە - نجد -لـە بیابـانی دوورگـەی عـەرەب ڕەوانـەی ناوچـەکانی باشـووری ئێـستای ئێـراق و شام کـراون شـەپۆڵ لـە دوای شـەپۆل و ، ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی یارمـەتی دەریان بووه ، بە هۆی بەردەوامی شەڕی نێوان دەسـەڵاتی عوسمـانی و فارس لە ئێران . هەروا هۆزەکانی - مەداعنە و ئەلاسلەم .

٢- هۆزی زەفیر :- ئەم هۆزەش هەر لە هەمان ناوچە ڕەوانەی ئێراقی ئێستاو شام کران لە سەدەی شانزەهەم ... لە ناو ئەو هۆزەش تیرەکانی - بوومفرج و مەلیحل و کەراعنـەو خەسامنەو ئـەلبوعامر - لەناوچەی حەویجە نیشتەجێ بوون .

٣- هـۆزی عنـزه :- ئـەم هـۆزەش ٢٥٠ سـاڵ بـەر لـە ئێستا ڕەوانـەی ناوچـەی حەویجە کران .

٤- هۆزی جوولە :- ئـەم هـۆزەش بەتیرەکانیـەوە ڕەوانـەی ناوچـەی پارێزگـای کەرکوك کراون و لە باشووری کەرکوك نیشتەجێ بوون .

٥- هۆزی جومیلە :- ئەم هۆزەش بەر لـە ٣٠٠ سـاڵ ڕەوانـەی ئێـستای ئێـراق کراون .

٦- هـۆزی عوبێـد :- ئـەم هـۆزەش لـە بنـەڕەتا دانیـشتووی وولاتـی یەمـەن بوونەو ناوزەندن بە هۆزی - زبێد و لە دەستی ڕاستی زێـی دیجلە نیشتەجێ بوون .

٧- هــۆزی قرغــول :- ئــەم هــۆزەش بەتیرەکانیــەوە لــە شــاری نــەژدو دەوروووبەری ڕەوانەی ئێراق کراون و لەگەڵ هۆزی عوبێد لەناوچەی بێجـی و حەویجە نیشتەجێن .

٨- هۆزی جحێش :- ئەم هۆزەش لـە بنـەڕەتا زوبێدیـەو لـە وولاتـی یەمەنەوە ڕوویان لە بیابانی عەرەبی کردووەو بەرەو ئێراق ڕەوانەکراون

٩- هۆزی هیبات :- ئەم هۆزەش زوبێدی ڕەسەنن و لەهەمان شووێن هـاتوون و لە پارێزگاکانی سەلاحەددین و کەرکوك نیشتەجێ کراون لە هەرێمەکەدا .

١٠- هۆزی جبوور :- ئەم هۆزەش بەهەمان شێووە نیشتەجێی پاریزگاکانی مووسل و ئەنبار و سەلاحەددین بوون .

ئەم هۆزە عەرەبانە بەچەند قۆناخ ڕوویان لەئێستای ئێراق و شام و کەنداو کردووە ئەویش :-

١- بەهۆی فتووحاتی ئیسلامی ، کە یەکەم بە ئیسلام کردنی گەلانی دانیشتووی ئەو ناوچەیەو ، دووەم داگیرکردنی خاك بەزۆرداری . نەك بە ئیسلام کردن و جیٚ هێلانی خاکی گەلان و دوور کەوتنانەوەیان لە کێشە هەمە لایەنەکان .

٢- دەسەلاتی سەلاحەددینی ئەیوبی ، هۆکارێکی گرنگ بوو لە بەهێزکردنی جیٚ پێگەی عەرەب و نیشتەجیٚ بوونیان لەو ناوچانەی کەلە ژێر دەستی خاچەکان رزگارکرا ... واتە سەلاحەددین .

لە پێناو یەکەم بەعەرەبکردنی خاکی گەلان بوو بەتایبەت خاکی کوردستان و ، دووەم ژیاندنەوەی ئاینی ئیسلام .

لە بەر ئەوەی گەر سەلاحەددین نەبوایە عەرەب و هەلگری ئاینی ئیسلام توانای ئەوەیان نەبوو خۆیان و ئاینەکەیان رزگاربکەن لەژێر دەستی مەسیحیەکان لەو سەردەمدا .

٣- بوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە رۆژهەلاتی ناوەراست و پارمەتی دەری ناوچە جیاجیاکانی ژێر دەسەلاتەکەی ، بە تایبەتی لەسەر خاکی کوردستان و ئێستای ئێراق و شام و کەنداو لە ناوچەکەدا .

٤- دامەزراندنی دەوولەتەکانی عەرەبی و ، بە تایبەتی ئێراق و سووریاو ئێران و تورکیا ، هۆکاری سەرەکی بوو لە بە عەرەبکردن لەم ناوچانەو رەوانەکردن و هێنانی عەرەب بۆ ئێراقی ئێستاو شامی پێشوو وەك سووریاو ئوردن و فەلەستین .

هاتنی هەردوو پارتی بەعس لە سووریاو ئێراق ، بۆ سەر دەسەلات و لە باری کەش و هەواو باری گوونجاو بۆ بەعەرەبکردن و هێنانی عەرەب لە وولاتانی دراوسێی ئەم دوو وولاتە ، بە تایبەتی سعوودیەو بەردەوام بوونی لەم کارە شۆڤێنیانە لەهەموو بوارەکان ، لە سەر خاکی گەلان لە ناوچەکەدا .

١٨٩٧/٨/٢٩ گرێدانی یەکەم کۆنگرەی جوولەکە لە شاری بازلی وولاتی سوویسرا بەئا
بـوونی هـەموو هێـزە داواکارەکـان و لایـەنگیران بـە دروسـتکردنی دەوڵـ
جوولەکە لە فەلەستین و لەکۆتایی کۆنگرەکە ، کە بەچوار بڕیاری سەر
کۆتایی هات ئەویش:-
١- کـارکردن بـەپێی نەخشەی دیـارکراو لەسـەر نـویێ کردنـەوەی فەلەسـ
بەیارمەتی جوولەکە لە هەردوو بواری کشتووکاڵ و پیشەسازیدا .
٢- کارکردن لەپێناو دامەزراندنی دام و دەزگاکانی یەهوودی.
٣- کـارکردن لـەپێناو هانـدانی گیـانی یەهوودیانـەو ویـژدانی یەهوود
بەگەیاندنی ئامانجەکان .
٤-کارکردن لەپێناو جێ بەجێکردنی ئامانجەکانی جوولانەوەی سەهیۆ
، لەگـەڵ ئەوەشـدا زینـدووکردوەوەی زمـانی عیـبری و ئـەدەبی عیـ
رۆشنبیری عیبرییەکان لەجیهاندا.



١٨٩٧/١٠/٣ لـە دایـك بـوونی نووسـەرو شـاعیری نـاوداری فەرەنـساو جیهان - لـویس ئاراگۆن - لـە شـاری پاریـسی پایتـەختی فەرەنسا .
جێگـەی باسـکردنە کـە لـویس ئاراگۆن لەو کاتـەی وولاتەکـەی لـە ژێـر زەبـرو زەنگـی داگـیر کـردن بـوو لـە لایـەن هێزەکانی سـووپای ئـەڵمانیا ، کـە ئـەم کــارەش بــووە هۆکــاری کاردانەوە لە سـەر هەسـت و هۆشـی ئاراگۆنی شـاعیر و بووە هۆی ئەو
بەرهـەم داهێنانـەکانی بـۆ بـەرگری کـردن لـە نیشتیمانەکی تـەرخان بکـ
وولاتەکەیدا .
هەروا ئاراگۆن لە کۆلیژی پزیشکی لـە شـاری پـاریس قوتـابی بـوو ، کا
هاوڕێـیـەتی - تەنـدریتی بریتـۆن -ی دەکـرد ، کـە دامەزرێنـەری قوتاب

سووریالیت بوو ، بۆ ماوەیەکیش پێکەوە بەڕێوەبەرایەتی ئەو ڕێبازە ئەدەبیانەی کرد ، لە ساڵی ١٩١٩ هەر بەیەکەوە گۆڤاری – ئەدەب – یان دەردەچوواند .

دوای ئەوە لویس ئاراگۆن بەشداری لە جوولانەوەی دادابیەکانی کرد و هاتە ڕیزی ئەو تەوژمە ئەدەبیە گرنگە کە لە دەر کردنی ناوداری و ناسینی وەك شاعیرێکی گەورەی فەرەنسا .

هەروا سوودی لەو تەوژمە وەرگرت ، کاریگەرترین شاعیر کە کارتێکەری ئاراگۆن بێت و سوودی لێ ببینێت – تریستیان تزارا – بوو کە دامەزرێنەری دادییەکان کە لە شاری زیوریخ ئەو تەوژمە ئەدەبیەی دەستپێکرد ، دادابیەکان نەمایەوە بۆ جاری دووەم پەیوەندی بە سووریا لیستەکان کردەوە و زنجیرەیەك نووسین و بەرهەمی بڵاو کردەوە ، لەوانەش ڕۆمانی – هۆگرەکان – و – جووتیاری پاریس – بوون – جگە لەمانەش دوو کۆمەڵە شیعری پوخت و بەهێزی بە چاپ گەیاند ، یەکێکیان بە ناوی – شەپۆلە خەونەکان – بوو لە ساڵی ١٩٢٤ بڵاوبووەوە ، ئەوی دیکەشیان بە ناونیشانی – بزووتنەوە هەمیشەییەکە – کە لە ساڵی ١٩٢٦ ڕووناکی چاپ و بڵاوکرنەوەی بینی .

هەروا دەرکەوتنی هەندێ بیروو بۆچوونەکان سووریا لیستەکان کە لەگەڵ بۆچوونی ئاراگۆن ناکۆك بوون و وایکرد کە جارێکی دیکە بە ووردی بەخۆیدا بچێتەوە ، لەوانەش لایەنگیری هەندێك لە شاعیرانی ناو سووریا لیستی ئەو هێرشە ناهەقەی کە فەرەنسا کردییە سەر شۆڕشگێرانی وڵاتی مەغرب بۆ کەپکردنی دەنگی ئازادی لەم وڵاتەدا .

هەروا ئاراگۆن لە سەرەتا هەرگیز لەگەڵ ئەوە نەبوو دەنگی مرۆڤ هەر لە کوێیەکی جیهان بێت خامۆش و کپ بکرێت . بۆیە ئاراگۆن و پۆل ئیلوار بەر پرسی ئەو هەڵوویستانەی شاعیرانی ناوبازنەی سووریا لین دایەوە ، کەچی ئەوان لە بەیاننامەیەکدا ئاراگۆن و ئیلواریان و بە ناپاك خائین نازەند کرد ، ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دیکەش ناسین و ئاشنا پەیدا کردنی لەگەڵ – ئیلیز – بنچە ڕووسی کە کۆنە دۆستی مایکۆفسکی شاعیر بە لە ساڵی ١٨٢٦.

لە ئەنجامی ئەو فشارە دژووارە دەروونیەی کە دووچاری هاتبوو ڕۆمانێکی

گەورەی خۆی بەناوی بەرگری کردن لە بێ کۆتایی لە میوانخانەیەکی ئیسپانیا سووتاند ، کە نزیکەی ١٥٠٠ لاپەرە دەبوو ، لویس ئاراگۆن لە ساڵی ١٩٣٢ گەشتێکی بۆ یەکیەتی سۆڤیەت ئەنجامداو تازەش لەگەڵ هاورێیەکەی – ئەندرێ بریتۆ – پەیوەندی پچراند بوو .

دوای ئەوە بووە بەرێوەبەری رۆژنامەی ئەم ئێواریە کە تەنیا گرنگی بە رۆمان و هونەرەکانی رۆمان نووسین دەدا ، دوای ئەوە چەند رۆمانێکی دەست پێکرد ، رۆمانی زەنگەکانی پاڵ – کە بە یەکەم رۆمانی زنجیرە – جیهانی واقعی – دەژمێردرێت .

دوای ئەوە رۆمانی – رێبوارانی گالیسکە – و گەرەکە جوانەکان – ی بلاوکردەوە . کە بیرو ناوەرۆکیان بۆ مەرگەسات و کارەساتە دڵتەزێنەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی دەگێرایەوە و دیمەنی ئەو جەنگە کاولکاریە تیایاندا بەر جەستە کردبوو ، ئەم کەسایەتیە لە کارە هەمەلایەنەکانی بەردەوام بوو تا کۆچی دوایی دەکات و بەرهەمەکانی وەك کەلتوورێك بۆ گەل و نیشتیمانەکەی و گەلانی دیکەی جیهان ماوەتەوە لە وولاتەکەیدا .

**سەرچاوە :-** لە ئەدەبی فەرەنسی سەردەمدا ، نووسینی – سامیە ئەحمەد ئەسعەد .

## ١٨٩٨

١٨٩٨/١/٢٣ لەدایك بوونی پێشەنگی سینەمایی رووسی و ناوداری جیهانی – ئازنستاین– لە هەرێمی لاتیڤیا.

١٨٩٨/٤/٢٢ یەکەم ژمارەی رۆژنامەی کوردستان لە قاهیرەی پایتەختی میسر بلاوکرایەوە لە لایەن – تێکۆشەرو کەسایەتی ناوداری کورد مامۆستا مقداد مەدحەت بەدرخان – کە ئەو رۆژە بە رۆژی رۆژنامەگەری کورد لە کوردستان دانراوەو هەموو ساڵێك یادی ئەم رۆژە دەکرێتەوە لە کوردستاندا .



کردستان

بسم الله الرحمن الرحيم

١٨٩٨/٥/١ لە ئاكامی شەڕی نێوان ئەمەریکا بەسەرکردایەتی جۆرج دوی و ئەسپانیا بەسەرکردایەتی مونتوخو لە کەنداوی مانیلا – الفیلین – کە بووە هۆی تێك شکاندنی کەشتیە جەنگیەکانی ئیسپانیا ، بێ ئەوەی هێزەکانی سووپای دەریایی ئەمەریکا یەك سەرباز لەدەست بدات ... ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئیسپانیا هەرچەند ژێردەستەی هەیبوو لە ئەمەریکا لەدەست بدات ، کە بەر لەو شەڕەدا ، یەکەم دەوڵەتی زلهێزبوو لە سەدەکانی شانزەو حەڤدەدا ، لە زەریای هێمن کێشووەرەکەدا هەر لەوکاتەشدا شۆڕشی کووبا سەرکەووتنی بەدەست هێنا بەیارمەتی ئەمەریکا دژی جووڵانەوەی رزگار لە دوورگەی کووبا لە کێشووەرەکەدا .

١٨٩٨/٥/٢٢ دامەزراندنی کۆمەڵەی ئیتحادوتەرەقی لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا، دوای ئەوە لەگەڵ کۆمەڵەی حریە لە شاری سیلان لە١٩٠٥/٥/٨ یەکیان گرت ، بە ناوی کۆمەڵەی گشتی ئیتحادوتەرەقی لە پاریس ، بەڵام ئیدارەی جووڵانەوەکە لە شاری سیلانك بوو.

١٨٩٨/٦/١٥ بۆ یەکەم جار بانکی دەرچوو ڕاگەیەندرا ، کە ماوەی بە دەرکردنی پارەی کاشی بەردەدات بەناوی – نیکتۆت– ئەویش لەووڵاتی میسرو بەمەڕسوومی پاشای میسر – مەحەمەد عەلی پاشا – و بەردەوام بوو تاکوو ساڵی١٩٦٠ ووڵاتەکەدا .

١٨٩٨/٧/٩ سەرکردەو کەسایەتی کورد – شەریف پاشای خەندان – بە پۆستی باڵوێزی عوسمانی بەرەو شاری ستۆکهۆڵمی پایتەختی سووید بەرێکەوت ، لە پێناو ئەنجامدانی کاری باڵوێزی لە دەسەڵاتی عوسمانی لە ووڵاتی سوویددا .

١٨٩٨/٧/٣٠ لە دایك بوونی پەیکەرتاشی بەناوبانگی سەدەی بیستەم – هنری سەبنسەر مۆر– لە شارۆچکەی کاسلفوردی هەرێمی بۆرکشایەی بەریتانیا، لە جەنگی یەکەمی جیهان بەشداری چەندین شەڕی کردووە دژی هێزەکانی ئەڵمانیا .لە ناوچەو هەرێمەکاندا .

١٨٩٨/٨/٨ بە هۆی کێشەی نیوان هەردوو عەشیرەتی هەمەوەند و شوان لە پارێزگای کەرکوك لە باشووری کوردستان ، ئەویش لە راپۆرێکی سەرکردەی عوسمانی– ڕەزا – کە بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی نووسیەو دەڵێ:–

عەشیرەتی هەمەوەند گوێرایەڵی ڕامیاریەتی حکوومەتی عوسمانی ناکەن و

بۆتـە هـۆی نانـەوەی دووبـەرەکی و لێـك ترازانـی بـاری ناوچـەکەو هێرشـیان کردۆتە سەر عەشیرەت و حکوومەتی عوسمانی لە ناوچەکەدا .

١٨٩٨/٨/٢٣ شـاندێکی کەنیـسەی ئۆرزکـسیەی رووسـی بـە سـەرۆکایەتی – سـینهوود ئەرسمندریت کیوبل – گەیشتنە ئێران و دوایی بەرەو شاری تەبریزو دوایـی بـەرەو شـاری ورمـێ ل ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان ڕۆیـشتن ، لـە دوای ئـەو سووڕانەوەیە ڕێکەوتنامەی نێوان ئاشووریەکان و کەنیسەی ناوبراو مۆرکرا. ئـەویش کـە ئاشـووریەکان بـچنە نـاو کەنیـسەی ئۆرزکـسیەی ڕووسـی ، کـە ئەمانە زۆربەی زۆریان کوردی دانیشتووانی رۆژهەلات و باکووری کوردستان بوون لە کێشووەرەکەدا .

١٨٩٨/٩/٢ بەریتانیا بەهێزەکانی سووپای میسر بەرەو باشوور هەنگاویاناو لە ئەنجام بـووە هـۆی هەلگیرسـانی شـەڕی – کـڕی – و لـە ناووەنـدی ڕێگـای نێـوان – شـندی – و – ئومـدریان – کـە بـووە هـۆی کووشـتنی – ١٠٠٠٠ – هـەزار چەکدارو هاوولاتی ، کە لە ناویان یەعقوبی برای خەلیفە عەبدوللا تعایشی و محەمـەد مەهـدی بـوون.. دوای ئـەوە عەبـدوللا تعایـشی گوواسـترانەوە بـەرەو سـوودان لـە ناوچـەی – کوردڤـان – لـە هـەرێمی دارفـور گواسـتراوە کـە کـورد بووەو دانیشتووی کوردڤان بووە لە ناوچەکەدا .

١٨٩٨/٩/٢٧ بـەپێی بەلگەنامـەی ژمـارە/٥٥ ی بڕیارەکـانی رژێمـی عوسمـانی، کـە تێیـدا هاتیە . کە ڕێکـەوتنی ئاشتبوونەوە لە نێوان عەشیرەتی هەمەوەندو شوان بەردەوامـە ، لـە نێـوان کەسـایەتیەکانی هـەردوو لایـان بەمـەرجێ عەشـیرەتی هەمەوەنـد ١٠٠ پارچـە چـەك و چـوار ئەسـپ بداتـەوە عەشـیرەتی شـوان ، کەرێکەووتنەکەشیان لە چوار برگە پێك هاتبوو لە ناوچەکەدا .

١٨٩٨/١٠/١٥ سەرکردەکانی جوولانەوەی سەهیۆنیزم – هرتزل و ماکس بوودنهابر – بەرەو شـاری ئەسـتانە بەرێکـەووتن و چـەند داواکیـان لـە داواکـانی سـەهیۆنیزم ئاراستەی سـولتانی عوسمـانی کـرد ، کە تیایـدا رووبـەری خـاکی داواکـراوی تێدا دیاریکرابوو . کە لە زێی نیلی میسر تاکوو زێی فورات بوو لە باشووری کوردسـتان .. وەك زەوی ناوزەنـد کـراوی یـەهوودی – ارض المعیـاد – لەنەخشەکانیاندا هاتبوو.

١٨٩٨/١٠/١٨ مەتران – سالیزبووری– هەڵسا بە تەواوکردنی کەنیسەی فوودی جۆرج ، لە دوای دروستکردنی لەلایەن مەزهەبی ئینجکلیکانیە ، کە کەنیسەی هەموو بەریتانیا بێت ، هەروا لەکاتی سەردانی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا بۆ شاری فوودی ، ئەویش بە کردنەوەی کەنیسەکە بەشێوەیەکی فەرمی لە ١١/١ی هەمان ساڵدا .

## ١٨٩٩

١٨٩٩/٣/١٥ لە دایك بوونی نووسەرو رۆژنامەنووسی کورد مامۆستا – یوسف مەلەکی تەلکیفی– لە شاری بەغدا ، کە هەوڵەکانی لە پێناو گەشەپێدانی رۆژنامەگەری کوردی بووە لەهەموو بوارە جیاجیاکاندا .

١٨٩٩/٣/٢١ مۆرکردنی پەیمانی ئەنگلو – فەرەنسی، کە فەرەنسا بە فەرمی دانی بەدەسەلاتی بەریتانیا لە سەر کەندی نیل نا بەتەواوی لە وولاتی میسردا .

هەروا بەریتانیا دانی تەواوینا بەمافی فەرەنسا لە سەرپەرشتی کردنی ئەفریکیای ناوەندیو بەشی زۆری لە رۆژئاوای ئەفریکیا لەو رێکەووتنەدا ، داگیرکەری بەریتانیا باجی داگیرکردنی وولاتانی عەرەبیدا بەو داننانە بە فەرەنسا لە ناوچە جیاجیاکانی کێشوەری ئەفریکیادا .

١٨٩٩/٥/١٢ ژمارە دووی ساڵنامەی – نقارات المعارف عمومیە – یەدا باسی لەدام و دەزگای رۆشنبیری و پەروەردیەکانی وویلایەتی مووسڵ دەکات لەلاپەرەکانی ١٤٠٢ – ١٤٢٠دا ، کە هەندێك زانیاری لەسەر کتێبخانە ناودارەکانی ناوچەو هەرێمە کوردیەکان دەکات .

بەڵام ئەو کتێبخانانەی ناویان هێنراوە لەو لاپەرانەدا هەمووی هی کوردستان نین ... بەڵکوو بەدەیان و بە سەدان کتێبخانەش هەبوونە کەناویان نەخراوەتە ناو لاپەرەکانی ئەم لیستەیەی کە لە ساڵنامەکەدا هاتووە ... لەوانەیە لەشووێنی دیکە ناوەکانی کتێبخانەکانی دیکە کە ناویان نەهاتووە تۆکارکرابێت ... ئەو کتێبخانانەی کە ناویان هاتووە ئەمانەن :–

١– کتێبخانەی مزگەووتی گەوورەی هەولێر لە باشووری کوردستان کە دامەزرێنەرەکەی مامۆستا – ئەبووبکر – بووە لە ساڵی ١٦٦٩ دامەزراوەو

ژمارەی کتێبەکانی ٢١٠٥ کتێب بووە.
٢- کتێبخانەی خاتوو فاتمە خاتوون ، لە هەولێر لە ساڵی ١٧٨٥ کە فاتمە خاتوون دایمەزراندووەو ژمارەی کتێبەکانی ٣٥٠ کتێب بووە .
٣- کتێبخانەی شێخ هیدایەت لە خانەقای شاری هەولێر ، کە شێخ هیدایەت خۆی لەساڵی ١٥١٨ دایمەزراندووەو ژمارەی کتێبەکانی ٦١٠ کتێب بووە .
٤- کتێبخانـــەی مزگـــەوتی شـــێخی چـــۆلی لـــە شـــاری هـــەولێر ، ئـــەم کتێبخانەیـەش لەساڵی ١٧٥١ لەلایـەن شێخ جـەرجیس دامـەزراوەو ژمـارەی کتێبەکانی ٢٥٠ کتێب بووە .
٥- کتێبخانـەی خاتوونیـە ... لـە خاتوونیـەی شـاری هـەولێر لەلایـەن حـاجی ئەفیـە خـاتوون لـە سـاڵی ١٧٨٥ دامـەزراوەو ژمـارەی کتێبـەکانی ١٣٠ کتێـب بووە .
٦- کتێبخانـەی مەلا ئیسحاق ، ئەم کتێبخانەیەش لەگەرەکی مەلا ئیسحاق لەلایـەن مستەفا ئاغـا لەسـاڵی ١٧٨٥ لەشـاری هـەولێر دامـەزراوەو ژمـارەی کتێبەکانی ٣٠٥ کتێب بووە.
٧- کتێبخانـەی کورد محەمـەد پاشا ، ئەم کتێبخانەیە لەگـەرەکی سـەرای لـە شارۆچـکەی روانـدزی سـەر بـە پارێزگـای هـەولێر لەلایـەن محەمـەد پاشـا - پاشای کۆرە - دامەزراوەو ژمارەی کتێبەکانی ٤٠٠٠ کتێب بووە.
٨- کتێبخانەی پاشا ، ئـەم کتێبخانەیـە لەگـەرەکی نوعمانیـە لەشارۆچـکەی رواندز لەلایـەن عەبدوڵڵا پاشـا دامـەزراوەو ژمـارەی کتێبـەکانی ٣٠٠ کتێـب بووە.
٩- کتێبخانــەی بجیــل ، ئــەم کتێبخانەیــەش لــە گونــدی بجیــل کەســەر بــە شارۆچکەی ئاکرێیە لە باشووری کوردستان دامەزراوەو ژمـارەی کتێبـەکانی ٩٠ کتێب بووە.
١٠- کتێبخانـەی ئاکرێ ، ئەم کتێبخانەیە لەشارۆچکەی ئاکرێ دامـەزراوەو ژمارەی کتێبەکانی ١٣٠ کتێب بووە .
١١- کتێبخانـەی حـاجی سلێمان ئاغـا ، ئـەم کتێبخانەیـە لەقـەڵای کـەرکوک لەلایـەن سلێمان ئاغا لـە ساڵی ١٨٠٥ دامـەزراوەو ژمـارەی کتێبـەکانی ٢٠٠ کتێب بووە .

١٢– کتێبخانەی دەدە شاقوڵی ، ئەم کتێبخانەیە لەگەڕەکی مووسەلا لەشاری کەرکوك لەلایەن حاجی عەبدولفەتاح لەساڵی ١٩١٢ دامەزراوەو ژمارەی کتێبەکانی ١٥٠ کتێب بووە .

١٣– کتێبخانەی ئاغازی ، ئەم کتێبخانەیە لە گولمەنیە لەگەڕەکی سادات لەلایەن شێخ عەبدوڵلا دامەزراوەو ژمارەی کتێبەکانی ٣٠٠ کتاب بووە لە هەرێمەکەدا . لەگەل چەندین کتێبخانەی دیکە کە مێژووەکەی دیارنیە .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ساڵنامەکانی عوسمانی جێگەی گرنگی پێدان و پەرەپێدان بووە ... لەهەمان کات زۆر لە نووسەرو لێکۆڵەران گرنگیان پێداوە... کە مێژووی ساڵنامەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٤٦ ئەویش بەهۆی هەوڵەکانی – مستەفا پاشا – ی سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی ئەو کات بووە ... کە لە سەردەمی سولتانی عوسمانی سولتان عەبدولمەجیدی یەکەم – ١٨٣٩ – ١٨٦١ – یەکەم ساڵنامەی دەرکرد و ، دوای ئەوە دەستکرا بەدانانی ساڵنامە جۆراو جۆرەکانی لە ژێر باڵی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە کێشوەرەکەدا.

سەرچاوە:– رۆژنامەی – برایەتی – ژمارە/٢٧٤٠

١٨٩٩/٧/٢٧ گرێدانی کۆنگرەی یەکەمی لاهای لە وڵاتی هۆڵەندا ، کە ناوێکە لە سەر دوو کۆنگرەی نێودەوڵەتی لە شاری لاهای پایتەختی هۆڵەندا ، لەکۆشکی – هویستن بۆشی– شانشین لە سەر داوای نیقۆلای دووەمی قەیسەری رووسیا .

ئەویش لە پێناو کەمکردنەوەی چەکی کۆمەڵکوژی ، کە ببووە هۆی لەناووبردنی گەلان لە جیهاندا ، کە چەندین وڵات بەشداریان لەو کۆنگرەدا کرد ، لەوانە ئەمەریکاو کۆنگرەکە بەمۆرکردنی سێ رێکەوتننامە کۆنگرەکە کۆتایی پێ هێنرا ئەویش :–

١– تایبەت بەناوبژیووانی نێودەوڵەتی .

٢– بەرامبەر شەڕی نێوان وڵاتان.

٣– بەرپاکردنی ئارامی و ئاشتی نێودەوڵەتی و چارەسەری کێشەکانی نێودەوڵەتی ، بەرێگەی لێبووردن و هاوکاری و دۆستایەتی... دوای ئەوە

